| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | شرفکندی، عبدالرحمن، ۱۳۰۰ - ۱۳۶۹. شارح. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | دیوانی عارفی ڕەببانی شێخ ئەحمەدی جزیری مەشهوور بە «مەلای جزیری» قدس‌سرەالعزیز / هەژار شەرحی لی‌کردوە. |
| مشخصات نشر | : | تهران پانیذ ۱۳۹۳. |
| مشخصات ظاهری | : | ۸۰۰ ص. |
| شابک | : | 978-964-7105-51-4 |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | جزیری، احمد بن محمد، قرن ۱۱هق. دیوان شرح و تفسیر. |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۱هق. شعر و ادبیات. |
| شناسه افزوده | : | جزیری، احمد بن محمد، قرن ۱۱هق. دیوان. شرح. |
| ردەبندی کنگره | : | PIR۶۲۲۷/۶د۹۰۸۵/ |
| ردەبندی دیویی | : | ۴/۱۸فا |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۶۷۴۳۷ |




چاپ اول ۱۳۹۳ تیراژ: ۲۰۰۰
لیتوگرافی باختر چاپ دالاهو
تهران : خیابان ابوریحان نبش وحید نظری پلاک ۲۶
تلفاکس: ۶۶۴۱۵۹۸۲-۲۲۱۹۰۹۵۱
nashrepaniz@hotmail.com
isbn:978-964-7105-51-4.۹۷۸-۹۶۴-۷۱۰۵-۵۱-۴

## ناسنامە

| | | |
|---|---|---|
| ناوی کتێب | : | دیوانی مەلای جزیری |
| شەرح | : | مامۆستا هەژار |
| پێداچوونەوە | : | ماجد مەردۆخ ڕۆحانی |
| هەڵەگرتنەوە | : | ئەفشین بەهاری‌زەڕ |
| ڕووبەرگ | : | حەمیدڕەزا زەڕی |
| پیت‌چنی | : | ئاراز عەبدی |
| ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان | : | ئاری عەبدی |

# پێڕست



**مِیننەت ژ خودایێ کو ب عەبدێ خۆ مەلایێ**
**ئێکسیرێ غەمێ عیشقێ، نە دینار و درەم دا**

# دەسپێک

ئەم کتێبە سی و چەند ساڵی پێش، واتا: ساڵی ١٣٦١ ک.هـ. (١٩٨٢ ز.) لە چاپ دەرهات و ئەو کاتە، وەک *«هەژار بۆ کوردستان»* و *«چوارینەکانی خەییام»*، پێشوازی لێ نەکرا؛ بە چەند بۆنەوە:

**یەکەم**: کوردی ڕۆژهەڵات، زۆربەمان تازە خەریک بووین خوێندنەوە و نووسینی کوردی فێر ببین؛ ئەویش هەر بە زۆری خۆمان؛ دەنا بە فەرمی، نە مامۆستایەک لە ئارادا بوو نە دەرس و دەفتەرێک؛ وەک ئێستەش کە هەر نییە و هەر نەکرا. بۆ ئێمە، شەرحی ڕەنگین و سەنگینی مامۆستا هەژار لە سەر شیعری عیرفانی پڕ لە وردەکاریی مەلای جزیری، یەکجار قورس بوو.

**دووەم**: شەڕ بوو. پەلەوەریش بواری نەبوو بەو سنوورەدا تێپەڕێ. هەموو هەناردە و هاوردەی هەر دوو بەری ئەو هێڵە لەو کوردستانە، هەر گڕ و گوللە، لە چەکی هەمەجۆرەی شەڕخوازان بوو. کتێبی بەستەزمان چۆن بتوانێ بەو ئاوربارانەدا دەرباز بێ؟

**سێیەم**: کورد، زۆرتر هەژاریان وەک شاعیرێک دەناسییەوە. ئەو ساڵانە ـ لە موکوریان و ئەردەڵان ـ کەم کەس چێژەی پەخشانی مامۆستای چێژتبوو.

ساڵ هاتن و چوون. بەو هەموو کۆسپ و کەندەوە، فێری زمانەکەمان بووین؛ شەڕی دوابڕاو، دوای بڕا؛ کەوشەن خۆش بوو؛ کتێب و نووسراوەی جۆراوجۆر دەرهاتن. پەخشانە ڕازاوەکانی مامۆستاش، وەک *شەرەفنامە* و چێشتی *مجێور* و *قورئانە*کەی، ڕووناکییان بینی و چاوی خوێندەوارانی پێ ڕۆشن بۆوە؛ مێدیای کوردی زۆر چالاک هاتە مەیدان و زمانی کوردی ـ باکوور تا باشوور ـ بە زیاتر لە بیست کاناڵی جیهانیدا بلاو کردەوە و گوێگرانی پێ ڕاهێنا و...

بەم جۆرە، دوای سی ساڵان، ئەوا چەند ساڵە خەڵک داوای ئەم کتێبەش دەکەن.

زۆر باشە، چاپی دەکەینەوە. بەڵام ئەگەر بە چاوی نڤیسیارێک[1] چاوم لێ کرد، دیتم کارەکە هەروا هاسان نییە و پێویستە تۆژاڵێک تۆزی لە سەر بتەکێ تا دەرکەوێ چەند

---

١. «نڤیسیار» بۆ Editor دانراوە؛ فارس «ویراستار» و عەرەب «مُنَقِّح»ی پێ ئێژن.

کتێبێکی وێژەیی بەرزە و هەروەها چ خزمەتێکی گەورەیە بۆ باشتر تێگەیشتن و نزیک‌تر بوونەوە لە کوردی باکوور. گرفتەکان:

١- ڕێنووسەکەی، کە لەگەڵ یەکگرتووی ئەورۆ، یەک ناگرنەوە.

٢- دەق و پەراوێز تێکەڵن و هەروەها هێندێک پەراوێز و ڕوون‌کردنەوەی وێژەیی و مێژوویی پێویستە.

٣- لەوانە گرنگ‌تر، شیعرەکانی مەلای جزیری -کە کرمانجین- زۆر ئاڵۆزن و زۆرێک هەڵەی تێدان.

جا ئەگەر بۆ ١و٢ کارێکم پێ بکرێ، بەداخەوە لە حاند ٣دا دەستم کورتە.

پێش هەموو شتێ بۆ دەسنووسەکەی مامۆستا گەڕام؛ بەڵام پاش ئەو هەموو ساڵە، نە لە کەرەج (ماڵی مامۆستا) و نە لە تاران (پەخشانگای سرووش) هیچم دەس نەکەوت.

بە لای خۆمەوە گوتم: با جارێ بۆ ئەو بەشەی وا شتێکم لە دەس دێ، لە بەرێکەوە خەریک بم، بۆ باقیش خێرۆمەندێک پەیدا دەبێ دەستم بگرێ. بەم جۆرە هەر لە سەرەتاوە پێدا چوومەوە و چم پێ لەگەڵ دەکرا، کردم. مایەوە سەر دەقی شیعرەکانی مەلا.

سەرەتا چاپی دووهەم (١٩٥٧ ز.)ی شەرحە عەرەبییەکەی «مەلا ئەحمەدی زڤنگی»م لە مامۆستا هادی موورادی خۆشەویست ساند؛ کە مامۆستا هەژاریش لە پێشەکییەکەیدا باسی کردووە و دیارە لە بەر دەستی بووە. لەوێ شیعرەکان بە ڕێنووسی عەرەبی نووسراونەتەوە و وشەکان سەر و بۆر و ژێریان بۆ دانراوە؛ ئەگەرچی لە لایەکەوە ئەویش هەڵەی زۆرە و لە لایەکی ترەوە هێندێک لە تایبەتمەندییەکانی زمانەکەمان بەو شێوە نووسینە دەرناکەوێ، بەڵام دیسان هەر باش بوو. کە بەرامبەر بە یەکم دانان، زانیم زۆریان فەرقە و لای کەم سەرچاوەیەکی ترم پێویستە تا بزانم کامە ڕاستە. ناچار تا دیوانێکی ترم دەس دەکەوێ، دەستم ڕاگرت.

پێنج- شەش مانگ ڕابرد. لەو ماوەیەدا چەند کتێب‌فرۆشیی گەورە و بچووکی هەولێر و سلێمانی گەڕام؛ بەڵام دیوانێکی وا دڵم پێ دامەزرێ و پشتی پێ ببەستم، دەستم نەکەوت.

ڕۆژێک مامۆستایەکی کوردی یەکجار ڕۆح‌سووکی خەڵکی جۆلەمێرگ، دانیشتووی شاری وان، بە ناوی مامۆستا «خالد سادینی»، هات بۆ سنە و بوو بە میوانم.

مامۆستا خالد کارێکی گەورەی سەبارەت بە ژیان و شیعرەکانی مەلای جزیری وا بە دەستەوە و بیستبووی لە کتێبخانەی ناوەندیی شاری کرماشان، نوسخەیەک دەسنووس لە شیعری مەلا هەیە. هاتبوو بەشکوو ئەو قسە ڕاست بێ و بتوانێ ببینێ و شتێکی لێ دەسکەوێ.

باسی ئەم کتێبەم لەگەڵ کرد؛ گلەی بوو کە زۆری هەڵەی زەق تێدان. گوتم: کارم لەنگە و ئاخۆ دەست بدا پێکەوە جارێک بیخوێنینەوە؟ فەرمووی ناتوانم دانیشم؛ بەڵام فایلی سێ نوسخەی ئەو دیوانەم هەیە؛ بۆتی دەنێرم. مامۆستا خالد هەزار جار ماڵی ئاوا، دوای چەند ڕۆژێک بە برادەرێکدا، لە شاری ورمێوە، سی-دییەکی بۆ ناردم کە ئەم سێ دیوانەی مەلای جزیری تێدا بوون:

١- دەسنووس بە خەت و ڕێنووسی عەرەبی، نووسینەوە و ڕاستکردنەوەی «شێخ مونەووەر»، کوڕی شێخ ئەسعەدی دووەم، کوڕی شێخ عەبدوڵڵای خەنۆولی بەرواری، کە بە نەسخێکی خۆش نووسیویەتەوە و لە سەفەرەمانگی ساڵی ١٣٨١دا تەواوی کردووە و [مەلا] عەبدورڕەقیب، کوڕی مەلا عەبدوڵڵای بەرواری، ڕاست ٤٥ ساڵی دواتر، واتا مانگی سەفەری ساڵی ١٤٢٦، (١٠ ساڵی پێش) لە چاپی داوە.

٢- بە ڕێنووسی کوردی لە سەر خەتی لاتینی و ئامادەکردنی «سەلمان دلۆڤان»، چاپی پەخشانگای «نەوبەهار»، ئەستەمبووڵ، ساڵی ٢٠١٠ ز.

٣- دیوان و وەرگێڕاوەی ترکی، بە ڕێنووسی کوردی لە سەر خەتی لاتینی، کاری «عوسمان تونچ»، چاپی دامەزراوەی فەرهەنگی و گەشتیاری «باکالگی»، ئانکارا، ساڵی ٢٠١٢ ز.

کورد گوتەنی: «کوێر لە خودا چی دەوێ؟ دوو چاوی ساغ» بۆ تاقیکردنەوەیەک، چاوێکم لەو چوار نوسخە کرد و دوو_سێ غەزەلم لێ بەرامبەر کردنەوە. چی دەبینم؟ لە ورد و درشت، هێندەیان جیاوازی هەیە، تێیاندا گوم دەبم. بە تایبەت نوسخەکەی عوسمان تونچ هەر تەواو فەرقی لەگەڵ باقی زۆرە. ئەی چار چییە؟ ئەمجار چۆن یەکچاو ببمەوە؟ وەبیر خۆم هێناوە: کاری من هەڵەهەڵگرتنەوە لە شیعرەکانی مەلای جزیری، شەرحەکەی مامۆستاهەژارە؛ نەک بەرامبەرکردنەوەی ئەو چەند دیوانە و

دەرهێنانی دیوانێکی جێ متمانەی مەلای جزیری. ئەوجار ئەمن ئێستا دوو نوسخەی عەرەبی و دوو نوسخەی لاتینیم لە بەر دەستە. کە دەزانم ئەو دوو ڕێنووسە، کاتێ کوردییان پێ بنووسین، هەرکام کەم و کووڕی تایبەت بە خۆیان هەیە. کە وا بوو، بڕیارم دا پەل لە ئەستێران نەکوتم؛ دەستم بە کلاوی خۆمەوە بێ و بەم دەستووره بڕۆم:

١- جارێ هەرچیم لە دەقی کتیبەکە، بە قەڵەمی مامۆستا، بردبووە پەراوێز، «هەژار»یکم لە پەنا دانا؛ با لەگەڵ پەراوێزەکانی من تێکەڵ نەبن.

٢- لە کرمانجی باکووردا، «ی» نیشانەی کەسرەی ئیزافە، دەبێتە «ی کراوە» (مَجهول)؛ کە لە ڕێنووسماندا بە نیشانەی «ێ» دەیناسین. وەک: نیوڕستەی «جامی عیشقی پاکی یەزدانی»، بە کرمانجی دەبێتە «جامێ عیشقێ پاکێ یەزدانی». لە چاپی یەکەمدا، ئەو بزوێنە لە زۆربەی زۆری شوێنەکانیاندا دیاریان نییە. لەم چاپە، تا پێم زانیبێ، شوێنی خۆیان دۆزیوەتەوە و دەرکەوتوون.

٣- لە هەرکوێ هەموو نوسخەکان یەکدەنگ، جیاواز لەوی خۆمان بوون، چوومە سەر قسەیان و تەنیا ئەوانەم لە پەراوێزدا ئاماژە پێ کردن کە مانایان بە تێکڕایی گۆڕاوە؛ دەنا بۆ وردەجیاوازییەکان، بە مەرجێ کە لەگەڵ شەرحەکەی مامۆستادا هاتبێتەوە، وەک: «عەرز و حالا موحبەتێ مە ...» بە جێ «عەرز و حالا سوحبەتی مە ...» دامنا و دەنگم دەرنەهێنا!

٤- پێویستە ئاماژە بەوەش بکەم: لە دەیان شوێندا دەبینی کێشی شیعرەکە ئاڵۆزە و هەر چوار نوسخەش لەسەری سوورن! کەچی ئەوی مامۆستا هەژار دایناوە، تەواوە. ئەم خاڵە بەتایبەت لە وەرام و وەڵامەکەی مەلا لەگەڵ فەقێ تەیراندا، بە دە و دوازدەشەوە نەوەستاوە. سوور دیارە مامۆستا خۆی و بە زەوقی خۆی ئەو چەوتییانەی ڕاست کردۆتەوە؛ دیارە بۆ منیش نییە هەر بەوەندەی کە لەگەڵ باقیدا فەرقی هەیە، دیسان لار و خواریان بکەمەوە!

٥- تەرتیبی شیعرەکانم نەشێواندووە و هەر وان کە بوون؛ بێجگە قەسیدەی «پەریشانی مەلا» _کە بە دابی قەدیم، «لا»یان دەخستە پاش «ه» و «و»_ کەوتبووە دواوەی دیوانەکەوە؛

هێنامە شوێنی خۆی کە خوێنەر لێ بزر نەبێ. ئەمجار ٩ شیعرمان هەن کە دواپیتی سەروایان «ث»، «ص»، «ض» و «ط»یە کە لە ڕێنووسی ئەورۆماندا نایاننووسین، دیسان بۆ سەر لێ نەشێوان، لە جێ خۆیان نەمجوولاندوون؛ ئەگەرچی هێناومنە سەر شێوەنووسینی یەکگرتوو؛ بەڵام لە کۆتایی یەکەم باڵی سەرەبەیتیاندا، لە ناو کەوان، وشەکەم بە ئیملا عەرەبییەکەشی نووسیوە. بۆ وێنە لە غەزەلی «ڕەنجی بێوەر»دا، ئاوام کردووە: عومرێ زایع بوو مە بێ دلبەر عەبەس (عَبَث)

٦- لەو چوار دیوانە باسم کردن، شیعرەکان بێ ناون. لەم دیوانەدا هەرشیعرێک ناوێکی هەیە کە دیارە مامۆستا خۆی بۆی داناون. ناوەکان هێندێک باکووری و بڕێک باشوورین.

٧- ئەم کتێبە لە چاو دیوانەکەی سەلمان دلۆڤان _ کە لە باقی تەواوترە _ سەرجەم ٤ غەزەل، ١٤ چوارینە و ٢ تاکەبەیت (فەرد)ی کەمە. بەڵام ئەوەشمان لە بیر بێ کە مامۆستا لەو شیعرانەی لە هەموو دیوانەکانی مەلای جزیریدان، ١٠ شیعری لاوازی خستۆتە پاشکۆوە و بە هی جزیری نازانێ؛ باسێ کە هیچکامی تر خۆیان لێ نەداوە.

وەک تاکەخاڵێک لە سەرینەی وردەکارییەکانی مامۆستا:

مەلا لە چەند شوێنان، بۆ شوبهاندن و نرخاندنی قەد و باڵا و خەت و خاڵ و برۆی یار، ئاماژە بە جواننووسی (خطاطی) و شێوە جۆراوجۆرەکانی خەت دەکا؛ تا ڕادەیەک کە هیچ شاعیریترمان _تا من بزانم_ نەیکردووە. تۆ بێژی بۆخۆشی لەم هونەرەدا دەستێکی بووبێ کە وا بە وردی یەک بە یەکی ئەو خەتانە دەناسێ و بە تایبەتمەندییەکانیان دەزانێ؟ بریا هیچ نەبێ، دوو تاکەبەیت لە شیعرەکانیمان، بە خەتی خۆی، دەس بکەوتایە.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم جار شیعری بەرزی مەلای جزیری و پەخشانی تەرزی مامۆستا هەژار، وەک پێویستە، دەرکەوتێ و خوێنەری تامەزرۆی وێژەی کوردی، وەک ئارەزوویە، چێژەی لێ وەرگرێ و بە دڵییەوە بنیشێ.

براتان: ماجد مەردۆخ ڕۆحانی

سنە، هاوینی ١٣٩٣ (٢٠١٤ ز.)

# پێشەکی

**هاوزمانە ئازیزەکەم!**

خۆت لە من باشتر دەزانی کە ئێمەی کورد، چەند گەلێکی هەژار و هەناسەساردین. چەند لە کاروانی ژیار و شارستانی بەجێماوین؛ ترسێنراوین؛ ڕەتێنراوین؛ بەشخوراوین. وا پتر لە هەزار ساڵە خراوینە ناو چاڵەوە و قەتیس ماوین؛ دەرەتانی ڕزگار بوونمان بۆ نەماوە. داگیرکەران هەردەمەی بە ناوێکەوە، بە ناوی دین، بە بیانووی هاونەژادییەوە، ڕاویان کردوین؛ خواردوویانین؛ بە یەکتر سپاردوویانین؛ کوشتوویانین؛ بە هەزاران دەردیان بردوین. تەنانەت ڕێگە نەدراوین ـ هەتا ژیاوین ـ بە زمانی خۆمان هاوار کەین. ئەو مافە ڕەوایەی کە خوا بۆ بەندەی خۆی ڕەوا دیوە، کوردخۆرانێ کە بە خۆیان گوتووە موسوڵمان و خوداپەرست، بە ناڕەوایان زانیوە! لە ڕۆژیش ئاشکراترە کە قەباڵەی بوون و مانی هەموو گەلان لەم سەرزەمینە، زمانە؛ ئەگەر زمان لە ناو درا، بوون و مانیش لە ناو دەچێ.

ئێستا کە لەم بڕانەوەی چەرخی بیستا، هەوای ئازادی و ڕزگاری هەڵیناوین و هەوڵ دەدەین ئێمەش وەک گەلانی دیکە، خواپێداو بین؛ ناوێکمان لە دنیا هەبێ، چاوەچاوین بە خەباتمان بگەینە بستووی ئاواتمان و خۆمان ڕەگەڵ کاروانی گەلانی ئازاد بخەین. هاوار بکەین: کاکە بەجێمان مەهێڵن! ئێمەش گەلێکین وەک ئێوە و شێوەمان لە خۆتان دەکا؛ با ئێمەیش وەک ئێوە بژین، لێم ڕوونە لێمان دەپرسن: کوا پێناستان؟ تا باوەڕیتان پێ بکەین. نازانم دەبێ چی بڵێین؟ پێناس زمانە؛ فەرهەنگە؛ مێژووی کەونارا و تازەیە؛ وێژە و شیعر و ئەدەبیاتە؛ بە هەموو لک و پۆپییەوە.

بە ناشوکری خودا نەبێ، ئێمەی کڵوڵ و چارەڕەش، تا ئێستا بۆمان نەلواوە زمانە بەستەزمانەکە بە تەواوی لە شوێنێکدا کۆ کەینەوە؛ بێتاریخین. هەرچێ دەربارەی کوردەوە لە تاریخاندا نووسراوە، هیچی بە زمانی کورد نەبووە. ئەمە واتا هەر کوردێکی لە عەرەبی و فارسی و تورکی تێ نەگەیوە، ئاگای لە مێژووی خۆی نییە و ژینامەی ڕابردووەکانی، بە گوێچکە ئاشنا نەبووە.

هەموو چەرخێک، بەسەتان و هەزاران بوێژمان هەبووە؛ بەڵام بە فەرموودەی حاجی قادر «لەبەر بێدەفتەری ون بوون و فانی». ئەگەر تاک و تەرایەکیان لێرەولەوێ بە

سەر زارانەوە ماون و بە یەکجاری نەفەوتاون و دەماودەم بە ئێمە گەیون، تێیان ناگەین. هەولیش نادەین تێبگەین و بزانین ئەو کەلەپوورەی کە بۆ ئێمە بە جێ ماون، چەند بەنرخن.

هەزاران کوردی وا هەیە لە وێژە و مێژووی گەلاندا هێند شارەزان بوونە دەریا. بەلام لەمەڕ ئەدەبیات و فەرهەنگی کورد، تلپاتی تەڕیش شک نابەن! ڕەنگە بلێن جا ئێمە وەکوو خۆت گوتت، داگیرکەر ڕێگەی نەداوە خزمەت بە خۆمان بکەین و پەرە بە زمانەکە بدەین؛ چارمان چییە؟ من عەرزیان دەکەم وا نییە: جوولەکە دوو هەزار سالان دەربەدەر و لانەواز بوون؛ زمان و ئەدەبیاتەکەیان پاراستووە. یا بە گفتی حاجی قادر «ئەرمەنی بە خەتی خواری، ئەوە هیچ کە زمانەکەی پاراستووە، بگرە پەرەشی پێ داوە». دەی ئەوانیش وەکوو ئێمە ـ کە ئێستا لێمان قەوماوە ـ لێقەماو بوون.

جا با ئێستا لە لۆمە و سەرکۆنە گەڕێین. ئەوی چوو، چوو. مردوو بە گریان و شیوەن ناژیتەوە. ئێستا چی بکەین؟ چۆن خۆمان زیندوو کەینەوە؟ دەسا با شنگل لە خۆ دەین. ئەم چەند بەلگە پەرپووتانەی کە پێناسی زیندوویەتی گەلی کوردە، کۆ کەینەوە. هەر خوێندەوارێکی دلسۆز بە پێی توانا، لە سووچێکەوە بۆی بچێ. ئەدەبیاتی کەونارامان، ژینامەی ڕابردووەکانمان، بزانین و بیانکەینە مایەی شانازی. زمانە شیرینەکەمان بە تەواوی بخەینە سەر قاقەزان و لە نەزانی ڕزگارمان بێ.

دەسا وا من بە پێی توانای هەژارانەم، خەریک دەبم دیوانی مەلای جزیری شی کەمەوە و بە کوردییەکی خۆمالیانەی ـ کە ئەمڕۆ لە ناومان باوە ـ شەرح بکەم. گوتم بە گوێرەی توانای خۆم. واتا ئەوەندەی دەیزانم دەریغ ناکەم. چونکە دەزانم جزیری زۆر لەوە بەمایەترە کە هەژارێکی کۆلەوار لە خوێندندا، لەو عیرفانە سووفییانەیە و لەو دلدارییە گەرم و پرشنگدارە، کە لای مەلای جزیری بوو، سەر دەرکا. بۆیە لەبەر خوێندەوارە کوردەکان دەپاڕێمەوە یاریم بدەن خەلەتم بۆ ڕاست کەنەوە و لە هەرکوێدا ڕێم هەلە کرد، بمگەڕێننەوە ڕاستەڕێ. خوا ڕاستە و ڕاستی لێ خۆش دێت.

## کورد و خزمەت بە ئیسلام

ئەگـەر تۆزێـک بـە وردی و پشـوودرێژی، کتێبـە مێژووییـەکانی چـاردە چـەرخی ئیسلامەتی بپشـکین و وەخـوێنین، نووسـەران و بەهونـەران، وێژەوانـان و هۆزانـان، ئەوانەی کە زۆر خزمەتیان بە دینی ئیسلام کردووە و لە ناو هەموو موسوڵمانان نـاو و ناوبانگیان کردووە لە بەر چاوانیان ڕابنێین، سەرنج بدەین کە هەریەک لەو موسوڵمانە زانایانە بە بنیچە لە کـام گـەل بـوون و لـە کـام نیشـتمان گـووراون، ئەوسـا بۆمـان دەردەکەوێ کە بەشی کورد لەم ناوەدا هەتا چەندە و چەندی دەستەچیلەی زانست، خسـتۆتە سـەر ئـەو گـڕ و بڵێسـە پـاک و پـیرۆزەی ئیسـلامەتی. بڕوانینـە هـەر کتێبخانەیەک سەتان کتێب دەربارەی ئیسلامەتییەوە، لە نووسەرانی کوردەوە دێتـە بەرچاو، بە عەرەبی، بە فارسی و تورکی نووسراون و خاوەنەکانیان کورد بـوون و هـەر نەشیانفەرمووە کوردین!

ئیمام موحەممەدی غەززالـی فەرموویـەتی: «دیـنی ئیسـلام لـە سـەر سـێ سـتوون وێستاوە. ئەگەر خودا ئەو سێ کۆڵەکەی نەدابا، لەوانە بـوو تێـک بتـەپێ. ئـەم سـێ دیرگە ئەستوورانەش دینەوەری و ئامێدی و شارەزووری بوون[1]».

کام موسڵمانی خوێنەوار هەیە هەر کوێرەسیوادێکی بێ، ناوی پیاوی بەناوبانگی وەکوو ئیبنوخەلـەکان، ئەبولفیـدا، ئیبنوحاجیـب، ئیبنوسـەلاح، هەرسـێ ئیبنوئەسـیرەکانی بلیمەت و سەتان ئیبن و ئەبووی دیکـەی نەبیسـتبێ کـە کوردبـوون و بـە عـەرەبی نووسیویانە؟ کام دەشتەکی و شوانەوێڵەی نەخوێنـدەوار، لـە هـەموودنیای ئیسـلامدا دەس دەکەوێ کە ناوی ئیبنوسیرینی نەبیستبێ. ئەو کابرایەی داهێنەری خەونامەیە و لە خەون لێکدانـەوەدا هـەتا ئێسـتا هاوتـای نـەبووە. کـێ دەزانـێ ئـەو زیـرەک و بلیمەتەی کە خەونامەی هـەموو ڕۆژێ سـەر بـە هـەموو ماڵـی موسوڵـماندا دەکـا و خەونیان بۆ لێک دەداتەوە، کوڕەکوردە و خەڵکی مەڵبەندی باڵـەکە لـە کوردسـتانی عیراقدا و ئێستاش گوندێک لە جێگەی سیرین ئاوایە و ناوی بەرسیرینی هەیە.

خەڵـەکانی نیشـتمانی مێژوونـووس ئیبنوخەڵـەکان، لـە نێـوان هـەولێر و کۆیـە هەڵکەوتووە.

---

١. هەرسێکیان کوردا!

ئیبنوحاجب ـکە واتا کوڕی پەردەدارـ لە جزیری ئیبنوعومەر ژیاوە و کوڕی پەردەداری میر بووە؛ کە جزیریش مەڵبەندێکە لە کوردستانی سووریە.
پێی ناوێ لەسەری بڕۆم. ئەگەر بە دوورودرێژی، ناوی هەموو ئەو کوردانەی کە لە ڕێی زانست و هونەر، لە درێژایی هەزار و ئەوندە ساڵدا، لە ڕای ئیسلامدا کۆشاون و ناویان تێدا دەرکردووە، بیرخەمەوە، وشتر لە بنیا نرکەی دێ!
هەر دوور نەڕۆین لەم چەند چەرخانەی دواییدا کەسانی وەک مەلا عەبدوڵڵا بێتووشی، ئیبنولحاج و ئەبووبەکری موسەننیف و مەلاجامی و سەتان کوردی وا هەڵکەوتوون، کە بوونەتە مایەی شانازی عەرەب و پێشڕەوی موسڵمانان بوون.
هەر لەم چەرخی بیستەمەدا، سەتان کەسی وەک زەرقلی خێوی کتێوی الاعلام، ئەحمەد شەوقی کە نازناوی ئەمیرولشوعەرای عەرەبزوانانی پێ درا، ڕەسسافی شاعری عەرەب کە کۆتەڵی لە بەغدایە بۆ چەقاوە، مێژوونووس موحەممەد کوردعەلی، عەبباس مەحموود عەققاد کە بە مامۆستای بێ هاوتای وێژەی تازەی عەرەبزمانان ناسراوە، چیرۆک نووسانی بە ناوبانگ لە میسر و دنیای عەرەبدا: مەحموود تەیموور و عایشە تەیموور کە کورد بوون و بوونە جێی شانازی عەرەب و کورد هیچ بەهرەی لێ نەدیون!

**با بزانین بۆچی لەبەر چی؟**

زۆربەی ئەو پیاوە گەورانەی کە باس کران و کران بە نموونەی مشتێک بۆ خەڵوارێک، یان هەر لە ناو عەرەباندا لە دایک بوون و لە ناو عەرەبزماناندا پەروەردە بوون و جیا لە زمانی عارەبی فێری زمانێک نەکراون، یا خۆ خۆیان لە زمانە زگماکەکەیان شاردۆتەوە و بەو زمانەی کە پەرە و ڕەواجی هەبووە، نووسیویانە. نووسراوەکان ـکە زۆر بە نرخ و هێژا بوونـ عەرەبزوان پێی خەنی بوون و کتێبخانەکانی خۆیان پێ ڕەنگاندوون و بە شانازی گوتوویانە ئەو کەسانەی کە ئەوندە خزمەتیان بە زمانەکەمان کردووە، بە عارەبیان دەژمێرین و هەرکەسیش دەڵێ وا نەبوو، تێر ئاوی سارد بخواتەوە!
دوکتور تاها حوسەین ئەو زانا بەناوبانگە کوێرەکەی میسری، لە بیرەوەری

ئەبووعەلی‌سینادا، لە وتارێکا گوتی: «ئەبووعەلی سینا بە عەرەبی نووسیویەتی و ئێمە بە عەرەبی دەزانین؛ جا با ئێرانییەکان هەر هاوار کەن و بڵێن لە خۆمانە».

دە ئۆباڵ بەستووم هەقیانە. زمان پێناسی گەلانە. هەرکەس لە هەر ڕەگەزێک بێ، بەهەر زمانێک باخێوێ یان بنووسێ، دەگەڵ خاوەن زمانەکە بۆتە یەک و ئەشێ بە ڕبەی ئەو بپێوێ. ڕاستت دەوێ کەسانی وا وەک تالان کرابن وایە. بەرهەمەکەی خەڵک دەیبا و منەتیشی لێ نازانن و ناشیناسن و بەهرەی بە بێگانە دەگا و خزمی خۆی هەڵاواردووە.

بۆ نموونە حاجی قادری هەر زیندوو کە دیتوویە حەزرەتی کاک ئەحمەدی شێخ، کتێبی شەرع و وەعزەکەی ــ کە ناوی ناوە *مەکتووبات*ــ بە زمانی فارسی داناوە، ویستوویە بەگژیا بچێ؛ نەیوێراوە. زۆر بە خشکە و دەپەردەدا لە سێ بەیتا گەیاندوویە و فەرموویەتی:

وەک مریشکێک کە بەختی نەیهێنێ بێت و جووچکەی مراوی هەڵبێنێ
هەر بگاتە کەناری جۆگەلەیێک نایەتە شوێنی، بمرێ، جووجەلەیێک
ئەم لە وشکانی ئەو لە ناو ئاوە تێ دەگا «شت» درانی پێ ماوە!

جا ئەگەر حاجی قادری نەمر ئەوندە بۆ کوردی نووسین بە تاسە بووە و بە لایەوە کفر بووە کوردێک بزانێ بنووسێ و بە زمانی کوردی نەنووسێ و تەوس و توانجی تێ گرتوون، ئێمە هەر دەربارەی کەسێک کە وەکوو کاک ئەحمەدی شێخ لە ناو جەرگەی کوردا ژیاوە و بە تەما بووە ئامۆژگاری کوردان بکا و دە قورئان و حەدیسیان بگەیێنێ، کە چی بچێ بە زمانێک بۆیان بنووسێ کە تێ نەگەن! حەق دەدەین بە حاجی قادر؛ نەک دەربارەی هەمووکەس لەو نووسەرانەی کە بە زمانی بێگانە کتێبیان هەیە و بە خۆیان نەگوتووە کوردین. وەک کورد دەڵێ: «پیاو نابێ جوانان بشکێنێ». یان وەک دەڵێن: «با قسەیێکیش بۆ دز بکەین». ئەگەر تۆزێک بە وردی و لەسەرەخۆیی ڕابردووی ئەو پێشینانەمان، تەرزی ژیانیان، باری ڕامیاری و کۆمەڵگای کە ئەوانی تێیا ژیاون، بێنینە بەر چاوی خۆمان، بۆمان ڕۆشن دەبێتەوە کە زۆریش خەتابار نەبوون. هەر کامێک لە ئێمەی ئەمڕۆش وەک ئەوان باین، ناچار بووین وەک ئەوان بکەین.

زۆر لەو نووسەرە گەورانە وا ڕوویداوە دایک و باوکیان لەبەر نەداری و هەژاری یان لە

ترسی دارکاری و بێگاری زۆردار، سیپاڵەشڕەی ناو ماڵیان بە کۆڵیانەوە گرتووە و بەرەو وڵاتی غەریبی، بگرە هاتم! لە وڵاتانی کەس‌نەناس گیرساونەوە. لە ڕێی بژێوی منالیان ڕەنجیان داوە و زۆر بە هەژارانە ژیاون. دیارە منالی ئەوانە فێری زوانی منالانی دەوروبەری خۆیان دەبن. یان منال لە وڵاتی نامۆ پای ناوەتە سەر دنیاوە. دایک و باوک خواخوایانە کوڕەکەیان فێری زوانی ئەوانە بێ کە ئەو کاریان لە لا دەکا و هەوڵ بدا لە بەچکە ئاغا تێ بگەن و تێیان بگا. بۆ نموونە چیرۆکی دوو لەو کوردانە دەگێڕمەوە:

پەیامنێرێکی گوڤاری *ڕوزالسیف*، وت‌ووێژی دەگەڵ عەبباس مەحموود عەققاددا کردبوو. یەکێ لە پرسەکان ئەمە بوو: تۆ لەکام مەڵبەندی میسرا لە دایک بووی؟ عەققاد دەڵێ: کچم من میسری نیم؛ کوردم. باوکم خەڵکی دیاربەکر بوو؛ چەرچی ئاوریشم فرۆش بوو. کەلافە ئاوریشمی دێنا و لە میسر دەیفرۆشتەوە و بەوە دەژیاین. دواجار لە چەرچیگەریەتی وازی هێنا و دەگەڵ دایکم ئێمەشی هێنا قاهێرە و بە یەکجاری نیشتەجێ بووین. خوێندم و پێگەیشتم و بوومە نووسەر بە عەرەبی. کەلافەش چۆنکە لای عەرەب ئوقدەی ناوە، نازناوی خۆم کردە عەققاد.

جارێکی تر، ڕۆژنامەنووسێکی دیکە، ئەو پرسیارەی لە شێخ عەبدولباسیتی عەبدوسسەمەدی قورئان‌خوێنی ناوداری میسری کردبوو؛ کە تۆ لە کام ئەشیرەتی؟ گوتبووی باوکی من کوردێک بوو لە ژیانی ئاوارەییدا هاتبووە شاری قاهێرە و ببووە مجێوری مزگەوت و من لە میسر لە دایک بووم.

جا ئیستا چ خوابەرداره گلەیی لە عەققاد بکەین، بۆچی بە کوردیت نەنووسی؟ یان بە عەبدولباسیت بێژین: کوا موناجاتی بە کوردیت؟

پێویستە لە بیرمان نەچێ، مرۆ وەک فریشتە نییە، کە بژیوی نەبێ و بژی. هەمووکەسێک، ورد و درشت و خاوو گشت، چ کەوتبێتە ناو چالا، یان حەو تەبەقە بالا بێ، نان و ژیانێکی هەر دەوێ؛ بەرگ و پێڵاوی گەرەکە؛ ئاتاجی ئەنوا و بانێکە لە بۆرانی بپارێزێ و شەوانە تێیدا بسرەوێ. هەمووکەس بۆ کەرستەی ژین پێویستە ئەرک بکێشێ و چەند بۆی دەلوێ بۆ خوشیی ژیان بکۆشێت. هونەرمەند هونەری دەرخا و پلە و پایەی خۆی وە سەرخا.

دەسا با لێکی‌دەینەوە: ئەو کوردە خاوەن‌جەوهەرەی دەبەر حوکمی عەرەب و تورک و فارسدا، نووسینی بە زمانەکەی خۆی، نەک هیچ‌کەس پەرەی پێ نەدا، بگرە بە تاوان حەساو بێ! ئەگەر سواری سەری خۆی بێ و لەسەر کوردی نووسین سوور بێ، کێ ئافەرینی لێ دەکا؟ کێ کتێبەکەی لێ دەکڕێ؟ بە چی بژی؟ بە چی جێگەی لە کۆمەڵگادا خۆش بکات؟ دە پێناوی کوردی نووسیندا بیگرن، کێیە لەسەری وە جواب بێت؟ کوردی خزمی؟ ئەوان بۆ خۆیان لە چاڵدان؛ پێویستیان بە خەڵکیی هەیە دەستیان بگرێ.

ڕەنگە ئێستا لەبەر خۆتەوە بپرسی: گەلۆ ئێمەش وەک عەرەب و تورک و فارس، موسڵمانین؛ خاون بڕوا بە قورئانین. بۆچی ئێمە زمانمان لێ قەدەغەیە و ئەو برا موسوڵمانانە بە زمانی خۆیان دەنووسن قەیدی نییە؟! وەرامەکەشت ئەمەیە:

دەستووری ئیسلامی بەڕاست ـکە قورئانەـ دەڵێ: موسڵمانان بران. پێغەمبەری خودا فەرمووی: هەرگیز عەرەب لە ناعەرەب زلتر نییە. «کێ لە گوناه بەپارێزترە، لە لای خودا بەڕێزترە.»[1]

سەلمانی فارسی ناوێک، کەس‌نەناس و ڕووت و پێخواس، کوێلەی زەلامێ جوولەکە، لای پێغەمبەر لە خزمە نزیکەکانی بەڕێزتر بوو؛ فەرمووی سەلمان کەسی منە. لە دوای کۆچی پێغەمبەریش هەتا نزیکەی چل‌ساڵێک، کەس گوێی نەدەدا بە نەژاد، بە خوێن، بە نەجیمی و نانەجیمی؛ هەر لە خوا ترسان مەرج بوو بۆ گەورەیی و قەدر و حورمەت. بەڵام بە هەزار داخەوە، هەر لەو ساوە حوکم کەوتە دەست بەرەی ئەمەوییەکان و پادشایەتی بە کەلەپوور لە ناو ئیسلامدا دامەزرا، برایەتی گەلانی ئیسلام توایەوە و بە ناخی هەردا ڕۆییە خوار. کار بوو بە زۆردار و بێ‌زۆر. هەرکەس، هەر تیرە، هەربەرەی دەستەڵاتی وەدەس کەوت، خۆی و خزم و هاونەژادی بڵند کرد و وەکوو ئاژەڵ لە هاودینە نامۆیەکانی دەڕوانی. خەلیفەکانی ئەمەوی ئەگەر تەرمێکیان بدیبا، دەیانپرسی: کێیە؟ ئەگەر دەیانگوت قورەیشە، هاواریان دەکرد خزمەڕۆ. ئەگەر بیانگوتا عەرەبە، دەیانگوت لە هۆز کەمی کرد. بیانگوتایە عەرەب نییە و موسڵمانە، دەیانگوت ها، ماڵی خوایە دەیدا و دەشی‌سێنێتەوە!

---

١. ... إنَّ اکرَمَکُم عِندالله أتقیکُم سوورەتی حوجورات، ئایەتی ١٣

دراو خۆش بێ و مەلا خۆش بن، درۆ کردن بە زمانی پێغەمبەرەوە و بە بوختان حەدیس هەڵبەستن، لە تۆڵەکە هەرزانتر بوو. گوتیان پێغەمبەر فەرموویە: خوا لە ناو جانەوەراندا، ڕێزی لە بابەئادەم نا. لە زاروزیچی ئادەمدا، هۆزی عەرەبی هەڵبژارد. لە ناو هەموو هۆزی عەرەب، قورەیشی زۆر پەسند کرد و کردییە گەورەی بەرەی مرۆ. گوتیان عەرەب دەگەڵ ناعەرەبدا هاوکوهف نییە. واتا ئەگەر ژنێکی دەشتەکی عەرەب، مێرد بە یەکێ وەکوو ئەبووعەلی سینا بکا، دروست نییە؛ چۆنکە پایەی ژنی عەرەب زۆر لەو پلە بەرزترە. گوتیان پێمێرد لە ناو گۆڕدا، بە عەرەبی مردووی ناعەرەب دەدوێنن؛ جا با مردوو کۆنە ترکێکی بیلمەز بێ. گوتیان لە ڕۆژی قیامەتا هەموو کەسێک دەبێ عەرەبی بزانێ؛ دەنا بە شەق دەری دەکەن. گوتیان و گوتیان و گوتیان ...

کاری خۆ بە زل زانین و نەژادپەرستیی عەرەبی خاوەن دەستەڵات، هەر بەوەندەوە نەوەستا کە بڵێ دەبێ بە عەرەبی فێربن و بەس. گوتیان هەرکەس بڕوای وا بێ دەتوانێ بە زانست و خواپەرستی بگاتە ڕێزی عەرەبان، کافر دەبێ و نێویان لێ دەنێین «شعووبی» و لەسەر ئەو تۆمەتە گەورە بشکوژرێن، بە فێرۆ دەڕۆن.

جا وەختێ حاڵ ئەو حاڵە بێ و دنیا و دینی هەموو کەسێک بە عەرەبی نووسین بەند بێ و بە عەرەبی گوتن بژی و لە قەبر و قیامەتیشماندا، عەرەبی نەزانین، لاڵ بین، چۆن دەکرێ گلەیی بکەین کە فلانکەس بۆچی نەیگوتوە عەرەب نیم. یان فیسارکەس بۆ بە زمانی خۆی نەینووسی؟ جا نەک هەر کورد، بگرە هیندی و فارس و تورک و ئەفغانی و گەلانی تریش ـکە ژێرچەپۆکەی عەرەب بوون ـ خۆیان و زمانەکەیان لە بیر خۆیان بردوەتەوە و بەختەوەریان ئەو کەسە بووە کە بتوانێ خۆی وا بە عەرەب نیشان دا کە بە عەرەبی بزانن.

هیچ نابێ پێمان سەیر بێ کە پیاوێکی زانا و دانای وەک ساحیبی بنی عەبباد ـکە لە چەرخی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە ـ بڵێ ناڕوانمە ئاوێنە چۆنکە بیچمی ئێرانییەکم نیشان‌دەدا؛ بێزم لە خۆم دەبێتەوە. یان شێخ موحەممەدی زاهید کە نازناوی «تاج‌العارفین»ی هەبووە و باپیری ئەو شێخ «حیسامەددین چەلەبی»ە بووە کە مەولانا جەلالەددین لە مەسنەوی پێی هەڵدەڵێ، لە هۆزی گاوانی کورد و لە سەرەتای چەرخی شەشەمیندا ژیاوە، فەرموویەتی: «شەو کورد بووم و هەر کردییە ڕۆژ، بووم بە عەرەب!».

هەوڵ دان بۆ بوونە عەرەب، یان فێربوونی زمانی پاراوی عەرەب ـکە قورئانی سەرینچاوەی دینەکەمان بەو هاتووە ـ ئەوندە کاریگەر بووە، کە یەکجاری خۆمان لە بیر بەرێتەوە و کەس ئاوڕ وە سەر زمان و ڕەچەڵەک و نەریتی نەتەوایەتی نەداتەوە. ئەگەر لە پاش نەمانی عەبباسییەکان و نەژادپەرستانی عەرەب، گەلانی فارس یان تورک یا خۆ موسڵمانانی تر، دەپاڵ عەرەبی فێربووندا، زمانی زگماکی خۆشیان ژیاندۆتەوە، هەر خزمەتیان بە زمانی قورئان کردووە. بەو زمانەی کە عەرەبی نەزانەکان زانیویانە، قورئانیان بۆ تەفسیر کردوون؛ حەدیسیان پێ وەرگێڕاوە. هەڵبەست و پەخشانەکانیان ـبا بە عەرەبیش نەبووبێ ـ هەر باسی خودا ناسین و قورئان بە پیرۆز زانین بووە. کە دیتووشیانە ئیمانیان بە دەکار کردنی زمانیان لە دەست نادەن، هێدی ـهێدی مێژووی نەتەوایەتی خۆیان، ئەدەبیاتی میراتی ڕابردووەکانیان هێناوەتە سەر کاغەز و شناسنامەی سەربەخۆیی نەتەوەی خۆیان ساز داوە و پێی بوونە شت. بەڵام بە ناشوکری ناڵێم ئێمەی کوردی موسوڵمانی بەستەزمانی هەمیشە ماف پێشێل کراو، قەت ئاسمانی ساومان نەدی؛ شەشەکان یان ڕەمەزان بوو، بەشمان هەر ژەمی بێ نان بوو. ئاغاکانمان ئەگەر عەرەب یان تورک یا خۆ فارس بوون، هەرچەند بە دەم گوتویانە: ئێمە برای دینیتان و موسڵمانین و هەموو پەیڕەوی قورئانین، لە ڕاستیدا خواردوویانین. تەنانەت زمانەکەشمان لە لای ئەوان بویتە مایەی گوناهبارییی. کورد هەرگیز لە هیچ کاتێکدا لە ژێر حوکمی ئەو موسڵمانە جوانانە! نەیوێراوە تەفسیری قورئانی خوداش بە زمانی کوردی بنووسێ؛ چ جای باسی ژان و کوانی دەردی ژێردەستەیی و پەستی و داد و هاوار لە دەس برایانی هاودین، بە زمانە خواپێداوەکەی، لە بارەگای خودا ڕانێ. کورد ئەگەر پێی خوێندرابێ، هەرگیز بە زمانی خۆی نەبووە؛ زمانی خەڵکی خوێندووە. ئەگەر جەوهەر و هونەری لە پاڵ خۆیدا شک بردووە، ناچار بووە بە زمانی لە خۆی بێگانە نیشانی دا. ئەو کابرایەی لە بەر حوکمی فارس یان تورک یان گەلێکی دیکەدایە و جگە لە زمانی ئاغاکەی، زمانێ تر ڕەواج و بڕەوی نییە؛ ئەگەر بە تەما بێ بژی و مایەی بژیوی پەیداکا، گەرەک بە زمانی ڕەواج‌دار

ڕمێنێـک بـۆ خـۆی پەیـدا کـا. وا دەبینـین کـە هـەزاران لـە نووسـەر و هونەرمەندانی بەچکەکورد، لە فارسی و تورکی و عەرەبی و تەنانـەت ڕووسـی نووسیندا، خاوەن ناون و لە زمانە زگماکەکەشیان بەش بڕاون!

بەڵێ ئەو داگیرکەرانە موسڵمانە بەدەمانە، ویستوویانە گەلی کوردمان ـکە خـاوەنی کوردستانەـ بتوێننەوە و توانەوەشـی بـە نـەمانی زمانیـەتی؛ تـا بتـوانن کوردسـتانی داگیرکراو بە یەکجارەکی قووتدەن و ماڵخوراو بە کۆی زوخاڵ بێ.

بەلام خواستی خودای گەورە، دەگەڵ ویسـتی ئـەو گەلـە کوردخۆرانـەدا، یـەکتریان نەگرتۆتەوە. لە هەر دەورە و زمانێکدا، لە کوردستان چەند کوردێکی وا هەڵـکەوتوون کە بە زمانە خودا پێداوەکەی خۆیان، بە شیعری ناسک و پاراو، لەبەر خودا پاڕانـەوە و ئاسەواری بایەخداری وەهایان لێ بە جێماوە، کە بـە لافـاوی زۆرداران نـەڕووخاوە و هێندە خۆش و دڵبزوێن بوون، گەلی کورد لە ناو دڵیاندا هەڵـیانگرتووە و سـینە بـە سینە و دەستاودەست، دایک بە ڕۆڵە و باب بە نەوەی خـۆی ئەسـپاردوون. بەڵـگەی مان و نەتوانەوەی زمانەکە لـە نـاو شـیعر و ئاسـەواری ئـەو چەنـد کـوردە بلیمەتـە، گەیشتۆتە دەستی ئێمە و ئێستا زۆر بە شـانازی دەڵـین: ئێمـەش خـاوەنی زمـان و ئەدەبیاتی گەشەدارین و دەتوانین بە خۆمان بێژین: ئێمەش چتین...

یەک لەو پیاوە کەڵەپیاوە بەناوانەی کـە بوونـە هـۆی نەکوژانـەوەی بلێسـەی گـڕی بەتینی زمانمان، شێخ ئەحمەدی جزیری بوو. ئەگەر لە نیوە بـەیتێکیا فەرموویـەتی: «شەوچرای کوردستانم» زۆر دوروستە و هیچ گومانی تێدا نییە.

ئەو شەوچرا تیشکدەرەی کە خودا لە ڕۆژگارێکدا، بۆ گەلی کوردی ناردووە، لـە سـێ لاوە تیشکی داوە و تاریکی لەسەر ڕەواندووین: یەکەمینیان خوداناسینی بەڕاستی؛ کە ناومـان لێ ناوە عیرفان. دووهەمینیان شـیعری تـەڕی دڵـدارانە؛ واتـا: غـەزەل. بەشـی سـێهەم ـهەرچەندە خۆی ئەو نیازەشی نەبووبێـ دەکار هێنانی زمانی خوداپێداوی خۆیەتی کـە کوردییە و زمانەکەی بە شیعری ناسک و دلگر بۆ هەڵگرتین.

چۆنە لە ناو هەزاران و هەزاران کوردی خوێندەوار، کە هامدەوری جزیری بوون، ئـەو پیاوە بڕیاری داوە هەڵبەستی بە کوردی بلێ و بەڵگەی هەرگیز نەمردنی لە ناو دڵـی هەموو کوردی خوا پەرستا، کە بیناسن، تۆمار بکا؟

وەرامەکەی زۆر هاسانە: مەلا لە قورئان و حەدیس شارەزای بێ هاوتا بووە. زانیویەتی خودای گەورە هەر وەک دە عەرەبی دەگا، لەو زمانە کوردییەش دەگا، کە خۆی بە بەندەی بەخشیوە. ڕاز و نیاز دەگەڵ خوادا، بە هەر شێوە و زمانێک بێ فەرقی نییە.
مەلا لە پلەی عیرفاندا گەیشتۆتە چلەپۆپە؛ دەگەڵ خودا تێکەڵ بووە و بە فەرموودەی ئەولیایان، گەیوەتە وەحدەتولوجوود. عارف کە گەییە ئەو پایە، ئیتر دنیا و قیامەت و خۆشی و ناخۆشی و هەژاری و ساماندارى، لای ئەو نرخی پووشەکایەکی نامێنێ؛ لە هەر چییەکی ڕادەمێنێ، خودای تێدا بەدی دەکا. وەکو حافز پێمان دەڵێ:

لە مەیخانەی مەجووسان ڕۆشنی خوا هاتە بەرچاوم

دە بڕوانە چتۆ تیشکێ لە کوێدا خۆی نیشانداوم[1]

مەلا لە شێعرێکیا دەڵێ:

مینن‌ەت ژ خودایێ کو ب عەبدێ خۆ مەلایێ

ئیکسیرێ غەمێ عیشقێ نە دینار و درەم دا

کەسێ کە سوپاسی خوا دەکا لە جێگەی دینار و درەم، ئیسکیری ئەوینی هەیە، کێ دەتوانێ حوکمی لێ بکا وا هەستە یان وا دانیشە؟
دەبا بزانین ئەو ئەوینە پاک و بە نرخ و هێژایەی یەکسەرە یا دووسەرە بوو؟ واتا ئەوینی خودا بوو؟ یان دڵداریی کیژێکی خەڵکی دنیابوو؟ یان هەردوولا؟ ئەو کەسانەی لە عیرفان زۆر شارەزابوون و لە هەرچی سەرزەمینیی بێ تەکیونەوە و سەرتاپا هەر بۆ خودا بوون، لایان وایە ئەو ڕێبوارەی کە ئەم ڕێگە دژوارە دەگرێتە بەرێ، دەبێ خۆی بۆ ئامادە بکات. دەبێ دڵی بە ئەوینی مەجازییەوە خەریک بکا تا وا نەرم و ناسک ببێ، کە بتوانێ سۆزی ئەوینی خوداییش وەخۆ بگرێ.
مەولانای ڕوومی فەرموویە: سۆفی کە عیشقی مەجازی نەچێشتبێ، گایەکی مێزەر بەسەرە!
جامی دەڵێ: لاوێک داوای لە پیاوێکی خودایی کرد لە عیرفاندا مامۆستای بێ. لێی پرسی هەرگیز گیرۆدەی داوی ئەوینی جوانان بووی؟ گوتی نەخێر. گوتی بڕۆ ببە ئاشق؛ ئەوسا وەرە تا بە شاگردیت وەرگرم.

---

١- در خرابات مُغان نور خدا می‌بینم      این عجب بین که چه نوری زِ کُجا می‌بینم

مەلای ئێمەش ــ کە بێ گومان لە عیرفاندا مەلا جامی و مەولانای ڕوومی بەلخیشی پێ ڕاناگەن ــ لەو فێرگە سەرەتاییەوە ملی لەو سەفەرە ناوە. دڵی داوە بە کیژەکوردێکی نازدار کە خوای گەورە هەرچی جوانی و هەرچی نیشانەی سەنعەتی بێچوون و وێنەی خۆیەتی، بەوی داوە. کوورەی ئەوینی مەجازی دڵی مەلای قاڵ کردووە و خشت و خاڵی سووتاندووە و دووبارە دایڕشتۆتەوە؛ تا بە پاکی و بەوپەڕی ئامادەییەوە بچێ بەپیر ئەوینی خودای تاکەوە و لەو کرەوە کرگاری بێتە بەرچاوان و لەو جۆگەوە پێ هەڵگەڕێ تا دەگاتەوە بناوان و لە سۆنگەی دڵۆپەئاوێک، دەریا بە چاوان ببینێ. ئەوسا بۆ هەتا هەتایە تێکەڵ بە دەریا بێتەوە و بەرەو بەژ نەگەڕێتەوە.

ئێستا بۆمان دەردەکەوێ کە بۆ مەلا هەستی گەرمی دەروونی خۆی بە کوردی بۆ هۆندووینەوە. هیچ‌گا چاوی لەوە نەبووە ڕێز و قەدری لە سایەی نووسینەکانی لە لای خەڵک بۆ پەیدا بێ. ماڵی دنیا و ئافەریم و بارەقەڵڵای خەڵکیی لە لای ئەو هیچ نرخی نەبووە. لە ڕێزی ئەو کەسانە بووە کە دەڵێن مانای ئایەتی «هەردووک سۆلەکەت فڕێدە!»[1] ــ کە خوا بە مووسای فەرمووە ــ واتا دنیا و قیامەتیشت لە بیر بچێ. نە بۆ بەهەشت چوون خواناس بە، نە لە ترسی جەهەندەمێ، نە بۆ قەدر و ڕێز لە ژیاندا. ئەو ئەوینداری خودایە و خواش لە کوردییەکەی تێدەگا! بە ڕواڵەتیش ئەوینداری کیژەکوردێکی جوان‌چاکە کە سەنعەتی یاری گەورەی لە ڕوخساری ئەودا دیوە و پێی هەڵدەڵێ. بە کیژەکورددا هەڵدانیش خۆ ناشێ بە کوردی نەبێ. دەبێ هیچ نەبێ بە خەیاڵ لە لای وا بێ ئەگەر یارە دنیاییەکەی ناڵەی دڵی ئەو ببیسێ، کەمێک لە زۆرێک تێبگا. بۆیەش دەڵێم یاری دنیای بە ڕواڵەتی، چونکە سەرلەبەر دیوانی شیعری مەلا بپشکنی، هەموو شیعر و هەڵبەستێکی، هەم غەزەلە هەم عیرفانە. وەهای ئەم دووە لێکداوە کە نازانی مەبەستی سەرەکی کامە. واتا ئەوینی مەجازی وا بۆتە عیشقی حەقیقی، کە هەرگیز لێک هاوێر نابن. لە مەنزڵگای وەحدەتولوجوودیشیدا، خودای لە تیشکی ڕوخساری ئەو کیژە کوردەدا دیوە. دەیسا با مەلا بناسین:

---

١. إني أنا ربُّکَ فَأخلَع نَعلَیک إنّکَ بِالوادِ المُقدّسِ طوی سوورەتی تاها، ئایەتی ١٢

# مەلای جزیری
## عارف و شاعیری پایەبەرزی کورد

چەندین چەرخە ناوی ئەو خواناسە گەورە و شیعرەکانی، لە چوارقوڕنەی کوردستاندا، بە سەر دەم و زارانەوە؛ شەوانی هەینی لە مزگەوت، لە کۆبوونەوەی دەروێشان، لە تەکیەکان، لە بەزمی مەولوودنامەدا، شیعری مەلا گوڵی سەرسەلەی جڤاتە.

هەموو کوردێکی خوێندەواری خوداپەرست، ناوی ئەو پیاوە خواناسەی لە دڵدا جێ کردۆتەوە. بەڵام تا ئەم ئاخر و ئۆخریانەش کەس ئاوڕی وە سەر ژینامەی ئەو شێخە نەداوەتەوە. لە سەرەتای ئەم چەرخەوە جاروبارە لێرە و لەوێ، چەند کەسێک بۆی تێکۆشاون کە بیناسن و بزانن کەنگێ ژیاوە و چۆن ژیاوە. جا چۆنکە زۆر درەنگ بۆی چوون، ژینامەی ئەو پیاوە گەورە هێند ئاڵۆز و پڕگرێ و گرفنچک بووە، کە زۆری زانایی دەوێ تا باش بۆمان ئاشکرا بێ مەلا کەی ژیاوە و چۆن ژیاوە و کەی هاتۆتە سەر دنیاوە و کەی کۆچی دوایی کردووە.

بەگشتی ئەو نووسەرانەی کە دەربارەی مەلا دواون، لەسەر ئەمەندە پێک هاتوون کە ناوی «شێخ ئەحمەد» بووە و خەڵکی جزیروبۆتانە؛ کە شارێکە لە کوردستانی تورکیا و کەوتۆتە بن چیای جوودی. ئەو جوودییەی کە گەمیەی نووح پێغەمبەری لێ گیرساوە و ناوەکەی لە قورئاندایە.

لەسەر ئەمەندەش پێک هاتوون کە نازناوی لە شیعردا جار_جار «**مەلا**»، جار_جار «**مەلێ**» و هێندێک جاریش «**نیشانی**» بووە. مەلا و مەلێ‌کەی ئاشکران؛ کە بە مانای زانا لە عیلمی عەرەبین. بۆ نیشانییەکەشی دەڵێن: نیشان یان ئامانجی تیرە؛ کە مەلا نیازی وا بووە بە تیری ئەوین پێکراوە. یان مەبەستی خاڵی سەر گۆنای یار بووە؛ کە کرمانجان بە خاڵ دەڵێن نیشان. واتا خۆی بەو خاڵەوە ناو ناوە کە لە ڕوومەتی سەلماوە دیاری داوە. ئیتر لەسەر دیاری دانی دەورانی ژیانی مەلا و هاتنە دنیا و کۆچ کردنی، زۆریان قسە تێک‌گیراوە و لەسەر زۆر شت پێک نەهاتوون.

ئەوا ئێمە هەرچی مێژوونووسەکانی خۆیی و نامۆ لەو بارەوە نووسیویانە، بۆ ئێوەی دەگێڕینەوە؛ بیر و بڕوای هەژارانەی خۆشمانتان لەبەر دادەنێین. بە هومێدم کە

ئێوەی خوێندەواری ژیر، بتوانن ژینامەی مەلا لەو ناوەدا ڕوون کەنەوە.

مامۆستا عەلائەددینی سەجادی ـخوا دەس بە عومرییەوە بگرێـ لە *مێژووی ئەدەبی کوردی*دا، زۆربەی بڕوای جۆربەجۆری مێژوونووسانی پێشە خۆی تۆمار دەکا؛ کە بۆتانی ڕادەگوێزم:

لە ژێر ناوی جزیریدا مامۆستا عەلائەددین، ژمارەی ١٤٠٧-١٤٨١ی داناوە کە وادیارە لای وابووە، لە چەرخی پازدەی میلادی، مەلا ژیاوە؛ واتا بەو حەسابە دەبێ تەمەنی حەفتا و چوار ساڵ ڕابردبێ، جا مردبێ. ئەم جار هاتووە زۆر ڕەنگین و سەنگینانە، پێشەکییەکی دەربارەی مەلا نووسیوە کە لە ڕاستیدا زۆر جوانە و لە پاش ئەو پێشەکییە دەڵێ: «بولبولی سەرچڵی ئەم داستانە، ناوی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ موحەممەدە؛ لە جزیرا بۆتان (گزرتادوقردو) هاتۆتە دنیاوە و هەر لەو شارەش مردووە». بەڵام هەرچەندە ـوەک گوتمانـ ساڵی بوون و نەمانەکەی بە ژمارە لە بن ناوەکەی نووسیوە، کەچی هەر لەم باسەی خۆیدا، خودی ئوستاد عەلائەددین پێمان دەڵێ: «لاپەڕەی مێژووی ژیانی شێخ ئەحمەدی جزیری زۆر تاریکە. تۆژینەوە و وردبوونەوەی زۆر و زانایانەی دەوێ. دەسا وا من بۆ گەیشتن بە ئامانجێک، هەرچی دەربارەی ژیانی شێخ ئەحمەدەوە نووسراوە، لە کتێبە مێژووەکەی خۆمدا کۆم کردەوە؛ لام وایە ڕەنگ بێ ئەوساکە مێژووی ئەو پیاوە هێژایە تۆزێک باشتر ڕوون بێتەوە.»

دوکتوور بلەچ شێرکۆ[1] لە کتێبی «*القضیّة الکُردیّة*»دا دەڵێ: «مەلای جزیری ناوی شێخ ئەحمەد و خەڵکی بۆتانە. لە ساڵی ١١٦٠ی میلادیدا لە شاری جەزیر و بۆتان مردووە؛ شیعری زۆری لە غەزەل و ئیلاهییات و عیرفاندا هەیە.»

مامۆستا ئەمین زەکی بەگ ـبە ڕەحمەت بێـ لە هەردوو کتێبەکەیدا واتا «*مێژووی کورد و کوردستان*» و مێژووی خاوەنناوانی کورد «*مشاهیر الاکراد*»دا دەڵێ: «مەلای جزیری ناوی شێخ ئەحمەدە، لە دوانیمەی سەدەی شەشەمی کۆچیدا، لە ڕۆژگاری دەستەڵاتی عیمادەددین ـکە فەرمانڕەوای مووسڵ بووەـ ژیاوە. دیوانی شیعرەکانی خۆی بۆ فەرمانڕەوای تەورێزێ ـکە ناوی، خانی خانان بووەـ بە دیاری و پێشکەش

---

[1] . بلەچ شێرکۆ، ناوی نهێنی خوا لێ خۆشبوو «جەلادەت عالی بەدرخان»ە.

ناردووه.» كه چی هەر ئەو مێژوونووسەش له شوێنێكیتر فەرموویه: «مەلا كەوتۆتە دوای جامی. واتا له پاش مەرگی مەولانا عەبدورڕەحمانی جامی، مەلا ژیاوه.» كه ئەم ڕیوایەتانه هەرگیز یەكتر ناگرنەوه؛ چونكه جامی له چەرخی نۆهەمی كۆچی ژیاوه.

مامۆستا موحەممەد عەلی عەونی ڕەحمەتی ـكه ناودارانی كوردی ئەمین زەكی بەگی به عەرەبی وەرگێڕاوەـ دەربارەی ژیانی مەلاوه چەند پەراوێزێكی هەیه. له یەكێكدا وای نووسیوه: «ئەو شێعرانەی كه له دیوانی جزیری ناوی سەعدی و حافز و جامی تێدایه، هیچیان شیعری جزیری نین؛ ئاوەكین و لاوەكی؛ هەروا سەربەخۆ ڕەگەڵ دیوانیان خستووه.

مامۆستای ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس، ئۆگست ژابا له كتێبه ناودارەكەیدا ـكه به ناوی *حیكایاتی كوردە*ـ دەربارەی جزیری ئێژێ: «مەلا خەڵكی جزیری ئیبنوعومەره، له دەورانی عیمادەددینی زەنگیدا، واتا له نێوان سالانی ٥٤٠-٥٥٦دا ژیاوه.»

مامۆستا عەلائەددین له یەكەم چاپی مێژووی ئەدەبی كوردیدا، له ڕووپەر ١٦١، بایداوەتەوه سەر باسی مامۆستا عەونی و فەرموویه: «بەر لەوه باسی ژینامەی مەلای جزیری تەواو بكەم، چەند بەیتێكی گرانی مەلای جزیریم ـكه خۆم مانام نەدەزانین ـ نارده میسرێ بۆ لای مامۆستا موحەممەد عەلی عەونی كه بۆمیان لێك بداتەوه و به پەله بیانێرێتەوه. مالم هەقە زۆر پیاوەتی دەگەڵ كردم. ڕۆژی ٩٥١/٥/٤ وەرامەكەم بۆ هاتەوه. جیا له مانای شیعرەكان، دەربارەی ژیانی مەلاش شتێكی نوێی بۆ نووسیبووم و فەرمووبووی: دەمێك ساله هەر خەریكم كه دەربارەی ئەو شیعرانەی له دیوانی جزیریدا و ناوی سەعدی و حافز و جامی دەهێنێ دەتۆژمەوه. داخۆ ڕاست هەر هی مەلا بوون یاخۆ به ناوی ئەوەوه خراونه ناو دیوانەوه؟ تا خواوڕاستان، لەم ئاخرـ ئۆخریانەدا، چاوم به دسخەتێك كەوت كه له سالی ١٣٢٢ كۆچیدا نووسیویانه و له كوردستانی جەنووبی ماوەتەوه. له پێشەكی ئەو دەسخەته ژینامەی مەلا نووسراوه. تیا دەلێ: «شاعیری بەڕێز جزیری، هاوزەمانی سولتان موحەممەد فاتیحی عوسمانی بوو.» كه وا بوو ئەبێ جزیری، له پیاوه ناودارەكانی سەدەی نۆهەمی كۆچی بێت. ئیتر گومانم نەماوه ئەو شیعرانەی كه تیاندا ناوی سەعدی و حافز و جامی هێناوه، هی مەلایه و لاوەكی و دەسەرخراو نین.»

دیسان ماموستا سەجادی لەسەر ئەم باسەی خۆی دەڕوا و دەڵێ: «ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی فۆن هارتمان ساڵی ١٩٠٤ی میلادی، دیوانی مەلای جزیری کە لە برلین لە چاپ داوە و بە خەیاڵیش وێنەیەکی سیمای جزیری کێشاوە و خستوویەتە سەر بەرگەکەی، ئەویش دەربارەی ژیانی مەلا هەروەک ژابای لێ زانیوە.» سەجادی لە پاش ئەو هەموو باس‌وخواسە هەمە جۆرە بۆر و زۆرەی ڕایگوێزاوە، ئەمجا بۆ خۆی بیروڕای خۆیمان پێ دەڵێ و فەرموویەتی: «مەلا لە ناو قەسیدەیەکدا بەیتێکی هەس، بەم جۆرەیە:

گەر لوءلوئی «مَنثور» ژ نەزمێ تە دخوازی

وەر شیعری مەلێ بین تە بە شیرازێ چ حاجەت؟

گەلۆ! نیازی لە شیرازی، سەعدی بووە یا نە حافز؟ حافز ساڵی ١٣٩١ی میلادی بە ڕەحمەتی خودا چووە. ئەگەر مەبەستیش سەعدییە ئەویش خەڵکی سێزدەهەم سەدەی میلادە. کە وا بوو ئەو ڕیوایەتەی کە گوتوویە مەلا لە چەرخی دوازدەهەمی میلادا لە دنیا دەرچووە، پووچ دەردەچێ. لە لایەکی تریشەوە وا دەزانین کە مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی ساڵی ٨٧٧ی کۆچی (١٤٧٢ی میلادی) لە کوردستان ڕابردووە و لە هەولێرەوە ڕەد بووە و بۆ حەج چووە. لە باسی سەفەرەکەیدا، لە شوێنێکدا فەرموویەتی: «لە جەزیر چوومە دیاری پیاوێ پیر. نیوەپیاوێکی دیش هەبوو لە جەزیر.» وا دیارە پیرەمێردەکە مەلای جزیری بووبێ و لەو کاتەشدا، عەلی حەریری لە تافی جوانیدا بووە، بۆیە بە نیوەپیاوی ناو دەبا و دەبێ جامی ئەو دوو کەسەی بە کەیفێ بووبێ، بۆیە باسی کردوون. خۆ دیاریشە تا پیاو لە تەمەنی شێست ساڵانە تێ نەپەڕێ بە پیرەمێرد ناوی نابەن. کە وا بێ دەبێ دەوروبەری ساڵی ٨٢٠ی کۆچی پێی نابێتە سەر دنیاوە. یان تۆزێ کەمتر یان زیاتر.»

خۆ ئەگەر ئەمین زەکی بەگ، بەڵگەی ژیانی جزیری، لە چەرخی شەشەمی کۆچی، دوو بەیتی ناو دیوانەکەس کە بە خەیاڵ لای وایە دۆزیویەتەوە و بێ‌گومانە، ئێمە دەڵێین: نەیپێکاوە و لەم دووبەیتەی نەزانیوە. با بزانین چۆن؟!

مەلا لە شوێنێکا فەرموویە:

ئەی شەهەنشاهی موعەززەم حەق نیگەهداریٚ تە بیٚ

سووورەیێ «انّا فَتَحنا» دەوٚر مـاداریٚ تـە بیٚ

لە شوێنێکی تریشا، لە سەرەتای قەسیدەیەکا دەڵێ:

خانیٚخانان لامیعیٚ نەجما تە هەر پورنوور بیٚ

کەشتیا بەختیٚ تە ئەز بایێ موخالیف دوور بیٚ

ئەمین زەکی پێ دادەگرێ کە ئەم شەهەنشا زەبەلاحە و ئەو خانیخانانە، لە زەمانی دەستەڵاتی ئەتابیک عیماددین زەنگی‌دایە؛ کە فەرمانڕەوای مووسڵ بووە، لە تەوریز حوکمی کردووە. مەلا ئەو بەیتانەی خۆی دەگەڵ دوو قەسیدەکەدا بۆ خانی خانان ناردووە. ئەتابیک عیمادەدینیش لە چەرخی شەشەمی کۆچی ژیاوە. کە وا بوو مەلای جزیریش دەبێ خەڵکی ئەو چەرخە بێ.

مامۆستا ئەمین زەکی‌بەگ، هیچ بۆی ڕوون نەکردوینەوە ئەو خانی خانانە کێ‌بووە؟ کەی لە تەوریز بەو ناوە حاکمێک هەبووە؟ مەلا کاری بە خانەکەی تەوریز چ بووە تا بە شیعر باسی بکا؟ ئەم جار ئەم واتەی شاهەنشاهە هەر بۆ شێرە کوللەی خەڵکی ئێران بویتە نازناو، هەرگیز خانی والی تەوریز نەیویٚراوە بەو ناوەوە خۆی نیشان دا. ئێمە دەبێ بۆ ناوی خان لە تورکیا پتر بڕوانین تا ئێران. بۆ نموونە بۆچی نابێ مەبەستی مەلا لەو خانە، سولتان موحەممەد خانی فاتح بێ کە لە ساڵی ٨٥٥ ڕا تا ٨٨٦ سولتانی ئەستەنبووڵ بووە و ناوی خەلیفەی ئیسلامی لە خۆ ناوە؟ یان بۆچ سولتان بایەزید خانی دووهەم نەبێ کە ٨٨٦ چۆتە سەر تەختی پاشایی و تا ٩١٢ی کۆچی ماوەتەوە؟ ئەگەر هەر بشڵێن شاهەنشا مەبەست حاکمی ئێرانە، خانی تەوریز ئەو ناوەی لێ ناوەشێتەوە. بۆچی نەڵێین مەبەستی مەلا لەو ناوە، سولتان حوسەین بایقرایە کە لە تەیمووریەکان بووە و لە چەرخی ٩ تا سەرەتای چەرخی دەیەم بە سەر ئێرانڕا گەیشتووە؟»

جا وەک مامۆستا سەجادی لەم بۆچی و چ دەبوویانەی هەڵدەکرێنێ، وا دەنوێنێ کە دەبێ بە هەموو بەڵگان، جزیری لە چەرخی نۆهەم لە ساڵانی نزیک ٨١١دا هاتبێتە ناو ژیانەوە و لە دەوری ٨٨٦دا بە ڕەحمەتی خوا شاد بووبێت. ئەمجار مامۆستای

سەجادی بۆ پووچاندنەوەی ئەو قسەی کە وتراوە مەلا لـە چـەرخی شەشـەمدا بـاوی بووە و هەر لەو چەرخەدا مردووە، بەڵگەیەکی تری هەیە کە بە ڕاستی جێ سەرنجە. دەڵێ:

«ئەگەر چاوێک بە کتێب و پەڕاوەکانی دەورانی پێش موغولاندا بخشێنین، لـە هـیچ شوێنێک تووشی وشەی مەلا نابین. پیـاوە گـەورەکانی دیـنی و هۆزانـەکانی ئـاینی، نازنـاوی خواجـەیان هـەبووە یـان پێیـان گوتـوون مـەولانا. موغولـەکان کـە وڵاتی موسڵمانانیان گرتووە و خۆیان بوونە هەمەکارە، بە پیاوی زانا و ڕێبەری دینی خۆیـان گوتووە «لاما». دیارە هەمیشە ژێردەستان دەیانەوێ لە هەموو شـت لاسـای خـاوەن دەستەڵاتان بکەنەوە. ئەوانیش بە خواجـەی خۆیـان گوتـووە لامـا. وردە_ وردە دوو پارچەکەی ئەم وشەیە جێگەیان گۆڕیوەتـەوە و لامـا لێمـان بۆتـە مـالا و مایەکـەش هەڵقرچێنراوە و «مەلا»کەی لێ ساز دراوە. جا ئەگەر لـە پـاش موغـولان، هێنـدێک کۆلکە خوێندەواری غەیرە عەرەب، پینەیان پێدا گرتـووە و گوتویانـە نـاوی مـەلا لـە «مِلء»ی عەرەبانەوە پەیدا بووە؛ کە واتا پڕ. یانێ ئەگەر گوتیان مەلا، وەک پێی بڵێن پڕ لە عیلم و دارماڵ لە زانستی وایە، بە هەڵە چوون؛ چونکە عەرەب بە زانیاران نالـێ مەلا. ناوی موللا لە ناو عەرەباندا هەیە، بـە مامۆسـتای قوتابخانـەی منـاڵانی جزمـی عەممەخوێن دەڵێن و تۆزێک گاڵتە پێ کردنیشی تێدایە.»

سەجادی لە دوای ئـەم باسـەش لەسـەر وتـار دەڕوا و دەڵـێ: «بـۆ ڕوون بوونـەوەی ژینامەی مەلا زۆرم حەوڵ و تەقەلا دا؛ لـە هـەموو کەسـم دەپرسـی. لـە هەرکـەس هەرچییـەکم دەبیسـت دەمنووسـییەوە. لـەم پرسـیار و تێکۆشـانە زۆرانەمـدا دەسنووسێکی دیوانی مەلای جزیریم وە دەس کەوت کە لە ساڵـی ١٣٣٨ی کۆچێـدا پیاوێ وە ناو عەبدولقادیری ئامێدی نووسیویەتی و لـە پێشـەکی دیوانەکـە ژینامـەی مەلای جزیری بەم جۆرەیدا دێ، نووسیوە:

«جزیری ناوی ئەحمەدە و فەرزەندی شێخ موحەممەدە. ساڵی ١٤٠٧ی مـیلادی لـە شاری جزیری بۆتان، لە ناو بنەماڵەیەکی هۆزی بوختی، چاوی بە ژیان هەڵێناوە. باب و باپیرانی مەلا هەموو شێخی سەر بەرماڵ بـوون و سـەر بـە شـێوەی نەخشـبەندی. ئەحمەد _کە بێچوە مەلا بووە_ بە منداڵی لە لای باوکی خۆی خوێندووە. بە لاوەتی

ـوەک هەموو فەقێلەی دیکەی کوردەواری ـ بەرەو خوێندن دەرکەوتووە و گەلێک شار و دێ گەڕاوە و لە زۆر سەرچاوەی جۆربەجۆر، پاراو بووە و تەمەنی سی و دوو ساڵ بووە کە لای مەلا تەها ناوێک، لە فێرگەی گوندی «ستورباس» ئیجازەنامەی وەرگرتووە و لە گوندێک بە ناوی «سەربا» ـکە نزیکی دیاربەکرە ـ دامەزراوە و بۆتە دەرس‌بێژی دینی. لەوێشەوە چۆتە مەڵبەندی «حەسەنکێف» و لەوێش دەرسی گوتووتەوە و زۆری مەلای پایەبەرز پێ گەیاندوون. لە نەکاوێک تیری ئەوینی خودایی دڵ و دەروونی پێکاوە و قودرەتی خوا لە چاوی کچە کوردێکدا خۆی نیشانی مەلا داوە و لەو سایەوە بۆتە عارفێکی دڵدار، یان دڵدارێکی خوداناس و سەرەنجامی ئەو ئەوینە دڵتەزێن و پڕ لە تینە، کارێکی بە سەر هێناوە کە خۆی و دنیا و قیامەتی وە لا ناوە و دەستی لە تەدریس بەرداوە و هەر بە هەڵوەدایی ژیاوە. تا لە ساڵی ١٤٨١ی میلادیدا ـکە حەفتا و چوار ساڵ ژیاوە ـ بەرەو ژیانی بێ‌خەزانی دنیای هەرمان بارگەی سەفەری تێکناوە و لەشاری جەزیر نێژراوە و هەتا ئێستاش گۆڕی پڕ لە نووری مەلا، جێ زیارەتی حەشاماتە و لە لایەن دڵدارانەوە، لەسەر قەبری گوڵبارانە.»

سەجادی پاش ڕاگوێزانی ئەو ژینامە هەمەجۆرە و لێک جیاواز و سەرەولێژ و پڕ لە کوست و هەورازانە، کە خۆشی پێمان دەفەرموێ زۆر چەتوونە قسەی ڕاست و بێ گرێمان لەو ژینامانە دەسکەوێ، لە نەکاو با دەداتەوە و سەروسیما و بیچم و کەسمی مەلای جزیری باس دەکا و فەرموویەتی:

«دەم‌وچاوی سپی و سوور بوو؛ قەد زراو بوو؛ چاوی گەشی هەر پرشنگی بەرێ دەکرد؛ برۆی ڕەش و کەوانی بوو؛ توێڵی تەسک و ڕوومەتێکی پان و پۆڕ و ڕیشێکی سپی و تەنک و خشپیلانە و کەپۆیێکی کورتی هەبوو. ڕانک و چۆخەی دەبەر دەکرد. ڕیشووی جوانی لە مێزەرەکەی هەڵدەبەست. هەتا بڵێی مەشرەف خۆش و قسەخۆش بوو. هەمووکەسێک خۆشی دەویست. لە دواڕۆژانی پیریشدا کەوای شۆری دەبەردا بوو؛ زۆریشی لێ دەوەشاوە. هەردەگەڕی و قەلەندەریی ببوە خۆی و نەیدەکرا دەستی لێ بەردا.»!

کەسیش نەبوو لەو دەمەدا بە کاکە سەجادی بێژێ: ئەرێ قوربان! تۆیەک کە ئێستاش نەتزانی ئەو شاعیرە لە چەرخی شەشەمدا ژیاوە یان لە سەدەی نۆیەمیندا،

چۆنت زانی ڕەنگی ڕانک و چۆغەکانی و ڕیشووی بادراوی شەدەکەی وا باس بکەی؟!
ئەو باسەی کە تۆ لێی دەکەی، وا دەردەخا کە هەزار جار شەڕە کەوچکتان کردبێ و
لە ناو حوجرەی فەقێکاندا لە پەنا یەکتر نووستبن و لەسەر بەشە نان و دۆیەک بەگژ
یەکتریدا چووبن و ئاشت بووبنەوە.
ئیتر مامۆستا سەجادی لە پاش ئەو وردە کاریانە! چەند چیرۆکی گوێ ئاگردانی
لادێشمان لەو بارەوە بۆ باس دەکا، کە ئەمانەن:
«مەلا تەمەنی سی ساڵ بوو - واتا دوو ساڵ بەر لە خوێندن تەواو کردن- لە دێی
«دێرهان» لە نزیک قەڵای «حەسەنکێف» دەچێتە سەر زەماوەندی ئیجازەنامەی
فەقێیەک. کیژ و لاوانی ئەو ناوەش هاتوونە وێ کە لەو دیلان و بەزمەدا بە سەیرانەوە
هاوبەش بن. سەلما ناوێک کیژی حاکمی حەسەنکێف ـکە ناوی مەلیک کامیل بوو-
دەگەڵ دەستەخۆشکانی خۆی هاتبوونە سەیری ئەو بەزم و ئاهەنگە. مەلا کە سەلما
دەبینێ، بە یەکجاری هەرچی چەند ساڵ و زەمانە فێری بووە، لە دەست ئەدا.
بەزەیی خودای بێ هاوتا لە سیلەی چاوی سەلماوە دڵی مەلا بۆ خۆی دەبا و
یەکجارەکی لە بوون و نەبوونی دەکا. لە باری ئەوینداریدا، قەیسە شێتەکەی عامیری
و پیری سەنعان دەسک و گوڵیان لەدوو دەکرد. زیکر و فیکری شەو و ڕۆژی، هەر بیر
لە سەلما کردن و هەر ناوی سەلما بردن بوو. لە سایەی عیشقی مەلاوە ناوی سەلما
کەوتە سەر هەموو زمانان و لە هەموو دەر و کۆڵانان، باس هەر باسی چاوی سەلما و
تاووتینی دڵی مەلای دڵداری بوو. ئەم باسە گەیشتەوە میر؛ زۆر دڵگیر بوو. چۆن
مەلاییکی هەرجایی و هەژار و بێکەس و بێناو، ڕێی دەکەوێ ئەویندار کیژی من
بێ و ناوی لە ناو حەشاماتا بزرینگێنێ؟! مەلا بگرن تا بیکوژم. خێرەومەند و
کەیخودایان، تکایان بردە بەر میر و تێیان گەیاند، کە ئەو پیاوە پیاوی خوایە و لە خوا
بەدەر کەس ناناسێ و ئەگەر ناوی سەلما دەبا، خوا لە چاوی جوانی سەلمای کیژی
تۆدا بەدی دەکا. میر بۆ ڕاستی و چەوتی قسەی لاگیرانی مەلا، دەکەوێتە ئەزموون و
تاقی کردنەوە. دەزانێ وەک دەڵێن وایە و ئەو خواناسە حەیا لە خوا، چیتری بە بیردا
نایە و لە پەڵە و هەڵەی دنیایی و داوێنپیسی و هەرزەکاری نەک هەر بێزار و بەبێزە،
بگرە هەرگیز بە دڵیشیا تێپەڕ نەبووە. واز لە کوشتنی دەهێنێ تەنانەت هێندێک

کەس دەڵێن میر مەلای لاواندۆتەوە و بۆ ماوەیێک لە لای خۆی حاواندۆتەوە و دڵـی چۆتە سەر ئاکاری پاک و لەباری ئەو پیاوە و بەڵینی داوە کیژەکەی لێ مارەکا و پارە و دراوی داوەتێ کە بچێ جلکی بۆ بکڕێ و بووک وەگوێزێ. مەلا بـە پوولـی زۆرەوە ڕووی کردۆتە شاری مووسـڵ. هـەموو بـازاڕی گـەڕاوە و بـە بـێ ئـەوە هـیچ بکـڕێ گەڕاوەتـەوە و پولـەکەی گێڕاوەتـەوە. مـیر گوتوویـە: بـۆ بـە دەسـتی والا و بـەتاڵ گەڕایتەوە؟ مەلا لە جوابا گوتویە: میرم! سەرانسەری ڕاستە بازاڕ و قەیسەری مووسڵ گـەڕام. هـەزاران تـۆپ کیمخـوا و خـارا و خامـەک و مەخمـەر و دارا و ئەتلـەس و دەسرەی سەرکەیی و حەریر و ئاوریشمم دیتن. بـەڵام هیچیـان ـبـە بـڕوای مـنـ شیاوی بەژن و باڵای تەرز و ڕێکی سەلما نەبوون. ئـەو قوماشـەی بـۆ بـەژنی سـەلما دەس بدا، لە هەموو دنیادا نییە!

دەماودەمیش دەگێڕنەوە کە مەلا لە شاری جزیر ئێوارانە چۆتـە نـاو گۆڕسـتانەوە و پاڵـی وەکێلێکی مەڕمەڕ داوە و ڕاز و نیازی دڵدارانەی دەگەڵ خودای خۆی کردووە.

پیرێژنێکی جزیری، هەر کە مـەلای دیـوە دەڕوا بـۆ گۆڕسـتان، هەویرەکـەی خـۆی شێلاوە و چاوەنۆڕی مەلا بووە، کەی کێلەکە بەجێ دێڵێ. هەر کە مەلا بەرەو مـاڵان هاتۆتەوە، ژنە دەرفەتی هێناوە و ئەنگوتکە هەویرەکانی بە مەڕمەڕەکـەوە داوە. کێلـە مەڕمەڕ ـکە بەتینی دەرونی ئەو ئەویندارە وەک تەندووری سوورەوەبووی نێلـدراوی لێ هاتووەـ نانەکانی برژاندووە.»

وا لێرەدا گردەوەکۆی سەجادی، کە لە مەڕ ژینامەی مەلا، لە مێژووی ئەدەبی کـوردا هێناویەتی، دەبڕێتەوە.

کتێبێکی دیکەش هەیە بە عەرەبی؛ بە قەڵەمی ئەحمەد کـوڕی مـەلا موحەممـەدی بۆتانی زڤـنگی، مفـتی بـاژێری قامیشـلی لـە سـووریا. شـەرحێکە لـە سـەر دیـوانی هەڵبەسـتەکانی جزیـری و نـاوی نـاوە: «*العقـد الجـوهری فی شـرح دیـوان الشـیخ الجزری*». واتا: گەردانەی گەوهەرین، لە شەرحی دیوانی شێخی جزیریدا. نووسـەری کتێب بەر لەوە مانای شیعرەکانی مەلا بە عەرەبی لێداتەوە، ژینامەی مەلای هێنـاوە بە عەرەبی و کردوویەتە پێشەکی شەرحنامەکەی.

لە دوای ئەوە کە سوپاسی سەیدا عەلائـەددین دەکـا، چونکـە بـەهرەی لـە *مێـژووی*

ئەدەبی کوردی وەرگرتووە، دەڵێ: «هەرچەند مامۆستا سەجادی مالمهەقە ڕەنجی زۆریشی کێشاوە و بۆ دۆزینەوەی ژینامەی جزیری ماندوو بووە و گەلێک شتی پڕبایەخی دەس کەوتووە، بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم، هیچ سەبووریم پێیان نایە و دڵ ئاویان لێ ناخواتەوە. ئەوا بۆ خۆم لە لێکۆڵینەوەی فرە و پشکنینی شیعرەکانی دیوانەکەی، شتێکم هەڵکراندووە که پێم وایە بەڵگەی ڕاستن بۆ دینەوەی ڕۆژگارانی ژینی مەلا و لێم ڕوونە کە من زۆر باشتر لە مامۆستا عەلائەددین ئەم مەتەڵەم هەڵێنابێ و وەستایانەتر بۆی چووبم. ئەمجا دەس پێدەکا و دەڵێ: «مەلا لە شوێنێک فەرموویە:

ژ ڕەعنا نێرگزین تەی مەست و خوونریز

زەمان بۆ عەهدێ جەنگ‌ئەنگیزێ چەنگیز

لە جێیەکیش ناوی تەیمووری لەنگ دەبا.

لە شیعرێکیشدا دەڵێ:

ژ حافز قوتبێ شیرازێ  مەلا فەهم ئەر بکی ڕازێ

لە بەیتێ دیشدا گوتوویە:  ژ ڕەنگێ سەعدی و جامی

کە وا بوو، مەلا بێ‌گومان کەوتۆتە داوی چەنگیزەوە و تەیموووریشی جێ‌هێشتووە. کە یەکەمیان لە ٦٢٥ و دووهەمینیان لە ساڵی ٨٠٧ی کۆچی، فەراقی ڕەشی لێ بڕاوە. حافزیش ـجامی گوتەنیـ ساڵی ٧٩٢ی کۆچی لە دنیا کۆچی کردووە. جامیش کە لە دیوانەکەدا ناوی هەیە، دیارە پێش مەلا کەوتووە. ئەو کەسانەی وتوویانە، ئەو شیعرانە هین مەلا نین وا دیارە لە وێژەوانی و شیعرناسین، کۆڵەوار بوون. چۆنکە هەرکەس هەروا تۆزێک لە مرخ و چێژەی هەڵبەستەی مەلای جزیری تێگەیبێ، سوور دەزانێ کە ئەم شیعرانە هی مەلان و مافی کەسیان پێوە نییە.

هەرکەسێکیش شارەزای فەرموودەکانی سەعدی و حافز و جامی بێت، زوو تێدەگا کە مرخی مەلای جزیری چەند لەوانەوە نزیکە و چەندە نرخی بۆ داناون. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هەڵبەستێکی مەلا هەیە بە عەرەبی، لەسەر بەندەکەیا دەڵێ:

يا رامیَ قَلبی بِسهام اللحظاتِ! هيهاتَ نَجاتی[1]

---

١. ئەی ئەو کەسەی بە تیلەی چاو، دڵت وەبەر تیران داوم! تازە دەرناچم؛ فەوتاوم.

کێش و ڕەوتی ئەو هەڵبەستەی تەواو لاسای هەڵبەستێکی مامۆستا ئەحمەد پاشـایە، کە وەک بوێژێکی ناودار، هەتا ساڵی ٩٠٢ی کۆچی لە وڵاتی ترکاندا ژیاوە. میسیۆ ژابا و ئەمین زەکی کە دەڵێن مەلا لـە نیـوەی چـەرخی شەشـەمیندا ژیـاوە، ئـەو نـاوی عیمادەددینــە لێــی تێــک داون. ئــەوان هــەردووک هــەر عیمــادەددینی زەنگــی، فەرمانڕەوای شاری مووسڵیان ناسیوە؛ کە لە چەرخی شەشەم ژیاوە. بیستوویانە کە وا عیمادەددین ناوێک، دەگـەڵ مـەلا دۆسـتی و شناسـایی هـەبووە و شـیعریان پێـک گۆڕیوەتەوە. دەی کە وا بوو عیمادەددین هەر یەکێکە، ئەویش لە بەرەی زەنگییــە و ئەتابەکێک بوو لە مووسڵ. مووسڵیش لـە جزیـر نزیکـە و ڕەنگـە ئـەو فەرمانڕەوایـە، دەگەڵ ئەو پیاوی خودایە نێوانێکی خۆشیان بووبێت.

بەڵام خۆم لە تۆژینەوەمدا بۆم دەرکەوت کە ئەو پیاوەی بەو ناوەوە دەگەڵ مەلا شیعر ـشیعرێنی کردووە، ناوی زەنگی لێ نەنراوە؛ پێی وتراوە عیمادەددینی جزیری. گش لە مێژووشارەزایەک باش دەزانێ، کە عیمادەددینی زەنگی کوڕی ئاقسونقور ناو بووە و هەرگیز لە جزیر نەژیاوە و کەسیش هەرگیز پێی نەگوتوە عیمــادەددینی جزیــری. ئەوا عیمادەددینەکە قت. دەچینە سەر خــانی خانــان، کــە ئــەمین زەکــی لای وایــە فەرمانڕەوای تەورێز بووە و مەلا شیعری بۆ ناردووە و بە بەژن و باڵایدا هەڵدەڵێ. بـە ڕاستی ئەمەش هەڵەیە؛ هەر چونکە ناوی تەورێزێ لە شیعرەکەدا هاتووە، هێندێک لە مێژوونووسانی، وەسەر تەڵە پەڕاندووە. ئەگەر ئێمە بە تەواوی لە شاری جزیری بۆتان شارەزا بین ــ وەکوو بۆخۆم شارەزام ــ زۆر بە هاسانی دەیــزانین کــە ئــەو هەڵبەســتە ڕەنگینەی خانی خانانی تێدایە، باسی فەرمانــڕەوای کــوردی شــاری جزیرابۆتانــە. بــا بزانین بۆچ:

شاری جزیری کەونارا ــ کە پاتەختی دەسەڵاتداریی کــورد بــووەــ زۆر ئــاوەدان و زۆر جوان و زۆر لەبار و تەیار بووە. وەک ئێستاش شوێنەوارەکەی نیشــاندەدا، وارشــێکی بە هەر چوار دەورا کێشراوە. بەردی وارش لە مەڕمــەڕی تاشــراو بــووە. بەشــی زۆری ئایەتەکانی قورئانێ، لەو سەربەردە مەڕمەڕانــە هەڵــکەنراوە. ســوورەتەکانی فاتیحــا و ئەنعام و ئیننا فەتــەحنا و ئــەو عەشــەرەی ئایەتەلکورســی تێدایــە؛ زۆر زەق نــەقاری کراون. کە زۆر بەودم زانراون و ویستوویانە لە پیتی ئــەو ســوورەتانە، خــوا شــارەکە و

موسوڵمانانی شارەکە، لە بەلایان بپارێزێ. ئەگەر هەڵبەستەکەی مەلا بە وردی بخوێنینەوە، سوور دەزانین کە مەبەستی لە شوێنی خانی خانانی جزیرەیە و مەبەستی لە خانی خانان، میری جزیروبۆتانە.

دەبڕوانە فەرموویەتی: «ئایەتەلکورسی و ئەنعام هەیکەلا تۆخێ تە بن». یان فەرموویە: «سوورەیێ ئوممولکیتاب ماداریێ جِەزرەت سوور بێ». یاخۆ لەو قەسیدەیە کە میری جزیرێ بە ناوی شاهەنشای موعەززەم ناو دەبا دەڵێ: «سوورەیێ ئیننا فەتەحنا دۆر و ماداریێ تە بێ». کە ئەم ئایەتانە دەگەیەنێ لە دەوری وارشی شارن و مەبەست شاری جزیرەیە. ئەگەر مەلا میرەکەی خۆی پەسند بدا و بە ناوی خانی خانان و شاهەنشای زلی ناوبەرێ، چی‌تیایە؟ بەڵگەی هەرە ئاشکراتر هەر لەو هەڵبەستەدا هەیە. لە پەسنەکەی میردا دەڵێ: «گەرچی دەر ئیقلیمێ ڕابیع هاتە تەختێ سەلتەنەت». خۆ دیاریشە جوغرافی‌زانانی پێشین، درێژی و پانی زەمینیان بە حەو بەش دابەش کردبوو؛ هەر بەشەی ناوی ئیقلیم بوو. شاری جەزیر لەو دابەش_ دابەشێنەدا، لە سەر ئیقلیمی چوارەم بوو. ئەمجار ئەو بەیتەی کە ناوی تەورێزی تێدا هاتووە، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە ڕووی قسە دەحاکمی تەورێزێ بێ. نەخێر، مەلا ویستوویە لە خوا بخوازێ ئەو میرە کوردەی جەزیرێ کە ڕەواج بە ئیسلام دەدا و فەقێ و مەلای زۆری هەیە، دەرسی قورئان و حەدیسان دەڵێنەوە، خوا هەر بالادەست‌تری بکا و دەڵێ لە خودام تەڵەبە تۆ کە لە شارێکا دەژی لە ئیقلیمی چوارەمدایە، خاوەنی حەوت ئیقلیمان بی. جگە لە هەموو کوردستان ، تەورێزیش بێتە بەر حوکمت؛ خاوەنی مولکی خوراسانیش خۆی بداتە بەر دالدەی تۆ.

نە تەنێ تەبریز و کوردستان ل بەر حوکمێ تە بن

سەد وەکی شاهێ خوراسانێ د فەرواریێ تە بێ

دەبا بزانین عیمادەددینەکە کێ بوو، کە وا ئەو چەند مێژونووسە لە ناسینی بە هەڵە چوون؟ هەتا ساڵی ١٠٠٥ ک.م. کە شەرەفخانی بدلیسی، لە نووسینی *شەرەفنامە*کەی بۆتەوە، دیارە میرێک لە جزیر هەڵنەکەوتووە ناوی عیمادەددین بووبێت. چۆنکە نەک هەر لە جزیرە، لە هەر سووچێکی کوردستان، بەر لە ساڵی ١٠٠٥ میر و دەستەلاتدار بووبێت، شەرەفخان ناوی نووسیوە و دە *شەرەفنامە*ی

ئاخنیوە. دەیسا منیش لە چەند دیوانی دەسخەتی خەڵکی جۆراوجۆرا دیومە کە ئـەو دۆستەی دەگەڵ مەلا شیعر_ شیعرێنی کردووە، عیمادەددین جزیرییە.
لە دەورانی شەرەفخانی مێژوونووسدا و لـە سـالانی ١٠٠٠ هـەتا ١٠٠٥، مـیری جزیـر و بوتانێ، میرشەرەفی کوڕی ئەبدال، لە میرانی خانەدانی ئازیزان و باپیری بەدرخانیان بـوو. هەروەک ناوی میرشەرەف بوو، خانشەرەفیشیان پێ دەگوت. میرشـەرەفخانی بدلیسـی لە *شەرەفنامە*کەی خۆیدا، زۆر بە خانشەرەفدا هەڵدەڵی و دەڵێ: زۆر پیاوێکی دەسـت و دڵ و دەروونپاکە. فەقێ و مەلای زۆر خۆش دەوێن. زۆر مەدرەسە و مزگەوتی تازەی لە شاری جزیر ساز داوە کە یەکێک لەو مەدرەسانە مزگەوتی سووری پێ دەڵێن؛ لـە پـەنای شوورەی شارەوە و کەوتۆتە لای ڕۆژاواکەی. مەوقووفەجاتێکی زۆر و پـڕ داهـاتی بـۆ ئـەو مزگەوتە داناوە؛ کە لە پاش نەمانی خۆشی مزگەوت هەر لـە بـڕەودا بـێ و هـەر فـەقێ و مەلای تێدا بێ. دەیسا کەسیش گومانی لەوەدا نییە کـە شـێخ ئەحمـەدی جزیـری لـەو مزگەوتە دەرسبێژ و پێشنوێژ بووە و گەلێک مـەلای لەوێـدا ئیجـازە داوە و دیـارە هـەر لەوێش مردووە و هەر لەو مزگەوتەش نێژراوە. ئیستا ئەگەر مەلای عارف، مەلای شاعیر و ئەویندار، مژۆڵی چاومەستانی کورد بە تیرە بێ ئامانەکـەی خانشـەرەفی بشـبهێنێ، بـۆ ناسینی خانی مەلا _کە هەر دەبێ خـان شـەرەف بـێ_ چـی دەمێنـێ؟ دە بڕوانـە ئـەم شیعرەی مەلا چەند جوانە، کە فەرموویە:

خـــــەف وان ڕەشــــــاندن دل خـــــــەدەنگ

تەشــــــبیهێ تـــــــیرێن خانشـــــــەرەف

جا دەشبێ ئەو عیمادەددینەی کە زۆر ئاشنای مەلا بووە، خزم و کەسی خانشەرەف بێ و لە جزیرێ دەگەڵ مەلا بووبن بە دۆست و شیعریان بۆ یەکدی نووسیبێ.
سەرباری ئەو بەڵگانەشم، شتێکی سەرنجڕاکێشی دیکەش هەیە. لە هەموو دیوانەکانی جزیریدا، وتووێژی شاعیرانەی نێوان مەلا و فـەقێ تـەیران دەسـت دەکـەوێ. فـەقێ تەیران بە شیعر نامەی نووسیوە و مەلاش جوابی فەقێی هەر بە شیعر داوەتەوە. فەقێ تەیران لە هۆنراوەیەکی خۆیدا، لە ژێر ناوی: «دلۆ ڕابە! دلۆ ڕابـە!» مێـژوی ئـەو ڕۆژە دەنووسێ کە ئەوەی تێدا نووسیوە. لە نیوە بەیتێکا دەڵێ:
«هەزار و چل و یەک چوونە» ئیتر من تەواو لێم ڕوونە مەلا لە ئاخر و ئۆخری سەتەی

دەیەمی کۆچیدا هاتۆتە مەیدانی ژیان و مەودایەکی تەواویشی لە چەرخی یازدە بڕیوە و هیچ بە دووریشی نازانم کە هەموو نیوەی ئەو چەرخەش زیندوو بووبێت؛ هێندێکیش بەو لاوە چووبێت. واتا ژینامەی دەسخەتی عەبدولقادری ئامێدی، کە عەلائەددین دیویەتی، دەبێ ڕاست بێ کە مەلا حەفتا و چوار ساڵ تەمەنی لە دنیا بووبێ. لە دەوری هەشتای چەرخِیدا هاتبێتە سەر دنیاوە و لە نێوان پەنجا و شیست پلەش، لە چەرخی یازدە مردبێ.»

شەرحنووسی بە عەرەبی، کە ئەم چەند بەڵگە ڕوونەمان دەربارەی دەورانی ژیانی نیشان دەدا؛ دێتە سەر باسی چۆنیەتی زانست و بلیمەتییەکەی. دەڵێ: «مەلا لە هەر دوازدە عیلمەکاندا دەریایەکی بێپەی بووە. لە زانینی زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی، تاقەسوارەیە لە مەیدان. بەو سێ زمانە و بە کوردیش- کە هەر زمانی خۆی بووە- هەڵبەست و هۆنراوەی هەیە؛ کە بۆ ڕەوانی و پاراوی تاکیان نییە. دیوانەکەی بۆ یەکەم جار لە برلینی ئەڵمانیا چاپ کراوە. زۆر جاری دیش لە ئەستەمبوول، لە کوردستان، لە ڕووسیاش دیسان چاپ کراوەتەوە. ڕۆژهەڵاتناسان زۆر بە جێگەورەی دەزانن.» دەشڵێ: «مەلا ــکە دەرسبێژی مزگەوتی سووری جەزیر بووــ پاش مەرگیشی لە ژێرزەمینێک هەر لەو مزگەوتی سوورە نێژراوە و زیارەتگایە.»

پێشەکی شەرحی عەرەبیش دەربارەی ژینامەی مەلا کۆتایی هات. منی وەرگێڕی هەژاریش چەند قسێکم هەیە بیکەم:

ئەگەر ژابا، فۆن هارتمانی ئەڵمانی، یان ئەمین زەکی و بلەچ و عەلی عەونی و مامۆستا عەلا سەجادی بەر لە ژینامەنووسینی ئەو عارفە، دیوانەکەیان بە وردی خوێندبایەوە تەنیا ئەو شیعرەی کە باسی تیرەکانی خانشەرەفە، بەس بوو کە بۆیان دەرکەوێ مەلا لە چەرخی یازدەدا زیندوو بووە. ئەو گۆڕەی تێیدا نێژراوە ژێرزەمینی مزگەوتێکە کە خانشەرەفی جزیری لە پاش هەزارەمی کۆچی سازی داوە. ئیتر ئەو هەموو شێوان و ئاڵۆزبوونەی تێ نەدەچوو؛ قسە هێنان و بردنی پێ نەدەویست.

قسەی دووهەمم ئەمەیە: لە سالانی ١٩٥٦ڕا ماوەی سێساڵ بۆ خۆمماڵم لە گوندێک بوو لە جزیرەی ئیبنوعومەر لە کوردستانی سووریە؛ کە ناوی «قوبوورولبەیز»ە[1] و لە

---

١. قُبورُالبَیض

نزیک شاری «قامیشلوو» هەلکەوتووە. دەگەڵ مەلا و شاعیران و ویژەوانانی ئەو ناوە هاتوچۆی یەکترمان دەکرد. لێم دەبیستن مەلا عەبدوسسەلام خەریکە دیوانی مەلا بە عەرەبی شەرح دەکا، دەشیانگوت زۆر مەلای چاکە و کرمانجیش بە شێوەی بۆتان باش دەزانێ، چونکە خۆی خەلکی بۆتانە. بەلام زۆر ڕووت و نەدارە؛ هیچ ئاشتەبای خوا شک نابا. لە حوجرەی مزگەوتێکدایە سەلت و سپات. مەلا ئەحمەدی زڤنگی ـکە بۆتە مفتی قامیشلی و ئەو مزگەوتەشی بە دەستە و خوا نەیبڕێ، زۆریش دارا و دەولەمەندەـ خێر بە مەلا سەلام دەکا و نان و چێشتی بۆ دەنێرێ. دەمانگوت خوا خێری بنووسێ.

مەلا سەلام سالی ١٩٥٨ مرد. پاش ماوەیەک شەرحی دیوانی جزیری بە عەرەبی لەچاپ درا؛ مەلا ئەحمەدی زڤنگی مفتی لە شاری قامیشلووی لەسەر بەرگەکەی نووسرابوو. وێنەیەکی جوانی مفتیش دەبیندرا. ئیتر یادێک لە مەلا سەلام نەکرابوو. وەباڵ بەستۆی ئەوانەی کە من لێم بیستوون، مفتی لە جیاتی شۆرباکەی، کتێبی مەلا سەلامی بە ناوی خۆی لە چاپ داوە. جا ئێستا کە ئەو جەنابەش وەک مەلا سەلام بۆتە خۆڵ و هەردووک چوونە بەر بەزەیی خودای گەورە، من سوپاسی مفتیش دەکەم کە ئەم گەنجینە بەنرخەی لە دەس نەمان پاراستووە و نەیهێشتووە لە ناو بچێ.

دوامین قسەم پاڕانەوەیە لە لاوان، لە پیاوانی وێژەوانی کوردیزانی لە شیعری ئەویندارانە و باری عیرفانی شارەزا. لەو کارەدا کە من شانم وەبەر داوە، دەستم بگرن. سەرنج بدەن بزانن لە کوێدا هەلەم، خواراییم بۆ ڕاستکەنەوە. یا بە کۆششی هەمووانی، کارێک بکرێ *دیوانی مەلای جزیری* وەک پێویستە، هەمووکوردێکی خوێندەوار لێی تێبگا. کێ هەر تێبینیەکی هەبێ، با بە نامە بۆم بنووسێ، تا بەوپەڕی سوپاسەوە بیخەمە ناو پەراوێزی دیوانەوە.

خۆشیتان لە خوا دەخوازم. ئەوا ئێوە و ئەویش دیوانی جزیری بە شەرحەوە.

**هەژار**

٥٩/١١/٢٤ (١٩٨١ ز.)

# هەرێ مەیگێڕ!

| | |
|---|---|
| ۱ | نەوایا موتریب و چەنگێ فەغان ئاڤێتە خەرچەنگێ<br>وەرە ساقی حەتا کەنگێ نەشۆیین دل ژ ڤێ ژەنگێ |
| ۲ | حەیاتا دل مەیا باقی بنۆشین دا ب موشتاقی<br>«ألا یا أیُّها السّاقی! أدِر کأساً وَ ناوِلها» |

**مانای وشەکان:**

**نەوا**: ئاواز؛ **موتریب**: بەزمگێڕ؛ **چەنگ**: ئامرازێکی مووسیقایە؛ **فەغان**: هاوار؛ **ئاڤێتن**: هاویشتن؛ **خەرچەنگ**: قرژاڵ؛ **خەرچەنگ**: بورجێک لە ئاسمان؛ **ساقی**: مەیگێڕ؛ **حەتا**: هەتا؛ **ژ ڤێ**: لەوە؛ **حەیات**: ژیان؛ **باقی**: هەرماو؛ **دا**: تا؛ **موشتاق**: بەتاسە؛ **الا**: هەرێ؛ **ایهالساقی**: هۆی مەیگێڕ؛ **ادر**: بگەڕێنە؛ **کاسا**: پاڵەیەک؛ **و ناولها**: بیشیدە.

**پوختەی مانا:**

دەنگ و سەدای چەنگی بەزمگێڕ، جۆش و خرۆشی گەیاندە ئاسمان. دە مەیگێڕ وەرە! هەتا کەی دڵمان لەو ژەنگە نەشۆینەوە؟ ئەو مەیە کە هەر هەیە و قەت نافەوتێ، با بە تاسەوە بیخۆینەوە. هەرێ مەیگێڕ! دەبا پیاڵەکەت بگەڕێ و بیشماندەرێ.

| | |
|---|---|
| ۳ | کو کاتیب دێمی جەدوەل کەت شکەستە خەت موسەلسەل کەت<br>ژ یەک حەرفان موفەسسەل کەت کییە ڤێ موشکلێ حەل کەت؟ |
| ۴ | دزانی ڕوود و عوود ئەووەل چ ئاڤێتن سورروود ئەووەل؟<br>«کە عشق آسان نُمود اوّل ولی اُفتاد مُشکل‌ها» |

**مانای وشەکان:**

**کو**: کە؛ **کاتیب**: نووسەر؛ **دێم**: ڕوخسار؛ **کەت**: بکات؛ **شکەستە**: شکاو؛ **موسەلسەل**: بە زنجیرە؛ **شکستە** و **موسەلسەل**: دوو جۆرە شێوە خەتن؛ **ژ یەک**: لە یەکتر؛ **حەرف**: کەنار؛ **حەرف**: پیت؛ **افتاد**: کەوت؛ **مشکل‌ها**: چند ئیشکال.

**پوختەی مانا:**

هەرگا نووسەری ئەزەلی -کە خودایە- خەت و خاڵی ڕوخسار دابڕێژێ، بسکان چین–چین کا و بە زنجیرەیان بکا و لاجانگان لێک جیا کاتەوە، کێ دەتوانێ ئەو دژوارییە چارە بکات کە تووشی ئەوینداری دێ؟ تۆ دەزانی ڕوود و عوود ـکە دوو کەرستەی مووسیقایین_ هەر لە هەوەڵەوە بە گۆرانی گوتوویانە:
دڵداریی سەرەتاکەی هاسانە؛ بەڵام زۆری دژواری لە دووە.

٥ ژ میهرا وێ شەفەق سەعدێ شرین‌لەعلێ شەکەروەعدێ
دنالم شوبهەتێ ڕەعدێ عەجیبم لێ ژ ڤێ جەعدێ

٦ کە دل را تاب هر چینش بە کُفری می‌برد دینش
«زِ تاب جعد مُشکینش چە خون اُفتاد در دل‌ها»

**مانای وشەکان:**

**میهر**: خۆشەویستی؛ **شەفەق**: تیشک؛ **سەعد**: پیرۆز؛ **سەعد**: ناوی ئەستیرەیەکە سەعدوسوعوودیشی پێ دەڵێن، دیتنی بە ودمە؛ **شرین**: شیرین؛ **لەعل**: لاڵ، لێوی یاری پێ شبهاوە؛ **وەعد**: بەڵێن؛ **شبهەت**: وەکوو؛ **ڕەعد**: گرمەی هەور؛ **عەجیبم**: سەیر ماوم؛ **لێ**: بەڵام؛ **ژ ڤێ**: لە ئەو؛ **جەعد**: مووی لوول‌خواردوو؛ **تاب**: پێچ، چین، بە سەریەکدا هاتوو؛ **بە کُفری**: بۆ کافر بوونێک؛ **می‌برد**: دەبا؛ **دینش**: دینی ئەو؛ **مُشکین**: وەک میسک ڕەش و بۆنخۆش؛ **خون**: خوێن؛ **دَر**: دەناو؛ **دل‌ها**: دڵان.

**پوختەی مانا:**

لە خۆشەویستی ئەو کەسەی کە تیشکی ڕوخساری وەک شەبەقی ئەستێرەی سەعد، بە ودم

و پیتە و لێوی شیرینی بە ڕەنگی لاڵە و گفت و بەڵێنی وەک شەکر لە دم دەباریێ، وەک هەورەگرمە دەنگی ناڵەم بەرزە؛ بەڵام دیسان سەیر ماوم لەو کەزی و پرچە لوولانە کە هەر چینەی، دڵی عاشق بەرەو کفرێک ڕادەکێشێ. ئای کە لە تاوی پێچی کاکۆڵی چین لەسەر چینی ڕەش و بۆنخۆشی میسک ئاسای چەندە خوێن تزاوەتە دلانەوە!

٧ دڤێ تاقێ، دڤێ خانێ مە عەیش و ئەیمەنێ کانێ
کەسێ دەست دەت ژ دەورانێ نیهالەک ڤێ گولستانێ

٨ در آغوشش چو می‌آرد کە از دل جانش بسپارد
«جَرَس فریاد می‌دارد کە بربندید مَحمِل‌ها»

**مانای وشەکان:**

**دڤێ**: دەناو؛ **تاق**: کەوانەیی. لێرەدا ئاسمانە کە لە بەرچاو بە تاق هاتۆتەوە؛ **خان**: کاروانسەرا؛ **مە**: ئێمە؛ **عەیش**: ژیان؛ **ئەیمەنی**: بێترسی و هیمنایەتی؛ **کانێ**: کوانێ؛ **دەوران**: ڕۆژگار؛ **نیهال**: تازەنەمام؛ **ڤێ**: لەوێ؛ **گولستان**: باغی گوڵان؛ **ئاغوش**: باوەش؛ **چو می‌آرد**: کە دەهێنێ؛ **کە از دل**: کە لە دڵەوە؛ **جانش**: گیانی؛ **بسپارد**: تەسلیم بکا؛ جَرَس: زەنگۆڵە؛ **فریاد**: هاوار؛ **فریاد می‌دارد**: دەنگ بڵند دەکا؛ **بربندید**: هەڵبەستن؛ **مَحمِل‌ها**: بارگەکان.

**پوختەی مانا:**

لە ژێر ئەم ئاسمانە پشت چەماو و کەوانییەدا و لەو کاروانسەرای دنیایەدا، ژیان و بێترسی لە کوێ بۆ ئێمە دەست ئەدا؟ پیاو لە هەموو ماوەی ژیانیدا تێدەکۆشێ کە دەستی بگاتە تازە نەمانێک لە باغی گوڵاندا و دە باوەشی بگرێ و گیان و دڵی پێ بسپێرێ. کە چی لەپڕ بەر لەوەی بە ئاوات بگا، دەنگی زەنگی کاروانی مەرگی دێتە گوێ کە ڕابن! وادەی سەفەرە و بارگە و بنە بپێچنەوە!

٩ ب قورئانـــێ، ب ئایاتـــێ، ئەگـــەر پـــیرێ خـــەراباتێ
ببێـــژت ســـەجدە بـــن لاتـــێ موریـــدێن وی دبـــن قاتـــێ

١٠ مُریـــد اَر بی‌بَصَـــر نبـــوَد، زِ فرمـــانش بـــه در نبـــوَد
«کـــه ســـالک بی‌خبـــرِ نبـــود زِ راه و رســـم منزل‌هـــا»

**مانای وشەکان:**

**خەرابات**: مەیخانە؛ **پیری خەرابات**: لە زاراوەی سۆفیانەدا پیری تەریقەتـە؛ **سـەجدە**: سوژدە؛ **لات**: ناوی بتێک بووە لە ناو عەرەبدا؛ **موریدێن**: مریـدان؛ **قاتـێ**: گـوێڕادێر و بەرفەرمان؛ **ار**: ئەگەر؛ **بَصَر**: چاو، بینایی؛ **نبوَد**: نەبێ؛ **سالک**: ڕێبوار؛ **راه و رسم**: ڕێ و شوێن.

**پوختەی مانا:**

سوێند بە قورئان و ئایەتان ئەگەر پیری تەریقەتێ بە مریدان بلێ دەبێ سوژدە بۆ بـت بەرن، مریدی ڕاست هەرگیز لە گفتی دەرناچن؛ چۆنکە ئەگەر چاوی دڵیان کوێر نەبێ دەزانن ئەو پیرە کە ڕێگەی بەرەو خـودا بـڕیوە، شـارەزایی تـەواوی هەیـە و هـەرگیز تووشی هەڵەیان ناکا.

١١ شەڤێ زولمات و دەریایێ ژ مەوجان قەت خەبـەر نایـێ
شکەسـتی کەشـتیا بایـێ عـەجاجێ ڤـێ شـەفەق دایـێ

١٢ ژ حەرفان ماه و ساڵێ مـا نـەهات دەر شـکلێ فالـێ مـا
«کُجـــا داننـــد حـــال مـــا سَـــبُکباران ســـاحل‌ها»

**مانای وشەکان:**

**زولمات**: تاریکی؛ **مەوج**: پێل؛ **قەت**: هیچ، هەرگیز؛ **شکەستی**: شکاو؛ **کەشتی**: گەمیە؛ **عەجاج**: گەردەلوول و گێژەڵووکە؛ **حەرف**: پیـتی ئـەلف و بـێ؛ **شـکل**: وێنـە؛ **شکل**: چەتوونی؛ **فال**: نیاز گرتن لە ئاکامی خۆش؛ **کجا**: لە کـوێ؛ **داننـد**: دەزانـن؛ **سبُکبار**: بارسووک؛ **ساحل**: قەراخ ئاو.

**پوختەی مانا:**

شەو تاریکە؛ لە دەریادا قەتیس ماوین. گەردەلوول گەمیە بادەوانییەکەی تێکشکاندوین. هاڕە و هاژەی شەپۆلان وە سەر دەنگی هاوار کردنمان کەوتووە و کەس گوێی لە هاوارمان نابێ. کەوتینە فاڵ گرتنەوە؛ پیتی ناوەکانمان، دەگەڵ ساڵ و مانگی لە دایک بوونمان لێک دایەوە؛ ئەویش باشی نەهێنا. دەسا ئێستا ئەوانەی سووکبارن و لە قەراخ ئاوان حاوانەوە، چۆن دەزانن ئێمە چەند پەرێشانین؟

**١٣** مە را ژەووەل چ بر؟ خامی، کِشاند آخر بە بَدنامی
ژ ڕەنگێ سەعدی و جامی ژ شوهرەت پێ حەسین عامی

**١٤** ب دەنگ و بانگ و ئاوازی دبێژت نەغمەیا سازی
«نِهان کی مانَد آن رازی کَزو سازَند مَحفِلها؟»

**مانای وشەکان:**

**مەرا**: منی؛ **ژەووەل**: لە سەرەتاوە؛ **چ بر**: چی بردی؛ **خامی**: کاڵی و کرچی؛ **کشاند**: کێشای؛ **بە بدنامی**: بۆ ناو زڕان؛ **ژ ڕەنگێ**: لە چەشنی؛ **شوهرەت**: ناوبانگ؛ **پێ حەسین**: هەستیان پێ کرد؛ **عامی**: خەڵکی ڕەمەکی؛ **نەغمە**: ویرەویر. **نِهان**: وەشاردوو؛ **راز**: نهێنی دڵ؛ **کزو**: کە لەو؛ **سازند**: ساز بدەن؛ **محفل**: کۆڕی بەزم.

**پوختەی مانا:**

هەر لە سەرەتاوە چی منی بەو دەردە برد، کاڵی و کرچی خۆم نەبێ؟ بە ناپوختەیی ملم لە کار نا؛ تا وام لێ هات. شۆرەتی بەدناوییەکەم وەک شۆرەتی ناوی چاکی سەعدی و جامی دنیای تەنییەوە و هەمووکەس بەو ناوزڕانەی منی زانی و ئێستا کۆڕی بەزمی پێ دەگێرێ و لە هەموو لا باسم دەکەن. دە ئیتر چۆن دەتوانم نهێنیِ خۆم بشارمەوە؟

**١٥** ژ حافز قوتبێ شیرازێ، «مەلا» فەهم ئەر بکی ڕازێ
ب ئاوازێ نەی و سازێ ببی بەر چەرخ پەروازێ

١۶ تَــزِدْ مِــنْ حُبِّهــا الصَّــفْوى بِهــا اَهَــلُ‌الهوى نَشْــوى
«مَتى ما تَلَق مَنْ تَهْـوى دَعِ الْـدُنيا وَ أهمِلهـا (أمهِلهـا)»

**مانای وشەکان:**

**قوتب**: تەوەرە؛ **قوتب**: پیری هەرە پایەبەرز لە تەریقەتدا؛ **فەهم**: زانـین، تێگەیشـتن؛ **نـەی**: بلـوێر؛ **چـەرخ**: ئاسمـان؛ **پـەرواز**: فـڕین؛ **تـزد**: بـۆت زیـاد دەکـرێ؛ **حُـب**: خۆشەویستی؛ **ها**: ئەو مێوینە؛ **صفوی**: پاکی و پاکژی؛ **بە**: بەو خۆشەویسـتییە؛ **هـوی**: ئەوین و دڵداری؛ **نشوی**: سەرخۆش و مەست؛ **متی**: کەی؛ ما: کە؛ **تلق**: تووش بـووی؛ **من تهوی**: ئەوەی کە دڵبەرتە؛ **دع**: وە لا بنێ، تەرک بکە؛ **اهملها**: وازی لێ بینە، گوێ مەدەرێ؛ **امهلها**: وچانێ بدەیە.

**پوختەی مانا:**

هۆی مەلا! ئەگەر تۆش وەک حافز قوتبی شیراز، شتێکت لێ حاڵی ببێ، بە گوێ گرتن لە ئاوازی بلوێر و ساز، دەفڕییە تەشقی ئاسمانێ. لە ئەوینی ئەو دڵـبەرە، کـە دڵـداران سەرخۆش دەکا، پاکیی دڵ و دەرونیشت بۆ زیـاد دەبـێ و گەشـە دەکـا. هـەروەخت تووشی دڵبەر بووی، ئیتر دنیا واز لێ بێنە و تەرکی بکە!

٢

# ئیکسیری ئەوین

«پەسنی پێغەمبەر، دروودی خودای لێ بێ»

١ ئیسـمێ تەیـە مـەکتووب د دیوانـێ قیدەمـدا
حەرفەک قەلەمێ عیلمێ ب تـەقویمێ ڕەقـەم دا

**مانای وشەکان:**

**ئیسم**: ناو؛ **تە**: تۆ؛ **مەکتووب**: نووسراو؛ **قیدەم**: هەرەپێشین؛ **تەقویم**: ڕێکی و لـەباری؛ **ڕەقەم دان**: خەت دان.

**پوختەی مانا:**

ئەی موحەممەد! ناوی تۆ بەر لە هەموو ئافەریدەیەک لـە دیـوانی خـودادا نووسـراوە. بنووسی زانیاری خودا زۆر بە ڕێکوپێکی پیتەکانی نـاوی تـۆی لـە سـەرووی هـەموو ناوانەوە خەت داوە.

٢ ئەشـکال و خـەتێن دائیرەیـێ نوقتـەیێ عـیلمن
ئـەڤ نـەقش و میسـالێن د خـەیالاتێ عەدەمـدا

**مانای وشەکان:**

**ئەشکال**: شکلان؛ **خەتێن**: خەتان؛ **دائیرە**: دایرە، جەغز؛ **نوقتە**: خاڵ؛ **نەقش**: نـەخش؛ **میسال**: وێنە؛ **عەدەم**: نەبوون.

**پوختەی مانا:**

زانایی خودا هەر لە بناواندا کە شکڵ و خەتی جەغزی بـەدیهێنانی داڕشـتووە، نـاوی تۆی کردۆتە نوختەی ناوەندی دایرەی بوون و هەربیچم و وێنەیەکی هەبووە یان لەوە

بەو لاوە دەبێ، بەدەوری ئەو نوختەیەدا خول دەخۆن و تەواف دەکەن.

٣ میم مەتلەعێ شەمسا ئەحەد ئایینەسیفەت کر
لامیع ژ عەرەب بەرقێ ل فەخخارێ عەجەم دا

**مانای وشەکان:**

**مەتلەعێ شەمس**: خۆرهەلات؛ **ئەحەد**: تاک و تەنیا؛ **ئایینە**: ئاوێنە؛ **لامیع**: ترووسکەدەر؛ **بەرق**: برووسکە؛ **فەخخار**: سوالەت؛ **عەجەم**: غەیرە عەرەب.

**پوختەی مانا:**

خوای گەورە پیتی میمی موحەممەدی کردە ئاوێنەئاسای بەر ڕۆژی تیشکدەری تاقانەیی خۆی. تیشکی خوای یەکتا لەو ئاوێنەوە ـکە موحەممەدەـ لە ولاتی عەرەبەوە بریقەی بە غەیرە عەرەبان گەیاند کە تا ئەوسا وەک سوالەت وا بوون؛ ئەوانیشی گەش کردەوە.

٤ دا شاهیدێ ئەسما بە هەمی وەجهی بناسین
یەک مەستێ سەمەد کر ب یەکی نەقشێ سەنەم دا

٥ یەک گرتییە زولفێ ئو یەکی خالێ نومایی
ئایینە ب ئەسکەندەرێ و جامێ ب جەم دا

**مانای وشەکان:**

**شاهید**: ئاگاداری مەبەست؛ **ئەسما**: ناوان؛ **هەمی**: هەموو؛ **وەجه**: بار، لا؛ **بناسین**: لێ تێبگەین؛ **سەمەد**: بێنیاز؛ **کر**: کرد؛ **سەنەم**: بت؛ **گرتییە**: گرتوویەتە؛ **زولف**: کەزی؛ **نومایی**: نیشانی داوە.

**پوختەی مانا:**

تیشکی خودا، لەو ئاوێنەوە ـکە موحەممەد بووـ دایە دنیا. جا بۆ ئەوە ناوە زۆر و جۆربەجۆرەکانی خودا، هەریەکە جێگەی خۆی بگرێ و مانایان وەدی بێت و ئیرادەی

چۆنە بێتە جێ، هێندێک خەڵکی بە تینی تیشکی خودایی سەرخۆش و مەستی ئەوینی خودای بێنیاز و کارساز کرد، هێندێکیشیانی وا لێ کرد کە بەو تیشکە چاویان لە بەر ئاوێنەکە باش هەڵنەیە و لەباتی دیداری خودا بتومتیان وەبەر چاو بێ و گومڕا ببن. هێندێکیشی بە کەزی و خاڵانەوە گیرۆدە کرد. هەر ئیرادەی خوا خۆیەتی کە ئاوێنە دەنێتە دەس ئەسکەندەر و جام دەکاتە بەشی جەمشید.

٦ ئەرواحێ موقەددەس شەبێ قەدران تە دخوازن
نوورا تەیە میسباح د قیندیلێ حەرەم دا

**مانای وشەکان:**

**ئەرواح**: گیانان؛ **موقەددەس**: پیرۆز؛ **شەب**: شەو؛ **قەدر**: حورمەت، ڕێز؛ **شەوی قەدر**: شەوێکە لە ڕەمەزاندا کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارێ بۆ پێغەمبەر. هەرکەس لەو شەوەدا نزا بکا، خودا تکای دەگرێ؛ **نوور**: تیشک و ڕووناکی؛ **میسباح**: چرا؛ **قیندیل**: جێ چرای هەڵواسراو؛ **حەرەم**: شوێنێکە لازمە ڕێزی لێ بگیرێ و کاری چاکی تێدا بکرێ. حەرەم لێرەدا بەمانا ماڵی کابەیە.

**پوختەی مانا:**

هەموو گیانانی پیرۆز و موبارەک لە شەوانی لەیلەتولقەدردا ـکە نزای تێدا ڕەوا دەبێـ هەر تۆیان نیازە و تەنیا ئاواتەخوازن کە بە دیدارت شاد ببن. ئەو تیشکەی لە چرای ماڵی کابەوە بڵاوە کە لە ناو جێ چرادا هەڵواسراوە، تیشکی تۆیە و هەموو ڕۆشناکی هەر لە تۆڕایە.

٧ دا وەقتێ لیقایێ ب تە حەی بن د بەقایێ
من نەقدێ دل و جان د فەنایێ ب سەلەم دا

**مانای وشەکان:**

**وەقت**: کات؛ **لیقا**: تووش‌هاتن؛ **ب تە**: بە تۆ؛ **حەی**: زیندوو؛ **بەقا**: هەرمان و نەفەوتان؛ **نەقد**: نەغدینە؛ **فەنا**: لەناو چوون؛ **سەلەم**: پێش‌فرۆش.

**پوختەی مانا:**

ئەی دۆست! وا من دەستم لە ژیانی دنیا بەرداوە و هەر لە ئێستاوە نەغدینەی گیان و دڵم بۆ شاد بوون بە دیداری تۆ پێش‌فرۆش کردووە. کە هەرگا دەستم بە تۆ ڕابگا و بە دیدارت شاد ببم، لە پلەی هەرمان و نەفەوتاندا دەمێنمەوە.

٨ یاقووت‌فرۆشان د کەف ئەلماس شکەستن
ئەڤ سەفحەیێ ئەلماسێ کو نەققاشی ڕەقەم دا

**مانای وشەکان:**

**کەف**: لەپی دەست؛ **نەققاش**: دەس‌ڕەنگین؛ **سەفحە**: ڕووکار؛ **ڕەقەم**: خەت‌دان؛ **شکەستن**: شکاندیان.

**پوختەی مانا:**

ئەو سیما و ڕوخسارەی کە لە سپییەتیدا ڕەنگی ئەڵماسی لە بەرەو خستووە و دەس‌ڕەنگینیی خودای داهێنەر خەتی داوە، کارێکی وای بەسەر دنیا و خەڵکی دنیا هێناوە کە گەواهیرفرۆشان لە عەزرەت و ئاواتی ئەو، هێندەیان دەستی خۆ ڕێک گووشیوە کە ئەڵماسیان بەو هەموو سەختییەوە لە ناو لەپدا شکاوە و ورد و خاش بووە.

٩ یا ڕەب ژ چ ڕوو لەب ب سەنایا تە گوشایەم؟[1]
«سُبْحانَکَ لَنْ أُحصِيَ فِي شأنِکَ حَمْدا»

**مانای وشەکان:**

**یا رب**: خوایە؛ **ژ چ ڕوو**: بە کام بۆنەوە؛ **لەب**: لێو، **سنا**: پەسن و پێدا هەڵدان؛ **گوشایەم**: هەڵپچرم؛ **سُبْحانَکَ**: پاکی بۆ تۆیە و تۆ لەوە بەرزتری؛ **لَنْ أُحصِيَ**: هەرگیز بۆم ناژمێردرێ؛ **فی شانِکَ**: دەربارەی تۆ؛ **حَمْد**: سوپاس و پەسن.

---

١. هەڵدەگرێ لەتەبەیتەکە تێکڕا فارسی بێ: «یا رب زِ چه روُ لَب به ثَنای تو گُشایم؟»

**پوختەی مانا:**

خوایە من ئەبێ چی بم و چۆن ڕێگە بدەم بە خۆم کە بە تۆدا هەڵبڵێم؟ تۆ زۆر لەوە بالاتری کە سوپاس و باسی کار و کردەوەی جوانی تۆ لە دەست من بێت. هەرگیز نامکرێ بەرانبەر بە گەورەییت شتێک بڵێم کە شایانی گەورەیی و مەزنایی تۆ بێ.

**١٠** مینەت ژ خودایێ کو ب عەبدێ خۆ «مەلا»یێ
ئیکسیرێ غەمێ عیشقێ، نە دینار و درەم دا

**مانای وشەکان:**

**ئیکسیر**: بە تۆز و دەرمانێک دەڵێن کە ئەگەر بەسەر مسی سوورەوەبوویدا بکەی دەبێتە زێڕ؛ **دینار و درەم**: پووڵ و پارە.

**پوختەی مانا:**

منەتبار و سوپاسگوزاری ئەو خودایەم کە لەباتی پوول و پارە، ئیکسیری خەمی ئەوینی داوە بە مەلای کۆیلەی خۆی.

## ٣

# پەریشانی مەلا

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ئـــیرۆ ژ دەربـــا خەنجـــەرێ | لازم ب ئێشـــــانی مــــــەلا! |
| | تەشـــــبیهێ زولفـــا دلبـــەرێ | زانم پەریشـــــــانی مـــــــەلا! |
| ٢ | زانم پەریشــــــــــانی ژ دل | بـــێ حـــەد ب ئیشـــانی ژ دل |
| | تەشـــــبیهێ بریـــــانی ژ دل | بـــیللاھ نـــە ئینســـانی مـــەلا! |
| ٣ | بـــیللاھ چ تەبعـــەت ئـــادەمی | یەکســـەر دبـێم یـەک عالـەمی |
| | دەریایـــێ قـــاف و قـــولزومی | یـــان چـــەرخێ گـــەردانی مـــەلا! |
| ٤ | یـــارەب چ وێ میحنەتکەشـــی | سـەر تـا قـەدەم تێـک ئاتەشـی |
| | مـــەجرووحێ قەوسـێ توزرەشـی | لـــەو دل ب پـــەیکانی مـــەلا! |
| ٥ | زانم ژ عیشـــــقێ دۆژەهـــــی | بـــەحرەک ژ نـــارێ ئاســـیهی |
| | ئـــیرۆ ل ماهـــێ خەرگـــەهی | تەشـــبیهێ ســـەیوانی مـــەلا! |
| ٦ | ئەڤ سـینەیا وەک نـای و نـەی | پـوڕ لـێ کشـاندن داغ و کـەی |
| | هـــێ دل ب نائـــەهلان ددەی | یـــارەب چ نـــادانی مـــەلا! |

**مانای وشەکان:**

**دەرب**: زەبر؛ **ب ئیشانی**: پرژانی؛ **لازم**: بێ‌گومان؛ **بێ‌حەد**: لەڕادەبەدەر؛ **بریان**: کـەباب؛ **دبێم**: دەبێژم؛ **دەریای قاف**: بەحری موحیت، کە دەیانگوت کێوی قـاف دەوری دنیـای داوە و پێشیشـی لـە هـەر چـوار لاوە دەریایـە؛ **چـەرخی گـەردان**: ئاسمـانی گـەڕۆک؛ **میحنەت**: ئازار و مەینەت؛ **کـەش**: کێش؛ **ئاتـەش**: ئـاگر؛ **مـەجرووح**: برینـدار؛ **قـەوس**: کەوان؛ **توزرەش**: ڕەشی بریقەدار؛ **دۆژە**: جەهەندەم؛ **نار**: ئاگر؛ **ئاسیە**: چاڵووک؛ **ئاسێ**: زۆر دژوار؛ **ماه**: هەیڤ؛ **ماهی خەرگەهی**: بریەتییە لە جوانیی دڵبەر؛ **خـەرگاە**: بارەگـای گەوران؛ **سەیوان**: سایەدەر؛ **کەی**: داغ؛ **نائەهل**: ناباب، نەگونجاو؛ **نادان**: نەزان.

**پوختەی مانا:**

مەلا! ئەمڕۆ لەبەر نووکی خەنجەری سەری مژۆلان، لێم ڕوونە ژان و سۆت زۆرن. وەکوو پرچی ئالۆزی یار، پەرێشان و بیربلاوی. بەو هەموو ئێش و ژانەوە، بەو هەموو دڵپرژانەوە، بەو گش پەرژ و بلاوییەوە، چۆن دەردەبەی؟ بە خوا تۆ وەک هیچکەس ناچی. مرۆ ناتوانێ خۆ بگرێت؛ تۆ هەر ماوی! من ئێژم تۆ ئادەمی نیت؛ تۆ عالەمێکی بەتەنیای؛ دەریای؛ یا خۆ ئەو ئاسمانەی کە خول دەخوا. ئەی خوا هاوار چەندت دەرد و ئازار چەشی؟! سەرتاپا ئاگری گەشی؛ برینداری کەوانی ڕەشی زۆر ڕەشی. دڵت بە پەیکان داچناوە. دڵت لە ئەوین ئاگرە؛ وەک ئاگری جەحەندەمێ. وەک دەریایەکی ئاگری. لە ئاگری زۆر دەورەدەر و سووتێنەر. دەڵێی بە دارکەچاڵووکان نێل دراوە. گڕت بەرزە؛ گەیوەتە تەشقی ئاسمانی ئەو بالایە و خەرمانەیە، لە دەوری هەیڤی ڕوخساری یاری خوێنشیرین، هالایە. سینگت وەک بلوێر کون-کونە؛ داخی لێدیارە. ئەگەر بێت و دڵت بدەی بە دنیایە و جگە لە یار، هیچکەس ترت لە بیر بێ، دەردەکەوێ کە زۆر نەزان و دەبەنگی.

| | | |
|---|---|---|
| ١٠ | دوڕدانەیا دیم گەوهەرە | ئایینەیا ئەسکەندەرە |
| | بێ مروەتێ دلکر کەرە | مەجرووحێ خالانی مەلا! |
| ١١ | بی مروەتێ دل هەڕشاند | تەشبیهێ شیشێ لێ کشاند |
| | کەر کر جەگەر خۆی لێ ڕەشاند | ئاتەش ل سەردانی مەلا! |
| ١٢ | نارێ ژ ڕەنگێ دۆژەهێ | حوسن و جەمالا وێ مەهێ |
| | مە د پەردەیا ڤێ خەرگەهێ | خەفکر چ عوممانی مەلا؟ |
| ١٣ | ئیرۆ ل عومرێ خۆی تەلەف | بێ شاهید و جاما سەدەف |
| | بێ چەنگ و ساز و نای و دەف | زانم پەشیمانی مەلا! |
| ١٤ | زانم تە کووهێ توورە دل | لەو هەر ب نار و نوورە دل |
| | شەهکاسەیا فەرفوورە دل | لەو مەست و سەکرانی مەلا! |

**مانای وشەکان:**

**دوڕدانە**: گەوهەری تاقانە؛ **دوڕدانە**: قوتووی مرواری؛ **کەر**: لەت؛ **بێ مروەت**: بێ پیاوەتی، بێ ئینساف؛ **هەڕشاند**: لەبەریەکی برد؛ **خەف**: وەشارتی؛ **تەلەف**: فیڕۆ؛ **سەدەف**: لانکی مرواری؛ **نار**: ئاگر؛ **سەکران**: سەرخۆش.

**پوختەی مانا:**

دلی مەلا، کە هەمیشە خەیالی ئەو ڕوو بە خالەی گەوهەرینەی لە ناودایە و بۆتە قوتوولکەی گەوهەران و هێندە ڕوونە، وەک ئاوێنەیەکی ئەسکەندەر، لێی بڕوانە، هەموو دنیای تێڕا دیارە، یار شکاندی و بێ ئینساف نەیگوت خەسارە؛ بۆ لەتی کەم؟ لە پاش لەت کردن، قیمەی کرد؛ تێکی هەلکێشا؛ بە ئیسۆتی خالەکانی کزاندییەوە. بە شیشی برژۆلییەوە کرد و هێندێکیش خوێی لە لێوی نمەکینی خۆی پێوە کرد و تینی ئاگری ڕوومەتی لەسەر دانا؛ وا لە برژانە و بەژانە. تۆ بزانە ئاگری ئەوین، کە تەواو وەک ئاگری جەحەندەمە و جوانی یارم، کە لە ئەندازە بەدەرە، دەناو بارەگای دلمدا جێی بۆتەوە و وێک ناکەون. وەشارتیشن؛ کەس پێ نازانێ لەوێدان. بەڕاستی دلی تۆ مەلا هەراوە وەک دەریای عوممان.

مەلا! ئەمڕۆ یارت نەدی؛ پیالەی سەدەفی پڕبادەت لێ وەرنەگرت؛ گوێت لە دەنگی ساز و بلوێر و دەف و چەنگ نەگرتووە؛ کە لە کۆڕی ئەودا هەیە. واتا ژیانت بە فیڕۆ چوو! پەشیمانی لەو ژیانە!

دلت پڕ ئاگر و نوورە. دلی چی هەر کێوی توورە؛ کە خودا خۆی نیشان داوە. لە بادەی ئەوین تژەیە و بۆتە شاکاشی هەلازناو؛ بۆیە دەتبینم سەرخۆشی.

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ | هەر سینە تابێ ناتەمام | ناپوختە خام، بێ میهر و جام |
| | غەرقین د خوونا دل مەدام | لەعلا بەدەخشانی مەلا! |
| ١٦ | پوڕ لەعل و دوڕ تە ژ کلکێ عیشق | ئانینە نەزما سیلکێ عیشق |
| | دەر بەڕڕ و بەحرێ مولکێ عیشق | مەعلوومە خاقانی مەلا! |
| ١٧ | بی حەد ل قەلبێ شوبهێ نەی | جەورا تە دانین داغ و کەی |

| | |
|---|---|
| لەو بی حەمەل خوش نینە مـەی | ئـــەمما بـــە شـــیرانی مـــەلا! |
| ١٨ مینـنــەت ژ تــالیع هــەم ژ بــەخت | ئاسەف ب تەخت و بـەخت و رەخـت |
| بەلقیس ئـەوی ئـانی ب وەخـت | ئـــــیرۆ ســـــولەیمانی مـــــەلا! |
| ١٩ ئەو هەردو لەعل و هـەردو وەشـم | گەهگەهـ ب ناز و گـەهـ ب خەشـم |
| ئـــەو بـــەژنو بـــالا هاتەچەشـــم | مـــە د ســـەیرێ رووحـــانی مـــەلا! |

**مانای وشەکان:**

**ناپوختە**: پێ نەگەیشتوو؛ **خام**: خاو؛ **میهر**: ئەوین؛ **مەدام**: هەمیشە؛ **مەدام**: بادە؛ **لەعل**: لاڵ، کە بەردێکی بەنرخە؛ **بەدەخشان**: ناوچەیەکە لە ئەفغانستان سەربە مەڵبەندی فەیزاباد، لاڵی زۆر باش لەوێ دێنن؛ **کلک**: قەڵەم؛ **نەزم**: هۆنینەوە؛ **سیلک**: لیزگە؛ **بەرِر**: بەژ؛ **خاقان**: وشەیەکی تورکی جەغەتایە، نازناوە بۆ قەراڵەکانی چین و خانەکانی مەغول، تەنانەت سوڵتانەکانی ئەستەمبووڵ و قوڵەپادشاکانی قەجەریش ناوی خۆیان دەنا خاقان، کە بە کوردی بۆتە «قاقان»؛ **حەمەل**: بەرخ؛ **حەمەل**: هەوەڵمانگی بەهار، کە ڕۆژ لە برجی کاورە؛ **شیرانی**: شیرنایەتی؛ **بەشیر**: مژدەدەر؛ **ئانی**: هێنای؛ **تالیع**: چارەنووس؛ **ئاسەف**: وەزیری دەستی ڕاستی سولەیمان پێغەمبەر؛ **رەخت**: شتومەک؛ **بەختی**: لۆکی بەربار؛ **بەلقیس**: بەڵکیس، شازادەخانمی سەبا لە یەمەن، کە بە تەگبیری وەزیری دێو، بۆ سولەیمانیان بە بووک هێنا و پەپوو دەلالی نێوان بوو؛ **وەشم**: خاڵ؛ **خەشم**: تووڕەیی؛ **سەیر**: گەشت؛ **رووحانی**: سەر بە ڕۆح و گیان، گیانی.

**پوختەی مانا:**

هەر سینەیەک، هەر هەناوێک، ئەویندارىی نەزانیبێ و تامی بادەی دڵدارانەی نەچێژتبێ، هەرگیز ناگا و پوختە نابێ و ناتەواوە و شل و خاوە. خۆشی هەر لە خۆتە مەلا! دڵت نوقمی خوێنی ئەوینی دڵدارە و ئەو خوێنە لێت بۆتە بادە و هەمیشە سەرخۆشت دەکات. بەڕاستی تۆ ئێستاکانێ لەچاو خەڵکی- کە وەک خشتی کاڵ ماونەوە- وەکوو لەعلی بەدەخشانی. نەک هەر خۆت بویتە لەعل و بەس، لەعل و دوڕت لە نووکی قەڵەم هەڵدەڕژێن و بە لیزگەی ئەوین هۆنراون. لە سایەی ئەو نووسینانەت، ناوت لە دەریا و بەژ هەیە و ئێستا تۆ وەک قەراڵێکی لە مەڵبەندی ئەویندارانی.

یاری نازدار! زۆرت داغ بە دڵەوە ناوم؛ سەرەوژێر حەو کونت تێ کرد. ئێستا بلوێرە و دەناڵێ. وا مانگی سەرەبەهارە؛ جەنگەی بادە فڕکردنە. بێ کەبابی گۆشتی بەرخ و بێ شیرنایی، ناتەواوە. جەرگم هەیە بۆ کەباب و دڵم بلوێرە و لێدەدا. لێوەکەشت لە شیرینی شیرین‌ترە.

یان: مزگینی و بەڵێنی تۆ، کە دەتبینم، دەبێتە نوقڵی مەجلیسێ.

مەلا دا دەنگ! ئەوا گوێم لە مژدەدەرێکە دەڵێ: یار هات. خودایە لێت منەتبارم. دیارە بەختم وەک ئاسەف بۆ سولەیمانە؛ کە بەڵکیسی بە تەختەوە، بەکەڵوپەلی بەریەوە و بە کاروانی شڕوشاتاڵی جیازەوە، گەیاندە ماڵی سولەیمان. مەلا! تۆش لەمڕۆ بەولاوە سولەیمانی ئەو زەمانەی.

یار هات و چاوم پێ کەوت. دوو خاڵ لە دەوری لێوی بوون؛ نازی دەکرد. بە ناز خۆی لێم توورە دەکرد. گیانم کەوتە گەشت و سەیران و سەیرانێکی زۆر گیانانەی لەو بەژن و باڵا جوانە کرد.

شیاوی باسە: بریان لە ناو کرمانجاندا، بەو کەبابە دەڵێن کە گۆشت دەخرێتە قووڵکەوە و تۆزێک بە گڵ دایدەپۆشن، ئاوری لە سەر دەکەنەوە تا دەپیشێ.

۲۶

## مەششاتەی حوسن

آ مەششاتەیێ حوسنا ئەزەل چەنگالێ زولفان تاب دا
دا عیشق هل بت پێل بە پێل قەلبێ مە پێ جەللاب دا[1]

**مانای وشەکان:**

**مەششاتە**: شانەکەر، بووکجوانکەر، ڕازێنەوە؛ **حوسن**: جوانی؛ **ئەزەل**: هەرە پێشوو؛ **چەنگال**: ئاڵقە، چنگال؛ **زولف**: کەزی؛ **تاب**: داو یان پێچ دان؛ **دا**: هەتا؛ **عیشق**: ئەوین؛ **هل بت**: بەرز بێتەوە؛ **پێل**: مەوج، شەپۆل؛ **قەلبێ مە**: دڵی ئێمە؛ **جەللاب**: کەوی بنە، ئەو کەوەی کە ڕاوکەر لە حەشاردا دایدەنینەوە و دەخوێنێ و کەوی دیکە بە دەنگییەوە دێن و دەداو دەکەون؛ **جەللاب**: جەلاد، کورد بە میرغەزەبی سەربڕ دەڵێن.
جەللاب، وەک لەو بەیتە فولکولۆرییەدا هاتووە کە دەڵێ:

دوو چاوی مەستت بوونە جەللابم  پێیان بفەرموو نەدەن عەزابم

خۆ ئەگەر قولاپیش بێ، ئەوە هەر قولاپەکەی خۆمانە و بە ئاسنی سەر گۆچانی دەڵێن. وێشدەچێ جوللاب بێ و هەر بە مانای قولاپ هاتبێ کە ئەمەش لەهجەیەکی وڵاتی عەرەبە و لە هێندێک جێگە، بە تایبەتی لە میسر و عراق، قاف دەکرێتە جیم. لە باتی «قاعِد» دەڵێن: «جاعِد»؛ **پەی**: دوایی.

**پوختەی مانا:**

ئەو ڕازێنەوەی کە جوانیی ڕێکوپێک دەکرد، یاخۆ جوانیڕازێنەوە هەر لە ڕۆژی بناواندا، قولاپە یان ئاڵقەی کردە داو یان پێچی دا تا ئەوین وردە وردە وەک شەپۆلی لە دوای شەپۆل بۆی سەرکەوێ و دەو داوە با دراوە کەوێ و پێوە ببێ؛ تەواو وەک

---

١. ئەگونجێ ئاخری بەیتەکە «قەلبێ مە پێ قوللاب دا» یان «قەلبێ مە لێ جەللاب دا» بێ کە هەر یەکەیان واتایەکی تایبەتیان هەیە. «هەژار»

حیکایەتی ڕاوکەری بە داو؛ بەڵام فەرقەکە لێرەدایە کە ڕاوکەر کەوی بنەیان داناوە و لێرەدا هەر جوانیی داوەکە دڵی بەرەو خۆی کێشاوە و ئەو پەندەی پێ داوە.
یاخۆ پێچی ئەو زولفە ئاڵقە_ ئاڵقەیە دڵی ئێمەی خستوەتە شوێن جەلادەوە. یاخۆ دڵی ئێمەی بەر قولاپ داوە.

٢ حوسنا حەبیب و لوتفێ یار ئاڤێتە دل عیشقا غەدار
لەو سەلب کر ژێ ئیختیار وێ حوسنێ ئەڤ ئیجاب دا

**مانای وشەکان:**

**حوسن**: جوانی؛ **حەبیب**: دۆست؛ **لوتف**: ناسکی؛ **ئاڤێتە**: هاویشتییە؛ **غەدار**: خاوەن زۆر و داگیرکەر؛ **سەلب**: زەوت؛ **کر**: کرد؛ **ژێ**: لەو؛ **ئیختیار**: دەسەڵات؛ **وێ**: ئەو؛ **ئیجاب دان**: وا ویستن؛ **ئیجاب دا**: وا هەڵدەگرێ.

**پوختەی مانا:**

جوانی و ناسکی ئەو دڵبەرە، ئەوینی خاوەن زۆر و داگیرکەری خستە دڵەوە. جوانی و ناسکی بوونە سەبەب کە عیشقی زۆردار، بە دڵم بزانێ و هەر هات، هەموو ئیختیارێکی لە دەست دەرهێنام. ماڵم حەقە ئەو جوانییە کە من ئەیزانم، هەڵدەگرێ کە هەر خۆی ساحیب ئیختیار بێ.

٣ من دی سەحەر زولفێن د مەست هاتن سەما ئیحرام بەست
چوون سەجدەیا خالێ ب قەست لەو حاجبان میحراب دا

**مانای وشەکان:**

**من دی**: ئەمن دیتم؛ **سەحەر**: بەربەیان؛ **زولفێن**: دوو زولف، بسکی لە هەر دوو لاوە؛ **هاتن سەما**: دەستیان بە سەما کردن و هاتوچۆ کرد؛ **چوون سەجدەیا**: چوونە سەجدەبردن بۆ خاڵ؛ **بە قەست**: بە نیەت هێنانەوە؛ **لەو**: لە بەر ئەوە؛ **حاجب**: برۆ؛ **حاجبان**: دوو برۆ؛ **میحراب دا**: خۆیان بۆ کردن بە میحراب.

**پوختەی مانا:**

لە بەرەبەیاندا کە هێشتا نوێژی سبەینە مابوو، یارم دیت بسکەکانی دەلەرینەوە و وەکوو مەست و سەرخۆشان تلیان دەداو و ڕادەژان. لە کزەبای بەیانی ـکە بای بسکانی پێ دەڵێن- کەوتنە ڕەقس و سەماوە. لە ناکاو بۆ پەرستنی جوانتر لە خۆیان، کەوتنە بیر و بەرگی تەوافیان سازدا و نیەتیان هێنا کە لە ناو میحرابی برۆیان، سوژدە بەرنە بەر خاڵی نێوان چاو و ئەبرۆیان.

٤ ڕووح و ڕەوانێ من حەبیب دیسا ب تەلبیسا ڕەقیب
ڕەنجیدە کر مسکین غەریب تەرکا دلێ ئەحباب دا

**مانای وشەکان:**

**ڕووح و ڕەوان**: گیان؛ **حەبیب**: گراوی؛ **تەلبیس**: حیلە و فەن و فێڵ و گزی؛ **ڕەقیب**: چاوچنۆک و شۆفار؛ **ڕەنجیدە**: دڵشکاو؛ **مسکین**: هەژار؛ **غەریب**: ئاوارە؛ **ئەحباب**: دۆستان.

**پوختەی مانا:**

ئەم یارە خۆشەویستە، کە مایەی گیان و ژیانمە، ئەوا دیسانەوە لە زمانشڕی و گزیکاریی شوفار و چاوچنۆکانەوە، دلی یارانی بە جێ هێشت و هەژار و ئاوارەکانی دڵشکستە کرد.

٥ مەحبووب و ڕەیحان پڕ گولاڤ کەرکر ل من جەرگ و هەناڤ
زەهرا هەلاهیل بوو دە ناڤ لەو ساقی ئەو جوللاب دا

**مانای وشەکان:**

**مەحبووب**: خۆشەویست؛ **ڕەیحان**: ڕیحانە؛ **پڕ**: دارماڵ یان زۆر؛ **گولاڤ**: گولاو؛ **کەر**: لەت؛ **کەرکر**: لەت_ لەت کرد؛ **ل من**: لە من؛ **هەناڤ**: دەروون.

ئەم بەیتە لە دیوانە چاپ کراوەکاندا وا نووسراوە کە ئێمە نووسیومانە. بەلام من لام

وایە لەباتی ڕەیحان، **ڕاح** بووبێ و بە **ڕاحێن** کەوتبێتە شێعرەوە. ڕاح بە بادە ئەڵێن و ڕاحێن جەمعە، واتا شەرابەکانی؛ چوونکە وا ماناکەی ڕێک و لەبارتر دێتەوە.
**زەهر**: ژەهر؛ **هەلاهیل**: سەمێکی زۆر بە قەوەتە. گوایە شیرەی گیایەکی کوشندەیە؛ **ناڤ**: ناو؛ **ساقی**: مەیگێڕ، ئاودێر؛ **جوللاب**: گوڵاوێ کە بە شەکر یان هەنگوێن شیرین کرابێ.

**پوختەی مانا:**

یار کەوا دەمێ ئێمەی بە جێ هێشت، کەوتینە حاڵێکەوە کە شەرابی پڕ گوڵاویش، وەختێ مەیگێر بۆی تێکردین، لە باتی ئەوە پێی وەکەیف بێین، لێمان بوو بە ژەهر و دەتگوت ژەهری هەلاهیل دەخۆینەوە. هەر خواردمانەوە، جەرگ و هەناومان لەتوپەت بوو.

٦ وان دەست و زەند و ساعیدان مەی دانە شێخ و زاهیدان
مەستی ب چەشمێ شاهیدان ئەو نێرگزا سیراب دا

**مانای وشەکان:**
**وان**: ئەوان؛ **زەند و ساعید**: قۆڵ و باسک؛ **شێخ**: پیری تەریقەت؛ **زاهید**: سۆفی تەرکەدنیا؛ **مەستی**: سەرخۆشی؛ **چەشم**: چاو؛ **شاهید**: ئاگادار؛ **نێرگز**: نەرگس؛ **سیراب**: تورت و تێراو.

**پوختەی مانا:**

ئەو مەچەک و باسکە ناسکانە، کە یار مەی پێ ئەدا بە شێخ و سۆفیان تا مەست ببن، ئاگاداران و دڵوشیاران هەر لە ڕێگەی چاوەوە مەست بوون و دیتنی چاوی مەستی یار- کە وەک نێرگزی تێراوە- هۆشی لێساندن.

٧ میسکێ ڕەشاندی ئەز دەبێم وان نوقتەیان هن بوونە کێم
لێ خەتتێ ڕەیحانی ل دیم کاتب ژ نۆ ئیعراب دا

**مانای وشەکان:**

**میسک**: موشک، ئەو ماکە بۆنخۆشەی لە ناوکی جۆرە ئاسکێک پەیدا دەبێ؛ **ڕەشاندی**: پرژاندی؛ **ئەز**: من؛ **دبێم**: دەبێژم، دەڵێم؛ **وان نوقتەیان**: ئەو نوختانە؛ **دیم**: ڕوومەت و ڕۆخسار؛ **کاتب**: نووسەر؛ **ئیعراب**: سەر و بۆر بۆ کردن، یان ڕاست کردنەوەی هەڵە.

**پوختەی مانا:**

هەرچەندی بیر لە نەقش و نیگار و جوانی و لەباری ئەو ڕوومەت و ڕۆخسارە نازدارە دەکەمەوە، دەکەومە سەر ئەو بیر و خەیاڵەوە کە دەڵێم: وا وێدەچێ لە پێشدا هاتبن بۆ ئەوە سپیاییە ساکارەکەی بنەخشێنن، میشکی ڕەشیان لێ پرژاندووە؛ تا ببنە ئەو خاڵە ڕەشە بۆنخۆشانە. لە پاشان کە ڕوانراوە خاڵەکانیان بە کەم زانیوە و ویستوویانە نەخش و نیگارەکە تەیارتر بێ و دیمەن ڕێک و لەبارتر خۆی بنوێنێ. نووسەر ـکە مەبەستی قەڵەموەشێنی هەوەڵە ـ هاتووە بە خەتی ڕێحانی کەمایەسی خاڵانی لە بەین بردووە و ئێستا ئەم خەتە ڕێحانییە کە لەو ڕوخسارەدایە، دەگەڵ خاڵە ڕەشەکان ڕێک کەوتوونەوە و ڕوخساری یار لەوپەڕی جوانیدایە و هیچ هەڵە و کەمایەسی تێدا بەرچاو نایە.

٨ نازکقەدا نوورین بەشەر ئەو بوو ل من نەقشێ بەسەر
دینا خەیالێ هەر سەحەر ناف دیدەیێ بێخوابدا

**مانای وشەکان:**

**نازکقەد**: بەژن باریک، بەژن زراو؛ **نوورین**: نوورانی، شەفاف ؛ **بەشەر**: پێست، یان بنیادەم؛ **ئەو بوو ل من**: ئەو لە من بووە بە؛ **نەقش**: نەخش؛ **بەسەر**: چاو؛ **دین**: دیتن؛ **دینا**: دەیهێنا؛ **سەحەر**: بەیانی؛ **ناڤ**: ناو؛ **دیدە**: چاو؛ **بێخواب**: خەوزڕاو.

**پوختەی مانا:**

ئەو پێست شەفافە یان ئەو بەشەرە بەژن باریکە، لێم بۆتە نەقشی چاوم. وەک بیبیلەی چاومی لێهاتووە. هەموو بەیانیان هەر خەیاڵی ئەو دێتە بەرچاوی لە خەو تۆراومەوە.

٩ ئەو تللی‌یێن نازک ڕەقیق پور دامە فینجانا عەقیق
ئەو بادەیا نوورین ڕەحیق میننەت ب من وەهھاب دا

**مانای وشەکان:**

**تللی**: قامک؛ **نازک**: ناسک؛ **ڕەقیق**: باریک؛ **پڕ**: زۆر یان دارماڵ؛ **فنجان**: پیاڵە؛ **عەقیق**: یاقیق، بەردێکی بەقیمەتە و شاعیران، بۆ ڕەنگەکەی، شەرابیان پێ تەشبێ کردووە؛ **بادە**: شەراب؛ **نوورین**: نوورانی، شەفاف؛ **ڕەحیق**: خالس و بێ‌خڵتە و بۆنخۆش؛ **میننەت**: منە؛ **وەهاب**: زۆر دەهندە و بە بەخشش.

**پوختەی مانا:**

یار بەو قامکە ناسک و باریک و لەبار و شووشانەی خۆی، زۆر فنجانی لە شەرابی ڕۆشنی بێ‌خڵتە و ساف و بۆنخۆش، دەرخوارد دام. زۆر منەکار و منەتبارم کە ئەو بەخشندە دەستبڵاوەم دەست کەوتووە.

١٠ دا خەف نەبت بەژنا فەرێ مەی هاتە شەهکاسا سرێ
میننەت کو ئیرۆ دیمدورێ دیسا شەرابا ناب دا

**مانای وشەکان:**

**دا**: هەتا؛ **خەف**: نادیاری؛ **نەبت**: نەبێت؛ **بەژنا فەرێ**: بەژن و بالای بەلەنجەولار؛ **شەهکاسە**: شاکاشی؛ **سر**: ڕاز و نهێنی؛ **ئیرۆ**: ئەمڕۆ؛ **دیم دور**: ڕوخسار بە وێنەی مرواری؛ **دیسا**: دووبارە؛ **ناب**: بێ خەوش.

**پوختەی مانا:**

بۆ ئەوە بەژن زراوی بەلەنجەولار هەر لە بەر چاومان بێ و خۆمان لێ نەدیو نەکات، بادەی داینێ و مەی ڕژایە ناو هەناوەوە و خۆی گەیاندە دڵەوە کە دڵ وەک شاکاشی ڕاز و نیازان وایە.
یان ئەو دڵەی کە دەفری ڕازداری خودایە، منەتبارم کەوا ئەمڕۆ ئەو ڕوخسار وەک دوڕە، دیسانەوە شەرابی بێ‌خەوشی داینێ.

١١ مەی هاتە فینجانا سەدەف کەس دێ ڤەخوت ئیرۆ ب خەف
ساقی ب چەنگ و نای و دەف فـەرفووریيا مـەهتاب دا

**مانای وشەکان:**

**مەی**: بادە؛ **هاتە**: چووە ناو؛ **فینجان**: دەفر؛ **سەدەف**: گوێ ماسیلکە، جێگەی مرواری؛ **دێ**: دەبێ؛ **ڤەخوت**: بخواتەوە؛ **ئیرۆ**: ئەمـڕۆ؛ **ب خـەف**: بـە دزی؛ **ساقی**: مـەیگێر؛ **چەنگ**: ئامرازێکی مووسیقایە؛ **نای**: بلوێر؛ **دەف**: دەفە؛ **فەرفووری**: پیاڵـەی چیـنی؛ **مەهتاب**: مانگەشەو، ترێفە.

**پوختەی مانا:**

ئەوا شەراب کرایە ناو دەفری سەدەفینەوە. کەسی وا هەیە ئەمـڕۆ بـەدزی بخواتـەوە؟ نەخێر نییە. چە وەختی خۆ شاردنەوەیە؟ ئەوا مەیگێر دەگەڵ ئاوازە و دەنگی چەنگ و دەفە و بلوێر، پیاڵەی چینی پڕ لە شەراب دەگێڕێ کە وەک ترێفەی مانگە.

١٢ عیدە و حەبیبێ نەزرە لێ یان دێ ب قوربان بێ «مـەلێ»
یا ڕەب ببینم ڕۆژ هەلێ سککین د دەسـت قەسسـاب دا

**مانای وشەکان:**

**عید**: جەژن؛ **حەبیب**: دۆست؛ **نـەزرە لێ**: نەزری لە خـۆ گرتـووە؛ **یـان**: یـەعنی؛ **دێ**: دەبێ؛ **ب قوربان بێ**: بە قوربانی بێ، ببێتە قوربانیی بۆ ئەو؛ **مەلێ**: مەلا؛ **یارەب**: ئـەی خوایە؛ **سککین**: چەقۆ؛ **د دەست**: دە دەستی.

**پوختەی مانا:**

ئەوا جێژنە و یار لە خۆی گرتووە قوربانی بکا و مەلایِ هەڵبژاردووە کە بیکاتە قوربانی. هەی خوایە دەی ببینم ڕۆژ هەڵبێ و چەقۆی لە ناو دەستی قەسابدا ببینم و ئەو هەلە پیرۆزەم لە کیس نەچێ. جا چە لەوە خۆشترە ببمە بەلاگەردانی بالای ئەو نازدارە.



# موغبەچەیێن مەیفرۆش

بۆ ئەوە کە لە پوختەی مەبەستی جزیری لەم قەسیدەیەی تێ بگەین، پێویستیمان بە کورتە پێشەکییەک هەیە:
سۆفیایەتی، یا وەک لە ئێراندا باوە و پێی ئەڵێن فەلسەفەی عیرفان، چەندین دەرەجە و پلەی هەیە. کە یەکێک لەوانە خۆ گوم کردن و دەگەڵ خوا تێکەڵ بوونە. سووفی گەیشتۆتە حالەتێک کە جگە لە خودا هیچ شتێکی وە بەرچاو نەهاتووە. هەر ئافەریدەیەک کە هاتۆتە بەرچاوی، بە تیشکدانەوەی ئاوێنەی نووری خوای داناوە و بە لایەوە سێبەرێکە ئەو دەیبینێ و ماک و بنچینەکە، کەوانە کردنی زاتی ئافەرینەندەیە.
جا بەم قۆناغە گوتراوە: «مەنزلگەی فەنافیللاهی» واتا: توانەوە لە خوادا. هەر ئەم ئیستلاحە بە «وەحدەت موتلەق»یش ناو براوە. جا ئەو سۆفییە کە گەیشتۆتە ئەو پلە بەرزە، هەرچییەکی دیوە و هەرچی بە دڵیا تێپەڕیوە، هەر بە خودای زانیوە و من ـ من و تۆ ـ تۆیی و خۆم و خۆیی لە نێواندا نەماوە. واتا: ئەگەر هێندێک لەو سۆفییانە وەک حوسەینی کوڕی مەنسووری هەلاج، سەید ئەحمەدی ڕوفاعی، بایەزیدی بەستامی و زۆری تریش، کە لەم وتارەدا ناگونجێ هەموویان ناو بەرین، لە کۆڕی جەزم بووندا گوتویانە من خودام! مەبەستیان کفر کردن نەبووە. ئەوانە خۆیان بە تنۆکێک دیوە لە ناو دەریاییکی بێ پەی و بێ سەروبن و ئەو تنۆکەش هەر پاژێک لەو دەریایەیە و ئەگەر گوتوویەتی «من دەریام»، ڕاستی گوتووە. تنۆک لە ناو دەریادا دەتوانێ بڵێ دەریام. پاژ دەتوانێ خۆی  بە ناوی گش ناو بنێ و هەر کاتێ جوزء خۆی بە ناوی کول بناسێنێ، عەیبی لێ ناگیرێ. جا ئەو سۆفییە کە بە پەیژەی خواناسیندا ئەوندە سەردەکەوت کە پای ئەنایە سەرپلەی تیکەلاویی لەگەڵ خوادا؛ نەک هەر خۆی بە خوا دەهاتە بەرچاو بگرە هەرچێکی ئەیدیت، خوای تیا بەدی ئەکرد.
شێخ سەعدی لەم بارەوە دەڵێ:

موحّد همان بیند اندر اِبِل　　که در خوبرویانِ چین و چِگِل

یانی کابرا کە دەگاتە پایەی ئیمان بە وەحدەتی موتلەق، چە بڕوانێتە بیچمی ناقۆلای وشتر و چە بڕوانێتە بەژن و باڵای ڕێکی لاوچاکان و ڕووپاکانەوە، جگە لە تیشک و ڕۆشناکی خوا هیچ نابینێ و جگە لە خوا بە بەرچاو و دڵی ئەوا نایە.

جا ئەگەر شێخ ئەحمەدی جزیری خۆمان وشتری پێ جوان نەبووە یاخۆ لەو شاخ و بەرد و چڕ و هەردەی جزیری بۆتان وشترێک نەبووە کە سەرنجی ڕابکێشێ! بە دیمەنی شۆخ و شەنگی سەلمای کیژی میرەوە گرتوویە و نووری خوا لە گۆشەی چاوی مەستی سەلماوە خۆی نیشان داوە و بەرەو خۆی کێشاوە و حاڵەتی جەزمەی پێ داوە و خۆی لە کۆڕی بەزمی مەیگێڕاندا دیوە کە دەستی بەزەیی خوا پڕی پێداکردووە و بردوویە و لە بارەگای بەرزی خۆیا جێگەی بۆ کردۆتەوە و تنۆک لە دەریای ماک و بنچێنەدا تواوەتەوە و بۆتەوە بە تنۆکە ئاوەکەی هەمان سەرچاوەوە.

جا ئێستا کە ئەم پێشەکییەمان بە سەرچڵی پێشکەش کرد، ڕەنگە هاسانتر لەم قەسیدە بگەین. دادەی با بزانین ئەڵێ چی؟

آ　موغبەچەیێن مەیفرۆش هەر سەحەرێ تێن سەما
　بادەخوران نۆش ـ نۆش مانە ل دۆرێ جەما

**مانای وشەکان:**

**موغ**: مەلای زەردەشتی؛ **بەچە**: منداڵۆکە؛ بەڵام «موغبەچە» بە تێکڕایی، بەو منداڵە دەمڕووتانەیان گوتووە کە مەیگێڕی مەیخانەکان بوون؛ **مەیفرۆش**: مەیخانەچی؛ **هەرسەحەرێ**: هەر بەیانییەک یان هەموو بەیانییەک؛ **تێن**: دێن؛ **سەما**: هەڵپەڕکی و دیلان؛ **بادەخوران**: شەرابفڕکەران؛ **نۆش ـ نۆش**: دەگەڵ خواردنەوەی پیاڵە بەدووی پیاڵەدا، یان بە گوتنی نۆشت بێ! نۆشت بێ!؛ **مانە**: ماون؛ **ل دۆرێ**: لە دەورە؛ **جەما**: کۆمەڵ.

**پوختەی مانا:**

شەرابخۆرانی زۆر لەزەبر، شەو و ڕۆژ لە مەیخانەدا بەسەر دەبەن و ئەوندە لە جۆشن کە لە بەرەبەیانانیشدا بەزم و ئاهەنگ سستی و کزی بەسەرا نایە! جا لە بەرەبەیاندا، کاتێ

ئەو مەیگێڕە لووس و سادانە لە ناو کۆڕی سەرخۆشاندا سوور ئەدەن و بەزم گەرمە، شەرابخۆرانی هاودەم و هامپیالەش پتر گەرم دادێن و پیاڵە بە شوێن پیاڵەدا، شەراب فڕدەکەن و بانگاوازی «نۆشتبێ! نۆشتبێ!» لەو ناوەدا دەنگ ئەداتەوە و بە تێکڕایی لە دەوری سەما و ڕەقسی ئەو مەیگێڕە لووس و پووسانە، کۆ دەبنەوە و تێیان ڕائەمێنن.

٢ هن گولێ بۆعەنبەرن هن د شیرینئەسمەرن
هن گوهەرێ دانەیین میسلێ سوهەیلێ سەما

**مانای وشەکان:**

**هن**: هێندێک؛ **گول**: گوڵ؛ **بۆ**: بۆن و بەرامە؛ **عەنبەر**: ماکێکی زۆر بۆنخۆشە کە لە ناو ورگی جۆرە ماسییەکدا دەس دەکەوێ؛ **گوهەر**: گەوهەر؛ **دانە**: بێوێنە؛ **میسل**: وەکوو؛ **سوهەیل**: کاروانکوژە، ئەستێرەی سیوەیل ؛ **سەما**: ئاسمان.

**پوختەی مانا:**

ئەو منداڵە لووسە مەیگێڕانە، هێندێکیان گوڵن و بەرامەی عەنبەریان هەیە؛ هێندێکیان گەنمڕەنگی دڵکێشن. هێندێک وەک گەوهەری تاقانە وان و بە وێنەی ئەستێرە سیوەیلەکەی ئاسمان تیشک ئەدەنەوە.

٣ هن زەرینە پوڕسوڕن سەر ب پەرن دێم دوڕن
من کو د چەرخێ وە دی سەبر و قەرارم نەما

**مانای وشەکان:**

**زەری**: سەوزە ڕەنگ؛ **پڕ**: زۆر، یان تژە؛ **سوڕ**: دڵکێشی و جازبییەت؛ **سەر ب پەرن**: پەڕیان لە سەریان داوە، یان **سەر ب پۆرن**: کاکۆڵیان هەیە؛ **دیم**: ڕوومەت و دەم و چاو؛ **دوڕ**: مرواری درشت؛ **کو**: کە؛ **چەرخ**: کۆز و کۆڕ؛ **ڤە**: وەها؛ **دی**: دیت.

**پوختەی مانا:**

هێندێکیش لەو مەیگێڕانە سەوزەڵە ڕەنگ و خوێنشیرین و دڵکێشن؛ کاکۆڵیان هەیە.

یاخۆ پەریان لە سەریان داوە بۆ جوانی. دەموچاو و ڕوخساریان وەک مرواری درشت، ساف و ڕووناکە. کاتێ من لە کۆڕی بەزمدا ئەو دیمەنەم بەرچاو کەوت، ئیتر بە جارێک ئارام و ئۆقرەم لێ هەڵگیرا.

۴ سەبر و قەرارم کو بر جـان و جەگـەر هـور دکـر
زولمێ وەرەنگ کـێ دکـر جـان دبـر و دل تـەبا

**مانای وشەکان:**

**سەبر و قەرار**: ئۆقرە و ئارام؛ **کو**: کە؛ **بر**: بردی؛ **جان**: هەم لەش هـەم ڕۆح؛ **جەگـەر**: جەرگ؛ **هور**: ورد؛ **دکر**: دەکرد؛ **دبر**: دەبرد؛ **تەبا**: دەگەڵ.

**پوختەی مانا:**

دیسـان مـەلا بایداوەتـە سـەر ئـەو بـاوەڕە کـە باسـی کـرا. بـەڵام لێـرەدا جـارێ چوارچێوەیەکی ئامانەتی بۆ دروست کردووە. ئەم دیمەنە جوانەی ڕەقس و سەمای ئەو مەیگێڕە خونچیلە و خوێنشیرینانەی بە تیشکێکی جوانی سـەلما دانـاوە کـە خـودی سەلما و جوانییەکەش هەر پاژێکن لە دەریای نووری خوا و لێرەدا هەموو جوانییـەکان لەو سەرچاوەدا بەدی ئەکرێن. جا ئەفەرموێ: کاتـێ مـن ئـارام و سـەبرم لـە دەسـت دەرچـوو ـکـە دیـارە سـەلما بـە تـاڵانی بردبـوو ـ بەوەندەشـەوە نەوەسـتا، گیـان و جەرگیشمی هەنجنی. ئاخر بابە بڕوانن کێ تا ئێستا ناهەقی وای کـردووە کـە گیـان بەرێ و دڵیشی لەگەڵ بەرێ و هیچ بۆ تاڵان کراوەکە نەهێڵێتەوە؟!

مەلا تا ئێرە دێت و گورجێ هۆشی خوا ناسینەکەی لەم بێهۆش بوونەدا وشیار ئەبێتەوە و بەرپەرچی قسەکەی خۆی ئەداتەوە و ئەڵێ: ماڵوێران! ئەم من_من و تۆ_تۆیەت لە چییە؟ تۆ چیی؟ تا گیان و دڵێکت هەبێ و یار بیبا؟ هەرچی هەیەو نییە هەر خۆیەتی. گیان و دڵێک کوا من بڵێم هی منە؟ هەر خۆیەتی کە گیان و دڵە. ئەفەرموێ:

۵ جـان و دلـێ مـن ئـەوە حۆریوەشـێ مـن ئـەوە
پادشـەهێ مـن ئـەوە ئـەز ل دەرێ وێ گـەدا

**مانای وشەکان:**

**حۆر**: حۆری، جوانچاکی چاوڕەش؛ **وەش**: ئاسا؛ **ئەز**: مـن؛ **ل دەرێ وی**: لـە دەرگـای ئەو؛ **گەدا**: پارسەک و سوالکەر.

**پوختەی مانا:**

گیان و دڵی من ئەوە. ڕەنگ حۆرییەکەی من هەر خۆیەتی. پاشای من هەر ئەوە. من لە دەرگای ئەوا گەداییێکی ڕووت و هەناسەساردم.

٦ یارێ کو دی ئەم گەدا دەست ب دەستێ مـە دا
ئەم ب سەمایێ برین ڕەقس و سەما ژێ (سەماژی) وە ما

**مانای وشەکان:**

**یارێ**: یارەکە؛ **کو دی**: کاتێ دیتی؛ **ئەم**: ئێمە؛ **مە**: ئێمە؛ **سەما**: ئاسمان، یان ڕەقس؛ **برین**: بردین؛ **ڕەقس و سەما**: هەڵپەرکێ و بەزم، یان هەڵپەڕکێ و ئاسمان؛ **ژێ**: لەو؛ **ژی**: ـیش؛ **وەما**: هەروەها ما، یان: بەجێ ما.

**پوختەی مانا:**

تا پێم وابوو من منم و گیان و دڵێکم هەیە کە بە تالان براوە و ڕۆژێـک لـە ڕۆژان خـاوەنی شتێک بووم، ئەوا سەرگەردان و بێدەرەتان مابوومەوە. بەڵام کـە لـە جەرگـەی بێهۆشـیدا هۆشم هاتە بەر و تێگەیشتم کە نە من هەم و نە جەرگ و هەناو و گیان هـی مـن بـووە و من جگە لە گەدایەکی هەناسەساردی لە بەر ئاستانەی یار کەوتوو، شـتێک نـیم و هـەموو شت هەر خۆیەتی، ئەوسا یار ــکە دیتی من بە گـەدایی خـۆم زانیـوەــ بـەزەیی بـزووت و دەستی خستە ناو دەستمەوە و منی بردە ناو کۆڕی بەزمەکەوە و بە چـوونی مـنی گـەدا، ڕەقس و ئاهەنگ هیچ تێک نەچوو؛ لە پێشدا چۆن بوو هەر وەک خۆی ما.

یان ئەڵێ: دەستی خستە ناو دەسـتم و مـنی بـەرز کـردەوە و بـەرەو ژووری بـردم و گەیاندمیە جێگایەک و پلەیەک لە قەدر و عێززەت کە سەهلە ڕەقـس و بـەزمی سـەر عەرز، ئاسمانیش لەو پلەیە بەجێ ما و نەویتر خۆی دەنواند. واتا بە قەولی سەعدی:

مـرۆ دەگاتـە شـوێنێک مـەگین خـودا لـەوێ بـێ
بنـۆڕ چ پایەبـەرزیت هـەر هێندەیـە خـودا نی[1]

۷ گۆتـە مـە دوڕدانـەیی ئـەم ژ تـە و تـۆ ژ مـەی
لەو ب حەقیقەت یەکین مەسئەلە بێ شـوبهە مـا

**مانای وشەکان:**

**گۆتە مە**: بە ئێمەی گوت؛ **دوڕدانە**: دوڕی تاقانە و بێوێنە؛ **ئەم ژ تە**: ئێمە لە تۆ؛ **تۆ ژ مەی**: تۆ لە ئێمەی؛ **لەو**: بۆیە؛ **ب حەقیقەت**: لە ڕاستیدا؛ **بێ شـوبهە مـا**: بێگومـان و ڕۆشن بۆوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو گەوهەرە تاقانە و بێچوونە بە ئێمەی گوت: ئێمە لە تۆین و تۆش لە ئێمەی. هـەر بۆیە ئەگەر ڕاست بیر بکەیەوە ئەزانی کە ئێمە یەکێکین و من و تۆییەک لـە گۆڕێـدا نییە. ئیتر مەسئەلەکە لە لای من تەواو ڕۆشن بۆوە و هیچ گومان و دوودڵیم نەما.

۸ دا مە ب دەسـتێ سـوڕێ جامـا ژ ڕەنگـێ دوڕێ
جەزبـە گهـا جـان و دل پـر شەوشـاندن هـەما

**مانای وشەکان:**

**دا مە**: دای بە ئێمە؛ **ب دەستێ سوڕێ**: بە دەستێکی نادیاری؛ **جامـا**: پیاڵـەی؛ **ژ ڕەنگـێ**: بە وێنەی؛ **دوڕ**: مرواری درشت؛ **جەزبە**: حاڵـەت لێهـاتن؛ **گهـا**: گەییشـت؛ **پـر**: گـەلیک، یەکجار زۆر؛ **شەوشاندن**: شێواندنی؛ **هەما**: هەروەها، بە بێئەوە خۆم ئاگا بکەم.

---

۱. رسد آدمی به جایی که بجز خُدا نبیند     بنگر که تا چه حدّ است مکان آدمّیت

**پوختەی مانا:**

یار کە منی گەیاندە بەزمی بارەگای خۆی و تێی گەیاندم کە هیچ فەرق و جیاوازییەک لە نێواندا نییە و پەردەی گومان و دوودڵی منی لە نێوان لابرد و باشی تێگەییشتم مەسەلە چییە، ئەونسا بە دەستی نادیاری لە منڕا، یاخۆ بە دەستی پڕ لە جازبێتی خۆی، پیاڵەیەکی دایە دەستم کە تەواو وەک مرواری ئەینواند. هەرکە پیاڵە گەییشتە دەستم، جەزبە خۆی گەیاندمێ و بە یەکجاری گیان و دڵمی ئاڵۆز و پەرێشان کرد و ناشتوانم هۆی هاتنی ئەو حاڵەتە بەیان کەم.

٩ بادە مە نۆشی ژ دەست چوومە ژ خۆ مامە مەست
قەترە بە بەحرێ گها بەحر ب عەینێ خۆ ما

**مانای وشەکان:**

**بادە**: شەراو؛ **مە نوشی**: ئێمە خواردمانەوە؛ **ژ دەست**: لە دەست؛ **چوومە ژ خۆ**: لە خۆ چووم، بوورامەوە؛ **مامە مەست**: بە مەستی مامەوە؛ **قەترە**: تنۆک، دڵۆپ؛ **بەحر**: دەریا؛ **گها**: گەییشت؛ **عەینی خۆ**: هەر وەک خۆی.

**پوختەی مانا:**

بادەمان لە دەستی ئەو گەوهەرە تاقانەیە وەرگرت و خواردمانەوە. دڵم بوورایەوە و کەوتمە سەرخۆشییەکی بێبڕانەوە. واتا: تنۆکە ئاو، گەییشتەوە دەریا و دەریاش هەر وەکوو خۆی ما. بە من هیچ زیاد و کەمی نەکرد و بە لێلایی من لێڵ نەبوو. دەپێشدا هەر پاژێک لە دەریا بووم و ئێستاش دەگەڵ دەریادا تێکەڵ بوومەوە و دەریا منە و من دەریام.

١٠ گووش بە عامێ مەدە تەرکێ مودامێ مەدە
«اکثَرُهُمْ فی غُمی أغلَبُهُمْ فی عَما»

**مانای وشەکان:**

**گووش**: گوێ؛ **عامی**: خەڵکی ڕەمەکی؛ **مودام**، یان **مەدام**: شەراب؛ **اکثَرُهُمْ**: زۆربەیان؛ فی: لە ناو؛ **غُمی**: بێهوشی؛ **اغلَبُهُمْ**: زیاتریان؛ **عَما**: کوێری.

**پوختەی مانا:**

مەلای جزیری دوای ئەوە کە خۆی لەو پلە بەرزەیەی خوا ناسیندا دیتەوە و کورد گوتەنی: کەڵەشێری خۆی بە لەپەوە لێناوە، ئاوڕێک وەسەر خەڵک دەداتەوە و ئامۆژگاریی ڕێڕەوانی تەریقەت دەکا کە نەچن گوێ بدەنە ئەو خەڵکە ڕەمەکییە کە لایان وایە ئافەریدە لە خوا جیایە و بە من ـ من خۆیان هەڵدەمسێنن و ڕێڕەوانی ڕاستەقینەیان بەر تەوس و پلار داوە و ناو و نیرتکەی کفر و لە ڕێگە لادانیان پێوە دەلکێنن. دەڵێ: نەکەی دەغیلە گوێ لەو ئاپۆرە نەزانانە بگری و تەرکی بادەنۆشییەکەی بەزمی ئێمە بکەی! ئەوانەی ئەو لۆمە و لەقەمانە هەڵدەبەستن، زۆربەیان تۆزقاڵێک هۆش و بیریان نییە و زیاتریان هەر تەواو کوێر و کوترن و ڕەش و سپی لێک ناکەنەوە!

١١
حەرفێ ژ یەک بوونە فەسڵ گەر ببری وان ب ئەسڵ
حەرف دبت یەک خەتەک خەت کو نەما نوقتە ما

**مانای وشەکان:**

**حەرف**: پیت؛ **ژ یەک**: لە یەکتر؛ **بوونە فەسڵ**: جوێ بوونەوە؛ **گەر ببری**: ئەگەر بەرییەوە؛ **وان**: ئەوان؛ **ب ئەسل**: بۆ سەر ماک و بنچینە؛ **دبت**: دەبێتە؛ **یەک خەتەک**: تاکە خەتێک؛ **کو نەما**: ئەگەر نەما؛ **نوقتە ما**: نوقتە ماوە.

**پوختەی مانا:**

ئەم مەوجووداتەی کە هەیە و هەبووە و دەبێ، هەمووی لە یەک نوختەی سەرەتاییەوە پەیدایە. نوختەی سەرەتایی واتا نوقتەی مەبدەء، ئەزەلی و ئەبەدییە؛ هەر بووە و هەر دەبێ و گۆڕانێکی بەسەردا نایە و ناسوێ و لە بەین ناچێ. جا لەو نوختە سەرتاییەوە

هێڵ و خەت کشاوە و هێڵ و خەتیش پارچە ــ پارچە کراوە و پیتی لێ پەیدا بووە و ئەو پیتانە بوونەتە درۆشمی هەموو مەوجوداتی جۆراوجۆر و هەمەڕەنگە. ئێمە ئەگەر بێت و ئەوانە بەرینەوە سەر عەسل و ماک، پیتەکان دەبنەوە بە هێڵ و ئەگەر بە بناوانی هێڵەکەدا بڕۆین، تووشی نوختە و خاڵی سەرەتایی دەبین. ئەگەر ئەو خەتەش کە پیتەکانی لێ پێک هاتووە نەمێنێ، ئەو خاڵە سەرەتاییە هەر وەک خۆیەتی و هەر لە جێگەی خۆیەتی و دووبارە دەتوانێ ببێتە ماکی خەت و خەت ببێتە ڕەگەزی پیت و پیت دووبارە بە شکڵی جیاواز خۆ بنوێنن.

جا کە وا بوو، بۆ کەسێکی کە بەسەر ڕاستیدا بکەوێ و باشی لێک بداتەوە، ئەوی حەسابی بۆ دەکرێ و ئەوی لە ڕاستیدا ماکی هەموو پیت و خەتێکە، ئەو نوقتە ئەزەلی و ئەبەدییەیە و چیتر نییە. واتا وەحدەتی موتڵەقە و جگە لە خوا شتێکیتر حەساوی بۆ ناکرێ.

١٢ وەحدەتێ موتڵەق «مەلا»! نوورە د قەلبان جەلا
زۆرێ د ڤێ مەسئەلێ ئەهلێ دلان شوبهە ما

**مانای وشەکان:**

**وەحدەت**: یەکایەتی؛ **موتڵەق**: بێ بەند و چەندوچوون؛ **جەلا**: مشتوماڵ، یان سورمە؛ **زۆر**: گەلێک؛ **د ڤێ مەسئەلێ**: دەو مەسئەلەیەدا؛ **شوبهە**: گومان و دوو دڵی.

**پوختەی مانا:**

ئیمان و باوەڕی بەو یەکییەتی بێ چەند و چوون و بە بند و بارە، هۆ مەلا! تیشکێکە دڵان مشتوماڵ دەدات. یان نوورێکە هەر وەک سورمە، چاو ڕوون دەکاتەوە و خشت و خاڵی لێ لا دەدا. ئەو باوەڕەش دڵی ڕێڕەوانی ڕاستی ڕوون دەکاتەوە و پڕوپووشی پڕوپووچی لێ ڕادەماڵێ. بەلام بەو دەرەجەی ئیمان و باوەڕی گەیشتنە هەروا کارێکی سووک و هاسان نییە و زۆری دەوێ تا ڕێبواری ڕێگەی خوا ناسین دەیگاتێ. بەشێکی زۆر و زەبەندە لە ئەهلی دڵ و ڕێڕەوانی تەریقەت، هێشتا نەگەیشتوونە سەر ڕاستەڕێگە و لە بیابانی دوودڵی و گوماندا سەرگەردانن.

# غەم و شادی

١ چین_چین کرن زولفێن سیا کەسکئەتلەسا دیبا قەبا
ئێدی نیشان نابن خویا تێکل کرن لازم سەبا

**مانای وشەکان:**

**چین**: گنج؛ **کرن**: کردن؛ زولفێن: زولفان؛ **سیا**: ڕەش؛ **کەسک**: سەوز؛ **ئەتلەس**: نەوعێک پارچە؛ **دیبا**: حەریر؛ **قەبا**: کەوا؛ **ئیدی**: ئیتر؛ **نیشان**: خاڵ؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **تێکل**: تێکەڵ؛ **سەبا**: شنەبای بەیانی.

**پوختەی مانا:**

ئەو یارە جوانە سەوزەپۆشەی کەوا حەریرە، ئەوندەی ئەو زولفە ڕەشانە گنج_گنج کرد کە بوونەتە لەمپەری دیمەنی خاڵی ڕوخساری. لێشم ڕوونە ئەوە کاری شنەی بەیانە کە ئەو بسکە لوولانەی تێکەڵ کردوون و بەسەر ڕوخساری یاری دارڕژتوون و ئێمەی لە دیتنی خاڵان بێبەش کردووە.

٢ من دی سەبا دایێ سەحەر ماداریێ بەدریێ کر دو کەر
قەوسوقەزەح ژێ هاتە دەر دیسا بە زولفانرا تەبا

**مانای وشەکان:**

**من دی**: من دیتم؛ **سەبا**: سروە؛ **دایی سەحەر**: شەوەکێ لێیدا؛ **مادار**: دەورە و خرایی؛ **بەدر**: مانگی چاردە؛ **کر**: کرد؛ **دو کەر**: دوو لەت؛ **قەوس وقەزەح**: کۆلکەزێڕینە؛ **ژێ**: لەو؛ **دیسا**: دیسان، یان داییسا؛ **بە زولفانرا**: بە زولفانەوە؛ **تەبا**: دەگەڵ.

**پوختەی مانا:**

من بە چاوی خۆم دیتم لە بەرەبەیاندا بای بسکان، ئەو بسکە ڕەشانەی هەژاند و خستە سەر ڕوخساری یار و وەک ئەوەم هاتە بەرچاو کە مانگی چاردەی کردبێتە دوو لەتەوە. هەر ئەو شنەبایە کە لە هاتندا بۆ جاروبارەیەک کەمێک لەو بسکانەی سەر ڕوخساری کە دەلەراندەوە، تیشکی کولمیَ یار جاروبارە لە پەنا زولفانەوە خۆی دەنواند و دیمەنی زەردایی ئەو تیسمالکە تیشکە دەگەڵ دیمەنی ئەتلەسی کەسک و حەریری ڕەنگاورەنگی بەرگی یار تەواو دیمەنی کۆلکەزێرینەیان هەبوو؛ کە لە پەنا هەورەوە دیاری ئەدەن و نابیَ لە بیریشمان بچیَ کە بسکەکانی وەک ئەو هەورە وا بوون کە ڕۆژیان نەدیو کردبوو.

شیاوی باسە: مەلا لەو شیعرەدا ئیشارە بە مۆجزاتێکی پێغەمبەر(د) دەکا، کە مانگی کردووە بە دوو کوتەوە. واتا لەو دیمەنەدا مۆجزەکە دیسان خۆی نیشان داوە؛ بەڵام ئەمجارە لە زولف و ڕوخساری سەلماوە. پیاو وەختیَ چاوی بە مۆجزات دەکەویَ دەبیَ سەڵوات لیَ بدا و سەلام بڵیَ؛ بۆیە ئەفەرمویَ:

٣ ئیرۆ ژ مە ل بەدرا تەمام عەنبەرفشان بن سەد سەلام
«ای هُدهُدِ شیرین‌کلام! أهلاً وَ سَهْلاً مَرْحَبا»

**مانای وشەکان:**

**ل**: لە؛ **بەدر**: مانگی پڕ؛ **تەمام**: تەواو؛ **عەنبەر**: بۆنێکی خۆشە؛ **فشان**: پڕژێن؛ **هُدهُد**: پەپوو؛ **شیرین‌کلام**: گفت‌ولفت‌خۆش؛ **اهل**: ئاشنا؛ **سەهل**: هاسان و ڕۆح‌سووک.

**پوختەی مانا:**

لە کتێبەکانی ئایینیدا هاتووە کە سلێمان پێغەمبەری پادشای جوولەکان، جگە لە ئادەمیزاد هەموو جانەوەرێکیش لە دنیادا سەری وە بەر باری هێناوە و لە بەر فەرمانیدا لارەمل وێستاون. ئەویش زمانی دێو و درنج و درندە و پەرندە و چەرندەی وەک زمانەکەی خۆی زانیوە. ئەم سلێمانە دڵی چووەتە سەر شاژنی سەبا کە لە یەمەنی ئێستادا بووە. ئەم دڵدارییەش لە قسەی پەپوویەکەوە دەستی داوە کە بۆی گێڕاوەتەوە

و گوتوویە: قوربان! پاشازادەییێکی مێچکەی زۆر جوانم لە سەبا دیوە کە جگە لە جوانییەکەی هێندە و هێندە زێڕ و زێوی هەیە و تەنانەت ئەو تەختەی کە لە سەری دائەنیشێ لە زێڕی خالیسە و ئەگەر ئەوەت دەس کەوێ خەنی دەبی. سلێمان نەدیتە عاشقی ئەو کیژە بووە کە ناوی بەلکیس خانم بووە و هەر پەپووی کردۆتە دەلالی نێوان و نامەی پێدا ناردووە بۆ بەلکیس کە مێردی پێ بکا. پەپوو لەو دەلالیەدا سەرکەوتووە. ئەمجار دیتوویانە کە هێنانی ئەو کیژە لەم ڕێگە دوورەوە زۆر دژوارە. چیبکەن چاکە؟ دێوێکی بنچینە جندۆکە هەستایە پێ و گوتی: خەمت نەبێ! بەر لەوە تۆ لەو مەجلیسە هەستی من دەچم تەخت و بەلکیس خانمت بۆ ئەهێنم. یەکێکیتر کە لەو زاناتر بوو گوتی: من بەر لەوە چاوت بترووکێنی ئەو تەختەت بۆ ئەهێنم. سلێمان دیتی وا تەختە دانراوە و وا بەلکیسە بۆی ڕازاوەتەوە و ڕووبەڕووی دێت. ئیتر لەو ساوە ناوی پەپوو بەسەر زمانی نووسەران و شاعیرانەوە گەڕاوە و ئەگەڕێ و ئەیکەن بە ڕازداری خۆیان و بەودا دەردی دڵ ڕادەسپێرن بۆ یارە دووردەستەکانیان.

مەلای جزیری دوای ئەوە ئەو مۆجزاتەی دیوە کە مانگی چاردە بۆتە دوو کەرت و زولفە ڕەشەکان بە دەم باوە، بەسەر ڕوخساری یاردا دەلەرێنەوە و بۆنی عەنبەر و گولاو لەو ناوەدا بلاوە، دەست دەکا بە سەلەوات لێدان و سەلام ناردن. دەفەرموێ: ئەمڕۆ لە ئێمەوە سەد سەلام لەو مانگە تەواوە عەنبەر و گولاوپژێنە بێ. ئەوسا دەستەودامێنی پەپوو دەبێ کە ئەوە خوایە مل بدا و نامەی مەلا بۆ سەلما خانم بەرێ. جا دێ دەپێشدا باسی جوانی و نەجیمزادەیی سەلمای بۆ دەکا تا ئەگەر نامەکەی برد، یار بناسێ و بیداتە دەست خۆی. دەڵێ: ئەی پەپووی گفتولفت شیرین! یاخوا بە خێر هاتی. تۆ وەک کەس و کاری خۆمی؛ زۆر ڕەزاسووکی. جێگەت لەسەر سەران و لەسەر چاوان. تۆ ئەبێ بزانی کە:

۴ من دلبەرەک وەک دوڕ هەیە مەحبووبێ شیرێن‌سوڕ هەیە
حوسن و جەمالەک پوڕ هەیە بەلقیس‌سیفەت مەسکەن سەبا

**مانای وشەکان:**

**دلبەرەک**: گراوییەک؛ **دوڕ**: مرواری تاقانە؛ **مەحبووب**: خۆشەویست؛ **سوڕ**: دلکێشی و جازبییەت؛ **حوسن و جەمال**: جوانی و لەباری؛ **پوڕ**: زۆر؛ **بلقیس‌سیفەت**: بەلکیس‌ئاسایی؛ **مەسکەن**: ماڵ.

**پوختەی مانا:**

پەپووگیان! من دلڕفێنێکم هەیە وەک دوڕ وایە. خۆشەویستێکم هەیە تا بلێی ڕەزاشیرین و پڕ لە جازبییەت و دلکێشییە. هەرچەندی دڵ حەز بکا، جوان و لەبارە. وەک ئەو بەلکیسە وایە کە ماڵەکەی لە شاری سەبا بوو. یانی ئەویش پاشازادەیەکە لە بەلکیسی سلێمان کەمتر نییە. دەبێ چیت بۆ سلێمان کرد، ئەوەیش بۆ من بکەی. جا هەروەک جوانی و نەجیم‌زادەییەکەیم پێ گوتووی، پێویستە هێندێک لە ئاکار و کرداریشی بزانی:

۵ شووخ و شەپالا مەی‌پەرەست ئەو زالما هشیار و مەست
ڤێ نامەیێ خەف دێ ڤ دەست «فی طَیّها نَشرُالنَبا»

**مانای وشەکان:**

**شووخ**: شەنگ؛ **شەپال**: بەژن و بالا شووش و باریک؛ **زالم**: زۆرکار؛ **هشیار**: بەئاگا؛ **مەست**: سەرخۆش؛ **ڤێ**: ئەو؛ **خەف**: بە نهێنی؛ **دی**: بدەی؛ **ڤ دەست**: بە دەست؛ **فی**: لە ناو؛ **طَیّها**: لۆچیدا؛ **نشر**: بلاو کردنەوە و درکاندن؛ **نبا**: خەبەر و دەنگ و باس.

**پوختەی مانا:**

ئەو شازدە بەلکیس‌ئاسایەی من، شەنگ و شۆخێکی بەژن‌شووش و باریکە و لە پەستا شەراب دەخواتەوە. زۆردارێکە زۆری لە وشیار و مەستان دەکا و هیچ‌کەس لە زوڵمی ئەو ڕزگار نییە.

یا: ئەو زۆردارە هەم وشیارە هەم مەستە؛ چاوەکانی مەستە و دلی تا بلێی وشیارە.

جا مام پەپووگیان! ئەوا بەو پێ‌وشوێنە کە من بۆم دانای، بەو تاریفە کە من کردم، تۆ

دەتوانی بیناسی. ئەوا دەمەوێ نامەیێک و چەند ڕاسپێرییەکت پێدا بنێرم. نامەکەم کە پێچاوەتەوە و لە ناو لۆچ و لایەکەیدا دەنگ و باسی کەساسی خۆمی تەواو تێدا درکێندراوە. بەڵام دیسان بە زمانیش:

٦ بێژ ئەو شرینا سورپەری دوڕدانەیا ئەز موشتەری
کان عەهد و پەیمانا بەرێ بێفایدە چوون شوبهێ هەبا

**مانای وشەکان:**

**بێژ**: بێژە؛ **سورپەری**: دلکێش وەک فرشتە؛ **دوڕدانە**: دوڕی تاقانە؛ **ئەز**: مـن؛ **موشتەری**: کڕیار؛ **کان**: کوان، لە کوێن؛ **بەرێ**: پێشوو؛ یان خالس؛ **شوبە**: وەکوو؛ **هەبا**: ئەو توزقاڵە تۆزانەن کە لە دەوری تیشکی خۆری ناو کولانچکەی ماڵ دەهاڵێن.

**پوختەی مانا:**

پەپووی دەم و ڕاوێژ خۆشی شیرینزوان! تۆش دوای تەسمیل کردنی کاغەزەکە، لە زمان منەوە بەو خوێنشیرینەی کە وەک فرشتە دلکێشە و دوڕدانەیەکە کە من بە گیان و دڵ بوومە کڕیاری، بێژە: کوان بەڵێن و گفتی پێشووی؟ یان کوانێ مەرج و پەیمانە بێ غەوشەکانی؟ بۆ نەماون؟ بۆچی هەمووی بێجێ دەرچوون و لە بەهرە کەوتن و وەک ئەو تۆزقاڵە تۆزانەیان لێ هات کە لە دەوری کۆلەکە تیشکی ناو ماڵ دەهاڵێن و بە چاو دەبیندرێن و بە دەست ناگیرێن و وە بەر دەست نایەن؟
هەروەها لە بیرت نەچێ ئەوەیشی لە زمان منەوە پێ بلێ کە:

٧ مە دڤێ پەرییا دلبەرێ لێ هەی ب ئوسلووبا بەرێ
لێ کەفش ببێتە ژ پەنجەرێ بێ و بچت تەشبیهێ با

**مانای وشەکان:**

**مە دڤێ**: ئێمە دەمانەوێ؛ **پەری**: فرشتە؛ **لێ**: بەڵام؛ **هەی**: هەر؛ **ئوسلووب**: ڕەوشت؛ **لێ**: لەو؛ **کەفش**: کەشف، دیاری؛ **تەشبیهێ**: وەکی.

**پوختەی مانا:**

عەرزی بکە ئێمە وە نەبێ گلەمان لەو بێ کە ئەو بە جوانی خۆی دلی بردووین؛ نەخێر. ئێمە بە دڵ ویستوومانە و دەشمانەوێ کە دڵمان بە تالانی فرشتەیەکی وەها ناسک و نازدار بڕوا. بەڵام دەشمانەوێ کە لە بەرانبەر ئەم دلبردنەدا ئەویش- هەر وەک جاری جاران دەیکرد- جارەو بارەیەک لە پشت پەنجەرەوە و دوودەریی کۆشک و تەلاری خوونکارییەوە، لە کاتی ڕەوتی سووک و لەبار و بەلار و لەنجەیدا- کە وەک با لەتیف و شەففافە- وا پکا چاوێکمان لە دوورەوە پێی بکەوێ. ئیتر لە دڵ بردن گەردنی خۆش و ئازا بێ و ئێمە چیترمان لەو ناگەرەکە.

٨ دلبەر مەجالا نامە دی ناسی کو نشیانا مە دی
نوونەک موخالف تێ نەدی «هَلْ قَلْبُها نَحوْی صَبا»

**مانای وشەکان:**

**مەجال**: وەخت؛ **دی**: دیتی؛ **نشیان**: ناونیشان، مۆر و ئیمزا؛ **نوون**: کەمایەسی، وەک لە کوردی خۆشماندا دەڵێن: نوون لە چاوی مندا هەبێ لەودا نییە؛ **موخالف**: پیچەوانە؛ **تێ**: تێدا؛ **هەل**: دەرکەوت، یان: ئاخۆ؛ **قَلْبُها**: دلی ئەو کیژە؛ **نَحْوِی**: بەرەو من؛ **صَبا**: مەیل کردنی دلدارانە.

٩ نەیشەکەرا سپی دەست و زەند زانم مەجالا نامە خوەند
لیڤان تەبەسسوم کر ژ قەند «ماسَت کَبانٍ فی رُبا»

**مانای وشەکان:**

**نەیشەکەر**: قامیشی شەکر؛ **دەست و زەند**: قۆڵ و مەچەک؛ **زانم**: دەزانم؛ **مەجالا**: وەختێک؛ **خۆند**: خوێندییەوە؛ **لیڤان**: لێوان؛ **تەبەسسوم**: بزە؛ **کر**: کرد؛ ژ **قەند**: لە قەند؛ **ماسَت**: لارایەوە؛ **کَ**: وەکوو؛ **بان**: جۆرەدارێکی لووس و لەبار و شۆخ و شەنگە. زۆربەی بوێژانی عەرەب بەژن و بالای یاری خۆیان بەو شبهاندوە؛ **فی**: دە؛ **ربا**: تەپۆڵکە.

**پوختەی مانا:**

ئەوینداری بەتاسە، دوای ئەوە کە نامەی بە پەپوودا ناردووە و چاوەنۆڕیی هاتنەوەی ئەکات، هەموو ئاواتی ئەوەیە نامەبەر بە موژدەوە بگەڕێتەوە و یار دڵی نەرم ببێ و بەزەیی پێدا بێتەوە. جا دێنێ دیمەنی یار وەک خۆی ئارەزوو ئەکا، ئەهێنێتە بەرچاوی خەیاڵ و لەبەر خۆیەوە خۆی دلداریی ئەداتەوە و دەورتێنێ و دەڵێ:

لێم ڕوونە دڵبەرم کە نامەی منی دیوە، لە خەت و ئیمزاکەمەوە زانیویە کە ئەوا من ناردوومە. کە خوێندوویەتەوە و دیتوویە هەر گلە و گازندەیەکی کە من لەوم کردووە ڕاستە و درۆ و شتی پێچەوانەی ئەدەبم تێدا نەنووسیوە، بێگومان بەزەی پێما هاتووە و مەیلی دڵی ڕووی کردۆتە منەوە. یان لە خۆی دەپرسێ، تۆ بڵێی دڵی بەرەو ئێمە بزووتبێ؟ لە خۆشیانا باوەڕ ناکەم.

بەڵێ دەزانم ئەو بەژن و بالایەی ــکە لە ڕاستی و شیرینیدا، وەک قامیشە شەکر وایەــ کاتێ بەو دەست و مەچەکە سپییانەی خۆی نامەکەی منی وەرگرتووە و خوێندۆتەوە، لێوە شەکربارەکانی بزەیان هاتۆتە سەر و خۆی ڕازاندووە؛ بەڵام چۆن ڕازاندنێک؟ وەک نەمامی داری بان کە لەسەر تەپۆلکەیەک شین بووە و شنەبا دەیلەرێنێتەوە، وا بووە.

مەلا لەو خەیاڵە خۆشانەدا ژیاوە کە نامەبەر گەڕاوەتەوە و موژدەی پێ داوە کە کارەکە پێک هاتووە و بەختی دلدار گرتوویەتی؛ دەڵێ:

١٠ قاسد ب مەقسوودا مە هات با موژدە و ئەمر و بەرات
نیشان هنارن هەم خەلات شەهزادەیا گولگوونقەبا

**مانای وشەکان:**

**قاسد**: ڕاسپاردە؛ **ب**: بە؛ **مەقسوود**: مراز؛ **مە**: ئێمە؛ **موژدە**: مزگێنی؛ **ئەمر**: فەرمان؛ **بەرات**: نامەی ڕەزامەندیی سەروەران؛ **نیشان**: نیشانە و یادگاری؛ **هەنارن**: ناردن؛ **خەلات**: دیاری شایانە.

**پوختەی مانا:**

ڕاسپاردە (پەپوو) چۆنم ئارەزوو بوو وا هاتەوە. مزگێنی بە مراز گەیشتنی پێ دام.

فەرمانی قبووڵ و نامەی ڕەزامەندی و نیشانە و خەڵاتی بۆ هێنام؛ کە ئەو شازدە کەوا گوڵگوڵییە بۆی ناردبووم.

١١ ئیرۆ مەجال لێ هات و وەخت دیسا جوان بوو من درەخت
ئەو لامیعا دایی ژ تەخت «ماکانَ بَرْقاً خُلَّبا»

**مانای وشەکان:**

**ئیرۆ**: ئەمڕۆ؛ **مەجال**: وەخت، هەل؛ **وەخت**: کات؛ **دیسا**: جاریَ تر؛ **جوان**: جحێڵ؛ **درەخت**: دار؛ **لامیع**: برووسکەدەر؛ **دایی**: دای؛ **ژ**: لە؛ **ماکانَ**: نەبوو؛ **برقا**: برووسکەیەک؛ **خُلَّب**: فریودەر؛ **بەرقی خُلَّب**: بەو برووسکەیە دەڵێن کە لە هەورەدرۆزنەوە دیار ئەدا و بارانی بە شوێندا نایە.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ هەل و دەرفەت بۆ من ڕەخساوە. وا لە پاش پیری بەو مژدەیە کە لەوە بەولاوە یار لە پەنجەرەی کۆشکەوە خۆی نیشانم دەدا، لەشم ـکە وەک داری گەندەڵی لێ هاتبووـ گەڕایەوە تافی جوانیم و بوومەوە بە نەمامێکی شل و شەنگ. چا بوو شوکور ئەو برووسکەیەی کە لە تەختی شازادەی دڵبەرمەوە بەرەو من هاتووە، برووسکەی هەورەدرۆزنە نییە و ڕاستە؛ بارانی بەزەیی بە شوێندایە و فریو و مریو دە ئارادا نەبوو.

١٢ سەلوا ڕەوان زەررین وەرەق چیچەک «مەلێ» دین سەد نەسەق
«یاقوتُها یَحْکی الشَّفَق یَحْکی عُقوداً کوکبا»

**مانای وشەکان:**

**سەلو**: سەرو، سەوڵ؛ **ڕەوان**: ڕێک و بێ گرێ و قۆرت؛ **زەررین**: زێڕین؛ **وەرەق**: پەلک؛ **چیچەک**: گوڵ؛ **مە لێ**: ئێمە لەو؛ یان: **مەلێ**: «مەلا»؛ **دین**: دیتن؛ **نەسەق**: جۆربەجۆر، بە تەرتیب دانراو؛ **یاقوت**: بەردێکی سووری بەقیمەتە؛ **یَحْکی**: دەنوێنێ؛ **شەفەق**: سوورایی ئاسۆ لە دوای زەردەپەڕ؛ **عقد**: گەردانە و لیزگە؛ **عُقود**: جەمعی عقد؛ **کَوکَبْ**: ئەستێرە.

**پوختەی مانا:**

بەڵێ مۆژدە و بەڵێنەکە ڕاست بوو. ئێمە لەو بەژن وەک سەروی ڕەوانی پەلکەزێڕینـە، سەد جۆرە گوڵمان چاو پێ کەوتن کە بە تەرتیب و ڕێک و پێکی لێی ببوونە خشـڵ و خەمڵ. یاقووتـەکانی نـاو خشڵـەکان لاسـایی سـوورایی ئاسـۆگی دوای زەردەپـەڕیان دەکـردەوە و دەنـاو لیزگـەدا دەتگـوت ئەسـتێرەن و کراونـە گەردنبەنـد و لیزگـەی بەرمووروەکانی.



# دڵی یەخسیر

آ دلبەر شکینا شەککەرەک «فَقُلْتُ یا روُحی مَتی»
گۆ من حەتا خاتر هەبت مەن گۆ چ کم ئەز با هەتا

**مانای وشەکان:**

**شکینا**: شکاندی؛ **شەککەرەک**: شەکرێک؛ **فَقُلْتُ**: منیش گوتم؛ **یا**: هۆی، ئەی؛ **روُحی**: گیانی من؛ **متی**: کەنگێ؛ **گۆ**: گوتی؛ **خاتر هەبت**: وازم لێ بێت، پێم خۆش بێت؛ **من گۆ**: من گوتم؛ **چ کم**: چە بکەم؛ **ئەز**: من؛ **با**: دەگەڵ.

**پوختەی مانا:**

دڵبەرم شەکرێکی لە لێوان باری. واتا بە لەبزی شیرینی خۆی، بەڵێنی دامێ کە بەیەک دەگەین. گوتم: گیانە شیرینەکەم کەی ئەم بەڵێنە دێتە جێ؟ لە وەراما فەرمووی: کەنگێ خۆم وازم لێ هەبێت، ئەودەم. گوتم: من چە لەو کەنگێیە بکەم؟ خوا ئەزانێ ئەو کەنگێیە کەنگێ دەبێ!

٢ زولفان تو بەس چین_چین بکە بسکێن موقابل دین بکە
پێشکێشی یەک زولفەک تە بن مولکێ خوتەن، تەختێ خەتا

**مانای وشەکان:**

**زولفان**: کەزییان؛ **بسک**: ئەگریجە؛ **موقابیل**: بەرانبەر؛ **دین**: شێت، یان دیتن؛ **یەک زولفەک**: تاقە زوڵفێک؛ **خوتەن و خەتا**: ناوی دوو مەملەکەتە کە ئاسکی میسکیان هەیە.

**پوختەی مانا:**

تۆ ئەگەر پێک گەیشتنەکەمانت حەواڵە بەو ڕۆژە کردووە کە خۆت کەنگێ حەز بکەی و من ئەبێ لە چاوەنۆڕیدا ڕایبوێرم و بە تاووتۆیی ئارەزووی بەسەرچوونی ئەو کەنگێیە بتلێمەوە، هیچ نەبێ بۆ ئەوە تا ئەو ڕۆژە بمێنم، تۆ ئەو کەزیانەت هێندە چین ـ چین مەکە! ئەو بسکانە نیشان مەدە! با بە یەکجاری شێت نەبم. یا: ئەو بسکانەت وامەکە هێندە لە هاتوچۆدا بێ کە وەک شێتان ئارام و ئۆقرەیان لێ هەڵگیراوە و پیاو شێت دەکەن.

ڕەنگە تۆ خۆت نەزانی ئەو کەزیانەی تۆ چەند نازدار و بەنرخن. مەملەکەتی خەتا و خوتەن ـ کە هەواری ئاسکی ناسکن ـ بە خڕوپڕی دەکرێنە پێشکەشی تاکە داوێک لەو زولفانەت.

٣ دل بەندێ داوا زولفەکی کەفتی کەمەندا ئولفەکی
«هَلْ فی یدالمَفْتونِ شَیْ أو کَیْفَ أصنع یا فَتی»

**مانای وشەکان:**

**بەندی**: گراو؛ **داو**: هەودا؛ **کەفتی**: کەوتووە؛ **ئولف**: خۆشەویست و هۆگر؛ **هل**: ئاخۆ؛ **فی**: لە ناو؛ **یَدْ**: دەست؛ **مَفتون**: شێواوی دڵداری؛ **اَو**: یان؛ **کَیْفَ**: چۆن؛ **أصنعُ**: بکەم؛ **یا فَتی**: ئەی جوان.

**پوختەی مانا:**

وا دەردەکەوێ تازەلاوێکی لە دەردی ئەوین بێخەبەر، سەرکۆنەی مەلای کردووە کە ئەم کارەی تۆ دەستت داوەتێ، لە تۆ ناوەشێتەوە و باش وایە لەم دڵدارییە واز بێنی. مەلا لە وەرامیا دەڵێ: کوڕم! ئاخر چۆن دەس هەڵگرم؟ دڵە ئەوا لە دوای زوڵفێکدا گیری کردووە؛ دەستم پێ ڕاناگا. کەمەندی عیشقێک لە دەوری دڵ هاڵاوە کە هەرگیز ڕزگاریی نابێ. پیاویش کە دڵی لە لای خۆی نەما، سەری لێ دەشێوێ و شێت ئەبێ. دە باشە تۆ خۆت بڵێ، شێت و دیوانەی دڵداریی، چی لەدەست دێ بیکا؟ یان هەر لە

خۆت دەپرسم، من دەتوانم چی بکەم؟ لێم ڕوونە حەقی من ئەدەی کە شێت بم؛ بەلام کە دەلێم دڵ لە دوای زولفانی هالاوە، پێم نەگوتی زولفەکان چین و چۆنن. گوێ بگرە تا بزانی:

۴ زولفێن‌بوت و شیرین‌لەبان ژەهرینە شوبهەت عەقرەبان
لێ من ژ بسکا پڕگرێ ئێرۆ تنێ گرتن دوتا

**مانای وشەکان:**

**زولفێن**: زولفان؛ **بت**: خوای دەسکرد؛ **شیرین‌لەبان**: لێوشیرینان؛ **ژەهرینە**: ژهردارن؛ **شوبهەت**: لە گوێن؛ **عەقرەبان**: دووپشکان؛ **لێ**: لەو، یان بەلام؛ **ژ**: لە؛ **پڕ**: زۆر؛ **گری**: گرێ؛ **تنێ**: تەنیا؛ **گرتن**: گرتیان، یان گرتمیان؛ **دوتا**: دوو هەودا.

**پوختەی مانا:**

یاری من بۆتە بتی لێو شیرین و جوان‌چاکان و وەک خوای جوانی دەیپەرستن. ئالقەی زولفی وەک کلکی دووپشک هەلگەڕاونەوە و بۆ کوشتنی تەماشاکاران ژەهراوی و گوژەرن. تاکە تالێک لە کوشتنی عاشقان یەکاویەکە. بەلام چ لە من دەکەی کە من بە تەنیا گیرۆدەی دوو لق لەو تالە زولفە پڕ لە گرێیانە، یا ئەو دوو زولفانەم.

۵ نیسبەت پەری زیبایە ئەو وەک نێرگزا یەکتایە ئەو
«یا مَنْ رأی خِلّیِ فَهَلْ یُشبی بِشَیءٍ قامَتا»

**مانای وشەکان:**

**نیسبەت**: لە حاند؛ **پەری**: فرشتە؛ **زیبا**: جوان؛ **نێرگز**: نەرگس؛ **یەکتا**: تاقانە؛ **یا مَنْ**: ئەی کەسێکی؛ **رای**: دیتی؛ **خِلّیِ**: دۆستم؛ **فَهَلْ**: ئاخۆ؛ **یُشبیَ**: دەشبهێندرێ؛ **بشیءٍ**: بە شتێک؛ **قامت**: بەژن و بالا.

**پوختەی مانا:**

ئەو یارەی من لە ڕاست فریشتەی ڕاگری، لەو جوانترە. لە بەژن و بالای تورت و شلکی بڕوانی، وەک لقە نێرگزێک، یان وەک نێرگزێکە کە لە نێرگزجاڕدا گوڵی سەرتۆپە و تاقانەی بێ هاوتایە.

لێرەدا مەلا هەست دەکا کە تەشبێ کردنی جوانی و بەژنی یاری بە فریشتە و نێرگز، جێگەی خۆی نییە و ئەو پەسن و تاریفە لە قەدری یار کەم دەکا؛ لەبەر ئەوە پەشیمان دەبێتەوە هاوار دەکا و دەڵێ: بابە! هۆی ئەو کەسەی یاری منت دیوە! وەباڵ بکێشە! داخوا هیچ شتێکی وا لە دنیادا هەیە کە ئەو بەژن و بالایەی پێ تەشبێ بکرێ؟

ئیشارەت بەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: «هیچ شتێک نییە کە وەک خوا بێ» مەلا- وەک گوتمان- لە پلەی «وەحدەت موتڵەق»دا خوای لە هەموو شتدا بەدی کردووە؛ کە مەعلوومە سەلماش هەر بەو پێودانە هاتۆتە بەر چاوی. دەڵێ: ناتوانم بڵێم وەک هیچ شتێک دەچێ.

٦ مە ژ بوغچەیا یار زَیّنی بێپرس یەک سێڤەک چنی
«وَ بِما جَنَیْتُ جَنْیتی أَلْقَتْ عَلَیَّ جِنایَتا»

**مانای وشەکان:**

**ژ**: لە؛ **بوغچەیا**: باغچەی؛ **زَیّنی**: نواڕی، یان ڕازاوە؛ **یەک سێڤەک**: تاقە سێوێک؛ **جنیت**: گوناهم کرد، یان چنیم؛ **جَنیە**: چنراو، لێکراوەوە؛ **الْقَتْ**: هاویشتی؛ **عَلَیَّ**: سەر من؛ **جنایتا**: تۆمەتی تاوانباری.

**پوختەی مانا:**

ئەم بەیتە وەرامی پرسیارێکی لاوە سەرزەنشتکارەکەیە کە پرسیویە: باشە زیاد لەو «ما خَلَقَ‌اللهُ»یە بۆچی تۆ لەو کەمەندە پڕگرێیە هاڵقاوی و دەرەتانت بۆ نەماوە و شێت و شەیدا کراوی؟ دەفەرموێ: من ڕوانیمە باغچەی یار کە بە هەمەڕەنگە ڕازاوەتەوە. ئیتر هۆشم لە خۆم بڕا و بە بێ ئەوە پرسی پێ بکەم، سەربەخۆ چووم سێوێکم چنی و لەسەر ئەم هەڵەکارییەم، منی بە گوناهبار داناوە و ئێستا دەبێ تاوانەکەی ببژێرم.

لە کتێبە ئایینییەکاندا دەڵێ: خوا بە ئادەمی گوت: لە بەهەشتا ئازادی هەرچێ دەکەی و هەرچێ دەخۆی؛ تەنیا تخوونی ئەو دارە مەکەوە کە من لێم حەرام کردووی. زۆر کەس دەڵێن داری سێو بووە و بابە دەم لە سەر دنەدان و فریودانی دایکەوا ـکە ئەویش شەیتان لە خشتەی بردبووـ سێوێکی لە دارەکە چنی و خوا لەسەر ئەو کارە سەربەخۆیەی، دەریکردە سەر دنیا و تووشی شەڕەشەقی ژیانی کرد.

مەلاش نیازی لە سێو چنینەکە، مەمک گوشین بێ! یاخۆ ماچ لە کولمە ڕفاندن بێ، ئەم حیکایەتی بابەدەم و دایکەوایەمان وەبیر دێنێتەوە و دەڵێ: هەرکەس بە بێپرسی خاوەنی دەست بۆ کارێک بەرێ، دیارە سەری لێ شێواوە و ئەگەر سەر شێوا دڵیش دەشێوێ و شێتی سواری سەری پیاو دەبێ؛ بینەقاقەی ڕێک دەکوشێ؛ وەک من بە سەرم هاتووە.



# ئاگری جیایی

ب ناریٚ فیرقەتیٚ سۆهتم ژ فەرقیٚ سەر حەتا پیٚدا
خەدەنگا غەفلەتی نۆهتم ژ بەرقا لامیعا تیٚدا ۱

**مانای وشەکان:**

**نار**: ئاگر؛ **فیرقەت**: جیایی؛ **سۆهتم**: سووتام؛ **ژ**: لە؛ **فەرقیٚ سەر**: تەپڵی سەر؛ **حەتا**: هەتا؛ **پیٚ**: پا؛ **خەدەنگ**: تیر، ناوی داریٚکی سەخت و پتەوە کە تیریان لیٚ دەتاشی؛ بەو هۆیەوە «خەدەنگ» هەر بۆتە ناو بۆ تیریش؛ **غەفلەتی**: لە ناکاو؛ **نۆهتم**: پیٚکامی؛ **بەرق**: برووسکە؛ **لامیع**: بریقەدار، ورشەدار.

**پوختەی مانا:**

بە بیٚئەوە هیچ ئاگام لە خۆم بیٚ، کوتوپڕ و لە ناکاو تیری جیایی یار پیٚکامی. تیری جودایی بە ورشە و گرشەیەک بوو، کە وەک برووسکە لیٚی دام و گڕی لیٚ بڵند کردم و سەر تا پامی سووتاند و کردمیە خۆڵەمیٚش.

خەدەنگا فیرقەتیٚ ڕەعدە دلیٚ ئەو غەفلەتیٚ لیٚ دەت
دبیٚژم وەر جەبەل بت ئەو بکەر بت ویٚ دگاڤیٚدا ۲

**مانای وشەکان:**

**خەدەنگ**: تیر؛ **ڕەعد**: هەورەتریشقە؛ **غەفلەتی**: کوتوپڕ؛ **دبیٚژم**: دەڵیٚم؛ **وەر**: ئەگەریش؛ **جەبەل**: کیٚو؛ **بت**: بیٚت؛ **بکەر بت**: لەت ـ لەت دەبیٚ؛ **ویٚ**: ئەو؛ **دگاڤیٚدا**: هەر لەجیٚ، دەسبەجیٚ.

**پوختەی مانا:**

ئایەتێک لە قورئانی پیرۆزدایە کە فەرموویە: «ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان ناردبایەتە سەر کێوێک، دەتدی کە لە ترسی خودا سەری کز کردووە و قەڵشی بردووە و لەبەر یەک چووە. ئەم مەسەلانە بۆ خەڵک ئەهێنینەوە شایەتا بیر بکەنەوە.»

مەلا دەیەوێ تێمان بگەیەنێ کە هەیبەتی جیا بوونەوە لە یاریش لەوانەیە ئەگەر بکەوێتە دڵی کێوەوە، لەبەر یەکی هەڵتەکێنێ. دەفەرموێ: تیری جودایی لە یار وەک هەورەتریشقەیە؛ ئەمما هەورەتریشقەیەکی زۆر لەزەبر و حەستەم. ئەگەر کوتوپڕ لە هەر دڵێک بدات، من دەڵێم ئەگەر ئەو دڵە دڵ نەبێ و کێو بێ، هەر دەستبەجێ لەتوپەت دەبێ و لەبەریەک دەچێ.

٣ هەچی فرقەت نەدی هجران نەبێ من داغ و کەی لێنە
ژ بل دەربێ د هجرانێ فیراقا ڕووح و جان کێ دا

**مانای وشەکان:**

**هەچی**: هەرچی، هەرکێ؛ **فرقەت**: جیایی؛ **نەدی**: نەدیت؛ **هجران**: دوورکەوتنەوە؛ **نەبێ**: نەڵێ، نەبیژێ؛ **داغ**: داخ؛ **کەی**: داخ؛ **ژ**: لە؛ **بل**: بێجگە، غەیر؛ **دەرب**: زەربەت وێکەوتن؛ **ڕووح**: گیان؛ **جان**: گیان.

**پوختەی مانا:**

کەسانێکی کە هیچ لە دەردی دڵ و ئەوینداری نازانن و بە دەردی دوورکەوتنەوە لەیار دووچار نەبوون، نابێ بڵێن ئێمە داخ کراوی خەمانین و دەرد و ئازارمان دیتووە. بێجگە لە دەردی دوورکەوتنەوە لە یار، هیچ ژانێک نییە کە ڕۆح و گیان لێک جیا کاتەوە.

لێرەدا پێویستی بە درێژەدانێک هەیە:

بە ئیستلاحی سۆفیان و ئەوانەی لە ناسینی خوادا وردەکارن، فەرقێک لە نێوان ڕۆح و نەفەسدا هەیە کە لە فارسیدا بە «جان» و «رَوان» تەعبیر کراون. ڕۆح سەرچاوە و ماکی ژیانە؛ نوێنەری پەروەرندەی توانایە و هیچ گۆڕان و نەمانی بەسەردا نایە. گیان یان نەفەس، نوێنەرێکی خزمەتکارە و لە لایەن ڕۆحەوە پێی سپێراوە کە کارگای لەش،

زیندوو بەڕێوە بەرێت. ئەویش هەتا سەرێکە و هەرگا ڕۆح ئیرادە بکا، دەس لە کار هەڵدەگرێ و ژیان دەپووچێتەوە. جا سۆفییەکان و لە پێش ئەوانیشدا پەیڕەوانی مانی، زۆر جار دەردیدڵیان لەوە کردووە کە لە ڕۆحی ماک و بنچینە ـکە ئەویش پاژێکە لە زاتی خودا جیا بۆتەوەـ هەمیشە پاڕاونەوە کە زۆر زوو ئەو لەشە قوڕینەیان ـکە بۆتە قەفەسی گیانیانـ لەبەین بچێ و بچنەوە مەوتەنی هەرە پێشووی گیانی گەورە. ئەوانە هەتا لە سەر دنیا بوون، خۆیان بە غەریب و ئاوارە زانیوە و دەردیدڵیان لە هیجران و دووری کردووە. لە شێعری سۆفیانەی عارفاندا زۆر لەم نموونەیەمان دێتە بەرچاو؛ هەر وەک لە سەرەتای «*مەسنەوی مەولەوی*»دا کە لە زمان بلوێرەوە پێمان دەڵێ:

زێدی من قامیشەلان و گوێ چەمە　　دابڕاوم، بۆیە نالە و زالەمە[1]

**۴**　ژ هەر بێ داغ و بێ دەردێ مەپرسن میحنەتا عیشقێ
　　چ زانن بێ خەبەر ژانا دلێ داغ و کەسەر تێدا

**مانای وشەکان:**

**ژ هەر**: لە هەر؛ **داغ**: داخ؛ **دەرد**: ئازار؛ **میحنەت**: پەژارە؛ **عیشق**: ئەوین؛ **چ زانن**: چ دەزانن؛ **بێخەبەر**: ئاگا لە هیچ نا؛ **ژان**: ئێش؛ **کەسەر**: غەم و حەسرەت.

**پوختەی مانا:**

وەک لە کوردیدا مەسەلە و دەڵێن «تیر ئاگای لە برسی نییە»، مەلاش دەفەرموێ: نابێ لە کەسێکی کە هەرگیز عاشق نەبووە و تیری ئەوین نەیپێکاوە و بە داغی دڵدارییەوە هەڵنەچزاوە، بپرسن: ئەرێ بۆمان باس بکە داخوا دەردی دڵداریی چۆنە. کەسێک دەزانێ دەردی ئێمە چییە کە بۆخۆی عاشق بووبێ و بە دەردی ئەوینەوە تلابێتەوە. بە دەردی بابەتایر گوتەنی:

وەرن سووتەدڵان گەردین هەم ئایۆم　　کە دەردی سووتەدڵ دڵسووتە زوونۆ

**۵**　کەسێ میحنەت دی و فیرقەت ڤەخواری جورعەیا هیجرێ

---

۱. از نیستان تا مرا بُبریده‌اند　　بر نفیرم مرد و زن نالیده‌اند

گریٚ وان تیٚ ب حالیٚ مـن دڤـیٚ هیجـران و زەجرێـدا

**مانای وشەکان:**

**کەسـیٚ**: کەسـێک؛ **میحنـەت**: پـەژارە؛ **دی**: دیـت؛ **فیرقـەت**: جیـایی؛ **ڤـەخواریٚ**: خواردییەوە؛ **جورعە**: قوم، فڕ؛ **هیجر**: دووری؛ **گریٚ**: گریان؛ **وان**: ئـەوان؛ **تـیٚ**: دێـت؛ **دڤیٚ**: دە ئەو؛ **هیجران**: ئاوارەیی؛ **زەجر**: ئازار و کوڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەمن ئێستا هەزار هاوار بکەم، ئەوانەی بە دەردی ئـەوین و دووری یـارەوە نـەچزاون، نازانن من چیمە. بەڵام ئەو کەسانەی کە عاشـق بـوون و لـە یـار دوور کەوتوونـەوە و ژاراوی دووریی دیداری یاریان بە گەرووڵا چووە، ئەگەر چاویان بە من بکەویٚ کە وا لە دیداری یار بیٚبەش و ئاوارە بووم، گریانیان بۆ حاڵی من دێت و دەزانـن چـیم بەسـەر هاتووە.

٦ ب داما موحبەتیٚ بەندم خـەدەنگا فیرقـەتیٚ دل نوهـت
ب شوبهیٚ مورغیٚ نیمبەسمەل د هەڤ وەرتیٚم د خوونێدا

**مانای وشەکان:**

**دام**: داو؛ **موحبەت**: خۆشەویستی، دڵـداری؛ **بەنـد**: ئەسـیر؛ **خـەدەنگ**: تـیر؛ **نوهـت**: پێکای؛ **شوبهیٚ**: وەکوو؛ **مورغ**: مەل؛ **نیمبەسمەل**: نیوەبسـمیللا، تـازە سـەر بـڕاو. لـە فارسیدا بە حاڵی حەیوانێکی کە تازە سـەری دەبـڕن و هێشـتا گیـانی دەرنـەچووە و پەلەقاژە و باڵەفڕەی گیاندانییەتی، دەڵێن «نیم بِسمِل»؛ چوونکـە سـەربڕ لـە وەخـتی سەربڕیندا دەڵیٚ: «بسمیللا». جا یانیٚ سەری بڕیوە بەڵام هێشـتا تـەواو لـە سـەربڕین نەبۆتەوە و «بسمیللا»کەی تەواو نـەگوتووە. **دەهـەڤ**: تێکـەوە؛ **وەرتـێم**: دەگلـێم؛ **د خوونێدا**: لە خوێندا.

**پوختەی مانا:**

گراوی داوی دلّداریم. تیری جیا بوونەوەم لە یار، دلّـی پێکـاوم. وەک باڵـندەی تـازە سەربڕاو، پەلەقاژەمە و دەخوێنی خۆمدا دەگەوزم.

٧ برووســکا باتنــیٚ دا دل د پێتــیٚ ســینە ویٚ وەر بــوو
کــو دیٚ بێــتن تــەبێتا دڵ د نــاڤ ویٚ نــار و پێتێــدا

**مانای وشەکان:**

**برووسک**: برووسکە؛ **باتنیٚ**: نادیاری؛ **پێت**: گڕ و بلّێسە؛ **سینە**: سـینگ؛ **وی وەر بـوو**: لیٚ هالاّ؛ **کو**: کوا، لە کویٚ؛ **دیٚ**: دەبیٚ؛ **بێتن**: ببێت؛ **تەبیت**: ئۆقرە و ئارام؛ **نار**: ئاگر.

**پوختەی مانا:**

برووسکەیەکی نادیاری لە دلّمی دا. دەگەڵ بلّێسەی ئاگری سینەم، لێک هالان و گڕی ناو هەناوم ئەوندەی بوو، ئەوندەی تریشی هاتە سەر. جا ئێستا دڵ چـۆن لـە نـاو ئـەو هەموو بلّێسە و ئاگرەدا ئۆقرە و ئارامی بۆ دەمێنیٚ؟

٨ ژ ئولفــیٚ شــوبهەتیٚ زولفــیٚ مــەدام لــەو بێقــەرارم ئــەز
کــو جانــیٚ مــن عــەزیز ئــیرۆ چــوو و دل ویٚ د ئولفێــدا

**مانای وشەکان:**

**ئولف**: هۆگری و مەیل؛ **شوبهەت**: وەکوو؛ **زولف**: کەزی؛ **مەدام**: هەمیشە و دایم؛ **لەو**: بۆیە؛ **بیٚقەرار**: بیٚئۆقرە و ئارام؛ **ئەز**: من؛ **کو**: کە؛ **جان**: گیان؛ **عەزیز**: بـەڕێز و هێـژا؛ **چوو**: ڕۆیشت.

**پوختەی مانا:**

لە تاووتوێی دلّدارییەکی کە هەمە و هەمیشە و دایم وەک کەزیەکانی یارم لـە ڕاژان و هاتوچۆدام، هیچ ئۆقرە و ئارامم نییە. بۆیەیـە کـە یـارە بەنرخەکـەم ئەمـڕۆ ڕویشـت، دلّیشم ــکە هۆگری خۆی بووە و هەرگیز لیٚی دوور ناکەوێتەوەــ دەگەلّی ڕۆیشتووە.

٩ ژ مەحبووب دوور کرم چەرخێ فەلەک وێ پڕ هەلاڤێتم
نـزانم دێ ل کـوو دت مـن دەڤـێ دەوران و چەرخێـدا

**مانای وشەکان:**

**مەحبووب**: خۆشەویست؛ **کرم**: کردم؛ **چەرخ**: گەردوونە؛ **فەلەک**: زەمانە؛ ئاسمان؛ **پڕ**: زۆر؛ **هەلاڤێتم**: هەڵیهاویشتم؛ **نزانم**: نازانم؛ **دێ**: دەبێ؛ **ل کوو دت**: لـە کـوێ بـدات؛ **دڤێ**: دەو؛ **دەوران**: سوورِ؛ **چەرخ**: خول.

**پوختەی مانا:**

گەردوونەی گەردوون دژی من سوورِا و زۆری هەڵتەکاندم و هەڵیهاوێشتم و لە یـاری خۆمی جوێ کردمەوە. هێشتا نازانم دەبێ لەو چەرخ و خولەدا بە کوێمدا بدات و بەکام پەلمەوە بکا و چ پەندێکم بەسەر بێنێ؟

١٠ حـەبیبێ بێخـەتا کوشـتم ب دەربـا فیرقـەتێ ئـاخر
ژ وێ ڕۆژێ دزانی من کو یـار ئـەو تـیر ل جـەرگێ دا

**مانای وشەکان:**

**حەبیب**: خۆشەویست؛ **بێخەتا**: بێسووچ و تـاوان؛ **کوشـتم**: کوشـتمی؛ **دەرب**: زەبـر؛ **فیرقەت**: جیایی؛ **ژوێ**: لەوێ؛ **دزانی من**: من دەمزانی؛ **کو یـار**: کـە یـار؛ **ئـەو تـیر**: تیرەکەی؛ **جەرگ**: جگەر.

**پوختەی مانا:**

بە بێئەوە هیچ سووچ و گوناهێکم لێ ڕووبدات، یاری خۆشەویستم دووری خستمەوە و بە زەبری دەردی دووری منی کوشت. من هەر لە ڕۆژی هەوەڵێوە کە یـار بـە تـیری دڵداریی پێکامی، دەمزانی ئەم دەردەم بەسەر دێت و لە دوارِۆژدا گەرەکە نرخـی ئـەو شادی و خۆشییە بژمێرم و لە دووری دیـداری یـاردا بـە عـەزرەت و ئاواتـەوە گیـانی ئامانەتی بسپێرم.

مەلا لەم چەند بەیتانەدا ئیشارە بەو بڕوایە ئەکا کـە دەڵـێن: لـە ڕۆژی بناوانـدا (ڕۆژی

ئەزەل)، خودای مەزن ڕۆحی هەموو ئافەریدەکانی ساز داوە و بە دیداری خۆی شاد کردوون. بەڵام بۆ مەبەستێکی تایبەتی- کە ئیرادەی خۆیەتی- هەریەک لەو گیانانەی ناردۆتە ناو قالبێکی قوڕین و گڵینەوە و خستوونیەتە سەر دنیا و بە ڕواڵەت تەنیا ماونەوە و ڕۆژێک دێت کە دووبارە دەچنەوە شوێنی پێشوویان و گەرەکە حیساب و کیتابی ڕۆژگاری ژیانی سەرزەوی بدەنەوە. جا هەر گیانێک لەو گیانانە، کە لە ماوەی ئەم ژیانە دنیاییەدا، نەکەوتۆتە ناو تاریکایی دنیاپەرستی و بەرچاوی ڕوونە و بیر لە ڕابردووی هەرە پێشووی خۆی دەکاتەوە، هەمیشە بە عەزرەت و ئاواتی ئەو ڕۆژەیە کە بگاتەوە بارەگای خوا. هەر بەو مانایە «خواجە حافیزی شیرازی» دەڵێ:
«کاتێ کە لە مەیخانەدا سەرخۆش و کەلەلا کەوتبووم، دەنگێکی نادیاری لە غەیبەوە مژدەی پێ دام کە: هۆی شابازی بەرزەنواڕی باڵانشین! ئەو قوژبنە مەینەتئاوایە جێگەی تۆ نییە. تۆ نازانی کەوا لە سەر برجەکانی تەختی خوداوە فیتووت بۆ لێ دەدەن کە بە فیتی خۆت بزانی و بچییەوە. من نازانم تۆ چیتە وا لە ناو ئەو جێگە داوانەدا ماتەت هەڵگرتووە؟!»[1]

۱۱ گەلۆ دیسا ببینم ئەز چرایێ وەسڵەتێ هل بت
بسووژم شوبهێ پەروانێ د بەر وێ نوور و شەوقێدا

**مانای وشەکان:**
**گەلۆ**: خەڵکینە، ئاخۆ؛ **دیسا**: جارێکیتر؛ **ئەز**: من؛ **وەسڵەت**: پێکگەیشتن؛ **هل‌بت**: هەڵبێ؛ **بسووژم**: بسووتێم؛ **شوبهێ**: وەکوو؛ **پەروانە**: پەپوولە؛ **نوور**: ڕووناکی؛ **شەوق**: تیشک.

---

۱. چە گویمت کە بە میخانە دوش مست و خراب — سروش عالم غیبم چە مژدەها دادست
کە ای بلندنظر شاهباز سدرەنشین — نشیمن تو نە این کُنج محنت‌آباد است
تو را زِ کُنگرەی عرش می‌زنند سَفیر — ندانمت کە در این دامگە چە اُفتادەست

**پوختەی مانا:**

تۆ بڵێی جارێکی تریش ئەو هەلەم بۆ بڕەخسێ بە دیداری یار شاد و شوکور ببەمەوە و چرای پێک‌گەیشتن دووبارە هەڵبێتەوە؟ ئەوسا وەک پەپوولە، بە دەوری گڕی چرادا بێم و باڵ و پەڕم هەڵپرووزێ و بسووتێم و ببمە شەهیدی ڕێگای دڵداریی؟

١٢ ب دەر بێ کەوکەبا سوبحێ ل مەشرق زوهرە تالع بت
زوحەل دوور بت ب شەش بورجان و وندا بت د غەربێدا

١٣ ژ قوندوس زوهرە پەیدا بت ژ هەندس موشتەری بێت دەر
سپێدێ دەت سورەییایێ شەفەق دەت قامەتێ پێدا

**مانای وشەکان:**

**ب دەر بێ**: وەدەرکەوێ؛ **کەوکەب**: ئەستێرە؛ **سوبح**: بەربەیان؛ **مەشریق**: خۆرهەڵات؛ زوهرە: ئەستێرەیەکی زۆر گەشە؛ **تالع**: هەڵاتوو؛ **بورج**: مەنزڵی ئەستێرە؛ **زوحەل**: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە و دەڵێن شووم و نەحسە؛ **وندا**: گوم؛ بت: بێت؛ **غەرب**: خۆرنشین؛ **قوندوس**: تاریکایی توند و خەستی شەو؛ **هەندس**: شەوی زۆر تاریک؛ **موشتەری**: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە؛ **سپێدە**: سپیایی بەرەبەیان؛ **سورەییا**: هێشووە ئەستێرەی کۆ؛ **شەفەق**: شەبەق، ڕووناکی ئاسۆ؛ **قامەت**: بەژن و باڵا.

**مانای ئەو دوو بەیتە بە تێکڕایی:**

شاعیر خۆی لە ناو تاریکەشەوی ناهومێدیدا دەبینێت و تەنها ترووسکە هومێدێکی لە سووچی دەروونیدا ماوە کە دنەی ئەدا ئاوات بخوازێ بە وەختێکی کە دووبارە بە دیداری یاری شاد و شوکور ببێتەوە. دەڵێ: تۆ بڵێی ئەو دەمە ببینمەوە کە لەو تاریکاییە خەستوخۆڵەدا، لەپڕ ئەستێرەی زوهرە لە لایەکەوە بدرەوشێتەوە؟ ئەستێرەی موشتەری، گرشە و ورشەی بێت؟ ئەستێرەی زوحەل- کە مایەی نەحسی و شوومییە- لە ئاسۆ ئاوا بێ و بەدبەختیم ببڕێتەوە؟ ئەستێرەی بەرەبەیان شەوق و شەبەقان بخاتە ئاسمانەوە و سپیایی بەرەبەیان هێشووی ئەستێرەی کۆ مشتوماڵ بکا و لە شەوێکی وا خۆشدا، بەژنوباڵای خۆشەویستم خۆ نیشان بدات و من لەو تاریکایی دووری و ئاوارەییە ڕزگار بکات؟

۱۴ ژ شەوقێ ئـەبروان بنمێـت هـیلال دیسـا دقەوسـەینان ·
ژ خـاوەر بێتـە خورشـیدێ زەلام وەر بـت د نوورێـدا

**مانای وشەکان:**

**شەوق**: مەیل؛ **ئەبروو**: برۆ؛ **بنمیت**: بنوێنێ؛ **هیلال**: مانگی یەکشەوە؛ قەوس: کـەوان؛ **قەوسەین**: دووکەوان؛ **خاوەر**: خۆرهەلات؛ **خورشـید**: خـۆر؛ **زەلام** (**ظـلام**): تاریکـایی؛ **وەر بت**: لە بەین بچێ؛ **نوور**: ڕۆشنایی.

**پوختەی مانا:**

بۆ ئارەزووی دیداری یار ــبە شەرتێک ئـەو خـۆی دەرخـاــ هـەموو شـتێک دەکەونـە هەلپە بۆ دیتنی. هەرچەندە من دەلێم بەیان بەر بێ، بەلام هیچ دوور نییە کە مـانگی یەکشەوە لە دوو لاوە بۆ لاسایی برۆکانی کەوانە بدا و بێتە بەر چـاو. خـۆر زۆر زوو لـە ڕۆژهەلاتەوە بۆ سەیرانی بەژن و بالای ئەو سەر لە ئاسۆگ بەرزکاتەوە. ئەوسا تاریکایی شەو و تاریکایی بەختی من بە یەکجاری لە بەین دەچن و لە ئارادا نامێنن.

۱۵ ب وەردان زەیینـین گولشـەن چەمەنـدا لالـە بشـکفتن
بنەفش و چیچەکان ڤێکرا شـەفەق دا یـەک د ڕەوزێـدا

**مانای وشەکان:**

**وەرد**: گولی‌گولاو؛ **زەیینین**: ڕازانەوە؛ **گولشەن**: گولجار، گولستان؛ **چەمەن**: مێـرگ و مێرخوزار؛ **لالە**: گولەمێلاقە؛ **بشکفتن**: پشکووتن؛ **بنەفش**: وەنەوشە؛ **چیچەک**: گولـی دەشت، لە هەموو جۆرێکی؛ **ڤێکرا**: هـەموو پێکـەوە؛ **شـەفەق**: شـەوق و ڕوونـاکی؛ **دا یەک**: دایان بە یەکتر؛ **ڕەوزە**: باغچەی گولان.

**پوختەی مانا:**

وادیارە عاشقی ئاوارە، لە پاش ئاوات خوازتن و بە خەیال، خۆش کردنی دنیا بۆ دیداری یاری ــکە هێشتا هەر ئاواتە و بۆی بەدی نەهاتووەــ دیسانەوە دەکەوێتە گلەیی کـردن لە بەختی ڕەشی خۆی و دەیەوێ دلی یار بۆ دیـدارێک نـەرم بکـا. ئـەم جـارە باسـی

فەسڵی بۆ دەکا؛ کە وا بەهارە و دنیا ڕازاوەتەوە و تەنیا ئەوی کەمە کە مایەی دڵخۆشی بۆ دروست ببێ. دەفەرموێ:
ئەوا لەم کژی بەهارەدا کە هەرِەمەی گولانە، گوڵی گوڵاو بوونەتە خشڵی دەشت و دەر و گوڵزاریان ڕازاندۆتەوە. گوڵەمێلاقە، مێرگ و مێرخوازیـان داپۆشـیوە. هـەموو جـۆرە گوڵێک ـکە وەنەوشەش یەکێکە لەوان ـ لە باخچۆڵاندا پشکوتوون و بەرانبەر بە یەک چەقیون و ڕووناکایی دەدەن بە یەکتر.

**١٦** سەحەرگەهـ عەندەلیب مەستن ژ بهنـا وەرد و بشـکۆژان
شـوبەهـ تووتـاک و گۆیینـان دنـالین ئـەم د فرقێـدا

**مانای وشەکان:**
**سەحەرگەهـ**: بەرەبەیان؛ **عەندەلیب**: بولبول؛ **مەست**: سـەرخۆش؛ **بهن**: بـۆن؛ **وەرد**: گوڵی پشکوتوو؛ **بشکۆژ**: خونچەگوڵ؛ **شوبەهـ**: وەکی؛ **تووتاک**: مەلێکە شەو هـەتا ڕۆژ ناخەوێ و هەر دەڵێ «توت، توت»؛ **گۆین**: مەلێکە شەو هەتا ڕۆژ ناسرەوێ و ناڵـەی دێ و جارـجار حیلەیەک دەکا کە وەک دەنگی گریان دەچێ؛ **دنالین**: دەناڵـێنین؛ **ئەم**: ئێمە؛ **د فرقێدا**: لە جودابیدا.

**پوختەی مانا:**
لەم بەهارە خۆشەدا، کە دەشت و دەر بە گوڵ و خونچـە ڕازاوەتـەوە و بولبـولان- کـە ئەویندارى گوڵانن- هەموو بەیانیان، لەبەر بۆن و بەرامەی گوڵان مەست و سـەرخۆش دەچریکێنن، چ خوا بەردارە منی چارەڕەش و کڵۆڵ، وەکوو تووتاک و گۆین، شەو هەتا ڕۆژ بگریم و بناڵێنم و لە دیداری یار بێبەش بمێنم؟

**١٧** ل کەلبێ ئاستانێ خوە نەپرسی قـەت حـەبیب جـارەک
گـەلۆ نائینـە بـیرێ ئـەم دقـێ نێچـیر و ڕاوێـدا

**مانای وشەکان:**

**کەلب**: سەگ؛ **ئاستان**: دەرگانە؛ **قەت**: هەرگیز؛ **حەبیب**: خۆشەویست؛ **گەلۆ**: خزمینە؛ **ئەم**: ئێمە؛ **دڤێ**: دەو؛ **نێچیر**: ڕاو، شکار.

**پوختەی مانا:**

وەخت کە بەهار بێ و هەڕەمەی گولان بێ، دیارە میر و شازادە دەبێ بچنە ڕاوشکارێ. باشە! شازدەکەی مەلاش دیارە لەو وەختە خۆشەدا چۆتە ڕاو. ئەدی چۆنە کە جارێک لە جاران، هەرگیز بۆ ئەو ڕاوشکارانە، سەگی ئاستانەی خۆی وە بیر نەهاتۆتەوە کە ڕەگەڵ خۆی بخا و بە دیداری خۆی دڵشادی بکا؟

**١٨** دزانم شەهسەواری مەن غەزالەک وێ د فتراکێ
بە جایێ سەیدێ ئەز بووما د وێ فتراک و بەندێدا

**مانای وشەکان:**

**شەهسەوار**: سەرتۆپی سواران؛ **غەزال**: کەژاڵ، ئاسک؛ **وێ**: وا؛ **فتراک**: بەن سامۆرتە؛ **سەید**: نێچیر؛ **ئەز**: من؛ **بووما**: ببوایەم؛ **د وێ**: لە ناو ئەو؛ **بەند**: بەن.

**پوختەی مانا:**

شاعیر کە جارێک خۆی بە سەگی ئاسانەی یار دادەنێ و گلەیی لە بەختی خۆی دەکا کە یارەکەی وە بیری نەهاتۆتەوە کە بیباتە ڕاوشکارێ، جارێکیتر بیری دەڕواتە ئەو دەشت و دەرە کە سووکەڵە سوارەکەی خۆشەویستی ڕاوی لێ دەکا و ئەوسا بە بیریدا دێ کە بۆ جوانێکی وا، بێگومان ئاسکی دەشت زۆر منەتبارن کە ببنە نێچیری. کە وا بوو، سوور دەزانم ئێستا هیچ نەبێ ئاسکێک ئەو خۆشییەی دیوە و بۆتە نێچیری یار و بە بەن سامۆرتەی زینەکەیەوە تەکە_تەکی دێت. دەڵێ:

ئەی خۆزیا من بوومایە لە جێگەی ئەو ئاسکە و بەو بەن سامۆرتەوە هەڵاوەسرابام.

**١٩** چ حەددیَ سەدهەزار جان بن د فتراکا حەبیبیَ من
کو سەد جەمشید و کەیخوسرەو غولامن سەر د ڤێ ڕێدا

**مانای وشەکان:**

**چ حەددی**: ڕێی ناکەویَ؛ **حەبیب**: خۆشەویست؛ **جەمشید و کەیخوسرەو**: دوو پادشای بەناوبانگی ئێران بوون؛ **غولام**: نۆکەر؛ **د ڤێ**: دە ئەو.

**پوختەی مانا:**

مەلا لەپڕ هۆشی دێتەوە بەرەخۆ و دەبینێ کە لەو ئاواتەخوازیانەیدا زۆر لە بەرەی خۆی پتر پێی ڕاکێشاوە! گورجێک پەشیمان دەبێتەوە و دەڵیَ:
نەک من، بەڵکوو سەد هەزار گیانیش پێکەوە بن، هەرگیز ڕێیان ناکەویَ ئەوندە بەرزەفڕی بکەن و ئاوات بخوازن کە لە بەن‌سامۆرتەی ئەو شاسوارەدا بەند بکرێن. بگرە سەتانی وەک جەمشید و کەیخوسرەو لەو ڕێگەدا خولامەتی دەکەن؛ هەر ئەوندە یار بە دیدارێک بیانلاوێنێتەوە.

**٢٠** د دەه سالان مولازم مام و یاریَ ڕوو نەدا جارێک
وەگەرنە یار ئەگەر ڕوو دت هەیە جارەک د سالێدا

**مانای وشەکان:**

**مولازم**: هەمیشە ئامادەی خزمەت؛ **مام**: مامەوە؛ **وەگەرنە**: ئەگینا؛ **ڕوو دت**: ڕوو بدا؛ **هەیە**: دەکریَ.

**پوختەی مانا:**

مەلا لێرەدا دەکەوێتەوە گلە و گازندە لە بەختی ڕەشی خۆی و دەڵیَ:
گریمان ڕێم ناکەویَ بمباتە ڕاویَ؛ گریمان ڕێم ناکەویَ بڵێم دە بەن سامۆرتەکەیدا بم؛ بەڵام من کە ماوەی دە ساڵی ڕەبەق لە بەر دەرگاکەی کەوتووم و هەرگیز ڕووم لیَ وەرنەگێڕاوە، نەدەبوایە جارێک لە جاران ڕووم بداتیَ و بملاوێنێتەوە؟ خۆ ئەگەر بڵێم ئەو لە بەر کاری زۆری نەیپەرژاوە، ڕاست ناکەم؛ چونکە ئەو خۆ لیَ بواردنەی منەی

ئەگەر بە ئانقەست نەبا، دەیتوانی هیچ نەبێ سالێ جارێک ئەحوالێکم بپرسێ و بە ڕووپێدانێک بەسەرم بکاتەوە.

٢١ دلۆ مزگینە مـن شـا بـە کـو سـولتانێ مـە دێ بێـتن
ژ من باوەرکە پەیغامێ سەحەر مـزگین بـە مـن پـێ دا

**مانای وشەکان:**

**دلۆ**: ئەی دڵ؛ **مزگینە**: مژدەیە؛ **شا بە**: شاد بە؛ **کو**: کەوا؛ **سولتان**: خونکار؛ **دێ بێتن**: لێ بڕاوە بێ؛ **ژ من**: لە من؛ **باوەڕ**: بڕوا؛ **پەیغام**: وەڵام؛ **سەحەر**: بەرەبەیان؛ **بە من پێدا**: بە منی دا.

**پوختەی مانا:**

باوەڕی سۆفیان وایە کە پیاو هەتا خۆی بە شتێک بزانێ، خوا ئاوڕی لێ ناداتەوە. وەختێک کە خۆی لە بیر بچێتەوە، ئەوسایە کە بەزەیی خوا بەسەری دەکاتەوە.
مەلا تا ئارەزوو دەکا کە یار دیداری لێ بکا و لەگەڵ خۆیا بەرێ بۆ ڕاو و چی و چی، مانای ئەوەیە خۆی بە شتێک دەزانێ و هەتا خۆشی بە شتێک بزانێ، لە لای خوا بە هیچ حیساب ناکرێ. بەڵام کە دەبینێ لە ماوەی دە ساڵدا هیچ لێی نەپرساوە، ئەوسا بۆی دەردەکەوێ کە ئەم خۆبینییە بۆتە لەمپەر لە نێوان دڵدار و یاردا. لەو خۆ بە شت زانینە پەشیمان دەبێتەوە و سەری کزی لە سەر ئەژنۆی هەژارانەی ئەنێتەوە و جگە لە یار هەموو شتێکی تەنانەت خۆشی، لە بیر دەچێتەوە و بە سەرکزییەوە دەپاڕێتەوە. یار بەزەی پێدا دێتەوە و بە خۆ پێ نیشاندانێک دەیلاوێنێتەوە. مەلا مژدەی ئەو دیدارە بە دڵە مەینەتبارەکەی ئەدا و ئەڵێ:
ئەی دڵ مژدەت پێ دەدەم، شاد بە! ئەوا خونکاری نازدارم بڕیاری داوە بێتە دیدارم. باوەڕم پێ بکە ڕاست دەکەم؛ چونکە لە بەرەبەیاندا پەیامنێری سەبای ساڵحان ئەو مزگێنیەی بە من داوە و تەواو جێگەی بڕوایە و هیچ گومان و دوودڵی تێدا نییە.

**٢٢** شوکور بیناهیا من هات و یەعقووب دیدە ڕەوشەن بوو
ب بۆیا یووسفێ میسرێ ل کەنعانێ بەسەر پێدا

**مانای وشەکان:**

**شوکور**: سوپاس؛ **بیناهی**: ڕووناکیِ چاو؛ **دیدە**: چاو؛ **بۆ**: بۆن؛ **کەنعان**: مەڵبەندێکە لە فەلەستین؛ **بەسەر**: هەم چاو هەم دیتن.

**پوختەی مانا:**

لەم بەیتەدا مەلا چیرۆکی یاقوب و یۆسفمان بیر دەخاتەوە کە یۆسف لە یاقوب پێغەمبەری باوکی دوور کراوەتەوە. باوک لە تاوی کوڕ، کوێر بووە. لە پاش چەند ساڵان کە براکانی یوسف چوونە میسر بۆ گەنم کڕین و یۆسف لەوێ کاربەدەستی دەوڵەت بوو، گەنمی دانێ و کراسەکەی خۆی بۆ باوکی نارد لە کەنعان. باوک بە بۆنی کراسی یۆسف، چاوەکانی چاک بوونەوە. دەڵێ:

زۆر سوپاس یارم ـکە ڕووناکایی چاوەکانمەـ هاتە دیدارم و چاوم بە دیداری ڕۆشن بۆوە. دیداری ئەویش هەر وەک کراسەکەی یۆسف بە بۆن، چاوی باوکی بینا کردەوە، منیش ـکە لە سۆی دیداری، دنیا لە بەر چاوم تاریک ببووـ بە دیتنی، تەم و تانەم لەسەر ڕەوی و ڕوون بوومەوە.

**٢٣** نەسیمێ سونبول و سێڤان سەحەردا حەبس و زێندانێ
ڤە بوو قفلا مە بێ مفتە زرنگینێ ژ قفلێدا

**مانای وشەکان:**

**نەسیم**: شنەبا؛ **سونبول**: گوڵی سمڵ؛ **سێڤ**: سێو؛ **سەحەر**: بەربەیان؛ **حەبس**: گرتووخانە؛ **ڤە بوو**: کرایەوە؛ **مفتە**: کلیل؛ **زرنگینی**: زرنگانەوە.

**پوختەی مانا:**

ئێمە ـکە لە دووری یار وەک ئەسیری ناو حەبس و زیندانان وا بووینـ لە بەرەبەیاندا شنەبایەک کە بەسەر پرچەکانی وەک گوڵی سمڵ بۆنخۆش، بەسەر کوڵمە سوورەکانی

سێوئاساییدا هاتبوو، ئێمەی گرتەوە. حەبس و زیندان لە لای ئێمە نەما. دڵی قفڵ دراومان بە بێ کلیل کرایەوە و بەڵکە لە خۆشی ئەو شنەبایە بۆنخۆشە، زرینگە لە قفڵەوە هات. واتا لە خۆشیان قفڵیش کردییە هاوار!

**٢٤** فیراقێ شەڤ ب ئاخر چوو سپێدە کەشف بوو دیسا
مەریخا نەحس ئافا بوو خویا بوو ڕۆژ د شەرقێدا

**مانای وشەکان:**

**فیراق**: دووری؛ **سپێدە**: بەرەبەیان؛ **کەشف**: دیاری؛ **دیسا**: دیسان؛ **مەریخ**: ئەستێرەیەکە بە شووم ناوی دەرکردووە؛ **نەحس**: شووم؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **شەرق**: خۆرهەلات.

**پوختەی مانا:**

شەوی دووری لە دیداری یار دوایی هات. بۆ جارێکیتریش ئۆخەی ئەوا بەیانی پێک‌گەیشتن، پێگەیشت. زۆر سوپاس؛ ئەستێرەی نەحسی بەختمان لە ئارادا نەما و ڕۆژی تاڵعمان لە ڕۆژهەلات، هەلات و خۆی ئاشکرا کرد.

**٢٥** د چەرخێ وەک نجووم دێم‌دوڕ سەما هاتن قیڕانا یەک
هەییڤا بەدر بوو ئەو سوڕپەری من دی د ڕەقسێدا

**مانای وشەکان:**

**چەرخ**: ئاسمان؛ **چەرخ**: زەمانە؛ **چەرخ**: سووڕدان و خول‌خواردن؛ **نەجم**: ئەستێرە؛ **نجووم**: ئەستێرەگەل؛ **دێم**: ڕوخسار؛ **دوڕ**: مرواری درشت؛ **سەما**: ئاسمان؛ **سەما**: هەڵپەڕکێ؛ **قیڕان**: بەرانبەریی و لێک نزیکی؛ **هەییڤ**: مانگی ئاسمان؛ **بەدر**: مانگی چاردە؛ **سوڕپەری**: وەک پەری لە دلکێشاندا؛ **ڕەقس**: هەڵپەڕکێ.

**پوختەی مانا:**

یاری خۆم دە گەڕی هەڵپەڕکێدا دیت کە سووڕی دەدا. کۆزی هەڵپەڕکێکە پڕی بوو

لە کیژی جوانی ڕوخسار وەک مرواری. دەهاتنە بەرانبەری یەکتر و لێک نزیک دەبوونەوە. کە ڕوانیم یاری من ـکە وەک پەری دلڕفێنەـ دەو کۆڕی ڕەقسەدا هەر دەتگوت مانگی چاردەیە دەناو ئەستێراندا، لە ئاسمانی جوانیدا چەرخ دەدا.

**٢٦** ژ وادی ئەیمەنێ دلبەر نزام ئەنگوشتەک ئیزهار کر
کو خۆش ئەنوار و بەرقێن ئەو تەجەللا بوون د توورێدا

**مانای وشەکان:**
**ژ وادی**: لە شیوی؛ ئەیمەن: ڕاستە؛ ئەیمەن: جێگەی هەرە پیرۆز؛ **نزام**: نازانم؛ **ئەنگوشت**: قامک؛ **ئیزهار**: دیار؛ **کو**: کە وا؛ **خۆش**: جوان؛ **ئەنوار**: ڕۆشناییگەل؛ **بەرق**: برووسکە؛ **تەجەللا**: دیاردە؛ **توور**: کێوێکە لە دەشتی سینا.

**پوختەی مانا:**
مەلا ئیشارە بە چیرۆکی مووسا پێغەمبەر دەکا کە وەختێک ژنەکەی زەیستان بووە، ویستوویە بچێ بزووتە ئاگرێکی بۆ بێنێ و ئاگری بۆ بکاتەوە؛ گەیوەتە ناو شیوەڵەیەک لە کێوی توور. خوا بانگی لێ کردووە کە تۆ لە پیرۆزترین شیوی تووردای؛ کەوشان داکەنە! هەروەها مووسا بە خوای گوتووە: دەمەوێ بتبینم. خوا فەرموویە: نامبینی. من خۆم نیشانی کێوی توور دەدەم؛ ئەگەر خۆی لە بەر دیداری من ڕاگرت، تۆش وا دەکەم بمبینی. خوا خۆی نیشانی کێوی توور داوە، کێو سووتاوە و مووسا دڵی بووراوەتەوە و لەسەرڕا بەر بۆتەوە. دەڵێ:
ئەو هەموو ڕووناکییە جوانانە، ئەو هەموو برووسکەدانە کە لەو بەرەبەیانە خۆشەدا بۆ عاشقان بۆتە دیمەن، دەبێ چ بێ، چ قەومابێ؟ نازانم. تۆ بڵێی یاری دلڕفێن قامکێکی نیشانی کێوی توور دابێ کە وا ئێمە وەک مووسا دڵمان دەبووڕێتەوە و بەڕوودا دەکەوین؟!

**٢٧** قیرانا زوهرەیێ من دی د بەر عەقدا سورەییایێ
ژ پەروینان دبێژم عەکسە هێژ کەفتی د جامێدا

**مانای وشەکان:**

**قیران**: بەرانبەر هاتنی دوو ئەستێرە؛ **زوهرە**: ئەستێرەیەکی گەشە؛ **دی**: دیت؛ **عەقد**: گەردانە؛ **سورەییا**: هێشووە ئەستێرەی کۆ؛ **پەروین**: ئەستێرەی ناو هێشووە ئەستێرەی کۆ؛ **دبێژم**: دەڵێم؛ **عەکس**: تیشکدانەوە؛ **هێژ**: هێشتا؛ **جام**: پیاڵەی بادە نۆشین.

**پوختەی مانا:**

لەو هەڵپەرکێیەدا کچەکانی ترم وەک لیزگەی گەردنبەندێک هاتنە بەر چاو کە لە جوانیدا بە کۆئەستێرە دەشبهێندران؛ بەرانبەر بە مانگی ڕووی یارم دەبوون و تیشکیان لەو وەر دەگرت. من ـکە مەستی شەرابی ئەو جوانییەمـ دەڕوانم پیاڵەکەم هەروا بریقەی ئەستێرانە لێیەوە دیارە. من دەڵێم تیشکدانەوەی ڕووی یارمە کە داویەتە ئەو ئەستێرانە و ئەوانیش تیشکیان داوەتە پیاڵەی بادەی منەوە.

**٢٨** حەبیبێ عەزمێ سوحبەت کر د جامان لەو شەراب ئانی
دلێ من دی دو سەییادان ژ بوریانا بەرێ وێ دا

**مانای وشەکان:**

**حەبیب**: خۆشەویست؛ **عەزم**: لێبڕان، قەسد؛ **سوحبەت**: هاودەمی؛ **لەو**: بۆیە؛ **شەراب**: مەی؛ **ئانی**: هێنای؛ **دی**: دیت؛ **سەییاد**: نچیرەوان؛ **بوریان**: بریانی، گۆشتی برژاو؛ **بەرێ وێدا**: لێی ڕوانی.

**پوختەی مانا:**

خۆشەویستەکەم، ویستی ببێتە هاودەم و هاونشینم؛ بۆ ئەوە بوو کە شەرابی دەناو پیاڵاندا هێنا. یانێ چاوە مەستەکانی نیشان دام. دڵم دەسبەجێ هەستی کرد کە دوو ڕاوکەرـ واتا چاوەکانی ـ تێیەوە دەڕوانن و دەیانەوێ بۆ مەزەی مەستییەکەی خۆیان، بیکەنە بریانی. «سالم» لەو بارەوە دەڵێ:

وەی وەی چ مەجلیسێ بوو دوێنێ لە دیدە و دل
دڵبەر شەرابی گێڕا «سالم» کەبابی هێنا

**٢٩** ب تـــوولێن ئاســـتانیرا ڤـــەخۆندم مـــیر ب دەرگاهـــێ
ب ڤێ چاڤێ حەبیب دیتم شوکور ئەڤ شـــەفقە مەولێـدا

**مانای وشەکان:**
**توول**: توڵە، سەگی پچووک؛ **ئاستان**: بارەگا؛ **ڤەخۆندم**: خوێندمییەوە؛ **ب ڤـی**: بە ئەو؛ **دیتم**: دیتمی؛ **شەفقە**: ڕحم و بەزەیی؛ **مەولێ**: مەولا، سەروەر.

**پوختەی مانا:**
خودایە ئەی سەروەری سەروەران! زۆر سوپاس بۆ تۆ کـە بـەزەییت بـە منـدا هـات و کارێکت کرد دڵبەرم من بە توڵەی دەرگانەی خۆی حیساب بکا و بمخوێنێتەوە. منی هـەژار لـە دەرگـای میرێکـی وا دەسـەڵات دار ڕێگـا بـدرێم و یـارم بـەو چـاوی خۆشەویستییەوە لێم بڕوانێ!

**٣٠** ژ شـــکلێ ئـــەبروێن ســـاقی هلاتـــن ســـەد هـــیلال ئـــیرۆ
وە بەدەرک من موقابل دی ئیشارەت مـــن ژ عەکســـێدا

**مانای وشەکان:**
**ساقی**: مەیگێڕ؛ **هلاتن**: هەڵاتن؛ **هیلال**: مانگی یەکشەوە؛ **ئیرۆ**: ئەمڕۆ؛ **وە**: وەها، ئـاوا؛ **بەدر**: مانگی شەوی چاردە؛ **موقابل**: بەرانبەر؛ **دی**: دیت؛ **ئیشارەت**: ئیشارە؛ **عـەکس**: تیشکدانەوە.

**پوختەی مانا:**
ئەمڕۆ کە یار ڕوخساری نیشان دا، سەد مانگی یەکشەوە بۆ لاساکردنەوەی برۆکانی ئەو مەیگێڕە چاومەستە، لە ئاسۆگ سەریان دەرێنا. هەروەها مانگی چاردەشـم دیـت کـە بەرانبەر بە ڕوومەت و هەنیەی وێستابوو. من ئیشارەتی ڕوخسـاری یـارم لـە تیشـک بەخشینی بە مانگی چاردە پێ گەیشت و زانیم دەرکەوتووە تا بیبینم.

٣١ ب زەهرێ خۆی شەریف خۆندم کو خدمـەتکارێ دێـرینی[١]
تە پڕ جەور و جەفا دینە سلووک و سـەعی و جەهدێـدا

**مانای وشەکان:**

**زەهر**: زار، دەم؛ **شەریف**: ممبارەک؛ خۆندم: بانگی لێ کردم؛ **کو**: کە؛ **پڕ**: زۆر، زیـاد؛ **جەور و جەفا**: دەرد و ئازار؛ **سلووک**: ڕێڕۆیشتن.

سـلووک لـە زاراوەی سـۆفیاندا، پلە_پلـە بـەرەژوور چوونـە بـەرەو خـودا تـا دەگەنـە مەنزلگەی توانەوە لە خوادا کە **فەنافیللای** پێ دەڵێن. ئەم پلانەش بریەتین لـە: **تۆبـە، کۆشش، تەنهایی، دوورەپەرێزی، لـە خـوا ترسـان، دنیـا فرێـدان، تکـا** و هی‌تـریش.

**سەعی**: ڕۆیشتنی  بە پەلە؛ **سەعی**: کۆشش؛ **جەهد**: تەقەلا و هەوڵ.

**پۆختەی مانا:**

یارم بە دەمی پیرۆز و شیرین‌زمانیی خۆی، منی دواند و فەرمووی کە تۆ خدمـەتکاری لەمێژینەی منی. تۆ لە ڕێگەی خزمەتی مندا و بۆ گەیشتن بە من زۆر ماندوو بـووی و زۆرت کۆشش و تەقەلا کردووە.

٣٢ بچین وەردان ژ گولزاران کو ئەغیاران ب دەست خـارن
ژ مەخسووسانێ دەرگـاهی دوو عـامن ئـەو د هیجرێـدا

**مانای وشەکان:**

**بچین**: بچنەوە؛ **وەرد**: گوڵ؛ **گولزار**: گوڵجاڕ؛ **ئەغیار**: بێگانە، غەوارە؛ **خار**: دڕوو، چقڵ؛ **مەخسووس**: تایبەتی؛ **دەرگاه**: دەرگا؛ **عام**: ساڵ؛ **هیجر**: دووری دیدار.

**پوختەی مانا:**

تۆ ئەوا دوو ساڵە دەردی دووری دەکێشـی و هـەر بـە تـەمای دیـدار بـووی و خـۆت ڕاگرتووە؛ چاکت کردووە. لەوە بـەولاوە دەتکـەم بـە خـولامی تایبـەتی بـەر دەرکـی

---

١. شێخ مونەووەر: «ب زارێ خۆ شیرین خووندم ژ لوتفێ بەندە نیشان کر»

بارەگای خۆم. ئەوندەش بزانە کە ئەوانەی غەوارەن و لە ئێمە بێگانەن، لە دنیادا جگە لە دڕک و داڵ چییان وەدەست نەکەوتووە. ئەوا تۆ گەیشتییە ناو باغ و باغچەی ئاوات. دەسا دەس‌بکە بە گوڵ چنین لە گوڵجاڕی ئارەزوودا.

۳۳ ب تەشریفا خوە ئەز خۆندم ژ لوتفێ بەنـدە نیشـان کـر
خەلات و شەفقە و دلدان شوکور خوازین کـو بـاخوێ دا

**مانای وشەکان:**

**تەشریف**: گـەورەکردن؛ **تەشـریف**: گـەورەیی؛ **خـۆ**: خـۆی؛ **خۆنـدم**: خوێندمییـەوە، لاواندمییەوە؛ **لوتف**: ئیلتفات و نـەرمی؛ **بەنـدە**: کۆیلـە؛ **خـەلات**: بەخشـش؛ **شـەفقە**: مەحەبەت و خۆشەویستی؛ **دلدان**: دڵدانەوە؛ **باخوێ**: خودا.

**پوختەی مانا:**

بە گەورەیی خۆی گەورەی کردم. بە نەرمی و ئیلتفاتەوە منی کۆیلەی خـۆی نیشـانە کرد. ئەو هەموو بەخشش و ئیلتفات و ڕووخۆشی و دڵدانەوە و لاواندنەوەی کە لە یارم دیت لـە هونـەر و کـردەوەی مـن بـەدەرە و تـەنیا خودایـە بـەزەی پێمـدا هـاتووە و خوێندوومییەوە و بەسەری کردوومەوە؛ زۆر سوپاسگوزارم لە خودا.

۳۴ مە هادر سەجدەیا شوکرێ ل وێ عەردێ موقەددەس بر
ب موژگانێن خوە دوڕ سـوفتن ئـەنی مـالی ل عەردێـدا

**مانای وشەکان:**

**مە**: ئێمە؛ **هادر**: حازر، دەسبەجێ؛ **سەجدە**: سەر وەسـەر عـەرز کـردن بـۆ کـڕنووش؛ **شوکر**: سوپاس. کەسێک کـە خـوا خۆشـی زۆری دەداتـێ، سـوژدەیەک دەبـا نـاوی سوژدەی شوکرە. **عەرد**: زەمین؛ **موقەددەس**: پیرۆز و ممبارەک؛ **بر**: بـرد؛ **موژگـان**: مژۆڵ؛ **دوڕ**: مرواری درشت؛ **سوفتن**: سوون، کون کردن؛ **ئەنی**: توێڵ، ناو چاوان.

**پوختەی مانا:**

من لە خۆشییان کە یار بە سەری کردمەوە و بە غولامی خـۆی حیسـاب کـردم، هـەر دەستبەجێ لە حوزووردا سوژدەی شوکرم برد. لەسەر ئەو زەمینە پیرۆزە ـکـە وەک شیوە پیرۆزەکەی کێوی توور بوو ـ پیاو لە هەرکوێ بە خوا بگا، ئەو شوێنە پیرۆزە. بـە مژۆلان مرواری فرمێسکانم دابێشت و دارشت. ناو چاوانم لە عەرز مالی و عەرزەکەم بە ناو چاوانم مالی و گەسکم دا؛ بەلام گەسکەکەم توێلم بوو.

**٣٥** هـەیا بیناهــیا چەهڤـان بـوت و عـوززای و لاتـێ مـن
توئی پێشـبەر سـجوودا مـن سـەحەرگاهان د خەلوێـدا

**مانای وشەکان:**

**هەیا**: ئەی؛ **هەییا**: وەرە؛ **بیناهی**: سۆما، ڕوونـاکی چـاو؛ **چـەهڤ**: چـاو، دیـدە؛ **بینـایی چاوان**: ناوە بۆ خودا؛ **بوت**: بت؛ **عوززا**: بتێک بووە لە مالی کابە؛ **لات**: بتێک بووە لـە مالی کابە. **پێشبەر**: قیبلە، ڕووگە؛ **سجوود**: سوژدەگەل؛ **سـەحەرگاهان**: بەرەبـەیانان؛ **خەلوە**: جێگەی تەنیایی.

**پوختەی مانا:**

وەرە ئەی ڕووناکی چاوانم! ئەی بینایی چاوان! وەرە ئەی کەسێکی کە من تۆم کردۆتە بت و دەتپەرستم و لە جێگەی عوززا و لات ـکە بتپەرستان دەیانپەرستن ـ مـن تـۆ دەپەرستم و وازم لە هەموو شتێک هێناوە جگە لە تۆ. تۆ ڕووگە و قیبلەی مـنی. مـن کە هەموو بەرەبەیانان بۆ کڕنۆشت سەر دەنێمە سەرزەوین و سـوژدە دەبـەم، ڕووم دە تۆیە و لە شوێنی تەنیاییدا تۆم دەگەلی.

**٣٦** ل بال عیلمێ تە مەعلوومە ژ زینێ من تو مەقسوودی
فیدای جانێ مە دێ جان بت د قەستا وەسل و دینێدا

**مانای وشەکان:**

**ل بال**: لە کن، لە لای؛ **عیلم**: زانست؛ **تە**: تۆ؛ **مەعلووم**: دیـاری و ئاشـکرا؛ **مەقسـوود**: مەبەست؛ **جان**: گیان؛ **فیدا**: قوربان، گۆڕی؛ **قەست**: نیاز؛ **وەسل**: پێک گەیشتن؛ **دین**: دیتن و چاو پێ‌کەوتن.

**پوختەی مانا:**

پێی ناوێ من بڵێم. خودایە! ئەی یـار! ئـەی بینـایی چـاوان! هـەموو شـتێک خـۆت دەیزانی. لەبەر زانستی تۆدا ئاشکرایە کە لە ژیانـدا جگـە لـە تـۆ نیـازێکم نییـە. مـن دەمەوێ لە ڕێگەی تۆدا ـکە گیانی بەڕاستیم تۆی ـ گیانم فیدا کەم. هەر ئەوندە بـەو هومێدەوە بم کە بە تۆ بگەم و بتبینم.

**٣٧** ب حوسنا خۆ ئیلاهی کی ب سـەهم و هەیبـەتێ دینـێ
نوجـووم و کەوکـەبێ لامیـع ژ بـالا تـێن بـە بەژنێـدا

**مانای وشەکان:**

**حوسن**: جوانی؛ **ئیلاهی**: خوای مـن؛ **کـی**: بکـەی؛ **سـەهم**: سـام و تـرس؛ **هەیبـەت**: مەترسی؛ **دین**: دیتن؛ **نوجووم**: ئەستێرەگەل؛ **کەوکەب**: ئەسـتێرە؛ **لامیع**: بریقـەدار؛ **بالا**: لای سەروو؛ **بەژن**: بالا.

**پوختەی مانا:**

خودایە بەو جوانییەی خۆت کەی کە بەشێکت داوە بە دڵبەرم و بەو هەیبـەت و مەترسی و دڵەلەرزەیە کەی کـە لـە دیتـنی ئـەو جوانییەتـدا لـە ڕووی دڵـبەرم دەیبینم و بەو دیدارە لەو بەژن و باڵا ڕێکەدا نیشانمان دەدەی، ئـەو خشـڵانەی دەبریقێنـەوە و لەسـەرڕا تـا خـوار لـە بـەژنی یـاردا وەک ڕیـزی ئەسـتێرە دەدرەوشێنەوە. کە ئەوانەش هەموو پاژێک و بەشێکی کەمن لە جـوانی تـۆ کـە لەوە بەشی یارمت داوە.

٣٨ ب خالێن وەرد و نەسرینان ژ قودرەت خـەت کشـاندی لـێ
ب تـەرحا نێرگـزا عێلـی سـەحەرگاهان نەسـیم لـێ دا

**مانای وشەکان:**

**خال**: خاڵی سەر ڕوو؛ **وەرد**: گوڵی سووری موحەممەدی؛ **نەسرین**: گوڵـێکی سـپییە؛ **قودرەت**: توانایی؛ **قودرەت**: کاری خودا؛ **خەت کشـاندی لـێ**: خـەتت لـێ کێشـاوە؛ **تەرح**: چووزە، چڵ؛ **نێرگز**: گوڵێکی سپی بۆنخۆشـە؛ **عێـل**: بڵـند؛ **عێـل**: عاشـیرەت؛ **نەسیم**: شنەبا.

**پوختەی مانا:**

خوایە! بە جوانی بەژن و باڵای یار ـکە جوانی خۆتە داوتەتێ ـ بە خاڵەکانی ڕوخساری چ ئەوانەی لە سەر کولمەی سووری- کە وەک گوڵی گوڵاون- چ ئەو خاڵانەی لە سەر لاجانگ و بەر گەردنن- کە لاجنگ و ژێرچەنەی وەک نەسرین وان- کە بە قـودرەتی خۆت نەخشاندووتن، خودایە سوێندت دەدەم بەو بەژن و باڵایە کە وەک چڵە نێرگزی شلک و بڵندە و لەچاو هەموو جوانانی عاشیرەتدا گوڵی سەرتۆپە، ئەو چڵە نێرگزەی کە بە شنەبای بەیانان دەلەرێتەوە. یان ئەو بەژنە شلکەی کە بە هەناسەی عاشقانەی ئێمە دەهەژێت.

٣٩ کـو توولـێ ئاسـتانێ دوور نـەکی ئیـدی ژ دەرگاهــێ
ژ باخۆی ڤی ڕجـوو نـاکین د بـا بـێ لوتـف و ڕەحمێـدا

**مانای وشەکان:**

**کو**: کە؛ **توولێ**: تولەی؛ **نەکی**: نەکەی؛ **ئیدی**: جارێکیتر، تـازە؛ **بـاخۆی**: خـودا؛ **ڤـی**: ئەوەی؛ **ڕجوو**: تەمـەننا، داوا؛ **بـاب**: دەرگـا؛ **بـاب**: بابـەت؛ **لوتـف**: ئیلتفـات؛ **ڕەحـم**: بەزەیی.

**پوختەی مانا:**

خودایە! سـوێندت ئـەدەم بـە جـوانی یـارم، بـە بـەژن و بـاڵای، بـەو خاڵانـەی پێـت

نەخشاندووە، کە هەمووشیان تۆزێکە لـە نموونـەی جـوانی خـۆت، دڵـم مەشـکێنە و جارێکی‌تر دوورم مەخەرەوە لە دەرگای خۆت و با هەر تولەی بـەر دەرگانـەی تـۆ بم. خودایە! ئەو تەمەننایەم تەنیا لەوەیە کە هومێدم بە لوتف و ڕەحمەتی تۆ هەیـە. دەنـا دەزانم عەبد حەقی نییە ئاواتی خۆی لەبەر خودا دانێ و بڵێ بیکە.
لێرەدا مەلا ئەو قسەی سۆفیانەمان بیر دەخاتەوە کە خودا بەرانبەر بە هیچ نایدا. تەنیا ئەگەر بەزەی بە کەسێکدا هات، دەرووی خێری لێ دەکاتەوە. نوێژ و تاعەت نـابن بـە هۆی بەخششی خودا.

**٤٠** تو نـارێ فیرقـەتێ زانی دکـارم، ئـەز تەحـەممول کـم
دبـــارێ کووهـــێ قەنـــدیلم، بلاقـــیلم د عیشـــقێدا[١]

**مانای وشەکان:**
**نار**: ئاگر؛ **فیرقەت**: جیایی، جـودایی؛ **دکـارم**: دەتـوانم؛ **ئـەز**: مـن؛ **تەحـەممول کـم**: هەڵگرم؛ **دبار**: کێو؛ **کووهی**: کێوی؛ **قەندیل**: کێوێکی بەرز و بەناوبانگە لە کوردسـتان؛ **بلاقیل**: بێ قسە و باس؛ **عیشق**: ئەوین، دڵداری.

**پوختەی مانا:**
خودایە هەرچەندە وای دابنێم کە من کێوی قەندیلم، هیچ گلە و متەقیشم لە دڵداریدا قەت نەبووبێ، ئایا من چیتر دەتوانم تاقەتی جـودایی بێـنم؟ خوایـە تـۆ خـۆت دەزانی ئاگری جودایی چەند بە تەوژم و بێ‌ئامانە. دەشزانی خۆ لەبـەر ڕاگـرتنی تەنانـەت لـە وزەی چیای قەندیلیشدا نییە.
مەلا ئیشارە بەو ئایەتە دەکا کە خوا فەرموویە:
ئەگەر ئەم قورئانەمان ناردبایەتـە سـەر چیـا، دەتـدیت بـە زەلیلـی لـە ترسـی خـودا، لەت‌_لەت بووە و لەبەر یەک چووە.

---

١. سەلمان دلۆڤان: «مەگەر فیلم د عشقێدا»

٤١ زەهی دەردێ مەزن فیرقەت جگەر سۆت ئاتەشێ دا دل
جهێ سەبرێ نەما چەندان فـەرەج مـن دی د سـەبرێدا

**مانای وشەکان:**

**زەهی**: یـەک، چ زۆر؛ **دەرد**: ژان؛ **مەزن**: زل؛ **فیرقـەت**: جـودایی؛ **سۆت**: سـووتا؛ **ئاتەش**: ئاگر؛ **جیە**: جێگە؛ **چەنـدان**: هێندە؛ **فـەرەج**: فـەرحانی؛ **سـەبر**: حەوسەڵـە و پشوودرێژی.

**پوختەی مانا:**

ئاخ لە ژانی گرانی جودایی چی پێکردم! جەرگی سـووتاندم؛ ئـاگری دە دڵ بـەردام. بەڵێ زۆرم سەبر کرد و لە سەبری زۆرەوە گەییمە فەرحانی. بەڵام ئیتر تازە کـە دڵ و جگەرم ئەوسا سووتاوە، دڵیش جێگەی سەبرە؛ ئاگری گرت و بوو بە خۆڵەمێش. ئیتـر جێگەی سەبر کردنەکەشم نەماوە. دەسا خودایە دیسان تووشی جوداییم مەکەوە!

٤٢ «مەلا» بێ قامەتا یەکتا قیامـەت مـن بـە چەهڤـان دی
فیراقـێ ڕووسـیا بـن تـە ژ مـن جانـێ شـرین جـێ دا

**مانای وشەکان:**

**قامەت**: بەژن؛ **یەکتا**: بێوێنە، (نەمامی تاقانـە)؛ **فـیراق**: جـودایی؛ **ڕووسـیا**: ڕووڕەش؛ **جێ**: جیا، جودا.

**پوختەی مانا:**

هۆی مەلا! (وەک شاعیرانی تر خـۆی دەدوێنـێ) بـێ بـەژن و بـاڵای یـار ـکـە وەک نەمامی تاقانە و بێوێنەیەـ من قیامەتم بە چاوان دیت. ئەی جودایی ڕووت ڕەش بێ! تۆ بووی کە گیانی شیرینمت- کە یارە- لێ جیا کردمەوە.

# دوعا

١ سەرێ زولفا تە ب کوللابێ دوعا
هاتە دەستێ مە ب جەللابێ دوعا

**مانای وشەکان:**

**کوللاب**: قولاپ؛ **دوعا**: نزا؛ **جەللاب**: کێشەر؛ **جەللاب**: بەو کەوە دەڵێن کە دەناو حەشاردا دەیشارنەوە و کەوی پێ ڕاو دەکەن.

**پوختەی مانا:**

ئەی یار! ئێمە دۆعامان کرد و دۆعاکەمان وەک کەوی ڕاو، وەک قولاپ و داو، سەری زوڵفی ئاڵقەی قولاپئاسایی تۆ کەوتە دەستمان.

٢ سوفییێ خەلوەنشین بێنە سوجوود
هەردوو برهێن تە نە میحرابێ دوعا

**مانای وشەکان:**

**خەلوەنشین**: چلەکێش؛ **برە**: بڕۆ.

**پوختەی مانا:**

ئەی یاری دلڕفێن! ئەو تاقی برۆیانەی تۆ پیرۆزترین میحرابن کە هەر کەس بەرانبەریان ڕاوەستێ و دۆعا بکا دەس‌لەجێ قبووڵ دەبێ. با سۆفییە چلەکێشەکانیش بەرەو ئەو برۆیانەت سوژدە بەرن تا شتێکیان لە قودرەتی خودا لێ حاڵی ببێ.

٣ عەرزێ کی دێ بکرم سوورەتێ حال
کو تویی قیبلەیێ ئەربابێ دوعا

**مانای وشەکان:**

**دێبکرم**: بکەم؛ **سوورەتی حال**: باسی چۆنیەتی خۆم؛ **کو**: کە؛ **قیبلە**: ڕووگە؛ **ئەرباب**: خاوەنان.

**پوختەی مانا:**

باس‌وخواسی چۆنیەتی خۆم، جگە لە تۆ لای کێ بدرکێنم؟ کە هەر خۆتی ڕووگەی نیاز و ئاواتانی.

۴ ژ دوعائێ قەدەحەک دەر دەستە
هەر سەحەر مەستێ مەیێ نابێ دوعا

**مانای وشەکان:**

**قەدەح**: پیاڵە؛ **دەر**: دەناو؛ **مەیی ناب**: شەرابی بێ خەوش.

**پوختەی مانا:**

لە سایەی پاڕانەوەم لە دەرگات، هەموو بەیانیان مەست و سەرخۆشم و لە بادەی بێغەوشی یادی تۆیە ئەو سەرخۆشییەم.

۵ گولێ ئیقبالێ ژ گولزارێ قەبوول
مە چنیبوو د شەکەرخابێ دوعا

**مانای وشەکان:**

**ئیقبال**: ڕوو تێکردن، بەخت؛ **شەکەرخاب**: خەوی خۆش، شیرین خەو.

**پوختەی مانا:**

من کە هێندە بەکزی و کەنەفتی لەبەرت پاڕامەوە تا خەو بە لایدا بردمەوە، لە خەوما دیتم کە نزام قبووڵ بووە و گوڵی بەختم پشکووتووە و گوڵچنینم لە گوڵزاری قبووڵ کردنت بە نەسیب بووە.

٦ بەر دوو برهێن تە ژ ئـیخلاس و یـەقین
مــە دبــر ســەجدە ب ئادابــێ دوعــا

**مانای وشەکان:**

**برە**: برۆ؛ **ئیخلاس**: دڵپاکی؛ **یەقین**: بێگومـانی؛ **مە دبر**: ئێمـە دەمـانبرد؛ **ئاداب**: ڕێوشوێن.

**پوختەی مانا:**

من وام بە خۆم هەست کرد کە بە دڵ و یەقین سوژدەم دەبردە بەر میحرابی ئـەو دوو برۆیانەت و بە داموودەستووری دۆعام دەکرد.

٧ ژ دلــەک ســافی تــۆ میحرابــێ ببــین
ســەجدەیەک لازمــە دەر بابــێ دوعــا

**مانای وشەکان:**

**ژ دلەک سافی**: لە دڵێکی سافەوە؛ **لازمە**: پێویستە؛ **دەر بابێ**: لە بابەتی.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر بە دڵێکی پاک و بێخەوش بڕوانییە ئەو برۆ میحرابی و کەوانییە، دەزانی کە بـۆ پاڕانەوە و نیازگرتن، پێویستە سوژدەیەکی بۆ بەری.

٨ مە د دل عوروەتێ وسـقایە ب دەسـت
ژ ســەنایا تــە ســەر ئــەلقابێ دوعــا

**مانای وشەکان:**

**مە**: ئێمە؛ **د دل**: دە دڵدا؛ **عوروە**: دەسکەگۆزە، دەسکی هـەرچی؛ **وسقا**: هـەرەقایم؛ **سەنا**: مەدح و پێدا هەڵگوتن؛ **ئەلقاب**: نازناوان.

**پوختەی مانا:**

من کە مەدحی تۆ دەکەم و ناوت دەبەم، ناوی تۆ سەروەری هەموو ناو و نازناوانە. ناوی

خۆت دەکەمە تکاکار لە دۆعا کردنـدا. دەسـتم بـە دەسـکی هەرەقایمـەوە گرتـووە و هەرگیز تل نادەم و لە ڕێگە لا ناکەوم.

٩ ژ ئەزەل یەکجیهـەتی دایـە «مـەلێ»
هـەر مـە ئیخلاسـە ژ ئەسـبابێ دوعـا

**مانای وشەکان:**

**ئەزەل**: هەرەپێشوو؛ **یەکجیهەتی**: یەکلایـەنی؛ **مـەلێ**:مـەلا؛ **هـەر مـە**: ئێمـە هـەر؛ **ئەسباب**: هۆ.

**پوختەی مانا:**

هەر لە ڕۆژی بناوانەوە، خوا یەکتاپەرستی داوە بە مەلا. هۆیـەکی کـە دەبێتـە مایـەی پاڕانەوەمان، ئەو ئیخلاس و دڵپاکییەمانە.



# دیدار

١ دەستێ قودرەت کو هلاڤێت ژ بەژنا تە نیقاب
ل جەمالا جەبەرووتی مە نەمان پەردە حیجاب

**مانای وشەکان:**

**قودرەت**: توانایی؛ **هلاڤیت**: هاویشتی، هەڵیماڵی؛ **نیقاب**: سەرپۆش؛ **جەمال**: جوانی؛ **جەبەرووت**: دەستەڵات؛ **حیجاب**: لەمپەر.

**پوختەی مانا:**

لەوساوە کەوا دەستی بە هێز و توانای سازدەری زەوی و ئاسمانان، بەژنی تۆی هێناوەتە ئاراوە و پەردەی نێوانی لە ناو لا داوە و خۆی بە ئێمە نیشان داوە، ئێمە جوانی خوای گەورەمان لە ڕوخساری تۆدا بەدی کردووە و بۆ دیتنی جوانی ئەو پەروەردگارە توانا و خاوەن دەستەڵاتە هیچ پەردەو لەمپەرمان لە ناودا نەماوە.

٢ ل گولێن تەی تەر و نازک کو سەحەر گرتی خوناڤ
د ئەباریق و قنینان ژ حەسەد سوهتی گولاب

**مانای وشەکان:**

**گولێن**: گوڵان؛ **تەر و نازک**: شەق و تورت؛ **خوناڤ**: شەونم، ئاونگ؛ **ئەباریق**: جەمعی **ئیبریق**: لوولێنە؛ **قنینە**: دەفری شووشە؛ **حەسەد**: ئێرەیی؛ **سوهتی**: سووتاو؛ **گولاب**: گوڵاو.

**پوختەی مانا:**

لەوەتا سەرگۆنای تۆ ــکە وەک پەلکە گوڵی ناسک و تورت و تێراو وانــ لە بەربەیاندا شەونمیان پەڕیوەتە سەر، گوڵاو کە شیرەی گیانی گوڵانە و دەزانێ نەگەیشتۆتە

بارتەقای ئەو شەونمە کە بەسەر کوڵمەکانتەوەیە، لەبەر ئێرەیی و چاونەزێری لە داخ و حەسرەتان، لە ناو تونگەی لولەدار و لە ناو شووشاندا سووتاوە.

٣ عەینێ کافوورییە مەشرەب مە ژ حوسنا تەیە ساف
لەو ژ عیشقا تە د دلدا مە ڤەبوو عیلمێ عوباب

**مانای وشەکان:**

**عەین**: کانی؛ **عەین**: هەروەک؛ **کافوور**: شیرەی دارێکە زۆرتر لە چین و ژاپون دەڕوێ؛ ئەویش وەک دارەبەنی وڵاتی خۆمان لەلە دەکرێ و شیرە دائەدا و دوایە وشک دەبێتەوە. ڕەنگی زۆر سپییە؛ بۆنی خۆشە و بۆ داودەرمان بە کار دەبرێ. بە لاشەی مردوویەوە دەکەن زوو بۆن نەگرێ. خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: «لەو دنیا کارچاکان لە پیاڵەیەک دەخۆنەوە کە ناوەرۆکی پیاڵەکە کافووریشی تێکەڵاوە و لە کانییەک تێراو دەبن کە هەرگا بیانەوێ هەڵدەقوڵێ»؛ **حوسن**: جوانی؛ **ساف**: بێخەوش؛ **لەو**: بۆیە؛ **ڤەبوو**: کرایەوە؛ **عوباب**: دەریای بە شەپۆل و شەپۆلی دەریا؛ **عوباب**: ناوە بۆ کتێبێکی فەرهەنگی عەرەبی کە «سەنعانی»[1] بیست بەرگی نووسیوە و بۆی تەواو نەکراوە.

**پوختەی مانا:**

لەو ساوە ئێمە ڕێگامان دراوە کە لە جوانیی بێگەرد و بێخەوشی تۆ بڕوانین، خۆمان لە بەهەشتا دەبینین و لە ڕێزی پیاوچاکانداین و لەو سەرچاوە بەهەشتییە تێراو دەبین کە کافووری لەگەڵا تێکەڵاوە. هەر بۆیەشە کە دەرگای دەریای زانست بە ڕووی دڵماندا کراوەتەوە و دڵمان لە زانایی خواناسیندا دەریایەکە شەپۆل ئەدات و سەرڕێژ

---

١. سەنعانی، ناوی ئەبولفەزایل حەسەن کوڕی موحەممەد بووە. لە نێوان ساڵانی ١١٨١ و ١٢٥٢ز دا ژیاوە. لە شاری لاهووری هیندووستان هاتۆتە دنیا. لە شاری غەزنە خوێندوویە و لە بەغدا مردووە. دوو فەرهەنگی عەرەبی نووسیوە؛ یەکێکیان ناوی: «*التكلمة والذيل والصلة*» واتا: تەواوکەر و پەراوێز و پێکگەیاندن بووە. ئەوی‌تریان، «*العُبابُ الزّاخر واللُّبابُ الفاخر*» دەریای پڕ و سەرڕێژ یان شەپۆلی سەرڕێژکەری دەریا و کاکڵە خۆشەکان. ئەو فەرهەنگەی تا پیتی میم هێناوە و بۆی تەواو نەکراوە و مردووە.
فەیرووزئابادی قامووسەکەی خۆی لەسەر دار و پەردووی ئەم دوو کتێبەوە هەڵناوە. «هەژار»

دەکات. یان، لە سایەی دیداری تۆوە، ئێمە زانستێک ڕووی تێ‌کردووین کە زۆر لە ناوەڕۆکی کتێبی «*العُباب*»ی سەنعانی زیاترە.

۴ مە ژ سەرچەشمەیێ حەیوان قەدەحەک سافی ڤەخوار
ناگەهێ لەززەت و زەوقا مە ب سەد جلدی کیتاب

**مانای وشەکان:**

**سەرچەشمە**: سەرچاوە؛ **حەیوان**: ژیان؛ **قەدەح**: پیالە؛ **ساف**: ڕوون و دوور لە لیڵاوی؛ **ڤەخوار**: خواردەوە؛ **ناگەهی**: ناگاتە؛ **لەززەت**: خۆشی؛ **زەوق**: چێژە؛ **جلد**: بەرگ.

**پوختەی مانا:**

ئێمە لە سەرچاوەی ئاوی حەیاتێ، پڕی پیالەیەکی ڕوون و ڕەوانمان خواردۆتەوە؛ خۆشی و چێژەیەکی کە ئێمە هەستمان پێ کردووە، بە سەد بەرگ کتێب باسی بکەین هێشتا دوایی نایە.

۵ لەو د چەنگێ مە دخوونێ کو د عیشقا تە بساز
مە ب بەژنا تە دخوونن نەی و قانوون و ڕوباب

**مانای وشەکان:**

**لەو**: بۆیە؛ **کو**: کە؛ **دخوونێ**: بانگ دەکا؛ **نەی**: بلوێر؛ **چەنگ، قانوون، ڕوباب**: هەریەکە ئامرازێکی مووسیقان؛ **بساز**: بساچینە، ئاشنابە.

**پوختەی مانا:**

ئەوینی تۆ و دیتنی دیداری تۆ، وەک ئاوی ژیانە، کە مردن لە ناو دەبا و تام و چێژەی لە باس‌کردن نایە. وا تازە تێدەگەم کە بۆچی گوێ لە هەر ئاواز و ئامرازێکی مووسیقی دەگرم تێکڕا هەر دنەم ئەدەن و ئامۆژگاریم دەکەن کە تۆ دەگەڵ ئەوین ئاشنا بەو دەست لە دڵداریی بەر مەدە،

٦ قەهوەیا تـەلخی دگـەل زەهـرێ هـەلاهیل بـدەری
مە ژ دەسـتێ تـە مبـارەک شـەکەرئامیزە خوشـاب

**مانای وشەکان:**

**قەهوە**: مەی؛ **قەهوە**: قاوە؛ **تەلخ**: تاڵ؛ **زەهر**: ژەهر؛ **هـەلاهیل**: گیایەکـە شـیرەکەی ژەهرێکی زۆر حەستەمە؛ **بدەری**: بدەیەی؛ **مە**: بۆ مە؛ **مبارەک**: پـیرۆز؛ **شـەکەرئامێز**: شەکراوی؛ **خوشاب**: خۆشاو.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر تۆ ژەهری هەلاهیل بکەیە ناو قاوە، یان شەرابی زۆر تاڵەوە و بڵێی بیخۆرەوە، چۆنکە دەستی پیرۆزی تۆی وێکەوتوە، بە لامەوە خۆشاوی شەکراوی شیرین و خۆشە.

٧ قولزومـێ عیشـقێ ژ بایـێ خـۆ موخـالیف دەمـەکێ
د هەماماتێ عەجاجێ مـە ل سـەر دەسـتی غـوراب

**مانای وشەکان:**

**قولزوم**: دەریـا؛ **عیشـق**: ئـەوین؛ **بـای موخـالیف**: بـای پێچەوانـە؛ **دەم**: تـاو؛ **هـەمام**: ڕاتلەکاندنی با؛ **عـەجاج**: گێژەڵـووکە و گـەردەلوول؛ **غـوراب**: جۆرێـک گەمیـەی بـە بادەوەی پێشوو بووە.

**پوختەی مانا:**

ئێمە سەردەمێک لە دەمان لە ناو دەریای پـڕ لـە تۆفانـدا وەبـەر گێـژ و گـەردەلوولێ کـەوتووین و بـە دەم بـای موخالیفـەوە ڕەتمـان دەبـرد و دەسـتەڵاتمان بـە سـەر گەمیەکەماندا نەدەما. گەمیەکەمان ئێمـەی بەسـەر دِەسـتی خۆیـەوە گرتبـوو. بـای پێچەوانە دەیرەتاند و سەرمان لێ شێوابوو.

٨ سەحەرێ خزری عینایەت کو بـرین چەشمـەیێ دل
ب جیهانێ مە نەزەر دا کو جیهـان عـەینێ سـەراب

**مانای وشەکان:**

**خزر**: سەوز؛ **خزر**: خدری زیندە. خدری زیندە یانێ کەسێکی نەمر. گۆیا یەکێک لە خۆشەویستانی خودا گەیشتۆتە سەرچاوەی ئەو ئاوەی کە هەرکەس بیخواتەوە هەرگیز نامرێ. واتا وەک سەوزەگیایەک وایە کە هەرگیز وشک و سیس نابێ و هەمیشە کەسکە؛ **عینایەت**: بەسەرکردنەوەَ و ئاگاداری؛ برین: بردینیە؛ **چەشمە**: سەرچاوە؛ **نەزەر**: روانین؛ **عەین**: بەتەواوەتی؛ **عەین**: کانی؛ **سەراب**: تراویلکە. لە بیاباندا پیاو لە دوورەوە شتێک دەبینێ بە ئاوی دەزانێ؛ بەلام ئاوێک لە ئارادا نییە و چاوی فریو دەخوا؛ بەوە دەڵێن سەراب و بە کوردی پێی دەڵێن تراویلکە.

**پوختەی مانا:**

ئەم تاکە شیعرە تەواوکەر و کلکەی شیعری پێشووە کە فەرمووی: لە دەریادا بەر گێژەڵووکە کەوتین و گەمیەکەمان با دەیڕەتاند و بە سەرگەردانی مابووینەوە؛ دەڵێ: شەوێکی زۆر حەستەممان دەرباز کرد تا لە بەرەبەیاندا ڕوحم و بەزەی خوا لێمان بوو بە خدری زیندە و لە تۆفان ڕزگاری کردین و دەستی کێشاین تا بردینیە سەرچاوەی دڵ؛ کە هەر چاوەی دڵیشە ئاوی ژیانی تێدایە و ئێمە پێی نازانین.
ئەوسا کە تماشای دنیامان کرد، بەو هەموو دەریا و وشکانییەوە کە هەیەتی، هەموومان تەواو بە سەراب و تراویلکە هاتە بەرچاو و زانیمان چاومان فریوی خواردووە.

٩ ب حوبابێ مەبە مەغروور وەهە سەرگەشتە «مەلا»
با ڤبەر کەفتییە وێ بێهودە سەرگەشتە حوباب

**مانای وشەکان:**

**حوباب**: بڵقی سەر ئاو؛ **مەغروور**: لەخۆبایی؛ **وەهە**: ئاوا؛ **سەرگەشتە**: سەرگەردان؛ **ڤبەر**: وەبەر؛ **کەفتی**: کەوتوو؛ **بێهودە**: لە هیچێ، بە خۆرایی.

**پوختەی مانا:**

ئەی مەلا! ژیانی ئەم جیهانە وەک بڵقی سەر ئاوە. بڵقی سەر ئاو بایەکی چۆتە ناو، کە وا

هەڵیمساندووە. ژیانی جیهانیش هەر وەک بڵقی سەر ئاو، بادی هەوایە و هەر وەک بڵق، بە با لێ دەرکەوتن، دەپووچێتەوە. ژیانیش، کە نەفەسێکی دا و نەهاتەوە، لە ناو ئـەچێ. جا ئاگات لە خۆت بێ، بڵقی سەر ئاو هەڵتنەخەڵەتێنێ و بە ژیانی دنیایی بایی نەبی!

١٠ وەیـە هودهـود ژ سـەبا بێـت و بـزانین چییـە حـال
کو ل حالێ مـە غـەریبان نـە سـوئال و نـە جـەواب

**مانای وشەکان:**

**وەیە**: ڕەنگ هەیە؛ **هودهـود**: پەپووسڵـێمانە؛ **سەبا**: شـوێنێک بـووە لـە یەمـەن کـە بەلکیس بەر لـەوە ببێتـە ژنی سلـێمان پێغەمبـەر، لـەوێ ژیـاوە. (باسـی سلـێمان و بەلکیس و دەلالییەکەی پەپوومان لەپێشـدا کـردووە)؛ **غـەریب**: ئـاوارەی نیشـتمان؛ **سوئال**: پرسیار؛ **جەواب**: وڵام.

**پوختەی مانا:**

ئێمە لە نیشتمانی ڕاستەقینە دوور خراوینەوە و لەم جیهانە ئامانەتییـەدا بـە ئـاوارەیی ماوینەوە. نە کەس لێمان دەپرسێ چـۆنی و نـە وڵامێکمـان بـۆ دەنێـرن کـە دڵـمان خۆش کا. هومێدمان هەیە و ڕەنگە پەپووی پێوقەدەم پیرۆز مژدەیەکمان لە سەباوە بۆ بهێنێ و دەخۆمان بگەین کە چۆنین و چۆن دەبین.

١١ هەردوو برهێن تەنـە میحـراب، چ ئیمـان و چ کـوفر
بوود و نابوود کو یەکن ئەڤ چ سـەواب و چ عیقـاب

**مانای وشەکان:**

**برە**: برۆ؛ **تەنە**: تۆن؛ **ئیمان**: باوەڕی؛ **کوفر**: بێئەمەگیَ؛ **بوود و نابوود**: بوون و نەبوون؛ **سەواب**: پاداش؛ **عیقاب**: تۆڵە و سزا.

**پوختەی مانا:**

ڕێبوارانی ڕێگەی خواناسین بە قۆناغێکدا تێپەڕ دەبن کە قۆناغی لە خوادا ون بوونی پێ

دەڵێن. لەم پلەیەدا بەرد و دار و گیاندار و بێگیان بە لایانەوە هەمووی هەر خوا دەپەرستێ. ئەوانەی کە بە ڕواڵەت کافرن و سەجدە دەبەنە بەر بت، لە لای ئەوان سەجدەکەیان بۆ خودایە. چۆنکە باوەڕی و ناباوەڕیش هەر لە لایەن خوداوە بە بەندە دراوە و هەر فەرمانی خۆیەتی بەجێ هێندراوە. لایان وایە پاداشی چاکە و سزای خراپەش، هەر شتێکی زاهیری و ڕواڵەتییە و کەسێکی فەرمانی ئەوی پێکهێنابێ ــ فەرمانەکە هەرچییەک بێت ــ ناشێ دەرد و ئازاری لەسەر ببینێ و هەر وەک لەمەو بەریش باسمان کرد، سۆفیانی پایەبەرز دەڵێن: یار هەمووی هەر ڕەحمەت و خۆشییە و ڕەحمەت لە هەرکوێ هەبێ ئازاری لێ نییە و خوداش لە هەموو جێگەیەک هەیە. کە وا بوو عەزاب نابێ هەبێ. زۆر جار لە گفتەی سۆفیاندا تووش دەبین کە دەڵێن: ئەوەی شێخ لە خانەقادا بۆی دەگەڕا ئێمە لە گۆشەی مەیخانە تووشی بووین و...
هەر ئەو دوو برۆیەی ڕاست و چەپی تۆیە کە بوونەتە سوژدەگای باوەڕدار و بێباوەڕانی ڕواڵەتی. ئیتر کوفر و ئیمان دەبڕێتەوە و تێکەڵ دەبن. بوون و نەبوون ئەگەر هەیە و ئەگەر نییە، هەر لە خۆتەوەیە. پاداشی باش دانەوە و سزا دان چۆن جوێ دەکرێنەوە؟!

**١٢** وەرە نیشانی «نیشانی» دە خوە بێپەردە سەحەر
لێ ژ خوونێ بکە پەرهیز کو شەهیدان چ حیساب

**مانای وشەکان:**

**نیشانی**: نیشانەی تیران؛ **نیشانی**: نازناوی مەلا لە شیعردا؛ **بێپەردە**: ئاشکرا؛ **لێ**: بەلام؛ **خوون**: خوێن؛ **پەرهیز**: پارێز؛ **شەهید**: کوشتەی ڕێگەی هەقانییەت؛ **حیساب**: ژمارە، **حیساب**: لێ پرسینەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەی یار! وەرە دە بەرەبەیاناندا خۆت نیشانی ئەم نیشانەی تیرانەی خۆت بدە! بەلام هەر من نیم کە شەهیدی تیری ئەوینی تۆم؛ کوژراوانی ئەو ڕێگەیە لە ژمارە بەدەرن و هەمووش لە ڕێی هەقدا کوژراون و خوێنیان لە بەر دەڕوا. ئەگەر هاتییە سەردانمان، تۆزێک بە پارێزەوە وەرە، نەوەک خوێنی ئێمە پەلاویت بکا و دەشزانی کە شەهید لێپرسینەوەیان بۆ نییە.



# پیاڵەی لێواولێو

١ «للّه الحَمـد» ژ یـاریّ مـە د دەسـت جامـە لەبالـەب
ژ لـەبیّ نووشـی پەیاپـەی د دل ئیلهامـە لەبالـەب

**مانای وشەکان:**

**للّه الحَمد**: شوکور بۆ خوا؛ **ژ یاریّ**: لە یارەوە؛ **مە**: ئێمە؛ **جام**: پیاڵە؛ **لەبالەب**: لیپاولیپ، لێواولێو؛ **لەب**: لێو؛ **نووش**: ڕەواقی هەنگوین؛ **پەیاپەی**: لەسەر یەک و بێ پسانەوە؛ **ئیلهام**: لە غەیبەوە خەبەر بە دڵ گەیشتن.

**پوختەی مانا:**

سوپاس بۆ خوا کە یار ئێمەی خوێندۆتەوە و بە لێوە شیرینەکانی_ کە هاوتای ڕەواقی هەنگوینن_ ئێمەی لاواندۆتەوە و لەوساوە جام و پیاڵەی لیپاولیپمان لە ئەوین هاتۆتە دەست و دڵمان پڕ بووە لە موژدە و خەبەری غەیبی.

٢ د ڕییـا وان خـەتوخالان کـو نـە حـەرفێن قەلەمینـە
مـە ژ فـەیزا تەیـە مەسـتانە ڕەوان چامـە لەبالـەب

**مانای وشەکان:**

**ری**: ڕێگە؛ **وان**: ئەوانە؛ **خەتوخال**: خاڵومیل؛ **حەرف**: پیت؛ **قەلەم**: بنووس؛ **فەیز**: بەرەکەت، سەرڕێژ؛ **ڕەوان**: بێ گریّ و قۆرت؛ **چامە**: شیعر و هەڵبەست.

**پوختەی مانا:**

ئەو خاڵ و خەتەی لەو ڕوخساری تۆ دێتە بەر چاو؛ کاری قەڵەمی نووسەر و نەقاشان نییە. خوای گەورە بە دانستە ڕژتوونی. من کە دڵم داوەتە ئەوینی ئەوانە، بە پلە و

پایەیەک گەیشتووم کە لە بەرەکەتی ئەوانەوە کە ڕێژەوی کردووە سەرخۆشم، شیعرەکانم ئاوا ڕەوان و بێ‌گرێ و قۆرتن و بەسەر لێوانەوە دەگەڕێن.

٣ مەستێ شەهکاسێ مەیا جازبەیین ڕووح د زات (ددات)[١]
ڕووح دزانت کو ژ بەر لەززەتێ عیشق مامە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**شەهکاسە**: شاکاشی؛ **جازبە**: کێشەری؛ **ڕۆح**: گیان؛ **زات**: خۆیی؛ **کو**: کەوا؛ **لەززەت**: خۆشی؛ **مامە**: ماوم.

**پوختەی مانا:**

لەو بادەیە ـکە ڕۆح و گیان بەرەو خۆی دەکێشێـ من بە شاکاشی فرم کردووە. نەک تەنها لەش و ئەندامم تەزیوە و بڵێم وەک خەڵکی ڕەمەکی سەرخۆشم، بگرە گیانیشم بەو لەزەتەی زانیوە و دەزانێ کە من لەو خۆشی دووبارەیەی ئەویناویدا بە لیپاولیپی ماومەوە.

٤ نیرگزا مەست ژ بالا چەمەنا سونبول و گول تێ
قەدەحێ تازە ب دەستێ خوە تەنێ دامە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**بالا**: بەژن؛ **بالا**: سەروو، ژووروو؛ **چەمەن**: چیمەن؛ **سونبول**: سمڵ؛ **تێ**: دێ؛ **تێ**: تێدا؛ **تازە**: هەرەباش؛ **تەنی**: تەنیا؛ **دامە**: دای بە ئێمە.

**پوختەی مانا:**

بەژن و باڵای یارم وەکوو مێرگ و مێرخوزارێکە کە هەموو جۆرە گوڵێکی جوان و بۆنخۆشی تێدایە و لەوانەدا گوڵی ڕوومەتی و سونبولی کەزیەکانی و لە سەرووی هەمووانیشەوە نێرگسی چاوە مەستەکانی بەجوانی خۆ دەنوێنن. دیتنی چاوەکانی بۆ

١. سەلمان دلۆڤان و زڤنگی: «ڕووحی ددین»

من وەک ئەوە وابوو کە پیاڵەیەک شەرابی هەرە باشی دابێتە دەستم و پڕ بە پڕ مەست و سەرخۆشی کردووم.

٥ وەحدەتێ سیرفە مە مەشرەب تە چ ئیکسیرێ وجوود
ئەم لەبالەب چ لەبالەب ب خوە هەم جامە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**وەحدەت**: یەکالایی؛ **سیرف**: تەواو بێخەوش؛ **مەشرەب**: ئاوخۆرە؛ **مەشرەب**: مەبەست و مەرام؛ **تە**: تۆ؛ **ئیکسیر**: ئەو دەرمانەی کە مس دەکا بە زێڕ؛ **وجوود**: بوون؛ **جام**: پیاڵە؛ **جامە**: لیباس، کراس.

**پوختەی مانا:**

ئێمە بە هەموو باراندا لەگەڵ یارا تێکەڵین و بووینە یەکێک و لە سەرچاوەی خالیس و بێگەرد و ڕوون تێراو دەبین. تازە کارمان لەوە دەرچووە کە مامۆستا و پیری دەستگیر ئیکسیری خۆیانمان لێ خەرجکەن و مسی وجوودمان بکەنە زێڕ. ئێمە زێڕی خالیسین؛ ئێمە وەها پڕ بووین لە ئەوینی یەکیەتی لەگەڵ خوادا، سەرباری خۆمان، بگرە کراسەکەشمان لە ئەوین سەرڕێژ دەکاو لیپاولیپە.

٦ شەمع و پەروانە ب زاتێ خوە ژ حالێ مە د دوورن
ئاتەشەک سیرفە ژ عیشقا تە ڤەوەستامە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**شەمع**: مۆم؛ **پەروانە**: پەپوولە، **ب‌زاتێ خو**: لە خودی خۆدا؛ **د دوورن**: پەرتن؛ **ئاتەش**: ئاگر؛ **سیرف**: تەواو بێخەوش؛ **ڤەوەستان**: گیران؛ **ڤەوەستان**: هەستانەوە؛ **ڤەوەستان**: داوەستان.

**پوختەی مانا:**

چیرۆک و بەسەرهاتی مە لە ئەویندا، بە هیچ جۆر نابێ دەگەڵ ئەویندارییی پەروانە و مۆم باسی بکرێ و بڵێین وێک دەچن. گڕی شەم جوانە؛ بەڵام هەر دەمێکە. یان بە فوویەک دەکوژێتەوە یان بە توانەوەی مۆم، دەبڕێتەوە. پەپوولە دڵدارێکی گیانبازە؛ بەڵام بە باڵسووتانێک لە ئەوین دەتەکێتەوە. گڕی ڕوخساری یاری من، لە گڕی شەم تیشکهاوێژترە و هەرگیز بە هیچ با و توانەوەیەک لە ناو ناچێ. من جێگەیەکم نییە بڵێم بە گڕی ئەوین دەسووتێ؛ چۆنکە هەر خۆم ئاگری ڕووتم و لەو ئاگرە نەمرانەم کە هەرگیز کوژانەوەی بۆ نییە و لە عیشق پڕ و داوەستاو و ڕاوەستاوم.

**٧** قەدەحەک تازە ژ عیشقێ د ئەزەل دامە حەکیمی
ژێ د نووشین هەی و هەی هێ ب خوە جاما مە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**قەدەح**: پیاڵە؛ **تازە**: زۆر باش و عالی؛ **ئەزەل**: هەرە پێشوو؛ **دامە**: دای بە ئێمە؛ **حەکیم**: زۆر زانا؛ **حەکیم**: دەسەڵاتدار؛ **حەکیم**: بژیشک و لوقمان؛ **ژێ**: لێ؛ **دنووشین**: دەخۆینەوە؛ **هەی** و **هەی**: دایم و دەرهەم؛ **ب خوە**: بۆ خۆ؛ **جام**: پیاڵە.

**پوختەی مانا:**

زانای هەرەگەورە و چارەسازی بێوێنە، هەر لە ڕۆژی بناواندا لە شەرابی هەرەباشی ئەوینی خۆی پیاڵەیەکی پێ داوم کە دایم و دەرهەم لێی دەخۆمەوە و پێی سەرخۆش دەبم و پیاڵە هەروەکە خۆیەتی؛ پڕاوپڕە و هیچی لێ کەم نەبۆتەوە و نابێتەوە.

**٨** جارەکی گوهتی نیشانینە «مەلا»یێ وەرە پاقێ
(یان: «نیشانی» نە مەلایی وەرە پاقێ)
ئەو دخواست مە ژدل و جان و دەهەن و کامە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**جارەکی**: جارێک؛ **گوهتی**: گوتی؛ **نیشانینە**: نیشانەکانی؛ **نیشانی**: نازناوی مەلا لە شیعردا؛ **مەلایی**: مەلایەتی؛ **پاڤێ**: بهاوێژە، فڕیبدە؛ **جان**: گیان؛ **دەهەن**: دەم؛ **کام**: مراد؛ **کام**: ناو دەم.

**پوختەی مانا:**

ئۆخەی، جارێک لە جاراندا بە مراد گەیشتم. یار دواندمی و فەرمووی: وەرە بە قسەم بکە و ناو و لەقەبی نیشانی و مەلایەتی لە کۆڵ خۆت بکەوە! چونکە ناو و لەقەم، نیشانەی ئەوەیە کە تۆ شتێک هەی و خۆتیان پێوە ڕادەنێی. لە بارەگای ئێمەشدا هەرکەس خۆی بە شت بزانێ و ناو و نیشان بۆ خۆی دانێ، ڕێگەی نادرێ و بە هیچ حیساب ناکرێ. تۆ ئەگەر دەتەوێ ئێمەت هەبێ، ئەبێ خۆت لە بیر بچێتەوە و ناو و نیشانی بوونت کوێر بێتەوە. بەڵێ ئەوە ئەوپەڕی ئاواتم بوو کە پێک هاتووە و بە دڵ هەر ئەمەم ویستووە. لەوەتا ئەم فەرمانە شیرینەم بیستووە، گیان و دڵ و دەمم پڕە لە شیرنایەتی بە مراد گەیشتن.

٩ 
تە دزانم، تە دبینم کو توئی نووریٚ وجوود
«الله الله» ژ چ نووره د سەرایا مە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**تە**: تۆ؛ **دزانم**: دەزانم؛ **دزانم**: دەناسم؛ **کو**: کە؛ **نوور**: ڕووناکی، تیشک؛ **وجوود**: بوون؛ **الله الله**: پەک ماشەڵڵا؛ **سەرا**: ماڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەوا مەلایەتیم فڕێ داوە؛ هەموو نیشانەی بوونم هاویشتۆتە ناو چاڵی نەبوونەوە. ئێستا جگە لە تۆ کەس ناناسم؛ جگە لە تۆ هیچ نابینم. تێگەیشتووم کە بوون تیشکێکی ڕووناکی تۆیە. سەد ماشەڵڵا لەو ڕووناکییەت کە لە خانووی جێ ژیانی ئافەریدەکانتدا و لە عەرز و ئاسمان تیشکی داوەتەوە.

١٠ ژ عینایەت نەزەرێ خاسە کو هەر میسرەع و بەیتەک
قەدەحێن ئابێ حەیاتینە د شیعرا مە لەبالەب

**مانای وشەکان:**

**عینایەت**: چاو لێ بوون؛ **نەزەر**: لێ ڕوانین؛ **خاس**: تایبەتی؛ **میسرەع**: نیوە شیعر؛ **بەیت**: شیعرێکی دوو میسرەعی؛ **قەدەح**: پیاڵە؛ **ئابی حەیات**: ئاوی ژیان.

**پوختەی مانا:**

دیارە یار بە چاوی مەرحەمەت و بەزەیی لە منی ڕوانیوە و ئیلتیفاتێکی تایبەتی دەربارەی من هەیە؛ ئەگینا ئەوە خۆڕایی نییە کە هەر تاک و لەتێک لە شیعری من، بارتەقای پیاڵێکی پڕاوپڕ لە ئاوی حەیاتێ دێتەوە.



# ڕەنج و گەنج

١ شـاه ب قەسـدا کوشـتنا مـن ڕم هەژانـدن بێسـەبەب
دا مە چەشمێ قەهر و خەشمێ ڕم ل دلدا کـو ئـەدەب

**مانای وشەکان:**

**شاه**: خونکار؛ **قەسد**: نیاز؛ **کوشتن**: مراندن؛ **ڕم**: ڕمب؛ **هەژاندن**: ڕاژاندن، ڕاتلەکاندن؛ **سەبەب**: هۆ؛ **دا مە**: دای بە ئێمە؛ **چەشم**: چاو؛ **قەهر**: تووڕەیی؛ **خەشم**: ڕق؛ **کو**: کە.

**پوختەی مانا:**

یارم کە خونکاری هەموو جوان و نازدارانە، مژۆڵەکانی بە تووڕەییەوە ترووکاندن؛ کە بۆ من وەک ئەوە وابوو بە ڕمبان لە من ڕاسابێ. بە چاوی تووڕەیی و غەزەبـەوە تماشـای کردم و دیارە مەبەستی ئەوە بوو کە لە خزمەتیا بە ئەدەبتر بم. هەرچەندە من خـۆم لام وایە هیچ بێخزمەتییەکم نەکردووە و هۆی تووڕەیی ئەوم پێـک نـەهێناوە؛ بـەڵام هەروەک جوانی و دڵنەرمی ڕەوشی یارە، هەروەهاش قەهر و تـووڕەییش یـەکێک لـە سیفاتی ئەوە. کەوابوو نابێ ئێمە سەبەب بپرسین.

٢ کوشـتیێن دیـدار و دینـێ بێخـەتا هـەر دەه سـەدن
هەر سەحەر دیسا ژ نۆ وێن تێنە کێـرێ سـەد جەلـەب

**مانای وشەکان:**

**کوشتی**: کوژراو؛ **دیدار**: چاو پێ کەوتن؛ **دین**: تماشا، دیتن؛ **بێ خەتا**: بێ سوچ؛ **دەهسەد**: هەزار؛ **ژ نو**: سەر لە نوێ، لە سەرڕا؛ **تێنە**: دێنە؛ **کێر**: چەقۆ؛ **جەلەب**: گەلە، کەرک.

**پوختەی مانا:**

وەنەبێ هەر من بە تەنیا بێ سووچ و هەڵە لە ڕێگەی دیداری یاردا، بەر تووڕەیی کەوتبم و کوژرابم؛ هەزارانی وەک من کە ئارەزووی دیتنی یاریان کردووە، لە ڕێگەی خۆشەویستیدا -کە بەلای ئەوانەوە هیچ گوناهێکی تێدا نەبووە- کوژراون. لەسەر ئەو حاڵەشڕا، ئەو کوشتنە هێندە خۆش و مایەی بەختەوەرییە کە هەموو سبەینان، سەر لە نوێ سەد_ سەد گەلە دڵدار بە داوخوازی خۆیان دێنە بەر کێرد و دەیانەوێ لەو ڕێگەدا بمرن.

٣ دێ ژ چەرخێ پەنجەمین بیتن تەنەززول کەت مریخ
میسلێ شەمسێ گەر کشینیتن ل وان تیغێن غەزەب

**مانای وشەکان:**

**دێ**: بێ‌گومان، هەر ئەبێ؛ **چەرخ**: ئاسمان؛ **تەنەززول**: هاتنە خوار، داگەڕان؛ **مریخ**: ئەستێرەیەکە بە قسەی ئەستێرەناسانی پێشوو لە ئاسمانی پێنجەمەوە، کێردێکی خوێناوی لە دەستایە و شەڕ و شۆڕی دنیا ئەو دەینێتەوە؛ **میسل**: وەکوو؛ **شەمس**: خۆر؛ **کشینیتن**: هەڵبکێشێ؛ **تیغ**: تیخ؛ **غەزەب**: تووڕەیی.

**پوختەی مانا:**

هەر ئێمەی دڵداری سەرزەوی نین کە منەی کوشتن، بە تیخی تووڕەیی و قەهری یار دەکەین؛ بەڵکوو ئەگەر یاری خونکارم تیخی غەزەبی خۆی بەرەو مریخ و خۆر ڕاتڵەکێنێ، مریخ لە ئاسمانی پێنجەم و خۆر لە ئاسمانی چوارەمەوە بەرەو زەمین دێنە خوار و منەتبارن کە وە بەر تیخی یار بکەون و ئەو بەختیارییەیان بە نەسیب ببێ.

٤ هەر مەجالا ئەو د جەنگێ بێت و ڕەت هەر جارەکێ
ڕاست و چەپ دێ بێختن سەد_ سەد ب مزراق و قەسەب

٥ ڕوستەم و جەمشید و خالید، حەمزە یان شێرێ عەلی
ئافەرین یا شەهسەوارێ تورک و ڕمبازێ عەرەب

**مانای وشەکان:**

**مەجال**: کات؛ **مەجال**: شوێنی هاتوچۆ کردن؛ **جەنگ**: شەڕ؛ **ڕەت**: بڕوات؛ **دێ بیختن**: مەعلووم دەکەوێنێ؛ **مزراق**: نێزە؛ **قەسەب**: درێژووکەی ناو کلۆر وەک قامیش و حەیزەران و...؛ **قەسەب**: ڕمبی درێژ کە لە دار حەیزەران بووە. **ڕوستەم**: پاڵەوانی خەیالاتیی ئێران؛ **جەمشید**: پادشایەکی کۆنی ئێرانە، کورد «جەمشێر»یشی پێی دەڵێن؛ **خالید**: خالندی کوڕی وەلید، هەواڵێکی پێغەمبەر بووە؛ **حەمزە**: ئیمام هەمزە، مامی پێغەمبەر؛ **عەلی**: ئیمامی عەلی، کە بە شێری خوا بەناوبانگە؛ **ئافەرین**: ئافەریم، لەمنەتکەوێ؛ **یا**: هۆی؛ **شەهسەوار**: سەرتۆپی سواران؛ **ڕمباز**: ڕمب وەشێن.

**مانای شیعری چوار و پێنج:**

لە هەر مەیدانێکدا خونکاری نازداری من تاقە جارێک بێت و بچێت و شەڕ بکا، بە زەبری نێزەی مژۆلان و بالای بەرز و شووش و باریک و نەرمونیانی ـ کەوەک ڕمبی حەیزەرانە ـ سەتان و هەزارانی وەک ڕوستەم و جەمشێد و خالند و هەمزە و عەلی، خۆی لەبەر ناگرن و بە ڕاستە و چۆپەدا دایاندەپاچێ و لە مەیداندا تخێل دەبن. ئەی هەزار ئافەرین بۆ تۆ شاسواری تورکان و سەرتۆپی ڕمبوەشێنانی عەرەب!

٦ لێ ل تۆلێ ئاستانێ چخ ب وان لەعلان کرن
دەرگەهێ فەتحێ ڤەبوو ئیرۆ ل مەهجووران عەجەب

**مانای وشەکان:**

**لێ**: بەڵام؛ **تول**: سەگی چکۆلە؛ **ئاستان**: ئاسانە؛ **چخ**: بە ترکییانی دەرکەوە. کورد ئەم وشەیە بۆ دەرکردنی سەگ بە کار دەبەن؛ **لەعل**: لاڵ، بەردێکی بە قیمەتە. شاعیران لێوی یاریان پێ شبهاندووە؛ **فەتح**: کرانەوە؛ **فەتح**: بە ئاوات گەیشتن؛ **ڤەبوو**: کرایەوە؛ **مەهجوور**: بەجێ هێڵدراو؛ **مەهجوور**: تەرک کراو و دوور خراو؛ **عەجەب**: سەیر و سەمەرە.

**پوختەی مانا:**

شتی زۆر سەیر و سەمەرە ئەوەیە کە خونکاری من بەو هەموو سام و هەیبەتەوە کە

وەک گوتمان ئەگەر بە قەهرەوە دەمریخ و ڕۆژ ڕاخورێ، سەر بەرەو ژێر دێنە بەر دەستی و هەزاران پاڵەوانی بەناوبانگ لە ڕووی ئەودا خۆ ناگرن و هەر لەجێ لە مەیدان تخێڵ و سلار دەبنەوە، هەر بەو تووڕەییەوە بەو لێوە وەک لەعلانەی خۆی، چغەی لە توڵەی ئاسانەی خۆی ــ کە منم ــ کرد. بۆ من بە خێر گەڕا؛ دەرگای مرادانم بەڕوودا کرایەوە و لە پاش هەڵپەسێران و خۆ تێ نەگەیاندن، بە دیداری شاد بوومەوە و بەو تێڕاخورینە، لاواندمییەوە.

**٧** بەندەیێ سادق سەحەر ئامانجێ ڕەشتووزێن خوە کر
من ب قەولێ دژمنان دەت بەر خەدەنگان بێ سەبەب

**مانای وشەکان:**

**بەندە**: کۆیلە؛ **سادق**: کار و قسە ڕاست؛ **ئامانج**: نیشانە؛ **ڕەشتووز**: دەبان، دەبانی دەم ڕەش؛ **دەت**: دەداتە؛ **خەدەنگ**: تیر.

**پوختەی مانا:**

لە بەرەبەیاندا بوو کە یار منی بە تماشایەک لاواندەوە و کۆیلەی بێخەوشی خۆی بەسەر کردەوە. منی کردە نیشانەی تیخی دەبانی تازە ساوی برۆ ڕەشەکانی و مژۆڵە جەرگبڕەکانی. دوژمنان وایان زانی یار بڕیاری داوە بێ هیچ سەبەب و هۆیەک من بداتە بەر تیران و لە دیداری خۆی ناهومێدم بکا؛ بەڵام ئەو دوژمنانە زۆر بە هەڵەدا چوون.

**٨** لەشکرێ قەهر و غەمان وێ چوون حەسارا دل بکن
کەعبە و بەیتولحەرامە لێ ب نوور بێتن ڕەجەب[1]
(یان: دێ نەبوورت لێ ڕەجەب)

**مانای وشەکان:**

**لەشکر**: سوپا؛ **قەهر**: خەفەت؛ **غەم**: پەژارە؛ **چون**: چلۆن؛ **حەسار**: ئابلۆقە؛ **کەعبە**:

١ . عوسمان تونچ: «کەعبە و بەیتولحەرامێ ڕانەبوورت بێ ڕەجەب»

ماڵی خوا؛ **بەیتولحەرام**: مەککە؛ **لێ**: لەوێ؛ **بنوور بێتن**: ڕووناک بێت؛ **دێ نەبوورت**: هیچ‌گا ڕانابڕێ؛ **ڕەجەب**: مانگێکە لە مانگانی ساڵی عەرەبی و یەکێکە لەو چوار مانگەی کە حەرامیان وە پاشڵ خراوە و عەرەب لەو چوار مانگەدا یەکتریان نەدەکوشت و نەدەچوونە تاڵان و بڕۆی یەکتری. سێ مانگەکەی تریش، مانگی ناو جێژنان و قوربان و محەڕەم بوون.

**پوختەی مانا:**

دوای ئەوە کەیار بە لێوی موبارەکی خۆی چغەی پێ گوتووم و دوای ئەوەکە چاوم بە چاو و برۆیانی ڕوون بۆتەوە، تازە چۆن لەشکری خەم‌ومەینەت دەتوانن دەوری دڵم بدەن و تووشی ناهومێدیم بکەنەوە. دڵی من بۆتە مەککە و ماڵی کابە و هیچ هێزێک ناتوانێ ئازاری پێ بگەیەنێ و هەتا- هەتا من و دڵم لە ڕەجەبە مانگدایین و هەرگیز مانگی ڕەجەبی ئێمە دوایی نایەت و هەمیشە ڕووناک و مایەی ڕووناکی دڵە.

٩ سوفتی‌یێن پڕ لەعل و مەرجانان ب موژگانان حەتا
دیدە ڕەوشەن بوون ب دینا دیم دوورێ سیمین غەبەب

**مانای وشەکان:**

**سفتی**: سماو؛ **پڕ**: زۆر؛ **لەعل و مەرجان**: دوو جۆرە گەوهەری ڕەنگ سوور و ئاڵن؛ **موژگان**: مژۆڵ؛ **دیدە**: چاو؛ **ڕەوشەن**: ڕووناک؛ **دین**: دیتن؛ **دیم**: ڕوخسار؛ **دوڕ**: مرواری درشت؛ **سیمین**: زیوین؛ **غەبەب**: بەرچێڵە.

**پوختەی مانا:**

من کە دەڵێم چاوم بە دیداری یار ڕووناک بۆتەوە و شانازی بڕینی تیری مژۆڵانم بە نەسیب بووە و خۆشەویستی و ئیلتفاتی یار لە ناو دڵمدا جێگیرە و دڵم لەو ساوە بۆتە ماڵی خودا، تازە خەم حەددی نییە بێتە ناوی. نابێ وا بزانن کە ئەم هەموو خۆشییەم بە مفت و مەرحەبا دەس کەوتووە؛ نەخێر، لەو ڕێگەدا زۆرم دەرد کێشاوە؛ زۆر فرمێسکی ئاڵ و خوێن‌ڕەنگم ـکە بە لەعل و مەرجان دەشبهێندران ـ بە سەر نووکی مژۆلاندا هێناوە و

داماباراندووە و وەک ئەوە وا بووە کە لەعل و مەرجان، بە مژۆلان بسمم. پاش ئەو هەموو گریان و زەجرکێشان و لالانەوە، یار بەزەی پێما هاتۆتەوە و ڕێگەی داوم بڕوانمە ئەو ڕوخسارەی کە وەک دوڕ وایە و بە تماشای ئەو بەرچەنە زێوینە، بەختەوەر ببم.

١٠ ئەی ڤە خزرێرا دڤێت ئاڤا حەیاتێ بت نەسیب
دێ ب سەعی و جەهد یەکسان بن ل بال وی ڕووز و شەب

**مانای وشەکان:**

**ئەی**: ئەوی، ئەو کەسی؛ **ڤە خزرێرا**: دەگەڵ خدری؛ **دڤێت**: دەوێ؛ **بت**: ببێت؛ **نەسیب**: بەش؛ **دێ**: گەرەکە؛ **سەعی**: کۆشش؛ **جەهد**: تەقالا؛ **یەکسان**: بەرانبەر؛ **ل بال**: لە کن؛ **ڕووز**: ڕۆژ؛ **شەب**: شەو.

**پوختەی مانا:**

کەسێک بە تەما بێ ڕەگەڵ خدری زیندوو کەوێ و بگاتە سەرچاوەی ئاوی حەیاتێ و مەرگ لە خۆی دوور بخاتەوە، گەرەکە لە ڕێگە ڕۆیشتندا ماندوو بوونی لە بەرچاو نەبێ و شەو و ڕۆژی بە خەیاڵدا نەیە و هەرگیز هیچ سات و کاتێک لە کۆشش و ماندوو بوون وچان نەدات.

١١ خدمەتا پیرێ موغان دێ کەت کەسێ مەقسوودە مەی
شیشە و جاما زوجاجێ ئەی دڤێت دێ ڕەت حەلەب

**مانای وشەکان:**

**پیری موغان**: خاوەن مەیخانە؛ **کەت**: بکات؛ **مەقسوود**: نیاز، مراز؛ **مەی**: شەراب؛ **شیشە**: مینا، بلوور؛ **جام**: پیاڵە؛ **زوجاج**: شووشە؛ **ڕەت**: بڕوات؛ **حەلەب**: شارێکە لە سووریا کە قەدیم بە شووشەی چاک بەناوبانگ بووە.

**پوختەی مانا:**

کەسێکی تامەزرۆی فڕکردنی شەرابە، لەسەریەتی خزمەتی مامە پیرەی خاوەن

مەیخانە بکات. کەسێکی بەتەمایە پیاڵە و جامی شووشەی بلوورینی هەبێ، دەبێ ڕێگەی حەلەب بگرێتە بەر.

١٢ جەورێ هێندێ دێ کشێنت هەر کەسێ تاووس دڤێت
گەوهەر و دوررا یەتیم بێ تەرکێ سەر تێتن تەلەب[1]

**مانای وشەکان:**

**جەور**: ئازار؛ **هیند**: هیندووستان؛ **دێ**: گەرەکە؛ **کشێنت**: بکێشێ؛ **دوررا یەتیم**: مرواری تاقانەی ناو سەدەف؛ **تەلەب**: داوا، خواستن.

**پوختەی مانا:**

ئەو کەسەی بەنیازە تاوسی هەبێ، دەبێ ڕێگەی چوونە هیندووستانی وەبەر چاو نەیە و گەرەکە خۆی لەو ڕێگەیەدا ماندوو کا. کەسێکی کە ئارەزوویەتی گەوهەر و مرواری تاقانەی وەدەست کەوێ، دەبێ خۆی بخاتە ناو دەریا و ترسی خنکان فڕێ دا. ئەگینا بە بێ تەرکی سەر کردن، هەرگیز بە مراد ناگات.

١٣ غەفلەتێ ئەو کەششفی شیر دەست ب دەست هاتن جەگەر
گو: غەبینەت یا «مەلا» میسکین مە لێ کەرکر کەزەب

**مانای وشەکان:**

**غەفلەتی**: لە ناکاو، کتوپڕ؛ **کەششفی**: خۆی دیاری دا؛ **دەست ب دەست**: لەسەر یەک و بێ وچان؛ **جگەر**: جەرگ؛ **گو**: گوتی؛ **غەبینەت**: حەیف، ئەی بێچارە؛ **یا**: ئەی؛ **کەر**: لەت و کوت؛ **مسکین**: هەژار؛ **کەزەب**: جەرگ.

**پوختەی مانا:**

بەڵێ وەک گوتمان، دڵدار لەسەریەتی لە ڕێگەی یاردا زۆر خۆی ماندوو بکا و تەرکی

---

[1]. شێخ مونەووەر: «نینن تەلەب». عوسمان تونچ: «نابی تەلەب»

گیان و سەربکا. بەلام نابێ لای وا بێ کە یاریش لە سەریەتی لە بەرانبەر ئەو ماندوو بوون و جزیاکێشانەیدا تۆڵەی بۆ بکاتەوە. دیداری یار لە نرخاندن و کڕیار بەدەرە و بەدوورە. عاشق دەبێ وەزیفەی خۆی ـکە جزیاکێشان و ژان و ئێشانەـ پێک بهێنێ و ئەوسا چاوی لە بەزەیی و ڕوحمی یار بێ. نەک لای وا بێ دەبێ حەق و کرێی ماندوو بوون وەرگرێ. من کە دەڵێم زۆر گریلوم و زۆر برژاوم، چاوم لەوە نەبوو کە یار بۆم بە حیساب بێنێ؛ بەلام خۆی بەزەی پێمدا هاتەوە و لەپڕ و نەکاوێک خۆی نیشان دام و شیری برۆ و تیری برژانگ لە جەرگم هاتنە دەست و بێ وچان دایانپاچی و هێزیان لێ بریم. یار کە منی وا بە کەساسی و کەنەفتی دیت، ئاوری بەخێری لێ دامەوە و فەرمووی: ئەی بێچارە مەلای هەژار و کڵۆل! بە زەبری تیر و شیری ئێمە، لەت و کوت کرا.



# منی قەرەبەخت

آ  من د دل کۆڤان هەزارن داغ و کەیبەر بێ حێساب
میحنەتا وەردێن ب خارن وێن د دلدا سەد نیشاب (نەشاب)

**مانای وشەکان:**

**کۆڤان**: دەرد و حەسرەت؛ **کۆڤان**: کوان و برین؛ **کەیبەر**: برینی جۆرە تیرێکی دەم وەک چەقۆ؛ **میحنەت**: پەژارە؛ **وەرد**: گوڵ؛ **خار**: چقڵ، دڕوو؛ **نیشاب**: تیر؛ **نەشاب**: چنگ لێ گیرکەر.

**پوختەی مانا:**

کەسێکی ئارەزوو بکا کە لە گوڵان نزیک بێتەوە و لە دیمەن و بۆن و بەرامەیان کەیف بکا، گەرەکەتێ هەڵچەقان و ژانی دڕکانیش قبوول بکات. ئەو گوڵەی من ویستوومە بۆی بچم و لێی نزیک ببمەوە هەروەک بۆ خۆی سەرتۆپی گوڵانە، چقڵ و دڕکی دەوریشی لە چاو دڕکان، تیری دەمپان و گوێزانن. جا شتێکی ئاشکرایە کە من لە ڕێگەی گەیشتن بەم گوڵە تاقانەیە هەزاران برین و ژان و داغ و سەرەتیرم دەدڵدا ماوەتەوە.

۲  سەد نیشابن من د دل ئیرۆ ژ خارێن سۆر گولان
یەک ب یەک پەیکان چەڤی بوون چوونە جەرگێدا کولاب

**مانای وشەکان:**

**نوشاب**: تیر؛ **خارێن**: چقڵان؛ **سۆر**: سوور؛ **پەیکان**: سەرەتیر؛ **چەڤی**: چەمیو؛ **کولاب**: قولاپ.

**پوختەی مانا:**

بەڵێ من کە ویستوومە لە سوورەگوڵان نزیک ببمەوە، ئەمڕۆ دەبینم کە سەد تیر لە دڵم هەڵچەقیوە و سەری هەموو تیرەکانیش پەرچیان خواردۆتەوە. بە قولاپە چنگیان لە ناو جەرگ و هەناوم گیر کردووە.

٣ پور ب وان جەرحان خۆ تیرن لۆ کو دی دەرمان دکەن
شەربەت و ئاڤا حەیاتێ شەککەر و قەند و گولاب

**مانای وشەکان:**

**پوڕ**: پڕ؛ **جەرح**: برین؛ **لۆ**: کابرا؛ **لۆ**: هەی ماڵ ئاوا؛ **کو**: چون؛ **شەربەت**: دەرمانی تراو؛ **ئاڤا حەیاتێ**: ئاوی ژیان؛ **شەککەر**: شەکر؛ **گولاب**: گوڵاو.

**پوختەی مانا:**

ئەو بەیتە وەک وەرامێکە بۆ سەرکۆنەکارێک کە گوتبێتی: ئەم هاوارەی پێ ناوێ بچۆ لای بژیشکان، بە تۆزە شەربەتێک چاکت دەکەنەوە. مەلا دەڵێ:
ئەو هەموو برینەی کە لە جەرگ و دڵمە و هەموو برینێکیش پڕە لە تیر و سەرە تیر و نەهاتوونە دەر، چۆن بە شەربەت و گوڵاو و شەکراو و قەنداو چاری دەکرێ؟ کابرا بە خوا ئاوی حەیاتیشم بە گەروودا کەن تازە من خۆش نابمەوە؛ کارم کراوە و دەردم کارییە.

٤ گەر دوو سەد پەیکان د نیڤا دل بوان دێ خوەش بوان
هەر دەما کەوکەب بدینا نەجم و پەروین بێ حیجاب

**مانای وشەکان:**

**گەر**: ئەگەر، **پەیکان**: سەرەتیر؛ **نیڤ**: ناوەند؛ **بوان**: ببان؛ **خۆش**: چاک؛ **دەم**: کات؛ **کەوکەب**: ئەستێرە؛ **نەجم**: ئەستێرە؛ **پەروین**: هێشووی ئەستێرەی کۆ؛ **حیجاب**: ڕووپۆش، لەمپەر.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دەڵێم دەردی من بەوانە نییە بە بژیشک و حەتار و لوقمانان عیلاجی بکرێ و ئاوی حەیاتیش دەهانام نایە، مانای ئەوە نییە کە ئیتر ڕێگەی چارە بە تەواوی بەستراوە و درگای هومێدی چا بوونم لێ داخراوە. نەخێر، ئەگەر من بە بێ پەردە و ڕووپۆش چاوم بە بەژن و باڵای ئەو سوورەگوڵەی خۆم ڕوون بباوە و خشڵ و پرپرە و سسڵەکانی بەژنیم بدیتبا ـ کە هەروەک ئەستێرە و هێشووی کۆ، لە ئاسمانی جوانی ئەودا دەدرەوشێنەوە ـ لێم ڕوونە ئەگەر دووسەد سەرەتیریشیم دەنێوەڕاستی دڵ هەڵچەقیبا، دەستەولەجێ برینیان کوێر ئەبوونەوە و گۆشتەزوونیان دەهێناوە و حەلەمم لێ دەبڕا و وەک گوێزی ئازام لێ دەهاتەوە.

**٥** زوهرە و عیقدا سورەییا کەشفی بوون ئەو د شەرق
سایەیا بەختێ مە دایێ ما ل سەر پەردە و نیقاب

**مانای وشەکان:**

**زوهرە**: ئەستێرەیەکی زۆر گەشی گەڕۆکە؛ **عیقد**: گەردنبەند؛ **سورەییا**: گەلە ئەستێرەی کۆ؛ **کەشفی**: دیاردە؛ **شەرق**: خۆرهەڵات؛ **سایە**: سێبەر؛ **بەخت**: ئیقباڵ؛ **دایێ**: کەوتە سەری؛ **ما ل سەر**: لە سەری مایەوە؛ **پەردە**: لەمپەر؛ **نیقاب**: ڕووپۆش.

**پوختەی مانا:**

من کە دەڵێم ئەگەر یارم بە بێپەردە و ئاشکرا دیتبا، خەمم لە دڵ دەبڕان، مانای ئەوە نییە کە یار خۆی لە من پۆشیوە. نەخێر، یار هەمیشە و لە هەموو شوێنان حازر و بەرچاوە. بەڵام ئەوە بەختی ڕەشی منە کە نەیهێناوە و بۆتە لەمپەر لە نێوان من و یاردا. ئەستێرەی زوهرە و گردنبەندی گەلە ئەستێرەی کۆ ـ کە مرازم لە خشڵەکانی بەژنیەتی ـ لە ئاسمانی باڵای یاردا، لەو لایەوە کە ڕۆژی ڕوخساری لێ هەڵدێ، دیار و ترووسکەدارن؛ بەڵام بەختی ڕەشم وەک هەورێکی ڕەش داوەستاوە و سێبەری کردۆتە نێوان و ناتوانم بیبینم.

«ئەوحەدی»ش دەڵێ: دۆست پتر لە خۆم نزیکی خۆمە؛ بەڵام ئەوە منم کە لەو

دوورم. چی بکەم؟ کێ وا هەیە حاڵی بکەم؟ کە دۆست لە تەنیشتمەوەیە و من لێی تەریکم![1]

٦ واژگوون دەورێ نوما من چەرخ و بایێ لەو لەبان
کەوکەبان سەیرا موخالیف گرت و تێکەل کر حیساب

**مانای وشەکان:**

**واژگوون**: بەراوەژوو؛ **دەور**: گەڕ؛ **نوما**: نواندی؛ **چەرخ**: ئاسمان؛ **چەرخ**: سووڕدان؛ **چەرخ**: ئامرازی هەڵپێچان؛ **با**: باو؛ **با**: سووڕ و خول؛ **با**: ڕەوشت؛ **لەولەب**: لۆلەپ، قرەقرە؛ **کەوکەب**: ئەستێرە؛ **سەیر**: گەڕیان؛ **موخالیف**: پێچەوانە؛ **تێکەل**: ئاڵۆز؛ **تێکەل**: لێکدراو؛ **حیساب**: ژمارە.

**پوختەی مانا:**

لە بەدبەختی و کڵۆلی من، سووڕی گەردوون پێچەوانە و بەراوەژوو بۆتەوە. باوی لۆلەپەکان بە باری نائاساییدایە. ئەستێرەکان ـکە من بەختی خۆم لێوە دەدیتن ـ هەمووی ڕێگەیان تێک داوە و بە تەواوی سەرم لێ شێواوە و حیساب و میسابم لە دەست دەرچووە.

٧ ڤێک کەتن شەمس و زوحەل ئیرۆ د بورجا عەقرەبێ
سەیف چوو دەستێ مریخێ مولکێ دل لەو بوو خەراب

**مانای وشەکان:**

**ڤێک‌کەتن**: یەکدیگیر بوون؛ **شەمس**: خۆر؛ **زوحەل**: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە و بە نەحس ناسراوە؛ **بورج**: مەنزڵگەی مانگ و ڕۆژ لە ئاسماندا؛ **عەقرەب**: دووپشک؛ **عەقرەب**: چەند ئەستێرەیەکن لە ئاسمان کە لە دوورەوە وەک دووپشکێک دێنە بەرچاو. هەروەها مەنزڵگەیەکی ئاسمانن بۆ مانگ و ڕۆژ لە حیسابی ئەستێرەناس و

---

١. یار نزدیک‌تر ز توست به تو     تو زِ نزدیک او چرایی دور؟!

نجووم‌گەراندا؛ **سەیف**: شیر، شمشێر؛ **مریخ**: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە. ئەستێرەناسانی قەدیم بە خوای شەڕ و ئاژاوە و خوێنڕشتنیان دەزانی و شکڵەکەیان وەها دەهاتە بەرچاو کە کێردێکی لەدەستایە دڵۆپە خوێنی لێ دەتکێ؛ **لەو**: بۆیە؛ **مولک**: ماڵ؛ **خەراب**: وێران و خاپوور.

**پوختەی مانا:**

بۆ چارەڕەشیی من، ئەمڕۆ خۆر و زوحەل، دەناو بورجی عەقرەبدا گەیشتوونەتە یەک؛ کە بە هەموو حیسابان بەڵگەی نەگبەتی و بەدبەختییە. مریخ کە کێردێکی لە دەستا بوو، دەبووە مایەی خوێنڕژان لە جیهاندا. ئێستا بۆ کڵوڵی و نەگبەتی من، کێردەکەی بە شیر گۆڕیوەتەوە. ماڵی دڵم بۆیە بە یەکجاری وێرانە.

٨ لەو تەنەززول کر مریخێ نەوبە چوو دەورا زوحەل
چوو تەرەف میهرا سوپیهرێ نەززلی عەردان عەزاب

**مانای وشەکان:**

**لەو**: بۆیە؛ **تەنەززول**: هاتنە خوار؛ **تەنەززول**: بۆ سەلماندن؛ **نەوبە**: نۆرە؛ **دەور**: باو؛ **تەرەف**: لا؛ **میهر**: خۆر؛ **میهر**: خۆشەویستی؛ **سوپیهر**: ئاسمان؛ **نەززلی**: دابەزی؛ **عەرد**: سەرزەمین؛ **عەزاب**: ئازار.

**پوختەی مانا:**

هەر لە بەختی ڕەشی منەوە بوو کە مریخی خودای خوێنڕێژی و ئاژاوە، لە پلەی فیزی خۆی دابەزی و سەلماندی کە زوحەلی نەحسیش دەورێکی دەنەگبەتی مندا هەبێ و لەم کارەساتەدا هاریکاری مریخ بێ. لەو لایشەوە خۆر ـ کە جێگەی هومێد و هانایانە و پشتم بە مەحەبەتی ئەو قایمە ـ لە ئاسماندا خۆی لێ خستمە لایەکەوە و لام لێ ناکاتەوە و سەرئەنجام هەرچی دەرد و ئازار و ناخۆشی بوو ڕووی کردە سەرزەمین و وڵاتانی گش تەنییەوە.

٩ لـەو ب شـەش بورجـان عوتاریـد ژافتابـێ دوور بـوو
لـێ زوحـەل بـوو موشـتەری ئاڤـیتە چـەرخێ ئیـنقلاب

**مانای وشەکان:**

**عوتارید**: ئەسـتێرەیەکی گەڕۆکـە، بـە حیسـابی نجوومگـەرانی پێشـوو لـە ئاسمـانی دووهەمدا دەخولێتەوە؛ **ئافتـاب**: خۆر، کە بەو حیسابەی پێشوو لـە ئاسمـانی چوارەمـا دەگـەڕێ؛ **زوحـەل**: ئەسـتێرەیەکی گەڕۆکـە بـە شـوومی مەشـهوورە؛ **موشـتەری**: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە، ئەستێرەناسانی قەدیم دەیانگوت لە ئاسمانی شەشـەمدا خـول ئەخوا؛ **موشتەری**: کڕیار؛ **چەرخ**: ئاسمان؛ **ئینقلاب**: هەڵگەڕانەوە و ژێر و ژوور بوون.

**پوختەی مانا:**

بەختی من کەوتۆتە ڕەشاییەوە. بۆیە وا دەبینم کە عووتارید بە شـەش مـەنزڵ لـە خـۆر دوور کەوتۆتەوە. خۆ دیارە ئەگەر ئەم دوانە لێک نزیک بن، مژدەی خۆشـی و شـادییان پێوەیە. جا کە عوتارید دوور کەوتۆتەوە لە خۆر، زوحەلی نەحس و نەگبـەتبار لـە خـۆر بۆتە کڕیار و بە نزیک بوونـەوەی خـۆر و زوحەلـە ئـاژاوە کەوتۆتـە ئاسمانـەوە و مایـەی بەختەوەری خەڵکی زەمین بەراوەژوو بوونەتەوە و هەموو شتێک لە باری خۆی ترازاوە.

١٠ شەووشـی نـەزما نجوومـان هەیئـەتا چـەرخ و بـورووج
لەو ل وەزعـەک دەر نـەتێتن مـاه و زوهـرە و ئافتـاب

**مانای وشەکان:**

**شەووشی**: شیواوی، ئاڵۆزی؛ **نەزم**: ڕێـکوپێکی؛ **هەیئـەت**: بـیچم و تـەرز؛ **هەیئـەت**: زانستی ئەستێرەگەری؛ **چەرخ**: ئاسمان؛ **بورووج**: گەلە بورج؛ **بورج**: مەنزڵگەی مانـگ و خۆر لە ئاسمانا؛ **لەو**: بۆیـە؛ **وەزع**: بـار، حاڵـەت؛ **دەرنـەتێتن**: نایەتـە دەرەوە؛ **مـاه**: مانگ؛ **زوهرە**: ئەستێرەیەکی گەڕیدەیە؛ **ئافتاب**: خۆر.

**پوختەی مانا:**

لیزگەی هۆنراوەی ڕێکوپێکی ئەستێرەکان شێواو و ئاڵۆزە. بیچم و تەرزی بورجـەکان

لە ئاسماندا ـبەرانبەر بە زانستی ئەستێرەناسین ـ هیچی لە جێگەی خۆیدا نەماوە و شیرازەیان لەبەر یەک هەڵوەشاوە. هەر لەمەش ڕایە کە لە بەرچاوی من مانگ و زوهرە و خۆریش ـکە جاران لە جێگەیەکی دیارییەوە هەڵدەهاتن ـ ئێستا ڕێگەیان گۆڕیوە.

١١ مونقەلیب من دی مەنازیل ڤاژی ئەو سەیرێ دکن
یەک ب یەک خوون ژێ دبارن ئاتەش و لەمع و شەهاب

**مانای وشەکان:**

**مونقەلیب**: وەرگەڕاو؛ **مەنازیل**: گەلە مەنزڵ؛ **مەنزل**: قوناغی ئەستێرە؛ **ڤاژی**: بەراوەژوو؛ **سەیر**: گەڕان؛ **خوون**: خوێن؛ **ژێ**: لێ؛ **ئاتەش**: ئاگر؛ **لەمع**: ترووسکە؛ **شەهاب**: پریشکەی ئەستێرە.

**پوختەی مانا:**

من وام دیت کە مەنزڵگەی ئەستێران بارەوباربوون. گەڕانی ئەستێران بە پێچەوانەی پێشوون. لە هەموو ئەستێرەیەک هەروا خوێن و ترووسکە و پریشکە دا دەبارن.

١٢ زوهرە چەنگێ ئەڤ سواژدی ئەڤ ژێ چەنگ ئاڤیتە چەنگ
خۆش لە پێ قانوونێ وێ گوهـ دە تو قانوون و ڕوباب

**مانای وشەکان:**

**ئەستێرەی زوهرە**: لە بەرچاوی ئەستێرەناسانی کۆندا لە بیچمی کیژۆڵەیەکدا بوو کە سەما دەکا و چەنگ دەژەنێ؛ **چەنگ و قانون و ڕوباب**: سێ ئامرازی مووسیقان.

**پوختەی مانا:**

زوهرەی چەنگ ژەن کە ئەو شەڕ و کێشە و خوێندابارین و ئاگر ڕێژان و ئاورینگ هێنانی ئەستێرانەی دیت، پەنجەی هاویشتە چەنگەوە و هەوایەکی غەریب و خەمباری لێ دا. دەسا تۆش ئەی کڵۆڵی داغدار! پەیڕەویی لە ڕێ و شوێنی زوهرە بکە و گوێ لە دەنگی خۆشی قانوون و ڕوباب بگرە تا کڵۆڵی دڵت پتر جۆش بدات.

۱۳ ئــــەز دبـــێم ئاخرزەمانـــــە دێ قیامـــــەت ڕابـــتن
لەو شەڤا تـاری کشـاندی و نهیشـت ئەسـوەد غـوراب

**مانای وشەکان:**

**ئەز دبێم**: من دەڵێم؛ **ئاخرزەمان**: بڕانەوی دنیا؛ **قیامەت**: هەستانەوەی پاش مـەرگ؛ **ڕابتن**: ڕابێ؛ **لەو**: بۆیـە؛ **شەڤا تـاری**: شـەوی تاریـک؛ **کشـاندی**: کێشـای؛ **نهیشـت**: نیشتەوە؛ **ئەسوەد**: ڕەش؛ **غوراب**: قالاو.

**پوختەی مانا:**

من دەڵێم دەمی بڕانەوی دنیا داهاتووە و بێگومان قیامەتمان لێ ڕادەبێ. هەر بۆیەشە کـە تاریکـایی شـەوەزەنگمان بەسـەردا کشـاوە و دەڵـێی قەلەڕەشـەمان بەسـەرەوە نیشتۆتەوە و باڵەکانی بە سەرماندا شۆڕ کردۆتەوە و ناهێڵێ لە هیچ لایەکەوە چاومـان بە ڕووناکی بکەوێت.

۱۴ خۆش ل من عالەم سیاه ما ستێر و کەوکـەب قـەت نـەمان
ئــەز ژ ڤــێ ڕۆژێ دترسـام ئـاخری زوو کـر شـتاب

**مانای وشەکان:**

**عالەم**: دنیا و هەرچی تێیدایە؛ **سیاە**: ڕەش؛ **ستێر**: ئەستێرە؛ **قەت**: هەرگیز؛ **ئەز**: من؛ **ژ ڤێ**: لەوی؛ **ئاخری**: سەرەنجام؛ **کر**: کردی؛ **شتاب**: پەلە.

**پوختەی مانا:**

هاوارە لە من! دنیای ڕووناک و خۆشی جاران، لێم ڕەش هەڵگەڕاوە و لـە تاریکاییـەوە پێچراوە. هەرچەندی دەڕوانم قەت ئەستێرەیەک لە ئاسماندا نابینم کە دڵی خۆمی پێ خۆش کەم. دەمێک بوو لەوە دەترسام کە تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە بم. ئەوا سـەرەنجام تووش بووم و ئەو ڕۆژی لێی دەترسام بە پەلە و هەڵەداوان هات.

١٥ ئەڤ نە ئەو ئیقلیمە یا شەمس و کەواکیب تێ ب سەیر
ئەز نە وێ عەردێ دبینم یا کو لێ ئەو ماهتاب

**مانای وشەکان:**

**ئەڤ**: ئەم؛ **ئیقلیم**: مەڵبەند؛ **یا**: ئەوی؛ **شەمس**: خۆر؛ **کەواکیب**: گەلەستێرە؛ **تێ**: تێدا؛ **سەیر**: گەڕان؛ **ئەز**: من؛ **وێ**: ئەو؛ **عەرد**: زەمین؛ **کو**: کە؛ **ماهتاب**: مانگەشەو، تریفە.

**پوختەی مانا:**

ئەو مەڵبەندەی ئێستا منی تیام، باوەڕ ناکەم ئەو مەڵبەندەکەی جاران بێ کە بە ڕۆژ، خۆر و بە شەو، ئەستێرە لە ئاسمانەکەیدا لە هاتوچۆ و گەڕاندا بوون. من هیچ ئەو سەرزەوییەی جارانم وە بەر چاو نایە کە تریفەی مانگ، ڕووناکی دەکردەوە.

١٦ جین و تەییارەک مە دی وەربوو د من وندا کرم
دامە بەر پەنجە و کولابان هەلفراندم وەک عوقاب

**مانای وشەکان:**

**جن**: جندۆکە؛ **تەییار**: فڕندەی لەزەبر؛ **مە دی**: ئێمە دیتمان؛ **وەربوو**: تێ ورووکا؛ **وندا**: گوم؛ **کرم**: کردم؛ **پەنجە**: چڕنووک؛ **کولاب**: قولاپ؛ **عوقاب**: هەڵۆ.

**پوختەی مانا:**

منی وا داماو و سەرگەردان لە ناو تاریکایی ئەنگوست لەچاوا بە خۆم نەزانیبوو. دیتم لەپڕ و نەکاوێک جندۆکەیەکی زۆر فڕندە خۆی لوور کردمێ و تێم ورووکا و بەر چڕنووک و چنگاڵی خۆی دام و وەک هەڵۆ بردمی و گومی کردم و خۆم لێ ون بوو.

١٧ سوفلەوێ ئینام و ئاڤێتم زەمینا زولمەتێ
لێ کو هشیارم گەلۆ یان خەونە من دیتی ب خواب

**مانای وشەکان:**

**سوفلەوی**: بە جنۆکە و شەیتانان دەڵێن کە گوایە خەڵکی دنیای خوارەوەن و پەستن؛ **سوفلەوی**: سەر بەرەوخوار؛ **ئینام**: هێنامی؛ **ئاڤیتم**: هاویشتمیە؛ **زولمەت**: تاریکایی؛ لێ: بەڵام؛ **هوشیار**: بەئاگا؛ **گەلۆ**: خزمینە، هەیاران؛ **من دیتی**: من دیتوومە؛ **خواب**: خەو.

**پوختەی مانا:**

ئەو جنۆکە باڵدارە کە دەمن ڕۆهات، لە ناو چنگوڕکی خۆیدا دایپۆشیم و بردمی سەربەرەو ژێر هێنامی و هاویشتمیە ناو وڵاتی تاریکستانەوە. بەڵام نازانم ئاخۆ ئەوەی من دیومە، خەونە و من لە خەوا وام بەسەر هاتووە یاخۆ لە ئاگاداری و بێداریدام؟ لێم ڕوون نییە. تۆ بڵێی خەون بێ و بێدار بوونەوەی بە شوێندا بێ؟!

**١٨** دێوێ مەلعوون و مونافق ئێ خودێ ڕووڕەش کری
ما ب بالا هەلکشیتن عاقیبەت چێ بت سەلاب

**مانای وشەکان:**

**دێو**: نەوعێ جنۆکەی بێفەڕ و بەگەڕ و بەهێزە کە عیفریتیشی پێ دەڵێن؛ **دێو**: لێرەدا مەبەست نەفسە؛ **مەلعوون**: نەحلەتی؛ **مونافق**: دووڕوو؛ **خودێ**: خودا؛ **ما**: ئێمە؛ **ما**: بۆچی دەبێ، سەبەب چییە؛ **بالا**: بەرزی، باڵان؛ **سەلاب**: چوارمیخە؛ **سەلاب**: سەختی و ڕەقی.

**پوختەی مانا:**

دێوی نەفسی نەحلەتی و دووڕوو، ئەو نەفسە بەدکارەی کە خوا ڕووی ڕەش کردووە و بە زولمەتی کردووە، چۆن دەبوایە ئەم هەلە دەستخاو ئێمە بە فریو هەڵفرێنێ و ئەو کەتنەمان بە سەر بێنێ؟ جا کە من لە بێئاگاییدا ئەوەم بە سەر هاتووە، دەبێ ئاخر و عاقیبەتەکەی چۆنم چوارمیخە بکێشێ و بە کام عەرزی سەخت و ڕەقەنمدا بدات؟!

**١٩** ئەهرەمەن تەعلیمی دابوو، ئەبیەزی دەست تێ هەبوو
پوڕ ب ڤێ تەعلیم و ڕایێ هاتبوو، چووبوو، خیتاب

**مانای وشەکان:**

**ئەهرەمەن**: شەیتان؛ **تەعلیم**: فێرکردن؛ **ئەبیەز**: سپی؛ **ئەبیەز**: ناوی جندۆکەیەکی بەدکارە کە دۆستی نزیکی شەیتانە و پادشای گەورەی جندۆکانە؛ **پوڕ**: زۆر؛ **ڕا**: تەگبیر؛ **خیتاب**: وتوویژ.

**پوختەی مانا:**

نەوسی بەدکارم کە منی بەو دەردە بردووە، کارەکەی لە خۆیەوە نەکردووە؛ شەیتان و پادشای جندۆکە بەدکارەکان دەمێک بوو خەریک بوون نەوسم لە خشتە بەرن و دەگژ منی ڕاکەن. زۆریان وتوویژ لە نێواندا لەسەر ئەم مەبەستە هاتبوو، چووبوو تا پێکهاتبوون و نەفسی منیان تەعلیم دابوو کە چیم دەگەڵ بکا و ئەویش دەرسی ئەوانی لە من دەکار کرد.

**٢٠** سەرسەری[١] عیللەت نزانی سیحر یا ئەبیەز دکت
پوڕ غەلەت ئەرزان مە دی دەرحەق خوە ئەو عالیجەناب

**مانای وشەکان:**

**سەرسەری**: بە سووک و هاسان گرتن و گوێ نەدان؛ **عیللەت**: هۆ؛ **سیحر**: جادوو؛ **ئەبیەز**: پادشای جندۆکەی بەدکار؛ **پوڕ**: زۆر؛ **غەلەت**: هەڵە؛ **ئەرزان**: کەمنرخ؛ **عالیجەناب**: پایەبەرز.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هەرچی بە سەرمان هاتووە، خەتای خۆمان بووە. لە بارەگای ئەو یارە پایەبەرزەدا جێگەمان بۆ دیاری کرابوو؛ بەڵام ئێمە قەدرمان نەزانی و لامان وا بوو ئیلتیفاتی کەمە و کەوتبووینە گلە و گازندە. ئەم دوو دڵی و بەنرخ نەزانینەی بوونمان لەسایەی ئەودا، ئێمەی لە ڕێگە دەربرد و گەیشتینە حاڵێک کە شەیتان و جنۆکە زەفەرمان پێ بەرن.

---

١. هەر چوار نوسخەی بەردەستم «سورپەری» یا «سرپەری»یان نووسیوە؛ واتا جندۆکەی جوانکەلەی دڵڕاکێش.

٢١ ئاه ئەیبامێن ویسالێ وەه کوو خـوەش بـوورین و چـوون
ئەو شەرابا عەیش و نۆشێ مـا ل پێشـبەر مـن سـەراب

**مانای وشەکان:**

**ئاه:** ئاخ و داخ؛ **ئەییام:** ڕۆژان؛ **ویسِال:** پێکگەیشتن؛ **وەهکوو:** پەکووکە؛ **خوەش:** بـە پەلـە؛ **بـوورین:** ڕابـران؛ **چـوون:** ڕۆیشـتن؛ **شـەراب:** بـادە؛ **عـەیش:** ژیـان؛ **نـۆش:** خواردنەوە؛ **ما:** مایەوە؛ **سەراب:** تراویلکە.

**پوختەی مانا:**

ئاخ و داخم بۆ ئەو ڕۆژانەی کە لەیارەوە نزیک بووم و لـە خۆشـییەکدا ڕامـدەبوارد کـە قەدرم نەزانی. داخەکەم ئەو خۆشگوزەرانی و عەیش و نۆشەی ئەودەم، ئێستا کە وەک تراویلکەیەک دێتە بەر چاوم و کە بۆی دەچم، بە ناهومێـدی دووچـار دەبم و نـەماوە. پەکوو لەو ڕۆژە خۆشانەی تەمەنم کە چەند بە پەلە ڕابردن و لەبەین چوون.

٢٢ شـەربەتا شـیرین لـەبان زەهـرا هـەلاهیل بـوو د نـاڤ
لـەو ب نـارێ فیرقـەتێ ئـاخر ل مـن دل کـر کـەباب

**مانای وشەکان:**

**شەربەت:** خۆشاو؛ **لەب:** لێو؛ **ژەهر:** زەهر؛ **هـەلاهیل:** گیایەکە شیرەی زۆر کوشندەی هەیە؛ **ناڤ:** ناو؛ **نار:** ئاگر؛ **فیرقەت:** جودایی؛ **کەباب:** بریان.

**پوختەی مانا:**

وا دیارە ئەو شەربەتەی کە من لە لێو شیرینانەوە پێم گەیشت و خواردمـەوە، ژەهـری هەلایلی تێدا بوو؛ بۆیە ئاخر و عاقیبەتەکـەی وام بـە سـەر هـات کـە تووشـی دەردی جودایی بووم و بە ئاگری دووری لە یار، دڵم برژا و بوو بە بریانی.

٢٣ هودهودەک خۆش‌تەبع من ئیرۆ دڤێ هـەروەک نەسـیم
دا ب بـاڵ دلبـەر هنـارا بانیـا دیسـا جـەواب

**مانای وشەکان:**

**هودهود**: پەپوو سلێمانە؛ **خۆش‌تەبع**: مرخ‌خۆش؛ **نەسیم**: شنەبا؛ **ب بال**: بۆ کن؛ **هنارا**: بناردایە؛ **بانیا**: بیهێنایە؛ **دیسا**: هەمیسان؛ **جەواب**: وەرام.

**پوختەی مانا:**

ئەوپەڕی ئاواتم ئەوەیە کە ئەمڕۆ پەپووسلێمانەیەکی خۆش گفت‌ولفت و قسەڕەوان و قالب‌سووک، کە لە ڕەوتا وەک سروەی بەیان نەرم و نیان و خۆشڕوو بێ، دەستم بکەوتایە و بمناردایەتە لای یارم و ڕاسپێری و دەردی دلی خۆم بەودا بناردایە و لەو سەریشەوە وەرامی یاری بۆ بهێنامایەوە.

**۲۴** عەرزێ حالێ من بگۆتایێ ب عینوانێ ئەدەب
ئاستان بکرا زیارەت چەتر و سەیوان و تەناب

**مانای وشەکان:**

**عەرز**: شاندن؛ **حال**: چلۆنایەتی؛ **عەرزێ حال**: باسی چلۆنیەتی؛ **عینوان**: دام و دەستوور؛ **ئەدەب**: ژیری؛ **ئاستان**: دەرگانە؛ **زیارەت**: دیدەنی؛ **زیارەت**: ماچ کردن؛ **تەناب**: ڕستە چادر.

**پوختەی مانا:**

ئەو قاسیدە سووک‌باڵ و خۆشڕەوتە، بگەییایە سەراوپەردە و چادر و ڕەشماڵی یارم و زۆر بە ژیری و عاقڵانە، سەردەرانە و لاشیپانەی دەرگانەکەی و چەتر و سەیوان و ڕستەی ڕەشماڵەکەی ماچ بکردایە و ئەوسا باسی کەساسی و بێ‌کەسی منی بۆ بکردایە.

**۲۵** دا د چەشمان من وەرێنا خاکێ هەر وەک تووتیا
یا حەبیب پێ لێ نهایی بانیا وێ ئەو توراب

**مانای وشەکان:**

**دا**: هەتا؛ **چەشمان**: چاوان؛ **وەرینا**: کردبا، کێشابا؛ **تووتیا**: دەرمانێکی چاوانە، چاو

ڕوون و گەش دەکاتەوە؛ **یا**: ئەوەی؛ **حەبیب**: خۆشەویست؛ **نهایی**: ناویە؛ **بانیا**: بیهێنابا؛ **توراب**: گڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەو ڕاسپاردەیە دوای ماچ کردنی دەرک و لاشیپانە و سەیوان و چەتر و ڕستە چادر و دوای گەیاندنی ڕاسپێری و باس کردنی کەساسی من، لەو خاکەی کە یار پێخوستی کردووە، تۆزێکی بۆ من بە دیاری بهێنابایەوە کە من وەک تۆتیا دەچاوەکانی خۆم بکێشابا و چاوم گەش و ڕووناک ببوونایەتەوە.

**٢٦** هەرکەسێ ڕابێ د بەحسێ جارەکێ مەهدەر بکت
خەیرێ هەفتێ حەج د دێرت بەلکوو بیهتەر ئەو سەواب

**مانای وشەکان:**

**رابێ**: هەستێ؛ **بەحس**: باس؛ **مەهدەر**: تکا؛ **خەیر**: چاکە؛ **هەفتێ**: حەفتا؛ **حەج**: چوونی ماڵی خودا؛ **ددێرت**: دەیبێت؛ **بەلکوو**: تەنانەت؛ **بیهتر**: زیاتر؛ **سەواب**: پاداشی چاکە.

**پوختەی مانا:**

من ئەوندە کەساس و بێچارە و مستەحەقی بەزەییم، ئەگەر کەسێک هەستێ و بچێ لە لای یار باسی کەساسی و کڵۆڵی من بکا و تکاشی لێ بکا کە ئاوڕێکی بەخێرم لێ بداتەوە، لێم ڕوونە وەک حەفتا حەجی کردبێ وایە و تەنانەت دەتوانم بڵێم کە خێرەکەی لە حەفتا حەجیش زیاترە.

**٢٧** وەعدە دابوو دێ شەهیدکم وێ ب شیرێ خۆی شەریف
ما نەبی ئیرۆ پەشیمان ئەو ژ تەدبیرا سەواب

**مانای وشەکان:**

**وەعدە**: بەڵێن؛ **دێ**: دەبێ؛ **وێ**: ئەوی؛ **شەریف**: پیرۆز و بەڕێز؛ **ما نەبی**: نەکا ببێ؛ **تەدبیر**: تەگبیر؛ **سەواب**: ڕاست و دروست.

**پوختەی مانا:**

دەمەوێ ئەو کەسەی ئەو خێرە دەکا و بۆم دەبێتە تکاکار لە لای یار، وەبیری بهێنێتەوە کە یار وەختی خۆی بەڵێنی دابوو، فەرمووبووی مەلای بە شیری پیرۆزی خۆم دەکوژم و دیاریشە کوژراوی دەست و شیری ئەو یارەم دەرەجەی شەهیدانی هەیە. نەکا بە هیچ باران لەو بەڵێنە خۆش و تەگبیرە ڕاست و دروستەی خۆی پەشیمان بێتەوە. تکا بکەن کە ئەو بەڵێنە بەجێ بهێنێ و لەو شەهید بوونە بێبەشم نەکات.

**٢٨** شەرحێ حالێ من «مەلا» نارەت بەیازێ هێ تەمام
ڤێ سەوادێ گەرچە هەردەم ژێ برن سەد ئینتخاب

**مانای وشەکان:**

**شەرحێ حال**: ژینامە؛ **نارەت**: نارِوات؛ **بەیاز**: سپیایەتی: **بەیاز**؛ دەفتەری شیعران؛ **بەیاز**: پاکنووس؛ **سەودا**: ڕەشایی؛ **سەودا**: پێش‌نووس؛ **هەردەم**: هەموو کات و سات؛ **ژێ**: لەو؛ **برن**: بردن؛ **ئینتخاب**: هەڵبژاردن؛ **ئینتخاب**: لێرە بە مانا هەڵبژاردەیە.

**پوختەی مانا:**

ئەی مەلا! باس‌وخواسی عیشق و دڵداریی و سووتان و برژانت هەرگیز بە تەواوەتی پاکنووس ناکرێ؛ چونکە فریای پاک نووسینەوە ناکەوی و هەر پێش‌نووسەکەی دایم و دەرهەم دەستاودەست دەکا و لە هەموو سات و کاتاندا بە سەتان هەڵبژاردەی لێ بەرِێ دەکرێ.



# راست و چەپ

١ لەو سـەحەر جـەولان ددت بایـێ سـەبایێ راسـت و چـەپ
سووسەن و سونبول ب مەستی بێن سەمایێ راسـت و چـەپ

**مانای وشەکان:**

**لەو**: لەبەر ئەوە، بۆیە؛ **جەولان**: هاتوچوو؛ **ددت**: دەدات؛ **بای سەبا**: شـنەبای بـەیان؛ **سووسەن**: سوێسنە؛ **سونبول**: گوڵی سمڵ؛ **مەست**: سەرخۆش؛ **بێن سەمایی**: وەسەما کەون، بڕەقسێن.

**پوختەی مانا:**

بسکوکەزی و پرچۆکەی ئەو نازنینە دڵـڕفێنە، لـە بۆنخۆشـیدا برەوبـەری سوێسـنە و سمڵن؛ چۆنکە بوونەتە هاوسای لاجانگ و هەنیەی وەک مانگی ئـەو شـۆخە. دەگـەڵ ئەوەشا کە بۆنخۆشن، مەستی جوانچاکی لاجانـگ و هەنیەشـن. شـنەبای بـەیان کـە دەنگوێ، دەیەوێ ئەو بسک و کەزیانە کـەوا مەسـتی جـوانی لاجـانگن، بـە ڕاسـت و چەپەدا بخاتە سەما و هاتوچووە و ئەویش لەو دیمەنە کەیفی خـۆی تـەخت کـات و نیازی تریشی هەیە. وەک:

٢ دا ژ میحرابا دو نوونان سەجدە بـەت ئەسـوەد حەجـەر
دل ب میزان ماهێ نەو ئەبروو نومایـێ راسـت و چـەپ

**مانای وشەکان:**

**دا**: هەتاکوو؛ **ژ میحرابا**: لە میحـرابی؛ **میحـراب**: بـەو کەوانەیـە دەڵـێن کـە لـە لای ڕووگەی ناو مزگەوت دەدیوار کراوە و مەلا لەوێوە پێشنوێژی بۆ خەڵک دەکا؛ **نـوون**:

یەکێکە لە پیتەکانی ئەلف و بێتکە کە هێندێک لە نووسەرانی پێشـوو وەک کـەوانێک هەڵیاندەخستەوە. نوون نوختەیەکی هەیە؛ زۆر لـە شـاعیران بـرۆی ماشـقە و گـراوی خۆیان بە نوون شبهاندووە و خاڵـی نـاو کەوانـەی برۆیـان بـە نوختەکـە نـاو بـردووە؛ **سەجدە**: سەر لەسەر زەوین دانان بۆ ڕێز لێنانی ئافەریدەگار و دەسـەڵاتداران؛ **بـەت**: ببات؛ **ئەسوەد**: ڕەش؛ **حەجەر**: بەرد؛ نیاز لە ئەسوەدحەجەر، ئەو بەردە ڕەشەیە کە دە ماڵی کابە گیراوە و خەڵک «حَجَرُ ا لْأَسْـــوَ دْ»ی پـێ دەڵـێن. ئـەو بـەردە پـیرۆز و ممبارەکە؛ حاجییەکان لەسەریانە ماچی کەن، ئەگینا حەجەکەیان ڕێک نایـە. ئەگـەر حاجی لە بەر ئاپۆرەی خەڵک نەتوانێ دەمی بگاتە ئەو بەردە ڕەشە، دەبێ هـیچ نـەبێ دەستی پانەوپان نیشانی بەردەکە بدا و ئەوسا لـەپی دەسـتی خـۆی مـاچ بکـا. هـەر بۆیەشە کە دەبێ لە باتی پشتی دەستی حاجیان، کـە تـازە لـە حـەج دێنـەوە بـەری دەستیان ماچ بکرێ. واتا ئەو جێگەیە ماچ‌کەن کە نیشان بەردەکە دراوە.
نیازی مەلا لێرەدا خاڵی نـاو کەوانـەی بـرۆی سـەلمایە کـە لـە لای ئـەو لـە بـەردە ڕەشـە بریقەدارەکەی ماڵی کابە پیرۆزتر بووە؛ **میزان**: تەرازوو؛ **میزان**: بورجێکە لە ئاسمـان؛ **میـزان**: ڕێک و بەرانبەر؛ **ماهی نەو**: مانگی یەکشەوە؛ **ئەبروو**: برۆ؛ **نومایی**: خۆ بنوێنێ، بێتە بەرچاو.

**پوختەی مانا:**

سروەی بەرەبەیان ــکە بسـک و پرچۆکـەی ئـەو نـازداری باوانـەی ڕژانـد و خسـتنیە جووڵان و هات‌وچۆــ مەبەستی ئەمە بوو ئەو بسک و پرچۆکانە کـە بـە سـەر هەنیـە و ڕوخساری یاردا پەرژ و بڵاو ببوون و ببوونە هەورێک کە بەری ڕۆژ و مانگی ڕوومـەت و هەنییەیان گرتبوو، لادرێن. ئەوسا برۆکـانی یـار ــکـە وەک کـەوانی نـوون و پێڵـەی خەت‌خۆشە هەرە لەزەبرەکانــ خاڵـە ڕەشـەکانی نـاو کەوانـەی بـرۆ ــکـە بوونەتـە نوختەی هەرە جوان و دڵڕفێنــ بە لادانی بسک و کەزیـەکان دەرکـەون و بێنـە بـەر چاوی عاشقان. بەڵێ برۆکانی یار، لە تەرز و بیچمدا وەک نوونن؛ بـەڵام لـە بـاریکی و خۆشەویستیدا وەک مانگی یەکشەوەن کە بە ئاسمانی سامالی هەنیەوە گیرسـاونەوە. ئەو دوو مانگە یەکشەوەیەش هەریەکە خاڵێکی ڕەشی بریقەداری گرتۆتە ناو کەوانـەی خۆیەوە و دەکرێ بڵەین ئەستێرەی هاوڕێن. جا لادانی ئەو بسکانە لە ڕاست و چەپەوە لە لایەن بسکانەوە کارێکی وای کردووە کە دڵ چاوی بـەو دوو بـرۆ میحرابییـە ڕوون

بێتەوە و لە خۆشیانا سوژدەی شوکر بەرەو ئەو خاڵە ڕەشانە بەرێ کە لە ناو کەوانەی برۆدا جێگیرن و هیچ چەپێکیان دەبەر بەردە ڕەشە پیرۆزەکەی کابەدا نییە.

٣ دل ژ بسکا فلفلین بوو فر ددا خالا سیاه
شەهپەرێ زولفا شەپالێ دال دایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**فلفل**: ئیسیوەت؛ **فلفلی**: وەک ئیسۆت ڕەش و تیژی زمانسووتێن. زۆر لە شاعیرانی پێشوو بسکی ڕەش و خاڵی ڕەشی ماشقەی خۆیان بە فلفلێ شبهاندوە؛ **فلفلی**: مووی هالاو و بە ئاڵقە داوێستاو و مۆنجدار؛ **فر**: فڕین و باڵگرتنەوە؛ **فردان**: بەرەو شتێک فڕین؛ **شەهپەر**: شاباڵ؛ **شەپال**: جوانی خوێنشیرین و ڕەزاسووک؛ **دال**: پیتێکی خواری نیوە ئاڵقەیە لە ئەلف و بێتکەدا.

**پوختەی مانا:**

دڵ کە زۆر لەمێژ بوو دیل و زنجیرکراوی داوی بسکی ڕەشی ئاڵقە و مۆنجداری ئەو نازدارە بوو، کاتێ سروەی بەیان ئەنگووت و بسکەکانی لە سەر ڕوو لادا و میحرابی برۆ و خاڵی ڕەشی ممبارەک دەرکەوتن، هەلی بە دەرفەت زانی، خۆی لە زیندانی بسکان ڕزگار کرد؛ وزاقی خۆی دا؛ فڕکەی کرد خۆی بگەیەنێتە بەر داڵدەی خاڵی ڕەشی ناو کەوانەی میحرابی برۆیان و لە پەنای ئەواندا بحەسێتەوە و بە سوژدە بردن بۆ ئەو خاڵانە شوکری ڕزگار بوون بکا؛ بەڵام ئاواتەکەی بۆ پێک نەهات! سەری زولفی یار - کەوەک شاباڵی پەری وانە- کەوتنە شوێن دیل و یەخسیری ڕاکردووی خۆیان و لە ڕاستە و چۆپەوە لە ڕەنگی پیتی دال بۆی چەمانەوە و بە ئاڵقە ئابلۆقەیان دا و نەیانهێشت لە ئایین وەرگەڕێ و ڕووگە بگۆڕێ؛ گورجێ گرتیان و خستیانەوە گرتووخانەکەی پێشووی.

٤ عالەمەک ویرانێ زولفێن تە ژ ڕەنگێ عەنبەرێ
چەرخ و پەروازێ ددەن جارەک ل بایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**عالەم**: جگە لە خوا هەموو شت؛ **عالەم**: خەڵکی سەر دنیا؛ **عالەمەک**: عالەمێک، واتا خەڵک و حەشاماتێکی زۆر؛ **وێران**: کاول، خراپ؛ **زولفێن**: کەزیەکان؛ **تە**: تۆ؛ **ژ ڕەنگێ**: لە گوێنی، وەکوو؛ **عەنبەر**: ماکێکی ڕەشی بۆنخۆشە لە ورگی جۆرە ماسییەکدا دێتە بەرهەم؛ **چەرخ**: سووڕدان؛ **پەرواز**: هەڵفڕین؛ **جارەک**: هەلێک؛ **ل بایێ**: لە بەریا.

**پوختەی مانا:**

هەرچەند جارێک کە بای بسکان ئەو کەزی و پەرچەمە ڕەشانەی تۆ ـکە لە ڕەنگ و بۆن و بەرامەدا لە عەنبەر دەکەن ـ دەجووڵێنێ و دەخاتە سەماوە و لە چەپ و ڕاستەوە ڕایاندەژێنێ و باڵیان پێ دەگرێ و سووڕیان پێ دەدا، حەشاماتێکی زۆر و زوربە لە تاوتوێی دیمەنی جوانیت، ماڵوێران و خانەخەراب دەبن و ئاگریان تێ دەچێ و دەبنە پووش و پەڵاشێک، بە دەم باوە سووڕ دەخۆن و باڵدەگرنەوە و بە ڕاستە و چەپەدا دەکەون.

**٥** خەنجەر و تیر و تەبەر بارین شوبهـ بەرق و برووسک
میسرییان لامیع ژ ئەڵماسان ددایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**تەبەر**: بێور، تەور؛ **بارین**: دابارین؛ **شبهی**: وەکی؛ **بەرق**: هەورەتریشقە؛ **برووسک**: برووسکە؛ **میسری**: شیری دەسکاری میسرییان؛ **لامیع**: ورشەدار؛ **ئەڵماس**: بەردێکی بەنرخە؛ **ددایێ**: دەیدایێ، لێی دەدا.

**پوختەی مانا:**

برۆکانی یارم بەو شیرە میسرییانە دەمێنن کە وەستاکاری زۆر دەستڕەنگین هەڵیاندەخەنەوە و هێندە بە نرخ و خۆشەویستن کە بالچووغەیان بە ئەڵماس دەڕازێننەوە. یاخۆ وەک شیرێک وانە کە وەستاکاری میسر، دەم و دووخیان لە ئەڵماس داڕژتووە و هەروا لە دوورەوە بریقە و گرشەی دێ.

جا کاتێ کە شنەبا بسکی لەراندەوە و برۆ دەرکەوتن، حەشاماتی دڵداران هەستیان کرد کە ڕێژنەبارانی خەنجەر و تیر و تەوریان بەسەردا دەبارێ و ورشەی برۆی تازە ساویان، بە شیرێک زانی کە لە میسر کراوە و لە ئەڵماس داڕژاوە و لە ڕاست و لە چۆپەوە گرتوونییە بەر و لە بریسکە و ورشەدا نوقمی کردوون و وەک بریسکەی ئاسمان هەڵیاندەپرووکێنێ و دەیانکاتە قەرەبرووت.

٦ تەیرک و عیقد و شوراب و نەترک و بەرگ و وەرەق
هەر ب لەرز و جەزبەیێن یاقووتێ تایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**تەیر**: باڵندە؛ **تەیرک**: خشڵێکی ژنانەیە کە وەک کۆتر دەچێ و لە زێڕ دەکرێ؛ **عیقد**: گەردانە، گەردنبەند؛ **شوراب**: گولینگە و پلپلە و لەرزانە؛ **نەترک**: گۆبەرۆک؛ **بەرگ و وەرەق**: خشڵی زێڕن لە شکڵی گەڵا و پرپرە و پەرەنگ؛ **لەرز**: لەرین؛ **جەزبە**: کێشان؛ **جەزبە**: حالات لێهاتنی دەروێشان کە ئێمە جەزم بوونی پێ ئەڵێین؛ **یاقووت**: بەردێکی بەنرخی ڕەنگ ئاڵە؛ **تا**: هەودا و لیزگە.

**پوختەی مانا:**

کاتێ بای بەیان زولفی یاری بە ڕاست و چەپدا هەژاند و چاو و برۆ و هەنیە و لاجانگ و کولم و خاڵی ئەو یارە شەپاڵەی خستە بەر چاو، نەک هەر ئێمەی دڵدار و گیرۆدەی ئەوینی ئەو نازدارە تووشی شێواوی و ماڵوێرانی و حاڵ لێ هاتن بووین، بگرە خشڵە بێگیانەکانی گەردن و بەرۆک و جلکەکانیشی ـکە زێڕ و بەردی بەقیمەت و ئاوریشمن ـ دەگەڵ ڕاژانی بسکان بە دەم باوە، ئەوانیش کەوتنە ڕاژان و سەماوە و ئەوانیش وەک ئێمەی ئەویندار و بریندار، ئارام و ئۆقرەیان لێ هەڵگیراوە و جەزمەیان لێ هاتووە. بڕوانە لە خشڵەکانی کە بریەتین لە: کۆتری زێڕ، گەردانەی یاقووت، گۆبەرۆک، لاسەرە و گوڵ و پەرەنگی گوارە، تەنانەت ئەو هەودا ئاوریشمانەش کە گەردنبەند و خشڵی دیکەی پێ هۆندراونەوە، گولینگە و لەرزانەکانیشی لە تاوی دیمەنی ڕوخساری دەلەرێنەوە و بە ڕاستە و چۆپەدا تلدەخۆن و ئیختیاریان لە دەس دەرچووە.

٧ بشـــکوێن بەنـــدا گرێبانـــێ ژ ڕەنگـــێ کەوکـــەبان
بەرق و تیرۆژێن ژ خورشیدێ ڤـەدایێ ڕاسـت و چـەپ

**مانای وشەکان:**

**بشکوێن**: هەڵپشکووتن، دەمیان کردەوە؛ **بەندا گریبانێ**: دوگمەی بەرکۆزە؛ **ژ ڕەنگێ**: هەر وەکوو؛ **کەوکەب**: ئەستێرە؛ **بەرق**: درەوشین؛ **تیرۆژ**: تیشک؛ **خورشید**: خۆر؛ **ڤەدایێ**: دایەوە.

**پوختەی مانا:**

یەخـەی کـراس داخرابـوو، زولـف و کـەزیش بـە سـەر سـنگ و بەرۆکـدا هـاتبوو، دایانپۆشیبوو. دوگمەکانی یەخە، لە ناو ئەو ڕەشایی کەزیانەدا دەترووسکانەوە؛ دەتگوت ئەستێرەن و لە شەوی تەواو تاریکدا زریوە_ زریویانە. لـە ڕاستیشـدا ئێمـەی دڵـداری کلۆڵ و هەژار کەوتبووینـە شـەوەزەنگی ئەنگوسـتلـەچاو؛ هـەر چـاوەنواڕ بـووین لـە سووچێکەوە ڕووناکایی هومێدێک بەدی بکەین. خواوڕاستان سروەی سەبای ساڵـحان ئەنگووت؛ زولفی لە ڕاسـت و چەپـەوە لادان. یەخـە و بـەرۆکی ڕاتڵـەکاند و دەرزی و دوگمەی بەرۆکی ترازاند؛ ڕۆژی ڕوونـاک لـە ئاسـۆی بـەروێوە دەرکـەوت و تیشـکی لاجانگ و کولمە و هەنیانیش لە چەپ و ڕاستەوە ئاراسـتە بـوون و لـە پـاش شـەوی ناهومێدی، ڕۆژی هومێد و خۆشیان هەڵات و هەژارانی چاوەنواڕ خەڵات کران.

٨ کەوکـەب و قەوسـێقوزەح، لوئلوئـێ بەنـدا حەیـدەری
تێن تەوافا زولـف و خـاڵێن دلـڕوبایێ ڕاسـت و چـەپ

**مانای وشەکان:**

**کەوکـەب**: ئەسـتێرە؛ **قـەوس**: کـەوان؛ **قـوزەح**: بڵـقی سـەر ئـاو؛ **قەوسـێقوزەح**: پەلکەزێڕینە، کۆلکەزێڕینە؛ **لوئلوء**: مـرواری؛ **بەنـدا حەیـدەری**: خشڵـێکی ژنانـە کـە بریەتییە لە لیزگە لیرەیەک لە نیوەی کڵاو و سـەرپێچی سـەر دەدرێ و بۆیـەش ئـەو

ناوەی لێ نراوە چۆنکە هەوەڵجار لە ناو هۆزی حەیدەرانلووی کورددا بۆتە باو. ئێستا لە ناو کوردەکاندا بەژێرچەنە و لاسەرەی لیرە و زێڕیش هەر دەڵێن بەندا حەیدەری؛ کە زۆر جاران جەواهێراتیش کراوەتە نێوانی لیرەکان؛ **تێن**: دێن؛ **تەواف**: لە دەورەگەڕان و سووڕدان؛ **زولف**: کەزی؛ **خالێن**: خالان؛ **دلروبا**: دلڕفێن.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هەروەک گوتمان، عالەم کە بە مانا هەموو ئافەریدەیەکە، حەیران و سەرگەردانی ئەو جوانییەن کە یار هێناویەتە بەر بار و بەر کار. ئیتر کار لەوە دەرچووە کە ئێمەی گیانداری دلدار و هەژار گرفتاری بین و ببڕێتەوە. نەخێر، تەنانەت خشڵەکانی بەریشی شێت و ماڵوێران و سەرگەردانی ئەو جوانییەن. تۆ لەکاتی هەنگووتنی شنەبای بەیانا وەرە و بڕوانە کە چۆن گیرە و لاسەرە و گەردانەکانی ـکە لە زێڕ و جەواهیراتن و بە ڕەنگی پەلکەزێڕینە لە حەوت وێنە دەنوێنن ـ دەوری سەری زولف و خالان دەگەڕێن و دەیانەوێ ئەو زولفە ڕەشانە، کە وەک پەردەی ماڵی کابەن و ئەو خالانە، کە جوانتر و پیرۆزتر لە بەردە ڕەشەکەی حاجیانن، زیارەت بکەن.

٩ دل دخوونت زولف و خالان دێم و بالایێن ژ نوور
هەر ب قانوون موژدەیا غەیبی ژ نایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**دخوونت**: بانگ دەکا؛ **دیم**: ڕوومەت و کولمە؛ **بالا**: بەژن؛ **نوور**: ڕووناکی؛ **قانوون**: دام و دەستوور؛ **قانوون**: ئامرازێکی مووسیقایە؛ **موژدە**: مزگێنی؛ **غەیب**: نادیار؛ **نای**: بلوێر.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر بێت و بە دڵێکی ڕوون و وشیارەوە گوێ لە ئاوازە و لۆرەی بلوێر بگرین و بتوانین وەک پێویستە تێی بگەین، تێ دەگەین کە بلوێر لە دنیای نادیارەوە لە ڕاست و چەپمانەوە مزگێنی بە دلان دەدا و بانگیان لێ دەکا کە هەر دڵێک بە ئاواتەوەیە

تووشی بەختەوەری بێت، با ئالوودە و گیرۆدەی ئەو زولف و خاڵە و ڕوومەت و بەژن و باڵایە بێت کە لە نووری خودا دروست کراون.

۱۰ زەنگیيان جەوشەن ڤەبەستن پێشبەرێ جووقا حەبەش
دابرستن یەک ب یەک چون بەر لێوایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**
**زەنگی**: تیرەیەک لە قولەڕەشەکانن کە لە لای زەنگبارەوە هاتوون. زەنگی لە شیعری شاعیرانی کۆندا هەمیشە نیشانەی دلڕەقی و بێبەزەیەتییە؛ **جەوشەن**: زرێ[1]؛ **ڤەبەستن**: دایانبەست، لە خۆیان شەتەک دا؛ **پێشبەر**: ڕووبەڕوو؛ **جووق**: دەستە، تیپی لەشکر؛ **دابرستن**: دارژانە، هەڵیانکردە؛ **لیوا**: ئالا؛ **حەبەش**: واتا خەڵکی حەبەشە کە ئەوانیش تیرەیەک لە قولەڕەشەکانن.

**پوختەی مانا:**
کەزی و بسکەکانی یارم لە ڕەشی و دوورەبەزەییدا بە دوو لەشکر لە زەنگی و حەبەشان دەشبهێن کە پێک هاتبن و بۆ شەڕ و پێکدادان بەرانبەر بە یەک، وەک تیپێک لە لای ڕاستەوە و جووقەیەک لە لای چەپەوە ڕیزیان بەستبێ، وا بوو. کاتێ شنەبا لەراندنییەوە، وەک ئەوە دەچوو کە ئەو دوو لەشکرە دلڕەقە، دابرژێنە یەکتری؛ هەر لایەش کە بە ئاڵقە و مۆنج بوون، وەک زرێیان دەبەر کردبێ دەهاتە بەرچاو. هەر لەشکرە بۆ ئەو هێرشە خۆیان دا بەر ئالای گەردنی کێل تا بە فەرمانی سەرکردەی هەموو نازداران دەگژ یەک ڕابچن.

۱۱ چینگ ـ چینگا بشکوان ئاواز و دەنگێ زەرگوان
سەد مەلایک گۆه ددن بەر وێ نەوایێ ڕاست و چەپ

---

۱. جەوشەن لە ڕەگەزدا کوردییە و گەوچن بووە؛ واتا بە ئاڵقە چندراو. لە پاشان عەرەب وەریانگرتووە و «گ»یان کردۆتە «ج» و «چ»یان کردۆتە «ش» و بە ماڵی خۆیان زانیوە. «هەژار»

**مانای وشەکان:**

**چینگ_چینگ**: جرینگە و زرینگە؛ **بشکۆ**: دوگمە، لێرەدا نیاز لەرزانەیە؛ **ئاواز و دەنگ**: خرینگ و هۆڕ؛ **زەرگۆ**: گوێ زێڕین، مەنگۆڵە و خرینگە؛ **مەلایک**: فرشتەی خودا؛ **گوه**: گوێ؛ **نەوا**: دەنگ و سەدا.

**پوختەی مانا:**

دوو لەشکری زوڵفان لە ڕاست و چەپەوە بە ئاڵقە و مۆنج زرێیان لە خۆیان شەتەک داوە و چوونە بەر ئالاوە و بە دەم باوە تێک چرژاون. ئەو شەڕە مارشی شەڕیشی دەوێ. شەق و هۆڕی ترازانی دوگمە و زرینگە و جرینگەی لەرزانەکان و خرینگ و هۆڕی گۆبەرۆکی زەردی زێڕین _کە ئەوانیش بە دەم شنەوە دەلەرزانەوە_ ببووە مارشی ئەو تێکچڕژان و پێکهەڵپرژانە. جا وەرە و تماشا کە چەند خۆشە زولف و کەزی بەو دیمەنە لەبار و دڵتەزێنەوە، لە سەر کولم و لاجانگی وەک ڕۆژ و مانگ بلەرێنەوە و خرینگ و هۆڕی سسلە و پلپلە و لەرزانە و خرینگە و مەنگۆڵە و چرپەی ترازانی دوگمەکانی بەروێ بێتە گوێ! نەک ئێمە بۆ گوێ گرتن و سەیرکردنی ئەو دیمەن و ئەو دەنگە گیانپەروەرە منە دەکەین، بەڵکوو فریشتەکانی خوداش کڕ و مات گوێیان بۆ بیستنی ئەو دەنگە و دیتنی ئەم ڕەنگە هەڵخستووە و هاتوونە تماشایە.

**١٢** لەو ژ عیشقا وێ دنالن بازن و بەرگ و وەرەق
جەزبەیا دل من ژ ڕەمزا وان گەهایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**لەو**: لەبەر ئەوە، بۆیە؛ **بازن**: مەچەکبەند؛ **بەرگ**: پەلک؛ **وەرەق**: گەڵا، نیاز لە بەرگ و وەرەق ئەو پەرەنگ و پرپرانەیە کە لە شکڵی گەڵادار دروست کراون و وەخۆ خراون؛ **جەزبە**: جەزمە و حاڵ لێ هاتنی دەروێشانە؛ **ڕەمز**: نیشانە و بەڵگە؛ **وان**: ئەوان؛ **گەهایێ**: گەیشتێ.

**پوختەی مانا:**

من کە خرمەی بازنە و مەچەکبەند و زرینگەی پرپرە و پەرەنگم لە قۆڵ و بازن و بەرۆکی یارەوە بیست و بە دڵوداو گوێی دڵم دایە، تێگەیشتم کە ئەو بێگیانانەش دڵیان داوە بەو دلبەرە خوێنشیرینە و ئەوانیش وەک هەموو دڵدارێکی دڵسووتاو لە ئەوینی ئەو جوانە دەناڵێنن. ناڵەی ئەوان بۆ من بوو بە دنەدەرێک کە منیش تووشی جەزمە لێهاتن و لە هۆش چوون ببم و دەردی دڵداریی، لە ڕاست و چۆپەوە بمگرێتە ناو خۆی و دەرەتانم لێ ببڕێ.

**١٣** زوهرە و عیقدا سورەییایێ د شەرقێ کەششفین
لەیلەتولقەدرێ ژ مەغریب پەردە دایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**زوهرە**: ئەستێرەیەکی گەڕیدەی زۆر گەشە؛ **عیقد**: گەردانە؛ **سورەییا**: هێشووە ئەستێرەی کۆ؛ **شەرق**: خۆرهەڵات؛ **کەششفی**: کەشف بوو، دیاری دا؛ **لەیلەتولقەدر**: شەوی هەرە پیرۆزە لە لایەن موسوڵمانانەوە کە لەو شەوەدا قورئان بۆ پێغەمبەر بە خەڵات هاتووە و پەرستنی خودا لەو شەوەدا خێری نوێژ و ڕۆژووی هەزار مانگی هەیە؛ **مەغریب**: خۆرنشین؛ **پەردە**: لەمپەر؛ **دایێ**: پێیدا دا.

**پوختەی مانا:**

گەردنی یارم لە سپیایەتی و ڕووناکیداندا وەک ئەستێرەی زوهرەیە. گەردنبەندە مروارییەکەی ملی، وەک هێشووی ئەستێرەی کۆیە کە لەدەوری زوهرە هالابێ. ئەو گەردن و گەردانەیە لە لای ڕۆژی ڕوخسارەوە ــواتا ئەو جێگەی ڕۆژی لێ هەڵدێ ــ هاتنە بەرچاو. بەڵام شەوەزەنگی زولفەکانی، لەو شوێنەوە کە تیشکی ڕوخسار دەبڕێتەوە و بە خۆرنشین حەساو دەکرێ ــکە ئەو شەوی زولفانەش هیچ چەپێکی دەبەر لەیلەتولقەدردا نییە ــبە سەر گەردندا پەرژوبڵاو بوون و لە ڕاست و چەپەوە پەردەیەکی ڕەشیان لە بەر زوهرە و پیرۆی گەردن و گەردانە گرتەوە و دیمەنەکەیان لە بەرچاو ون کردین.

۱۴ زوهرەڕەنگێ ماه و خورشیدێ ژ بالا وێ نوما
لەو دو کەوکەب چوونە ڤێڕا ئیستیوایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**ڕەنگی**: هەر وەکوو؛ **ماه** و **خورشید**: مانگ و خۆر؛ **بالا**: بەژن، لای سەروو؛ **نما**: نواندی، دیاری دا؛ **لەو**: بۆیە؛ **کەوکەب**: ئەستێرە؛ **ڤێرا**: دەگەڵ؛ **ئیستیوا**: خەتی گریمانەیی ناوقەدی گۆی زەوی.

**پوختەی مانا:**

لە لای سەرووی بەژنی یارەوە هەنیەی وەک مانگ و کولمەی وەک خۆر و گەردنی ساف و سپی و بێگەرد و گەشەداری وەکوو زوهرە خۆیان نواند. ئەم پێکەوە درەوشانەوەی ئەو سێ ڕووناکیدەرانە، بوو بە هۆی ئەوە کە دوو ئەستێرە- نیاز لە دوو ئەستێرە، یان لاجانگی یارن یان جووتە مەمکی هەنارن- ڕاست وێستان و خەتی ناوەڕاستیان لە چەپ و ڕاستەوە گرتە بەر.

۱۵ بێتە ئەیوانێ ژ خەلوێ حۆریا قودسی سرشت
سەدهەزاران حۆری قودسی تێن لیقایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**ئەیوان**: هەیوان و بەربێلایی؛ **خەلو**: بەتاڵ؛ **خەلوە**: جێگەی تەنهایی؛ **حۆری**: کیژی بەهەشت؛ **قودسی**: ممبارەکی خودایی؛ **حۆری قودسی**: کیژە جوانەکەی ناو بەهەشت؛ **تێن**: دێن؛ **لیقا**: تووش بوون و دیدەنی.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر بێت و جارێک لە جاران ئەو جوانچاکەی یاری من ـکە یەکێکە لەو کیژە بەهەشتییانە کە لەپاکی دروست کراون و ئاکاری پیرۆز و ممبارەکنـ لە گۆشەی تەنهایی دەرکەوێ و بێتە بەر هەیوان و سەیوانی ماڵەگەورە، نەک هەر ئێمە ئاپۆرەی دڵداران، بگرە بە سەتانهەزار لە کیژەکانی ناو بەهەشتی خوداش، بە سینەباز لە

بەهەشت باز دەدەن بۆ ئەوە بێنە دیدەنی دیداری یاری ئێمە و لە ڕاستە و چۆپە دەوری لێ دەدەن.

١٦ ما «مەلایێ» ئەز لەبێ لەعل ئابێ حەیوان بت نەسیب
قودسیان ڕاگرتیێن دەستێ دوعایێ ڕاست و چەپ

**مانای وشەکان:**

**ما**: تۆ بڵێی، ئاخۆ ئەبێ؛ **ئەز**: لە؛ **لەب**: لێو؛ **لەعل**: بەردێکی بەقیمەتە کە زۆر لە شاعیران بە لێوی یاریان شبهاندووە؛ **ئاب**: ئاو؛ **حەیوان**: ژیان؛ **بت**: ببێت؛ **نەسیب**: بەش؛ **قودسی**: ئەو فرشتانەی کە لە ئاسماندان؛ **ڕاگرتیێن**: ڕایان گرتووە (یان: **ڕاکردیێن** واتا: بڵندیان کردووە)؛ **دوعا**: نزا و پاڕانەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەوندە بە زەلیلی و هەژاری لەبەر خودا پاڕاومەتەوە کە جارێک لە عومراتمدا ئەو لێوە ناسک و لەعل ڕەنگانە ڕامووسم و ئاوی ژیان و نەمردنیان لێ هەڵمژم؛ کە مەلائیکەتەکانی ئاسمانیش بەزەییان بە منی کلۆڵدا هاتۆتەوە. ئەوانیش هەموو بۆ یاریدەی من، دەستی نزایان بەرز کردۆتەوە و لە ڕاستە و چۆپەوە بۆم دەپاڕێنەوە کە نزام ڕەوا بێ.
هۆی مەلا! تۆ بڵێی خوا ئەو ئاواتەت پێک بهێنێ و جارێک لەو لێوە سوور و ئاڵە- کە وەک یاقووت و لاڵە- مژێک بمژم و بەو ئاوی حەیاتەی کە لە لێوی ئەودایە منیش لە مردن ڕزگارم ببێ و ببمە خدری زیندەیەک؟



# چەپ و ڕاست

ا  نێرگزێن شـەنگ دەمەسـتن چـەپ و ڕاسـت
سـاقیان جـام د دەسـتن چـەپ و ڕاسـت

**مانای وشەکان:**

**نێرگز**: نەرگس؛ **شەنگ**: شۆخ؛ **مەست**: سەرخۆش؛ **ساقی**: مەیگێڕ؛ **جام**: پیاڵە.

**پوختەی مانا:**

چاوەکانی یارم- کە وەک نەرگسی شۆخ و شەنگن- چ چاوی ڕاست و چ چاوی چەپی، مەست و خومارن. پیاو لە دیتنیان مەست و سەرخۆش دەبـن و بـە ڕاسـتە و چەپـەدا دەکەون. دوو چاوەکانت وەک دوو مەیگێڕی شۆخ و شەنگ و چەلـەنگ، بـە ڕاسـتە و چەپەدا مەی دەگێڕن و سەرخۆش و کەلەلامان دەکەن.

٢  ڕاست و چـەپ تـێن جگـەر و سـینە کـولاب
عەرعەرین شەنگ د لەستن چـەپ و ڕاسـت

**مانای وشەکان:**

**تێن**: دێن؛ **جگەر**: جەرگ؛ **سینە**: سینگ؛ **کولاب**: قولاپ؛ **عەرعەر**: دارێکـی ئـازادە و زۆر ڕاست و پەنگ هەڵدەچێ، شاعیران بەژنی یاری پێ دەشوبهێنن. **لەستن**: کـورت کراوی وشەی **لەیستن**، واتا: ڕەقس و سەما کردن و خۆ بادان بە لار و لەنجەوە.

**پوختەی مانا:**

لە وەختێکدا کیژە قەد باریکەکان ــکە بەژن و بالایـان وەک داری عەرعـەر شـەنگ و شل و شۆخنــ دەستیان بە ڕەقس و سەماکردن کرد و بە ڕاستە و بە چەپەدا خۆیـان

بادەدا و دەلەرانەوە، جەرگ و سینە و هەناوی عاشقان وەک وە بەر بارانی تیران کەون، وا بوون و بە ڕاستە و چەپەدا دەکەوتنە مەیدانەوە. مژۆڵیان وەک قولاپ لـە جـەرگان گیرکەن، وا بوون.

٣ تـوخ و عـالا کـو خویـا بـوون ژ عەجـەم
عـەرەبان تیـپ شکەسـتن چـەپ و راسـت

**مانای وشەکان:**

**توخ**: نیشانەی سەرکردەیی مغولان بووە، بریەتی لە چەپکێک مووی یاڵی ئەسـپ کـە بنەکەی دە زێڕ گیراوە؛ **عالا**: ئالا؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **تیپ**: دەسـتەی لەشـکر؛ **شکەستن**: شکان؛ **عەرەب**: لە ڕاوێژی شاعیراندا بە شـتی ڕەنـگ ڕەش دەڵـێن. زۆریـان زولفـی ڕەشی یاریان بە عەرەب شبهاندووە. هەروەها عەجەم لە شیعری شاعیراندا بە ڕەمـزی سپییەتی داندراوە.

**پوختەی مانا:**

وا دیارە مەلا دەیەوێ بڵێ: یار بە دەستی سپی و ناسـکی، زولفـی لـە سـەر ڕوو لاداوە. ڕەنگە نیازی لە توخ شانە یان کەزیبەندی زێڕ و نیازی لە ئـالا سەرپۆشـی ڕەنگاوڕەنـگ بێ. واتا: یار بە دەستە سپییەکانی کە زولفە ڕەشەکانی لە سەر ڕوو لادا و شانەی زێـڕی دە بسکان گیراند، دەستە-دەستەی زولفان بە سەریەکدا شکان و چین-چین بوون.

٤ بـەر ڤـە شـەرقێ د سـەحەر وەسـتاین
هینـدووێن ڕۆژپەرسـتن چـەپ و راسـت

**مانای وشەکان:**

**بەر ڤە شەرقێ**: ڕوو بە ڕۆژهـەلات؛ **سەحەر**: بـەیانی زوو؛ **هینـدوو**: خەڵـکی هینـد؛ زۆر لـە شاعیرانی کۆن، خاڵی ڕەش و بسک و زولفی یاری خۆیان بە هیندوو شبهاندووە؛ چۆنکـە بـە لای ئەوانەوە هیندوو کافرن و کافریش بە ڕەنگی ڕەش، کە نووری ئیمانی تێدا نییە، ناسراوە.

**پوختەی مانا:**

لە بەرەبەیاندا ئەو زولف و بسکە ڕەشانەی یارم کە بە لای ڕاست و لای چەپی ڕوخساریدا هاتبوون، هەر دەتکوت لەو هیندییانەن کە ڕۆژ دەپەرستن و بەیانییان بەرەو ڕۆژ دەبن و کڕنووشی بۆ دەبەن. چونکە ڕوخساری یار وەک ڕۆژە و لاجانگی وەک سپیایی بەیانی پێش تاوهەڵاتە و ئەو بسکانە وەک هیندووی ڕۆژپەرست، ڕەش و کافری بێ بەزەیین دەگەڵ عاشقان.

٥ قەیسەرێ ڕوومێ ل سەرحەددێ فەرەنگ
تۆق و زنجیر ڤەبەستن چەپ و راست

**مانای وشەکان:**

**قەیسەر**: لەقەبی ئیمپراتووری ڕۆم. **ڕووم**: ڕۆم، سەرزەمینی تورکیای ئێستا؛ **سەرحەد**: سنوور؛ **فەرەنگ**: فەرانسە یان ئورووپا بە گشتی؛ **تۆق**: ئاڵقەی ئاسنین؛ **ڤەبەستن**: بەستنیەوە.

**پوختەی مانا:**

بسک و کەزی یارم کە بە زنجیرە چین بە چین و ئاڵقە_ ئاڵقە دەوری ڕوخساری سپی و ناسکیان داوە، بەوە دەشبهێندرێ کە قەیسەری ڕۆمێ دەوری وڵاتی فەرەنگانی بە زنجیر و ئاڵقەی لەشکر دەورە دابێ.

٦ هەردوو دەستێن خوە حەمایل شەڤەکێ
مە ژ بۆ یارێ د خۆستن چەپ و راست

**مانای وشەکان:**

**دەستێن**: دەستان، دوو دەست؛ **حەمایل**: بەندی شمشێر و بەندی نوشتە کە دە مل دەکرێ و بە تەنیشتدا دێنە خوار؛ **شەڤەکی**: شەوێک.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هەموو ئاوات و نیازمان هەر ئەوە بووە کە تەنیا شەوێک لە ژیانماندا هەردووک دەست و باسکمان لە گەردنی یار وەک حەمایەڵ هاڵابا و لە ڕاست و چەپەوە بە خۆمانەوە کوشیبا.

٧ ڤە (ڤەه) «مەلێ» سوڕپەرییا حۆری سرشت
سەد مەلەک دەست ب دەستن چەپ و ڕاست

**مانای وشەکان:**

**ڤە**: ئەوە؛ **ڤەه**: عەجەبا؛ **مەلێ**: مەلا؛ **سوڕ**: دڵکێش و ڕۆحسووک؛ **پەری**: جندۆکەی جوان؛ **حۆری**: کیژی بەهەشتی چاوڕەش؛ **سرشت**: ڕسکان.

**پوختەی مانا:**

ئەوە (یان: سەیرە) مەلا تۆ ناتوانی دەستەملان بوونی بخوازی! ئەو پەرییە دڵکێشەی کە وەک حۆری بەهەشت خولقاوە، هەمیشە سەد خزمەتکاری کچی پاکی وەک فریشتەی خودا، دەستیان بە دەستییەوەیەتی؛ لە ڕاست و چەپەوە پاسەوانی لێ دەکەن و چاوی لێ خافڵ ناکەن تا وە گیر تۆ کەوێ و دەستەملانی ببی.



# گوڵباران

آ گـەر ژ وێ حـۆری سرشـتێ عیشـوەیەک ئیزهـار بـت
دێ ببـت نـارێ خـەلیلوللاه و دووژەهـ سـار بـت

**مانای وشەکان:**

**گەر**: ئەگەر؛ **ژ وێ**: لەو مێوینە؛ **حۆری سرشت**: وەک حۆری ڕسکاو؛ **عیشوە**: ناز و غەمزە؛ **ئیزهار**: دیاریدان؛ **دێ**: بێشک؛ **ببت**: دەبێت؛ **نار**: ئاگر؛ **خەلیل**: دۆست؛ **خەلیلوللا**: دۆستی خودا. نیاز برایم پێغەمبەرە؛ **دووژەه**: جەهەننەم؛ **سار**: سارد؛ **بت**: ببێ.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ژیانمان جەهەننەم بێ، یان وەک برایمی پێغەمبەر دە ناو ئاگر هاوێژرابین، بەو مەرجە ئەو حۆرییە جوانچاکە بە نازەوە گۆشەیەکی چاومان بۆ دەرخا و لێمان بڕوانێ، ئاگر بە دەردی ئاگرەکەی برایم دەچێ و تەنانەت جەهەننەمیش بێ، بێشک سارد و سڕ هەڵدەگەڕێ.

مەلا لەو شیعرەدا باسی برایم پێغەمبەرمان بیر دەخاتەوە کە نەمرود بە تاوانی بتشکاندن خستییە ناو ئاگرەوە و خودا فەرمانی بە ئاگر دا کە سارد و سەلامەت بە و ئازاری مەدە! دەڵێ: منی دڵدار خۆم و دڵەکەم کەوتووینە ناو ئاگری ئەوینێکەوە کە هیچ لە ئاگری نەمرود و بگرە لە ئاگری جەهەنەمیش کەمتر نییە. جا ئەگەر خوای کردبا ئەو نازداری باوانە بەو چاوانەی، بە نازێکەوە لێی ڕوانیبام، لێم ڕوونە ئاگر و گڕپەی دڵی منیش بە دەردی ئاگرەکەی برایم سارد دەبۆوە؛ بەڵکە ئەگەر جەهەنەمیشم لە دڵدا بوایە تینی دادەمرکا.

٢ وەر ژ بەر پەردێ یەدێ بەیزا بە موعجیز بێتە دەر
شەمس و کەوکەب دێهلێن عالەم تژی ئەنوار بت

**مانای وشەکان:**

**وەر**: وە ئەگەر؛ **ژ بەر**: لە پشت، لە بن؛ **پەردێ**: پەردەیرا؛ **یەدێ بەیزا**: دەستی سپی؛ **موعجیز**: ئەوی کەسێ تر نییەتی؛ **شەمس**: خۆر؛ **کەوکەب**: ئەستێرە؛ **دێهلێن**: هەلدێن؛ **عالەم**: هەموو دنیا جگە لە خوا؛ **تژی**: پڕ؛ **ئەنوار**: ڕۆشناییگەل.

**پوختەی مانا:**

مەلا دەیەوێ دەستی حەزرەتی مووسامان وەبیر بێنێتەوە کە مۆجزات بووە و هەرگا ناویەتە باخەلی و دەریهێناوەتەوە، لە سپیایەتیدا شۆقی داوەتەوە.
گوتمان ئەگەر لێی ڕوانیبام ئاگری دلم دادەمرد؛ خۆ ئەگەریش دەستە سپی و ناسکەکەی ـکە چەپێکی دەبەر دەستە مۆجزاتەکەی مووسادا نییەـ لەو دیو پەردەوە دەرێنێ و پیشانی دنیای بدا، وەک هەموو ئەستێرە و خۆر، وێکڕا هەلاتبن و ڕووناکایی بدەن، ئاوا هەموو دنیا پڕ دەبێ لە ڕووناکی و شۆقدانەوە.

٣ وەر ژ عەکسا خەمریان قەوسێقەزەح دەت یاسەمین
دێ گول و ڕەیحان ببارن، تێکوتێک گولزار بت

**مانای وشەکان:**

**عەکس**: تیشکدانەوە؛ **خەمری**: پارچە قوماشێکی سوورە کە ژنان پرچی سەر توێلیانی پێ گرێ دەدەن؛ **خەمری**: ئەو پەرچووکانەیە کە بەسەر توێلدا دێن و لە ناوەڕاستی هەنیەدا هەلدەپاچرێن؛ **قەوسێقەزەح**: کۆلکەزێرینە؛ **دەت**: بدات؛ **یاسەمین**: گولی یاسەمەنە کە زۆر سپی و زۆر بۆنخۆش و زۆر ناسکە؛ **دێ**: بێشک؛ **تێکوتێک**: سەرلەبەر، گشتلەگشت؛ **گولزار**: گولجاڕ؛ **بت**: ببێت.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ڕوخساری یارم- کە وەک سەرپەڕی گوڵی یاسەمەنە، سپی و ناسکە و لە بۆنخۆشیدا لەو زیاترە- تیشک بداتە دەسرۆکەی سووری لە هەنیە گرێدراوی، یان تیشک بداتە ئەو پەرچووکانەی کە بە سەر توێڵیدا هاتوون و لە ڕەشییان دەبریقێنەوە، ئەوسا تیشک بداتەوە و تیشکەکە بگەڕێتەوە بۆ سەر گۆنای یار ـکە وەک پەڕی سوورەگوڵە ـ ئەوندە ڕوشنایی ڕەنگاوڕەنگ پەیدا دەبن کە کۆلکەزێڕینەی لێ دروست دەبێ. کۆلکەزێڕینەش نیشانەی پاش بارانە و بارانەش هۆی شین بوونی گیا و گوڵ و ڕێحانە. کە وا بوو هەر کە یار ڕووی نیشان بدا و خەمری و پەرچووکان ڕووناک بکات و ئەوانیش تیشکی بگەڕێننەوە، هەموو دنیا سەرلەبەری دەبێتەوە گوڵجاڕ و لە هەموو شوێنان گوڵ و ڕێحانە بە بارە و خۆشی و گەشی دادەبارێ.

۴ شەمعێ دێ جان دت ژ شەوقێ بێتە بەر سوبحێ نەفەس
نارت ئاخر گەر ب موویەک بەحسێ زولفا یار بت

**مانای وشەکان:**

**شەمع**: مۆم؛ **دێ**: بێشک؛ **جان**: گیان؛ **دەت**: بدات؛ **بێتە بەر**: بچتەوە بەر؛ **سوبحێ**: سبەینێ؛ **نەفەس**: هەناسە؛ **نارت**: ناگاتە؛ **ئاخر**: دوایی؛ **گەر**: ئەگەر؛ **بەحس**: لێدوان؛ **زولف**: کەزی.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر هەر لە هەوەڵی شەوێڕا دەس بکرێ بە باسی تاقە موویەک لە زولفی یار، شەو خەلاس دەبی، بەرەبەیان هەناسە دەدات و ڕۆژ دەبێتەوە، مۆم دەتوێتەوە و دەکوژێتەوە؛ بەڵام تاریفی جوانی و درێژی ئەو تەنیا مووە هەر درێژەی پێ دەدرێ و بە کەس نابڕێتەوە.

هەر لەم مانایەدا شاعیرێکی فارس گوتوویە: ڕۆژی قیامەت کە دەڵێن درێژییەکەی هەزار ساڵە، چی دەگەڵ دڵی پڕ لە گازندەی ئێمەی پێ دەکرێ؟! ئەوا سەری زولفی

تۆ بە داستانی دڵداری ئێمە کورت بۆتەوە.[1]

«نالی» خۆشمان، چەند خۆشی فەرمووە کە دەڵێ:

هــەر پەرچــەم و پێشــانییە فیکــری شــەو و ڕۆژم

هــەر گــەردن و زولفــە ئەمــەلی دوور و درێــژم

۵ سیلسـیلا بەحسـێ ژ خوونـا دل بـەر ئـان زولفـا بچـین

دێ خـەتا بـت ناڤـێ میسـک ئـەر نافـەیێ تاتـار بـت

**مانای وشەکان:**

**سیلسیلە**: زنجیر و زنجیرە؛ **ژ خوونا**: لە خوێنی؛ **بەر ئان**: لەسەر ئەو؛ **بچین**: چیندار؛ **خەتا**: غەڵەت؛ **ناڤ**: ناو، ئیسم؛ **میسک**: نەوعێک ئاسک هەیە کە لە هەلاتن و ماندووبوونی زۆرەوە خوێن دەناوکییەوە دەتزێ و خوێنەکە ڕەش هەڵدەگەڕێ و وشک دەبێتەوە و وەک دەناو کیسەیەکدا بێ، بە ناوکییەوە تەکەتەکی دێ و لە دواییدا لە غارداندا لێی دەکەوێت. ئەو خوێنە وشک هەلاتووە عەترێکی زۆر بۆنخۆشە و ناوی لێ نراوە میسک یان موشک. جا وا زانراوە کە ئاسکی دەشتەکانی چین و خەتا و تاتارستان، میسکی هەرەچاکیان لێ بەرهەم دێت؛ **ئەر**: ئەگەر؛ **نافە**: ناوکی ئاسکی میشک؛ **خەتا**: ناوە بۆ مەڵبەندەکانی باکووری چین کە ئێستا بریەتییە لە مەنچۆری و مەغولستان و تورکستانی ڕۆژهەلاتیی؛ **تاتار**: ناوی عەشایرێکی تورکە کە بە ولاتەکەشیان هەر تاتاریا دەڵێن.

**تێبینی**: مەلا لەو بەیتەدا گاڵەی کردووە! زۆر لە وشەکانی هەڵدەگرن دووجار مانا بکرێن؛ **خەتا**: هەم ولاتی خەتا، هەم غەڵەت؛ **چین**: هەم ولاتی چین، هەم چین لەسەر چین کەوتن و بە سەریەکدا شکانی مووی کەزی.

---

[1] حافزیش نزیک لەو هەوایە دەڵێ:

کوتە نکنـد بحث سـرِ زُلف تو حافظ پیوستە شُد این سلسلە تا روز قیامت

**پوختەی مانا:**

خوێنی دڵی دڵداران کە لە تاوی کەزیە ڕەشە پرچینە چین لەسەر چینەکەی ئەو نازدارە هەڵقولاوە و ڕژاوە و بەو تاڵە زولفانەوە بەندە، ئەوندە لە سایەی زولفی تۆوە بۆنی خۆش بووە کە هەرکەسێک باسی میسکی ناو ناوکی ئاسکی چین و خەتا و تاتار بکا و بڵێ ئەو خوێنی دڵە و ئەو مێشکی ئاسکە وەک یەکن، غەڵەت دەکا و بە هەڵەدا چووە. بۆنی خوێنی دڵمان بە هەوای زولفت هەزار قات لە بۆنی خوێنی وشکهەڵاتووی ناوکی ئاسکی میشک خۆشترە.

٤ تەوقێ گەردەن حەلقەیێ زوننارێ زولفا یارێ من
دێ کلیتا کەلبێ عشقێ حەلقەیا زوننار بت

**مانای وشەکان:**

**تەوق**: قەڵادەی مل؛ **حەلقە**: تاڵقە؛ **زوننار**: کەمەربەندی ئاوریشمی خاچپەرستان؛ **کلیت**: کلیل، هاچەر؛ **کەلب**: سەگ.

**تێبینی**: لەم بەیتەدا مەلا داستانی شێخی سەنعانمان بیر دەخاتەوە کە بۆ کچێکی خاچپەرست دەستی لە دین هەڵگرت؛ قورئانی سووتاند؛ شەرابی خواردەوە؛ زوننـاری بەست و بوو بە بەرازەوانی ماڵی دلبەری.

مەلا دەگەڵ ئەوەشدا کە وەفا و ئەمەگی شێخی سەنعانی بەرانبەر بە گڕەی ئەوین بە لاوە پەسندە، خۆی لە ئەوینداریدا ئەمەگدارتر نیشان دەدا و دەڵێ من خۆم بە سەگی ئاستانەی دلبەر دەزانم و ئاواتم ئەوەیە قەڵادەی ملم و قفڵ و ئاغزوونەکەی لە ئاڵقەیەکی زوونـاری بەژنی یار بێ. جا چونکە پرچ و کەزی یاری من لە ناو قەدی هاڵاوە و ئیحتیاج بە کەمەربەندی ئاوریشم نییە و هەر زولفە پڕ چینەکەی جێگەی زوونـاری پڕ کردۆتەوە، من ئاڵقەی زولفیم بە نەسیب دەبێ. ئەگەر ڕاستیشت دەوێ قفڵ و کلیلی قەڵادەی سەگی ئاستانەی عیشقێ هەر دەبێ ئاڵقەی زولف بێ.

زۆر لە سۆفییان دۆعایان کردووە کە خودایە وا پکەی وەک سەگ وەفادار بم.

**پوختەی مانا:**

با تۆقی گەردەنم ئالقەی زوننارى زولفی یارم بێ. ئاخر هەر دەبێ قفلی قەلادەی سەی عیشقێ ئالقەی ئەو زوننارە بێ کە زولفییەتی. «مەحوی» دەلێ:

دەگەڵ دەستی مەلا ڕێک ناکەوێ زوننارى زولفی یار
وەکوو شێخ ئیختیاری مەزهەبی تەرسا نەکەم چبکەم؟

مەولەوی تاوەگەوزیش فەرموویە:

بێتەناب زولف مەحبووب نە گەردەن    حەیفەن وە قابز گیان تەسلیم کەردەن

**٧** عەقدێ ئیحرامێ د عیشقێدا کـو پـیرێ عیشـق بەسـت
دێ چ غەم گەر خەرقە ڕەهنێ خانـەیێ خـەممار بـت[١]

**مانای وشەکان:**

**عەقد**: نیەت هێنان؛ **ئیحرام**: ڕۆژانی جەنگەی حەج کە حەجاج جلکـی خۆیـان فـڕێ دەدەن و پەشتەماڵ و فۆتە دەبەر دەکەن؛ **پیرێ عیشـق**: مامۆستا و ڕێبەری عاشـقان، یان: ئەوی لە ئیشقێدا پیر بووە؛ **بەست**: دابەست؛ **دێ**: ئیدی، ئیتـر؛ **چ غـەم**: قەیـدی چییە، چ دەبێ؛ **خەرقە**: بالاپۆشی پڕ پینەی دەروێشان؛ **ڕەهن**: بارمتـە؛ **خانـە**: مـاڵ و دوکان؛ **خەممار**: بادەفرۆش.

**پوختەی مانا:**

مەلا دەیەوێ تەریقەتی خۆی لە تەریقەتی وشکە سۆفییە ڕواڵەتبینەکان جیا کاتەوە؛ دەلێ: ئەوان دەچنە حەج، نیەتی ئیحرام دادەبەستن، بۆ ئەوە دەوری ماڵی کابە بدەن جلکەکانیان دادەکەنن و تووڕی هەڵدەدەن. ئێمەش بە شوێن پیری تەریقەتی عیشقدا حەجی خۆمان هەیە. کابەی ئێمە ماڵی یار نییە؛ بەڵکوو خودی یـارە و یارەکـەش لـە هەموو جێگا هەیە و لە هەموو ئاقارانەوە دیارە... لـە حـەجی خۆمانـدا، ئەگـەر پـیری تەریقەت نیەتی ئیحرام دادەبەستێ و ئێمەش پەیڕەوی لێ دەکەین، هەموو شـتێکمان

---

١. ئاخر حافز دەلێ:

گـر مُـرید راه عـشقـی فـکـر بـدنامی مکن    شیخ صنعان خرقه رهن خانەی خمّار داشت

تەنانەت دنیا و قیامەت و ئاواتی بەهەشت و ترسی جەهەننەمیشمان تووڕهەڵدەدەین و تەنیا و تەنیا یارمان لەبیرە و یار دەپەرستین و هیچی تر. جا لە وەختی وادا کە خەرقەو مەرقە فڕێ دەدرێ و تازە نامانگەرەکە، چی ئەبێ ئەگەر ئەو خەرقەیە لە دووکانی شەرابفرۆشدا لە گرێوی شەراب داندرابێ؟! بگرە لەوە چاترە کە بە خۆڕایی فڕێی بدەین. ناشبێ لۆمەی شێخی سەنعان یا من یان هەر ئەویندارێکی ڕاستی دیکە بکرێ کە چۆن جبە بە زوننار دەگۆڕینەوە. بە لای ئێمەوە یار لە هەموو شوێنێکە و هەموو شت نوێنەری یارە.
حافزی شیرازی -کە یەکێک بووە لە دەستەی ئەو دڵدارانە- دەڵێ: لە مەیخانەی زەردەشتییان نووری خودا دەبینم.[1]

٨ گەزمەیەک قەوسێ شەڤین عاشق بە نێڤا دل کەڤت
دێ ژ جان دەستان بشووت خاسما کەڤان نووبار بت

**مانای وشەکان:**
**گەزمە**: سەرەتیری چەقۆیی؛ **قەوس**: کەوان؛ **شەڤێن**: دەشەوێدا؛ **شەڤین**: چەماو؛ **نیڤ**: ناوەڕاست؛ **کەڤت**: بکەوێ؛ **دێ**: بێشک؛ ژ **جان**: لە گیان؛ **دەستان بشووت**: دەستان دەشوا؛ **خاسما**: خۆ بە تایبەتی، مەخسووسەن؛ **کەڤان**: کەوان؛ **نۆبار**: هەوەڵجار؛ **نووبار**: کچێکی تازە مەمکی خڕکردووە.

**پوختەی مانا:**
ئەوینی ڕاستەقانی (عیشقی حەقیقی) کارێک بەسەر ئەویندار دێنێ کە ئەوە هیچ هۆش و دینی لێ دەستێنێ، بگرە هەر خودی خۆشی لە بیر نامێنێ و دەبێتە زیندوویێکی مردوو یان مردوویێکی زیندوو. ئەوانەی بە ئاگری ئەم ئەوینەوە نەتلاونەوە، نازانن خەبەر چییە... ئەگەر سەرە تیرێکی عیشقێ لە برۆیەکی کەوانی چەماوەدا، لە نیوەشەوێکا ناوەندی دڵی دڵدارێک بپێکێ، ئەو دڵە دەسبەجێ دەست

---
١. در خرابات مُغان نور خدا می‌بینم

لە گیانی خۆی دەشوا. خۆ نەخوازە و بەتایبەتی کە ئەو تیرە لە کەوانی برۆی کیژۆڵێکی تازە مەمک خڕکردوو دەرچێ و ئەوە هەوەڵجاریش بێ کە دڵەکەی کردۆتە نیشانە. چۆنکە هەوەڵ نیگای پێک گەیشتنی دڵدار و دڵبەر، هەرگیز شوێنەواری کوێر نابێتەوە. ئەو هەوەڵ تیری نیگایە لە هەموو برینگەرێک کاریگەرترە و لای عاشق پیرۆزترین شتە. «مەولەوی تاوەگەوزی» دەفەرموێ:

بێ زام خەدەنگ موژەی مەهرووان    نەنگەن وە سارای قیامەت لوان

واتا بە بێ برینی تیری مژۆڵی ماڕوخساران، شەرم و شوورەییە ڕۆشتن بۆ دەشتی قیامەت.

٩ وەر ژ قەوسەینان ب میزان بێتە دەر جۆتەک خەدەنگ
دێ جگەر بت پارە-پارە، سینە تارومار بت

**مانای وشەکان:**

**وەر**: وە ئەگەر؛ **ژ قەوسەینان**: لە دوو کەوانان؛ **ب میزان**: بە ڕێکوپێکی؛ **جۆتەک**: جووتێک؛ **خەدەنگ**: تیر؛ **جگەر**: جەرگ؛ **بت**: دەبێت؛ **پارە_پارە**: لەت_لەت؛ **تارومار**: تەرت و توونا.

**پوختەی مانا:**

گوتمان ئەگەر سەرەتیرێک لە کەوانی برۆوە وە ناوەندی دڵ کەوێ، دڵ دەست لە گیان دەشوا. تیرێک لە کەوانەوە، واتا ئەگەر گوشەی تاکە چاوێکمان بداتێ. ئەدی ئەگەر یار چاومان پێ هەڵێنێ و بە هەردووک چاوە مەستەکانی لێمان بڕوانێ، ئەوسا دوو تیر بەرەو هەناومان دێن و نیشانەش ئەپێکن. چونکە میزان کراون و سێرە پێ گیراون. ئەو کاتە جگە لەوە دڵ دەست لە گیان دەشوا، هەم جەرگیش لەت_لەت دەبێ و هەم سینگ و هەرچی لە بن سەرپۆشی سنگدایە دادەفەتێ و تەرتوتوونا دەبێ.

١٠ خوون ژ میلاکێ ب دەربا خەنجەرێ گەر بێتە دەر
بوو شەهیدێ عیشقێ ئێدی دێ ژ کوو هشیار بت

**مانای وشەکان:**

**خوون**: خوێن؛ **میلاک**: جەرگ و هەناو؛ **دەرب**: لێدان؛ **شەهید**: کوژراوی ڕێگەی ڕاست، یان: کوژراوی خۆشەویس؛ **ئێدی**: ئیتر؛ **ژ کوو**: لە کوێ؛ **هشیار**: لەسەر هۆش.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی بە دەردی ئەوین دووچار نەبوون و ئاگایان لە حالی من نییە، لۆمەم دەکەن کە بۆچی هۆشت لەسەر خۆت نییە؟ بۆ وڕاوە دەکەی؟ بۆ باسی زوننار و شەراب و مەراب دەکەی؟ کورە ئاخر کەسێکی بە خەنجەری تازەساوی گۆشەی بڕۆ و مژۆڵی دڵبەرێکی وا نازدار جەرگ و هەناوی کەوتبێتە دەشتەوە و بووبێتە شەهیدی ڕێگای ئەوین، چۆن دەتانەوێ هۆشی دنیای دەسەردا بمێنێ و وەک ئێوەی بێخەبەر پێتان خۆشە، بتاندوێنێ؟!

۱۱ دێ ژ وان لەعلان شفایێ دل ب قانوون تەلبە کت
دا ئیشارەت خۆش بکن هەرچی کەسێ بیمار بت

**مانای وشەکان:**

**دێ**: لازمە، وا باشە؛ **ژ وان**: لە ئەوان؛ **لەعل**: گەوهەرێکی ڕەنگ ئاڵە شاعیران لێوی ئاڵی گەشی یاریان پێ شبهاندووە؛ **شفا**: لە نەخۆشی چاک بوونەوە؛ **قانوون**: ڕێوشوێن؛ **تەلبە**: داوا؛ **کت**: بکات؛ **ئیشارەت**: دوان بە دەست یان بە چاو؛ **خۆش**: ساغ؛ **بکن**: بکەنەوە؛ **بیمار**: نەخۆش و لەش بەبار.

**تێبینی**: نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێ کە «**ئەبوعەلی سینا**» یان «**ئیبنوسینا**» بۆ بژیشکی لە هەموو کەس بەناوبانگتر بووە و بە نموونەی حەکیمی هەرەگەورە ناوی هاتووە. ئەبووعەلی سینا سێ کتێبی بە ناوی: «*ئیشارەت*»، «*قانوون*» و «*شفا*» نووسیوە. مەلا ناوی ئەو کتێبانەشی بردووە و هەر یەک لەو ناوانە دووجار دەبێ مانایان لێدرێتەوە.

**پوختەی مانا:**

ئێمە کە تا ئێستا هەر باسی تیر وە دڵ کەوتن و جەرگ لەت بوون و هەناو بەخەنجەر دەرهاتنمان کرد، نابێ لامان وا بێ کە دڵبەر هەر وازی لە جزیادان و کوشتن و برینە و

دڵخۆشیی بە دیمەنی زام و برینە. نەخێر یار هەروەک دەردمان بۆ دەنێرێ، دەرمانیشی لە لایە. ئەو بریندار و لەشبەبارەی کە باری گرانی دڵداریی لەسەر شانە و باری هەژاریی لەسەر لێوانە و هێندە دەردی گرانە کە بە کتێبەکانی ئەبووعەلی سینا (ئیشارەت و شفا و قانوون) چاری نایە، چاریان وا لای جووتە لێوی ئاڵی بە ڕەنگی لاڵەوە. بزەیەکی ئەو لێوانە، دەرمانی هەموو دەردانە. هەرکەسێ دەردەدارە، با لەبەر ئەو لێوانە بپاڕێتەوە تا لەشساغی بەسەر بگرێتەوە و لە هەموو کەس چاکتر بێتەوە.

١٢ بولبولێ مەجرووحێ عیشقێ تاقەتا خاران نەهن
دێ کولاڤا ڕیشێ سینە بشکوەک بێخار بت

**مانای وشەکان:**

**مەجرووح**: زامدار؛ **کولاڤ**: چنگورکی باڵندەی ڕاوکەر؛ **ریش**: زام؛ **بشکۆ**: خۆنچەگوڵ، یان: گوڵووکی داری بەریی؛ **خار**: دڕک؛ **تاقەت**: تابشت؛ **نەهن**: نییە.

**پوختەی مانا:**

دەست لە لۆمەم هەڵگرن. بولبولێکی کە دڵی زامداری تیری ئەوینە، هێندە دڵناسک بووە کە تاقەتی تێڕاچوونی دڕووی سەرکۆنە و لۆمەی ئەغیاری پێوە نەماوە. بەڵکوو ئەگەر خۆنچەگوڵێکی بێ دڕکیشی وە سینگ کەوێ، وەک بە چنگۆڕکی باڵدارێکی گۆشتخۆر لێی درابێ، دەڕووشێ. واتا گوڵیشی وێکەوێ بریندار دەبێ.[1]

١٣ هەر دلێ بازی سیفەت دێ سەیدێ تەیهوو نک وە بێ
فەرر و پەروازێ هومایێ و پەنجەیێ شنقار بت

**مانای وشەکان:**

---

١. لێرەدا چیرۆکی مەنسووری هەلاجمان بیر دەخاتەوە کە خەڵک بەرد و تیریان تێ دەگرت. جونەیدی بەغدادی ـکە هەواڵ و هاودەردی بووـ خونچە گوڵێکی پێدا دا، هاواری کرد. گوتیان: بۆ تیر نانالی، چۆن لە گوڵ دەنالی. گوتی گوڵێک دۆست پێتدا بدا لە هەزار تیر و شیری بێ خەبەران بەژانترە. «هەژار»

**بازی**: بازی ڕاوی؛ **سیفەت**: ڕەوشت و ئاکار؛ **دێ**: بێشک؛ **سەید**: نچیر؛ **تەیهوو**: سوێسکە؛ **نک**: کن؛ **وە**: ئێوە؛ **فەرر**: شکۆ و گەورەیی؛ **پەرواز**: فڕین؛ **هوما**: پیرۆزە، باڵداری بەختەوەری؛ **شنقار**: شمقار، کە وەک باز دەچێ و لە باز گەورەتر و بەهێز و گوڕترە و لە ڕاو، چابکترە.

**پوختەی مانا:**

هەر دڵێکی کە ئاکاری لە ناو خەڵکا وەک ئاکاری بازە دەناو مەلاندا و چاوی لە بەرەژوور چوونە و بەرزەفڕ و بەدەمارە و ڕێگەی خۆی باش شارەزایە، حەز و منە دەکا کە تەنانەت بۆ سوێسکەیەکی ئاستانەی تۆش ببێتە نێچیر؛ هەر ئەوندە لە تۆ نزیک بێ و جارێک چاوی پێت بکەوێ؛ چۆنکە دەزانێ نێچیری بەردەستی تۆ حەتتا ئەگەر سوێسکەیەکیش بێ، شکۆ و پایەبەرزیی پیرۆزەی پیرۆز و هێز و گوڕ و چابکی شمقاری وەگیر دەکەوێ.

**۱۴**
یار دێ حاکم بتن قەولێ ڕەقیبان گۆهـ نەدت
شاهێ مولکێ دلبەرێ دێ فاعیلەک موختار بت

**مانای وشەکان:**

**بتن**: ببێ؛ **دێ**: دەبێ؛ **قەول**: گفت؛ **ڕەقیب**: چاونەزێر و شۆفار؛ **گۆهـ**: گوێچکە؛ **نەدت**: نەدات؛ **فاعیلەک موختار**: خاوەن دەسەڵاتی بێ پرسوڕا کە هەرچی بیەوێ، بیکا و کەس نەتوانێ چۆن و بۆچی پێ بڵێ.

**پوختەی مانا:**

شکایەتم لەوانە نییە کە لای یار خراپەم دەڵێن. بۆرە گلەییم لە یارە کە بۆچی ڕێگا دەدا لای ئەو خراپی من بڵێن. ئەو یارە کە هەر خۆی حاکمە و دەبێ حاکمی موڵکی دلبەریکاران بە کەیفی خۆی بکا و گوێ نەداتە بۆڵە و شەیتانی کردنی کەس.

١٥ دل ب زولمـێ ناسـوژێ غـەنج و خـەت و خـالن د دل
خـەیرخواهێن دەولـەتێ مـیرێ ژ وان گۆهـدار بـت

**مانای وشەکان:**

**ناسوژێ**: ناسووتێ؛ **غەنج**: ناز؛ **خەت و خال**: خاڵ و میل؛ **خەیرخواه**: چاکە خواز؛ **گوهدار**: گوێدێر.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر گازندەم هەیە و خۆم ناو ناوە دڵسووتاوی ئەوینێ، مانای ئەوە نییە زوڵم و ناهەقییەکم لێ کرابێ؛ نەخێر، دڵی من کە پڕە لە ناز و خەیاڵی خەت و خاڵی دڵبەر و ئەوانەش هەمووی خێر و خۆشین، ئاگر و سووتان ناتوانێ ڕوو بکاتە دڵمەوە لەبەر ئەوان. بەڵام خۆ دیارە ناز و جوانی ئەو کە خەیاڵیان لە دڵمایە، پایەداریی ئەو جوانییە دەخوازن و بۆ خونکاری مولکی عیشق خێرخوازن. با گوێ لەوان بگرێ و ئەو دڵەی کە هێلانەی ناز و خۆشەویستی خەت و خاڵی ئەوە، تۆزێک بلاوێنێتەوە.

١٦ تەیرێ دل بێ توعمەکی (تەمعەکی) نایێتە دەست شەهزادەیان
قووشـچییێ شـاهین د دەسـتێ دێ د بـێئـازار بـت

**مانای وشەکان:**

**تەیر**: باڵدار، مەل؛ **توعمە**: چێژە؛ **تەمعە**: تەماح؛ **قووش**: باشووکە؛ **قووشچی**: بازەوان؛ **دێ**: لازمە، پێویستە؛ **د بێئازار بت**: بێئازار بێ.

**پوختەی مانا:**

شازادە و نەجیمزادەکان لە ڕاوکردنی مەلاندا ڕێ و شوێنیان وایە کە تەماح وەبەر مەلان دەنێن و چێشکەیان دەدەنێ تا بکەونە داویانەوە و ڕاویان بکەن. بازەوانی شازادان ــکە باز یان شاهێنی لە سەر دەستەــ دەبێ مەلی ڕاوکراو ئازار نەدات و بە نەژاکاوی بیداتە دەست ئاغاکەی خۆی.
جا کە من و دڵم بە خۆشی خۆمان بووینە نێچیری خەت و خاڵ و ئاڵووالای تۆ،

پێویستە تۆش لە ڕێوشوێن کەنار نەگری؛ تەماحێکمان وەبەر بنێی؛ تامی دەمی دڵمان بە گفتێکی شیرین خۆش بکەی. کارێک بکەی کە ئازار نەبینین و بە دەستی نەزانانەوە نەژاکێین.

۱۷ بەندەیێ باخۆی بڤێت دێ مەیلێ سیم و زەڕ نەکت
دا عەتایا پادشاهان بێحەد و ئەژمار بت

**مانای وشەکان:**

**بەندە**: کۆیلە؛ **باخۆی**: خودا، خودان؛ **دێ**: پێویستە؛ **سیم و زەڕ**: زیو و زێڕ؛ **عەتا**: بەخشش؛ **پادشاه**: خونکار؛ **حەد**: سنوور؛ **ئەژمار**: ژمارە.

**پوختەی مانا:**

وا دیارە مەلا لەوەندە داوایەشی لە یار پەشیمان بۆتەوە. دەڵێ: من کۆیلەم؛ کۆیلەش ئەگەر خودا یان خودانی خۆی بوێ، نابێ زێڕ و زیو و دنیا و خۆشی خۆی لێ داوا کا. چۆنکە ئەو دەمە بۆ خۆشەویستییە خالیسەکەی شەریک پەیدا دەکا. ئەگەر کوێلە هیچی داوا نەکرد و هەر بۆ ڕەزای خاوەنی کاری کرد و چیتری نەگرتە بەر چاو، لە لای خونکاری خاوەنی، زۆر بەڕێز دەبێ و بەخششی لە سنوور و هەژمار بەدەری بەسەردا دەبارێنێ و لە خەم و پەژارەی دەردێنێ.

۱۸ سار دبت دل ما ب سەد جەور و جەفایان زەررەیەک
عیشق تەبعەت نارە هنگی دێ بچت دژوار بت

**مانای وشەکان:**

**سار**: سارد؛ **دبت**: دەبێ؛ **ما**: مەگەر؛ **زەررە**: تۆزقاڵ؛ **تەبعەت**: مزاج و تەبیات؛ **نار**: ئاگر؛ **هنگی**: هەرچەندە؛ **دێ بچت**: خەریک بێ، بەردەوام بێ و پێوە بچێ؛ **دژوار**: چەتوون و سەخت.

**پوختەی مانا:**

جا ئەوە گوتیشم ئازار دەبینم، جا ئەوە پاڕاشمەوە کە گوێ بۆ شۆفار و چاونەزێران مەگرە، بەڵام ئایا ئەگەر سەد ئەوندەش ئازار و دەرد بچێژم، مەگەر دڵم لە ئـەوین سارد دەبێتەوە؟ نەخێر تۆزقاڵێکیش چییە سارد نابێتەوە؛ چونکە مـەزاجی ئـەوین ئاگرینە و بڵێسەی ئاگر هەتا بچێ و بەردەوام بێ، بـەرزتر و بـەتین‌تر و دامرکـانی دژوارتر دەبێ.

۱۹ لەشکرێ عالەم مەگەر یەکسەر تە دوژمـن بـن «مـەلا»
غەم بە موویـەک ناکشـینی گـەر تـە دلبـەر یـار بـت

**مانای وشەکان:**

**مەگەر**: گریمان، فەرزەن؛ **یەکسەر**: سەرلەبەر، بەگشتی؛ **تـە**: لـە تـۆ؛ **غـەم**: کەسـەر؛ **ناکشینی**: ناکێشی؛ **تە**: تۆ.

**پوختەی مانا:**

مەلا گلەیی کردن لە لۆمەکەران و لە جەور و ئازارکێشان شتێکی زیادە. تۆ کـە دڵـت داوە بەو دڵـبەرە، گریمـان تـەواوی هـۆردووی دنیـا بێتـە دوژمنـت؛ تـۆ لـە خۆشـی ئەویندارییەکەت قەت بە قەد تۆزقاڵێکیش خەم ناخۆی و کەسەر هەڵناگری. پیاو یاری وای هەبێ چۆن گوێ بە دەرد و ئازار دەدات؟

«مەحوی» دەفەرموێ:

لەسـەر تۆم دوژمنـە دنیا قـەزییـە مانیـعولجـەمعـە
کە تەرکی تۆ نەکەم تەرکی هەموو دنیا نەکەم چبکەم



# ئیکسیری ئەوین

١ قەلبێ مە شوبهـ زێـڕێ ژ فـەیزا تـە جـەلا گـرت
ما رووسیەهـ و سیفرسیفەت رەنگێ سەفا (سـەدا)گرت

**مانای وشەکان:**

**قەلب**: دڵ: **قەلب**: قەڵب و بەدەڵ؛ **شوبهـ**: وەک؛ **فەیز**: بەرەکەت؛ **جەلا**: مشـتوماڵ؛ **سیفر**: مس؛ **سەفا**: سافی و ڕۆشنی؛ **سەدا**: ژەنگ؛ **ما**: ئایا؛ **ما**: مایەوە.

**پوختەی مانا:**

دڵی ئێمەی قەڵب و دەغەزدار ــ کە وەکوو مسی ژەنگاوی لە ژێر باری گوناهانـدا ڕەش هەڵگەڕابووــ ئێمەی تووشی ڕووڕەشی کردبوو. لە ئاوڕوێدانی پڕ بەرەکەتی تۆڕا، وەکوو زێڕی مشتوماڵ کراوی لێ هات. یان: ئـاخۆ قـەت ڕووی داوە شـتێکی مسئاسـایی ڕەش هەڵگەڕاو ببێتە زێڕی ساف؟ بەڵێ دڵی من ئەو مس ئاساییە بوو کە لە بەرەکەتی تۆوە کراوە بە زێڕی بێخەوش.

٢ تەشبیهێ ب جەدوەل مە د نیف ئاتەشێ عیشـقێ
دل قەلبێ حەقیقەت بت و ئیکسیرێ هەما گـرت

**مانای وشەکان:**

**تەشبیه**: وێچوون؛ **جەدوەل**: جۆگەلەی بچووک؛ **نیف**: ناوەنـد؛ **ئاتـەش**: ئـاگر؛ **قـەلب**: وەرگەڕان؛ **حەقیقەت**: ڕاستینە؛ **هەما**: بە هاسانی، هەروەها.

**پوختەی مانا:**

ئێمە دەناو ئاگری ئەویندا تواینەوە و وەک ئاوی ناو جۆگە ڕەوانِ بـووین و دڵـمان، کـە وەک مسی ژەنگاوی و ڕەش وا بوو، وەرگەڕا بە تواوەیەکی بێخەوش و ئەوسا بە هاسانی ئیکسیری ئاوڕدانەوە و بەزەیی تۆی وەرگرت و کرا بە زێڕی ساف و دوور لە قەڵبی و دەغەڵی.

۳ سالێک کییـە؟ هـاتی ژ مـەجازێ ب حەقیقـەت
سوورەت نەشوناسیی و ب مەعنا نـە فـەنا گـرت

**مانای وشەکان:**

**سالیک**: ڕێڕەو، ڕێبوار؛ **هـاتی**: هـاتوو؛ **مـەجازی**: ڕواڵـەتی؛ **سـوورەت**: شـکڵ؛ **مـەعنا**: ناوەڕۆک؛ **فەنا**: لە ناو چوون، تێدا چوون.

**پوختەی مانا:**

ڕێڕەوانی ڕێگەی خوداناسین کێن؟ ئەوانەن کە بە ئەوینی دنیاییەوە گیرۆدە بوون و لە جوانییەکی کە خوا بە دڵبەرانی داوە، کەوتوونەتە سەر ئەوینی ئەو جوانیدەرە و بوونـە دڵداری خودا و ئەوسا بە تەواوی لە ناو ئەوینی خواییدا تواونـەوە و هـەروەک نـەبووبن وایان بەسەر هاتووە؛ کە دەڵێن «فەنا فیللا» بوون. بەڵام ئەو کەسانەی کە هەر بە دەم دەڵێن خواناسین، کە چی نە خودایان لە شکڵی جواناندا دیوە و نە بـە بـاتین (بـاطن) گەیشتوونە تاوانەوە لە ئەوینی خودراییدا بە ڕێڕەو حیساب ناکرێن.

۴ تەنها نـە ل مـن لامیعـێ حوسـنا تـە شـەفەق دا
عالەم ب خوە وێ حوسن و جەمالێ دخوەدا گرت

**مانای وشەکان:**

**لامیع**: بریقـەدەر؛ **حوسـن**: جـوانی؛ **شـەفەق**: ڕوونـاکی کـەنارەی ئاسمـان؛ **شـەفەق**: بەزەیی؛ **عالەم**: جگە لە خوا هەموو شتێک.

**پوختەی مانا:**

من وتم لە بەرەکەتی تۆ مسی ڕەش و ژەنگاوی بووم، بوومە زێڕی ساف. گوتم سۆفی بەڕاستی کەسێکە تۆ لە ڕووی دڵبەراندا بەدی دەکا و دەبێتە عاشقی خۆت و لە تۆدا دەتوێتەوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەر من هەستم بە جوانی تۆ کردبێ و بەس. هەرچی هەیە و ئافەریدەی تۆیە، وەکوو مـن بریقـەی جـوانی تـۆی دیـوە و جـوانی و دڵرفێنی تۆ هەموو دنیای داگرتووە و تۆی کە بەزەت بە کەسێکدا بێت، لە ئەوینی ڕواڵەتەوە دەیخەیە سەر ئەوینی ڕاستینی خواپەرستی و دەیتاوێنییەوە.

٥ تەیغوونێ د دەستێ تە زەهـی دەولـەت و ئیقبـال
هەرچی تە بری دامـێ د تـۆرا خـوە هومـا گـرت

**مانای وشەکان:**

**تەیغوون**: وادیارە مەلێکی دەشتی بێ کـە ڕاو دەکـرێ؛ بـەڵام مـن لـە فەرهەنگانـدا نەمدیتەوە. وا بیر دەبەم **تەیهوو** بێ کە بە سوێسکە دەڵێن؛ **زەهـی**: هـای لـەو، ئـای چەند؛ **دەولەت**: بەخت؛ **ئیقبال**: ڕووداو، بەخت؛ **تۆر**: تۆڕ، داوی بەگەوی هەراو؛ **هومـا**: پیرۆزە، مەلێکی ئەفسانەیە و گوایە سێبەر لە هەرکەس بکا دەبێتە فەرمانڕەوا.

**پوختەی مانا:**

سوێسکە بکەوێتە ناو دەستی تۆ، دەبێ بە بەخت و سەرکەوتنی خۆی بنازێ. هـەرچی بە داوی تۆ بگیرێ و بکەوێتە تـۆڕی تـۆوە، خـۆی بـە هومـا دەزانـێ. دەیسـا چ لـەوە خۆشترە پیاو گیرۆدەی داوی تۆ بێ.

٦ جانـێ خـوە مـە کـر دانـەیێ داڤـا کـو ڤـەدایی
ئاهووسیفەت ئەو پێ حەسییا راهـێ خـەتا گـرت

٧ عـەنقا نـە شـکارا کەسـە داڤـان تـو بچین‌ڤـەر
داڤا کـو ل عـەنقا تـو ڤـەدي بـادێ‌هـەوا گـرت

**مانای وشەکان:**

**جان**: گیان؛ **دانە**: دەنک؛ **ڤەدایی**: نراوەوە؛ **ئاهوو**: ئاسک، مامز؛ **حەسیبا**: هەستی کرد؛ **خەتا**: هەڵە؛ **خەتا**: مەڵبەندێکە؛ **عەنقا**: سیمورغ؛ **شکار**: ڕاو؛ **بچینڤەر**: هەڵبچنەوە، کۆکەرەوە؛ **بادێهەوا**: خۆڕایی و هیچ.

**پوختەی مانا:**

ئێمە بە تاسەوە ویستمان گیانمان بەو دانە و داوەوە بکەین کە نراوەتەوە و ببینە نێچیری تۆ و بە بەختی خۆمان بنازین. بەڵام بە داخەوە گیانمان وەک ئاسکی سڵ، بە بێ ئەوە بزانێ ئەو دەداو کەوتنە چەند مایەی بەختەوەری و شانازییە، هەر هەستی بە داو کرد، ڕەوییەوە و خۆی گەیاندە مەڵبەندی خەتا و ڕێگەی هەڵەی گرتە بەر و لەقەی لە بەختی خۆی دا. ئێمە بە هەڵە چووبووین کە بە خەیاڵی خۆمان دەتوانین ببینە نێچیری بەردەستی تۆ. واتا ئێمە داومان دەنایەوە کە ئەو بەختەوەرییەمان دەسکەوێ؛ بەڵام زۆر بە هەڵە چووبوین. هاتنە ناو تۆڕی تۆ، وەک ئەوە وایە کە ئێمە سیمورغ بە داو بگرین. دەیسا داو و بەهانە کۆکەرەوە! سیمورغ بۆ تۆ ناگیرێ و هەرکەس داو بۆ سیمورغ بنێتەوە، هەر بابەدەست و دەمەلەپوش دەبێ. خودا ئەگەر بۆخۆی ئیرادە نەکا بەندەی لە خۆی نزیک بکاتەوە، هەموو فێڵ و ئاواتی بەندە بە خۆڕایی دەچێ.

٨ هەرکەس سەحەرێ تالبێ تشتەک ب چەمەن هات
هن سووسەن و هن سونبول و هن زولفێ دوتا گرت

**مانای وشەکان:**

**هەرکەس**: هەمووکەس؛ **سەحەر**: بەرەبەیان؛ **تالب**: داخواز؛ **تشت**: شت، چت؛ **چەمەن**: مێرگ، چیمەن؛ **سووسەن و سونبول**: سوێسنە و سمڵ، دوو گوڵن؛ **زولف**: کەزی؛ **دوتا**: دوو لایەنە.

**پوختەی مانا:**

بەختەوەری و بەش و بەهرە لە خواوەیە. هەموو کەس لە سەرەتادا، لە بەرەبەیانی

هەبوون و ژیندا بە ئاواتی شتێکەوە کە تاسەی گیانی بشکێنێ، ڕوویان کردە مێرگ و چیمەنی دنیاوە. هێندێکیان سوێسنە و هێندێک سملیان چنی و هێندێک دەستیان لە دوو لاوە بە کەزی یارەوە گیرساوە.
«نالی» شاعیری گەورەمان لەم بارەوە دەڵێ:

سەهم و نەسیب ئەسلییە، باسی گیا و گوڵ نییە
تووتنە خەرجی سووتنە، مۆدنە ماچی لەب دەکا

**٩** دەستێ مە سەحەر گرت و برین سەیرێ حەبیبێ
فیلحال رەقیبێ ژ حەسەد لەرزە و تا گرت

**مانای وشە:**
**سەیر**: گەڕان و تەماشا؛ **حەبیب**: خۆشەویست؛ **فیلحال**: دەستەولەجێ؛ **رەقیب**: چاونەزیر؛ **حەسەد**: ئێرەیی؛ **لەرزە و تا**: نۆبەتی، یاو و لەرز.

**پوختەی مانا:**
یاری خۆشەویست لەو بەرەبەیانەدا بەزەی بە منا هاتەوە؛ لاواندمییەوە؛ دەستی گرتم و بردمیە گەڕان و تماشای گوڵان. دوژمنی چاونەزیر هەر کە ئەمەی دیت، لە داخان و لە بەغیلی و ئێرەیی، نۆبەتی هاتێ و دەلەرزی.[١]

**١٠** ئەو کەبکێ خەرامان کو د کۆزێ ل قەبوو هات
شاهێنێ قەزایێ ب تەغافول ژ خوە راگرت

**مانای وشە:**
**کەبک**: کەو؛ **خەرامان**: بەلەنجەولار؛ **کۆز**: حەشارگە؛ **قەبوو**: قاسپە؛ **قەزا**: حوکمی خودا؛ **تەغافول**: خۆ گێل کردن.

---

١. لێرەدا مەلا چیرۆکی ئادەم و حەوامان دەخاتەوە بیر کە خودا بەهەشتی پێ دان و شەیتان فریوی دان و تووشی نەگبەتی ژیانی سەر دنیای کردن؛ کە ئەم مەبەستە لە شیعرەکانی دوااییدا پتر ڕۆشن دەبێتەوە. «هەژار»

**پوختەی مانا:**

ئەو کەوە کە لە خۆشی نزیکبوونەوەی لە خۆشەویست، کەوتبووە لەنجەولار کـردن و دەحەشارگەدا دەیقاسپاند و تەواو خۆی لەبیر کردبوو، پەنجەی قەزا ـ وەک شاهێن کە دەکەو ڕۆ دەبێ ـ ڕۆی بۆیە و گرتی و بردی.

١١ زینهار کەسێ دەست ببت ئەرقەمێ سەروی
بێ عیشوەیێ لەعلان نە ب تەسلیمی ژها گرت

**مانای وشەکان:**

**زینهار**: دەغیلە؛ **ئەرقەم**: ماری جنجیر؛ **سەرو**: داری سەوڵ؛ **عیشوە**: ئیشارەتی بە نازەوە؛ **تەسلیم**: خۆ بە دەستەوە دان؛ **ژها**: هەژدیها.

**پوختەی مانا:**

دەغیلە هۆشتان لە خۆتان بێ. هەرکەسێک بە هەر پایەیەک بگات، ناشێ لە خۆی بایی بێت و جگە لە خۆ تەسلیم کردن بە یار و چاوەنۆڕی کردنی فەرمان لە لێوە لەعلەکانی، هیچ کارێک ئەنجام بدات. ئەو کەسەی دەستی دەگاتە زولفی یار ـ کە وەک ماری جنجیر لەو بەژن و باڵای وەک سەوڵەی هاڵاوە ـ ئەگەر بە بێ ئاگاداری و ئیشارەتی لێوی یار بێ، وەک ئەوە وایە کە خۆی گیرۆدەی هەژدیها کردبێ.

تێبینی: لێرەدا شاعیر یادێک لە مارەکەی بەهەشت دەکا، کە شەیتان کردییە جاشی خۆی و بابەدەمی پێ فریودا.

١٢ سەبرێ بەرێ شیرینە وە ئوستادێ خەبەردا
لەو دل مە ب تەحلی و غەمان خوررەم و شا گرت

**مانای وشەکان:**

**سەبر**: پشوولەسەرخۆیی؛ **لەو**: بۆیە؛ **تەحلی**: تاڵی؛ **خوررەم**: خۆش؛ **شا**: شاد.

**پوختەی مانا:**

ئێمەی کە دەستمان گەیشتبووە زولفی یار و لە باخچەدا دەستی گرتبووین و سەیرانی پێ دەکردین، قەدری ئەو نیعمەتەمان نەزانی و لە خۆمان بایی بووین و ملمان لە نافەرمانی نا و بێ ئەوە گوێ بدەینە ڕێ و شوێنێک کە یار بۆی دیاری کردبووین، بزووتینەوە، لەجیاتی زولف ـکە وەک مار لە بەژنی یار هالابووـ بێتە بەردەستمان، بووینە گیرۆدەی هەژدیهای دەرد و بەلایان. بەلام بە فەرموودەی مامۆستا، سەبر و پشوولەسەرخۆیی ـبا تالیش بێـ بەری شیرین ئەدات. وا بۆیە ئێمەش دلی خۆمان بە تالی و خەمانەوە خۆش کردووە و چاوەنۆڕی ئەو بەرە شیرینەین کە داری سەبر بیدات.

**١٣** هەر نەشتەر و شۆکێن کو حەبیبێ مە ل دل دا
من یەک ب یەک و تێک ل دەردێ خۆە شیفا گرت

**مانای وشەکان:**

**نەشتەر**: تیخی برین دڕین؛ **شۆک**: دڕک و چقل؛ **تێک**: هەمووی بە تێکڕایی.

**پوختەی مانا:**

بە هومێدی ئەو دەمەی کە داری پشوولەسەرخۆیی بەری شیرینم بۆ بدات، وا من هەر نەشتەر و دڕکێک کە لە لایەن یاری خۆشەویستەوە چەقاوەتە دلمەوە، بە مایەی خۆشبوونەوە و چاک بوونی دواڕۆژی دەزانم.

**١٤** عاشق ژ غەمێ سایەیێ وێ جامێ تەلەب کر
پوڕ عەقلێ ددێرت مە ژ قسمێ حوکەما گرت

**مانای وشەکان:**

**عاشق**: ئەویندار؛ **سایە**: پەنا، پەسیو؛ **وێ جام**: ئەو پیالەیەی؛ **پوڕ**: زۆر؛ **ددیرت**: وەدی دێنێ؛ **حوکەما**: هۆزانان.

**پوختەی مانا:**

ئەو عاشقە پەنای لەو پیاڵەی غەمهێنە داوا کرد و هانای پێ برد. لێت ڕوون بێ زۆر ئاقل و زانایە و ئێمە ئەو دەرسەمان لە شارەزایان و هۆزانان وەرگرتووە. خەم خواردن لە ڕێگەی عیشقدا دڵ پڕ دەکا لە عەقل و زانایی.

**١٥** سەف_سەف نە تنێ گەزمە دبارن ژ کەڤانان
دل کاکول و زولفان د کەمەندێ ب تەبا گرت

**مانای وشەکان:**

**تنێ**: بە تەنیا؛ **گەزمە**: تیر؛ **کەڤان**: کەوانی تیر هاویشتن؛ **تەبا**: پێکەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو خەمەی کە ئێمە بە دڵ ویستوومانە و خۆمان داوەتە ژێر پەنایەوە، لە چەند لاوە دەوری داوین. تیری مژۆڵ لە لای کەوانی برۆیانەوە بۆمان دادەبارن. جا نەک هەر ئەوندە، بگرە کاکۆڵ و کەزیش بە جووتە دڵمیان لە ناو کەمەندا شەتەک داوە.

**١٦** دێوانە هەرێ تێتە دڤێ سسلە و بەندێ
کو موستەحەقە خوسرەوی خووبان ب جەزا گرت

**مانای وشەکان:**

**دێوانە**: شێت؛ **هەرێ**: بێ‌گومان، چاری ناچار؛ **تێتە**: دێتە؛ **دڤێ**: دەنێو ئەو؛ **سسلە**: زنجیر، سسڵە؛ **بەند**: بەستن؛ **موستەحەقە**: ڕەوایەتی؛ **خوسرەو**: پاتشا؛ **خووب**: جوانی چاک؛ **جەزا**: سزا، جزیا.

**پوختەی مانا:**

ئەو کەسەی شێتی دەستی ئەوینە، بێ‌گومان دەبێ لەشی گیان و دڵی بخرێتە ناو ئەو زنجیرەی زولفانەوە و شەتەک درێ. سەرداری جوان‌چاکان، سزای ئەوانەی لە ئەوینی ئەودا شێت بوون، لە زنجیر شەتەکدانی داناوە!

۱۷ پەیوەستە دو فێرس ژ مەرا دابەرزین دل
زولفان بە چەپ و راستێ ل ئۆغلمە جەما گرت

**مانای وشەکان:**

**پەیوەستە**: پێکەوە نووساو؛ **پەیوەستە**: هەمیشە؛ **فێرس**: ئازا لە شەڕ و کوشتاردا؛ **دابەرزین**: ڕاسان، هەڵکوتانە سەر؛ **ئوغلمە**: تێکەڵ بە یەک بوونی شەڕکەران؛ **جەم**: تەنیشت، کن؛ **جەما**: کۆ، تۆپەڵ.

**پوختەی مانا:**

دوو برۆی پەیوەست و پێکەوە نووساو، یاخۆ بە بێ وچان دوو برۆکانی- کە لە دڵدار کوشتن زۆر ئازاو بەکارن- هەڵیانکردە سەر منی دێوانەی دڵداریی کە بمگرن و بە سزای خۆم بگەیەنن و لە ناو زنجیری کەزی و بسکاندا بمبەستنەوە. کەزیەکانیش لە ڕاستە و چەپەوە هاتنە نزیک بسکانەوە و لە گرتنی مندا یاریدەیان دەدان و لەو ناوەدا پەلەقاژە و خۆ ڕاپسکانی من و هێرشی ئەوان، مەیدانی جەنگی مەغلووبەی پێکهێنابوو.

۱۸ قەوسێ دو هیلالان کو ل سەر بورجێ ئەسەد بت
بوو شوهرە د عامێ عەمەل ئەنگوشتێنوما گرت

**مانای وشەکان:**

**قەوس**: کەوان؛ **هیلال**: مانگی یەکشەوە؛ **ئەسەد**: شێر؛ **بورجی ئەسەد**: چەند ئەستێرەیەکن کە لە دوورەوە وەک شکڵی شێر دیارن و پێنجەمین قۆناغی مانگانەی خۆرە؛ **شوهرە**: ناو کردوو؛ **عامی**: مەردمی ڕەمەکی؛ **عەمەل**: کار؛ **ئەنگوشت**: قامک؛ **ئەنگوشتێنوما**: بە ئیشارەی قامک نیشان دان.

**پوختەی مانا:**

ئەم بگرە و بەردە و هێرش و ڕاسانی برۆیان و پەلاماردانی زولفانە، بۆ شەتەکدانی دڵی منی دڵدار لە زنجیردا ـکە وەک مەیدانی جەنگی مەغلووبە وا بووـ کارێکی ئەوندە سەرسووڕێن و سەیر بوو کە مەردمی ڕەمەکیشی هێنابووە سەیرانێ. بەڵام عەجایبە کە

لە گرتنی مندا نەبوو؛ لەوەدا بوو کە دەیاندیت کەوانەی دوو مانگی یەکشەوە پێکەوە لە بورجی ئەسەددا خۆیان نیشان داوە. چونکە بورجی ئەسەد مەنزلگای ڕۆژە نە مانگ. دوو مانگی یەکشەوەش هەرگیز بە یەکەوە لە ئاسۆ نەبینراون. ئەم ڕووداوە هەموو مەردمی سەرسام کردبوو؛ بە قامک ئیشارەتیان بۆ دەکرد.
مەبەستی شاعیر لە بورجی ئەسەد ناو چاوانە. «اَسَد» بە حیسابی ئەبجەد شێستوپێنجە. «جَبین»یش کە بە عارەبی بە توێڵ دەڵێن، بەو حیسابە شێستوپێنجە. هەروەها «هَنی»: هەنی، کە بە کوردی بە توێڵ دەڵێن، دیسان شیستوپێنجە. کە وا بوو پوختەی ماناکە ئەمەیە: دوو برۆی کەوانی کە وەک مانگی یەکشەوە لەسەر توێڵی یاری نازەنین دیاری دەدا، خەڵک هەموو حیکایەتی لەت بوونی مانگیان وەبیر هاتەوە کە بە موعجیزەی پێغەمبەر لە ئیشارەتی قامکیەوە لەت بوو. بۆیە ئەو دیدارە ناوبانگی بە ناو خەڵکا بڵاو بۆتەوە.

**١٩** شیعرا تە «مەلا» سیحرێ شەکەرریزە بە موعجیز
زانم ژ لەبێ لەعلێ تە ئەڤ لەفز و ئەدا گرت

**مانای وشەکان:**
**سیحر**: جادوو؛ **شەکەرریز**: شەکرهەڵڕێژ؛ **موعجیز**: مۆجزات؛ **زانم**: دەزانم؛ **لەفز**: ئەو قسەی لە دەم دەردەچێ؛ **ئەدا**: دەربڕینی وشە.

**پوختەی مانا:**
ئەی مەلا! شیعری تۆ موجزات دەکا و سیحرێکە شەکری لێ دەبارێ. دەزانم شیعری وا، لە وزەی خۆتی تەنهادا نییە. لە خۆشی و یادی لێوی ئاڵی وەک لاڵ، ئەو قسانەت بۆ هاتووە. دیارە ئیشارەتێکیشی بۆ ئەو ئایەتە تێدایە کە فەرموویە: «وا دەبێ دەربڕینی وتە، کاری سیحراوی دەکا.»
شاعیری خوا لێ خۆشبوو «سالم» دەڵێ:

هەموو ئەشعاری دووشینم بە یادی لێوی نووشین بوو
دەچەسپا لێو بەسەر یەکدا حیکایەت بەس کە شیرین بوو



## یار ئاگاداره

۱ مەحبووب ب دل بت مە ب ئەڤراز چ حاجەت؟
عەنقا ب خوە بێتن فڕ و پەرواز چ حاجەت؟

**مانای وشەکان:**

**مەحبووب**: خۆشەویست؛ **ئەڤراز**: هەوراز؛ **ئەڤراز**: هاوڕاز؛ **حاجەت**: نیاز؛ **عەنقا**: سیمورغ؛ **پەرواز**: هەڵفڕین؛ **پەرواز**: باڵ لێک کردنەوە.

**پوختەی مانا:**

یاری خۆشەویست لە ناو دڵدا جێگیر بووە؛ پێی ناوی بۆی بڕوانمە بەرزایی ئاسمان. یان: بە هەوراز و ڕێگەی دژواردا بۆی بگەڕێم. سیمورغێک کە ئاواتی من بوو ببینم، خۆی هاتۆتە لام؛ ئیتر کارم بەوە نییە هەڵوەدای دیتنی بم و باڵبگرمەوە.

۲ نەی دووره حبیبێ مە چ فەریاد و فغان کین
وێ گوهـ ل زەمیرا دلە ئاواز چ حاجەت؟

**مانای وشەکان:**

**فەریاد**: هاوار؛ **فغان**: هەرا و داد؛ **کین**: بکەین؛ **گوه**: گوێ؛ **زەمیر**: دڵ، وەشارتووی دەروون؛ **ئاواز**: بانگ.

**پوختەی مانا:**

یاری مە لە ئێمەوە دوور نییە؛ ئیتر هەرا و هاواری بۆ لێ بکەین. ئەو وەشارتووی ناو دەروونمانی گوێ لێیە؛ بۆچی بە قەو بانگی کەین.

٣ گۆ سوختە! موورادا خــوە ژ مــن تەلبــە کــە ئــیرۆ
من گــۆ ژ کــەریم تەلبــە و داخــواز چ حاجــەت؟

**مانای وشەکان:**

**گۆ**: گوتی؛ **سوختە**: تازەفەقێلە؛ **موراد**: نیازی دڵ؛ **تەلبە**: داوا، تەڵـەب؛ **ئـیرۆ**: ئەمـڕۆ؛ **کەریم**: دلاوا، بەخشندە؛ **داخواز**: مەبەست و نیاز.

**پوختەی مانا:**

گوتی: ئەی تازەشاگرد! چیت گەرەکە داوای بکە تا بۆت پێک بێنم. گوتم: لە دلاوایان داوا کردنی شت پێویست نییە. بەخشندە بە بێ داوا لێ کردن نیازی هەژاران پێک دێنن.

نزیک بەم شیعرە، «مەولەوی» چەند شیرینی فەرمووە:

یا خەلیل دەخیل کێ عادەت کەردەن　　　تۆشـە وە دەرماڵ کـەریمـان بەردەن

مەلا دەیەوێ بڵێ: خوایە هەرچەندە فەرمووتە لێم بپاڕێنەوە و چیتان دەوێ بخـوازن، بەلام تۆ کە لە وەشارتووی دڵمان ئاگاداری، پێویست ناکا ئێمە بڵێین. تۆ خۆت زانـاش و بەخشندەشی.

٤ مــن نالــە رەفــیقن غــەم و تەحلینــە موســاحیب
فــەریاد ئەنیســێ منــە دەمســاز چ حاجــەت؟

**مانای وشەکان:**

**تەحلی**: تاڵی؛ **موساحیب**: هاوڕێ؛ **ئەنیس**: خەمڕەوێن؛ **دەمساز**: هاودەم.

**پوختەی مانا:**

ڕەنگە هێندێک لۆمەم بکەن کە بۆچی بە تەنیا دەژیم و گۆشەگیرم و هەواڵ و هـاوڕێم نین. ئەی نازانن من ناڵە هاواڵمە و پەژارە و تاڵی هاوڕێمە و هـاوار هاودەنگمـە. ئیتـر کارم بە پیاوی هاودەم چییە؟

٥ دڵـدان و نـەوازش چنـە دوشـنام بەسـن مـن
پڕ دەرد و جەفا حورمەت و ئیعـزاز چ حاجـەت؟

**مانای وشەکان:**

**نەوازش**: لاواندنەوە؛ **چنە**: چین؛ **دوشنام**: جوێن؛ **پـڕ**: زۆر؛ **جـەفا**: ئـازار؛ **ئیعـزاز**: بـە گەورە گرتن.

**پوختەی مانا:**

من هیچ چاوم لەوە نییە کەس بملاوێنێتەوە و دڵمبداتەوە؛ چونکە خـۆم بـە کـەمتر لـەوە دەزانم کە کەس بملاوێنێتەوە. بە جنێو پێدانیش بەسەرکرێمەوە، هـەر زۆرە. کەسـێکی کە وەک من لە دەرد و ئازار دارماڵ بـێ، کـوا کـاری بـە حورمـەت گـرتن و قـەدر لێنـان دەمێنێ. هەموو تەمەنم بە هەژاری و خاکەساری ڕابراوە و هەرگیز وەبەر چاوان نـەهاتووم. وەهاش فێری ئەم ژیانە بەژانە بووم کە هەرگیز ئارەزوو ناکەم بە ژیانێکی تری بگۆڕمەوە.

٦ سوحبەت بە مـەی و چـەنگێ حبیبـێ مـە بڤـێتن
فەریاد و فغانـێ مەنـە بـەس سـاز چ حاجـەت؟

**مانای وشەکان:**

**سوحبەت**: هەواڵەتی، هاودەمی؛ **چەنگ**: ئامرازێکی مووسیقایە. **بڤێتن**: بیـەوێ؛ **مەنـە بەس**: ئێمەی بەسە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر یار لە کۆڕی بەزمدا ـ کە مەی و مووزیکی بۆ ئامادەیە ـ ڕێگەی من بدات بچمـە لای، گریان و هاواری من جێگەی ساز و چەنگی بـۆ پـڕ دەکاتـەوە و لـە بـەر سـۆزی دەروونی من دەنگی مووزیک دەرناچێ.

٧ رازێـن مـە چ حاجـەت وەکـوو غـەمماز بـزانن
ئەشکێن مە بەسن دیدەیێ غەمماز چ حاجـەت؟

**مانای وشەکان:**

**راز**: نهێنی دڵ؛ **غـەمماز**: چاوداگر، ئەوانەی بۆ ئاشکرا کردنی سوڕی خەڵـک چـاو لـە یەکتر دادەگرن؛ **ئەشک**: فرمێسک؛ **دیدە**: چاو.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی لە ئاژاوە دەگەڕێن و دەیانەوێ بە چاوداگرتن ڕازی من دەخەڵک بگەیەنن، بـا هیچ خۆیـان مانـدوو نەکـەن. فرمێسـکی چـاوی مـن شـایەتیم لـێ دەدەن کـە مـن ئەویندارم. هیچ ئیحتیاج بە ئیشارەی چاوی چاوداگران نییە.

٨ هەر لەحزە چ حاجەت کو ب نـازان بکـوژی مـن
جانـا ژ خـوە قوربانـێ تـە مـە نـاز چ حاجـەت؟

**مانای وشەکان:**

**لەحزە**: چاوترووکانێک؛ **لەحز**: تماشا؛ **جانا**: گیانە؛ **ژ خوە**: خۆبەخۆ، لە خۆمەوە؛ **تە**: تۆ.

**پوختەی مانا:**

چ پێویستە هەموو سات و کاتان بەڕوانینی پـڕ لـە نـازەوە مـن بکـوژی؟ گیانـە ئـەوە ئاشکرایە کە من بوومەتە قوربانی تۆ؛ بە بێناز کردنیش. ئیتـر نـازی بـۆ چییـە؟ واتـا: مردوو مردووە؛ تازە کاری بە چەک نییە کە بکوژرێت.

٩ تا چەند بە هیجرا خوە تـۆ مـن تەجرەبـە ئیـنی؟
زێڕێ ژ خوە خالیس محەک و گاز چ حاجـەت؟

**مانای وشەکان:**

**هیجر**: دووری؛ **ئینی**: دێنی؛ **خالیس**: بێخەوش؛ **محەک**: بەردی ئەزموونی زێڕ.

**پوختەی مانا:**

تا کەی و تا چەند تۆ من بە دوور خستنەوە لە دیداری خۆت دەئەزمووی تا بـزانی لـە

دڵداریدا چەند بە ئەمەگم و چەند لە بەر دەردی خۆڕاگرم؟ کە لێشت ڕوونە من وەک زێڕی بێخەوش ــلە دڵداریداــ بێعەیبم. زێڕی ساف ئیحتیاجی بە لە محەک دان و بە گاز لێ هەڵکراندن نییە.

١٠. حاجەت نییە جانا یەدی بەیزا ب دەر ئانین
ئینکار د دیندا نەبت ئیعجاز چ حاجەت؟

**مانای وشەکان:**

**یەد**: دەست؛ **بەیزا**: سپی؛ **بەدەر ئانین**: دەرهێنان؛ **ئیعجاز**: مۆجزات.

**پوختەی مانا:**

گیانەکەم پێویست نییە تۆش وەک مووسا بە موعجیزە دەستی بە سپیەتی لە گیرفانی دەرهێنا تا فیرعەونی پێ لە ئینکار کردن بگیرێتەوە، موعجیزە بۆ من بکەی و دەستی سپیت دەرخەی. چونکە من بڕوای تەواوم هێناوە و هیچ گومانم لە دڵدا نەماوە و هیچ کارم بە مۆجزە نواندن نییە تا ببمە خاوەن باوەڕ.

١١. ئەسراری ئەزەل دێ د ئەبەد بێنە زوهووری
ئەنجامێ سەرئەنجامێ ژ ئاغاز چ حاجەت؟

**مانای وشەکان:**

**ئەسرار**: نهێنییەکان؛ **ئەزەل**: هەرە پێشوو؛ **ئەبەد**: هەرە پاشین؛ **زهوور**: دیاری دان، ئاشکرا بوون؛ **ئەنجام**: پێکهێنان؛ **سەرئەنجام**: ئاخری کار؛ **ئاغاز**: دەسپێکردن، سەرەتا؛ **دێ**: حەتمەن دەبێ.

**پوختەی مانا:**

نهێنییەکانی هەوەڵ کە خوا بڕیاری داون، بێگومان لە دوا ڕۆژدا هەر دێنە دێ. پیاو ناشێ هەر لە سەرەتاوە لای وا بێ دەبێ بەسەرهاتی خۆی لە دواڕۆژدا یان لە پاش مەرگ بزانێت.

نیازی شاعیر ئەوەیە کە خودا بۆ بەندە و ژیانی دنیا و قیامەتی بڕیاری خۆی داوە. ماندووبوونی بەندە بۆ زانینی چارەنووسی خۆی بەر لە هاتنی، بێسود و بەهرەیە.

٣٢ گەر لوءلوئی مەنسوور(مَنثـور) ژ نـەزمێ تـە دخـوازی
وەر شیعرێ «مەلێ» بین تە بە شیراز چ حاجـەت

**مانای وشەکان:**

**لوءلوء**: مرواری؛ **مەنسوور**: پەرژ و بلاو، نـەسمراو؛ **مەنسـوور**: پەخشـان، بەرانبـەر بـە شیعر؛ **نەزم**: هۆندنەوە؛ **نەزم**: شیعر؛ **مەلێ**: مـەلا؛ **شـیراز**: شـارێکە لـە ئێـران زێـدی سەعدی و حافز و گەلێک لە شاعیرانی ترە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر تۆ دەتەوێ مرواری هێشتا نەسمراوت لـە هـۆنراوەدا دەس کـەوێ، وەرە بڕوانـە شیعری مەلا؛ ئیتر کارت بە سەر شیراز و بویژانییەوە چییە؟



## هونەر مەرجە

١ کـەس ب دادا مــە نەپرســت گلــە و داد چ کــت؟
تــە نــەبت دادرەســەک بێهــودە فــەریاد چ کــت؟

**مانای وشەکان:**

**گلە**: شکایەت؛ **داد**: هاوار؛ **داد**: عەدالەت.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر هیچ کەسێک بە دادمان نەگا و لێمان نەپرسێتەوە، شکایەت و هاوار چی دەکا؟ تۆ ئەگەر فریاڕەسێکت نەبێ، هاواری بێفایدە چیت بۆ دەکا؟

٢ ب شــرینێ نەگــەهت دەســت ئەگــەر روســتەم بــت
دێ بــە بــازوو و مــلان شــوبهەتێ فــەرهاد چ کــت؟

**مانای وشەکان:**

**شرین**: شیرن، بەرانبەری تاڵ؛ **شیرین**: کیژە ئەرمەنییەک بوو، ببــوە ژنی خوســرەوی پەروێز، پاشای ئێران؛ **نەگەهت**: نەگات؛ **رۆستەم**: پاڵــەوانی چیرۆکــی ئێــرانی؛ **بــازوو**: باسک؛ **مل**: شان؛ **شوبهەت**: وەکوو؛ **فەرهاد**: کوردێکی کەڵهوڕی بەردتاشی ملهوڕ بوو، دڵی چووبووە سەر شیرین.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر خوا بڕیار بدا کار پێک بێت، بە باری نەرمیی و بە بێ تاڵی چێژتنیش بە ئاواتــت دەگەیەنێ. بەڵام ئەگەر بڕیاری خوای لەسەر نەبێ، کار بە زۆرەملێ پێــک نایــە. نــەک هەر فەرهاد بە زۆری شان و باهۆ و باسکی بەهێزی بگرە ئەگەر ڕۆستەمیش بوایە ـکە

لەو پاڵەوانتر بووە_ هێشتان دەستی نەدەگەیشتە یارە شیرینەکەی کە شیرین بووە.

٣ فاعیلــەک لازمــە دا فیعــل و ئەســەر پەیــدا بــت
گــەر تــو حــەدداد نــەبت کوورەیــێ حــەدداد چ کــت؟

**مانای وشەکان:**

**فاعیل**: کرگار؛ **لازم**: پێویست؛ **فیعل**: کر؛ **ئەسەر**: شوێنەوار؛ **پەیدا**: ئاشکرا؛ **حەدداد**: ئاسنگەر؛ **تو**: هیچ.

**پوختەی مانا:**

شاعیر دەیەوێ تێمان بگەیەنێ کە ئەگەر دەڵێ: «تا خوا نەیدا زۆری بازوو بەکار نایە»، مانای وا نییە تۆ هیچ نەکەی خوا دەیدات. نەخێر ئەشێ تۆ زۆر تەقەلا بدەی و هەموو هێزی خۆت بۆ بەدیهێنانی ئاواتت بخەیە کار؛ ئەوسا چاوەنۆڕی بەزەی خوا بی کە بە ئاواتت بگەیەنێت.
دەڵێ: دەبێ کارکەرێک هەبێ تا کار و کردەوەی بێتە بەر چاو. ئەگەر هیچ ئاسنگەرێک نەبێت کە ئاسن بوکتێ و بیکاتە ئامراز، تەنیا کوورەی ئاسنگەر چی پێ دەکرێ؟ دەبێ یەکێک نێڵی بدا و ئاسنی تێدا سوورکاتەوە.

٤ مومکینــەک دێ هــەبتن داکــوو تەلــەب حاســڵ بــت
سەید و نێچــیر کــو نــەبت توولــەیێ ســەییاد چ کــت؟

**مانای وشەکان:**

**مومکین**: شیاوی وەدی هاتن، ڕەوا؛ **دێ**: دەبێ؛ **هەبتن**: هەبێت؛ **دا**: تا؛ **تەلەب**: نیاز؛ **حاسڵ**: پەیدا؛ **سەید**: نێچیر؛ **نێچیر**: ڕاو؛ **توولە**: سەگی چکۆلەی ڕاوێ؛ **سەییاد**: نێچیروان.

**پوختەی مانا:**

ئەم قەسیدەیە ڕێ و شوێنێک بۆ بیر و بڕوای مرۆ بەرانبەر بە کاروبار و نەوی بوون و بەرز بوونی لە دنیا و قیامەتا دادەنێ و پێمان دەڵێ: مرۆ دەبێ خوا بناسێ و هاواری

بەرێتە بەرێ و بە تەمای ئەو بێ. ئەگەر خوا فریاڕەس نەبێ، هیچ کارێک ناچێتە سەر. خوا کەیفی لێ بێ بە بێ زەحمەتی زۆریش بە ئاواتت دەگەیەنێ. نابێ ئەوی دەتداتێ هەر لە زۆری بازووی خۆتی بزانی. ناشبێ لات وا بێ تا کار نەکەی دەتداتێ. خوا فەرمویە: «هەرچی بۆی نەکۆشێ، پێی ناگەی». ئەمجار دەبێ بۆ کارێک هەم کۆشش بکەی و هەم پەنا بەخوا بەری کە بۆت پێک بێنێت؛ کە لەوانە بێ پێک بێت. نەک شتی مەحاڵ داوا کەی و شوێنی کەوی. ئەگەر ڕاوکەر نەبێ و نێچیر نەبێ، تولەقەندی دەبێ بە تەمای گرتنی چی بێت؟

٥ هەر گل و سەنگ دبتن زێڕ ب تەدبیرێ حەکیم
قابیلییەت کو نەبت حیکمەتێ ئوستاد چ کت؟

**مانای وشەکان:**

**حەکیم**: زۆر زانا و حیکمەت زان؛ **قابیلییەت**: شیاوی؛ **ئوستاد**: مامۆستا.

**پوختەی مانا:**

دەبێ بۆ پێکهاتنی ئاوات، خوا پشتیوان بێ؛ خۆشت زۆر ماندووکەی؛ ئارەزووی وات هەبێ کە مەحاڵ نەبێ. دەبێ خۆشت ئەوندە لێهاتوو بی کە شیاوی پێکهاتنی ئەو ئاواتە بی. ئەوا وەک بیستوومانە، زانای وا هەن لە گڵ و بەرد، زێڕ دەردەخەن. بەڵام ئەگەر گڵەکە یان بەردەکە لەو تەرزە نەبن کە زێڕیان لێ پەیدا دەبێ، زانایی مامۆستای زانا بە هیچێ دەچێ. دەبێ شیاوی فێربوونیش بیت.

٦ کان ب گەوهەر چ بکت گەوهەر ئەگەر پاک نەبت
تو بەسیرەت تە نەبت سیرەتێ ئەجداد چ کت؟

**مانای وشەکان:**

**کان**: کانگا؛ **گەوهەر**: گەواهێرات؛ **گەوهەر**: جەوهەر و هونەر؛ **تو**: هیچ؛ **بەسیرەت**: بینایی؛ **سیرەت**: ڕەوشت؛ **سیرەت**: ژینامە؛ **ئەجداد**: باپیران.

**پوختەی مانا:**

سەرەڕای هومێد بە خوا و کۆششی خۆت و شیاوی و قابیلییەتت بۆ گەیشتن بە مـراز، ئەشێ پاک و بێخلتەش بیت. نەک بـە تـەما بی کـە لـە سـایەی جێبـەرزی بـاب و باپیرانەوە دەتوانی بە دەرەجەیەک بگەی. ئەگەر گەوهەر بۆ خۆی سـاف و بێغـەوش نەبێت کانگاکەی چۆنی ساف دەکا؟ ئەگەر خۆت هێزی بینایی دڵت نـەبێ ڕەوشـت و ژیانی باپیران چت بۆ ناکا.

٧ زێـــڕ و زێـــوەر دکـــرن جـــەلبێ قلووبـــان حاشـــا
حوســن و ســور زاتی نــەبت قامــەتێ مــەیاد چ کـت؟

**مانای وشەکان:**

**زیوەر**: خشڵ؛ **جەلب**: هێنان؛ **قلووب**: دڵان؛ **حاشا**: نەخێر هەرگیز؛ **حوسن**: جـوانی؛ **سور**: دڵکێشی؛ **زاتی**: خۆیی؛ **قامەت**: بەژن؛ **مەییاد**: بەلارولەنجە.

**پوختەی مانا:**

هومێد بە خـوا، قابیلییـەت و دڵسـافی، پێویسـتن؛ لـە تەریقەتـدا نەجیبایـەتی کـار ناکـا. هەروەهاش بە ڕواڵەت خۆ نیشاندان و بە ڕیش و پرچ و جبـە و تـەزبێحیش هـیچ نـاکرێ. کیژێک کە بۆخۆی جوان نەبێت بە زێڕ و خشڵ وەخۆ خستن ناتوانێ بەرەو خۆی ڕاکێشێ.

٨ عاشـقێ مەسـتێ ب عیشـقێ نییـە حاجـەت ب مـەیێ
واریـــدێ واریـــد و ئـــەحوال ب ئـــەورادێ چ کـــت؟

**مانای وشەکان:**

**عاشق**: ئەویندار؛ **مەی**: بادە؛ **وارید**: شارەزا؛ **واریـد**: بـە ئـاو گەیشـتوو؛ **واریـد**: ئـازا و نەترس؛ **ئەوراد**: کۆمەڵی ویرد؛ **ویرد**: دۆعای بن لێوان.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی گەیشتوونەتە سەرچاوەی ئاوی مراد و شارەزای حاڵوباڵی تەریقەتن، کاریـان

بە ویرد و دۆعا خوێندنی بن لێوان نییە. ئەوکەسەی بە بادەی ئەوین سەرخۆشە، کاری بە شەراب خواردنەوە نییە. مەبەست ئەوەیە ویرد خوێندن و لە بن لێوانەوە بۆڵەبۆڵ کردن، وەک مەی خواردنەوە بۆ مەست بوونە. جا کەسێ کە ئاوا مەستی ئەوین بوو، نیازی بە شەراب چییە؟!

٩ تە غەرەز ڤێککەتنا یەک وەلییەک مورشید بت
سالیک و تالبێ ئیرشادێ ب بەغداد چ کت؟

**مانای وشەکان:**

**غەرەز**: مەبەست؛ **ڤێک کەتن**: تووش بوون؛ **وەلی**: پیاوی خوا؛ **مورشید**: ڕێشاندەر، شارەزای کار؛ **سالیک**: ڕێبوار؛ **ئیرشاد**: ڕێشاندان.

**پوختەی مانا:**

تۆ ئەگەر مەبەستت گەیشتن بە پیرێکی دەستگیر و ڕێشاندەر هەبێ، دەبێ بۆی هەڵوەدا بی و داوای بکەی. ئیتر کارت بە شوێن و جێهەواری مەشایخانی بەناوبانگ نەبێ. بۆ نموونە لات وا نەبێ بەغدا ــ کە جێگەی گەیلانییە ــ دەردت دەرمان دەکا.

١٠ جەهدە ئو سەعی و تەلەب بێ ئەسەرەک سافی نەهن
تو نەبێ پەردەنشین چاکر و قەوواد چ کت؟

**مانای وشەکان:**

**جەهدە**: کۆشش؛ **سەعی**: دواکەوتن و تەقەلا؛ **تەلەب**: خواستن؛ **ئەسەر**: نیشانە؛ **نەهن**: نین؛ **تو**: هیچ؛ **پەردەنشین**: مەبەست لە پیاوی گەورەیە کە پەردەدار و دەرکەوان و لەشکریان هەبێ؛ **چاکر**: نۆکەر؛ **قەوواد**: قائیدان؛ **قائید**: سەرکردەی لەشکر.

**پوختەی مانا:**

لە کۆشش و تەقالادا بۆ دۆزینەوەی پیر، تا نیشانی تەواوت دەس نەکەوێ، ناشێ خۆت

دەگریۆی کەس بنێی. هەروا سەربەخۆ هەرکەس وتی پیری تەریقەتم، باوەڕ مەکە! نیشانی هەیە. جا هەر وەک پەردەدار و سەرکردەی لەشکر نیشانەی بوونی فەرمانڕەوایەکن کە لە پشت پەردەوەیە، ئاکار و ڕەوشتی پیریش نیشانەی ڕاستی و ناڕاستییەتی. ئەگەر میر نەبێ نۆکەر و سەرکردە بۆ هەن؟ چ دەکەن؟

١١ چ ئەسەر دێ ل بەرێ خارە بکت قەترەیێ ئاب
قەلەمێ مە ب دوسێ قەترەیێ زوهها د چ کت؟

١٢ دێ ژ حەق جازیبەیەک دل بگرت وەرنە «مەلا»
ژ ئەزەل گەر تو هیدایەت نەبت ئیرشاد چ کت؟

**مانای وشەکان:**

**بەر**: بەرد؛ **خارە**: زۆر سەخت؛ **قەترە**: تنۆک؛ **ئاب**: ئاو؛ **زوهها**: وشک؛ **د**: دێ، دەبێ.

**پوختەی مانای ئەو دوو بەیتە:**

مەلای جەزیری دوای ئەوە کە ڕێ و شوێن بۆ هەڵوەدای خواناسین و سۆفیایەتی دیاری دەکا و چەند مەنزڵێکی لەبەر دادەنێ کە دەبێ: بە تەمای خوا دەس پێ بکا، شیاوی ئەو کارەبێ، دڵساف و بێخەوش بێ، بە باب و باپیران نەنازێ، لای وا نەبێ بەرگی دەروێشی بەهرەی بۆ دەدا، بە دنیادا بگەڕێ تا دەگاتە پیری دەستگیر و هەروەها نیشانەی خواناسی لە پیردا ببینێ، ئەوسا هومێدی هەبێ کە لە پلەی سۆفیاندا جێگەی دەکرێتەوە؛ دیسان بادەداتەوە سەر بێ ئیختیارییەکەی بەندە و دەڵێ: ئەگەر خودا هەر لە ڕۆژی بناوانەوە بڕیاری نەدابێ کە تۆ لە ڕێزی خواناسان دەبی، من پێت بڵێم و نەڵێم، تۆ زۆریش خۆت ماندووکەی، هەر ناگەیە مراز. بە بێ بەزەیی و ئیرادەی خوا، ئەو پەندانە و ڕێ و شوێنانە، وەک تنۆکە ئاوێکە کە وەبەردی ڕەق بکەوێ. قەڵەمی من بە دوسێ تنۆکەی وشک، کوا دەتوانێ هیچ کارێک بکات؟ پێویستە کێشەرێک لە لایەن خواوە دڵت ڕابکێشێ؛ ئەوسا ئەم ڕێگەیە بگرییە بەر و بیبەیتە سەر.

٢٥

# بەشی ئێمە

آ	ئەووەل کـو یـارێ دامـە یـەک زەررەیـەک عینایـەت
قیسـمەت مـە خـەمر و جامـە د دەفتـەرا هیدایـەت

**مانای وشەکان:**

**کـو**: کـە؛ **دامـە**: دای بـە ئێمـە؛ **یـەک زەررەیـەک**: تاقـە تۆزکاڵـێک؛ **عینایـەت**: بەسەرکرنەوە؛ **قیسمەت**: بەش؛ **خەمر**: شەراب؛ **جام**: پیاڵە.

**پوختەی مانا:**

هەر لە سەرەتاوە کە یار تۆزێک ئێمەی بەسـەرکردەوە و ئێمـەی خوێنـدەوە، لـە نـاو سیایی و پەڕاوی شارەزایانی ڕێگەدا، بەشی ئێمەی شـەراب و پیاڵـەی بـەزەیی خـۆی دیاری کرد. واتا ئێمەی مەستی بادەی ئەوینی خـۆی کـرد و لـە ڕۆژی ئەزەلـەوە بـە مەستیی خولقاین.

٢	حوسـن و جـەماڵێ جانـان نـادێرتن تـو پایـان
هـەرچی نـەبت بیدایـەت ئەسـلا نـەهن نیهایـەت

**مانای وشەکان:**

**حوسن**: جوانی هەندام؛ **جەمال**: جوانی لە بیچم و لە ئاکاریشدا؛ **جانـان**: یـار، دڵـبەر؛ **جانان**: گیانان؛ **نـادێرتن**: نییەتی؛ **تـو پایـان**: هـیچ بڕانەوەیـەک؛ **بیدایـەت**: سـەرەتا، دەسپێک؛ **ئەسلا**: بە هیچ جۆرێک؛ **نیهایەت**: دوایی.

**پوختەی مانا:**

ئەوینی ئێمە هەمیشە لە گەرم و گوڕیدایە. چونکە ئێمە کە ئێژین عاشقی فلانە کیژین، عاشقی ڕۆحین. واتا عاشقی ئەو کەسەین کە ڕۆحی ئەوی داوە و خوای تێدا بەدی دەکەین. جا کە وا بوو چونکە خوای ئەزەلی لەبەرچاوە و هەرچی دەسپێکرانی نەبێ، دوایی هاتن و بڕانەوەشی نییە، عیشقی مە هەرگیز دوایی نایە و کاری تەنیا بە جوانی ڕوخسار نییە و یار هەمیشە لەبەر چاومان هەر ئەو جوانەیە کە هەوەڵ ڕۆژ دیتوومانە.

٣ فەیزا عولوومێ حیکمەت جاما سەدەف کو گێرا
مە ژ دەستێ موغبەچان دیت ب مەسحەف و ب ئایەت

**مانای وشەکان:**

**فەیز**: سەرڕێژ کردن؛ **عولووم**: زانستان؛ **حیکمەت**: زانستی ڕاست و بێ گرێ؛ **موغبەچە**: بەچکەمەلای زەردەشتی، بریەتییە لە شاگرد مەیخانەچی؛ **مەسحەف**: قورئان.

**پوختەی مانا:**

ئێمەی کە لە هەموو جوانییەکدا هەر خودا بەدی دەکەین و هیچ شتێکی ترمان وەبەر چاو نایە، لە مەیخانەدا ـ کە شاگرد مەیخانەچییە جوانەکان پیاڵەی لە سەدەفی پڕشەرابیان دەگێڕا ـ لە شەرابەکەیاندا دەمانـدی کە حیکمەتی خواناسینی لێ هەڵدەڕژێ و ئەو زانستانەمان پێ دەڵێ کە لە قورئان و ئایەتدا هەیە.

یان: سوێند بە قورئان و ئایەت کە لە شەرابی مەیخانەدا تیشکی خودا دەبینین.

حافزی نەمریش لەو بارەوە دەڵێ:

لە مەیخانەی موغاندا ڕۆشنی خوا دیتە بەرچاوم
چلۆن تیشکێ لە چۆن شوێنێک دەبینم؟ سەیرە، سوورِ ماوم![1]

---

١. در خرابات مُغان نور خدا می‌بینم    وین عجب بین کە چە نوری زِ کُجا می‌بینم؟!
مامۆستا هەژار هەر لە پێشەکی ئەم کتێبە، ئاوا بەرگی کوردی دەبەر ئەو بەیتە کردووە:
لە مەیخانەی مەجووسان ڕۆشنی خوا هاتە بەرچاوم
دە بڕوانە چتۆ تیشکێ لە کوێدا خۆی نیشان داوم؟!

۴ عـــارف حـــەتا نەنۆشـــی ژ دەســـتێ مەیفرۆشـــی
غائیـــب نـــەبوو ژ هۆشـــی پەیـــدا نـــەکر ویلایـــەت

**مانای وشەکان:**

**عارف**: خواناسی بەڕاست؛ **حەتا**: هەتا؛ **ویلایەت**: شێخایەتی.

**پوختەی مانا:**

کەس ناتوانێ سەربەخۆ بە بێ ئەوە لە لای پیری تەریقەت فێری ڕێ و شوێنی ڕاستین ببێ، پێ بگات. بۆ ئەو کەسەی کە ڕێبواری ڕێگەی خوداناسینی بەڕاستییە، پێویستە شەرابی ئەوینی خودا، لە دەستی پیری تەریقەت بخواتەوە و بە تەواوی خۆی لە بیر بچێتەوە و خۆپەرستیی بتوێتەوە؛ ئەوسا هومێدی هەبێ کە بکەوێتە پلەی دۆستانی خوداوە.

۵ گونـــاه و زوهـــد و تامـــات هلنـــاگرت خـــەرابات
کەســـێ ب ڤـــێ دەرێ ڕەت دڤـــێ بکـــت ڕیعایـــەت

**مانای وشەکان:**

**زوهد**: تەرکەدنیایی؛ **تامات**: وڕێنە و قسەی هەلەق ـمەلەق کردن؛ **خەرابات**: مەیخانە؛ **ڤێ دەرێ**: بەو لایەدا؛ **ڕەت**: بڕوات؛ **ریعایەت**: هۆش پێوە بوون، موراعات.

**پوختەی مانا:**

لەو مەیخانەی ئەوینی خودایەدا نە ڕێگە بۆ قسەی دوور لە مانای حاڵ لێ هـاتوان هەیـە، نـە سەرکز کردن و خۆ لە خۆشی دوور کـردن باویـەتی. لەوێـدا هـەرچی هەیـە سەرخۆشـی و دڵخۆشییە. خۆ بە کز و کەنەفت نیشان دان و قسەی لابەلا کردن، گوناهن لەوێدا. هەرکەس دەیەوێ ڕێگەی تێ بکەوێ، دەبێ ئاگای لە دام و دەستوور بێ و موراعاتی ئەدەب بکا.

۶ عیشقێ ژ هـەردو چـەشمان ئـەووەل د دل ئەسـەر کـر
لـێ زەررە ـ زەررە ئـاخر سـۆتن کـر و سـیرایەت

**مانای وشەکان:**

**چەشم**: چاو؛ **لێ**: بەلام؛ **زەررە**: کەمووسکە، قورسایی مێروولەی وردی زەرد؛ **سۆتن**: سووتان؛ **سیرایەت**: گیرۆیی، تەنینەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەوین لە سەرەتا، لە ڕێگەی هەردووک چاوانەوە کەوتە دڵ و شوێنی تێدا کردەوە. بەلام هەروا هێدی‌ـهێدی و تۆزە‌ـتۆزە، گڕی دە دڵ بەردا و سووتاندی و سووتانەکەش تەنییەوە بۆ دەروون و هەناوان.

٧ «شاکیالسّلاح» هەردەم ب کوشتنا «مەلێ» هات
گازندەیان ژ کێ‌کم ژ کێ بکم شکایەت؟!

**مانای وشەکان:**

**شاکیالسلاح**: پڕ چەک؛ **هەردەم**: هەمیشە؛ **گازندە**: گلەیی؛ **ژ کی**: لە کێ.

**پوختەی مانا:**

یاری من ـکە تەنیا هەر ئەو دەناسم و هەموو هاوار و هانام هەر دەبەمە بەر ئەوـ هەموو دەمان بە بێ وچان، بە پڕ چەکیی، واتا: بە مژۆلان، بە چاوان، بە برۆیان، بە ڕوخسار، بە قەد و بالا و زولف و خالان ـکە چەکی هەرە بەکارن- دێتە کوشتنی مەلا؛ کە خۆم بم. دەیسا ئەگەر فەرمانڕەوا و پەنادەر بۆ خۆی ئازارم بدا، من لە لای کێ گلە بکەم؟ شکایەتم بەرمە بەر کێ؟ هەر خۆی دەبێ دادی من لە خۆی بستێنێ![1]

٨ جاما د دەستێ شاهید ژەنگێ ژ دل دشۆتن
پیرێ موغان ژ رەندان وەه- وەه دکر ریوایەت

١. سەعدی دەفەرموێ:

از دشمنان برند شکایت بە دوستان — چون دوست دشمن است شکایت کُجا بریم

**مانای وشەکان:**

**شاهید**: یار، گراوی؛ **دشۆتن**: دەشوا؛ **رەنـد**: لەزاراوەی عارفاندا بە کەسێک دەڵێن کـە تێکەڵ بە خوا بووە و جگە لە خوا گـوێ بـە هـیچ شـت ـلـە دنیـا و قیامـەتـ نـادا؛ **ریوایەت**: گێڕانەوەی قسە.

**پوختەی مانا:**

لە پیری موغان- کە نیاز پیری تەریقەتە- بیستوومە. ئەویش لەوانەوە کە تەواو تێکەڵ بە خوا بوون و هیچیان جگە لە خوا لە بیر نییە، وای گێڕاوەتەوە: کە ژەنگی دڵ تـەنیا بەو پیاڵە مەیە دەشۆرێتەوە کە لە دەستی یار وەردەگیرێ.

٩ ئـــەتوارێ عیشـــق و مەســـتی، ئەســـرارێ بوتپەرســـتی
تـــەقریرێ ســـەد ریوایـــەت ناکـــەت ل بـــۆ کیفایـــەت

**مانای وشەکان:**

**ئەتوار**: تەوران؛ **تەور**: حاڵەت؛ **بوت**: بت، نیاز دلبەرە؛ **تەقریر**: گێڕانەوە و باس کردن؛ **کیفایەت**: بەس.

**پوختەی مانا:**

حـاڵاتی ئەویـنـداریی و سەرخۆشـیمان بـەو ئەوینـە و نهێنییـەکانی یارپەرسـتن، بـە گێڕانەوەی سەد داستانیش تەواو نابێ و بۆ تێگەیاندنی بێئاگایان، بەش ناکا.

١٠ «لیطمَـــــئنَّ قَلبـــــی عَـــــیْنُ الْیَقـــــینْ» دبەخشـــــت
«عـــیْنُ الْعیـــان» دڤـــێتن کـــافی نهـــن درایـــەت

**مانای وشەکان:**

**لیطمَئنّ**: تا خاترجەم بێ؛ **قَلبی**: دڵم؛ **عَیْنُ الْیَقـین**: بێگومـانیی و بـڕوای تـەواو؛ **عـیْنُ الْعیان**: دیداری بێپەردەو بە ئاشکرا؛ **کافی**: بەس؛ **نهن**: نین؛ **درایەت**: زانست.

**پوختەی مانا:**

لە قورئانا دەفەرموێ: برایم پێغەمبەر گوتی: خودایا نیشانم دە چلۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە. خوا فەرمووی: بۆچی باوەڕت نەکردووە کە پێم دەکرێ؟ گوتی: بەڵێ باوەڕم کردووە و دەزانم مردووت پێ زیندوو دەکرێتەوە؛ بەڵام دەمەوێ نیشانم دەی تا دڵم ئاو بخواتەوە و خاترجەم بم. خوا فەرمووی: چوار مەلان لەبەریەک هەڵوەشێنە و لە سەر هەر کێوێک پاژێکیان لێ دانێ و ئەوسا بانگیان کە بەغار بەرەو خۆت دێنەوە.

شاعیر دەگەڵ وەبیر هێنانەوەی ئەم ئایەتە، پێمان دەڵێ: نهێنییەکانی دلداریی و یارپەرستن، هەر بەوەندە پێکنایە کە بلێی دەزانم؛ یان وا ڕیوایەت کراوە و باوەڕم کردووە؛ نەخیر خودا بە ئاشکرا دیتن و دەگەڵ خودا تێکەڵ بوونە کە دڵ خاترجەم دەکا و ئەم حاڵەتەش هەر بۆ خواناسە بەڕاستەکان دەست ئەدا.

١١ میریی و پادشاهی موویەک ل نک «مەلایێ»
نادم ب مولکێ عالەم یەک زەررەیەک عینایەت

**مانای وشەکان:**

**موویەک**: تاڵێک موو؛ **ل نک**: لە کن؛ **عالەم**: هەموو شت جگە لە خوا.

**پوختەی مانا:**

هەموو دنیا و هەرچی خوا دروستی کردووە، لە لای من تۆزکاڵێک لە بەسەرکردنەوە و لاواندنەوەی یار ناهێنێ. میری خونکاری دنیایی لە کن منی مەلا، نرخی تاڵێک مووی نییە و بە هیچی ناکرم.



# گران‌ناز

١ عەرعـــەر خـــەراما ب قـــەدد و قامـــەت
یـــەک بووســـە دا مـــە ب ســـەد قیامـــەت

**مانای وشەکان:**

**خەرام**: لارولەنجە؛ **قەدد و قامەت**: بەژن و باڵا؛ **بووسە**: ماچ؛ **قیامەت**: ڕۆژی زیندوو بوونەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو یارە جوانە کە بەژن و باڵای وەک داری عەرعەر، ڕاســت و بێ‌گرێیــە و لارولەنجــە دەکا، تا ماچێکی دامێ، ئەوندەی جزیا و ئازار پێ چێشتم کە بارتەقای دەرد و ئـازاری سەد ڕۆژی قیامەت و ترس و لەرزەکەیەتی.

٢ یەک بووسە بەخشی ئـەووەل ب ئیحســان
ئـــاخر ل مـــن کـــر جـــورم و غەرامـــەت

**مانای وشەکان:**

**ئیحسان**: چاکە؛ **جورم**: گوناه؛ **غەرامەت**: تاوان.

**پوختەی مانا:**

ماچی دامێ و سەر لە هەوەڵەوە لام وابوو هەر چاکەم دەگەڵ دەکا و هیچی‌تر. بـەڵام دەرکەوت کە زۆرم تاوان بژاردەوە و کەوتمە بـەر سـزای گوناهکارانـەوە و لـە ڕێگـەی ئەویندا بە دووی ئەو ماچەدا هەزاران تاڵی و زەبوونیم کێشا.

٣ ژ ژەنــــگ و زەرقــــێ دل دا بشــــۆتن
جاما ســەدەف بــین رەنــد و کەرامــەت

**مانای وشەکان:**

**زەرق**: ڕیا، مەرایی؛ **بشۆتن**: بشوات؛ **بین**: بهێنە؛ **رەند**: زۆر باش؛ **کەرامەت**: قەدر و ڕێز.

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ ئەو پیاڵە سەدەفییە پڕ لەو مەیەی کە هەم جوان و باشــە و هــەم مــرۆ دەباتــە پلەی قەدر و حورمەتەوە، بێنە و بماندەرێ؛ تا ژەنگی دڵ و نەنگی دوڕوویی و مونافیقی لە دڵمان بشواتەوە.

٤ ژ هەردو چەشمێن تەی مەست و خــونرێز
نــوورا دو چــەشمان کــێ دی ســەلامەت؟

**مانای وشەکان:**

**چەشم**: چاو؛ **تە**: تۆ؛ **خونریز**: خوێنڕێژ؛ **نوور**: ڕۆشنایی؛ **سەلامەت**: دوور لە نەخۆشی.

**پوختەی مانا:**

ئەی یار! ئەی ڕووناکایی دوو چاوەکانم! کێ هەیە لە دنیادا لە دەســت ئــەو دوو چــاوە مەست و عاشقکوژەی تۆ بە سەلامەت دەرچێ؟

٥ ل دەرد و ئێشـــــان پـــەیکان و نیشـــــان
مە ژ هەردو چــەشمان کفشــن عەلامــەت

**مانای وشەکان:**

**دەرد**: نەخۆشــی؛ **ئـێش**: ژان؛ **پـەیکان**: ســەرەتیر؛ **ئـێش**: پێــوەدان؛ **کفـش**: دیــاری، کەشف؛ **عەلامەت**: نیشانە.

**پوختەی مانا:**

ئەو بە پەیکان پێکانە و ئەو پێوەدانەی کە دوو چاوە مەستەکانت تووشی منیان کردووە ئەوندە کاریگەر بوون کە لە هەموو گیانی مندا شوێنیان کردووە و برین و جێ پێوەدان، نیشانەی کاری چاوی تۆمان بۆ دیاری دەکا.

٦ ریسوایێ عیشقێ تەنها نە ئەز بووم
کەس دی زەمانان حوب بێ مەلامەت؟

**مانای وشەکان:**

**ریسوا**: ناوزڕاو؛ **ئەز**: من؛ **حوب**: خۆشەویستی، دڵداری؛ **مەلامەت**: سەرکۆنە.

**پوختەی مانا:**

هەر تەنیا من نەبووم کە لەسەر دڵداری ناوم بزڕێ و لۆمەم بکرێ؛ هیچکەس لە هیچ دەورە و زەمانێکدا دڵداری بێ سەرکۆنە و لۆمەی نەدیتووە.

٧ دو سەجدە فەرزن فیلحال ببین بەر
دەما خویا بن ئەو قەدد و قامەت

**مانای وشەکان:**

**سوجدە**: سوژدە، بۆ کڕنۆش سەر نانە زەوی؛ **فەرز**: هەرە پێویست؛ **فیلحال**: دەسبەجێ؛ **خویا**: ئاشکرا.

**پوختەی مانا:**

هەرگا ئەو بەژن و باڵایەی یارمان بۆ دەرکەوێ و خۆمان لێ ئاشکرا بکا، لە سەرمان فەرزە دوو سەجدەی بۆ بەرین. سەجدەیەک بۆ پەرستنی ئەو کە شیاوی پەرستنە؛ سەجدەیەک لە شوکرانەی دیتنی بەژن و باڵاکەی.

٨ دا عـــەیبێ رەنـــدان نـــەکی بـــە بـــادێ
«نُفُـــوسُ قَـــوْمٍ بِهـــا تَســـامَتْ»

**مانای وشەکان:**

**دا**: وشەیەکە بۆ وشیار کردنەوە، دەغیلە؛ **رەندان**: ئەو سەرخۆشانەی گوێ بە دام و دەستوور نادەن؛ **نەکی**: نەکەی؛ **بە بادێ**: بە بادەیێ، بە شەراب خواردن، یان: بە بادا بدەی؛ **نُفُوس**: گیانان؛ **قَوم**: کۆمەڵ؛ **بِها**: بەوی؛ **تَسامَتْ**: بەرزەوە بوو.

**پوختەی مانا:**

دەغیلە نەکەی عەیب لە ڕەندان بگری کە شەرابی دڵدارانەیان خواردۆتەوە و سەرخۆشی ئەوینن و بە لۆمە و لەقەمەوە عەیب و عاریان بە بادا بدەی و بە گوێی خەڵکی ڕابگەیەنی. چونکە ئەو بادەیەی ئەوان خواردوویانەتەوە گیانی زۆر لە کۆمەڵ و پیاوچاکانی پێ بەرز بۆتەوە.

٩ «مـــەلا» ل عـــومرێ بی فەیـــدە بـــووری
کێشـــا ب زور ئـــان قـــەهر و نەدامـــەت

**مانای وشەکان:**

**بووری**: ڕابرا؛ **زور**: زیاد؛ **زور**: زۆری؛ **قەهر**: خەم و خەفەت؛ **نەدامەت**: پەشیمانی.

**پوختەی مانا:**

مەلا داخی گرانی هەر ئەوەیە کە تەمەنی بێبەهرە ڕابرا و دنیا بە زۆری تووشی ئەو هەموو خەمخواردن و پەشیمانیی لە کردەوەی ڕابردووی کردووە.



# رەنجی بێوەر

آ	عومرێ زایع بوو مە بێ دلبەر عەبەس (عَبَث)
وەی تەڤێ عومرێ مە بۆری بەر عەبەس

**مانای وشەکان:**

**عومر**: تەمەن؛ **زایع**: خەسار؛ **مە**: ئێمە؛ **عەبەس**: فیڕۆ؛ **وەی**: هەی مخابن؛ **تڤێ**: لەو؛ **بووری**: ڕابرد؛ **بەر**: سەر.

**پوختەی مانا:**

تەمەنمان بە بێیار بە خەسار چوو. داخم بۆ ئەو ژیانەمان کە بە فیڕۆمان دا.
«خەییام» ئەم مەبەستەی لە چوارخشتەکییەکدا هێناوە و دەڵێ:
حەیفم لە دڵێ دێ کە بە بێ سووتمانە	دڵداری تێیا نەکردووە هێلانە
هەر ڕۆژێ کە بێ دڵبەر و بێ دڵداری	بێنرخە، پڕوپووچە، زیانی ژیانە[1]

۲	دل ئەمانەت دا بە نائەهلان نەدی
لێ ب نائەهلان مە دا گەوهەر عەبەس

**مانای وشەکان:**

**دا**: ها، وشەی خەبەردار کردنە؛ **نائەهل**: نابابەت؛ **لێ**: بەلام.

---

۱. ای وای بر آن دل که در او سوزی نیست	سودازده‌ی مهر دل‌افروزی نیست
روزی کـه تـو بی یـار بسـر خواهی بـُرد	ضایع‌تر از آن روز، تو را روزی نیست

**پوختەی مانا:**

هەرگیز نەکەی دڵی خۆت بدەیە سەر پێنەزان و نەگونجاوان. جا کە پەندی تۆ ئەدەم، لە عیبرەتێکەوەیە کە خۆم گرتوومە. من گەوهەری عومرم دا بەوانەی کە شیاوی نەبوون.

٣ دا دسەیرا عیشقێ بێ دلبەر نەچی
لێ دبت سەیرا تە بێ دلبەر عەبەس

**مانای وشەکان:**

**سەیر**: ڕۆیشتن؛ **عیشق**: ئەوین؛ **لێ دبت**: لێ دەبێتەوە.

**پوختەی مانا:**

دەخیلە بە بێدڵبەر بە ڕێگای عیشقێدا مەبە ڕێبوار. چونکە ڕێبواری بێ دڵبەر، ڕۆیشتنەکەی بە فیڕۆ دەڕوات. واتا کەسێک کە بە بێ پیری شارەزا لای وا بێ بە خودا دەگا، هەرچی دەیکا بەهرەی بۆ نادات و بە ئاواتی ناگات.

٤ پور د پەی وەسلێ مە سەعی و جەهدەدا
جەهدەء و سەعیا مە هاتن دەر عەبەس

**مانای وشەکان:**

**پور**: زۆر؛ **د پەی**: لە شوێن؛ **وەسل**: پێک گەیشتن؛ **سەعی**: کۆشش؛ **جەهدە**: تەقالا؛ **هاتن‌دەر**: دەرچوون.

**پوختەی مانا:**

ئێمە بۆ گەیشتن بە یار زۆرمان کۆشش کرد. هەمووی بە فیڕۆ چوو؛ هیچمان بۆ نەکرا.

٥ ئاه وێ کوشتم ب دەربا خەنجەرێ
ما د مێلاکێ درەت خەنجەر عەبەس؟

**مانای وشەکان:**

**وێ کوشتم**: ئەو کوشتمی؛ **دەرب**: زەبر؛ **ما**: چۆن؟، کەی؟؛ **مێلاک**: جەرگ و هەناو؛ **درەت**: دەڕوا.

**پوختەی مانا:**

من کە وتم کۆششم بە فیڕۆ چوو، ڕاست نییە. ئاخ و داخمە لە ئێشی ئەو زەبری خەنجەرەی کە یار دەجەرگ و هەناوانی گیراوم. مەگەر ئەو خەنجەر لێدانە کەم کارێکە کە من لە دەستی یار پێم گەیشتووە؟ دیارە کارەکەم بێ بەهرە نەبووە.

٦ دل ژ دەربا کاشوان بوو پارەپار
گۆی د مەیدانێ دبت سەد کەر عەبەس؟

**مانای وشەکان:**

**کاشۆ**: شەق، گۆچانی گەمەی گۆیێن؛ **پارەپار**: لەتوپەت؛ **کەر**: کەرت، لەت.

**پوختەی مانا:**

دڵم وەگ گۆ، لە مەیداندا بە زەبری شەق و گۆچانی دڵبەر، لەتوپەت بووە. جا چۆن دڵ بە خۆڕایی دەبێتە سەد پارچە؟ دیارە یار بەزەی بە دڵما هاتووە. بۆیە بەر کاشۆی داوە و لەت و کوتی کردووە و ئەو سەد پارچە بوونەی دڵم، بە خۆڕایی نەبووە.

٧ مەهدەرا وێ سوختەئێ ئیرۆ بکن
ئەز دبێژم نابت ئەڤ مەهدەر عەبەس

**مانای وشەکان:**

**مەهدەر**: تکا؛ **سوختە**: تازە فەقێلە، یان: سووتاو؛ **ئیرۆ**: ئەمڕۆ؛ **ئەز**: من؛ **نابت**: نابێت؛ **ئەڤ**: ئەو.

**پوختەی مانا:**

وەرن ئەی خێرۆمەندان! ئەمڕۆ کۆ بینەوە بۆ تکا کردن دەربارەی منی سووتاوی ئەوین و تازە شاگردی ڕێگەی یار ناسین. من دەڵێم تکای ئێوە بە فیڕۆ ناچێ و یار بەزەی پێمدا دێت.

٨ کفشـــە مـــەعنا کـــی ل لـــەوحێ ســـیم دی
نوقتـــەیێ میســـک و خـــەتێ عەمبـــەر عەبـــەس

**مانای وشەکان:**

**کفش**: دیار، کەشف؛ **مەعنا**: واتە؛ **لەوح**: تەتەڵە؛ **سیم**: زیـو؛ **نوقتـە**: خـاڵ؛ **میسـک و عەمبەر**: دوو بۆنخۆشی ڕەنگ ڕەشن.

**پوختەی مانا:**

مەڵێن تکا بێبەهرەیە بۆ تۆ؛ کە بەخت ڕەشـیت و یـار وەک زیـوی بێخەوشـە. کـێ دەتوانێ بلێ لەسەر تەتەڵەی زیوین، خاڵ و خەتی ڕەش خەسار بووە؛ بەڵکوو جوانتری دەکا. یار کە پاک و بێخەوشە، ئەگەر منێکی بەختڕەش وەک ڕەشایی خەت و خاڵی عەنبەرین و میسک ئاسایی، لە لای خۆی جێ بکاتەوە چی تیایە؟
یاخۆ: ئەگەر خاڵی وەک میسک بچێتە سەر خەتی «عەمبـەر»، دەبێتـە «غەمبـەر» و ئەوسا غەمم لا دەچێ.

٩ دا «مـــەلا» هوشـــیار بی لـــێ پـــور کەســـان
ســـینە پـــور لێدانـــە ســـەنگ و بـــەر عەبـــەس

**مانای وشەکان:**

**دا**: ها، دەغیلە؛ **لێ**: بەڵام، یان: لـەو؛ **پورکەسـان**: زۆر کـەس؛ **سـینە**: سـینگ و بـەر؛ **سەنگ**: بەرد؛ **بەر**: بەرد.

**پوختەی مانا:**

هۆی مەلا! دەغیلە وشیاری خۆت بە؛ لات وا نەبێ کۆششت بە فیڕۆ ناچێ. زۆر کـەس زۆریان لەو ڕێگەدا بەرد لە سنگی خۆیان داوە و هیچیان بۆ بە هیچ نەکراوە. پیاو دەبێ تەنیا چاوی لە بەزەی خوا بێ و نابێ لای وا بێ بە سەرمایەی کۆشش پێ دەگا.



# یار ببینە

آ نامێ عەنبەرشکەنێ بێـت ژ عەنبـەر مەکـە بـەحس (بَحـث)
بل ژ وێ سلسـلە ئـو زولفـێ موعەنبـەر مەکـە بـەحس

**مانای وشەکان:**

**نام**: ناو؛ **شـکەن**: شـکێن؛ **بـەحس**: دوان؛ **بـل**: بێجگـە؛ **سلسـلە**: زنجـیر؛ **موعەنبـەر**: عەنبەراوی.

**پوختەی مانا:**

تا کەزی و پرچی بە زنجیرەی عەنبەراوی یار لە خەیاڵدایە، لـە بـەرچاوە. بـە ڕاسـتی بازاڕی عەنبەری لە بڕەو خستووە. جگە لەو نابێ باس بکرێ. عەنبەر دەبـێ خـۆی ون کا لە شەرمان.

آ ڤـــەکە لێڤـــێ و ژ نیڤـــێ بڤـــەرین قەنـــد و نـــەبات
ژ لەبێ لەعلێ شـەکەربیژ و ژ شـەککەر مەکـە بـەحس

**مانای وشەکان:**

**ڤەکە**: بکەرەوە؛ **نیڤ**: نێوان؛ **بڤەرین**: داوەرێنە؛ **شەکەربیژ**: شەکردابێژ، یان: وتە شەکر.

**پوختەی مانا:**

بزەیەکت بێتە سەر لێوان و لێوت لێک بکەوە و قەنـد و نـەبات لـە لێـوی شـەکردابێژ، (یان: شەکربێژت) داوەرێنە ئەم ناوەوە و هەرگیز باسی شـەکری دەسـکردی بنیـادەم مەکە! چونکە ئەو بەرانبەر بە شەکری لێوی تۆ ـکە بە ڕەنگی لەعلی ئاڵەـ نەک هـەر بێتامە، تاڵیشە.

٣ ب سـەر ئەنگوشـتێ عـەقیقێ بـدە شەهکاسـێ رەحیـق
ئابێ حەیوانێ تە چین ناڤـێ ژ کەوسـەر مەکـە بـەحس

**مانای وشەکان:**

**ئەنگوشت**: قامک، تلی؛ **عەقیق**: گەوهەرێکی ڕەنگ ئاڵە؛ **رەحیق**: مەی؛ **ئابی حەیوان**: ئاوی حەیاتێ؛ **چین**: وڵاتی چین؛ **کەوسەر**: سەرچاوەیەکە لە بەهەشت.

**پوختەی مانا:**

یارە جوانەکەم! تۆ بەو قامکە یاقیقییەت فینجانی مەی ببەخشی بـە هەرکـەس، ئیتـر ئاوی حەیاتت داوەتێ و پێویست ناکا وەک ئەسکەندەر بە شـوێنیدا هـەتا وڵاتی چـین بڕوا و دەستیشی نەکەوێ. نەک هەر ئەوندە بگرە نابێ لە بەرانبەر ئەو فینجانە مەیەی تۆدا باسی ئاوی کەوسەری بەهەشتیش بکرێت.

٤ زەریئـێن شـەهلە و دوردانـە بـبن شـاهیدێ بـەزم
ژ گەنمرەنگ و سـیەچەردە و ئەسمـەر مەکـە بـەحس

**مانای وشەکان:**

**زەری**: سپی پێستی ئاماڵ زەرد؛ **شەهلە**: شەهلا، چاوکـاڵ؛ **شـاهید**: دڵـبەر؛ **شـاهید**: حازر.

**پوختەی مانا:**

من کە دەڵێم تا زولف و لێو و پەنجەی فینجان لە سەری تۆ هەبێ نابێ باسی عەنبەر و قەند و ئاوی حەیات و کەوسەر بکرێ، وەک ئەوەیە کە لە کـۆڕێکی بـەزم و ئاهەنگـدا، جوانچاکی وەک دەنکە دوڕ و چاوکاڵ بەزمگێڕ بن وُ کِچانی ڕەش پێست و گەنمڕەنگ و ڕەشتاڵەش خۆ بنوێنن؛ کە هیچ نموودیان نابێ و ناشێ باسیان بکرێ.

٥ دێ بیشـارەت ب ئیشـارەت ژ نـەیێ بێتـە سـیماع
تـو ژ نایـێ د شـەمایێ بکـە بـاوەر مەکـە بـەحس

**مانای وشەکان:**

**بیشارەت**: مزگین؛ **نەی**: بلوێر؛ سیماع: شنەفتن؛ **سەما**: هەڵپەڕکێ.

**پوختەی مانا:**

مژدەی گەیشتن بە موراد، گەرەکە لە گەرووی بلوێرەوە بەرگوێ بکەوێ. تۆ لە کۆڕی سەما و بەزمدا، بە لۆرینەوەی بلوێر باوەڕ بکە کە دل دەزرینگێنێتەوە و لە باس‌وخواس واز بێنە!

هەروەک «مەولەوی ڕۆمی» لە سەرەتای مەسنەویدا فەرموویە:

گــــوێ لـــــە بلـــوێر بگـــــرە بـــیری لێکـــــەوە
شـــــــیوەنی دەردی جــــــودایی لای ئـــــــەوە[1]

٦ وێ نیهالـــێ ب دەر ئـــاغووش و بـــدێ جانـــێ شـــرین
شاخێ عومری ب خوە بەرژێ و ژ قەیسەر مەکە بەحس

**مانای وشەکان:**

**نیهال**: نەمام؛ **ئاغوش**: هامێز؛ **شاخ**: لک؛ **ژێ**: لەو.

**پوختەی مانا:**

ئەو نەمامە دەباوەش بگری و گیانی شیرینی لە ڕێگـەدا بـدەی و لـە هـەموو درێژایـی تەمەندا لکێک لەو نەمامە بۆ خۆت تەرخان کەی، ئیتر ناشێ لە بەرانبەرتا ناوی قەیسەر بگوترێ. چونکە تۆ کە بەو بەهرەیە بگەی لە هەموو قەیسەران بەختەوەرتری.

٧ ئایەتێ حوســنێ موفەســـەل کـە ژ کەشـشـافێ جـەمال
علمێ عیشقێ بکە تەفسـیر و ژ دەفتـەر مەکـە بـەحس

**مانای وشەکان:**

**ئایەت**: پاژێک لە سوورەتی قورئان؛ **ئایـەت**: نیشـانە؛ **حوسـن**: جـوانی؛ **موفەسسـەل**:

---

١. بشنو این نی چون حکایت می‌کُند    از جُدایی‌هـا شـکایـت می‌کُـنـد

شـی‌كراوە؛ **كەشـشـاف**: دۆزەرەوە؛ **كەشـشـاف**: تەفسـیرێكی قورئانـە؛ **تەفسیر**: ڕاڤـە؛ **دەفتەر**: كتێب، پەڕاو.

**پوختەی مانا:**

كاكی ئەویندارى خودا! تۆ بۆ ڕۆشن كردنەوەی جـوانی خـودا كارێكـت بـە دەفتـەر و كتێب و تەفسیران نییە. تۆ كە جوانی خودات دیت، خۆت دەتوانی زانستی ئەوین شی بكەیەوە و لە هەموو تەفسیران باشتری بە خەڵک تێ بگەیەنی.

**٨** رازێ دەهــرێ ژ ســپیهرێ تــو نــزانی ب جــەدەل
حیكمەتێ داوەرە تـو ژ حیكمـەتێ داوەر مەكـە بـەحس

**مانای وشەكان:**

**راز**: نهێنی؛ **دەهر**: زەمانە؛ **سپیهر**: ئاسمان؛ **جەدەل**: دەمەقاڵـە؛ **حیكمـەت**: زانسـتی هێژا؛ **داوەر**: ناوی خوایە.

**پوختەی مانا:**

بە دەمەقاڵە و كتێب خوێندنەوە و ڕوانینە ئاسمان، نهێنییە گرینگەكانی زەمانـە ڕوون نابنەوە. حیكمەتی خودا ئەوە نییە كە مەمانان پەی پێ بەرین. تۆ لە باسی حیكمـەتی خودا گەڕێ.

**٩** ئابــێ حــەیوان تــە دڤــێتن تــو ببــە هــەمرەهێ خــوزر
جامــێ جــەم بــین و ژ دارا و سـكەندەر مەكـە بـەحس

**مانای وشەكان:**

**ئابی حەیوان**: ئاوی حەیاتێ؛ **دڤێتن**: دەوێ؛ **هەمرەه**: هاوڕێ؛ **خوزر (خُضـر)**: سـەوز؛ **خزر**: خدر، ناوی یەكێک لە پیاوانی خودایە كە دەڵێن ئـاوی حـەیاتی خواردۆتـەوە و هەرگیز نـامرێ و هـەر بـە سـەوزی واتـا بـە لاوەتی دەمێنێتـەوە؛ **جامی‌جـەم**: نـاوی ئاوێنەیەكە لە ئەفسانەدا كە جەمشید تێی ڕوانیوە و هەموو شـتێكی تێـدا دیـوە؛ **دارا**:

خونکاری ئێران بووە و لە ساڵی ٣٣٣ بەر لە زایین، لەبەر ئەسکەندەری خونکاری یۆنان بەزیوە.

**پوختەی مانا:**

تۆ دەتەوێ ئاوی ژیانی هەمیشەییت دەس کەوێ کە گەیشتن بە خودایە؛ دەبێ پیرێکی دەستگیری خدر ئاسایی بکەیە هاوڕێ و ڕێنیشاندەر. ئەوسا جامی جەمت دێتە بەرچاو؛ هەموو شتێک دەبینی. ئەگینا باس لە ئەسکەندەر و دارا و چیرۆکی کۆن، هیچ بەهرەت بۆ نادات.

١٠ ژ ئەزەل عاقیبەتێ کار کو مەعلووم نەبت
جامێ مەی نووش و ژ تەقدیرێ موقەددەر مەکە بەحس

**مانای وشەکان:**

**ئەزەل**: هەرە زوو؛ **عاقیبەت**: بنەتا، دوایی؛ **تەقدیر**: لێکدانەوە؛ **موقەددەر**: ویستی خودا.

**پوختەی مانا:**

هەر لە ڕۆژی بناوانەوە کە تێ نەگەیەنراوین دواییمان بە چی دەگا و چارەنووسمان چییە، چاک وایە پیاڵەی بادەی ئەوین بخۆینەوە و سەرخۆشی ئەوین بین و لەوە نەکۆڵینەوە کە یار چی بڕیار داوە بۆمان. هەرچی خۆی دایناوە دەبێ پێی شاد و شوکور بین.

١١ دلێ یارێ مە نەبوو نەرم ب سەد ئابێ گری
ژ دلێ دلبەرێ ما و بەرێ مەڕمەڕ مەکە بەحس

**مانای وشەکان:**

**گری**: گریان؛ **بەر**: بەرد.

**پوختەی مانا:**

دڵی یارەکەمان بە فرمێسکی زۆری سەد جار گریان نەرم نەبوو. تۆ ناشێ دڵـی ڕەقـی یاری ئێمە دەگەڵ ڕەقایی بەردی مەڕمەڕدا بەراورد بکەی و لێی بدوێی.

۱۲ تیر سەد تێنە جەگەر سینە ل بـەر مایـە چەپـەر
ژ دل و جەرگێ کول و سینەیێ کەر_کەر مەکە بەحس

**مانای وشەکان:**

**تێنە**: دێن؛ **جگەر**: جەرگ؛ **سینە**: سینگ؛ **چەپەر**: سەنگەر؛ **کول**: بریندار؛ **کەر_کـەر**: لەت_لەت.

**پوختەی مانا:**

لە سەر کوڵمە و لە مژۆڵەکانی یارەوە بە سەد_سەد تـیر بـەرەو جـەرگم دێـن. تـەنیا سەنگەر و مەتاڵم سنگی بێتین و تاومە. دەسا ئیتر خۆت دەزانی برینی جەرگ و دڵی بریندار و سینگی لەت_لەت کراوم هەر باسی ناکرێ کە چۆنن.

۱۳ شیرێ ئەلماسی کشینت تـو ژ لامیـع دە خەبـەر
ڤەکرت حوققەیێ یاقووت ژ گەوهەر مەکە بەحس

**مانای وشەکان:**

**لامیع**: برووسکەدەر؛ **لامیع**: تروووسکەی هەور؛ **ڤەکرت**: بکرێتەوە.

**پوختەی مانا:**

لە کاتێکا کە یار قامکی سپی و تروووسکەدارێ بۆ سەرکۆنەی ئەویـندار ڕادەدێـرێ، تـۆ لات وایە برووسکەی هەور دیاری داوە. ئەگەر لێو بزێوێ و ددانی بەرچاو کەوێ _کە دەمی وەک قوتووی لە یاقووتە_ ناشێ تۆ باسی گەوهەر بکـەی. چونکـە گەوهـەر لـە بەرانبەر دەم و ددانی یاردا هیچ برەوێکی نییە.

۱۴ ژ شەفەق زوهرە خویا بت تو بنێ پەروینان
جەبهەتێ ئەو بنومێت تو ژ مەهـ و خاوەر مەکە بەحس

**مانای وشەکان:**

**شەفەق**: کەنارەی سووری ئاسمان لە ئێوارەدا؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **بنێ**: بڕوانە؛ **پەروین**: ئەستێرەی پێرۆ؛ **جەبهەت**: توێڵ؛ **بنومێت**: بنوێنێ؛ **مەهـ**: مانگ؛ **خاوەر**: ڕۆژهەڵات.

**پوختەی مانا:**

لاجانگی یار ــکە سپییە و نزیک شەوی پرچە و تیشکی سووری ڕومەتی داوەتەوە و لە زوهرە جوانترەــ دیاری بدات، تۆ چۆن دەبێ بڕوانییە جوانی ئەستێرەی پیرۆ؟ هەنیەی یار خۆی بنوێنێ کێ ڕای دەکەوێ باسی خۆر و خۆرهەڵات و مانگ بکات؟

۱۵ ل روێ یارێ دو مەهـ نەو مە قران دینە دمەست
تو ژ سەیرا قەمەرێ تالع و ئەختەر مەکە بەحس

**مانای وشەکان:**

**نەو**: نوێ؛ **قران**: نزیکی؛ **قەمەر**: مانگ؛ **تالع**: هەڵاتوو؛ **ئەختەر**: ئەستێرە.

شیاوی باسە: ئیبراهیم پێغەمبەر ئەستێرە و مانگ و ڕۆژی دیوە، لای وا بووە خودای ئەون. کە دیتوونی ئاوا دەبن، گوتوویە ئاوابووم خۆش ناوێ و داهێنەریان خودای منە.

**پوختەی مانا:**

تۆ چیتە باس لە هەڵاتنی مانگ و ئەستێران دەکەی و بە بەڵگەیان دادەنێی؟ وەرە سەیری منکە! من دوو مانگی تازە هەڵاتووی یەکشەوەی مەست و سیوەنگیم لە نزیک یەکەوە لە ڕووی یاردا دیوە کە ئاوا بوونیان بۆ نییە و گومانم نەماوە کە یار شیاوی پەرستنە و کارم بە باسی مانگ و ئەستێرە نەداوە.

ئەستێرەناسان دەڵێن: ئەگەر دوو ئەستێرەی بەودم لێک نزیک بن، دنیا بەختەوەر دەبێ. مەلا دەڵێ نەک دوو ئەستێرە، من دوو مانگم لە نزیک یەکەوە دیوە کە مایەی ئەوپەڕی بەختیاریمە.

١٦ پور ژ دیم و خەت و خالان تە خەبەر دایە «مەلا»
نەزەرێ وەر بدە بەژنێ ژ موفەسسـەر مەکـە بـەحس

**مانای وشەکان:**

**دیم**: ڕوخسار؛ **وەر**: وەرە؛ **بەژن**: قەد و باڵا؛ **موفەسسەر**: ڕاڤەکراو.

**پوختەی مانا:**

هۆ مەلا! تۆ زۆر بە تەواوی دەربارەی پەسنی ڕوخسار و خەت‌وخاڵی یار دواوی. دەورە چاوێکیش لەو بەژن و باڵا شەنگ و چەلەنگە بکە و ئیتر ئەوپەڕی شیرینکاری خـودات بۆ دەردەکەوێ و نیازت بەوە نامێنێ کە دەربارەی داهێنـانی بێ‌وێنـەی خـودا مانـای کتێبانت بۆ لێکدەنەوە.



# بازاڕی جیهان

۱ تو سـەحەرگەهـ ب تەماشـا وەرە بـازاریٚ حـودووس (حُـدُوث)
لـیٚ تـە بـیٚ فایـدە ئـازار نـەدت خـاریٚ حـودووس

۲ دا ژ دل غونچــە لەبــەک نــازک و تەردانــە بژیٚــری[1]
ب تەبەسســوم ب تــەڕا بیٚتــە ژ گــولزاریٚ حــودووس

**مانای وشەکان:**

**حودووس**: پەیدا بوون، فەیلەسووفان بەدنیا دەڵێن «حُدوث»، چونکە خـۆی نـەبووە و خوا سازی داوە؛ **حودووس**: ڕووداو؛ **حودووس**: کارەسات؛ **لیٚ**: بەڵام؛ **خار**: دڕک؛ **دانە**: تاقانە، بێوێنە؛ **ب تەرا**: دەگەڵ تۆ؛ **تەبەسسوم**: بزە.

**پوختەی مانا:**

لە دەمی بەربەیانێکدا وەرە بازاڕی دنیا بۆ تماشایە. بـەڵام هۆشـت هـەبێ بـێ بـەهرە ئازارت نەدا دڕکی! هەتا بتوانی بە دڵی خۆت یەکێکی جوانی بێوێنەی تـەڕ و ناسـک ـکە لێوی خونچە ئاسا تەنگ و ڕەنگ ئاڵەـ لەگەڵتا بێ و لە گوڵـزار بـەرەو ڕووی تـۆ بزەی بێتێ.

۳ سەد گریهـ مـن د دلـن لـەو کـو چـەپ و راسـت دکـر
شاهیٚ حوسـنیٚ قیـدەمیٚ زولفـیٚ گریهـداریٚ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**لەو**: لەبەر ئەوە؛ **حوسن**: جوانی؛ **قیدەم**: هەر هەبوو، بەرانبەری پەیدا کراو.

---

۱. عوسمان تونچ: «دا ژ بل غونچەلەبەک نازک و تەر نەبژێری». کێشی ئەم بێ گرێیە.

**پوختەی مانا:**

لەو ساوە کە پادشای جوانی خودایی ـکە ئەو جوانییە هەر هەبووە و پێشینەی نییەـ زولفی یارمی بە لای ڕاست و چەپدا خستووە و هەریەک لەو کەزیبانە هەزار چین و گرێی تێ کەوتووە، منی هەژار بە سەد جێ، دڵ پڕ لە گرێم و هاوارمە لە دەست زەمانە و بەو حاڵەش هەر شاد و ڕازیم.

۴ بـل ژ سولـتانێ قیـدەم مـن ب تـو ئیقـرار نـەهن
گەر لکا بامە نهەن (نەهن) متقەب و بزمارێ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**بل**: بەجگە؛ **سوڵتان**: دەستەڵاتدار؛ **تو**: هیچ؛ **کاب**: گوێزنگ؛ **نهەن**: دانێن؛ **نەهن**: نین؛ **متقەب**: مەتکەو، ئامرازی کون کردن.

**پوختەی مانا:**

من کە دڵم داوە بەو جوانییەی یار و سەتان گرێم کەوتۆتە دڵ لە دیتنی زولفی چین–چین و پڕ گرێ، هەر بۆیە کە بە جوانی خوای دەزانم و لام وایە بەر لە پەیدا بوونی دنیا هەر بووە و گۆڕانی بەسەردا نایە. ئەینا هەرگیز جگە لە خوا، دڵم نادەم بە هیچ شتێک کە ڕوودەدا و پەیدا دەبێ. تەنانەت ئەگەر گوێزنگم بە مەتکەو کون–کون بکەن و بزماریشی لێ داکوتن، دڵداری خوام و هیچی تر. جوانی خودا لە ڕووی سەلمادا دەبینم.

۵ دل د دەریایێ قیـدەم قافـە ب سـابتقەدەمی
گەرچی دایم ل سـەرێ فەرقەمـە مینشـارێ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**قیدەم**: هەربوو؛ **قەدەم**: پا؛ **قاف**: دەیانگوت چیایەکە دەوری دنیای داوە و بنی لەدەریادایە؛ **فەرق**: تەپڵەسەر؛ **مینشار**: هەڕە، مشار.

**پوختەی مانا:**

دڵم لە دەریای ئەوینی ئەو جوانییە خودانوێنەدا وەک کێوی قاف خۆی داکوتاوە و پێداگرە. ئەگەر بێت و بە مشاری کارەسات و ڕووداوەکانی سەر دنیا ـکە لام هیچەـ تەپڵەسەریشم شەق بکەن، نە دەلەرزم نە لە ئەوین دەس هەڵدەگرم.

٦ بەلکوو دیوار ب گوهـ بن ب خودێ کی ب خودێ
ب تو رەنگی نەکری ئەشکەرە ئەسرارێ حودووس

**مانای وشەکان:**

**بەلکوو**: بەشکەم؛ **خودێ**: خودا؛ **ئەشکەرە**: ئاشکرا.

**پوختەی مانا:**

مەلا زۆرت پێ لێ هەڵێناوە! نەکەی بۆ خاتری خودا، دیسان بۆ خاتری خودا، بە هیچ باراندا نهێنییەکانی ڕووی‌داوە و نهێنییەکانی دنیایە ئاشکرا نەکەی! نەکا ئەوە دیوارە خاوەن گوێ بێ و لێ‌نەزانان قسەی دڵت لێ ببیسن.

٧ لەمعەیەک گەر ژ کەنارێ قیدەمێ پەرتەوێ دەت
دێ ژ بەر وێ سەعەتێ مەحو بن ئەنوارێ حودووس

**مانای وشەکان:**

**لەمعە**: ترووسکە؛ **پەرتەو**: تیشک؛ **سەعەت**: دەم، کەمترین وەخت، سەعات؛ **مەحو بن**: لە بەین بچن؛ **ئەنوار**: ڕۆشناکییان.

**پوختەی مانا:**

ئەو دڵدارەی گەیشتۆتە بارەگای یار، نابێ بە هیچ جۆر ئەوی لە یاری دەزانێ، نەک لای خەڵک، بگرە لای خۆشی بیدرکێنێ. چونکە تەنانەتی ئەگەر هەر تەنیا تروووسکەیەکیش لە خەرمانەی تیشکی جوانی یاری ئەزەلی ـکە خودایەـ بداتە سەر ئەم دنیایە، هەرچەند تیشک و ڕۆشناکی لە دنیایە، لە تاوی ئەو، دەستەولەجێ لە ناو دەچن.

٨ وێ ب سـەد پەنجـەرەیان دایـە شـوعاعا قیـدەمێ
گونبەدێ عیشقێ ل سەر کورسیێ دەوارێ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**وی**: ئەو؛ **شوعاع**: تیشک؛ **دەووار**: خولخولە، زۆر بە سووڕانەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو نهێنییەی کە من دەڵێم نابێ و ناشێ بیدرکێنم و خەڵکی لێ ئاگادار بکەم، نهێنی لە نێوان خودا و دڵدارەکانی خودایـە کـە بریـەتین لـە ئـەولیا. واتـا بـە فـەرموودەی سەعدی:

بولبـول دەوەرە فێـری ئـەوین بـە لـە پەپـوولان
نـووزەت نەیـە بـاش هەڵـبکرووزیت و بسـووزیت[1]

نەک لام وا بێ کە تیشکی هەمیشە بوویی (ئەزەلییـەت)ی خـودا بـەرپیوار و نادیـارە؛ نەخێر، ئەو ڕۆشناکییە لە سەتان ڕۆچنە و دەلاقەوە لەم گونبەزە خولخولە و سـەر لـێ سوڕماوەی دنیای نە هەتا سەری داوە و بە هەزار جۆر دێتە بـەرچاو. بڕوانییـە گیانـدار یان بێگیان، هەرچی ئافەریدە هەیـە، نیشـاندەری ئـەو تیشـکەیە. تەنانـەت جـوانیی دڵبەران، زۆر بە ئاشکرا ئەو جوانی خوداییە پیشان ئەدات.

٩ تـو حودووسـێ وە مـەبین قـەنج نـەزەرکی جـارەک
ل ئەساسـێ قیـدەمێ دانییـە دیـوارێ حـودووس

١٠ هـەرە ئەسڵـێ خـوە و تـەرتیبێ قیاسـێ ژێکـە
گـەر نـزانی چییـە یـەک جـار بـەرێ دارێ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**وە**: ئاوا؛ **قەنج**: باش؛ **نەزەر**: ڕوانین، تماشا؛ **ئەساس**: هیم؛ **دانییە**: دانـدراوە، یـان:

---

١. ای مرغ سحر عشق ز پروانه بیاموز کان سوخته را جان شد و آواز نیامد

داینا‌وە؛ **هەرە**: بچۆ؛ **تەرتیبێ قیاسێ**: بە بەراورد کردن، هەر شتە لە شوێن خۆ دانان.

**پوختەی مانای هەردووك بەیت:**

تۆ ناشێ هەروا بە سەرچڵی بڕوانی و بیر نەکەیتەوە! ئەگەر باش هەر لەم دنیایە و چی تێدایە، بە زیتی و وردی بڕوانی، باشت بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هیمی دنیا و ڕووداوەکانی کە ڕوو دەدا، لەسەر خواستی ئەو خودایە کە هەر بووە و هەر دەبێ؛ دامەزراوە و خۆبەخۆ پەیدا نەبووگە. جا ئەگەر هەتا سەرچاوە پێدا بچی و بەراوەردێکی ورد بکەیت و بە باشی هەر شتەی هەیە بەرییەوە سەر بنچینەکەی، ئەوسا بۆت ڕوون دەبێتەوە بەری داری دنیای فانی لە چی و لە کوێوە هاتووە و سەرەتای بە چییەوە بەندە.

۱۱ ئاتەشێ عیشقێ شبێ زێر وجودێ حەل کەت[1]
هەیە مومکین نەفرت زەیبەقێ فەرراریٚ حودووس

**مانای وشەکان:**

**ئاتەش**: ئاگر؛ **حەل**: توانەوە؛ **شبێ**: وەک؛ **زیبەق**: جیوە؛ **فەررار**: زۆر بزۆز و دانەسەکناو.

**پوختەی مانا:**

هەروەک چۆن زێڕ لە بۆتەدا، لەسەر ئاگر دەتوێتەوە، ئێمەش بە تینی ئەوینی یاری خۆمان تواوینەوە و خشتوخاڵی خۆشەویستیی دنیاییمان ـکە وەک جیوە بۆ هیچ کەسێ ئۆقرە ناگرێ و لە ناو دەستاندا ڕا دەکا_ لە کۆڵ کەوت. دیارە تینی ئاگرێکی زێڕی پێ بتاوێتەوە، جیوە هەر خۆی لەبەر ناگرێ.

«نالی» دەربارەی دەس لە دنیا بەردان بۆ دڵبەرەکەی فەرموویە:

بۆ تۆ کە بیکر و تازە وەکوو حۆری جەننەتی
قەیدی چییە عەجووزەیی دنیا بدەم تەڵاق؟

---

[1]. ئەحمەد زڤنگی و سەلمان دلۆڤان ئەم لەتەبەیتەیان وا نووسیوە:
«ئاتەشێ عیشقێ وجوودێ حەل دکت شوبهەتێ زەر»

١٢ «الله الله» کـو دعـومریَ خـۆه تـو جـارەک نـەبهی
چ سـەدا تێتـە ژ وێ گونبـەدێ دەوواریَ حـودووس

١٣ تـو ژ بـەر پـەردەیێ وەهمـیَ وەرە دەر تـا ببهـی
چ نەوا تێتـە ب سـەد نەغمـە ژ ئـەو تـاریَ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**الله الله**: وشەی سەیر مانە واتا: زۆر سەیرە؛ **تو جارەک**: هیچ جاران؛ **نەبهی**: نەبیسی، نەتبیست؛ **وەهم**: خەیاڵی پووچ؛ **نەوا**: ئاواز؛ **نەغمە**: هەوای مووزیک.

**پوختەی مانا:**

کابرای بێخەبەر لە دەردی دڵی ئەویندارانی جوانی خودایی! زۆر پێم سەیرە کە لە بەر سوورخواردنت لە ناو ئەم گونبەزە سووڕدەرەدا ـکە دنیایە و هیچ مان و بەقای بۆ نییەـ وا کەوتوویە ناو گێژی خەیاڵاتەوە، گوێچکەی دڵت کپ و کەڕە و هیچی بەکەڵک نابیسی. وەرە دەر لە ناو خەیاڵات! ببیسە چەند هەوا و دەنگی هەمەجۆر، کە حیکایەت لە گەورەیی و جوانی بێوێنەی یار دەکا و لە ژێ کەمانچەی دنیایە دێتە بەر گوێ. من دەیبیسم تۆ نایبیسی؟ بەڕاستی زۆرم بەزەیی بە تۆدا دێ و سەیر ماوم.

١٤ حـال و موسـتەقبەل و مـازی د خـوەدا تێـک یـەکن
سوبح مەوجوودە ب عـەینێ خـوە د ئیڤـاریَ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**حال**: ئێستە؛ **موستەقبەل**: داهاتوو؛ **مازی**: ڕابردوو؛ **تێک**: تێکڕا؛ **عەینێ خوە**: بێ زیاد و کەم، تەواو پڕبەپڕ.

**پوختەی مانا:**

لەو شوێنەدا کە ئێمەی دڵدار گەیوینێ، داهاتوو و ڕابردوو و ئێستای تێدا نەماوە. بەرەبەیان و ئێوارە و درەنگ و زوو، لە بەرچاوی لە دڵداری بێئاگایان هەیە. لای

ئێمە بەیان و ئێوار هەر یەکێکە و لە بارەگای یار، حیسابی کات و سات و بەیان و ئێوارێک نییە.[1]

۱۵ راست و چەپ گاف و سەعەت هەر لمـە ئـەودا تینـت
زولفـەقاریٚ قیـدەمیٚ حەیـدەریٚ کـەرراریٚ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**گاف**: کات؛ **سەعەت**: دەم؛ **زولفـەقار**: شیرە دوو دۆخە بەناوبانگەکـەی ئیمـام عـەلی؛ **حەیـدەر**: شێر؛ **کـەررار**: ئـەوی زۆر بادەداتـەوە سـەر دوژمـن، چـەرخی؛ **حەیـدەری کەررار**: نازناوی ئیمام عەلی بووە.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی تانەی نەزانی لە چاوی دڵیان پەڕیوە و بەرەو خودا سەر دەکەون، قسـەکانیان دووتۆمەن و یەکتر ناگرن. بە دەردی سەعدی گوتەنی:

گـا یەکجـار بالانشینم گا پشتی پای خۆم نابینم![2]

دەمێک لە گەشەی سەرخۆشی بە بەختی خۆیان دەنازن؛ کاریان بە دنیا و قیامـەت و بەهەشت و دۆزەقیش نییە؛ لە هەموو شت بـالاترن. دەمێـک دێنـە ڕێکـی هـەردی و دەردی دڵیان لە زەمانە دەس پیٚدەکا؛ هەژارانە دەیکەن بە نووزە و کرووزە و خـۆ بـە گوناهبار دەزانن و دەترسن نازیان بشێویٚ.

جا کە مەلا لە شیعرەکانی پێشوویدا دەگەڵ سەرچاوە تێکەڵـە و لـە نهێـنی تایبـەتی شارەزا بووە و زێڕی قاڵە و جیوەی دنیای لە لا بایە، لەم بەیتانەی ئایندەدا جۆریٚتر خۆ نیشان دەدا و بە ئاخەوە پێمان دەڵیٚ:

هەروەک چۆن ئیمامی عەلی بە شیرەکەی دەکەوتە جەستەی دوژمنـان، دنیـاش لـە ڕاست و چۆپەوە ئاوا دڵ و گیانی منی وەبەر شیری بەلا داوە.

---

۱. پێغەمبەری خوا فەرموویە: «لە کن خودا، بەیانی و ئێوارە نییە»؛ وا دیارە مەلا ئیشارەی بەو فەرموودەیە کردووە. «هەژار»

۲. گهی بر تارک اعلا نشینم زمانی پشت پای خود نبینم

١٦ ڕاست و ئەڤراز و نشوڤێ مە بوارن یەک و یەک
لێ تنێ وێ ل مە بوو دائیرە بەرواری جودووس

**مانای وشەکان:**

**ڕاست**: دەشتایی؛ **ئەڤراز و نشوڤ**: هەوراز و نشێو؛ **بوارن**: بوورین؛ **یەک و یەک**: یەکی_یەکی؛ **دائیرە**: جەغز؛ **بەروار**: گەوە، ڕێگە لە قەدی چیا.

**پوختەی مانا:**

هیچ هەوراز و نشێوم هەڵنەبواردووە کە پێیاندا ڕانەبوورم. تەنیا گەوەی دنیا ماوە کە وەک جەغز، دەناویدا هەڵدەخولێم و قەتیس ماوم.

١٧ دێ ل قەلبێ مە چ دەت لامیعەیا ئیسلامی
کو ل جانێ خوە مە خەف بەستیيە زوننارێ حودووس

**مانای وشەکان:**

**لامیعە**: ترووسکەدەر؛ **خەف**: بە نهێنی؛ **زوننار**: پشتێندی گاورانە.

**پوختەی مانا:**

دەسا ئێمەی کە بە ڕواڵەت ئیسلامین و لە بنەوە زوننا‌ری دنیاپەرستیمان لە پشتایە، چۆن بە ئاوات و تەما بین کە وەبەر تیشکی بێ‌گرێی ئیسلامەتی ڕاست بکەوین؟

١٨ ڕەنگ و ژەنگێ حەدەسێ نەقشێ حودووسێ مە د دل
بدە بەر ڕەندشێ عیشقێ ئەوە قەسسارێ حودووس

**مانای وشەکان:**

**حەدەس**: ڕووداو؛ **ڕەندەش**: ڕەندە، چلکبەر؛ **قەسسار**: گازر.

**پوختەی مانا:**

لە ڕووداوە کارەساتەکانی دنیا دڵمان ژەنگی هەڵێناوە و ڕەنگی زۆر خراپ گۆڕاوە. چار

هەر ئەوەیە بە دەس ئەوینی بسپێرین کە بۆمان خاوێن کاتەوە. ئەوین بۆ دڵ وەک گازرە بۆ پارچەی چڵکن و گەمار.

١٩ جان ل سەر دەستێ نهایی د ڕیا جانان‌دا
ڕووح سەف‌سەف کو ڤەوەستانە د بازاڕێ حودووس

**مانای وشەکان:**

**نهایی**: داندراوە؛ **جانان**: یار و دڵبەر؛ **ڤەوەستان**: ڕاوەستان.

**پوختەی مانا:**

لە کاتێکا هەموو گیانێک دەیەوێ لە بازاڕی جیهاندا بمێنێتەوە و ڕیز بە ڕیز لێی ڕاوێستاون، من گیانم وا لە سەر دەستم کە لە ڕێگەی یاردا بیدەم و خۆم لە دنیا ڕزگار بکەم.

٢٠ دێ ژ غەفلەت بڕەتن سایە زەوالێ ئەی دل
روونەنێ دا تو ئەمانەت ل سیها داڕێ حودووس

**مانای وشەکان:**

**دێ**: وێدەچێ، ڕەنگە؛ **غەفلەت**: نەکاو؛ **برەتن**: بڕوات؛ **زەوال**: لادانی ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمان؛ **روونەنێ**: دامەنیشە؛ **ئەمانەت**: خاترجەمی، دەغیلە؛ **سیها**: سێبەر.

**پوختەی مانا:**

دڵی سەرچڵ و سەرەڕۆ! لەوانەیە لە نەخافڵ سێبەری جەنگەی نیوەڕۆی ژیانی دنیاییت بڕەوێ و بکەوییە ئاسۆی ڕۆژپەڕی بەرەو نەمان. دەغیلە هەرگیز خاترجەم لە بن‌سێبەری دنیادا ڕۆمەنیشە.

٢١ تو ژ فەسڵێ هەرە ئەسڵێ کو دڤێ دەیرێ خەراب
دا نەبی مەرکەبێ جەهلێ تو د بن بارێ حودووس

**مانای وشەکان:**

**فەسل**: جیایی؛ **ئەسل**: ڕەگەز؛ **دەیر**: نوێژگەی ڕەبەنانی خاچپەرست؛ **خەراب**: وێـران؛ **مەرکەب**: ئەوی سواریی دەدا، بارەبەر.

**پوختەی مانا:**

تا لەم دنیا وێران و بە قوڕێ‌گێراوە بێ‌دەرەتان و گیرۆدەی، وەک بارەبەر لە ژێر بـاری نەزانیدای! بادەرەوە سەر ڕەگـەز و سـەرچاوەت و واز لـەم جیابوونەوەیـەت بـە هـۆی دنیاوە بهێنە تا لە بن بار قوتار ببی.

**٣٢** دا نیگـــارێ خـــوە ب ســـەد رەنگـــی ببیـــنی ئـــیرۆ
وەرە جارەک بکـە سـەیرێ تـو د ئـەتوارێ حـودووس

**مانای وشەکان:**

**نیگار**: جوانی دڵبەر؛ **سەیر**: تماشا؛ **سەیر**: گەشت و گەڕان؛ **تەور**: بار، حاڵەت؛ **ئەتوار**: جەمعی **توور**: کێوێکە لە سارای سینا.

**پوختەی مانا:**

ئەم دنیایـە هەرچەنـدە زۆر خراپیشـە و بـە خەرابـە دێتـە حیسـاب، بـەڵام بـاری زۆر لەباریشی تێدایە و چیای توووریش ـکە مووسا لەوێ دەگـەڵ خـودا دەئاخـاوت_ لـەم جیهانەبس. تۆ گەرەکتە یاری خۆت ئەمڕۆ بە سەت ڕەنگ بێتە بەرچاو، خۆت ئامـادەی گەشتێکی مووسا ئاسا کەو بگەڕە توووری سینایە.

**٣٣** تـو ب حالـێ مـە دزانی چییـە هـەر لـەحزە «مـەلا»
مە د دل تێت و دەرت خەنجەرێ غەدداری حـودووس

**مانای وشەکان:**

**لەحزە**: چاوترووکانێک؛ **غەددار**: بێ‌ئەمەگ و بەڵێن شکێن.

**پوختەی مانا:**

مەلا! گەرەکمـە پێـت بلـێم مـن چـۆنم و دەردم چەنـدە. لـە هـەر چاوترووکانێکـدا، خەنجەری دنیای بێ بەڵێن دەناو دڵما دێت و دەچێت؛ تێی دەچەقێت و دەردەچێ.



## سەوڵی ناز

آ
شمشـــادی خـــەرام و ســـەروی غـــەنناج
جانـــــان دبـــــرت ب عیشـــــوە تـــــاراج

**مانای وشەکان:**

**شمشاد**: داری شمشاڵ؛ **سەرو**: داری سەوڵ؛ **خـەرام**: لەنجـەولار؛ **غـەنناج**: زۆر بـەناز؛ **عیشوە**: غەمزە و ناز؛ **تاراج**: تالان.

**پوختەی مانا:**

ئەو بەژنە بە لارولەنجە و زۆر بەنازە ـکـە لـە سـەوڵ و شمشـاڵ دەکـاـ بـە سـیلەی چاوداگرتن و نازفرۆشتن گەلە گیان بە تالان دەبات.

٢
مـــن دی ســـەحەرێ د خوابـــێ مەســـتی
بێـــــــدەنگ تـــــــەزەروێ لالـــــــێ دورراج

**مانای وشەکان:**

**خواب**: خەو؛ **تەزەرو**: باڵدارێکی پنۆک_پنۆکی کلکدرێژە؛ **دورراج**: پۆڕ.

**پوختەی مانا:**

من لە بەرەبەیانێکدا ـکە هێشتان پۆر و تـەزەرویش لاڵ و پـاڵ بـوون و بـۆ خوێنـدن وەخۆ نەکەوتبوون‌ـ یارم دیت کە هێشتان خەوالویی شەو بەری نەدابوو.

٣
بشـــــکفت ژ غونچـــــە نیرگـــــزا مەســـــت
بـــــوو فـــــەرق ژ ســـــەر قەدیفـــــە دیبـــــاج

٤ جەبهـــەت کەشـــفی ژ ســـوبحێ ســـادق
نـــووری کـــو ڤـــەدا ل ســـەر شـــەبێ داج

**مانای وشەکان:**

**فەرق**: جیایی؛ **فەرق**: تەپڵەسەر؛ **قەدیفە**: پارچەی مەخمەر؛ **قەدیفـە**: گوڵـێکە؛ **دیبـا**: پارچەی ئاوریشم؛ **جەبهـەت**: توێڵ؛ **سـوبحێ سـادق**: بـەیانی ڕوون؛ **نـوور**: ڕۆشـنایی؛ **نوور**: گوڵ؛ **داج**: تاریک.

**پوختەی مانا:**

یار کە مەستی خەواڵو بـوو، چاوەکـانی ـکـە وەک دوو نێرگـزی مەسـتن ـ بـە ڕووی گوڵزاردا هەڵێنا. پارچەی ئاوریشمی سەرپۆشی لەسەر ناوچاوانی لادا. لە خۆشـی ئـەو دیمەنەی ئەو، نێرگز چاوی داپچڕاند و لە خونچەییەوە بـوو بـە گـوڵ. گـوڵقەدیفـەی ڕەنگ ئاڵیش بۆ لاسایی ئەو ڕوخسارە و بۆ دیداری، خۆی لە سەرپۆشی گـەڵای شـین ڕزگار کرد و هەموو لا دەبەژنی ڕاماین. ڕووناکی و سافی هەنیەی یـار کـە دەرکـەوت، تاریکایی شەوەزەنگی لە بەر ڕەوی و بەیانی ڕوونی وە دەر خست.

٥ ئەلماســـی نومانـــە شـــوبهێ میســـری
دانـــین جەگـــەرێ مـــە دل کـــر ئامـــاج

٦ نەســـــرین و بنەفشـــــە تەووزانـــــدن
مـــاوەرد درەشـــاندە شووشـــەیێ عـــاج

٧ جوهتـــێ حەبەشـــان ب تورفەتولعـــەین
ئانـــێ قـــەدەرەک ژ ئەســـپەهان بـــاج

**مانای وشەکان:**

**نومانە**: نواندیان؛ **میسری**: شیری میسری کە بە تیژ و جەوهـەردار بەناوبانگـە؛ **دانـین**: دایانگرت، هاتنێ؛ **ئاماج**: نیشانە؛ **ئەسرین**: گوڵێکی زۆر سپییە؛ **تەووزاندن**: ڕازاندنەوە و ڕێکوپێک کردن؛ **ماوەرد**: گوڵاو؛ **ڕەشاندن**: پرژانـدن؛ **شووشـە**: گـوڵاودان؛ **عـاج**:

ئێسکی ددانی فیل؛ **جوهت**: جـووت؛ **حەبـەش**: خەڵـکی حەبەشـە؛ **تورفەتولعـەین**: چاوتroوکانێک؛ **تورفە**: جوان و لەبەردڵان؛ **عەین**: چاو؛ **ثانی**: هێنای.

**پوختەی مانا:**

دیمەنێکم دێتە بەرچاو:

مەلا دوای نوێژی بـەیانی ـکـە دنیـا زۆر مـات و کشـەـ لـە مزگـەوت دەرکـەوتووە؛ گەشتێک دەکا. بە گیان و دڵ چاوی دڵ و گیانی بەرەو شانشینی کۆشـکی سـەلمای گراوی دەڕوانن. لەپڕ پەنجەرەی هەیوانی ڕوو بـە باخچـە دەکرێتـەوە. یـار خۆیـەتی؛ چاوی هێشتان مەستی خەوە. بەژن و بـاڵای بـەرز و تـەرزی تـل دەدا؛ دەلەرێتـەوە. چاوێک بە گولاندا دەگێڕێ و بزەیەک دێتە سەر لێوی. کارەکـەرێک ئاوێنـە و شـانە و گولاودان و کل و کلتووری بۆ دێنێ و لەسەر کورسی ڕووبـەڕووی دایدەمـەزرێنێ کـە خانم خۆی وەڕازێنێ و لە داهێنانی پەلکەی شـۆڕ، دڵـی دنیـا بشـۆرێنێ و بشـێوێنێ. کەزی دادێن. لە لادانیان، لاجانگی سپی دەنوێنێ. بە سینگ و بەرۆک و کەمەر، چەند لیزگە لە برۆیان دادێنێ. کلاوزێڕێکی پڕ پەرەنگ لەسەر دەنێ. بە سینگ و بـەرۆک و کەمەر، چەند لیزگە لە زێڕ و گەوهەر سەربەرز و بەختەوەر دەکا. لە وێنەدانی ئاوێنـە، خۆیشی عاشقی خۆی دەبێ. جا واوەیـلا لـە مـەلای دڵ برینـداری ئەوینـداری دوورە هومێد و هەژاری پاک و بێگەرد! لەم کاتەدا چی بە سـەر دێـت؟ سـەرچاوەی شـیعر دەجۆشێ؛ فیچقە دەکا. مەرکەف و قاقەز و قەڵەمی ناوێ. ئەشکی سوور و تای بژانـگ و پەڕەی دڵ هەیە. دەبا بزانین لەم سێ بەیتەدا، ئەو دەڵێ چی؟

برۆ ـکە وەک شیری میسری بەکەوانەن ـ بە مشتومالی سەرپەنجەی، وەک ئەڵماسـی تیژیان لێ هات. دڵمی کردە نیشانەیان؛ جەرگیشمیان پارەـپارە کـرد. لاجـانگی سـپی زیوین و کەزیە ڕەش و بۆنخۆشەکەی، خونچەی نەسـرین و وەنەوشـەی پـێ گەشـاوە و پشکووتن و بۆ دیداری دەستێکیان بە خۆدا هێنا و ڕازانەوە. گـولاودانی عـاج، لـە تـاوی لاجانگ و مەچەکی سپی و بۆنی خۆشی بسـکی خـاوی، لیکـاوی لـە دەم دەپـڕژا. کـل فرۆشانی ئیسفەهان ـکە بە کلچاکی ناودارن ـ لەوە ترسان چاوی ڕەشـی بێسـورمەی یار ـکە بازاڕی کلە سوبحانیش دەشکێنێ ـ برەوی سەودایان بەرێ. ملیان بـۆ خـولامی چەماند و بوونە باجدەری چاوانی و لە چاوترووکانێکـا سـەرانەیان گەیانـدە لای ئـەو دوو

حەبەشییە مەستانە. ئەگینا نە کەزیەکانی کاریان بە عەتر و گولاوە و نە چاوە مەستەکانیشی کلیان دەوێ. بۆنی خۆشی خودادادەی، بسکی خاوی و ڕەنگی لە ئەزەل دارژاوی جووتە چاوی، هیچ کاریکیان بە دەسکردی بەندەی خوداوە بەند نییە.

٨ سیما کو نوما نەما ل هش سیم
سیماب ژ خەجلە مایە رەجراج

٩ میرئاتێ سکەندەری ل پێشە
«بَحرٌ و لها العُکُوسُ اَمواج»

١٠ دۆرا قەمەرێ ژ بەر شەفەق دا
کو سپێدە ل فەرقێ سەر نها تاج

**مانای وشەکان:**

**سیما**: کەسم؛ **هش**: هۆش؛ **سیم**: زێو؛ **سیماب**: جیوە؛ **خەجلە**: شەرمەزاری؛ **رەجراج**: بەلەرزە؛ **میرئات**: ئاوێنە؛ **سکەندەر**: دنیاگرێکی بەناوە، دەڵێن ئاوێنەیەکی هەبووە هەموو دنیای نیشان داوە؛ **عُکوس**: وێنە دانەوە؛ **امواج**: شەپۆلگەل؛ **دۆر**: دەورە؛ **شەفەق**: ڕۆشنایی ئاسۆ لە ئێوارەدا؛ **سپێدە**: بەربەیان؛ **نها**: داینا.

**پوختەی مانا:**

کەسم و بیچمە ڕەزاسووک و ڕازاوەکەی کە دیاری دا، زێو لە تاوان لە هۆش چوو؛ سپی هەڵگەڕا. جیوە لە شەرمی لەرینی بەژن و باڵای، لە ڕەوت و لارولەنجەدا، لەرزی لێ هات. ئاوێنە کە وێنەی جوانی بێوێنەی هەموو دنیای ئەدایەوە، دڵی کەوتە شەپۆل دان و شەپۆلی جوانی دەویدا ببووە تۆفان و فەرتەنە. سپیایەتی بەرەبەیان بە دیمەنی ئەو ناسکە سپییە، لە خۆشیان بە سوپاسەوە قەدەمی وەک تانج نایە سەر. تەنانەت ڕووناکیی ئاسۆی ئێوارانیش لە عەیبەتان ڕۆژ و شەوی لێ گۆڕابوو؛ چووبوو دەوری مانگی دابوو؛ کە هیچ نەبێ کەمووسکەیەک وەک ڕوخساری یار دەنوێنێ.

مەبەستی مەلا ئەوەیە بریقەی کلاوزێڕەکە لە دەوری سەروسیمای یار وەکوو ڕووناکی ئاسۆ لە دەوری مانگی چاردەدا دێتە بەرچاو.

١١ چەرخــــە، فەلــــەک و مەلــــەک دبــــازن
«شَــــمسٌ و کواکِــــبٌ و اَبــــراج»

١٢ زوهــــرە ب قیرانــــێ قابــــێ‌قەوســــەین
«والــــنَجْمُ اذا هَــــوی بِمِــــدراج»

١٣ دەنگــــێ مەلــــەکان زمیهنــــە زەمزەم
ئــــەرواح ژ عیشــــقێ تێنــــە میعــــراج

**مانای وشەکان:**

**چەرخ**: ئاسمان؛ چەرخ: کۆڕی هەڵپەڕکێ؛ **فەلەک**: ئاسمان؛ زەمانە؛ **مەلەک**: فرشتە؛ **بازین**: سەما کردن، لەیزتن؛ **شەمس**: خۆر؛ **کەواکب**: ئەستێرەگەل؛ **ئەبراج**: ڕێبازەکانی ئەستێران؛ **قیران**: نزیک بوونەوە؛ **قاب**: ئەندازە؛ **قابەقەوسەین**: ئەندازەی ژێ‌کەوانێک (یان: ئەندازەی دوو دەست لە پەنجە تا هانیشک)؛ **نەجم**: ئەستێرەکۆی پیرۆ؛ **هەوی**: داکەوت؛ **مِدراج**: پلە_پلە؛ **زمیهتن**: گاڵەگاڵ کردن؛ **زەمزەم**: ویرەویر، زەمزەمە؛ **زەمزەم**: بوێسە؛ **زمەزم**: گورە و هەرا؛ **تێنە**: دێنە؛ **معراج**: بەرەو سەر کەوتن.

**پوختەی مانا:**

مەلای ئێمە کە لە بۆتەی ئەوینی خوداناسیندا قاڵ کراوە و پاڵێوراوە، لەپڕ دڵی دادەخورپێ و هۆشی گیانی لە سەیری جوانی سەلمایە _کە پاژێکی زۆر وردیلە لە دەریای جوانی خودایە_ ڕادەپەرێ و خوڕەی سەرچاوەی دێتە گوێ؛ حالی لێ دێ. هەموو نهێنی پشت‌پەردەی خاک و ئاوی ئەم زەمینەی دێتە بەرچاو. چی ببینێ؟ نەک هەر ئەو لە جوانی خودای جوانی‌دەر بە سەلماکەی ئەو سەرخۆشە و دڵی دەجۆشێ، بگرە هەرد و ئاسمان و هەرچی لە ناویاندا هەیە، کەوتوونە خۆشی و زەمزمە و هەڵپەڕکێ و بەزم و دیلانە. فەرموویەتی:

کۆڕی هەڵپەڕکێ و سووڕدانە؛ ئاسمان و فریشتەکان و ڕۆژ و ئەستێرە و برجەکان سەما دەکەن. زوهرە بە دەم هەڵپەڕکێوە نزیک بۆتەوە لە پیرۆ. ئەستێرەی کۆش بە سەماوە پلە_پلە بەرەو ئەو بەیانە جوانە دادەکەوێ. پۆل_پۆل فریشتە لێک کۆن و هەرایانە،

گاڵەیانە، ناڵەیانە، هەڵدەپەڕن، دادەپەڕن، بە ویرەویر، بە دەنگی قەو، پەسندی ئەو جوانییە دەدەن. هەموو گیانێکی بەختەوەر بەرەو تیشکی جوانی خودا، بۆ سەرکەوتن ملە دەکەن. گەرەکیانە زووی بگەنێ و سەیری بکەن.

«سەعدی»ش لەم بارەدا دەڵێ:

گەڵای شینی داران لە کن پیاوی وشیار  لە پەسنی خودا هەر پەڵەی دەفتەرێکە[1]

شیاوی باسە: مەلا لەم چەند بەیتانەدا، میعراجی پێغەمبەریشمان بۆ باس دەکا کە چۆن لە گەڕانەوەیدا و گێڕانەوەی ئەو سەفەرەی، کافر باوەڕیان نەدەکرد و عوتبەی کوڕی ئەبوولەهەبی مامیشی زۆر بێعەدەبانە دواندی و گوتی: «بڕوات بە ئەستێرە و خوای ئەستێرانیش نەماوە.» خودا سوورەی «نەجم»ی نارد و لەسەر ڕاستیی ڕووداوەکەی ئەو سەفەرە، هەر بە ئەستێرە سوێندی خوارد و فەرمووی:

«سوێند بە پیرۆ لەو کاتەدا دادەکەوێ و بەرەبەیان ئاوا دەبێ. ئەو هەواڵەو نە گوم بووە نە گومڕایە. لە خۆیەوە قسە ناکا. هەرچی دەیڵێ لە خواوەیە و فریشتەی زۆر توانا و بەهێز فێری دەکا... ئەو فریشتە وەحیبەرە. لە ئاسۆگ خۆی نیشان داوە و لە پاشانیش بە ئەندازەی ژێکەوانێک و نزیکتریش، خۆی لێ نزیک کردۆتەوە و فەرمانی ئێمەی پێ داوە.»

مەلای خواناس کە لە حاڵاتی جەزمەدا زۆر نهێنی گرینگی ئاشکرا کردوون. سوور دەزانێ لەوانەیە وشکەسۆفی ـکە سەریان لە هیچ دەرناچێـ بڕوا نەکەن؛ بە بزەی پڕ بەزەییەوە فەرمویەتی:

**١٤** دل بەحرە ئو سەدهەزار مەوجن
زاهید چ خەبەر ژ بەحرێ مەوواج؟

**مانای وشەکان:**

**زاهید**: تەرکەدنیا، لێرەدا مەبەست وشکەسۆفییە؛ **مەوواج**: زۆر بە شەپۆل.

---

١. برگ درختان سبز در نظر هوشیار  هر ورقش دفتریست معرفت کردگار

**پوختەی مانا:**

دڵی منی پێگەیشتووی تێگەیشتوو وەک دەریایە و لە سەد هەزار لایەنەوە شەپۆل دەدات. وشکەسۆفی ـ کە لەسەر خۆڵ مەلە دەکاـ خەبەری لە دەریا چییە؟!

«نالی» دەڵێ:

بڕوانە وشکەسۆفی و ڕەقسی بە هەلهەلە   دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە

**١٥** بووری و ب غەنجەکی «مەلا» کوشت
ئەو غونچەلەبا دەلال و غەنناج

**مانای وشەکان:**

**بووری**: ڕابرد؛ **غەنج**: ناز؛ **دەلال**: بە عەرەبی نازە و بە کوردی جوانچاکە؛ **غەنناج**: زۆر بەناز.

**پوختەی مانا:**

دیارە مەلا بە ئەمەگە. چاکەی سەلما لەبیر ناکا کە بەو دیدارەی بەیانەی، لانەی دڵی شێواندووە و گەیاندوویەتە ئەو حاڵەی کە زۆر نهێنی گرینگی بۆ دەرکەوێ.

دەڵێ: ئەو یارە دەم بیچکەلانەی لێوئاڵەی لەبەردڵانە، لەو تولحی بەرەبەیانە، بەنازەوە هات ڕابرد و مەلای هەژاری لە گیان کرد.



# سەروەری جوانان

١ دل ژ عیلاجێ کو ب دەرکەت میزاج
دێ ژ لەبێ نووش عەتا بت عیلاج

**مانای وشەکان:**

**عیلاج**: دەرمان؛ **عیلاج**: چارە؛ **نووش**: ڕەواقی هەنگوین؛ **عەتا**: بەخشین.

**پوختەی مانا:**

دڵێک کە نەخۆشیی بگاتە دەرەجەیەک کە بە هیچ کەس دەرمان نەکرێت، لە لیکی ڕەواق ئاسایی لێوی تەنکی یار چارەی دێت.

٢ ئایینەیێ جامێ جیهان‌بینێ جەم
بادەیێ لەعلینە د جاما زوجاج

**مانای وشەکان:**

**جام**: پیاڵە؛ **جام**: شووشە؛ **جام**: ئاوێنە؛ **جیهان‌بین**: دنیابین؛ **جەم**: نازناوی پاشایەکی کۆنی ئێرانە کە گوایە پیاڵەیەکی هەبووە هەموو دنیای تێدا دیوە؛ **بادە**: مەی؛ **زوجاج**: شووشە.

**پوختەی مانا:**

بادەی ئاڵ بە ڕەنگی لاڵ کە دەناو پیاڵەی شووشە بکرێ؛ دەبێتە پیاڵەکەی جەم کە خۆرەوەی هەموو شتی دنیای فراوانی دێتە بەرچاو.

٣ ژاڤێ حەیاتێ ب مەدا شەربەتەک
زیندە کرین ما ژ عەدوورا نەشاج

**مانای وشەکان:**

**ژاڤێ**: لە ئاوی؛ **عەدوو**: دوژمن؛ **نەشاج**: گریان و شیوەن.

**پوختەی مانا:**

مردبووم؛ یارم لە ئاوی ژیان ـکە مەیەک بوو، لیکی وەک ڕەواقی خۆی تێدا بووـ کە شەربەتێکی دەرخوارد دام، زیندوو بوومەوە و گریان و شین و قوڕپێوان هەر بۆ دوژمنان مایەوە.

۴ بەند کرم گەرچی شوبهـ فیل بووم
سیمبەرێ ساعید و بازوو ژ عاج

**مانای وشەکان:**

**ساعید**: قۆڵ؛ **بازوو**: باسک.

**پوختەی مانا:**

منێک کە بە لای خۆمەوە لە هێز و پێز و تواناداخۆم بە هاوتای فیل دەزانی، کەچی ئەندامزێوێکی قۆڵ و باسک سپیواشی بە ڕەنگی ددانی فیل، گرفتاری خۆی کردم و بەند و پێوەندی کردم.

«نالی» دەڵێ:

ئەلا ئەی ئاسکی ناسک بە باسک    شکاندت گەردنی سەد شێری شەرزە

۵ ئەختەرێ ئیقبال و مەهێ بورجێ بەخت
میهرێ سپیهرێ کەمەر و تەخت و تاج

۶ کووس کو هەنگافت ب شاهی ل تەخت
پادشەهان نەقدێ ڕەوان دان خەراج

۷ خوسرەوێ شیرینێ ل دەربەندێ حوسن
سیمبەران لازمە لێ موهر و باج

**مانای وشەکان:**

**ئەختەر**: ئەستێرە؛ **ئیقبال**: بەخت؛ **میهر**: خۆر؛ **میهر**: خۆشەویستی؛ **سپیهر**: ئاسمان؛ **کووس**: تەپڵ؛ **هەنگافتن**: لێدان؛ **رەوان**: ڕەواج؛ **رەوان**: گیان؛ **خوسرەو**: پاشا؛ **شیرین**: جوان و لەبەر دڵان؛ **شیرین**: ژنی خوسرەوی پەروێز کە فەرهاد لە سوێی مرد. لە دەربەندێک کۆشکی هەبوو کە جێگەی ئێستا شارێکە لە کوردستان، بە ناو «قەسری‌شیرین»؛ **موهر**: مۆر.

**پوختەی مانا:**

یارە جوانکیلانەکەی من بەڕاستی دەکرێ بە پادشای هەموو جوانانی سەرزەمین دابندرێ. ئەستێرەی بەودم و پیت و مانگی بورجی بەختەوەریی، بوونە کەمەری زێڕینی و تەختی لەسەر ڕۆنیشتنی. خۆر لە ئاسمان بە ئاواتە وەک تانج لە سەر سەری ئەو بێ. یاری من کە گەیشتە سەر تەختی پادشایەتی جوانان و لە خۆشییان تەپڵیان بۆ کوتا، پادشایانی دنیا تێکڕا ئامادەیی خۆیان شاندا کە نەغدینەی گیانی خۆیانی بە شاباش و باج بۆ بەرن. ئەو جوان و لەبەردڵانە کە لە دەربەندی جوانیدا هەر بۆ خۆیەتی و هیچ‌کەس نا، پێویستە ناسک‌ئەندامان بە دەستیی، گەڵنامەی خولامی و بەندەیی بۆ مۆرکەن و سەرانە و پیتاکی پێ بدەن.

**۸** سککەیێ شیعرا مە بە ناڤێ تە هات
لەو ب عەیارێ د جهان دا رەواج

**مانا:**

شیعری ئێمە ـ کە سکەکەی بە ناوی تۆوە لێدراوە ـ بۆیە بە عەیارتەواوی لە هەموو دنیا ناسراوە و پەرە و برەوی وا زۆرە.

**۹** ئابێ رەوان من دیە شیعرا «مەلا»
«یُنْکَرُ لِلماءِ لِسوءِ الْمِزاج»

**ماناى وشەکان:**

**من دیه**: من دیتوومـە؛ **یُنْکَـرُ**: ئینکـار دەکـرێ؛ **للمـاء**: بـۆ ئـاو؛ **لِسـوءِالمِزاج**: لەبـەر بەدمیزاجی.

**پوختەی مانا:**

من دەبینم شیعری مەلا بە ڕەوانی وەک ئاوی کانی ڕەوانە و هەتا بڵێی خۆش و جوانە، کێ دڵی لە ئاو ببێزێ دیارە بۆخۆی لە پاڵەخۆیدا نەخۆشە و هیچ تاوانێکی ئاو نییە.



# مەی چارەیە

| | | |
|---|---|---|
| ١ | دیســـــا ژ نـــوو بێحـــاله دل | ســـاقی وەریـــن جامـــا زوجـــاج |
| | موشـــــتاقێ خـــــەمرا ئالـــــە دل | لـــێ خـــۆش ئـــانی بـــت میـــزاج[1] |

**مانای وشەکان:**

**ژ نوو**: سەرلەنوێ؛ **وەرین**: بهێنە؛ **زوجاج**: شووشە؛ **موشتاق**: بەتاسـە؛ **خـەمر**: بـادە؛ **خۆش**: ساغ؛ **ئانی**: دەسبەجێ؛ **میزاج**: تەبیات.

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ! بەو پیاڵە بلوورینەی خۆت سا بادەیەکم بۆ بێنـە وا سـەرلەنوێ دڵ بێحاڵـە و ئارەزووی بادەی ئاڵ دەکا. هەر بمگاتێ، دەسبەجێ دڵ و تەبیاتم ئازا و ساغ و خـۆش دەبنەوە.

| | | |
|---|---|---|
| ٢ | ســاقی کــو دێم مــەهوەش بــتن | کـــاکول ژ شێڤـــا ڕەش بـــتن |
| | قەرقـــەف بـــلا ئاتـــەش بـــتن | ئەم دێ ب وێ دل کین عـیلاج |

**مانای وشەکان:**

**دیم**: ڕوخسار؛ **مەهوەش**: مانگ ئاسایی؛ **شیڤا ڕەش**: شـەوی تـاریکی ئەنگوسـتەچاو؛ **قەرقەف**: بادە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر مەیگێڕ وەک مانگ جوان بێ و کاکۆڵی وەکوو شەوزەنگ، ڕەشی تۆخ بێ، با ئەو مەیەی

---

١. عوسمان تونچ: «دێ خۆش بت و چێ بت میزاج»

دەمانداتێ وەک ئاگر جەرگسوتێن بێ؛ گوێ نادەینێ و دەردی دڵمان دەرمان دەکا.

٣ دا ئەم ب وێ دل حەی بکین — پێ سینە داغ و کەی بکین
سەد مەنزلان پێ تەی بکین — ئەو دێ د سەیرێ کەت رەواج

**مانای وشەکان:**

**حەی**: زیندوو؛ **کەی**: داغ؛ **تەی**: پێچانەوە؛ **سەیر**: ڕۆیشتن؛ **کەت**: دەکا؛ **رەواج**: برەو.

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ! بادەی ئاگرینمان پێ ببەخشە تا دڵمان زیندوو کاتەوە؛ سینە و هەناومان داغ بکا. مەی دەستی تۆ بۆ ڕێڕەوان دنەدەرە و بیخۆینەوە دەتوانین سەد مەنزڵ ببڕین و نەوەستین.

٤ بێ نوور و نارێ موحبەتێ — بێ نەقش و سونعێ قودرەتێ
ناچین مەقامێ وەسڵەتێ — «نورٌ لَنا وَاللَّيْلُ داج»

**مانای وشەکان:**

**نار**: ئاگر؛ **موحبەت**: خۆشەویستی؛ **مەقام**: جێگە؛ **وەسڵەت**: پێکگەیشتن؛ **لَنا**: بۆ ئێمە؛ **لەیل**: شەو؛ **داج**: تاریک.

**پوختەی مانا:**

شەو تاریکە؛ سەر دەرناکەین؛ نازانین بەرەو کوێ دەچین. ئەگەر ڕووناکایی و گڕی ئەوین و نەخشی دەسکردی توانایی خوای مەزن ڕێگەمان بۆ ڕۆشن نەکات، هەرگیز ناگەینە ئەو پایە کە بە بارەگای یار بگەین.

٥ ئەڤ نارێ سیقالا دلە — دائیم ل وی قالا دلە
نەورووز و سەرسالا دلە — وەقتێ هلێتن ئەو سیراج

**مانای وشەکان:**

**سیقال**: مشتومالٚ؛ **قال**: گاڵە و هەرا؛ **هلیتن**: هەلێت؛ **سیراج**: چرا؛ **سیراج**: بریەتی لە خۆر.

**پوختەی مانا:**

ئاگری ئەوین و خۆشەویستی کە دڵی من هەمیشە بۆی دەگاڵێ و لە تاسەی ئەوا دەناڵێ، تەواو دڵ مشتومالٚ دەکا و هەرگا خۆری ئەوینی یار تیشک بخاتە دڵەوە، لێی دەبێتە جێژنی نەورۆز و سەرساڵی دڵ.

| | | |
|---|---|---|
| ٦ | حەتتا ب نوورا بادەیێ | رەنگین نەکی سەججادەیێ |
| | دووری ژ وێ شەهزادەیێ | دوردانەیا گەردن ژ عاج |

**مانای وشەکان:**

**سەججادە**: بەرماڵی نوێژ، دووگرد؛ **دوردانە**: گەوهەری تاقانە.

**پوختەی مانا:**

ئەی رێڕەوی رێگەی ئەوین! باش بزانە تا دووگردت لە ناو شەرابدا ڕەنگ نەکەی، ناگەیتە لای ئەو شازادەی کە گەوهەری تاقانەیە و گەردنی سپییە وەکوو عاج.

«مەحوی» لەو بارەوە دەڵێ:

بە نووری بادە کەشفی زولمەتی تەقوا نەکەم چ بکەم؟

بە شەمعێکی وەها چارەی شەوێکی وا نەکەم چ بکەم؟

«حافز» دەڵێ:

ئەگەر پیرت گوتی دووگرد دە مەی هەڵکێشە، بیکێشە!

بە فەرمانی بکە! خۆی شارەزایە و ڕێگە ناگۆڕێ[1]

| | | |
|---|---|---|
| ٧ | دوردانەیا گەردەن بلوور | رەیحان ل سەر وەردێن د جوور |
| | هەیهەی بە مەستی تێنە دوور | خالا ل نک فەرقێ ب تاج |

---

١. بە می سجّادە رنگین کُن گَرَت پیر مُغان گوید     کە سالک بی‌خبر نبوَد زِ راەورسم منزل‌ها

**مانای وشەکان:**

**وەرد**: گوڵ؛ **جوور**: گوڵی گوڵاویێ؛ **ل نک**: لە کن.

**پوختەی مانا:**

ئـەو گەوهـەرە تاقانـەی گـەردنِبلوورینـە کـە ڕێحانـەی بسـکەکانی کەوتوونـە سـەر گوڵی‌گوڵاو و ئەو بسکە ڕێحانیانەشی کە مەستی جوانی خاوەنیانن، هەر لەپەستا دێنـە دەورەی ئەو خاڵی سەر هەنیـە جوانـەی کـە بەرانبـەر بـە نێـوانی سـەر دیـار ئـەدا و نەخشێکە لە بن تاجەکەی.

مەبەستی مەلا ئەوەیە یار بسکەکانی لاجانگی لەسـەر گۆنـاوە لا دەخـا و بـەرەو سـەر هەڵیاندەوێژنێ و لە نزیک خاڵی سەر توێڵی، بە کڵاوەکەی بەندیان دەکات.

٨

میهـرا تـە پـورِ ئەبتـەر کـرین   خـالان ژ بـەر بسـکان دەریـن

زولفـا موسەلسـەل عەنبـەرین   چین_چـین ژ چینـێ تێتـە بـاج

**مانای وشەکان:**

**میهر**: ئەوین؛ **ئەبتەر**: بێ‌پیت؛ **موسەلسەل**: بە زنجیرە کراو.

**پوختەی مانا:**

لە ڕێی خۆشەویستی تۆدا دەردێکمان بەسەر هاتووە، بەهرە و پیتمـان لـە دەس داوە. دەسا بەزەییەکت هەبێ! خاڵـەکانت _کـە ژێـر بسـکەکانت کـەوتوون_ دەر بهێنـە و بیاننوێنە. ئەو کەزیانـەت _کـە بـە زنجـیرەت هۆنیـون و بـە بەرامـە بـازاڕی عەنبـەر دەشکێنن، با دەرکەون؛ خەڵکی چینێ پێی بزانن. ئەگەرچی میشـکی خوتایـەش لای خۆیانە، دەستە_دەستە دێنە لات و باج بۆ ئەو کەزیانەت دێنن.

٩

تـەنـــها نـــە کوردستـــان ددن   شـــیراز و یـــەنگ و وان ددن

هەریەک ل سـەرِ چەهڤـان ددن   ژ ئەسـپەهان تیـتن خـەراج

**پوختەی مانا:**

جگە لە خەڵكی كوردستان ـكە شانازی بە جوانی كچی كورد دەكەن_ خەڵكی تریش لە شیراز و یەنگ (؟) و وان و ئیسفەهان و شوێنی تریش، باج بۆ ئەو جوانییەت دەنێرن و چی بفەرمووی لەسەر چاوان پێكی دێنن.[1]

١٠ چەهڤێن بەلەک قەوسێن هەلەک    چەرخ‌وفەلەک غالب مەلەک
«فی حُبِّها عُمری دلَک»    «وَالحُبُّ یَجری فی عُجاج»

**مانای وشەكان:**

**چەهڤ**: چاو؛ **هەلەک**: هیلاک و خەتەر؛ **هەلەک**: خوارەوەبوو؛ **چەرخ‌وفەلەک**: هەڵپەڕكێ بە كۆز؛ **غالب**: بەشی هەرە زۆر؛ **مەلەک**: پەری و فرشتە؛ **فی حُبِّها**: لە ئەوینیدا؛ **عُمری**: تەمەنم؛ **دلَک**: لەسەر ئاوا بوونە؛ **والحبُّ**: ئەوینیش؛ **تجری**: دەڕوا؛ **فی عُجاج**: لە گێژەڵووكەدا.

**پوختەی مانا:**

لەو كۆڕی هەڵپەڕكییەدا ـكە بەشی زۆر لە سەماكەر و سووڕدەران وەک فریشتە و پەری دەچن_ چاوی بەلەک و برۆی كەوانی پیاوكوژی ئەو نازدارە، دەردی داومێ. لە ئەوینی ئەو چاوانە تەمەنم لە ئاوابوونە و هێشتان گەمیەی ئاواتانم دەبەر گێژەڵووكەدایە و زۆر چەتوونە گەردەلوول تێكی نەشكێنێ.

١١ شاهید هەزار رەنگ خەملین    رەقس و سەما پێ كەملین
ئیرۆ «مەلا» ئەم سەد دلین    ساقی وەرین جاما زوجاج

**مانای وشەكان:**

**شاهید**: دلبەر؛ **خەملین**: خۆیان ڕازاندەوە؛ **كەملین**: بێ‌كەمایەسی بوون.

---

[1] لە فارسی كۆندا «یەنگ» بە مانای: ١. ڕێ و ڕەوش ٢. ڕێ چارە هاتووە؛ بەڵام وەک ناوی شوێن، لە هیچ قاموسێكدا نییە. تۆ بێژی «یەزد» بووبێ؛ كە شارێكی گەورەیە لە ڕۆژهەڵاتی ئەسفەهان؟

**پوختەی مانا:**

لەم بەزم و ئاهەنگ و کۆزی سەمایەدا، دڵبەران بە هەزار تەرز خۆیان جوان ڕازاندبۆوە و کۆڕەکە هیچ کەمایەسی تێدا نەبوو. مەلا! ئێمە ئەمڕۆ دڵمان لە سەد جێوە لەت_لەت بووە. مەیگێڕ! وەرە و پیاڵەی بلۆرینت بێنە تا وەخۆین و برینی دڵمان دەرمان بکەین.

«نالی» دەڵێ:

بـــۆچی نـــەگریم ســـەد کـــەڕەتم دڵ دەشـــکێنێ

مـــەی بـــۆ نـــەڕژێ شیشـــە لـــە ســـەد لاوە شـــکاوە



# ڕازداریی

۱ پـــورِ مەکـــە ئیســـرافێ د قـــەتلێ موبـــاح
«سَـــفکُ دَمِ الْعاشِـــقِ مـــا لا یُبـــاح»

۲ ســـینە ب دەســـتێ خـــوە موبـــارەک ڤـــەکە
«تَعْـــرِفَ کَـــمْ فـــی کَبَـــدی مِـــن جِـــراح»

**مانای وشەکان:**

**ئیسراف**: لە ڕادە دەرکردن؛ **موباح**: نهێنیێ درکێنراو؛ **موباح**: ڕەوا و حـەلال؛ **سَفْک**: ڕژاندن؛ **دَم**: خوێن؛ **ما**: شتێ کە؛ **لایُباح**: دروست نییـە و ڕەوا نابـێ. **تَعْرف**: دەزانی؛ **کَمْ**: چەند؛ **فی**: لە؛ **کَبَدی**: جەرگم؛ **جِراح**: برینان.

**پوختەی مانای ئەو دوو بەیتە:**

کوشتنی دلدارەکانت لە ئەندازە دەرکردووە. کە دەشتەوێ هەر بیانکوژی، وا بە کۆمەڵ مەیانکوژە و وا مەکە بە زۆریکاری و هەژار کوشتن، نـاوت دەرچـێ! چونکـە هێنـدێک وایان لە ناودا، وا لە ئەویندا سووتاوە هەربینا گیانی دەردەچێ و خوێنەکەشـی ناخەنـە گەردنی تۆوە. بۆ نموونە من خۆم دەڵێم: بە دەستی موبارەکی خۆت سینەم شەق کە و لە هەناوانم بڕوانە! تا بزانی کە چەند برینی کاریگەر لە جەرگمدا و مـزگێنی مـەرگم پێ دەدەن. من هەر لە سوێی تۆ، گیان دەدەم و کەسیش نالێ خوێنی بە ناهەق ڕژاوە و کەس گوناح ناخاتە سەر تۆ.

«سەعدی» لەو کوشت و کوشتارە تۆڵەی دەوێ. بە عەرەبی گوتوویە:

دەڵێن ڕاموسانی کچی جوان خەتایە ئەدی ڕشتنی خوێنی عاشق ڕەوایە؟![1]

---

۱. یَقولونَ لَثمُ الغانیاتِ مُحَرَّمٌ أسَفکُ دِماءِالعاشـقینَ مُباحُ

واتا: ئەم حەقیچە بەم حەقیچە!

٣ دل ژ هـــــەوایا تـــــه د فکـــــرێن دهـــــوور
«فـــــی لُجَـــجٍ بَـــیْنَ هُبـــوبِ الرِّیـــاح»

٤ عیشـق کـو گـەها کـێ وە ل عـەقلێ خـوه مـا؟
(یـان: عیشـق گـەها کـێ وو ل عـەقلێ خـوه مـا؟)
«یَفْتِـــکُ بالْعاشِـــقِ حُســـنُ الْمِـــلاح»

**مانای وشەکان:**

**هەوا**: ئەوین؛ **هور**: ورد؛ **لُجَج**: لوججەگەل؛ **لوججـه**: قـووڵترین بەشـی ئـاوی دەریـا؛ **هُبوب**: هەڵکردنی با؛ **ریـاح**: باگـەل؛ **گـەها**: گەیشـت؛ **یَفتِـک**: بێئـەمان دەکـوژێ ؛ **حوسن**: جوانی، باشی؛ **مِلاح**: بای گەمیە ئاژۆ؛ **مِلاح**: جوانچاکان.

**پوختەی مانا:**

منێک کە خۆم بە خاوەن ئاوەز دەزانی و دەمگوت دڵم کانگای بیری ژیرانەیە، لـەوەتا بوومە دڵدارت، خۆم و دڵم وەکوو گەمیەی بادەوانی کە لە ناوەنـدی دەریـادا قـەتیس مابێ و لە هەموو لا بای گەردەلوول دەوری دابێ و ڕایتەکێنێ و بیرەتێنێ و نزیک بـێ تێکیبشکێنێ، هومێدم لە مان بڕاوە.
هەرکەسی تریش کە وەک من لە ئەویندارییدا بگا و کاڵی و تاڵی بـەجێ بێڵـێت، وەک ئەو گەمیە لێقەوماوەی لێ دێت. تەنانەت ئەگەر باش، باش و بە ئارەززووی گەمیـەوان بێت، لە گێژاوی دڵداریدا بێگومان لەبەریەک دەچێ. ئاخ لـە دەس ئـەوینی جوانـان! دڵدارکوژی بێئامانن.

٥ دێ دو سیەهســـــورمەیێ چەهڤـــێن خوەکـــت
خاکـــێ ڕەهـــێ یـــارێ ســـەبا هـــەر ســـەباح[١]

---

١. دەشگونجێ ئەم لەتە بەیتە فارسی بێ: «خاکِ رَهِ یار، صَبا هَر صَباح»

٦ تــــۆز و غوبــــارێ ســـــەحەرێ بــــەر چەمـــــەن
«قَــــــدْ نَشــــــرَاَلطَیبَ و بِالْمِسْـــــکِ فـــــاح»

**مانای وشەکان:**

**سەبا**: شنەی بای ڕۆژهەلات؛ **سەباح**: شەوەکی؛ **چەمەن**: مێرگ و چیمەن؛ **قد**: لێرەدا مانای تەواو؛ **نَشرَ**: بلاوی کردەوە؛ **فاح**: بۆنی دا.

**پوختەی مانا:**

سروە و شنەی بەیانان ـ کە لە ڕۆژهەلات هەلدەکا ـ هەموو ڕۆژێ بە خاکی بەرپێی یارەکەم، چاوەکانی خۆی دەڕێژێ. تۆزی پالای یارە بالابەرزەکەی من، بۆنی خۆشی دا بە مێرگ و باغی گولان و بۆنی میسکیش نیسکێک لەو تۆزەی تێدایە کە هێندە بەرامە خۆشە.

٧ فێـــــرس و رمبــــــاز گـــــەهان یـــــەک ب تــــیر
«اَحْمَـدُ فـی البـینِ قَتیـلُ الرِّمـاح (قَتیـلَ الرِّمـاح)»

**مانای وشەکان:**

**فێرس**: ئازای سوارچاک؛ **اَحْمَدُ**: سوپاس و تاریف دەکەم؛ **بەین**: نێوان؛ **بەین**: دوورکەوتنەوە، هیجران؛ **قَتیل**: کوژراو؛ **رِماح**: ڕمبگەل.

**پوختەی مانا:**

بە نازەوە چاوە مەستەکانی لێک نا. پیلوەکانی لە دوولاوە بە تیر و ڕمبی بژۆلان هاتنە سەریەک و تێک گیران. لەو ناوەدا ئەحمەدی بێسووچ و تاوان بە نووکی ئەو بژانگانەی لە ڕمب درێژتر و تیژتر، شەهید کرا!

ئەمجار ئەگەر «قتیلَ» بی، واتا: سوپاس و ئافەرین دەکەم لەو کەسەی کە هەر دوور بە دوور کوشتەی ئەو مژۆلانەیە.

۸ «بوســـەزنان هـــر کـــە بـــرآن آســـتان»
«مگّـــنَ مِـــنْ جَبْهَتِـــهِ لا بَـــراح»

**مانای وشەکان:**

**بوسە زَنان**: بە ماچ کردن؛ **بَرْ**: لەسەر؛ **آستان**: پێشدەرگا؛ **مَکّنَ**: بـۆی لـوا؛ **مِنْ**: لـە؛ **جَبْهَە**: سەردار و سەروەر؛ **جَبْهَە**: سەردەرانە؛ لا: نا؛ **بَراح**: لاکەوتن، جێهێشتن.

**پوختەی مانا:**

هەرکێ هەر جارێک بۆی بلوێ سەر لە دەرگانەی یار بسوێ و سەرداری مـاڵ ڕێگـەی بـدا سـەردەرانەکە ڕامووسـێ، تـازە هـەرگیز لا ناکـەوێ و هـەتا هەتایـە لـە ژیـانی بەختەوەریدا ڕادەبوێرێ.

۹ «حَـــلَّ لَـــهُ القتـــلُ بِشَـــرْعِ الْهَـــوی
مَـــن کَشَـــفَ السِّـــرَ وَ بالسِّـــرِ بـــاح»

**مانای وشەکان:**

**حَلّ**: ڕەوایە؛ **قتل**: کوشتن؛ **شـەرع**: دەسـتوور؛ **هَـوی**: ئـەوین؛ **مَـن**: کەسـێ؛ **کَشَـفَ**: پەیدای کرد؛ **سِرّ**: نهێنی؛ **باح**: درکاندی.

**پوختەی مانا:**

مەلا! تۆ بۆچ ئەم نهێنییەت ئاشکرا کرد کە ماچێک لە دەرگانەی یار هـۆی هـەرمان و سەرچاوەی هەموو خۆشییانە؟ بە شەریعەتی دڵداران هەرکێ بـە نهێنییـەک بـزانی و ئاشکرای کا، کوشتنی ڕەوایە.

«حافز» دەڵێ:

وتی ئـەو یـارە کـە سەر داری قـەنارەی شـاد کـرد
سوچی گەورەی ئەوە بوو ڕازی نهێنی درکاند[1]

---

۱. گفت آن یار کز او گشت سَرِ دار بُلند　　جُرمش آن بود که آسرار هویدا می‌کرد

١٠ حوسـنێ ئـەدايا تـە «مـەلا» هـەركێ دی
«صَـحَّ لَـهُ إنـكَّ عَـيْنُ الْفصِـاح»

**مانای وشەکان:**

**حوسن**: باشی و جوانی؛ **ئەدا**: پێک هێنان؛ **صَحَّ**: بە ڕاست گەڕا؛ **لَهُ**: بۆ ئەو؛ **انـكَّ**: تـۆ؛ **عَيْن**: سەروەر، سەردار؛ **الْفِصاح**: قسەڕەوانگەل.

**پوختەی مانا:**

مەلا! هەرکەسێ کردە و هونەرتی چاو پێ بکەوێ و بزانێ چەند جوان و ڕەوان شیعر دەڵێی، بێ‌گومان بۆی دەردەکەوێ کە تۆ سەروەر و سەرداری زمان تەڕ و پاراوانی.
«نالی» دەڵێ:

نالی عەجەب بە قودرەت و حیکمەت ئەدای دەکا
مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووک



# حوسنا موقەددەس

۱ حـەیف د قەیـدا خـاک و گـل بـت عارفـیٚ چالاکـیٚ رووح
دڵ موجـەررەد بـت کـو پەرتـەو دەت ژ نـوورا پاکـیٚ رووح

**مانای وشەکان:**
**حەیف**: مخابن؛ **قەید**: بەند، زنجیر؛ **گـل**: حەڕی، قوڕ؛ **چـالاک**: چوسـت؛ **موجـەررەد**: ڕووتەوەبوو؛ **پەرتەو**: تیشک.

**پوختەی مانا:**
زۆر حەیفە گیانی چاکی بزۆز و چالاکی خودا ناس لە ناو بەندی قـوڕ و خـاکی لەشـی سەرزەوی بمێنیٚ. پێویستە ئەو بەند و کۆتەی فڕیٚ بدا تا سەرلەنویٚ گیانی پاکی وەبەر تیشکی جوانی خوای تاک کەویٚ.

۲ قەیدیٚ خاک و گل نەبت دا بـیٚ حیجـاب و پـەردە بـیٚ
میسلیٚ بەدریٚ جارنـان تێخـت خوسـووفیٚ خاکـیٚ رووح

**مانای وشەکان:**
**حیجاب**: پەردە، لەمپەر؛ **جارنان**: هێنـدیٚ جـاران؛ **تێخـت**: بخاتـە؛ **خسـووف**: مانـگ گیران.

**پوختەی مانا:**
وا باشە گیان ئازاد بیٚ و هیچ لەمپەر و بەندی خاک و قوڕی لە بەر و لە سەر نـەمێنن. چۆنکە تا دیل و یەخسیری ناو ئەو کەلاکـە خاکەیـە، چـاری ناچـار ــبـا وەک مـانگی چاردەش وا بیٚــ تووشی گیرانیٚ هەر دەبیٚ و خاک دەیگریٚ.

شیاوی باسە: گیرانی مانگی ئاسمانیش هەر لە سۆنگەی زەمینی خاک و ئاوییە کە دەبێتە لەمپەر لە نێوان مانگ و ڕۆژدا و سێبەری دەکەوێتە سەر مانگ.

٣ شەمعێ سەر نوور نادرت گەر ئەو نەکت پەرهیزێ دل
زەوقێ جاما عیشقێ ناکت گەر نەکت ئیمساکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**شەمع**: مۆم، شەم؛ **پەرهیز**: پارێز؛ **زەوق**: چێژە؛ **ئیمساک**: خۆڕاگرتن لە خواردن و...

**پوختەی مانا:**

مۆم ئەگەر لە ناوەڕۆکدا پیس و خۆڵاوی بێت، هەڵنابێ و ڕووناکی نادات. ڕێڕەوی ڕێگەی عیرفانیش هەر وەهایە. ئەگەر بە دڵ پارێز لە خڵت و خاشی دنیایی نەکا، هەرگیز ڕووناکی جوانی خودا، لە سەری خۆیدا نابینێ. هەتا عارف خۆی لە هەموو لەزەت و خۆشییان دوور نەگرێ و لەم دنیایە واز نەهێنێ، لە بادەی ئەوینی خودا چێژە ناکات.

٤ دل ب تایەک نێرگزان دە نازکەک تەروندە دە
گول دکن تەشبیهێ خاران هەر خەس و خاشاکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**تا**: چڵ، قڵ؛ **تەروەندە**: نۆبەرە، تازە پشکووتوو؛ **خار**: چقڵ؛ **خەس و خاشاک**: زبڵوزاڵ، پڕوپووش.

**پوختەی مانا:**

ڕێبواری سەر ڕێگەی عیرفان، لە دوای ئەوە کە لە خۆشی و شادی دنیا دەست بەر ئەدا و دڵ و گیانی بە پارێز و خۆراگرتن تەمیس و بێخڵتە دەکا، ئەوساش دەبێ لە هەڵبژاردنی یاری دەستگیردا پەلە نەکا و فریوی ڕواڵەت نەخوا. کەسێک کە دەستی بگاتە باغی گوڵان و ڕێگەی بدەن گوڵێک بۆ خۆی هەڵبژێرێ، با تێگەڕێ و چڵێک

نەرگزی ناسکی تازەپشکووتووی نۆبەرەی بێهاوتا بکاتە هی خۆ. ئیتر وەک ئەوانە نەبێ کە ڕووحیان لە زبڵوزاڵدا و چقڵانیش بە گوڵ دەزانن.

٥ جامــێ عیشــقێ پاکــێ رووحــانی تــەهوورا باتینــە
ئــێ نەنووشــی هــەرۆەها حــەتتا ئەبــەد ناپاکــێ رووح

**مانای وشەکان:**

**تەهوور**: خاوێن و خاوێنکەرەوە؛ **باتین**: دەروون؛ **نووشین**: وەخواردن.

**پوختەی مانا:**

بادەی ئەوینی پاکی خوداناسی ـکە تایبەتی گیانپاکانەـ دڵ و دەروون لە پیسییەتی دەشواتەوە. هەرکەس لەو بادە نەنۆشێ، هەزار ساڵیش تێبکۆشێ گیانی بۆ هەتاهەتایە گەمار و چڵکن دەمێنێ.

٦ هەیئــەتا کــەیف و کــەمێ بێکەیفــە کــەیفا عارفــە
دێ بمێنــت گــەر نــەبت ناچــار بــێ تــەریاکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**هەیئەت**: تەرز، ڕواڵەتی؛ **کەیف**: چۆنیەتی؛ **کەمی**: چەندی؛ **کەیف**: ئارەزوو؛ **دێ بمێنت**: هەر دەمێنێ؛ **تەریاک**: دەرمانی دژی ژەهر.

**پوختەی مانا:**

چۆنیی خودا و تەرز و بیچم و چەندایەتیی ڕەوشت و ئاکارەکانی (سیفاتی) هەرچی باس دەکرێ و دەگوترێ، لە ڕاستیدا هیچی دەگەڵ ڕاستەقانی تەواو یەکتر ناگرنەوە. هەرکەسێ هەر لە ئەندازەی ئاوەز و بیرکردنەوەی خۆی بۆی چووە. دڵ و گیانی ڕێڕەوانی ڕێگەی عیرفان، بەو چەند و چۆن لێکدانەوەی ئاکار و تەرز و دیمەنی خودای مەزن، ژانلەگیان و دڵپەشێو و سەرسووڕماون. هەرگا یار، یاری کردن و چاوی دڵیان لە دینی دیداری گەش بوو، لەو دڵەتەپێ و دوودڵییەی تووشیان بووە ـکە وەک

مارانگەزتە پێچ دەخۆن_ ڕزگار دەبن. کێ بە خوا بگا، تێدەگا کە بۆ ئەو یارە تاقانە، نە چۆنی هەیە و نە چەندی. خۆی و سیفەت و ئیرادەی هەر یەکە و خۆی سەرچاوەیە و لێک جیا نین.

٧ دێ بـە گوڵـزارا جـەمالا سەبزەپووشـان وی چ کـت؟
ئـێ دمیهرێـدا نـەبت دل پارە_پـارە، چاکـێ رووح

**مانای وشەکان:**

**جەمال**: جوانی؛ **سەبزەپووش**: لێرەدا بریەتییە لەو کەسانەی دەگەڵ خودا تێکەڵاون و هەرگیز سیس و پیر نابن و لە ناو ناچن[1]؛ **میهر**: ئەوین؛ **چاک**: دادڕاو.

**پوختەی مانا:**

کەسێکی لە دڵداریی پاکدا دڵی لەت_لەت نەبووبێت و پارچەی گیانی دانەدڕابێ، قەت ڕێی نابێ بچتە ناو باغی گوڵانی ئەو جوانانەی کە تا هەتا بـە ئـەوینی یـار زینـدوون و سیسی و کزی و هەڵوەرینیان نایەتە ڕێ.

٨ بـەر ژ جـان دەرراکـە یـەک رەوشـەنتر و والا دڤـێت
سوورەتێ حوسـنا موقـەددەس دا بکـت ئیـدراکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**بەر**: پێشتر؛ **دەرراکە**: زۆر زوو لە شت گەیشتوو، زۆر لەسەر هەست؛ **والا**: بەرز، هێـژا؛ **سوورەت**: شکڵ؛ **موقەددەس**: پیرۆز؛ **ئیدراک**: پێزانین.

**پوختەی مانا:**

هەر ئەویندارێکی خودا کە بەنیاز بێ بە دیداری یار شاد ببێ، پێویستە سەرەڕای گیانی

---

[1]. ناوی حەزرەتی «خضر» کە کورد دەڵێن: «خدر» واتا هەمیشە سەوز و دوور لە سیس بوون و وشک بوون.

خاوێن، هۆش و بیر و تێگەیینێکی زۆر لە پلەی بەرزا هەبێت تا تووشی هەڵەموت نەبێ و هەڵنەدێرێ. ئەوسا دەکرێ بە دیداری ئەو جوانییە هەرەپیرۆزە، گیانی شاد بێ و لە بەندی خەمان ئازاد بێ.

**٩** گەر خەبەرداری ژ سێررا «کُنْتُ کنزاً» گۆهـ بدێر
دا ب سەد تەورێ بەیان کەت مەعنیێ «لَولاک»ێ رووح

**مانای وشەکان:**

**کُنْتُ**: بووم؛ **کەنز**: گەنجینە؛ **گۆهـ**: گوێ؛ **تەور**: جۆر؛ **لَولاک**: تۆ نەبای.

دوو فەرموودەی پیرۆز (حەدیسی قودسی) هەیە پێغەمبەر لە زوان خوداوە فەرموویەتی: من گەنجینەی نهێنی بووم؛ ئەم جیهانەم هەر بۆیە کردووە بناسرێم. جارێکی تریش فەرموویە: گەر تۆ نەبای، ئەم ئاسمانانە و جیهانەم ساز نەدەدا.

ئەگەر ئێمە بە ڕواڵەتبینی و سەرچڵی لەو دوو فەرموودە بڕوانین، وا ئەزانین پێچەوانە و دژ بە یەکن. ئەم سازدانە بۆ کامیانە؟ بۆ ناساندنی خودایە؟ یان بۆ ڕێزنان لە پێغەمبەر؟ بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین، زوو تێدەگەین هەردووک لا لکی دارێکن و ناوئاخنی تابارێکن. با بزانین چۆن:

خوا ویستوویە خەڵک درووس کا، بیناسن. پێغەمبەری هەڵبژاردوون و ناردوونی مرۆ ئامۆژگاری بکەن کە بیناسن. موحەممەدیش «د.» بەرانبەر بە فەرموودەی خۆی (من ببوومە پێغەمبەر و هێشتان بابەدەم لیتە بوو)، پێشینەی پێغەمبەرانە و لە دوای هەمووانیش هاتووە. خودا گیانی موحەممەدی بەر لە هەرشت وەدی هێنا. واتا ماک و هەوێنی سازدانی دنیا موحەممەدە. بوونی پێغەمبەر و جیهان وەک دوو شەنگڵە بەرەکەتن کە لێک جیا ناکرێنەوە.[1]

---

١. «شێخی خانی» لە پێشەکی «مەم و زین»دا لەو بارەوە فەرموویەتی:

گەنجینەیی گەوهەری وەشێراو — پاش پەردەیی کردە دێتە بەرچاو
چی جوان و بەنرخی ئەم جیهانەن — بە جوانی خودای مەزن نیشانەن
ئەم چەند کر و کاری بێژارە — ویستی لە سەری هەبن ژمارە ←

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لە مانای نهێنی «گەنجینە بووم» ئاگاداری، دە گوێ بگرە و بزانە گیان چۆن بە سەد تەرز و جۆر مانای «گەر تۆ نەبای»ت پێ دەڵێ!

۱۰ لامیعێ سیررا تەجەللی سەر ل تووریٚ دل ددەت
زەبت ناکت وێ مەجالێ سەد هەزار ئەفلاکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**لامیع**: ترووسکەدەر؛ **تەجەللی**: خۆ شاندان؛ **زەبت**: ڕاگرتن و گرتن؛ **مەجال**: وەخت، دەم؛ **ئەفلاک**: ئاسمانان.

**پوختەی مانا:**

هەروەک مووسا لە کێوی توور لە خوا پاڕاوە ببینێ، خودا فەرمووی: تۆ نامبینی؛ بەڵام بڕوانە ئەو کێوە ئەگەر خۆی لە جێی خۆیدا گرت، سا ئەوساکە تۆش دەمبینی. وەختێ خودا خۆی نیشانی چیاکە دا، لەبەریەک چوو؛ مووسا بە بێهۆشی کەوت.

ئەگەر تیشکی جوانی خودا خۆی بۆ دڵ ئاشکرا بکا، گیان خۆی ناگرێ. ئەگەر

---

→ پێش هەر شتێ کارسازی زانا — هێنای تەتەڵە و بنووسی دانا
خۆی ئێکەم و ئەم یەکەم گیانە — زانای یەکەمە و نە لێک جیانە
بە ڕواڵە کە سێنە، هەر یەکێکن — هەر سێ وەکوو سێ گرێی لکێکن
دای جوانی نەمر برووسکەیەک لەم — پێغەمبەری ئێمە هاتە بەرهەم
ئەو تیشکی خودایە بۆ هەمیشە — بۆ هەر شتێ بۆتە پنج و ڕیشە
گیانان لە گیانی ئەو پەیا بوون — چەند تیرە و هۆز لە یەک جیا بوون
هی بەختەوەر و بەرەی بەختڕەش — چی ماون و هەرچی چوونە ناو لەش
سەرپاکی لە تیشکی ڕوونی ئەو بوون — گش هاتن و بوون لە بوونی ئەو بوون
هێشتا نە زەوی نە عاسمان بوو — ئەو سەروەری هۆزی سەروەران بوو
عاسمان و زەوی لەبەر ئەوی بوون — بۆ وی بوو فرشتە سەرنەوی بوون
پێغەمبەرێ بوو لە لای خودا ئەم — پێخوێیەکی قوڕ بوو باوە ئادەم
ئەو پەنجەرەیە و خودا دەوێرا — تیشکی لە دڵی ڕەشی مە گێرا

سەدهەزار ئاسمانیش لە هەموو لاوە بیگرن، وەک کێوی tووری بەسەر دێ.

۱۱ هەردوو ئیلانێن تە دێ مـن تـەوقێ گـەردەنکر مـودام
دا مە هەر بێتن تەبەسسوم وەک گولا زەححاکـێ رووح

**مانای وشەکان:**

**ئیلان**: مار؛ **تـەوق**: بەندی بە ئاڵـقە؛ **مـودام**: هەمیشـە؛ **زەححـاک**: زۆر بـە پێکـەنین؛ **زەححاک**: گوڵی جوان پشکووتوو.

**پوختەی مانا:**

مەلا لە پاش ئەوە هەموو ئامۆژگارییانەی خواناسانە و دەنگ و باسانەی چۆنیەتی بە خوا گەیشتن و تێگەیشتن لە مانای ئایەت و حەدیس، بۆ وچانێک بادەداتەوە سـەر دنیـا و دیسان ڕوو دەکاتە سەلمای دڵڕفێنی و دەفەرموێ:
چەند خۆشە پیاو دیلی تۆ بێ و خەڵکیش بەو کارە بزانن کە تۆ یەخسیر و دیلی خۆت ڕست کردووە. جا بۆ ئەمە من کە هەردوو پرچی وەک مـاری ڕەشـتم دیـت، کردمنـە تۆقی گەردنم تا لای هەمووکەس شانازی بەو بەختەوەرییـەم بکـەم و هەمیشـە وەک گوڵ گەش ببم و لە خۆشیانا هەر بخەنم و بزەم لە سەر لێو لا نەچێ.

۱۲ جەوهەرێ حوسنێ ئەدا تـەنها دبـت مـەقبوولێ تـەبع؟
گەر نە سەیقەل دت ب نورێ عیشق وەک حـەککاکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**جەوهەر**: گەوهەر، عەسل، لێرەدا بەمانا هونەرە؛ **سەیقەل**: مشتوماڵ؛ **حەکاک**: ئـەوی شتدەڕنێ تا ژەنگی لێ بکاتەوە.

**پوختەی مانا:**

شیعر و گفتی من بۆیە لە چاو قسەی خەڵکیتر زۆر لەبەردڵانە و خەڵک پێیان خۆشە، چۆنکە گیانم کە بە تیشکی ئەوین قاڵە، زمان و دڵ و مێشکمی بە خاوێنی ڕاهێنـاوە و

وەکوو ژەنگرِن ژەنگاوی مشتومالّ دەکا. ئەویش مشتومالّی داون؛ بۆیە وا خۆش و لەبارن.

۱۳ دێ بویێ ئەنداز و تەرزێ کی دبێت سیحرێ حەلال
گەر نە بالا تەبع بت وەک پەهلەوان چالاکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**دی**: لێرەدا بە مانا دەنا؛ **سیحرێ حەلال**: بریەتییە لە شیعر و وتاری زۆر باش.

**پوختەی مانا:**

دەنا کێ دەتوانێ بەم تەرز و بەو ئەندازە زۆرە سیحری حەلالّی بە دەمدا بێ. ئەوە کاری کەسێکە کە گیانی وەک پالّەوانی زۆر چوست و بەکار، مرخی شیعری بە پایە و پلەی بەرزەوە تێگەیاندبێ.

«نالی» دەلّێ:

فارس و تورک و عەرەب هەرسێم بە دفتەر گرتووە
نالی ئەمرِۆ خاوەنی سێ مولکە دیوانی هەیە

۱۴ دل ب رم ئاڤێهت و وێ لێ بار کر قەوسێ شەڤین (چەڤین)
دێ بدت بەر گەزمەیان بێ سووچ ئەو سەففاکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**رم**: رِمب؛ **ئاڤیهت**: هاویشت؛ **بار کر**: ئامادەی کرد؛ **شەڤین**: بە رِەنگی شەو؛ **گەزمە**: تیر؛ **چەڤین**: چەماو.

**پوختەی مانا:**

ئەو یارە عاشق‌کوژ و خوێنرێژە، بە رِمبی مژۆلان جەرگی هەنگاوتووم و ئێستا بەوە نەوەستاوە؛ دوو برۆ کەوانییەکانی ــ کە چەماون و رِەشن وەک شەوی زۆر تاریک ــ ئاراستەی گیانم کراوە و دەیەوێ ئەو بێ‌گوناهەش هەر بێ‌تاوان بەرتیران دات.

**١٥** شەهسەوار ئیرۆ کەمەند ئاڤێهتنە قەلبێ «مەلێ»
بەند ناکت غەیرێ فیتراکا تە سەد فیتراکێ رووح

**مانای وشەکان:**

**فیتراک**: بەن سامۆرتە.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ زۆر لەوانەی کە لە مەیدانی جوانی و دڵبەریدا سوارچاک دەژمێردرێن، ویستیان دڵی من بخەنە ناو کەمەندی خۆیانەوە و لە تۆم بستێنن. بەڵام خەیاڵیان خاوە؛ من بەوانە ناگیرێم و گیانی من تەنیا بە بەن سامۆرتەی پشت زینی ئەسپی تۆ نەبێ لە هیچ بەندێکی دیکەدا ئۆقرە ناگرێت و ناگیرێ.

«سەعدی» دەڵێ:

ئەگەر تۆ ڕاو بکەی وەحشی بە خۆشی دەبنە نێچیرت
هەموو گیانێک گرفتار بوونی تۆی بۆ بەختەوەر بوونە[1]

---

١. اگر به صید روی وحشی از تو نگریزد    که در کمند تو راحت بود گرفتاری



# کلیلی دڵ

١
عیشقێ کو بدن بە یەکدو ئەرواح
پەیوەستە دقێ بە هەف بن ئەشباح

**مانای وشەکان:**

**بە یەکدو**: بە یەکتری؛ **پەیوەستە**: پێکەوەلکاو؛ **پەیوەستە**: هەمیشە؛ **بە هەڤ**: پێکەوە؛ **ئەشباح**: شەبەحگەل؛ **شەبەح**: تارمایی، ئەو تەرز و شکڵەی کە گیان لە پاش دەرچوون لە لەش، بە خۆیەوە دەگرێ کە لەشیش نییە و هەروەک لەشە دنیاییەکە دەچێ؛ **شەبەح**: ئەو زنجیرەی لاقی دیلی پێ دەبەستن.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر گیانان لەبەر بارەگای خودادا ئەوین پێکتر بگۆڕنەوە و بەتەما بن هەر ئەویندارى یەکتر بن، زۆر پێویستە تارمایی گیان هەڵگریشیان هۆگر بەیەکتر ببن و بۆ هەمیشە خۆیان بە زنجیری ئەوین بەیەکەوە ببەستنەوە و هەرگیز لێک جیا نەبنەوە و تەواو هەر وەک تێکەڵاوی لەش و گیانی دەورانی ژیانی سەر دنیا، لێکدرابن.

٢
جان و جەسەدان کو ئیتتیحادن
«وَالْماءُ لَهُ المِزاجُ بِالرّاح»

**مانای وشەکان:**

**جەسەد**: لەش؛ **ماء**: ئاو؛ **لَهُ**: بۆ ئەو؛ **مِزاج**: تێکەڵاوی؛ **راح**: بادە، مەی.

**پوختەی مانا:**

تێکەڵاوی لەش و گیانی ئەویندارانی بەڕاستی و دەروونخاوێن و داوێنپاک، تا لە ڕووی

خاک بوون چۆن بووە، دوای دەرچوونی گیان لە ڕکەی لەشی خاکیش هەر وا دەبن. تێکەڵی گیان و تارمایی گیانهەڵگری ئەویندارانە، وەک لێکدانی مەی و ئاوە کە تازە بە هیچ ئاوایەک لە بەریەک هەڵناوێردرێن.

٣ وەسلا تە ل جان و دل حەیاتە
«مَنْ ذاقَ مَرارةالنَّوی طاحَ»

**مانای وشەکان:**

**مَنْ**: کەسێ؛ **ذاق** : چەشتی؛ **مَرارە**: تاڵی؛ **نَوی**: دووری، هیجر؛ **تاحَ**: بە هیلاک چوو؛

**پوختەی مانا:**

نزیکی و گەیشتن بە تۆ مایەی ژیانی گیان و دڵە. کەسێک تالایی دووری تۆی تام کردبێ، گومانت نەبێ مردووە.

٤ تەنها نە د سینە من خەدەنگن
«مِنْ لَحْظِکَ فیالقلوبِ اَرْماح»

**مانای وشەکان:**

**خەدەنگ**: تیر، **لحظ**: چاو؛ تماشا؛ **قلوب**: دلان؛ **اَرماح**: ڕمگەل.

**پوختەی مانا:**

نەک هەر من گرفتاری تۆم و سینگم پڕە لە تیری نیگای لاتیلی چاوەکانت. ڕمی تیژی مژۆلانت ــکە لە تەماشا کردنا دڵ دەپێکنــ زۆر دڵی وەک دڵی منیان هەنجنیوە.

٥ پەروین ژ شەفەق سەحەر خویا بوون
«لا بِدعَ وَ فیهِ مِنْکَ مِصباح»

**مانای وشەکان:**

**پەروین**: کۆ ئەستێرەی پێرۆ؛ **شەفەق**: لێرەدا بە مانا کوردییەکەیە، واتا شەبەقی ڕووناکایی بەیان؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **لابِدعَ**: تازەیەک نییە، واتا شتێکە ئاسایی؛ **فیهِ**: لەودایە؛ **مِنکَ**: لە تو؛ **مِصْباح**: چرا.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ئەستێرەی کۆ، بەرەو ڕووناکی بەربەیان هاتن و خۆیان ئاشکرا کرد، هیچ نائاسایی نییە؛ چونکە ڕوخساری تۆ بە شەوارەی خستبوون و بە تیشکی چراوە هاتن.

٦ «لَوْ مِستَ مِنَ‌الهوی کَبانٍ
لا بِدعَ وَ قَدْ تمیدُ ارواح»[1]

**مانای وشەکان:**

**لەو**: ئەگەر؛ **مِسْتَ**: ڕاژای، لەریتەوە؛ **مِنَ‌الهوی**: لەبەر شنەبا؛ **کَبانٍ**: وەک نۆنەمامی داری بان کە دارێکی زۆر شەنگ و شۆخە؛ **قَد**: لێرەدا خۆ دیاریشە؛ **تَمیدُ**: دەلەرێ و دەهەژێ.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دەبینم کە لەبەر شنەبایەک بەژن و بالات بە نازەوە بەم لا و ئەو لادا ڕادەژێ، بە نائاسایی نابینم؛ چونکە تۆ وەک ئێمە لەش نی. لە نازکیدا گیانێکی و گیانیش دیارە بە هاسانی، شنەبایەک دەیلەرێنێ.

---

١. بەیتێکی نیوە فارسی، نیوە عەرەبی لێرە کەوتووە:

«هَر شام و سَحَر به دَست خوبان مِن خَمرَتِنا تَدُرُّ أقداح»

واتا: هەموو ئێواران و بەربەیانێک، جوامێران، لە شەرابی ئێمە کاسەکانیان پڕ دەبن.

٧ سـەيياح مـە دیـن د خـەلوە ئـیرۆ
ئەڵـڵاھ کـو چ خـەلوە ئـوو چ سـەيياح!؟

**مانای وشەکان:**

**سەيياح**: «سائح»گەل؛ **سائح**: پێنج مانا دەدا: ڕەبەنێک بۆ خواپەرستی ڕوو بکاتە چیا و چۆلان، ئاوی ڕەوان، وتار نەخشین، گەڕیدە بە ولاتاندا، ڕۆژوەوان؛ **مە دین**: ئێمە دیمان؛ **خەلوە**: کونجی تەنیایی.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ لە کونجی تەنیایی بە چاوی دڵ سەیرم دەکرد: ڕەبەنانی خواپەرست و دەم بە ڕۆژووی نوێژ و ڕۆژوو پاک و مرۆی دنیاگەڕی زمان شیرین و دەمپاراو، کە گشتیان وەک من دڵداری دیداری یاری نازدار بوون، دەستەـ دەستە وەک ئاوی ڕەوانی ناو جۆ، بە بزەی هومێدوارییەوە هەر دەهاتن و تێدەپەڕین. ئای خودایە لەو کونجە خامۆشە چیم دیت!

٨ «افـتَحْ بِلِقـاکَ قُفْـلَ قَلْبـی
فالْقَلْـبُ لَـهُ لِقـاکَ مِفْتـاح»

**مانای وشەکان:**

**اِفتَحْ**: وەکە؛ **لِقا**: تووشهاتن؛ **قُفْل**: قفڵ؛ **قَلْبی**: دڵم؛ **لَهُ**: بۆ ئەو؛ **لِقاکَ**: تووش هاتنت؛ **مِفتاح**: کلیل.

**پوختەی مانا:**

دڵم بە جارێک داخراوە و تەنیا بە تۆ گەیشتن و دیداری تۆ دەتوانێ بۆم بکاتەوە.

٩ بـەرقێ کـو ڤـەدا ژ بـەر نیقابـێ
«فَـاللامِعُ مِـنْ سَـناهُ قَـدْ لاح»

١٠ قەوسوقـەزەخان نومـان ژ بـالا
«والْعَنْبَـرُ مِـنْ شَـذاهُ قَـدْ فـاح»

١١ ئایینــــه دلـــێ «مـــەلا» جـــەلا دا
«مِـــنْ طَلْعَتِــهِ فَقَـــد صَـــفا الـــرَاح»

**مانای وشەکان:**

**بەرق**: برووسکە؛ **قەدا**: دی، دایەوە؛ **نیقاب**: ڕووپۆش؛ **لامِع**: ترووسکەدەر؛ **سَنا**: ڕۆشناکی؛ **لاحَ**: دیاری دا؛ **قەوس‌وقەزەح**: پەلکەڕەنگینە؛ **شَذا**: بۆن و بەرامە؛ **فاح**: بڵاوەوە بوو؛ **جەلا**: مشت‌ومالْ؛ **طَلعە**: دیتن، هاتنەدەر؛ **صَفا**: پالاوتەبوو؛ **راح**: بادە.

**پوختەی مانا:**

دیارە پاڕانەوەی مەلا قبووڵ بووە. بۆیە دەڵێ:
برووسکێکی زۆر بەترووسکە لەو دیو پەردەی پیوارەوە چەخماغەی دا. ڕێژنەی بەزەیی لە دوو هات و دایباراند؛ کەی‌کەم ئیستەی‌کەم، دڵی سیس و تینووی ژاری هەزاران کز و نزاری دوورەهومێد و بێچارەی ئێمەگەلی ئەویندارران، پاراو بوون و گەشانەوە. لەو هەموو ئاڵ و والایەی ئەو بالایە، پەلکەڕەنگینە وەدی هات. عەنبەر ـکە بۆن و بەرامەی ئەو بەژن و بالا نەمامەی بەرکەوتبوو ـ بۆنخۆشیی بڵاو کردەوە. دڵی مەلا کە تا ئەوسا وەک ئاوێنەی ژەنگاوی ڕەش هەڵگەڕاو بوو، بە نم‌نمی پریشکەی هەوری بەزەیی خاوێن بۆوە. گیانی کە لە خشت‌وخاڵی دنیا، وەک بادەی پڕتلتە و خلتە شلوێ ببوو، بەو دیمەنە دڵڕفێنە وا پاڵێوراوە، هێند ڕوونە بادەی نموونەش نایگاتێ.



# ناڵەی دڵ

١ ئاهـــێ ژ دەردێ دل دکـــت هـەرچی کـو دی ئـازارێ چـەرخ[1]

دەربـــێ ل نیڤـــا دل ددەت لامیع سـیفەت نۆبـارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**ئازار**: ژان؛ **چەرخ**: زەمانە؛ **دەرب**: زەبر؛ **لامیع سیفەت**: وەک برووسکە؛ **نۆبار**: جـۆرە کەوانێک بووە کە چەند سەرەتیری وێکڕا دەرکردووە.

**پوختەی مانا:**

هەرکەس وەک من ژانی دەستی زەمانەی پەستی چێشتبێ، ناچـارە دەردیدڵ بکـا و ئاخ هەڵکێشێ. کەوانی دەستی زەمانە، تیران داوێتـە دڵـی مـن؛ بـە زەبرێکـی هێنـد دەستوبرد، دەڵێی برووسکە لێم دەدا.

٢ تـێن سـینەیان پـەیکان نهـین ئامانجـێ وان تـیران ئـەمین

دامـــا بـــەلایێ دەر کـــەمین هەر گۆشـە دورمـادارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**پەیکان**: سەرەتیر؛ **نهین**: بەنهێنی؛ **ئەمین**: ئێمەین؛ **دام**: داو؛ **دەرکەمین**: لە بۆسـەدا؛ **دورمادار**: دەوراندەور.

**پوختەی مانا:**

زەمانە لە هەر گۆشە و کەناران، بۆسەی بەڵای بۆ داناوین و دەوری داوین. سەزەتیران

---

١. هەموو نوسخەکان «هەرچی نەدی ئازارێ چەرخ»یان نووسیوە.

بەرەو سینگمان دەهاوێژێ و ئێمە نیشانەی تیرانین.

٣ بـیرا خـوە تیـنن غەنجـەیان عاشـق دنـیف ئەشـکەنجەیان
ئاڤـێتە دل بەرپەنجـەیان هەردەم ژ نـۆ شـونقارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**غەنجە**: ناز؛ **ئەشکەنجە**: ئازار؛ **ئاڤێتە**: دەهاوێتە؛ **شـونقار**: شمقـارِ؛ جۆرێـک بـازی زۆر چنگاڵ تیژ و بەهێزە.

**پوختەی مانا:**

لە جەمگەی ئازاردانێکدا کە لە زەمانەی دەبینین، سەبووریمان هەر بەوە دێت کە نازی یارمان دێتە بیر و ئازارمان لەسەر سووک دەبێ. بەڵام زەمان لێ ناگەڕێ ئاسوودە بین. هەر دەمێک سەرلەنوێ دڵمان دەخاتە بەر پەنجەی دەرد و ئازاردان؛ کە وەک شمقـار نێچیر دەگرێ، هەڵیدەدڕێ.

٤ کـوو ڤـان لـەتیفان گـولعیزار شـۆنا گـولان روسـتینە خـار
لـەو تـێن ژ بولبـول ئـاه و زار نیڤـا جیهـێ گـولزارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**کوو**: لە کوێ؛ **لەتیف**: نەرم و ناسک؛ **عیزار**: لاجانگ؛ **روستینە**: ڕواون.

**پوختەی مانا:**

کوان نەرم و ناسکانی لاجانگ وەکوو پەڕەی گوڵان؟ بە داخەوە لە شوێن گوڵان، دڕک ڕواون. بۆیە بولبول لە شوێنی چۆڵی گوڵاندا، لە چنگ دنیا گریان و ئاخ و ئۆخیانە.

٥ سـەد بازیـیـان ئـەڤ حیلـەباز تینـت ب حیلـە کارسـاز
گەهگـەهـ کـو نـازە و گـەهـ نیـاز سەحجار و پڕ مـەککارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**بازی**: عۆین؛ **گەه**: جار، گا؛ **سەحجار**: زۆر جادووگەر؛ **مەککار**: زۆر بەگزی.

**پوختەی مانا:**

ئەم زەمانە هەتا بلێی جادووگەرێکی بەفێڵە. بە ناز و قەمزە و عیشوە بێ، بە نیاز و نووزە و کزی بێ، کاری خۆی پێک دێنێ و سەتان فێڵی لە بنسەردایە.

6 هەرچی بخوونت سوحبەتێ ئاخر د جاما شەربەتێ
زەهرا هەلاهیل دێ دەتێ دا دل نەدن ئازارێ چەرخ

**مانای وشەکان:**

**بخوونت**: بانگ بکا؛ **سوحبەت**: هاودەمی؛ **هەلاهیل**: گیایەکە کە شیرەکەی ژەهرێکی زۆر کوشندەیە.

**پوختەی مانا:**

هەرکێ بەدەنگییەوە بچێ و دڵ بە زەمانە خۆش بکا، زیان دەکا. لە جەنگەی دۆستایەتیدا کە شەربەتی ئەداتە دەست، ژەهری هەلایلی تێدایە و دەیەوێ دەرمانخواردی کا. دەغیل نەکەن باوەڕ بە زەمانە کەن و دڵی خۆتانی بدەنێ!

«مُحیالدین عەرەبی» دەڵێ:

که یارم دیتی مەستم، دەستی بەستم، دامیە بەر شێران
بەڵێ هاوپیاڵەیی حەزیا سزای جزیای بەدوودا دێت[1]

7 ئەڤ ئەررەیا ژەهری ددان مەن ژێ د دل دانن سینان
مال بەهرێ فەرقێ دوژمنان بێت و برەت مینشارێ چەرخ

1. سَبَحتُ غَدیرُها شجاعاً اسوَدا لَتَخیفَ مِن یَقفُ بِذاکَ الأسوَد

**مانای وشەکان:**

**ئەررە**: هەڕە، مشار؛ **ژێ**: لەو؛ **سینان**: نووکە ڕمب؛ **مینشار**: مشار.

**پوختەی مانا:**

زەمانە وەک مشارێکە ددانەکانی بە ژەهر ئاو درابن. من زۆر نووکە ڕمبم لە دەست دنیا لە دڵدایە. با ئەو مشارە ژەهراوییە، هەر بەشی دوژمنانمان بێت و لە سەر تەپڵەسەری ئەوان بێت و بچێت.

٨ دوژمن ژ جان تالان بتن ئەو خوە هەرۆ نالان بتن
میلاک و دل کالان بتن لێ بێت و ڕەت غەدداریٚ چەرخ

**مانای وشەکان:**

**تالان**: پوڕ؛ **هەرۆ**: هەموو ڕۆژێک؛ **نالان**: بەناڵە؛ **میلاک**: سی و جەرگ و دڵ؛ **غەددار**: قەدارە، قوڵە شیرێکی دم ساتوورییە؛ **کالان**: بەرگی شیر و خەنجەر.

**پوختەی مانا:**

دەبا سەرەڕای مشاری ژەهراوی، قەدارەی زەمانەی غەددار، دڵ و هەناوی دوژمنان کالانی بێ. یاخوا گیانیان بە تالان چێ و هەموو دەمان بناڵێنن.

٩ داڤ کوهنە خانێ میسلێ دەیر چەندین کەواکیب تێنە سەیر
پەیکان بداڤێ شوبهێ تەیر هەرژێ دیارن نارێ چەرخ

**مانای وشەکان:**

**داڤ**: دەئەو؛ **کوهنە**: کۆن؛ **خان**: کاروانسەرا؛ **دەیر**: شوێنی ڕەبەنان؛ **سەیر**: تماشا؛ **سەیر**: ڕۆیشتن؛ **شوبهـ**: وەکوو؛ **نار**: ئاگر.

**پوختەی مانا:**

دەو کۆنە خانەدا ـکە وەک دەیری ڕەبەنانەـ چەند و چەند جار ئەستێرە دێن و

دەڕوانن و بەجێی دێڵن؛ ئەو هەر لەسەر ڕەوشتی پیسی خۆیەتی. پەیکان دەگرێتە ئەستێرانیش، کە وەک چۆلەکە ڕاویان‌کا. لەم زەمانە هەمیشە ئاگربارانە، دنیا دۆزەقی یارانە.

١٠ شەمسێ ب شەمسێ جام ب جام حەتتا د کن دەورێ تەمام
ئاتەش درێژە هەر مودام ئەڤ گونبەدێ دەوارێ چەرخ

**مانای وشەکان:**

**شەمس**: بریەتییە لە مەی؛ **شەمس**: دوژمنی زۆر سەخت؛ **شەمس**: هەلتۆزاندن و بار نەبردن، چەمووشی؛ **مودام**: مەی.

**پوختەی مانا:**

زەمانە وەک مەیگێڕێکی دڵپیسە. بە نیازی دوژمنایەتی، پێک لەسەر پێک بادە بۆ خەڵک تێ‌دەکا. بە هەمووانی دەچەشنێ و بەو مەیە دەیانمرێنێ. بادەکەی ئەو ئاگرێکە بۆ گیانی وەخۆرەوەکان. لەو گونبەزە خولخولەیە ئاور دەڕژێت.

١١ ئاگر د ئاب و گل دکت قەلبان ژ قەلبان هیل دکت
میتقەب د جان و دل دکت دائم ئەڤستن کارێ چەرخ

**مانای وشەکان:**

**هیل دکەت**: هەڵدەکا؛ **هیل دکەت**: هەڵدەپچڕێ؛ **میتقەب**: مەتکەو، مەتە، ئامرازی دار کۆلین؛ **ئەڤستن**: ئەوەن.

**پوختەی مانا:**

ئاگر دەخاتە ناو لەشی مرۆ، کە لە ئاو وگڵە. دڵان تووشی یەک دەکا و پێکیان دادەگیرسێنێ و لێکیان هەڵدەپچڕێ. گیان و دڵان کون‌ـکون دەکا. هەمیشە کاری، ئەو کارە نالەبارانەن.

۱۲ چەندی کـو خووبـان بـێن ڕەزم مـــن ژێ د دلـــدانن گـــەزم
ئامانجـــێ وان ڕەمـــزان ئـــەزم سەرعەسکەرێ سەییارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**خووب**: جوانچاک؛ **ڕەزم**: جەنگ؛ **من ژێ**: مـن لـەو؛ **گـەزم**: تـیر؛ **ڕەمـز**: نیشـانی نهێنی؛ **ئەز**: من؛ **سەرعەسکەر**: فەرماندە؛ **سەییار**: گەڕۆک.

**پوختەی مانا:**

هەرچەندی جوانچاکان دڵیان لە دەردی زەمانە دەڕەنجێ و دەیانەوێ بەگژیدا چـن، منی کلۆڵ بەر دەکەوم. لە وتاری بەتێکوڵیان تێ گەیشتووم کە من کراوم بە ئامـانج و منیان بە سەرکردەی بەڵای زەمانە داناوە. هەر بۆیە منی بێچارە دایم دڵـم بـە تـیر و تانەی جوانان بریندارە.

۱۳ مـن پورشەڤـان حـەتتا سـەحەر دانینـــە ڕێ ســـەمع و بەســـەر
ئـــەو مـــاهرو مابێتـــە دەر تـا ببمـە نەوبەتـدارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**سەمع**: گوێ؛ **بەسەر**: چاو؛ **نەوبەتدار**: جەزایەرچی، کێشکگر.

**پوختەی مانا:**

گەلێک شەوان تا بەیانی لە دەورەی یانەی ئەو یارە، گوێ لەسەر هەسـت و چەمـەڕام کە بەشکوو بەختم بهێنێ ئەو ڕوومانگە سەر لە پەنجەرە دەرێنێ و دوا بـە ڕۆژڕەشـیی من بێنێ. ئەگەر زەمانەش ـخوا نەکاـ نیازی وا بێ بەرد و زیپکی سارد و گـەرمی لـە ڕێ دانێ، خۆم بکەمە بەڵاگەردانی باڵاکەی.
«کوردی» دەڵێ:

چاوەکـەم زانیوتـە بـۆچی خـەو لـە چـاوم ناکـەوێ
چونکە من پێشخزمەتم، پێشـخزمەتان نـانوون شـەوێ

۱۴ کەس دی ل لەوحێ سینە قەت نەقشەک ڤەهاتی بێ غەلەت
هەر دەم ژ نوو یەک تازەخەت تاڤێتە دەر پەرگارێ چەرخ

**مانای وشەکان:**

**لەوح**: تەتەڵە؛ **وە هاتی**: ئاوا هاتوو؛ **ئاڤێتە**: دەهاوێتە؛ **پەرگار**: جەغزکێش، جەغزینگ.

**پوختەی مانا:**

هەرچی دەرد و ئازاری بەشی دڵدارانە، بە پەرگاری دەستی زەمانە لە تەتەڵەی سینەی من نەخش کراوە و هەموو دەم و کاتێک خەتێکی تازە دێتە سەر خەتان و هەرگیز نووسەری بەلایان، بۆ جارێکیش هەڵە ناکا هەڵمبوێرێ.

«ئەنوەری» دەڵێ:

هەر بەلایێ کە لە عاسمانەوە دێ
بەر لە هەمووان دەڵێ کوا ماڵی فلان[1]

۱۵ ما ژ حەسرەتا شیرینلەبان خەو تێتە چەهڤان قەت شەبان
فەریاد دەر بەر کەوکەبان پرسێ بکە ژ بێدارێ چەرخ

**مانای وشەکان:**

**ما**: بۆچی، مەگەر؛ **فەریاد**: هاوار؛ **دەر بەر**: لە پێش؛ **بێدار**: نەخەوتوو.

**پوختەی مانا:**

من کە وتم شەوان هەتا ڕۆژ ناخەوم و دڵ و چاوم بڕیوەتە ئەو سەرسەرایەی یار تێدا، مانای وا نییە دەتوانم بنووم و نانووم. بۆچی مەگەر لە عەزرەت و ئاواتی دینی لێوانی شیرینی وەکوو هەنگوینی، خەو تخوون چاوان دەکەوێ؟ هەیهات منی دڵدار شەو هەتا ڕۆژ هەر هاوارمە و ناڵەم گەیوەتە ئاسمان و ئەستێرەشم لە خەو کردوون. ئەگەر بڕوا بە

---

۱. هر بلایی کز آسمان آید بر سر هر کسی قضا باشد
نارسیده به ارض می‌پرسد منزل «انوری» کجا باشد

من ناکەی، باسم لە زەمان بپرسە کە شەو و ڕۆژ لـە خولدایـە و خـەوی نایـە و ئـازارم ناگریٚ؛ تا بزانی کە هەرگیز منی نەدیوە لە خەودا بم.
«سەعدي» دەلیٚ:

دریـژی شـەو لـە بـرژانـگـم بپرسـە کە هیچ تاوان بە سەر یەکدا نەهاتوون[1]

۱۶ ڤان ڕەهرەوێن هیممەت بولەنـد بەردانـــە مەیـــدانیٚ ســـەمەند
سەرگەشـتەین حـەتتا ب چەنـد ئەو ڕەکبیٚ مەشعەلداریٚ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**ڕەهرەو**: ڕیڤنگ؛ سەمەند: ئەسپ یان ماینی شیٚ؛ **سەرگەشتە**: سەرگەردان؛ **ڕەکب**: دەستەی سواران؛ **مەشعەلدار**: گڕهەلگر.

**پوختەی مانا:**

ئەو ڕێبوارە بەجیٚ و پایەبڵندانە کە ئەستێرەن لەو ئاسمانە، بە ئەسپی شیٚ لـە مەیـدان هاتوچوویانە، وەک دەستە سوارانێک دەچن کـە لـە شـەودا بـەرەو بـەزم و ئاهـەنگ دەچن و چۆڵەچرایان لە سەر شانە. بـەڵام لـە چـوون و هاتنـدا سـەرگەردانن؛ نـازانن بەرەوکویٚ دەڕۆن؛ بۆ هەڵدێن؟ بۆ ئاوا دەبن؟ کەی دوایی بەم ئاهەنگە دیٚ کە ناومـان ناوە زەمانە.
«خەییام» دەلیٚ:

لـەم جـەغزە کـە شـوێنی هـاتوچۆی هەموانـە
بـیٚ ژێـر و سـەرە و دوور لـە پـۆان و سـووانە
کـیٚ زانی لـە کویـوە هاتـووە و کێـوە دەچـیٚ
هـۆزان و نـەزان وەکـ یەکـە، سـەرگەردانە![2]

---

۱. درازنای شب از چشم دردمندان پرس عـزیز من که شبی یا هزار سالستـی
۲. در دایـره‌ای کـه آمـد و رفـتن مـاست او را نـه بـدایـت نـه نهایـت پیـداست
کس مـی‌نزند دَمی در این معنی، راست کاین آمدن از کجا و رفتن بــه کُجاست

**١٧** گاڤـەک ژ دەنگـێ زەنگـلان    ئەیمـەن چ ڕوونـین مـەنزلان
هەیهـەی دبیـنن مـەحمیلان    فـەریادە هـەر قـەنتارێ چـەرخ

**مانای وشەکان:**

**گاڤ**: تاوێکی کەم؛ **زەنگل**: زەنگۆڵە؛ **ئەیمەن**: هێمن؛ **روونین**: دانیشین؛ **مەحمیل**: کەژاوە؛ **قەنتار**: قەتار، گەلە بارەبەر پێکەوە لە کارواندا.

**پوختەی مانا:**

لە بەر دەنگی زەنگی کاروانی بارکردن بەرەو ئەو دنیا، کە زەمانە سازی داوە و کەژاوە لە دووی کەژاوە دێتە بەرچاو و هەروا هەیدیی بارکردنە، کوا دەتوانین ـبا بۆ کەمە تاوێکیش بێ ـ بە ئارامی و خاترجەمی لەم دنیایە پاڵ دەینەوە و دانیشین و قاچ ڕاکێشین؟!

«حافز» دەڵێ:

چلۆن پێم وا بێ ئاسوودە دەژیم تا سەر دەگەڵ یاران
دەبیسم زەنگی کاروان بانگ دەکا زوو لێبنێن باران[١]

«خەییام» دەڵێ:

هـەر بێنـەبەرە و هەڵـخول و هـاتوچۆیـە
گـوێ هەڵـخە هـەموو دەنگـی بـژی و ڕۆڕۆیـە
خـەرمانی ژیانـە سـوورە، گـەردوون سـەرکار
ڕۆکـردن و پێـوانی مـەیـە لـەو کـۆیـە[٢]

**١٨** پور مـن ژ ڤێ چـەرخێ «مـەلا»    کیـشانـە ئـافـات و بـەلا
ئـەبلـەه دبێنـم وی هـەلا    هەرچی ژ دل بت یـارێ چـەرخ

---

١. مرا در منزل جانان چه امن عیش؟ چون هر دَم    جَرَس فریاد می‌دارد کـه بربندید محمل‌ها
٢. آرند یکی و دیگری بربایند    بر هیچ کسی راز همی نگشایند
مـا را زِ قضا جُز این قدَر ننمایند    پیمانۀ عُمر ماست می‌پیمایند

**مانای وشەکان:**

**ئافات**: زیانگەل؛ **ئەبلەه**: گەوج، کەمئاوەز؛ **هەلا**: هۆی؛ **هەل**: وەخت.

**پوختەی مانا:**

مەلا! هەر من خۆم دەیزانم ئەم دنیایە چەند بێفەڕ و ئازاردەر و بێبەقایە. زۆرم زیان لە دەس دیوە و فرەم جەزرەبەی چەشیوە. با پێت بڵێم: لە کات و ساتی ژیاندا هەر کەس بە دڵ ببێتە دۆستی زەمانە، زۆر بێئاوەز و نەزانە.



## شەپالا شەنگ

آ
دلبـــەرێ ئـــیرۆ ســـەحەر ئاڤــیتە جــەرگێ مــن دو دۆخ
یــەک ل سـینە یــەک د دلــدا لــەو ژ مــن تـێن ئـاخ و ئـۆخ

**مانای وشەکان:**

**دۆخ**: ڕاستایی تیر؛ **دۆخ**: کوتەکی دۆق، سەر بە بزمار ؛ **ئۆخ**: هاواری ئێشان؛ **ئۆخـەی**: چ خۆشە.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار ئەمڕۆ لە بەرەبەیاندا کە چاوی هاتنە بەرچاوم، لە دوو لاوە بەرتیری مژۆلی داوم. لە لایەک سینەی پێکاوم، لایەک دلی وەبەرداوم. جا بۆیە هەر ئاخ و ئۆخمە. بۆ هی بەرسینەم کەوتووە، دەڵێم ئاخ دڵمی نەپێکا. بۆ ئەوەیش دڵـمی گرتـووە، دەڵـێم ئۆخەی بە ئاواتی خۆم گەییشتم.

۲
ئـاخ و ئـۆخێن مــن ژ دل تــێن لــێ ژ بــەر تــیرا قــزل تــێن؟
یــان ژ کوڤــانێن د کــول تــێن ژێ دزیت هــەر خــوون و زۆخ؟

**مانای وشەکان:**

**لێ**: بەڵام؛ **قزل**: سوور؛ **کۆڤان**: کوان و برین؛ **کول**: بـەژان؛ **دزیـت**: دەدەڵـێنێ؛ **زۆخ**: زووخاو.

**پوختەی مانا:**

بەڵێ دڵم هەر بەدڵ ئاخ و ئۆخییەتی. ئـاخۆ لەبـەر سـەرەتیرە کـە بـە خـوێنی مـنی بێبایەخ سوور بوون؟ یان لە برینی زۆر بەژانە کە بە دایم خوێن و زووخاو دەدەڵێنێ و

ترسی هەیە تیری تیژی بژانگی یار، شەلال و ژەنگاوی بکا؟

٣ خوون ژ دل جۆـجۆ رەوان تێ وەک عەقیق و ئەرغەوان تێ
لێ ژ دەست سەلوا جەوان تێ ئەو شەپالا شەنگ و شۆخ
(یان: سەلوا رەوان تێ)

**مانای وشەکان:**

**رەوان**: جاری، دانەوەستاو؛ **عەقیق**: یاقیق؛ **ئەرغەوان**: گولێکی ئاڵی دارە؛ **سەلو**: سەوڵ، سەرو؛ **سەلوا رەوان**: بریەتییە لە بەژن و بالای شۆخ؛ **جەوان**: تەڕ و تازە پێگەیشتوو؛ **شەپال**: خونچیلانەی خوێن‌شیرین.

**پوختەی مانا:**

جۆگەـجۆگە خوێنم لەبەر دلی دەڕوا. خوێنی من نەدەبوو جوان با؛ بەلام چۆنکە بە دەستی سەلما ڕژاوە ـکە بەژنی وەک داری سەولی تازەنەمام، ڕێکە و تا خوا حەزکا خونچیلانە و ڕەزاسووک و خوێن‌شیرینەـ خوێنەکەشمی جوان کردووە. هەر تنۆکەی بە ڕەنگی دەنکە یاقیقە یان وەک گولی ئەرخەوانە.

٤ ئەو شەپالا شۆخ و شەنگە کافرە، رۆم و فەرەنگە
دامە بەر جۆتەک خەدەنگە زالمێ کوشتم ب دۆخ

**مانای وشەکان:**

**کافر**: بریەتییە لە بێبەزەیی و دلڕەق؛ **رۆم و فەرەنگ**: لە زاراوەی شاعیراندا بە سپی پێستی زۆر جوان دەلێن؛ **خەدەنگ**: تیر؛ **دۆخ**: زەلیلی و زەبوونی.

**پوختەی مانا:**

ئەو نازدارەی لەبەردڵەی شۆخ و شەنگە، چەند بە دیمەن سپی و نەرمە، هێندەش دلی ڕەق و سەختە و بەزەیی پێمدا نەهات و لە دوو لاوە دامییە بەر شیری بژانگ و زۆر بە زەلیلی کوشتمی.

«نالی» دەڵێ:

دەخیلت بم! نەخیلی یا ڕوتابی وەها شیرین و سینەنەرم و دڵرەق؟!

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | زالمێــــی کوشــــتم شــــەپالێ | نازکـــێ غــــەنجێ دەلالـــێ |
| | بـــون حیجابـــا زولـــف و خالـــێ | ئیـــدەک و عـــالا و تـــۆخ |
| ٦ | نـــەترک و تـــایێن ب ریشـــی | ئـــێ دزێـــرن پێڤـــە وێشـــی |
| | مـــن دو فـــیرس دیـــن د پێشـــی | مـــروەت و ئینســـاف یـــۆخ |

**مانای وشەکان:**

**قەنج**: پەسند و بێخەوش؛ **دەلال**: دڵگر و جوان؛ **حیجاب**: پەردە؛ **ئیدەک**: سوخمە؛ **عالا**: بریەتییە لە پارچەی ڕەنگینی توێڵپێچ؛ **تۆخ**: جوققە؛ **تۆخ**: لێک هاڵان و پێچان و بەرەو ژوور و قیت هەڵگەڕانەوەی موو لە ناوەڕاستی ناوچاواندا کە وەک جوققەی پادشایانی لێدێت؛ **تۆخ**: بەو جوققەیان دەگوت کە لە مووی ئەسپ پێک دەهێنرا و لە جیاتی میداڵ دەدرا بە پیاوانی ئازای هەڵبژاردە، لە سەریانی دەن؛ **نەترەک**: مانگۆڵەی بەر لەرزانە؛ **تا**: هەودا؛ **ریشی**: ڕیشوو؛ **وێشی**: هێشوو؛ **فیرس**: سوارچاک، سووکەڵەسوار؛ مروەت: پیاوەتی؛ **یۆخ**: نییە.

**پوختەی مانای ئەو دوو بەیتە:**

ئەو خونچیلە خوێنشیرینەی دنیاپەسندەی جوانچاکە، زۆر بە زۆردارانە کوشتمی؛ چۆنکە هەر نەمتوانی بەدڵ سەیری خەتوخاڵی بکەم. دەسماڵ و هەنیەپێچەکەی، مووی پێشەسەری پێچراوی بەرەو ژوور هەڵگەڕاوەکەی، لاگیرەی پێچەسەرەکەی، هەودای بەڕیشووی دەسماڵی کە هێشووی زێڕیان پێوە بوون، بوونە پەردە لە نێوان چاوی بەتاسەم و دینی کەزی و خاڵەکانی وەک دەمەویست. پێشاوپێش هەر چاوەکانیم دیت کە بە مەستی وەک دوو سوارچاک هێرشبەرن بۆ سەر دوژمن. بە سیلە و گۆشە ڕوانیمیان و بێ بەزەیی و لێڕاوەستان، گیان و دڵیان شەقار کردم. داد و هاوار لە دەس ئەو چاوە مەستانە! نە پیاوەتییان دەگەڵ کردم نە هیچ ئینسافیشیان هەبوو؛ ئەگەر ئینسافیان هەبوایە، یەکجارەکی دەیانکوشتم.

٧ لــەو هــەرفتم ئــەز ژ مــەیلێ شــوبهەتێ ســەهلێ و ســەیلێ
موحبــەت و عیشــقا د لــەیلێ ئــەز کــرم یەکســەر پلــۆخ

**مانای وشەکان:**

**هەرفتم**: تێکڕووخام، تێکتەپیم؛ **مەیل**: ئارەزوو؛ **سەهل**: گڵ و خۆڵێک کە وەک ڕەمڵ سێلاو دەیبا؛ **لەیلێ**: گراوییەکەی قەیسی عامیری؛ **ئەز کرم**: منی کرد؛ **یەکسەر**: بەتەواوی؛ **پلۆخ**: پۆلوە ئاگری زۆر گەش؛ **پلۆخ**: داپەڵۆخاو، تەواو ڕزیو.

**پوختەی مانا:**

هەر لە ترسی زۆرداریی و دوورەئینسافی چاوانییەتی کە قەڵای ئارەزووی دیتنیم تێکتەپیوە. بوومە ئەو خۆڵە نەرمیلەی کە لافاو وەبەر خۆی دەدا و بە دار و بەردیدا دەدا. ئەگەر قەیس لە ئەوینی لەیلایەدا پێداگر بوو، ناگاتە من. من لە ئەوینی لەیلای خۆم لەسەر هەتا پێ ئاگرم و بە سووتانەوە گرشەمە و هەربینا هەر داپلۆخام.

٨ دەســت نــەهێلم ئــەز ژدینــێ شــوبهێ فرهــاد و شــرینێ
وەر ژ بــەر عیشــق و ئەڤــینێ مــن درێ چــت ئــەڤ کلــۆخ

**مانای وشەکان:**

**نەهیلم**: هەڵناگرم، بەرنادەم؛ **دین**: دیتن و تماشا؛ **فەرهاد**: ئەویندارە بە ناوبانگەکەی شیرین کە چیای بێستوونی تاشی؛ **وەر**: تەنانەت ئەگەر؛ **کلۆخ**: کەللەسەر.

**پوختەی مانا:**

بەڵام نابێ کەس لای وا بێ من بەم سووتان و کوژران و ئاوبردنە، وازم لە دیداری یار هێناوە. تا هێزم هەبێ و بۆم بلوێ دەچمە سەرسوێ و بۆ دیداری یار دەڕوانم. من لە ئەوینی شیرینی ئەو شیرینە ــکە لە گیانم شیرینترەــ ئەو فەرهادەم کە دڵ لە ئەوین بەر نادەم. تەنانەت ئەگەر سەریشم لەو ڕێگەدا بدۆڕێنم و وەکو فەرهاد، بە دەستی خۆم دوایی بە ژیانی خۆم بێنم.

٩ سـوحبەتا چـەرخ و سـەما تـێ وەک «مەلا» سـەد موبتـەلا تـێ
زەمـــزەم و ئاڤـــا حـــەیاتێ موشتەری سـەد شـەیخ و شـۆخ

**مانای وشەکان:**

**سوحبەت**: کۆڕی دۆستانە؛ **سوحبەت**: باس؛ **چەرخ**: سووڕ؛ **سەما**: هەڵپەڕکێ؛ **موبتەلا**: گیرۆدە؛ **حەیا**: شەرم؛ **حەیات**: ژیان؛ **زەمزەم**: ئاوێکە لە مەککـە و پـیرۆزە؛ **زەمـزەم**: ویرەویر؛ **موشتەری**: کڕیار.

**پوختەی مانا:**

لە کۆڕێکدا کە نازداران دێنە سەما و گەڕی دیلان دەبێتە کۆز و بـادەی وەکـوو ئـاوی ژیانی تاهەتایی و پیرۆز وەک ئاوی زەمزەمە و چۆڕەچۆڕی زەمزەمەی دێ و تنۆکـەی شەرم لە سەر ڕووی شەرمین و نەرمینان دیارە، بە سەتان لە پیر و لاوان، وەک مـەلا، گیرۆدە دەبن و بە دڵ لە خودا دەخوازن لەو کۆڕەدا ڕێگە بدرێن.



# چ داوەتە

١ هەیهەیا رەقس و سەمایا تە چ خوەش بەستییە چەرخ
کو د بورجێ ب سەما تێتە ل سەر دەستێ خوە بەرخ

**مانای وشەکان:**
**سەما**: هەڵپەڕکێ؛ **سەما**: ئاسمان؛ **چەرخ**: کۆز؛ **چەرخ**: خولدان بە گەرمی، چەرخ بەستن.

**پوختەی مانا:**
کۆڕ و کۆزی بەزم و سەمای کە تۆی تێدای و ئەو هەوا و هوریا و بەه ـ بەه و ماشەڵڵا لەو جوانییە گوتنەی ئەو کەسانەی لە سەمادا تۆ دەبینن، وای کۆڕ گەرم داهێناوە، دەنگی گاڵە و تینی ئەوینی دڵداران، لە ئاسمان دەنگیدایەوە. بورجی بەرخ (خاکەلێوە) ـکە خۆر لەودا لە هەموو دەمان گەشترە ـ بە ڕۆژەوە لە خۆشییان هەر هەڵدەبەزێ و بە چوارپەلان سەما دەکا.

٢ سوفیێن هەر د تەوافێ حەجەرولئەسوەدە قەسد
گول و سونبول ب سەما تێن حەمییان زەمزەم و چەرخ

**مانای وشەکان:**
**تەواف**: لەدەورەگەڕان؛ **حەجەر**: بەرد؛ **ئەسوەد**: ڕەش؛ **حەجەرولئەسوەد**: بەردی ڕەشی حاجیان کە دەدیواری کابە گیراوە و ماچی دەکەن تا حەجەکەیان بەرکەوێ؛ **حەمی**: هەموو.

**پوختەی مانا:**
هەروا پۆل ـ پۆل، شیخ و سۆفی، بۆ زیارەت و ڕاموسانی خاڵی ڕەشت، لە کابەی ڕووت

لە دەوری سەرت دەگەڕێن. لە کاتێکا کەزیە و بسکت، لەبەر شنەی هەناسەی ساردی دلداران ــوەک لقی گوڵ و سونبولان کە سروەی بەیان لێی دەداــ دەلەرێن و دێن و دەچن، حەجیان هەر لەبیر نامێنێ و تێکرا دەیکەن بە زەمزەمە و چەرخ و خول دان.

۳ نەقشێ ئەلماسی ل ئەلماسێ بنێ گرتییە حەرف
خەتێ یاقووتێ ل یاقووتێ شکێناندییە نەرخ

**مانای وشەکان:**

**ئەلماس**: گەوهەرێکی سپی و ڕوونی هەرە بەنرخە؛ **بنێ**: بڕوانە؛ **حەرف**: ڕەخنە و ئیراد؛ **یاقووت**: گەوهەرێکی ڕەنگ ئاڵە؛ **نەرخ**: بایی، نرخ.

**پوختەی مانا:**

پێستی سپی و تیشکدەری ڕوخساری یار ــکە بۆ جوانی بە ئەڵماس دەشبهێندرێــ بڕوانە تانە دە ئەڵماس دەگرێ و کردوویەتە گەپجاڕی خۆی. چونکە ئەو نە وەک ئەڵماسە هەر ساکار بێت؛ دەستی خودا، بە چەندین ڕەنگ ڕەنگاندوویە. ئەو سوورایییەی کە خوا لە لێو و کولمی ئەو خەتی داوە و لەچاو خەتان وەک خەتی یاقووتێ وایە، نرخی یاقووت و ئەڵماسی شکاندووە.[1]

۴ کەرخین ئەم د قیامێ مە ژ دل پەردە درانە
عارفێ وەقتم و مەعرووف بلا بێتە ژ کەرخ

**مانای وشەکان:**

**کەرخین**: تەزین؛ **کەرخین**: وەڕەزبووین؛ **قیام**: ڕاوێستان، هەستان؛ **عارف**: پیری تەریقەت، خواناس؛ **مەعرووف**: بەناوبانگ؛ **کەرخ**: گەڕەکێکە لە بەغدا، شێخ مەعرووفی کەرخی ــکە لە ئەولیای بەناوبانگ بووەــ لەوێ ژیاوە و هەر لەو کەرخەشدا نێژراوە.

---

١. لە ناو عەرەبان خەتخۆشێک بە ناوی «یاقوت مُستَعصمی» زۆر بەناوبانگە. ئەم لەتەبەیتە ئاماژەیەک بەویشی تێدایە کە گوایە خەتی لێوی وەکوو یاقووتی یار، نرخی خەتی یاقووتی موستەعسیمی شکاندووە.

**پوختەی مانا:**

ئێمـە زۆر ڕاوێسـتاوین و ڕاسـتی پلـە و پایـەی خۆمـان لـە خواناسـین دەرنەبـڕیوە. پەردەیەکم گرتبۆوە کە کەس لە تێکەڵاو بوونی گیـان و دڵـم دەگـەڵ یـار خەبـەردار نەبێت؛ نەک نائاگایان و بەدکارن ئینکار بکەن. بەڵام کە لەم وێستانەدا، ئێستا هەسـتم بە تەزین و لەبەر سـەرکۆنە نەبـەزین کـردووە و ئـەوین پـێم دەڵـێ خـۆم دەرخـەم، ئەدرکێنم کە من ئەمڕۆ ئەو عارف و خوداناسەم لە دنیادا تاکم نییەو لە نـاو جەرگـەی گیان پاکاندا بەناوبانگم. ئەگەر یەکی وەکوو مەعرووفی کەرخی بەناوبانگ، ئەمڕۆ زیندوو بایەتەوە و بهاتایەتە سەر دنیا، ئۆباڵی بۆ لە مل دەدام کە هەرچی دەیڵێم تەواوە.

٥ دا بناسـی خەتـەرێن رێ تـۆ نـەبی غافلـێ ژێ
دیجلەیە لێ دپڕن بڕ بڕێ (بەربڕی) پیل و بەر و مـەرخ

**مانای وشەکان:**

**دیجلە**: زێیە گەورە بەناوبانگەکە؛ **لێ**: لەوێدا، تێیدا؛ **بەر**: سنگ؛ **بڕ**: بڕست و توانا؛ **پێل**: شەپۆل؛ **پیل**: فیل؛ **بەر**: بەرد؛ **مەرخ**: بۆدڕ و کەندەلان، ئاودڕ.

**پوختەی مانا:**

کاورای ڕێبوار لە ڕێگەی خوداناسیندا کە ئەتەوێ بگەیە کاروانی ئێمـەی دڵـخۆش بـە ئەویندارییمان! لات وا نەبێ هیچ دژواریت نایەتە ڕێ و گەییشتن بـە دیـداری یـار زۆر هاسانە. ئەم کارە وەک لە دەجلەدانە، لە هەڕەتی تەوژم و سەرڕێژ کردندا؛ بەر شەپۆلی وا دەکەوی توانا و بڕست لە فیل دەبڕێ. گاشەی لووس و زەلامت زۆر دێنە بەرێ کـە نەدیتە تێ هەڵدەنگوی؛ لەپڕ سەرەنگرێ دەبی. پڕیە لە کەندال و ئاودڕ؛ تێ دەکەوی و نوقم ئەوی و گێژت ئەدا و ئەتخنکێنێ. دەغیلت بم! تا نەزانی مەلەوانی لـە زەبـری و دەتوانی لەو خەتەرانە خۆ دەربازکەی، مل لێ مەنێ و خۆی لێ مەدە!

٦ پـیرێ شـەعارە د شـیعرێ و «مـەلێ» شـال فـروش
تو نیشان من مەدە فەرخی کو ل نـک مـن بویـە فـەرخ

**مانای وشەکان:**

**شەععار**: کوێنچن؛ **شەعار**: هەرزەوێژی کۆلانگەڕ؛ **شال**: پارچەی پەشمینە؛ **فەرخی**: فەڕڕوخی شاعیری دەربارەی غەزنەوییان؛ **فەرخ**: جووجەڵە.

**پوختەی مانا:**

مەلا ئەمڕۆ لە بازاڕی هونەری شیعر و شاعیری، کاڵای پەشمینە دەفرۆشێ؛ تۆ ناشێ لە بەرانبەریدا ناوی فەڕڕوخی بهێنی. ئەو لەچاو من، کوێن فرۆش و هەرزەوێژێکی هەرجایی حیساب دەکرێ. فەڕڕوخی بەرانبەر بە من، جووجەڵێکە زەرنەقوتە و هێشتا تووکی لێ نەڕواوە.



## دەریایەکە

آ سیرریێ وەحـدەت ژ ئـەزەل گرتییـە حـەتتا ب ئەبـەد
واحیـد و فـەردە ب زاتـێ خـوە وی نیـنن چـو عـەدەد

**مانای وشەکان:**

**وەحدەت**: تاکی و بێ‌شەریکی خودا؛ **ئەزەل**: هەربوو؛ **ئەبـەد**: تاهـەتا؛ **واحیـد**: یـەک؛ **فەرد**: تاک؛ **نینن**: نین؛ **چو**: هیچ؛ **عەدەد**: هەژمار.

**پوختەی مانا:**

بەڵگەی پەی‌بردن بە یەکایەتی و بێ‌شەریکی خودا و هەربوونی و هەرمانی، بە پانایی و ڕۆشنایی هەر بوونیەکەی و هەرمانی لە بەرچاوە. خۆبـەخۆ یـەک و تەنهایـە و ژمـارە کردن هەڵناگرێ.

۲ د قیدەمـدا ئـەزەل و عـەینێ ئەبـەد هـەردو یـەکن
سەرمەدییەت وە دخوازت نـە ئـەزەل بـت نـە ئەبـەد

**مانای وشەکان:**

**قیدەم**: هـەرە پێشـینەیی؛ **عـەین**: تـەواو خـۆی؛ **عـەین**: سـەرچاوە؛ **سـەرمەدییەت**: هەرمانی بێ‌کەم و مەرج.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر وتمان خودا هەرە پێشوونەیە و خۆی زەمان و جیهـانی بەرهـەم هێنـاوە، ئیتـر پێشینە و دوایینە ـ ئەگەر هەبێ ـ بۆ عەقڵی کورتی ئێمەیـە و لـە بـازاڕی یەکایـەتی و هەمەکارەیی خودادا ناکرێ باسی ڕابردووگ و ئێستا و ئایندە و پاشەڕۆژ هەر بکرێ.

٣ فەرقــە واحیــد ژ ئەحــەد لــێ د مــەقامێ ســەمەدی
ب حەقیقــەت کــو یــەکن هــەردو چ واحیــد چ ئەحــەد

**مانای وشەکان:**

**واحید**: تاک؛ **ئەحەد**: یەک؛ **مەقام**: جێگە؛ **سەمەد**: بێنیاز لە هەموو شت و جێ نیازی هەموو شت.

**پوختەی مانا:**

واحد بۆ کەسێک دەبێژن کە هیچ کەسێ لە ئاکاردا تای ئەو ناکا و لە سیفاتدا تاقانەیە. ئەحەد بۆ کەسێک ئەگوترێ کە لـە چۆنایـەتی خۆیـدا (لـە زاتیـدا) بـێ هـەواڵ و بـێ شەریکە. جا ئەگەر گوتمان واحید یاخۆ ئەحەد، هەر یەکێکە و جیاوازی لە ناودا نییە.

٤ یەکــە دەریــا تــو بــزان قــەنج! چ مــەوج و چ حوبــاب
د ئەسڵــدا کــو حــەمی ئاڤــە چ ئــاف و چ جەمــەد

**مانای وشەکان:**

**قەنج**: باش، ڕاست؛ **حوباب**: بڵقی سەر ئاو؛ **حەمی**: هەموو؛ **جەمەد**: سەهۆڵ.

**پوختەی مانا:**

زۆر باش سەرنج دەو تێبگە! ئەگەر ناوی دەریامان برد، شەپۆل و بڵـقی ســەر ئـاویش هەر دەریاکە دەگرێتەوە. سەهۆڵ و ئاویش هەروەتر، یەک ڕەگەزن.

٥ ئافتابــێ ئەحەدییــەت د خــوەدا گرتییــە کــەون
نەکوو عەورەک هەیە لێ گرتییـە چەهڤـێن مـە ڕەمـەد

**مانای وشەکان:**

**ئافتاب**: تیشکی هەتاو؛ **کـەون**: هەرچی ئافەریدە و داهێنراوی نێوان عـەرز و ئاسمانـە؛ **عەور**: هەور؛ **رەمەد**: چاوێشە.

**پوختەی مانا:**

بەڵگەی تاقانەیی خـودا، وەک خـۆر تیشـکی هـەموو دنیـای داگرتـووە و لـە ڕۆژیـش ئاشکراترە. بەڵام ئێمەی چاوێشەدار، چاوپرووشین و لە بەرچاومان هەورێک هاتۆتە بەر تیشک و ناتوانین هەتاو ببینین.

٦ حوسـنێ زاتـێ بـوت و لاتـان ژ جـەمالا سـەمەدە
ژ میسـالا سـەنەمێ وەه کـوو تەجەللایـە سـەمەد

**مانای وشەکان:**

**حوسن**: جوانی؛ **لات**: ناوی‌بتە؛ **سەنەم**: بت؛ **تەجەللا**: ئاشکەرابوون.

**پوختەی مانا:**

ئەو جوانییە دڵڕاکێشەرەی بت‌پەرستان لە بتانیدا دەبینن و بویتە هۆی بت‌پەرستنیان، هەر تیشکی جوانی خودایە داویەتەوە و داویەتە وان. ئای چەند سەیر و سەمەرەیە! لە هەیکەلی بتانیشدا، خودا چەند ئاشکرا دیارە.

٧ غـەیرێ دەریـا نییـە سـەحرا ب حەقیقـەت ئـەمما
ژ رووێ کەیفـە کـو ئـەف ئاڤـە بـوی شـوبهێ زەبـەد

**مانای وشەکان:**

**کەیف**: چۆنیەتی؛ **شوبهی**: وەکی؛ **زەبەد**: کەف.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ڕاستت دەوێ ساراش هەر دەریایە. بەڵام تەرزێکِ گۆڕانی بەسەر هاتووە ئاو بـە ئاوی ماوەتەوە و ڕەملی سارا، کەفێکە دەریا چنیویە.[1]

---

١. شیاوی باسە: خودا بەر لە وشکانی و بەژ، دەریای هێناوەتە بەرهەم. وردە‌وردە تێکولی لێ پەیدا بووە و ئاوەکەی بە جێی هێشتووە و بەژ وەکوو کەف کردن وایە کە لە دەریاوە دەرچووبێ و توێی بەستبێ و کەژ و کۆی لێ پەیدا بووبێ. «هەژار»

٨ «كُـلَّ يَـومٍ هُـوَ فـي شَـأنْ» نـەبی غافلـێ ژێ
هـەر پەیاپـەی ژ شـئونان دكـرت فـەیز و مـەدەد

**مانای وشەكان:**
**كُلَّ يَوْمٍ:** هەموو ڕۆژێ؛ **هُوَ:** ئەو؛ **فِيْ شَأنْ:** لەحاڵێكدا؛ **ژێ:** لێی؛ **پەیاپەی:** بێپسانەوە، بە دوای یەكا؛ **شئونان:** حاڵەتان؛ **دكرت:** دەكا؛ **فەیز:** بەهرەگەیاندن؛ **مەدەد:** یاریدە و كۆمەگ.

**پوختەی مانا:**
خوا لە قورئاندا فەرموویە: هەرچی لە عەرز و ئاسماندان نیازیان لە خودا دەخوازن. خوا هەر ڕۆژێ حاڵەتێک بە خۆوە دەگرێ. بۆ ئەم حاڵەت گوێزانەوە زۆر مانا لێدراوەتـەوە. دەڵێن دەربارەی كوشتن و لە نەبوو زیندوو كردن و ڕۆزی پـێ دان و لێخۆشـبوون و تاوانبار تەنبێ كردن و تۆبە بەخشـین و چـاو پۆشـین و لێـک جیاكردنـەوەی یـاران و پێک‌گەیشتنی دوورانە. واتا خودا هەموو كارێكی لە دەس دێ و كەس نابـێ ناهومێـد ببێ و ناشێ لە نیاز بۆ بارەگای سستی بكا.
مەلا بە مریدی ڕێ دەڵێ: چاوت لە بەزەیی خوا بێ؛ دڵیشت لەسەر ئاگا بێ. بـەهرە و یاریكاریی خودا بێ پسانەوە بەرەو دنیا و خەڵكی دنیا بەڕێوەیە. لێی بخـوازە و مـەیژە ناگا.

٩ گـەر د ئـادەم بـدیا سـیررێ عـیلم ئیبلیسـێ
«حیَنمـا أبصَـرَهُ كَبَّـرَ حینـاً وَ سَـجَدْ»

**مانای وشەكان:**
**ئیبلیس:** شەیتان؛ **حینما:** هەركە؛ **أبصَرَهُ:** چاوی پێ كەوت؛ **كَبَّرَ:** ئەڵـڵاهو ئەكبـەری گوت؛ **حینا:** دەمێک؛ **سَجَدَ:** سوژدەی برد.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر شەیتان نهێنییەکانی زانستی بزانیبا، کە ئادەم چی دەپاڵدایە و خودا فێری چی کردووە و بنیادەم چەند لە لای خودا دەستی قەدری لێ نراوە، هەر کە تازە لەشی بابەدەمی دەدیت کە لە قوڕ درووسکراوە، بێ خۆگرتن ـلە دوای بە خودا هەڵگوتنـ سوژدەی دەبردە بەر ئادەم. بەڵام نەیزانی و تێداچوو.

١٠ چ زەمـــان و چ مـــەکان و چ جهـــات و چ حـــودوود
چ مـــەقادیر و تەفاســـیل و حیســـابن چ عـــەدەد

١١ چ مونافـــات و لـــوزوومن چ قیـــاس و چ میســـال
ئـــەڤ چ تەولیـــد و چ تەرکیبـــە چ رووحـــن چ جەســـەد

١٢ ســـەر ب عیجـــزێ ددرت قووەتـــێ دەرراکـــەیێ مـــا
«رَجَـــعَ الْعَقْـــلُ كَلـــيلاً وَ مَتـــى قـــامَ قَعَـــدْ»

**مانای وشەی ئەو سێ بەیتە:**

**زەمان**: دەم؛ **مەکان**: جێ؛ **جیهات**: لاگەل؛ **حدوود**: کەوشەنان؛ **مەقادیر**: ئەندازەگەل؛ **تەفاسیل**: زۆر درێژەدان؛ **حیساب**: هەژمار؛ **عەدەد**: ژمارە؛ **مونافات**: پێچەوانان؛ **لوزووم**: پێویستی؛ **قیاس**: بەراورد؛ **میسال**: نموونە؛ **تەولید**: بەرهەم دان؛ **تەرکیب**: لێکدان و تێکەڵ کردن؛ **جەسەد**: لەش؛ **ددرت**: دەدات؛ **دەرراکە**: زۆر لەسەر هەست و شتزان؛ **ما**: ئێمە؛ **رَجَعْ**: گەڕایەوە؛ **کەلیل**: کول و بڕستبڕاو؛ **مَتی**: کەنگێ؛ **قامَ**: هەستا؛ **قَعَدْ**: دانیشت.

**پوختەی مانا:**

تۆژینەوە و لێکدانەوە و پێوانەی کات و شوێن و جێ و هەژماردن و پێک گرتن و شت لەبەریەک ڕاگرتن و دوان لە مەڕ بەرهەم هێنان و پاژ لە یەکتر کردنەوە و باسی بوون و چۆنیەتی گیان و لەشان و ژماردن و بژاردن و «هەر نابێ و ئەشێ» کردنمان، لە بەرانبەر زانستی خودای مەزندا کەڵکی نییە و بەهرە نادا. ئاوەز و هۆشی بنیادەم، تا بیری لێ دەکاتەوە، سەری لە بەردی ڕەق دەدا و هۆشی تیژی زۆر بە کولی و کەلەلایی بەرەو خۆی دەگەڕێتەوە و

هەرگا ویستی هەڵبوێستێ، گورجێ ڕۆدەنیشێتەوە.

۱۳ حـــیرەت و عیجـــزە ســـەرەنجام دبابـــێ نـــەزەرێ
«کَـــیْ بـــە خـــالق نَظَـــرِ قاصِـــرِ مَخْلـــوقْ رسَـــدْ؟»

**مانای وشەکان:**

**حیرەت**: سەرسووڕماوی؛ **عیجز**: زەبوونی؛ **سەرەنجام**: ئاخری؛ **باب**: درگا، پاژێک لە کتێب؛ **نەزەر**: تماشا؛ **خالق**: داهێنـەر؛ **مخلـوق**: داهێنـراو، درووس کـراو؛ **قـا صِـرِ**: کورت؛ **رسَد**: دەگا.

**پوختەی مانا:**

هەرچەندی لێکیدەیەوە و گەو بە گەو تێکیکەیەوە و بیدەیە بـەر بـیری تیـژ و بتـەوێ لـە نهێنییەکانی زانستی خودا بزانی، بێبەهرەیە؛ ئەو کارە بە چاوی ڕواڵەت زۆر دژوارە بزانـدرێ. ئاخر بیر و ڕوانینی کورت و نەبەگەی درووس کراو کەی دە وەستاکەی خۆی دەگات؟

۱۴ گوفتوگۆی مەعریفەتێ چەنـدی «مـەلا» پەیـدا کـی[1]
گەوهـــەرا مەعریفـــەتێ ناگیهێتـــێ کـــەس ب خـــیرەد

**مانای وشەکان:**

**مەعریفەت**: ناسین؛ **خیرەد**: عەقل و ئاوەز.

**پوختەی مانا:**

مەلا! هەرچەندی بخوێنی و لە وتووێژ دەربارەی ناسینی خواوە کارامـە و زمـان پـاراو بی، دیسان هیچ دادت بۆ نادا. کەس بە عەقڵ گەوهەری خودا ناسینی دەسناکـەوێ؛ مەگین خوا کۆمەگی بکا.

۱. عوسمان تونچ: «گفتوگۆ چەندە مەلا مەعریفەتێ پەیدا کە»



# جیژنە پیرۆزە

١

عیـدە وو هەرکـەس ژ دیـدارا تـە لـێ پـیرۆزە عیـد
ئەز تنێ مـەحروومێ دیـدارم ب سـەد مـەنزل بەعیـد

**مانای وشەکان:**

**عید**: جێژن؛ **مەحرووم**: بێبەش؛ **بەعید**: دوور.

**پوختەی مانا:**

رۆژی جێژنە و هەرکەسێکی تۆ ببینێ جێژنی لێ پیرۆز دەبێ. هەر منم تـەنیا بـەخت ڕەشم و لە دینت بێبەشم. من لە دووری تۆ دەگەڵ خۆشی، بە سەد قۆناغ جودام.

٢

هـەر سـەحەر دهنێـرم ئـەز جانـا ب ئاهـانرا ژ دل
«بـارَکَ الْبـاری بِأسْـعادٍ عَلَیْهـا یَـوْمَ عیـد»

**مانای وشەکان:**

**بارَکَ الْباری**: خوا موبارەکی کا؛ **بِاسعاد**: بە بەختەوەری؛ **عَلَیْها**: لەسـەر ئـەو مێوینـە؛ **یَوم**: ڕۆژ.

**پوختەی مانا:**

گیانە من لە ناخ دڵمەوە هەموو ڕۆژێـک سـەرلەبەیان، بـە هەناسـە ساردەکەمدا وڵام دەدەم: خوایە هەموو ڕۆژی یارم بە بەختەوەریی و جێژن و شادی و دڵخۆشی بێ.

٣

دەرگـەهێ لوتفـا تـە خـانم مـال مـەحرووومان ڤـەبێ
«انَّ کلبـاً باسِـطاً دَهْـراً ذِراعـاً بالْوَصـید»

**مانای وشەکان:**

**خانم**: ئەی گەورەی من؛ **خانم**: ژنی بەڕێز؛ **ما**: تۆ بڵێی؛ **انَّ**: لێرەدا بەمانا ئـەوا؛ **کَلب**: سەگ؛ **باسِط**: ڕاخەر؛ **دەهر**: زەمان؛ **ذِراع**: دەست لـە پەنجـە تـا هەنیشـک؛ **وَصید**: ژێردەرانە، پێشدەرگانە.

خوا لە باسی ئەسحابی کەهفا فەرموویە: «سەگەکەشیان لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکەدا کەوتووە و هەردوو چەمۆڵەی داداوە.»

**پوختەی مانا:**

گەورەم (یان: خانمە جوانەکە)! منیش وەکوو گەماڵەکەی پیاوچاکانی ناو ئەشـکەوت، دێرزەمانە لە دیاری بەردەرگانەکەت چاوەنۆڕی لاواندنەوەم. تۆ بڵێی جارێک ئەو دەروە لە منی ناهومێد و دوورەبەخت بکرێتەوە؟

۴ پیرەمـــەردم عاشـــقم ئـــیرۆ مـــورادا مـــن ببـــەخش
«یـــا حبیبـــی یـــامُرادی یـــا مُنـــی قَلْـــبِ الْمُریـــد»

**مانای وشەکان:**

**مُراد**: جێنیاز؛ **مُرید**: بەنیاز؛ **مُنی**: ئاوات؛ **حبیب**: خۆشەویست.

**پوختەی مانا:**

پیرەمێردم، ئەویندارم، چاوی دڵم هەر لە تۆیە خۆشەویستەکەی جێنیازم! تۆ ئەوپەڕی ئاواتمی. دەسا بەزەییت پێما بێ و تۆزێکم بلاوێنەوە و دیدارێکم پێ ببەخشە.

۵ «فَـــرَّ عَقْلـــی مِـــنْ لَهیبـــی مِثْـــلَ بـــازٍ اَوْ عُقـــاب»
«ذَابَ روحـــی مِثْلَمـــا أنْحَـــلَّ فـــی نـــارٍ جَلیـــد»

**مانای وشەکان:**

**فَرَّ**: ڕای کرد؛ **مِنْ**: لە؛ **لَهیبی**: بڵێسەی من؛ **مِثْلَ بازٍ**: وەک بازێک؛ **او**: یان؛ **عُقاب**: هەڵۆ؛ **ذَابَ**:

توایەوە؛ **مِثْلَما:** هەر وەکوو؛ **انْحَلَّ:** لە بەریەک بڵاو بوو، توایەوە؛ **نار**: ئاگر؛ **جَلید**: سەهۆڵ.

**پوختەی مانا:**

ئاخر تا کەی دوور بم لە دیداری دەرگات؟ عەقڵێکم بوو بەگوڕ، وەکوو باز و هەڵۆ؛ لەبەر تینی بڵێسەی دڵ و هەناوم، لە هێلانەکەی تەرە بوو. ئەو گیانەش کە لە لەشما بوو، وەک چۆن سەهۆڵ لەسەر ئاگر دەتوێتەوە، توایەوە.

٦ «دَمعُ عَيْنـي مِـنْ بُكـائي مِثـلَ نَهْـرٍ فـي سُـكوب»
«نـارُ قَلْبـي مِـنْ غَرامـي فـي ضَـرامٍ فيالْوَقيـد»

**مانای وشەکان:**

**دمع**: ئەسرین؛ **عینی**: چاوم؛ **بُکائی**: گریانم؛ **نَهر**: چەم؛ **سُکوب**: داڕژان؛ **نارُ قلبی**: ئاگری دڵم؛ **غَرام**: ئەوین؛ **فی**: لە ناو؛ **ضَرام**: گڕپە؛ **وَقید**: دەستەچیلەی ئاگر.

**پوختەی مانا:**

هێند گریاوم لووزەوی فرمێسکی چاوم وەک ئاوی ڕووبار دێتە خوار. دڵ وا بە ئەوین سووتاوە، ئێژی گڕپەت لە پووش و پەلاش بەرداوە.

٧ دل ژ بەر ناریٚ مەجازی «بِالْحَقیقَتْ» بوو پەرەنگ
«نـارُ قَلْبـي فـي هَـواهُ مثـلُ نـارٍ فيالحَديـد»

**مانای وشەکان:**

**مەجازی**: داهاتووی بەدەڵ؛ **حەقیقەت**: ڕاست و ڕەسەن؛ **پەرەنگ**: پۆلوو، سکڵ؛ **هَوا**: ئەوین، مەیل؛ **حَدید**: ئاسن.

**پوختەی مانا:**

دڵم کە بەر لە دڵداریی سارد و سڕ بوو، هەرکە ئاوری ئەوینی تێدا هەڵکرا، ڕاست وەک

سکلّی گەش و بەگرشەی بەسەر هات. ئەو ئاگرەی کە لە ئەوینی یارەوە لە دلّمدا هەلّگڕاوە، وەک ئاسنی سوورەوە بوو دلّمی نەرم و پڕ لەتین کردووە.
شیاوی باسە: ئاسن کە لە گەرمان نەرم دەبیّ و سوور هەلّدەگەڕیّ، تینەکەی زۆر بەتەوژمە و درەنگیش سارد دەبێتەوە.

۸ «کَیْ خَلاص اَزْ دوزَخِ هِجرِ تو یابَمْ ای جَوان»
«هَر نَفَسْ دارَد صَلاء و نعرەی هَل مِنْ مَزیدْ»

**مانای وشەکان:**
**اَز**: لە؛ **یابَم**: گیرم ئەکەویّ؛ **دارَد**: هەیەتی؛ **صَلاء** : بانگ و قاو؛ **نَعْرَه**: گوڕە؛ **هەل**: ئاخۆ؛ **مَزیدْ**: زیادە.

**پوختەی مانا:**
کەی لە دۆزەقی دووری تۆ ڕزگار دەبم؟ یارە تازە پێگەیوەکەم! کە ئەم دوورییەت هەموو دەمان بە نەعرەتە هاوار دەکا: ئاخۆ لەوە زیاتر هەیە بیسووتێنم؟
لێرەدا مەلا ئیشارەی بە ئایەتێکی قورئان کردووە کە فەرموویە: ڕۆژی قیامەت خوا لە جەهەندەم دەپرسیّ ئەریّ پڕ بووی؟ دەلّیّ ئاخۆ پتر هەیە بۆمی بێنن؟!.

۹ کیّ دزانت من ژ رمبازان دەما ئۆغلمە تێن
تێنە دل سەدرم ژوان و سینە تێنیّ سەد جەرید

**مانای وشەکان:**
**ئۆغلمە**: جەنگی مەغلۆبە، هێرشی توند و تیژ؛ **جەرید**: جلیت، کورتە ڕمب.

**پوختەی مانا:**
کیّ دەزانیّ من لە دەستی چاوی مەستت چم بەسەر دیّ؟ بیّبەزە کەوتوونە جەستەی گیانی پرژانی دلّم. بویتە کولّکی گۆڕ و مەیدانی جلیتبازانی شۆڕەسوار و نیشانی نیشان پێکان بە پەیکانان. هەردەمیّ دێن و دەچن، سینگم بە ڕمبان کون_کونە و دلّ

بە نووکی تیری برژانگ بۆتە بێژنگ.

١٠ مـــن ژ ســـەففەینان ژ نیڤـــا مەقتـــەلێ رم تێنـــە دل
لـــێ لـــوان دەســـتان نـــیهن خوونـــا غـــەزایا ئـــەز شـــەهید

**مانای وشەکان:**

**سەففەینان**: دوو ڕیزان؛ **نیڤ**: ناوەڕاست؛ **مەقتەل**: شەڕگە؛ **مەقتەل**: برینی‌کاری؛ **لێ**: بەڵام؛ **نیهن**: نین؛ **غەزا**: پەلامار بۆ سەر دوژمن، خەزا؛ **شەهید**: کوژراو لە ڕاهی خوادا؛ **شەهید**: حازر و ئاگادار.

**پوختەی مانا:**

کەزیەکانت لە دوو لاوە بە هۆی سروەی شنەباوە ـکە تێکەڵ بە یەکتر دەبن و ڕوخسارتم لێ دەشێرنەوەـ وەک لێکدانی دوو ڕیز لە شەڕکەران دەچێ کە پەلاماری یەک دەدەن. منی بێچارەی هەژاری دڵ بریندار، لەو ناوەدا بێ سووچ و تاوان دەکوژرێم. خوێنیشم بە فیڕۆ دەڕوا و کەس کوشتنم ناگرێتە خۆ و شەهیدی گوژەر نەناس خۆم![1]

١١ موســحەفا حوســن و جــەمالێ ســوورەتا خــال و خــەتان
«مـــا تَلَوْنـــا غَيْـــرَ حَـــرْفٍ لا وَ قُـــرآنٍ مَجيـــد»

**مانای وشەکان:**

**موسحەف**: کتێب؛ **موسحەف**: قورئان؛ **حوسن و جەمال**: جوانی و خوشیکی؛ **سوورەت**: بەقەدریی و گەورەیی؛ **سوورەت**: بەشێکی سەربەخۆ لە قورئان یان کتێب؛

---

١. شیاوی باسە: شەڕی سەفین کە لە سالی ٣٧ی کۆچی، سەفەرەمانگ، لە دەم فورات، لە نزیکی شاری ڕەققەی لای حەلەب، لە سووریا، مابەینی عەلی و مەعاویە ڕووی داوە، لەم بەیتەدا ئیشارەتێکی بۆ کراوە. کێشە زۆرە ئاخۆ کوژراوی ئەو شەڕە هەموویان شەهیدن یان نا؟ «هەژار»

**ما**: نە؛ **تَلَونا**: خوێندمان؛ **حەرف**: پیت؛ **لا**: نا؛ **وَ قُرآنٍ مَجید**: سوێند بە قورئانی جێگەورە و پیرۆز.

**پوختەی مانا:**

سوێند بە قورئان، منی دڵداری سەرگەردان، لەوەتا هەم بە ئاواتم لە کتێبی پڕ لە پەڕی جوانی و دلگری ئەو یارە و بە تایبەتی لە سوورەتی خەت و خاڵی سەر ڕوومەتی تێر بڕوانم. بەڵام هێشتا جگە لە پیتی «نا»م نەخوێندووە و هەر وشەی نام گوێ لێ بووە؛ کە ئەو نایەش «لا»ی تێکنانی نێوان دوو برۆکانییەتی.

«نالی» دەڵێ:

وتم ئایا بە زاری خۆت ئەپرسی حاڵی زاری من

بڕۆی هێنایە یەک وەک شکڵی لا یەعنێ کە بێزارم

۱۲ گەرچی هەر دایم ژ میهرێ نەینەکا دل بەدرە من

وەک هیلالێ سوبحێ تێم ئەز جارنان بم ناپەدید

**مانای وشە:**

**میهر**: خۆر؛ **میهر**: ئەوین و خۆشەویستی؛ **نەینەک**: ئاوێنە؛ **بەدر**: مانگی چاردە؛ **هیلال**: مانگی یەکشەوە؛ **تێم**: دێم؛ **بم**: ببم؛ **ناپەدید**: نادیار.

**پوختەی مانا:**

هەرچەند هەمیشە دڵەکەم وەک ئاوێنەی کە تیشکی ڕۆژ بداتەوە، لە تیشکی ئەوین ڕۆشنە و وەک مانگی شەوی چاردەهەم ڕووناکە و بگرە زیاتریش؛ بەڵام جار‌ـجار کە پرشنگی دیداریم لێ لا دەکەوێ، دەبمە ئەو مانگە یەکشەوەی کە بەیانی بۆی بڕوانن. کە هەر نییە و بە یەکجاری تواوەتەوە.

«نالی» بە یارەکەی دەڵێ:

ئەی میهری میهرەبان وەرە سەربامی بامداد

تا مەهرووان ببن بە هیلالی شەوی محاق

۱۳ مـــا بلـــەعلێن جـــانفزا ناقـــێ مـــە بینـــت جارەکـــێ
«بِالـــدُّعا بَلِّـــغْ تَحِیّـــاتی لِسَـــلْمَی یـــا بَریـــد»

**مانای وشەکان:**

**ما**: بەڵکوو؛ **لەعلێن**: لەعلان؛ **جانفزا**: پیتدەر بە گیان؛ **بِالدُّعا**: بە نزا و پاڕانـەوە؛ **بَلِّغْ**: بگەیەنە؛ **تَحِیّاتی**: دروود و سەلامەکانم؛ **لِسَلْمی**: بۆ سـەلمایە؛ **یـا بَریـد**: ئـەی پـەیکی نامەبەر.

**پوختەی مانا:**

ئەوە خوایە بەڵکوو سەلما جارێک یادێک لـە مـن بکـا و بـەو دوو لێـوە تـەنک و ئاڵـە یاقیقیانەی ـکە گەشەی گیان لەوانڕایـەـ نـاوی مـەلا بـدرکێنێ. دە توخـوا! پـەیکی نامەبەر وێڕای دروود و سڵاوان بۆ پێکهاتی ئەم ئاواتەم، لەبەر سەلما بپاڕێوە.

۱۴ تو ژ«مەلا»یێ هەر بپرس ئەسرارێ عیشقێ حەل دکـت
ڤـێ موعـــەمماییێ چ زانـــن ســـەد مـــەلا و موســـتەعید

**مانای وشەکان:**

**حەلدکت**: هەڵدێنێ؛ **موعەمما**: مەتەڵ؛ **موستەعید**: فەقێی لەسەر ئیجازە، بەرەژوورتر لە سوختە.

**پوختەی مانا:**

تۆ گەرەکتە نهێنییە دژوارەکانی دڵی دڵداران بـزانی، ئـەو مەتەڵـە هـەر لای مـەلای جزیری هەڵدەهێندرێ و کەسیتر نا. مەلایان و خوێندەوارانی لـەزەبر، بـە سـەتانیش هیچی لە هیچ لێ نازانن.

۱۵ ئەر ب کوشتن وەر ب هشتن ئـەمر و فـەرمانا تـە بـت
«اَحْمَـــدُ عَبْـــدُ رَقیـــقٌ واقِـــفُ بَـــیْنَ الْعَبیـــد»

**مانای وشەکان:**

**عَبد**: کۆیلە؛ **رَقیق**: بەنی و کۆیلە؛ **رَقیق**: تەنک، باریک، نەرم و نیان؛ **واقِف**: ڕاوێستاو؛ **عَبید**: کۆیلەگەل.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دەتەوێ بمکوژی یان دەتەوێ بمهێڵیەوە، فەرمانت چۆنە با وا بێ و بە دڵ ڕازیم. ئەحمەد کۆیلەی ئاڵقەبەگوێی بەر دەرگاتە. بۆ فەرمانت لە ناو کۆیلەکانی دیتدا هەڵوێستاوە و گوێلەمست و لەسەرهەستە.



## داد و مەدەد

١ نەیشەککەرا گەردن ژ عاج دیسا ژ ڕەشتوزێن سەمەد
قەوسێن ل بالا فەرق و تاج کەیبەر ڕەشاندن بێ عەدەد

**مانای وشەکان:**

**نەیشەککەر**: قامیشی شەکر؛ **ڕەشتوز**: ڕەشی برقەدار؛ **سەمەد**: بێنیاز و جێنیاز؛ **ل بال**: لە کن؛ **ل بالا**: لە بەرەژوور؛**کەیبەر**: تیری دەمپانی وەک چەقۆ.

**پوختەی مانا:**

بەژنی باریک کە بە ڕاستی و شووشی و شیرینی، بەرەوی قامیشی شەکر دەشکێنێ و گەردنی زەردی سپیواش، کە عاج لە تماشا کردنی ڕادەمێنێ، ئەوا دیسان لەو جووتە برۆی سێونگی زۆر ڕەشی بریقەداری بەکەوانەی کە نێوانیان لە بڵندایی بالایدا، بەرانبەر بە دوڕ کاکۆڵ و تانجی سەرییەوە دیار دەدەن و ئەو کەوانە ڕەشانە دەسکردی وەستای بێهاوتای دنیاسازدەری بێنیازە؛ دەستی بە تیرەبارانی هەزاران لە دڵداران کرد.

٢ کەیبەر ڕەشاندن بێحیساب میسری کودان سیقال و تاب
سەد ڕوستەم و ئەفراسیاب کوشتن ل وان کەر کر جەسەد

**مانای وشەکان:**

**ڕەشاندن**: پرژاندنی؛ **سیقال**: مشتوماڵ؛ **تاب**: تیشکە و بریقە؛ **کەر**: لەت؛ **جەسەد**: لەش.

**پوختەی مانا:**

جگە لەوە چاوی مەستی بە مژۆلان، تیرەبارانی دڵمی کرد و لە هەژمار بەدەر بۆی

هاویشت، برۆکانی ـکە وەک شیری میسری تیژ و خوار و جەوهەردارن ـ وەها مشتومالّ کریا و بریقەداری کردبوون، کە نەک هەر منی هەژاری بەستەزمانیان پێ دەکوژرا، ئەگەر ڕوستەمی دەستان و ئەفراسیابی تووران وەبەر هاتبا، بە قەلّتێک دایدەهێنان و کەلاکیشیان هەنجن دەبوو.

| | | |
|---|---|---|
| ٣ | سەد پادشاه و خوسرەوان | جان دان ژ عیشقێ و رەوان |
| | نەسرین و لەبسێ ئەرغەوان | من دین ل بەژنا سەروقەد |
| ۴ | من دین ل بەژنا عەرعەرین | تایێن زەباد و عەنبەرین |
| | بایی سەبا دا چەنبەرین | زولف چوونە سەر نوورا سەمەد |

**مانای وشەکان:**

**خوسرەو**: قەراڵ، پادشا؛ **رەوان**: گیان؛ **لەبس**: جلک و شمەک؛ **عەرعەر**: دارێکی ڕاست و بڵندە؛ **تا**: هەودا؛ **زەباد**: لابار؛ بۆنخۆشێکە لە جانەوەرێک هەڵدەوەرێ کە وەکوو پشیلە دەچێ؛ **چەنبەر**: گەو، ئاڵقە.

**پوختەی مانا:**

من یارمدیت؛ چ ببینم؟ ئەو بالا سەوڵ و عەرعەرە، بە بەرگی ئاڵ و والاوە دەتگوت نەمامی عەرعەرە و بە نەسرین و ئەرخەوان گوڵی کردووە. کەزیەکانی ئەتوت تاتای میسکی زەباد و عەنبەریان بەر گرتووە. لەو کاتەدا بای بسکان هات و ئاڵقەی زولفان چوونە سەر ڕوومەتی جوانی کە تیشکی ڕووناکی خودا دەداتەوە. جا نەک هەر من، سەد پادشا و قەراڵیش ئەوە ببینن لە عەزرەتان گیان ئەدەن و فەراقی ڕەشیان لێدەبڕێ.

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | زولف چوونە سەر نوورا زولال | جارەک وەرە بایێ شیمال |
| | بسکان ژ سەر دیمێ ڤەمال | زولفان ژ بەر جۆتێ ئەسەد |

**مانای وشەکان:**

**زولال**: ڕوون و لووس و ڕەوان؛ **دیم**: ڕوخسار؛ **ڤەمال**: بماڵەوە؛ **ئەسەد**: شێر.

**پوختەی مانا:**

بای شەماڵ! دەستم دامێنت وەرە ئەو بسکە ڕەشانەی، کە نووری ڕوخساری یاریان داپۆشیوە، لادە و ئەگەر دەتوانی ڕامالە، با ئەو چاوانەش ببینم کە لە کوشتنی دلداران لە جووتێک شێر خەتەرترن. چونکە من بە دڵ ئاواتمە بەو چاوە جوانانە بمرم.

| | | |
|---|---|---|
| ٦ | سەححار جوهتی جادووان<br>دل گرت و دا بەر کاشوان | ئیرۆ ژ ڕەمزا ئەبرووان<br>کەر کر ل مسکینان کەبەد |
| ٧ | دل گرت و دا بەر خەنجەران<br>مە ژ دەستێ زولما ئەسمەران | کوشتم نیگار و دلبەران<br>داد و مەدەد، داد و مەدەد |

**مانای وشەکان:**

**سەححار**: جادووگەر؛ **ڕەمز**: ئیشارەت؛ **کاشو**: گۆچانی گەمەی شەقێن؛ **ئەسمەر**: گەنم ڕەنگ.

**پوختەی مانا:**

ئەو دووچاوە سیحراوییانەی ـکە وەک دوو جادووگەر وانەـ چاوێکیان لە برۆیان داگرت و تێیان گەیاند کە دڵمیان لە بەر لابەرێ. برۆی چەماو لە چەشنی گۆچانی شەقێن، دڵیان کردم بە گوێ مەیدان و ڕفاندیان و کە لە خەنجەریش تیژترن، ئەو بێچارەیان هەنجنی و لەتبەلەت کرد. هاوار لە من؛ منی هەژار؛ بەر زوڵمی زۆردار کەوتووم و زۆرکاری من، نازەنینێکی دڵبەر و زەرد ئەسمەرە. ئەی خوایە بە دادم بگە! نیازم زۆر بە یارمەتییە.

| | | |
|---|---|---|
| ٨ | دلبەر ژ لەعلێن خۆی شەفاف<br>دەریایێ عیشقێ قاف و قاف | دا مِن مەیا گولگوون و ساف<br>پەیوەستە تێتن جەزر و مەد |

**مانای وشەکان:**

**شەفاف**: ڕوونی شووشەیی؛ **گولگوون**: گوڵڕەنگ؛ **قاف**: کێوێکە لە دەریادا و دەوری

هەموو دنیای داوە؛ **جەزر**: کشانەوەی دەریا؛ **مەد**: هەڵکشانی دەریا.

**پوختەی مانا:**

مەلا دیارە زۆر دۆعای قبووڵ دەبن. لە پاش ئەو داد و هاوارە، دیارە دڵیان داوەتەوە؛ کە فەرموویە: یارم لەو جووتە لێوانەی ـکە وەک بلوور ڕوون و پاک و لە ئاڵیدا لە لاڵ دەکەنـ بادەی گوڵڕەنگی ڕووناکی پێ چەشاندم و تێی گەیاندم کە ئەگەر لەسەر واز نەبوو، جارـجارە دڵی ئێشاندم، گوێ نەدەمێ؛ چونکە ئەوین وەک دەریایە و هەموو دنیای داگرتووە و دەریاش بێ جەزر و مەد نابێ. جارێک لێم نزیک دەبێت و جارێکیان دەستم نایگاتێ.

| | | |
|---|---|---|
| ٩ | حوسنا مونەززەهـ بێمیسال | سەردا لیباسێ خەتوخال |
| | سەرگەشتە حەیران ما و لال | ئەحمەد کو دی نوورا سەمەد |
| ١٠ | ئەڵڵەهـ ژ نوورا سەرمەدی | یەک قەترەیەک دا ئەحمەدی |
| | شیرینی و ڕەمزەک وەدی | مەدهووش ما حەتتا ئەبەد |

**مانای وشەکان:**

**مونەززەهـ**: پاک و دوور لە کەمایەسی؛ **سەرگەشتە**: سەرگەردان؛ **حەیران**: حەپەساو، سەرسووڕماو؛ **ڕەمز**: ئیشارە، نهێنی؛ **مەدهووش**: تاساو.

**پوختەی مانا:**

منی دڵدار، کە ئەو جوانییە پاک و بێ عەیب و بێ وێنەیەم بە گلێنەکانی خۆم دیت و سەیری خەتوخاڵانم کرد ـکە بوونە نەخشی ڕوخساریـ بە یەکجاری بۆم دەرکەوت کە وێنەی نووری خودایە لەو ڕوخسارە جوانەدایە. ئیتر تاسام؛ سەرم سووڕا؛ لاڵوپاڵ بووم. خوایە نووری بێ ئاوابوون و سنوورت ـکە خۆی نیشانی بەندە داـ چەند گرینگە! من تنۆکێکم لە دەریای نووری هەمیشەیی تۆ پێ گەییشت. شیرنایەتی و مژدەی نهێنی وای داومێ، کە هەتاـهەتا سەرخۆش و بێهۆشم دەکات.



# سەفینەی مەی

١ ئــــاه ژ دەســــتێ وێ ســــرێ    دل ژ مــــەیێ حەوالــــە کــــر[1]
هــەرچی ل مــن کــری «مــەلا»    جامــێ مــەیا دوســاله کــر

**پوختەی مانا:**

ئەی داخەکەم! هیچ نازانم مەبەستی نهێنی چ بوو. دڵە دەردەدارەکەی من، حەواڵەی پیاڵەی مەی کرا. مەلا! هەرچی بەسەرت هات، لەو بادە کۆنەی بزانە.

«حافز» لەو بارەوە دەڵێ:

چــل ســاڵە دەردەدارم و وا تــازە تــێ دەگــەم
چـاری هــەژاری دڵبـەجغار مــەی دووساڵــە بــوو[2]

٢ شــەنگێ ب نــازێ مەششــیها    میســک و زەبــادێ وەششــیها
رووی مــا دبــن پیــا نــە هێــژ    زێــدە ل مــن دەلالــە کــر

**مانای وشەکان:**

**مەششیها**: ڕۆیشت؛ **وەششیها**: وەشێنرا، داوەری، پەرژوبڵاو بۆوە؛ **هێژ**: هێشتا، هێمان؛ **دەلال**: ناز؛ **ما**: ئێمە.

**پوختەی مانا:**

ئەو شەنگ و شۆخە بە نازە، هات و ڕابرد. ڕەوتە بەلەنجەولارەکەی، میسک و زەبـادی

---

١. عوسمان تونچ: «من ژ خەمان ب سەد بەلا    دل ل «مەلێ» حەواله کر» ...
ئەم شیعرە لە نوسخەی عوسمان تونچدا، تا کۆتایی، فەرقی زۆرە.

٢. چل سال رنج و غصّه کشیدیم و عاقبت    تدبیـر مـا بـه دست شـراب دوسـاله بود

دەوەشاند و بۆنی خۆشی بلاو دەکرد. بۆ پایەنداز لە ڕێبازی ئێمەی دلدار، ڕوو بە ئاسمان تخێل بووین و ویستمان بەختەوەرمان بکا و پێ لە سەر چاوانمان دانێت. بەلام پێ لە چاوی تەڕ و سوور نان بۆ بەری پێ ناسکەکەی ئەو دیارە زۆر بوو. بە نازەوە هێشتا ئێمەی بە تاوانبار دەرێناوە و منەت دەکا.

۳ چیچەک و گول سەحەرگەهان نەستەرەنێن د خەرگەهان
تێکی ژ میسک و ماوەرێ ماهێ خوناف و ژالە کر

**مانای وشەکان:**

**چیچەک**: گول؛ **سەحەرگەه**: دەمی بەیانی؛ **نەستەرەن**: جۆرێ گولەباغی ئالە؛ **خەرگەه**: خێوەتی گەورە؛ **خەرگەی کەسک**: بریەتییە لە ئاسمان؛ **خەرگەی مانگ**: خەرمانە؛ **ماوەر**: گولاو؛ **ماه**: هەیڤ؛ **خوناڤ**: شەونم؛ **ژالە**: شەونم، ئاونگ.

**پوختەی مانا:**

یارم لە بەرەبەیاندا کە ڕوخساری خۆی نیشان دا، کولمی سوور و لێوی ئالی و لاجانگی ژێرتای دەسمالی و هەنیەی مانگ و کەزی و بسکی، بەرامە بلاوکەرەوەی لەبەر ئەم ئاسمانە شێنە و لەسەر ئەم کۆنە زەمینە، دیمەنی دا. هەرچی گول بوون لە خۆشیانی و لە شەرمانی ـکە لە جوانیدا تای ناکەن ـ ئارەقیان کرد. ئاسمانیش بە ئەستێرەوە، لە عەزرەتی ئەو دیدارە و لە پرشنگی ئەو ڕوخسارە، تک ـتک ئاوی لە لێوان و ئەسرین لە چاوی دەباری. کە ئەو ئەسرینانە دەگەل خوەدانی گولاندا تێکەل بوون و شەونم ئەنگووت. بەلام نەک ئاونگی بێ بۆن؛ لە نێزیکی ئەو تازەگولە نازدارە، بۆنی میسک و گولاوی وەخۆ گرتبوو. بە کوردی لێکی دەینەوە مەلا دەلێ:

لە بەیاندا ـکە گول شەونمیان لەسەر بووـ یار هاتە دەر؛ لە ناو گولان پیاسەی کرد.

۴ دیمێ د بسک و خەمریان تاو و لەفێن د شەتریان
مانە تەمام کەسکوسۆر بەدرە ل دۆرێ هالە کر

**مانای وشەکان:**

**دیم**: ڕوخسار؛ **خەمری**: پەرچووکە، نیوە ڕووبەندێکی تۆڕی و بەگەو؛ **لەف**: پێچ؛ **شەتری**: گولینگەی بان شەدە؛ **کەسکوسۆر**: کۆلکەزێڕینە؛ **بەدر**: مانگی پڕ؛ **بەدرە**: بە هەڵپە و پەلە؛ **بەدرە**: کۆمەڵێک لە سکەی زێڕ و زێو.

**پوختەی مانا:**

دیمەنی ئەو دەم و چاوە، لە ناو بسک و گێلگێلە و گولینگە و دەرزی و لاگیرە و خرینگە و سەرپۆش و سەرپێچ و هەوری و گەردنبەندان، وەک مانگێک دەهاتە بەرچاو کە لە شەوی چاردەدا بێ و پەلکەزێڕینە بووبێتە خەرمانە و دەوری لێ دابێ.

5 دەور کرین ژ سونبولان چیچەک و بشکۆ و گولان
دل مە ژ ڕەنگێ بولبولان شبهەتێ داغێ لالە کر

**مانای وشەکان:**

**دەور**: دەورە؛ **بشکۆ**: بشکۆژ، خونچە؛ **شبهەت**: وەکوو؛ **لالە**: گوڵەمێلاقە.

**پوختەی مانا:**

بەو کەزیانەی کە وەک سونبول بۆنیان خۆشە، خونچەی لێو و گوڵی کوڵمی خستۆتە ناو پەرژینەوە و دڵم لە تاو نەدیتنی، داخلەدڵە و وەک مێلاقە ڕەش بووە جەرگ و هەناوی و بوومە هاودەردی بولبولان لە ناڵە و گریانی بەکوڵ.

نالی دەڵێ:

گریانی بەیانانی منە باعیسی خەندەت
پشکوتنی گوڵ مایەیی لێنانی شەواوە

6 پیرێ موغان ژ شیشەیێ دا مە سەفینەکێ مەیێ
شوکرێ خودێ کو قولزومەک من ژ خۆرا قەبالە کر

**مانای وشەکان:**

**موغ**: مەلای زەردەشتی؛ **پیری موغان**: مەیخانەچی، لە زاراوەی عارفاندا بە پیری تەریقەت دەڵێن؛ **سەفینە**: گەمیە، لە زاراوەی مەیخۆراندا پیاڵەی پڕە؛ **قولزوم**: لە بنچینەدا ناوی دەریای سوورە و چونکە نێزیک بە شاری «قولەیزمە»ی نزیک سیواسی میسر بووە، ئەو ناوەی بە سەرا بڕاوە، بەڵام لە شیعری شاعیراندا واتای دەریا دەدا؛ **قەبالە**: تاپۆ.

**پوختەی مانا:**

پیری تەریقەت لە بادەی دڵداریی خودا پیاڵەیەکی دەخوارد من دا. سوپاس بۆ خوا کە لە سایەی ئەو پیاڵەوە دەریایەکم وەگیر کەوت. واتا دڵم بوو بە دەریا لە ناسین و ئەوینی خودای مەزندا.

**٧**
خزرێ ب رەمز و موعجیزی     مەست مە دی د دینگزی
هات پیالەیەک د دەست     ئەشکەرە سەد پیالە کر

**مانای وشەکان:**

**خزر**: سەوز؛ خزر: ناوی یەکێک لە نزیکان بە خودایە کە مەرگی لێ دوور کەوتۆتەوە. دەڵێن ئاوی ژیانیشی خواردۆتەوە و هەمیشە هەر جوان دەمێنێ؛ **رەمز**: نهێنی و ئیشارە؛ **موعجیز، موعجیزە**: ئەو شتەی لە عەقڵ و دەسەڵاتی مرۆ بەدوورە؛ **دینگز، دینیز**: دەریا.

**پوختەی مانا:**

پیری من وەک خدری زیندە لە دەریای دڵما خۆی نواند. ئێمەی دی مەستی ئەوینین، پیاڵەیەکی لە دەستدا بوو؛ بەو پیاڵە سەد پێکی دامێ و سەد ئەوندە مەستی کردم.[1]

---

١. شیاوی باسە: قورئان باسی مووسا دەکا کە تووشی یەکێک هاتووە زۆر لە خۆی زاناتر بووە و لە دەریادا پێکەوە بوون؛ تا ئاخری چیرۆکەکە... دەڵێن ئەو پیاوە خدر بوو. مەلا لێرە ئیشارەتێک بەو باسەی قورئانیش دەکات. «هەژار»

٨ غونچەلـــەبا ژ رەنـــگ گولـــێ دیمـــێ ب ســیرِ نومــا «مــەلێ»
شـــوبهەتێ بولبـــولان ســـەحەر لـــەو مـــە فغـــان و نالـــە کـــر

**مانای وشەکان:**

**لەب**: لێو؛ **سیر**: نهێنی؛ **فغان**: هاوار.

**پوختەی مانا:**

خونچە لێوەی بەڕەنگ گوڵە، بە نهێنی لە بەیانـدا ڕوخسـاری نیشـان مـەلا دا. هـۆی ئەمەیە کە هەموو بەرەبەیانان، وەک بولبولان ئێمە گاڵە و ناڵەمانە.



# حەجی گەورە

١ دەرێ مەیخانەیا عیشقێ سەحەر عارف زیارەت کر
ب ئابێ چەشم و خونێ دل وزوو بەست و تەهارەت کر

**مانای وشەکان:**

**چەشم**: چاو؛ **وزوو**: دەستنوێژ؛ **تەهارەت**: پاکوخاوێنی.

**پوختەی مانا:**

خواناس (عارف) لە بەرەبەیاندا، دەرگای مەیخانەی ئەوینی نیشاندرا. بۆ ئەوەی بۆ ماچکردنی سەردەرانە و چوونە ناو مەیخانە بشێ، گەرەک بوو پاکوخاوێن بێ. لەسەر دەستووری خواناسان، لە خوێنی دڵدا خۆی شتت و بە ئاوی چاو دەستنوێژی گرت.

٢ ورین جاما هیلالیدا ژ عەکسێ ماهێ نەو بینی
کو خانێ میهر و جەرگێ چەرخ و خوانێ ڕووزە غارەت کر

**مانای وشەکان:**

**وەرین**: بهێنە؛ **هیلالی**: لە بیچمی مانگی یەکشەوە، (یان: لە ڕەنگی مانگی یەکشەوە)؛ **عەکس**: گەڕاندنەوە؛ **ماهی نەو**: مانگی تازە؛ **بینی**: ببینی؛ **خان**: ماڵ؛ **خوان**: سفرە.

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ! بەو پیاڵەی سەر دەستت ـ کە لە شکڵی مانگی نوێ دروست کراوە ـ مەیێکی زەردی تیشکدەر وەک مانگ بێنە و بماندەرێ و ڕوخسارتی تێدا بنوێنە و برۆکانت لەو بادەی لە ڕەنگ ئاوێنەدا تماشا کە! کە هەرچەند لەگوێن مانگی نوێ کەوانی و باریک دەنوێنن؛ چۆن پشێوی و ئاژاوەیان ناوەتەوە، تیری ئەوان لە ماڵەکەوانییانەوە ماڵی خۆر

و جەرگ و هەناوی ئاسمان و سفرەی ڕۆژووی ڕۆژوودارانی تالان کرد و سووتاندنی. لەو ساوە تۆ دیاریت داوە، نە ڕۆژ پەرستن لەباوە و نە ڕۆژوو لەبەر مانگ دیتن.

٣ ب میزان قەوسێ ماهێ نەو ل وەجهێ دلبەرێ من دی
ژ چەشم و گوشەیێ ئەبروو ب دۆڕ جامێ ئیشارەت کر

**مانای وشەکان:**

**میزان**: تەراز، بەرانبەر؛ **میزان**: بورجی تەرازوو لە ئاسمان؛ **قەوس**: کەوان؛ **قەوس**: بورجێک لە ئاسمان؛ **وەجه**: ڕوخسار؛ **وەجه**: لا؛ **ب دۆر**: بۆ دەورەی.

**پوختەی مانا:**

من کەوانەی برۆی یارم لە بەر هەنیەی بەدی کردن کە وەک مانگی تازەهاتوو، لە گۆشەی ئاسمانی ساودا هاتە بەرچاو. لە تەرازی و ڕێکوپێکی و کەوانەی ئەو دوو کەوانە، بورجی کەوان لە ئاسمانا دەگەڵ ئەستێرەی تەرازوو شەرمەندە بوون کە گرۆی لێ بردبوونەوە. یاری نازدار بە گۆشەی برۆ و تیلەی چاو هانەیان دام کە لە پیاڵە نزیک کەوم و لە تیشکی ئەوان لە مەیدا سەرخۆش و دوورەهۆش ببم.

٤ ب ئەبساران نەزەر من چوو ژ چەرخێ قەوسێ ئەبروویان
شوکور خوازین کو چاڤان کار بەرعەینێ بەسارەت کر

**مانای وشەکان:**

**ئەبسار**: چاوگەل؛ **بەسارەت**: عیلم و زانست؛ **نەزەر**: تماشا؛ **چەرخ**: سووڕاندن، بزواندن؛ **چەرخ**: جەغز؛ **چاڤان**: چلۆن؛ **چاڤان**: چاوگەل؛ **عەین**: چاو؛ **عەین**: خودی خۆ، تەواو.

**پوختەی مانا:**

کاتێ یارم گۆشەی برۆی بزواندن و بە تیلەی چاو تێی گەیاندم بادە وەخۆم، چاوم لە جەغزی برۆکەی هەڵخلیسکا و چاوە مەستەکانیم دیتن و بەوان مەست بووم. سوپاس بۆ خوا کە چاوانم هەڵێک کاریان لە ڕووی زانینەوە تووش هات. سەیر ماوم چلۆن ئەو جارە بەختی من ئەوندە باشی هێناوە؟!

٥ ژ بەر دیمێ نیقاب ئاڤێت و دەستوورا تەوافێ دا
د سەعێ بەیت و ئیحرامێ و من ئەسوەد زیارەت کر

**مانای وشەکان:**

**نیقاب**: ڕووبەند؛ **دەستوور**: ئیجازە؛ **تەواف**: دەدەورە گەڕان؛ **سەعی**: ڕۆینی بەپەلە و غاردان بە تایبەتی بۆ حاجیان لە هەڕەتی حەجدا؛ **بەیت**: ماڵ، ماڵی کابە؛ **ئیحرام**: دەربەست بوون بە چەند شتێک کە هەڕەتی حەج مەرجە بۆ حاجی؛ **ئەسوەد**: ڕەش، بەردی ڕەشی حاجیان.

**پوختەی مانا:**

یار ڕووبەندی لەسەر ڕوخساری تووڕهەڵدا. ئیجازەی دا کە لە دەوری سەری گەڕێم و دنیا لە خۆم حەرام کەم و بەرەو کابەی ڕوخساری ئەو بەغار بڕۆم. خوا شوکور حەجم قبووڵە و خاڵی وەک بەردە ڕەشەکەی حاجیان پیرۆز و ڕەنگ شەوەم، زیارەت کرد.

٦ د دیدارێ هەزاران جان نسارێ مەقدەمێ یارن
کەسێ جانان ب جان بینت د عیشقێ وی تجارەت کر

**مانای وشەکان:**

**نسار**: پەرژ کردن، شاباش؛ **مەقدەم**: جێگە پێ، پێ و قدەم؛ **تجارەت**: قازانج لە مامڵە.

**پوختەی مانا:**

لە ڕێگەی دیداری یاردا هەزاران گیان بە شاباشی بەری پێی کەم، لە قازانجمە. کەسێک یاری بە چاوی گیان ــ وەکوو من دیومە ــ ببینێ، لە بازاڕی ئەوینێ سوودی بێهەژمار وەگیر دینێ.

٧ ب دینارێ دنێ زینهار دا یارێ خوە نەفروشی
کەسێ یووسف فرۆتی وی د عالەمدا خەسارەت کر[1]

---

١. حافز دەڵێ:

یار مفروش بە دنیا کە بسی سود نکرد　　آن کە یوسف بە زر ناسرە بفروختە بود

**مانای وشەکان:**

**زینهار**: دەغیلە؛ **عالەم**: دنیا؛ **خەسارەت**: زیان.

**پوختەی مانا:**

دەغیلت بم نەچی هەرگیز بە زێڕ وماڵی دنیا یار وەگۆڕی. کەسێکی یووسفی میسری فرۆشت، هەر خۆی لە دنیادا زیانبار بوو.

٨ تنێ ئەو سەجدەیا شوکرێ تە بـر میحرابـێ قەوسـەینان
کو دەلق و شەمل و سەجادە ب ڤێ ناڤێ قەسارەت کر

**مانای وشەکان:**

**دەلق**: خەرقەی پڕ لە پینەی دەروێشانە؛ **شەمل**: ئەو چارەکە یان عەبایە کە دەلەشیان دەهاڵێنن؛ **سەجادە**: دووگردی نوێژ؛ **قەسارەت**: شوشتن؛ **قەسسار**: گازر، جل‌شۆر.

**پوختەی مانا:**

تەنیا هەر ئەو سوژدە و کڕنۆشەت بەکار هاتووە کە بەرانبەر بە میحراوی کەوانەی برۆی یار، بـۆ سوپاسـی دیدارەکـەی بـەجێت هێنـا و هـەر کەسـێکیش وەک تـۆ خەرقـە و بەژنپۆش و بەرماڵەکەی بە ئاوی چاو و خوێنی دڵ نەشۆرێ، بـە ئـاواتی دڵـی ناگـا و کڕنۆشی لێ قبوڵ ناکرێ.

٩ د بەحسێ لەعلی لەب هەر خام نارت تـەبعێ ئەلماسـی
وەلێ تەئسیر و فەیزێ میهرێ تەدبیرێ حـەرارەت کـر

**مانای وشەکان:**

**خام**: کاڵ، خاو؛ **نارت**: ناگاتـە؛ **تەئسیر**: کـارتێکردن؛ **فـەیز**: بـەهرە؛ **فـەیز**: سـەرڕێژ کردن؛ **میهر**: خۆر؛ **میهر**: ئەوین؛ **حەرارەت**: گەرما.

شیاوی باسە: لەعل و ئەڵماس دوو گەوهەرن کە دەڵێن کار تێکردنی ڕۆژ، بـە سـەتان ساڵ، لە دڵی بەردا سازیان دەدا.

**پوختەی مانا:**

هەر کاڵ و خاوێک ناتوانێ مرخی وەک ئەڵماس برابێ و بتوانێ لە باسکردنی لەعلی لێواندا سەرکەوێ. کە من دەتوانم لێی بدوێم، تیشکی خۆری ئەوینی بە سەرڕێژی من، ئەو گەرمایەی داوە بە دڵ کە بتوانێ لەم دژوارییە سەر دەرکا.

١٠ د ئیعجازێ بەیانێدا سوخەن گەر بێتە ئینسافێ
دزانت موختەسەر هەرکەس «مەلێ» سیحرە عیبارەت کر

**مانای وشەکان:**

**ئیعجاز**: شتێک کە لە توانای کەسدا نەبێ؛ **سوخەن**: وتە؛ **موختەسەر**: کورتە؛ **عیبارەت**: قسە درکاندن.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر خەڵک هەروا کەمێک ئینسافیان بێ، باش دەزانن مەلا لەو شیعرانەی خۆیدا، کارێک دەکا کە بە هیچ کەسێک ناکرێ و هەرچی لە دەمی دەردەچێ وەک سیحری جادووگەرانە.[1]

١. شیاوی باسە: مەلا لەم غەزەلەیدا شوێنی حافزی گرتووە و دوو شیعری خواجە حافز ـ لەو کێش و قافیە و مانایەـ لە ناو دیوانەکەیدایە. «هەژار»

شوێنی شیعری حافز و لەو زیاتر، مەولانای ڕۆمی ـ چ لە بواری مانا و چ لە باری کێش و سەرواوەـ لەم دیوانە تەواو بەرچاوە.



# هەمیشە بەهار

| | | |
|---|---|---|
| ١ | خەلقۆ ل من کن شیرەتێ | ئەو دلبەرا زەررین کەمەر |
| | من دی د حالێ غەفلەتێ | هات دەر ژ بورجێ وەک قەمەر |

**مانای وشەکان:**

**خەلقۆ**: گەلۆ؛ **شیرەت**: تەگبیر؛ **بورج**: مەنزلگەی مانگ؛ **بورج**: باڵەخانەی کۆشک.

**پوختەی مانا:**

خەڵکینە تەگبیرم چییە؟ چم لێ دەکەن؟ نازانن ئەمڕۆ چم دی؟ لە پڕ دیتم یار کەمبەرەی زێڕین لە پشت، لە باڵەخانە دیاری دا؛ وەک مانگ هەڵێ.

| | | |
|---|---|---|
| ٢ | هاتدەر ژ بورج و پەنجەران | دڵ گرت و دا بەر خەنجەران |
| | ئەڤ رەنگە حالێ دلبەران | لەو عاشقان خوون بوون جەگەر |
| ٣ | قەلب و جەگەر من بوونە خوین | لەورا کونوو دەربوون برین |
| | ئەی جان وەرە حالم ببین | وەر رووح ژ قالب بێتە دەر |

**مانای وشەکان:**

**جەگەر**: جەرگ، کەزەب؛ **رووح**: گیان؛ **قالب**: بەدەن.

**پوختەی مانا:**

هەر کە پەنجەرەی کردنەوە و لە دوورەوە لە ژووری باڵەخانەیدا خۆی نیشاندام، ژانێکی وام لە دڵ وەستا دەتگوت بەر خەنجەر دراوە. خوێن لە جەرگ و هەناومەوە هەڵدەچۆڕا و کونەبرینم کولانەوە. وەرە ئەی گیانی شیرینم تۆ هیچ نەبێ لە برینەکانم

بڕوانە کە دەشزانم گیانی ئامانەتی ناو لەش هەر تۆی لێنزیک کەوییەوە، خۆی لە لەش ڕادەپسکێنێ و بۆ سەیری بەژن و باڵای تۆ دێتە دەرێ و نایەتەوە؛ کە بەڕاستی دەبێتە مایەی شانازیم.

| | | |
|---|---|---|
| ۴ | جانێ من ئەر بێ سەر جەسەد | مزگین ب ئافاقان رەسەد |
| | عالەم حەمی پێ بن حەسەد | ئینسان و جین و جانەوەر |

**مانای وشەکان:**

**جەسەد**: لەش؛ **ئافاق**: ئاسۆگەل؛ **ئافاق**: هەموو دنیا؛ **رەسەد**: دەگا؛ **عالەم**: هەرچی ئافەریدەیە؛ **حەسەد**: ئێرەیی؛ **جین**: جنۆکە؛ **جانەوەر**: زیندەوەر.

**پوختەی مانا:**

یارم ـ کە گیانی بەڕاستم هەر خۆیەتی ـ گەر بێتە سەیری برینان، گیانە سیسەکەی ناو لەشم بۆ دیداری دێتە دەر و بە یەکجاری لە لانی لەش تەرە دەبێ. کە وا بوو یار دێتە سەیری جەندەکە بێگیانەکەی من. بەڵام هەر بگاتە سەرم، لە دنیادا دەبێتە قاو؛ خۆشی و مژدەی دیدارەکەی گش ئاسۆیەک بەرخۆ دەدا. هەرچی ئافەریدە هەنە ـ مرۆ و جنۆکە و زیندەوەر ـ ئێرەیی بە لاشەم دەبەن.

| | | |
|---|---|---|
| ۵ | عالەم حەمی تێکبوونە سەف | سەیرین ل شاهێ من بە خەف |
| | هاتن تەماشا چار تەرەف | شاتر خومار (خیمار) تایێن دبەر |
| ۶ | هات پادشاهێ پور سوپاه | قامەت ئەلیف دیم شوبهێ ماه |
| | داد و مەدەد سەد ئاه و ئاه | زولفان عەقارب تێنە سەر |

**مانای وشەکان:**

**سەیرین**: ڕوانیان؛ **شاهێ**: شادی؛ **شاه**: پاتشا؛ **خەف**: نهێنی؛ **شاتر**: چوست و مەزبووت؛ **شاتر**: جلەوداری پاتشایان؛ **خومار**: مەیگەستە، سەرگێژی سەرخۆشی؛ **خیمار**: نیوە ڕووبەندێک؛ **سوپاه**: لەشکر؛ **قامەت**: بەژن؛ **عەقارب**: گەلە دووپشک.

**پوختەی مانا:**

مەلا بە خەیاڵ دایناوە کە یار بەزەی پێدا هات و هاتە سەیری کەلاکە بریندارەکەی.
فەرموویەتی: هەموو دنیا کۆ بۆتەوە و ڕیزیان لە دەورم بەستووە کە هیچ نەبێ بە دزییەوە هەست بە شادی لەشەکەم کەن و لەو پاتشای نازدارانەش بە سیلەچاوێک بروانن. پیادەی جڵەوداری ئەسپی ئەو مەستە فەرمانڕەوایەش، لە جوانییەکەی مەی گەستەیە و پێشی تماشای گرتووە. کەزیەکانیشی ـکە سەریان بە ئاڵقە هەڵگەڕاونەوەـ وەک دووپشک لەو سەرەوە گەف لە تماشاکەر دەکەن. خیماریش نیوەی ڕوخساری داگرتووە. هەی داد! هەی خودا کۆمەگێک لە دەس ئێرەیی پاسداری ئەو نازدارە و کەزیەی ئەو باڵانەمامەی کە وەک پیتی ئەلف ڕاستە و تەختی هەنیەی وەک مانگ وایە.

| | | |
|---|---|---|
| ٧ | گەستیمە خەلقۆ عەقرەبێ | مەستم ژ شەوقا غەبغەبێ |
| | تالع تنێ مە د کەوکەبێ | ئێرۆ عەقارب تێنە دەر |
| ٨ | ئیرۆ عەقارب هاتە خوار | چوو نێڤی باغێ گولعوزار |
| | ئەو بوغچەیا هەر لێ بوهار | لەو بولبولان لێ قال و شەر |

**مانای وشەکان:**

**شەوق**: مەیل، ئارەزوو؛ **شەوق**: پرشنگ؛ **غەبغەب**: بەرچێڵە؛ **عوزار**: لاجانگ؛ **بوغچە**: باخچە؛ **بوهار**: بەهار؛ **قال**: گاڵە.

**پوختەی مانا:**

لە پرشنگی سپیایەتی ژێر چەناگەی، چاوم بەشەوارە کەوت و بە بۆنی ئارەزوو مەست بووم. هۆشم نەبوو، سەری نووکی کەزی و بسکی ـکە وەک کلکی دمارەکۆڵ ببووە ئاڵقەـ پێیەوە دام؛ سستی کردم. بۆ چارەنووس کە لە فاڵنامە دەڕوانم هەر بورجی دووپشکی ئاسمان لە بەختمە.
بەڵێ ئەمڕۆ کە یار کەزی بە شانە کرد، گەوەکانی هاتنە سەر ڕوومەتی جوانی، دەتگوت هەزار دمارەکۆڵ کەوتوونە ناو گوڵزارەوە و لاجانگی وەک گوڵ ناسکی، داپۆشرابوو.

بولبولان لە پیوار بوونی ئەو گوڵزارە هەر بەهارە، کەوتوونەناڵین و گاڵین و لەگەڵ بەختی ڕەش شەڕیانە.

٩ بیحەد ژ دل نالی و کەیب / دەو بوغچەیا رزوانێ غەیب
ڤان نالیان نینن چو عەیب / سوهتینە ئەم دل بوو سەقەر

**مانای وشەکان:**

**بیحەد**: لە هەژمار بەدەر؛ **بی حەد**: بێ سزادان؛ **کەیب**: ماتی و خەمگینی؛ **رزوان**: بەهەشت؛ **رزوان**: بەهەشتەوان، ڕەزەوان؛ **غەیب**: نادیار؛ **سەقەر**: جەهەندەم.

**پوختەی مانا:**

ناڵە و گاڵەی خەمبارانەی ئەوینداران، هێند لە ئەندازە دەرچووە ئەو بەهەشتی خودایەشی ـکە ڕووی یارەـ داگرتووە. بەڵام ناڵین بۆ ئێمەی دڵداری بێبەش، سزای نییە و ئاساییە؛ چونکە ئێمە دڵمان وەک جەهەندەم گەرمە و خەڵکی جەهەندەمیش لەو لا ناڵەیانە و دەنگیان دەگاتە ناو بەهەشت و هاوار دەکەن کە ئێوە فریامان کەون.

١٠ سۆتن ل من جەرگ و هەناڤ / وەردێن د هوور گرتی خوناڤ
زولف هاتە سەر لێ کر بلاڤ / بایێ نەسیم وەقتێ سەحەر

١١ ترسم موخالیف با دەتێ / زولفێن د دۆرا جەبهەتێ
راکەت قیام وێ ساعەتێ / عالەم ببت زیروزەبەر

١٢ زاهیر دبێژم پەندگیر / دا دل نەدی زولفا حەریر
شوبهێ «مەلێ» مێنی ئەسیر / گوهدێرە قەولێ موعتەبەر

**مانای وشەکان:**

**وەرد**: گوڵ؛ **هور**: ورد؛ **موخالیف**: پێچەوانە؛ **جەبهەت**: توێڵ؛ **زیروزەبەر**: ژێرەوژوور؛ **راکەت**: هەستێنێ، پەیداکات؛ **قیام**: هەستان؛ **ساعەت**: ڕۆژی قیامەت؛ **پەند**: ئامۆژگاری؛ **گیر**: بگرە؛ **قەول**: گفت؛ **موعتەبەر**: بە ئیحتوبار.

**پوختەی مانا:**

گوڵی ڕوخساری ئەو یارە لە بەیانا وردەشەونمی لە سەر بوو. کەزیەکانی بەسەردا هات و بای بەیان، لە سەر ڕوخسار پەخشی کردن. سەیری گوڵانم لە دەس چوو؛ لە تاوانا جەرگ و هەناوم سووتاون. زۆر دەترسم ئەو بای پێچەوانەی بەختە، کارێک بکا زولفان لە دەوری هەنیەشی بهاڵێنی و قیامەت لە دنیا ڕابێنێ و دنیایە ژێروژوور بکا و ئیتر بۆ دڵداری هەژار، هیچ دەردی خۆشیان نەمێنێ.

کاکی ڕێبوار! من کە مەلام، دەبێ بە ڕواڵەت پێت بڵێم دڵت مەدە بە کیژۆلەی ئاوریشمی دڵڕفێن؛ با وەک من گیرۆدە نەبی. بەڵام ئەم ئامۆژگارییەی من لە دڵمەوە هەڵنەقولیوە. پەندی بەڕاستیم ئەوەیە دڵ دەگرۆی جوانچاکێک نێ و گیرۆدە بە! تا ئامادەی دڵداریی یاری مەزن بیت.

٣٥

## مەستی ئەبەدی

١ جانـا ژ جـەمالا تـە موقـەددەس قەبەسـم ئـەز
گەر حوور و پەریزادە نەزەر کـی تـە بەسـم ئـەز

**مانای وشەکان:**

**موقەددەس**: پیرۆز؛ **قەبەس**: بزووت؛ **نەزەر**: تماشا؛ **ئەز**: من.

**پوختەی مانا:**

گیانە من لە خۆمەوە هیچ نیم. من گڕێکم لە کۆی گڕی تۆوە هاتووم. مـن نـە هـۆریم دڵ دەیگرێ، نە لە شوێن پەرییان دەگەڕێم. من لە دنیا و قیامەتما تماشایەکی تۆم بەسە.

٢ میسلێ مـەهێ نـەو گـەر تـە دڤـێتن مـە ببیـنی
مێــزە بکـە جامــێ تــو دبیــنی چ کەسـم ئــەز

**پوختەی مانا:**

ڕاستە من لە دڵداریدا هێندە لاواز و بـێڕەنگـم کـە وەک مـانگی یەکشـەوەم بەسـەر هاتووە و دەبێ زۆر ورد بۆم بڕوانن تا دەمبینن؛ بەڵام تۆ ئەگـەر بـەنیازی مـن ببیـنی، بڕوانە پیاڵەی مەیەکەی خۆت ببینە! منیش هەر تۆم. مەڕوانە ڕەنگی دنیاییم؛ منـیش و تۆش هەر دانەوەی تیشکی جوانی خوای مەزنین.

٣ یـەغما ژ مـە جـان کـر کـو تەجـەللایێ ل دلـدا
من ڕووحـێ د قالـب تـویی تـەنها قەفەسـم ئـەز

**مانای وشەکان:**

**یەغما**: تالان؛ **تەجەللا**: ئاشکرا بوون؛ **قەفەس**: ڕکە.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! هەرکە پرشنگی جوانی تۆ، خۆی بۆ دلم ئاشکرا کرد، گیانە ڕواڵەتییەکەمی بە تالان برد. ئێستا تۆم گیانی شیرینی و من بوومە قەفەسێک بۆ تۆ.

۴ حوببـــا تەیـــە مـــن رادهـــەژینی کـــو بنـــالم
شەب تا ب سەحەر نالە ژ رەنگێ جەرەسـم ئـەز

**مانای وشەکان:**

**راهەژاندن**: ڕاتەکاندن، ڕاژاندن؛ **شەب**: شەو؛ **جەرەس**: زەنگۆلە.

**پوختەی مانا:**

وەک دەنگی زەنگ بە هۆی دەستێک پەیدا دەبێ کە زەنگۆلە ڕادەژێنێ، نالەی منیش نە بە خۆمە؛ ئەوینی تۆ دەمخاتە سەر نالەکردن.

۵ من گـۆ مـەهێ نـەو چاشـیتیێ ئـەبرووێ یـاری
گۆ من چ حەدە شـوبهەتێ نـەعلێ فەرەسـم ئـەز

**مانای وشەکان:**

**چاشیتی**: چەشیت، چەشن، لەگوێن؛ **گۆ**: گوتی؛ **نەعل**: ناڵ؛ **فەرەس**: ئەسپ، چ نێر چ مێ.

**پوختەی مانا:**

بە مانگی تازەهاتووم گوت: لە چەشنی ئەبرۆی یاری. گوتی: ڕامناکـەوێ ئـەو پەسـنە؛ من وەک نالی ئەسپانم.

«نالی» دەڵێ:

بە سەروم وت کە ڕاست و سەرکەش و بەرزی! کـەچی لـەرزی
کــە فـەرقیشــم بگاتــە ئاســمان، بەنــدەی قــەدی یـــارم

٦ ساقی ژ ئەزەل یەک_دو قەدەح بادە بە من دا
حەتتا ب ئەبەد مەست و خومار و تەلەسم ئەز

**مانای وشەکان:**

**ئەزەل**: ڕۆژی بناوان؛ **قەدەح**: پیاڵە؛ **ئەبەد**: بێبڕانەوە؛ **تەلەس**: شل و شەویق و خۆنەگر، مەستی کەلەلا.

**پوختەی مانا:**

هەر لە ڕۆژی بناواندا مەیگێڕ یەکێ_دوو پیالە مەی دامێ؛ تا هەتایە مەست و سەرخۆش و کەلەلا دەمێنمەوە و ئەغیار بوونەوەم بۆ نییە.

٧ جانا تویی من جان، گولێ بێخار گەرەم بی
میننەت کو نە وەک بولبولێ میحنەتعەبەسم ئەز

**مانای وشەکان:**

**خار**: دڕک؛ **میننەت**: سوپاس؛ **میحنەت**: مەینەت؛ **عەبەس**: بێهودە.

**پوختەی مانا:**

گیانە! لەوساوە تۆم گیانی، وەک خێوی گولی بێدڕکم. سوپاس بۆ خوا کە وەک بولبول بابەدەست و ڕەنجخەسار نیم. چونکە گولی یاری بولبول بە چقڵ دەوری دراوە.

٨ سەد جەور و جەفا دی ب مە ناچین ژ دەرێ تە
یەکسەر تو نەباتی و ل تەبعێ مەگەسم ئەز

**مانای وشەکان:**

**نەبات**: بلۆری شیلەی قەند؛ **مەگەس**: مێش.

**پوختەی مانا:**

سەد جارانیش جزیام دەی و بێئەمەگیم دەگەڵ بکەی، لە دەرگاکەت لا ناکەوم. تۆ

نەباتی و تەبیاتی منیش وەک مێشە؛ لە شیرنایەتی دەگەڕێم.

«سەعدی» دەڵێ:

دڵ وەلا ناکــەوێ هــەر دێتــەوە لات تــا مــاوە

شانە هـەنگوین! لـە وزەی مـێش نییـە لات لـێ لادا[1]

«ناری» دەڵێ:

مێشی خاڵت نافڕێ بەس باوەشێنی کە بە نـاز

چونکە پابەندە بە شەهدی شەککەری گۆناتەوە

٩ گـەر وە تــە دڤـێتن بـبری ســەر بکــە فــەرمان

داڤێ سەعەتێ ســەر بـبرم خــوەش مقەسـم ئـەز

١٠ سەر تا ب قەدەم ئەز بسۆژم شوبهێ «مـەلا»یـێ

پەروانەسیفەت سوهتم و بێسەوت و حیسـم ئـەز

**مانای وشەکان:**

**سەعەت**: دەم؛ **مقەس**: قەیچی؛ **سوژین**: سووتان؛ **حیس**: هەست؛ **سەوت**: دەنگ.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دڵت وا دەخوازێ هەر سەرم پێوە نەمێنێ، فەرمانت هەر بدە بە خۆم. لـە سـەر پەڕاندنی خۆمدا، وەک مقەستم؛ هەر دەستبەجێ دەیپەڕێنم. ئەوسا وەک مۆم ـکە بۆ داگیرساندن هەودای سەری دەقرتێنن ـ سەر تا پام بۆ سووتان دەبێ و دڵـدارانیش بـە دەردی پەپوولە دەبەم. هەروەک خۆمی مەلا! لـە چەشـنی پەپوولـە سـووتام و هـیچ دەنگ و هەستیشم نەبوو.

---

١. ویدەچێ مرازی مامۆستا ئەم بەیتە بووبێ:

گر برانی نرود ور برود باز آید     ناگزیر است مگس دکەی حلوایی را



## دڵ دەریایە

آ تـــوورم ب دل و پـــەیرەویێ موســـایم ئـــەز
ئاتەشـــپەرس و نـــووریێ تەجـــەللایم ئـــەز

۲ بـــاریی ژ «وَعَلَّـــمْ» کـــو خەبـــەردار کـــرین
ئـــیرۆ تـــو بـــزان ئادەمـــیێ ئـــەسمایم ئـــەز

**مانای وشەکان:**

**باری**: خودا؛ **عَلَّمَ**: فێری کرد؛ **ئەسماء**: ناوان؛ **ئەسما**: هەرە بەرز.

**پوختەی مانا:**

لە قورئانێدا هاتووە: «خوا بە فریشتەکانی فەرموو: من جیێنشین لە سەر زەمین ناودێر دەکەم. گوتیان: ئاخر لەسەر دنیا، کاری خراپ وەدی دێنیێ و خوێن دەڕژێنیێ. ئێمەش پەسندی تۆ دەدەین و بە پیرۆزی تۆ هەڵدەڵێین... فەرمووی ئەوی من دەیزانم، ئێوە سەرتان لیێ دەرناچیێ. خوا ناوی هەموو شتێکی فێـری ئـادەم کـرد. لـە پاشـان لەبـەر فرشتانی ڕانا و فەرمووی: ئەگەر لاتان وایە ڕاستن، ناوی ئـەم شـتانە بڵـێن! گوتیـان: خوایە، پاکی هەر بۆ تۆ ڕەوایە. هەرچی بۆ خۆت فێرمان نەکەی، لێـی نـازانین. زانـا و هەمەکارە خۆتی. فەرمووی: ئادەم! ناوی ئەوانەیان پیێ بڵیێ. کاتیێ ئادەم ناوەکـانی لـە لای فریشتەکان درکاند؛ خـودا فـەرمووی: نـەموت پێتـان، مـن نادیـاری ئاسمانـان و سەرزەویشم ئاگا لێیە و دەیانزانم و هەرچی ئاشکرای بکەن و هەرچی گوم و نهێنیتانە دەیزانم؟»

مەلا دەڵیێ: لە شوێن مووسام، کە لەگەڵ خوا گفتوگۆ کـەم و بیـدینم. لـە لایـەکیش وەک چیای توور، نووری خوا خۆی نیشان داوم. وەک مووسا، بەرەو ئـاگر چـووم و بـۆ

تاوێک ئاگرپەرست بووم کە چی هەرخۆم نووری خودام. لەوساوە کە خوای بانی سەر، هەموو ناوی فێری بابەدەم کردووە؛ من ئەمڕۆ ئەشێ بزانی کە جێبەرزتر ئادەمیم.

٣ ئینشـــائێ علوومـــێ لـــەدونی چونکـــێ مـــە زانی
زانی ب حەقیقـــەت کـــو چ ئینشـــایم ئـــەز

**مانای وشەکان:**

**ئینشاء**: ئیجاد؛ **علوومی لەدونی**: زانستە تایبەتەکانی خودا.

**پوختەی مانا:**

چۆنکە خودا زانستە تایبەتەکانی- کە هەر نزیکانی خۆی لێ شارەزا دەکا- تێگەیانـدم؛ ئەوسا لە ڕاستیدا، بە خۆم زانی کە من چلۆن ئیجادێکم.

٤ حـــەرفێن ڕەقـــەمێ لـــەوحێ وجـــودا مـــە بخـــوان
دا قـــەنج بـــزانی کـــو چ ئـــیملایم ئـــەز

**مانای وشەکان:**

**ڕەقەم**: ژمارە؛ **لەوح**: تەتەڵە؛ **ئیملا**: نووسینەوەی گوتراو.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر تۆ بەو پایە بگەی کە بتوانی لە سەر تەتەڵەی فەرمانی دێرینەی خودا، ژمـارە و ناوان وەخوێنی؛ ئەوسا باش بۆت دەردەکەوێ کە من چۆن لـە ڕووی سـیایی نزیکـانی خودای گەورە، نووسراومەوە.

٥ زاهـــیر تـــو پەریشـــانییێ حالـــێ مـــە نـــەبین
مـــەجمووعێ د زاتـــێ خـــوە و تـــوغرایم ئـــەز

**مانای وشەکان:**

**زاهیر**: ڕواڵەت؛ **پەریشانی**: بڵاوی و پەشێوی؛ **نەبین**: مەڕوانە؛ **مەجمووع**: کۆ؛ **توغرا**: شێوەخەتێکی قیچەڵفیچە، پادشایان ناوی خۆیان پێ دەکردە مۆر بۆ سەر سکە و فەرمان.

**پوختەی مانا:**

نابێ تۆ لەوە بڕوانی کە بە ڕواڵەت، پەرێشان و حاڵپەشێوم. لە ڕاستیدا، وەکوو مۆری پادشایان، هەرچەند بە دیمەن تێکهاڵاو و وشەکانی لێکبڵاون، بەڵام جوان و پڕ لە مانان؛ منیش هەر وام.

«حەریق» لە باسی شێخی خۆیدا دەڵێ:

**هەم حازر و هەم غایب و هەم جەمع و پەرێشان**

**ئەم جەمعە نەقیزەینە لە تۆ بوو بە ڕیوایە**

«حافز» دەڵێ:

**لە مەیخانان گەدام ئەمما لە مەستیدا وەرە سەیرم**

**ستێرەم وان لەبەر دەستان و نازم پڕ بە عاسمانە**[1]

٤ **عالەم چییە ئیعراب و حرووف و کەلیمات**

**ئەو نوقتە د نەفسا خوەو و مەعنایم ئەز**

**مانای وشەکان:**

**ئیعراب**: سەر و ژێر و بۆر؛ **کەلیمات**: وشەگەل؛ **نوقتە**: خاڵ.

**پوختەی مانا:**

هەموو دنیا، بە سەر و بەر و ژوور و ژێر و هەموو وشە و هەموو پیتێک- کە بوونە ناو بۆ ئافەریدانی خودا- لە خاڵێکەوە دامەزران کە ئەویش بوونی خودایە. دەسا من

---

١. گدای میکده‌ام لیک وقت مستی بین!    که ناز بر فلک و حکم بر ستاره کنم

دەرچووم لە پیت و سەر و ژێران. من هەرخۆم، ئێستا بوومەتە ئەو نوختەیە و مانای نوقتەش لە مندایە.

مەلا لێرەدا، وەکوو زۆر لە سۆفییەکانی مێژوویی، وا تێکەڵ بە خودا بووە؛ کە جیاوازی لە ناو خۆی وەک ئافەریدەیەک و خودای سازدەری نەدیوە.

٧ سەد نیل و فورات تێن و درەن قەلبێ مەدا[1]
پێ ناحەسهین قولزم و دەریایم ئەز

**مانای وشەکان:**

**نیل**: چەمی گەورەی میسر؛ **فورات**: ڕووباری بەناوبانگی هەواڵی دیجلە؛ **تێن و دەرن**: دێن و دەڕۆن.

**پوختەی مانا:**

سەتان ڕووبار بە پڕایی نیل و فورات، لە زانست و بەهرەی خوایی بە ناو دڵما تێدەپەڕن. من کە بۆ خۆم بوومە دەریا، هەست پێ ناکەم.

٨ تو ژ نوسخەیێ تەوحیدێ مەخوون ئایەتێ نەفیێ
بێ ئالەتێ ئیسباتێ کو ئیللایم ئەز

**مانای وشەکان:**

**نوسخە**: وەنووسراو؛ **تەوحید**: بە تاک زانین؛ **نەفی**: دانپێدا نەهێنان؛ **ئالەت**: ئامراز؛ **ئیسبات**: وەڕاست گەڕاندن؛ **ئیللا**: بێجگە.

---

١. سەلمان دلۆڤان و زڤنگی: «سەد نیل وەتێن و ددرن قەلبێ مە»؛ بەڵام کێشی تەواو نییە.

**پوختەی مانا:**

ئەی کەسێکی ئەو نووسراوە دەخوێنییەوە و «لا اله الاّ الله»یە و مانای وایە هیچ شت نییە کە بۆ پەرستن ڕەوا بێ؛ جگە لە خوا. ناوی شت و کەس زیادە. هەر بێجگە لە خوا هیچ مەڵێ و ئەو بێجگەیەش بزانە خۆم دەگرێتەوە.[1]

٩ سەد نەقل و ڕیوایەت دەمەیا سافیە موویەک
ئیرۆ کو ژ پیرێ خوە ب فتوایم ئەز

**مانای وشەکان:**

**نەقل**: ڕاگوێزان؛ **ڕیوایەت**: گێڕانەوە؛ **فتوا دان**: ئیجازەدان.

**پوختەی مانا:**

ئەوەی کە دەڵێن وا نووسراوە و وا گوتراوە و دەبێ وا بکرێ و وا نەکرێ، لە کن سۆفی ـکە دەگەڵ خودا تێکەڵەـ وەک موو وایە کە لە ناو بادەی بێخڵتە دیاری بدا. من هەرچی دەیڵێم و دەیکەم، بە فتوای پیری دەستگیر ڕێم دراوە.

١٠ پەیوەستە تو هەر بانگی مە کی شوبهەتێ نایێ
بێ یار و مەی و سازێ مە گۆ نایم ئەز

**پوختەی مانا:**

کاورای مەلای زانستە ڕواڵەتییەکان! ئەگەر قورگت وەک بلوێر بلوورێتەوە و گازیم بکەی کە بێم و ببمە پەیڕەوت، بێ بەهرەیە. من پێم گوتووی کە ناچمە ناو کۆڕێکەوە بادە و ساز و یاری بەنازی لێ نەبێت.

---

١. زۆر لە سۆفیان، وەک «بایەزیدی بەستامی» و «موحیەددین ئیبنولعەرەبی» و «مەنسوور هەللاج» و گەلێک وەک ئەوان، وەها تێکەڵ بە خودا دەبوون، کە دەیانگوت خوا ئێمەیە و ئێمە خوداین و هەر یەکین و نە لێک جوداین. هەللاج دەڵێ: من خودام و خوا لە بالاپۆشەکەمدا. موحیەددین عەرەبی دەڵێ: هەرچەند پەسنی خودا ئەدەم پەسنی خۆمە... «هەژار»

١١ هــەرچی تــە بڤـێتن ژ مــە وەر جــان بخــۆبێتن
جانـــا بکـــە فـــەروار ڤەوەســـتایم ئـــەز

**مانای وشەکان:**

**وەر**: تەنانەت ئەگەر؛ **فەروار**: فەرمان؛ **ڤەوەستان**: هەڵوەستان.

**پوختەی مانا:**

یارە جوانە تاقانەکـەم! هەرچییـەکم لـێ داوا بکـەی، گیـانیش دەگـەڵ، بـۆ فـەرمانت هەڵوەستاوم و ئامادەم کە پێکی بێنم.

١٢ سەد شیش د دلدانـە ژ میهـرێ مـە «مـەلا»یـێ
لـەو هـەر ب فغـان میسـلێ نـەی و نـایم ئـەز

**پوختەی مانا:**

ئێمەی مەلا، دڵمان بە ئاگری ئەوین دەبرژێنرێ. لە سەد لاوە لە شیشی مـژۆڵ دراوە. گزە و چزە و هەڵچزانم، وەک بلوێر دەنگ ئەداتەوە و هاواریەتی.

«ناری» دەڵێ:

ڕووت وەکوو ئاگر، موژەت وەک شیش و ئـەبرۆت قیمـەکێش
میروەحــەت زولــف و کــەبابت جــەرگی پـارەی «نــاری»یـە



# عیشقی مەجازی

١ عاشق ئەر جارەک ژ بالا لێ بدەت بەرقا مەجاز
(یان: موجاز)
دێ ل نک ساحیبدلان حەتتا ئەبەد بت سەرفیراز

**مانای وشەکان:**

**بالا**: بەژن؛ **بالا**: بەرەوژوور؛ **بەرق**: برووسکە؛ **مەجاز**: نارەگەزی؛ **موجاز**: مەرەخەس کراو؛ **سەرفیراز**: سەربڵند.

**پوختەی مانا:**

هەرکە جارێک برووسکەیەک لە دڵداریی، وەبەر دڵی هەرکەس کەوێ؛ تا هەتایە، لە کۆڕی دڵڕووناکاندا ڕێگە دەدرێ و سەربڵندە.

٢ کەشفێ ئەسرارێ سیفاتان بێ مەحەببەت نابتن
سوورەتێ ئەسما دڤێتن دا بکین ژێ فەهم ڕاز

**مانای وشەکان:**

**کەشف**: پێزانین؛ **سوورەت**: وێنەی دیاردی؛ **ئەسما**: ناوان؛ **فەهم**: تێگەیشتن؛ **ڕاز**: نهێنی.

**پوختەی مانا:**

هەتا گیانێک تامی ئەوینێ نەچێژێ وزەی نابێ کە لە ڕازی نهێنی بارەگای خودا، هیچ بوێژێ و هیچ تێبگا. گەرەکە ئاکاری خودا و وێنەی ڕەوشت و سیفاتی، بێتە بەرچاو و دەربخرێ. ئەوسا دەکرێ بێژین خودامان ناسیوە. یەکێک لە سیفاتی خودا،

خوشیکییە. پیاو هەتا ڕێز لە جوانی و دلڕاکێشانی جوانانی سەر دنیا نەگریٚ، چووزانیٚ جوانییەکەی خودا مانای چییە؟! خوا بۆ ناوی خۆی ناوە جوان؟ جاریٚ دەبیٚ لەو جوانانەی، کە بەر تیشکی جوانی خودا کەوتوون، دڵ بۆ دڵداری ڕابێنیٚ و ئامادە بیٚ تا لە جوانی خواش حاڵی بیٚ.

«جەلالەددین ڕۆمی» دەڵیٚ:

ئـــەو مەلایـــەی لـــە دڵـــداریی بیٚخەبـــەرە
گـاجووتێـــــکە، مێـــــزەریٚ زلی لەســـــەرە

۳ لامیعا حوسن و جەماڵیٚ دی ژ عیلمیٚ بێتە عەین
عیشق دا ژیٚ هلبتن کی دی حەقیقەت بیٚ مەجاز

**مانای وشەکان:**

**لامیع**: بریقەدەر؛ **عەین**: خودی شت؛ **هلبتن**: هەڵبێت.

**پوختەی مانا:**

پێویستە هەست بە بریقەی جوانی کردن، لە چاو ڕاگوێزریٚ و بێتە دڵ و گیان بیچێژیٚ و لێی تیٚبگا. هەروا دیتنی دووراودوور و پیٚزانینی بە کار نایە. دڵداری جوانی دنیایی، کە ناو نراوە؛ ئەوینی بەدەڵ (عیشقی مەجازی) وەک ئەو بەردەستیٚیە وایە کە ئاگری پیٚ هەڵدەکەن. تا ئەو نەبیٚ و پزیسکی لیٚ نەبێتەوە، بڵێسەی ئاگریش نییە.

۴ حوسن و حوب بیٚ یەکدو نابن دیٚ بکن شاه و گەدا
نوور نادەت شوعلەیا مەحموودی بیٚ شەمعا ئەیاز

**مانای وشەکان:**

**حوب**: خۆشەویستی؛ **مەحموود**: سوڵتان مەحموودی غەزنەوی کە دەڵێن دڵی خۆی داوە بە خولامێکی کە ناوی «**ئەیاز**» بووە.

**پوختەی مانا:**

تینی جوانی و خۆشەویستی، لێک جیاواز ناکرێنەوە. لە بازاڕی دڵداریدا، شاو گەدا، دێنە ڕیزی یەک. ئەوینی بەگڕپەی مەحموود، لە چۆلەچرای ڕووی ئەیازێ هەڵگیرساوە و لەو بارەگای ئەوینەدا، ئەیاز لە مەحمووی ئاغای بەڕێزترە.

٥ مەعنیا عیشقێ دزانی ئایەتا حوسنێ بخوون
دا تو حەرفێن موحبەتێ یەک-یەک ژ هەڤ کی ئیمتیاز

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لە مانای ئەوینێ دەگەڕێی، دەبێ ئایەتی جوانی بزانی و بیشیخوێنی و زۆری خۆ تێدا سەرڕاست بکەی، تا بتوانی پیتەکانی خۆشەویستی شی کەیتەوە و پلەپلەی ئەوینداریت بۆ دەرکەوێ.

٦ کی خەبەردار بت ژ عیشقێ کەی ژ بەر وەستا گرت
گەرچی ڕاە ئەز زەررە- زەررە سینەسووز و جانگوداز

**مانای وشەکان:**

**وەستا**: وەستان، وچان؛ **ڕاە**: ڕێگە؛ **زەررە**: تۆسقاڵ؛ **سووز**: سووتمان؛ **گوداز**: توانەوە.

**پوختەی مانا:**

کێ لە ئەوین ئاگادار بێت، هەرگیز لە ڕێی دڵداریدا، وچان و پشوو نازانێ. با ڕێگەشی هەموو تۆز و تۆسقاڵێکی، سینگسووتێن و گیانتاوێن بێت.

٧ عاشقان بێ گاڤ لەو کالین ژ دل تێن شوبهێ ڕەعد
وان ژ بالا لێ دبارن وەک برووسکان ڕەمز و ناز

**مانای وشەکان:**

**بێ گاڤ**: بێ وەخت؛ **ڕەمز و ناز**: ئیشارەت و ناز.

**پوختەی مانا:**

دلداران وەخت و بێوەخت بۆیە وەک هەور دەناڵن و حاڵیان نییە، چونکە لە بـەژن و باڵاوە تیری چاوان، وەک لە دووی هەورەتریشقەی بەرێژنە، بۆیان دەبارێ.

٨ ئافەرین سەد ئافـەرین هـەی مـن ژ وانـرا ئافـەرین
ئـێ ژ تـیرێن دلبـەران دایم د دل پـەیکان و گـاز

**مانای وشەکان:**

**پەیکان**: سەرەتیر؛ **گاز**: قەیچی، قرتێن.

**پوختەی مانا:**

هـەر ئەوانـە هونەرمەنـد و دڵپەسـندن، کـە دڵـیان بـە گـازی ئـەوینێ قرتێنـراوە و سـەرەتیریان تـێ چـەقاوە. سـەد ئافـەریم بـۆ ئەوانـە و ئافـەرینم پێشـکەش بـەو دڵبەئەوین‌گازانە.

٩ گۆهـ دە ئاوازێ نـەیێ وەقتـێ سـەما تـێن موغبەچـە
فەهمێ ڕازێ گەر دکی چـاوا دنـالن چـەنگ و سـاز

**پوختەی مانا:**

وەرە سۆفی! لەو کاتە کە بەزمە لە مەیخانەدا و بەچکەگاور مـەی دەگێـڕن و بـە دەم سەماوە سووڕ دەدەن، ئەگەر هیچ لە نهێـنی ئـەوین گەیـەنرابی، دەزانی کـە دەنگـی چەنگ و لێدانی بلوێر و سازان چیت پێ دەڵێن.

١٠ ئەو دلێ من وەک کەبووتەر نابتن کەس لۆمە کـەت
لەو دفێ تووری وەدا کەفتی مـە دیـن سـەد شـاهباز

**مانای وشەکان:**

**کەفتی**: کەوتوو؛ **شاهباز**: بازی سپی؛ **کەبووتەر**: کۆتر؛ **لەو**: چۆنکە.

**پوختەی مانا:**

بۆ کەس ناشێ سەرکۆنەی دڵی من بکا؛ کە چۆن کەوتۆتە تۆڕەوە. دڵم وەک کۆترێکی بێهێز، لە تۆڕی ئەوینێک گیرە کە سەد شاباز لەو تۆڕەدا گیرۆدەن و کەوتوونە پەلەقاژەوە.

١١ وەر دلۆ داچین تەماشایا جوانانێن چەمەن
وێ هلانی سەر ب ناز و سایەبان دایێ نیاز

١٢ زولف و سونبول موشکبووی و بسک و سووسەن سۆرشیرین
سەروبالا سەبزپووش و کل‌نیشان و غونچەباز

١٣ نێرگزێن قامەت‌زومەررەد سەرگران هاتن خەرام
چار ئەترافان ب ڕەف-ڕەف لێ ب مەش تێن سی و قاز

١٤ دل ب کێ دەم ئەز ژ وان هەریەک ب غەنجان دل دبن
دلروباێن، جانفزاێن، دلبەرێن عاشق‌گوداز

**مانای وشەکان:**

**وەر**: وەرە؛ **دلۆ**: هەی دڵ؛ **چین**: بچین؛ **چەمەن**: مێرگ، چیمەن؛ **هلانی**: هەڵیهێناوە؛ **سۆرشیرین**: دڵکێش و ڕەزاشیرین؛ **باز**: ئاواڵە؛ **زومەررەد**: گەوهەرێکی سەوزە؛ **خەرام**: لەنجە؛ **ڕەف-ڕەف**: پۆل-پۆل؛ **غەنج**: ناز؛ **دلروبا**: دڵڕفێن؛ **جانفزا**: گیانگەشێن؛ **گوداز**: توانەوە؛ **نیشان**: خاڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەی دڵ وەرە بچینە سەیری مێرگولان! تازەگولان سەریان بە ناز هەڵێناوە و خۆیان وە بن سێبەر داوە. گولی سمل، بۆنی میسک و عەنبەر دەدەن. وەک بۆنی زولفی یارەکەم. سوێسنە لە ڕەزاسووکیدا و لە بۆن و بەرامەی خۆشدا، وەک بسکی ئەو شۆخە دەچێ. داری سەوڵ سەوزەپۆشە. وەک بەژنی یار کە جلکی سەوز دەبەر کا. بەڵام ئەوندەیان فەرقە، کە بالای یار، خاڵی هەیە. وەک کلەسوبحانی دەچێ و خونچەی دەمی پشکوتووە؛ کە لە بالای سەوڵا

نییە. گوڵی نێرگز کە لاسکیان وەک زومەڕڕەدە، لە سەوزایی، وەک چاوی مەستی یارەکەم بە سەرخۆشی و بە لەنجەولار، خۆ دەنوێنن. لە هەر چوار لاوە، پۆل-پۆلی قاز و قورینگ، دێنە سەیرانی مێرگولان و لە ناویاندا دێن و دەچن. هەرچی دەیبینم بە ناز و دڵڕفێنە و گیانگەشێنە و ئەویندار دەتوێنێتەوە؛ تێماوم کامیان پەسندکەم و خووی پێ بگرم و بیکەمە خەمڕەوێنی خۆم؟

**١٥** عەقدێ ئیحرامێ دەما دلبەر خۆیابێ فەرزێ عەین
سەجدەیەک بەر وان دوو برهان ناگرت جیه سەد نماز

**مانای وشەکان:**

**عەقد**: بەستن؛ **ئیحرام**: کەوتنە ناو هەرەتی حەجەوە کە زۆر شت لە پیاو حەرامە؛ **برە**: برۆ؛ **فەرزی عەین**: هەرەپێویست؛ **نماز**: نوێژ.

**پوختەی مانا:**

مەلا کە پەسنی مێرگولان لە جەنگەی بەهارا دەدا و دلخۆشیی دڵ دەداتەوە کە پێکەوە بڕۆنە سەیری گولان و هۆگریی بە هێندێکیان بگرێ، دڵی بیری دەخاتەوە کە ئەوینداری بەڕاستی، ناشێ بەجگە لە یارەکەی، دڵ بدا بە هیچ شتی تر؛ بۆیە دەڵێ:

خۆ بێبەش کردن لە زۆرشت لە کاتی زیارەتی کابەی پیرۆز و بەرزی دڵداران، وەک نوێژ لە سەر پیاو واجبە و سوژدە بردن بەرەو میحرابی برۆی یارێ هێندە بەجێ و جێگەورەیە کە سەد نوێژی بەرەو میحرابی مزگەوتان، جێی ناگرن.

**١٦** عیدە و میرێ مە ئیرۆ دەرگەهێ لوتفێ ڤەکر
گۆ «مەلا» هنگی بخوازی دێ ب دەم بەس تۆ بخواز

**مانای وشەکان:**

**هنگی:** ئەوندەی.

**پوختەی مانا:**

جێژنەیە و ئەو سەروەرەی من، ئەمڕۆ دەرگای ئیلتیفات و لاواندنەوەی خستە سەرپشت. فەرمووی مەلا! هەرچی نیازێکی تۆ هەتە، لێم بخوازە؛ تۆ چیت ئاواتە، دەتدەمێ.[1]

---

١. خوا لە قورئانا فەرموویە: «بەندەی من! ئەگەر لێت پرسن: خودا چۆنە؟ من نزیکم؛ بە دەنگ ئەو کەسەوە دەچم کە هانام دێنێتە بەرێ. دەبا هاوارم بکەنێ و بڕوای تەواویان بە من بێ. شایەت شارەزای ڕێ ببن». «هەژار»

٣٤

# كوژراوی چاو

١ ژ ڕەعنا نێرگزێن تەی مەست و خونریز
زەمان بوو عەهدێ جەنگ‌ئەنگیزێ چەنگیز

**مانای وشەکان:**

**رەعنا**: نەرم و شل؛ **ڕەعنا**: توند و بزۆز؛ **ڕەعنا**: جوان؛ **عەهد**: دەوران؛ **جەنگ‌ئەنگیز**: شەرهەڵایسێن؛ **چەنگیز**: خانە خوێنرێژە بە ناوبانگەکەی مەغول (١١٦٢ تا ١٢٢٧ز.) کە هەر لە چینەوە تا سەر کەنارەی دەریای ڕەشی، خستە ژێر چۆکی خۆیەوە.

**پوختەی مانا:**

لە سۆنگەی نێرگزی مەستی دوو چاوی تۆ- کە خوێنی هۆگران دەڕژن- زەمانی بێئەمانی خوێنڕژانی دەوری چەنگیزمان وەبیر دێنێ. دەبێ کێ بێ، بە تیری چاوەکانت، نەنگوابێت و دەبێ کێ بێ، کە لەم کوشتارە بێ ئامانە سەر دەرکا؟!

«حەریق» دەڵێ:

قڕانی عاشقانە، کەس نەما دەرچێت و سەر دەرکا
مەگەر بۆ موفلیسی وەک من کە بێ قران و پەناباتم

٢ تە جانێ من دڤێت ئەی جانێ عالەم؟
ژ من بستین ب لەعلێن خۆی شەکەرریز

**مانای وشەکان:**

**دڤێت**: دەوێ؛ **شەکەرریز**: شەکرپژێن.

**پوختەی مانا:**

تۆ کە گیانی هەموو ئافەریدەکانی، کەنگێ بەزەت بە مندا دێ و بەو لێوە ئاڵی یاقیقی و شیرینە شەکرپژانەت، فەرمان دەدەی کە بە گیان دەبەرت مرم؟ دە تۆخوا دڵم مەشکێنە و خۆت دوایی بە ژینم بێنە.

۳ دو عەنبەر بۆ ل شمشادێ ب مەستی
ڤەبەستن لەو هەوا بوو عەنبەرئامیز

**مانای وشەکان:**

**ڤەبەستن**: بەستنەوە؛ **لەو**: بۆیە؛ **ئامیز**: تێکەڵاو.

**پوختەی مانا:**

پرچەکانت لە دوو لاوە- کە هەمیشە بۆنی خۆشیان لێ بڵاوە- لە جوانی بەژن و گەردنت مەستی شەشدانگ، لە دەوری لاجانگ دەهەژان و بەم لا و بەو لادا دەکەوتن. لە بەژنی ڕاست و بێ‌گرێی وەک داری شمشاڵت بەستن، چۆنکە مەستن. کەچی هێشتان ڕاناوەستن و بزۆزن. کە ڕادەژێن بۆنی عەنبەر بڵاو دەبێ. بۆیە هەوا لە دەوری تۆ بە بۆنی خۆش هەڵازناوە.

۴ ژ ئاخا ئاستانێ مستەکی بین
ل داغاندا ببینم خوەش سەبا تیز

**مانای وشەکان:**

**ئاخ**: خاک؛ **ئاستان**: سەردەرانە، بارەگا؛ **تیز**: بەپەلە؛ **خوەش**: ساغ.

**پوختەی مانا:**

ئەی سروەبا! زۆر داخدار و بریندارم. تۆ خوا کە دێی، لە ڕێی خۆتا، لە خاکی بەر دەرگای یارم، مشتە خۆڵێکم بۆ بێنە! دەرمانی هەر ئەوە و یەکاویەک هەموو برینم سارێژ دەکا و بلۆقم دەپووچێننەوە.

٥ تنێ فەرهاد دزانت لەززەتێ عیشق
کو وی جان دایە شیرینێ، نە پەرویز

**مانای وشەکان:**

**لەززەت**: خۆشی؛ **پەرویز**: نازناوی خوسرەوی پادشای ئێرانی مێردی شیرینی بەناوبانگە.

**پوختەی مانا:**

حەز لێ کردوویی خوسرەوم بۆ شیرینێ، بە دڵ نییە. وەک پێویستە دەردی دڵی نەچێشتووە. تەنیا فەرهاد تامی ئەوینی چەشیوە و خۆشی دیوە؛ کە گیانی شیرینی خۆی دا بە شیرینە دڵبەندەکەی.

«سالم» دەڵێ:

بە ئیمای دیدەیی مەعشووقە عاشق کێو لە بن دێنێ
لە لای «سالم» کەندەی بێستوون موژگانی شیرین بوو

٦ تەبوتابێ هەزار ئەشکەنجە دا دل
ژ شیرازێ نیگاهێ مەستێ تەبریز

**مانای وشەکان:**

**تەب**: تا؛ **تاب**: یاو، هەڵچۆقان؛ **ئەشکەنجە**: ئازار؛ **شیراز**: ناوی شارێکە؛ **شیرازە**: کەنارە؛ **شیرازە**: بەندی بنەکتێب؛ **تەبریز**: ناوی شارێکە؛ **تەبریز**: نۆبەتێ‌ڕێژ، نۆبەتێ‌پەڕێن؛ **نیگاە**: ڕوانین.

**پوختەی مانا:**

ڕوانینی چاوی مەستی یار -کە دەرمانی گش‌دەردانە و بە سیلەی چاو، یاو و تا چا دەکاتەوە- بۆ من پێچەوانەی هێنا. هەر کە تیلەی چاوی دامێ، هەزار ئازاری دا بە دڵ. دڵم وەک نۆبەتێداران هەڵدەچۆقێ و هەڵدەبزۆقێ.

٧ ئیلاهـی نێرگـزا مـەی مەسـت و نـازک
ژ دەسـتێ خـوار و بـەدخاهان بپـاریز

**مانای وشەکان:**

**ئیلاهی**: ئەی خوایە؛ **خوار**: ناراست؛ **بەدخاه**: دڵپیس.

**پوختەی مانا:**

ئەی خودایە! ئەو یارەی من- کە وەک چڵەنێرگز شلک و تورتـە و چـاوی گـرۆی لـە نێرگسی مەست بردەوە- بیپارێزە و وا مەکە خوار و بێفەڕان، بۆ چاوێنی تماشای کەن.

٨ کـو لـێ تێـت ئـەو قـەبایێ ئاسمـانی
لـەتیفا شـەنگ و نـازک وەک بـەلازیز

**مانای وشەکان:**

**کو لێ تێت**: چەندەی لێ دێت؛ **قەبا**: کـەوا؛ **ئاسمـانی**: بـە ڕەنگـی ئاسمـان؛ **بـەلازیز**: گەزیزە.

**پوختەی مانا:**

ئەی خودایە! ئەو کەوایە ڕەنگ ئابیەی، چەندە جوان لێ دەوەشێتەوە! نەرمـە، شـەنگە، لەشـی ناسکە و هەروەک گوڵەگەزیزەی دەمەوبەهارە، کە سەرەڕای دیمەنی جوان، مـوژدەی نـەمانی دەمی زستانی خەمان و هاتنی هەڕەتی خۆشیی و دیمەنی جوانی بەهاری بە پێوەیە.

٩ سەواشـەک ڕێهتـە دیسـا عالـەما دل
ب جادوویـێ دوچـەشمێ فیتنەئـەنگیز

**مانای وشەکان:**

**سەواش**: شەڕ و هەرا؛ **ڕێهتە**: ڕژتییە؛ **عالەم**: جیهان؛ **فیتنـە**: گومڕایی، ئاژاوە؛ **ئـەنگیز**: هەڵایسێن، هۆ.

**پوختەی مانا:**

ئەو چاوە سیحربازانەی، کە دنیا لە سۆنگەی ئەوان پڕ لە ئاژاوە و هەرایە، ئەوا دیسا خۆیان نواند و بە جیهانی ڕواڵەتییەوە نەوەستاون. دنیای دڵی خاوەن دڵانیشیان تێک دا و پڕیان کرد لە پشێوێنی و ڕێگەی چارەیان لێ گوم کرد.

«نالی» دەڵێ:

وەرە تا عالەمی قەلبت نیشان دەم
کە وا فەقری غینایە و مردنی ژین

١٠ «مەلا» جانێ تە چاوان پەهلەوان کر
ل تایێ خەمرییان زولفا دلاویز

**مانای وشەکان:**

**پەهلەوان**: پاڵەوان، تەنافباز؛ **خەمری**: بسکۆڵە؛ **دلاویز**: دڵ پێوە هەڵاوەسراو؛ **ئاویز**: هەڵاوەسین.

**پوختەی مانا:**

مەلای دڵدار! سەرم لە کارت سووڕماوە. تۆ لە لایەک، دڵت بە تای کەزیەکانی گیرۆدەیە و هەڵواسراوە، لەو لاشەوە، گیانت هەر وەک هونەرمەندانی تەنافباز، لە سەر تای بسکۆڵەکانی دێن و دەچن. چۆن ناترسی؟

١١ ژ حوسنا بێنیشان نادی نیشانەک
«نیشانی» گەر ژ دل نەکراتە پەرهیز

**مانای وشەکان:**

**بێنیشان**: نادیار؛ **نیشانی**: نازناوی مەلایە لە شیعردا.

**پوختەی مانا:**

جوانی یارم وێنەی نییە و وەک هیچ جوانییەکی تر ناچێ و کەم کەس هەیە ئەم جوانییە، بە چاو ببینێ. تۆش ئەی نیشانی بوێژ! بۆیە توانیوتە ببینی و پەسنی بدەی، چۆنکە لە خۆت و لە گیان و دڵ، دەستت بەردا و جگە لە یار، پارێزت لە هەموو شت کرد.

١٢ خەباسەت تەبعە ژەهلی سەگسرشتە
یەقین ئەو کەر ژ جانان لەو دکەت بیز

١٣ مەبین ئەو گەر ب سوورەت ئادەمینە
هەمی دارن ژ ئێگر ڕاکری ڕیز

**مانای وشەکان:**

**خەباسەت**: پیسی؛ **ژەهلی**: لە ئەهلی، لە ڕەگەزی؛ **جانان**: دلبەر؛ **بیز**: خۆپارێزی، قێز؛ **سورەت**: شکڵ، بیچم؛ **ئێگر**: ئاگر.

**پوختەی مانا:**

تۆ تا دڵ نەدەی بە یارێک، نابی بە پیاو. ئەو کەسانەی دەڵێن دلداریی خراپە و بە بێزەوە لێی دەڕوانن، وەک کەرانن؛ هیچ تێناگەن. دەروونپیسن؛ وەک سەگ بە گلاویان بزانە! تۆ مەڕوانە کە لە بیچما وەک مرۆنە؛ گشتیان داری قەلاشکەرین بۆ سووتاندن ڕیز کراون.



# شەو و ڕۆژ

١ تــۆ دزانی ب خــودێ مــن تــو خیــالی شــەب و ڕۆز
ب خەیالا خوە مەدام مــن تــو ل بــالی شــەب و ڕۆز

**مانای وشەکان:**

**مەدام**: هەمیشە؛ **بال**: دڵ؛ **ل بال**: لە کن؛ **شەب و ڕۆز**: شەو و ڕۆژ.

**پوختەی مانا:**

ئەی یار! سوێندەکەم بە خودا، واتا سوێندەکەم هەر بە خۆت. خۆت دەزانی کە شەو و ڕۆژ، هەر بیر لە تۆ دەکەمەوە؛ تۆ لە خەیالم دەر ناچی. بە بیری خۆم، هەمیشە لە نـاو دڵمدای و شەو و ڕۆژ هەر لە لای خۆمی و لە دیدارت بێبەش نابم.

٢ هەر ب میزان دەرشێنی جەگــەرێ تــیر و خــەدەنگ
ژ نەسەق ساعیقە مە ژ قەوسێ هــیلالی شــەب و ڕۆز

**مانای وشەکان:**

**درەشێنی**: دەپرژێنی؛ **نەسەق**: تەرتیب و تەکووزی؛ **ساعیقە**: برووسکە؛ **قەوس**: کەوان؛ **هیلالی**: لە بیچمی مانگی یەکشەوە.

**پوختەی مانا:**

خوا فەرموویە: «هەموو شتێک لــە خــوداوە ئەنــدازەی بــۆ دانــدراوە و بــە تــەکووزی و ڕێکوپێکی، دێتە بەرهەم».
مــەلا دەڵــێ: ئەگــەر برووســکە لــە هــەورە و ئەگــەر تــیر لــە کــەوان ڕادێ و ئەگــەر نیوەجەغزۆکەی مانگ، بۆ وەخت و کات ناسینەوە و بۆ ڕووناکی دێتــە بــەرچاو، تــۆ بــە

میزان بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە و بێ هەڵبواردن، بە بێ هیچ جار هەڵەکردن، جەرگی منت وە بەر تیری بژانگ داوە و لە کەوانەی مانگی یەکشەوەی بڕۆڕا، ئەو تیرانەم دادەرژێنە سەر جگەرێ و شەو و ڕۆژیشیان بۆ نییە.

٣ میسلێ گۆیین تە ڕەوان نال ژ دلێ میسکین تێن
ئەم نزانین تۆ چرا هەر وە دنالی شەب و ڕۆژ

**مانای وشەکان:**

**گۆیین**: باڵندەیێکە شەو هەتا ڕۆژ دەناڵێنێ و بێدەنگ نابێ و هەر لات وایە لەبەر خۆیەوە دەڵێ: نا، نا؛ **ڕەوان**: بە دوو یەکدا هاتنی بێ پسانەوە؛ **چرا**: بۆچی، لەبەر چی؛ **میسکین**: هەژار.

**پوختەی مانا:**

مەلا ئەی دڵداری هەژار! چیتە وەکوو گۆیین، هەر دەنگیناڵە و نا- ناکەت لە دڵی بێچارە دەبیسترێ. ئەگەر گۆیین هەر لە شەودا دەناڵێنێ، دڵی تۆ بە شەو و بە ڕۆژ ناڵەیەتی و پشوو نادا.

٤ تە ب فەریاد و فغانان ب خوە بولبول کەڕ (کڕ) کر
«الله الله» ژ چ دەردی وە دکالی شەب و ڕۆژ

**مانای وشەکان:**

**فەریاد و فغان**: داد و هاوار؛ **کەڕ**: گوێکپ؛ **کڕ**: مات و بێدەنگ؛ **کالین**: لەبەر دەرد هاوار کردن.

**پوختەی مانا:**

دەمانگوت بولبول لە خوێندن چەقەسرۆیە و بێدەنگ نابێ؛ بەڵام تۆی دڵبرینداری تیری بەژانی دڵداریی، بە هاوار و گاڵە و ناڵەت کارێکت کرد، کە تەنانەت هەر خۆی بولبول وازی لە خوێندن هێناوە و کڕ و مات و دوژ داماوە و لە بەر هاواری زۆری تۆ،

گوێی کەڕ بووە؛ کە شەو و ڕۆژ، نایبڕییەوە. دەبێ دەردت چەند گران بێ؟ هەرخودا بۆ خۆی دەیزانێ! ڕاستی سەیرە! ڕاستی سەیرە!

٥ داکوو دلبەر قەدەمێ لێ بنەهەد ڕەوشەن کت
لەو تو خوونێ وە ژ چەهڤان ڤە دمالی شەب و ڕۆژ

**مانای وشەکان:**

**قەدەم**: پێ؛ **بنەهەد**: دابنێ؛ **لەو**: بۆیە؛ **ڤەمالین**: مالینەوە.

**پوختەی مانا:**

تۆ شەو و ڕۆژ، هەر خەریکی خوێن لە چاوانت دەماڵی. بە خەیاڵی کە جارێک یار، بە لاتا بێ و بتلاوێنێ و پێ لەسەر چاوانت دانێ و ببێتە ڕۆشنی و سۆمای چاوە کوێرەکانت. کە لە سوێی دیدارێکی ئەو، تانەیان پەریوەتە سەر. جا ناشتەوێ یار پێ لە خوێن بنێ و ئەم لاقە ناسک و خاوێنەی خوێناوی بێت!

٦ تە تنێ زەوق و سەفا کر ب سەیێن دلبەرێ‌را
سەرنخوون گەهـ شوبێ نوون گەهـ وەکوو دالی شەب و ڕۆژ

**مانای وشەکان:**

**سە**: سەگ؛ **گاهـ**: جار؛ **شوب**: وەکوو؛ **نوون**: ماسی؛ **نوون**: پیتی «ن». لە ئەلفوبێتکەدا کە قەدیم بەراوەژووی ئێستایان دەنووسی؛ **دال**: دالاش؛ **دال**: پیتی «د» لە ئەلفوپێتکەدا؛ «**ن**» و «**د**»: دەبێتە، ند؛ **ند**: واتا هاوتا و هەواڵ.

**پوختەی مانا:**

مەلا! ئەگەر خۆشی لە ژیانتدا دەس بکەوێ، هەر ئەو سایە کە دەگەڵ سەگی بەر دەرگای یاری دڵبەر، کەوتبوویە بەزم و کایە. جارێک لاسای ماسی گرتووت دەکردەوە و خۆت وەک «ن» هەڵدەگێڕاوە و جارێک وەک «د» باڵت ئەگرت و بەرەو ئەو سەرنخوون دەهاتییە خوارێ و ئەویش پەلاماری ئەدای و بەو کایە دەگەڵ کردنە،

خۆت کردە هەواڵ و هاوتای.

«نالی» دەڵێ:

هەر لەحزە دەڵێم من سەگی دەرگام و ڕەقیبیش
دێتە سەروچاوم کە منیش سەگ مەگەسێکم
گرتوویە سەگت چاکم و لای تۆمەوە دێنێ
یەعنی وەرە نالی کە منیش دادڕەسێکم

٧ فتوەیا پیری «مەلا»یان تو ب ئیلهامێ نەبی
ڤی مەیێ هەر وە دنووشی ب حەلالی شەب و ڕۆژ

**مانای وشەکان:**

**فتوی**: ئیجازەدان؛ **ئیلهام**: خستنە دڵەوە؛ **نەبی**: پێغەمبەر؛ **نەبی**: کەسی کە لە نادیار پیاو ئاگادار دەکا، پێشگۆ؛ **حەلال**: ڕەوا؛ **نوشین**: وەخواردن.

**پوختەی مانا:**

مەلا چیتە؟ دەتبینم بە شەو و بەڕۆژ بە بێ وچان، مەی دەنۆشی و لات ڕەوایە! ئاخۆ لات وایە نەخۆشی و بە فتوای شەرعی پێغەمبەر، کە مەی بۆ دەرمان حەلالە، دەخۆیتەوە؟ یان پیرە دەستگیرەکەت ڕێگەی داوی بخۆیەوە؟



# ئاوێنەی دڵ

١ شـاهیدێ جیلوەنومـا قودسـییێ فـەیرووزە لیبـاس
هەرچی ڕەنگێ تە نیشان دەت تۆ نیشانێ خـۆ بنـاس

**مانای وشەکان:**

**شاهید**: دڵبەر؛ **جیلوە**: خۆ ئاشکرا کردن؛ **قودسی**: پیرۆز؛ **فەیرووزە**: پیرۆزە.

**پوختەی مانا:**

پێغەمبەری خوا(د) فەرموویە: «هەر کەسێکی خۆی نەناسێ، خواش ناناسێ».
مەلا دەڵێ: تۆ مەگـەڕێ و چـاو مەگێـڕە کـە دڵـبەرت دە لیباسـی ڕەنـگ پـیرۆزە و ئاسمانی یان بـە هـەر ڕەنگێکـی دیکـە، خـۆت نیشـان دا، دەبێتـە مایـەی ناسـین و شارەزایيت. تۆ هەر خۆت یەک لەو ڕەنگانەی، کە یارت خۆی پێ دەنوێنێ. کە وا بـوو تۆ خۆت بناسە! ئەوساکە یارت ناسیوە.

٢ حوسـن بـێ ئایینـەیێ عیشـقێ تەجـەللی نـادت
عیشقێ مەحموودی د مەعنا نەمەکێ حوسنا ئـەیاس

**مانای وشەکان:**

**ئایینە**: نەینک؛ **مەحموود**: پەسند؛ **مەحموود**: مەبەست مـەحموودی غەزنـەوی؛ **نـەم**: تەڕایی، نم؛ **نەمەک**: خوێ؛ **ئەیاس**: هەیاسی خاس، دڵبەری مەحموودی غەزنەوی.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر تۆ خۆت باش نەناسی و دڵت ئەوندە پاک نەبێ لە ئەوین، کە وەک ئاوێنە بنوێنێ و بۆ یار، دەوێرا بڕوانی، هەرگیز چاوی دڵ و گیانت بە جوانیی دڵبەر ناکەوێ. ئاوێنەی

دڵی دڵدارە کە دڵبەری تێدا دیارە. دڵ و دڵدار و دڵدارییش، تنۆکێکن لە دەریای پڕ لە شەپۆلی خۆ ئاشکرا کردنی یار. ئەوینی پاک و پەسندی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی، شەیەک بوو لە دەریای جوانیی هەیاسی خاسی دڵبەری. (یان: چێژەی خۆشی دڵدارییەکەی، ئەو دڵ بە هەیاس دانە بوو کە خوێ و تامێکی تێ گەڕی.)

٣ هەرچی ڕەنگێ تە بڤێتن خوە ببینی لیللاه
نەزەرێ وەر بدە کاسێ چ خۆش ئایینەیە کاس

**مانای وشەکان:**

**للهِ**: بۆ خوا؛ **نەزەر**: ڕوانین؛ **کاس**: پیاڵە، کاسە.

**پوختەی مانا:**

دەغیلە بۆ خوات پێ دەڵێم، کە دەتەوێ خۆت ببینی داخۆ لە کام پلەدای و بە کام ڕەنگی، چاو لەو لا و لەم لا مەگێڕە! بڕوانە پیاڵەی پڕ لە مەی، ئەوینی پاک و بێخەوشت، بڕوانە خۆت، کە خۆشت وەکوو ئاوێنە، وێنەی یارت تێدا دیارە و ئەوسا تێدەگەی چ ڕەنگی و سەنگت لە بارەگای یاردا چەندە. ئەی نامەخوا، پیاڵە چۆن ئاوێنەیەکی وێنەدەرە!

٤ تو شەرابێ ب غەرابێ ب نەهەنگان دە دەمێ
دێ کیفایەت ب چ ڕەنگی مە بکن کووزە و تاس

**مانای وشەکان:**

**غەراب**: جۆرێ کەشتی بارکێش؛ **غەراب**: مەشکە؛ **غەراب**: دۆلچەی گەورە؛ **غەراب**: پیاڵەی زێوینی مەیخۆران، غەررابە؛ **قەررابە**: کووپەی گەورە؛ **کووزە**: گۆزە، جەررە؛ **تاس**: زەرک.

**پوختەی مانا:**

مەیگێڕ! تۆ ئێمە ناناسی. ئێمە لە دەریای ئەویندا، بووینە نەهەنگ؛ بە زەرک و پیاڵەی

چکۆلە سەرخۆش نابین؛ تینوایەتیشمان ناشکێنێ. ئەشێ بادە بۆ نەهەنگان بکرێتە ناو گەمیەی بارییی ئەوسا بەنیاز بی مەست ببین و بە نیاز بگەین.
بوێژێکی فارس دەڵێ:

تینوایـــەتیم بـــە تـــاس و زەرک چـــاری نـــاکرێ
مەیگێـــڕ بـــە گـــۆزە بـــادە بڕێـــژە بـــە قـــوڕگما[1]

٥ ڕەمز و ڕازێـن نـەی و نایـێ کـو سـەماعینە هـەمی
ژ محالاتـــە ب عـــەقلێ خـــوە بـــزانی ژ قیـــاس

**مانای وشەکان:**

**ڕەمز**: ئیشارە؛ **سەماع**: بیستن؛ **محال**: نامومکین، نەشیاو؛ **قیاس**: بەراورد کردن.
قیاس لە زانستی مەنتیقدا، مەبەستێکە چەند لای جیا-جیای هەیە. ئەگەر یەکێکیان سەلمێنرا؛ خوانەخواهی ئەوی تریش دەسەلمێنرێ. بۆ نموونە، ئەگەر گوتمان: جیهان گۆڕانی بە سەر دێت، هەرچی گۆڕانی بە سەر بێت، دیارە درووست کراوێکە. کە وا بوو ناچارین بێژین دنیا تازە پەیدا بووە و هەر لە پێشووڕا وا نەبووە.

**پوختەی مانا:**

ئاوەز لە ناسینی یاردا، بێچارەیە و بێکارەیە. ئەوی لەو بارە دەبیسی، لە ڕێگەی گوێوە دێتە دڵ. بیستنی دەنگی بلوێرێ، چلۆنایی قامیشت بۆ دیاری ناکا. تۆ ناتوانی لە بیستنی بەڵگەی تاقانەیی یارت، یار وەک پێویستە، بناسی و بزانی بەڕاستی چۆنە. بەراورد کردن لێرەدا، لنگی شەلە و چاوی کوێرە. گەرەک واز لە بیستن بێنی و بۆ خۆت ئەوەندە بکۆشی تا یار ڕووبەڕوو دەبینی. هەردووک پیاڵەی بیستن و بەراوەرد کردن، دەس بۆ مەبە! بە دەفری گەورەی وەک گەمیە، بادەی یارناسین پیدا کە!

---

١. «فرووغی بەستامی»یە دەڵێ:

این تشنگی به جام و قدح طی نمی‌شود    با ساقیان بگوی که می در سبو کنند

٦ وی دکت مەغلەتە هەر دەم ل حەریفان ب جەدەل
ب دو جامان ڤەدخون سیرەتێ ئەبیەز وەسواس

**مانای وشەکان:**

**مەغلەتە**: هەڵەکاری، بە هەڵە بردن؛ **حەریف**: هاوپیشە و هاودەم؛ **جەدەل**: دەم لە دەم نان، کێشەی بە دەم؛ **ڤەدخۆن**: دەخۆنەوە؛ **ئەبیەز**: سپی؛ **وەسواس**: دوودڵی.
دەڵێن شەیتانێکی سپی، کاری دوودڵی و گومانە کە بیخاتە ناو دڵی خاوەن باوەڕان.

**پوختەی مانا:**

ئەو کەسانەی گەرەکیانە کە بە مەنتیق و فەلسەفە و بە بیستن و بەراورد کردنی خۆیان، چۆنیەتی یارمان بۆ دەرخەن و بەو دوو پیاڵە گێژمان کەن و هۆشمان بەرن، وەک ئەو شەیتانە سپییە وان کە تووشی هەڵەی گومان و تەڵەی دوودڵیمان دەکەن. بوونی خودا، دەلیل و بەڵگەی پێ ناوێ و ئەوانەی لەو بارە دەدوێن، دەنگی بلوێریان بیستووە و بلوێر و بلوێرژەنیشیان هەر نەدیوە و ناشیبینن. لنگیان دارە و ناتوانن ئەم ڕێگە سەخت و دژوارە لەپێش بەرن.

٧ دەستگیرێ تە نەبت خزری عینایەت ل قیدەم
ناگەهێ ئابێ حەیاتێ ب دو عەسکەر ئەلیاس

**مانای وشەکان:**

**خدر و ئەلیاس**: دوو پیاوی خوان تا ئاخرەزەمان دەمێنن. خدر بە سەر بەژ ڕادەگا و ئەلیاس چاودێری دەریایە. دەڵێن خدر ئاوی خواردۆتەوە و بە سەرچاوەکەی دەزانێت؛ **عەسکەر**: کۆمای خەڵک؛ **ئەلیاس**: هەی ناهومێدی؛ **عینایەت**: مشوورخۆری، ئاگاداری.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر هەر لە ڕۆژەکەی بناوان، خدری لاواندنەوەی خودا، دەستت نەگرێ و ڕێگەی سەرچاوەی ژیانی هەرمانت پێنیشان نەدات، تۆ لە سۆنگەی دەمدەمانێ و قسە بە زۆرانێ

دانی کۆمای بەراوردکەران و بیسەرانی قسە و باسان، هەر تاسان و ناهومێدیت بۆ دەمێنێ.

٨ تو بنێ ماهێ نـەو و دەسـتێ قـەزایێ هـەی و هـەی
نە ل زەرعێ فەلەکێ بەلکـە ل عـومرێ مەیـە داس

**مانای وشەکان:**

**بنێ**: بنۆڕە؛ **قەزا**: فەرمانی پێک هاتووی خودا؛ **هـەی و هـەی**: بـێ وچـان و پسـانەوە؛ **زەرع**: چێندراو.

**پوختەی مانا:**

تۆ لە مانگی نوێ بڕوانە کە لە دەست قەزا و قەدەردا بۆتە داسێک جگـە لـە چێنگـەی ئاسمانێ تەمەنی مەش درەو دەکا.

«حافز» دەڵێ:

لە داسۆکەی مانگی یەکشەوەم دەڕوانی لە چێنگەی شینی ئاسمانـێ؛ پـووش و پـاری تەمەنی خۆم و کاتی دروێنەی وەبیرم هاتەوە.[1]

٩ تورکی خونریز و خومارێ مە ب یـەک غەمزەیـەکێ
زوهدێ چلساله ل من زیر و زەبـەر کـر ژ ئەسـاس

**مانای وشەکان:**

**تورک**: لە زاراوەی شاعیراندا بێبەزەیە؛ **غـەمزە**: عاشـیرەت وە چـەم؛ **زوهـد**: تەرکـە دنیایی؛ **زیر و زەبەر**: ژێر و ژوور؛ **ئەساس**: هیم.

**پوختەی مانا:**

چل سالان هەر چلەم کێشا و خۆم لە دنیـا دوورخسـتەوە. بـە تیلـەی بێبەزەییانـەی چاوی یارە چاومەستەکەم، هەر لە بناغەوە هەڵتەکا و ژێروژوور بوو.

---

١. مـزرع سبـز فلک دیـدم و داسِ مـه نـو یادم از کشتەی خویش آمد و هنگام درو

مەبەستی مەلا ئەمەیە: ڕێڕەو نابێ هەر لای وا بێ یار لە باری بەزەییدایە. ئـەو یـارەی ئەو- کە خودایە- دەگەڵ دلۆڤانی و بەزەش، تـووڕەیی و قـەهری لـە لایـە. لەوانەیـە هەموو ژیانت لە تاعەتا بەخت کەی و بەر تووڕەیی خودا کەوی و بەدبـەخت بی. هـەر ئەو خوایەی کە بۆ «لووت» بەزەو خۆشییە، بۆ گەلە نافەرمانەکەی، تووشیی و نەگبەتی دەنێرێ. وەک لە قورئانی پیرۆزدا، سەبارەت بە سزادانی هاوشاریانی لووت فەرموویە: «هەر کە فەرمانی ئێمە هات، سەروومان خستە ژێرەوە (ژێروژوور بوون) ئەوسـاش بـە گزمووله قوڕی وشکەوەبووی تێکتەپاوی ڕێزکراوی نیشانەدار، بـە گـەل بـەردبارانمان کردن.»

١٠ ژ لەبێ لەعلێ شـەکەربار قـە نـەکر پرسا «مـەلێ»
میسری‌یان گەزمـە ڕەشـاندن کوکشـاندن ئـەلماس

**مانای وشەکان:**

**قە**: هەرگیز، قەت؛ **مە**: ئێمە؛ **لێ**: بەڵام؛ **مـەلێ**: مـەلا؛ **میسـری**: شـیری میسـری کـە جەوهەردار و نایابن؛ **کشاندن**: کێشانی.

**پوختەی مانا:**

هەر کارێک یار کەیفی لێ بێ، چۆنچۆنی و بـۆچی و لەبـەر چـی، مـافی کـەس نییـە بپرسێ. ئەوین پرس بە کەس ناکا و هەر بۆ خۆی هەمەکارەیە. دەبڕوانە هـەرگیز بـەو دوو لێوە ئاڵە شەکربارەی هێشتا حاڵی نەپرسیوین. بەڵام کەوانەی دوو بـرۆی کـە لـە شیری میسری دەکەن و لە تیخی ئەڵماس تێژترن؛ جەرگیان بریم؛ تیرەبارانی دڵمیان کرد.



# زوننار بەس

آ

دل یەکە دێ عیشق یـەک بـت عاشـقان یـەک یـار بـەس
قیبلە دێ یـەک‌بت قولووبـان دلبـەرەک دلـدار بـەس

**پوختەی مانا:**

خوا زۆر لە ئەندامی ئێمەی، وەک دەست و پا و چاو و گوێ و لێو، جووت دروست کرد. بەڵام دڵمان هەر یەکێکـە. بـەوەدا دەبـێ تێبگـەین، بـیر و هـۆش و ئـەوین و خـودا ناسینمان، کە بە دڵمان سپێراوە، پێویسـتە لەسـەر تاقانێـک سـاغ بێتـەوە. دڵ‌یەکـە ئەوینیش یەک بێ، دڵبەر یەک‌بێ، ڕووگەیەک بێ و هەر دڵەی دڵبەرێکی بـێ و بـڵاو نەبێ. جا بزانین من بەرانبەر بەو ئامۆژگارییە چۆنم کرد؟

٢

من د بەندا زولفـەکی دل دا ب دەسـتێ پـیرێ عیشـق
لەو د عیشقێدا کو بەست ئیحـرام یـەک زوننـار بـەس

**پوختەی مانا:**

لە تاکە بەندیخانەیەکدا- کە پرچی پرپێچی یارە- دڵم گیرا. خۆم بە ئەوینێکی پاک و بێ‌وێنە و تاقانە ئەسپارد. دڵبەرم فەرمانی دامێ، بۆ زیارەتی ڕووی- کە تەنیا ڕووگـەی پیرۆزم هەر ئەوە- ئامادەی ئیحرام بەستن بم. ئەگەر ئیحرامی حاجییان فۆتەیـە و لـە دوو پارچەیە، فەرمووی: تۆ لە تای بسکی من، زوننارێک ببەستی، بەستە.

٣

تەرح و تەرزێ بوونە زوننـار و چـەلیپا یـەک ب یـەک
لـەو مـە زوننـار و چـەلیپا یـەک‌تنێ یـەکجار بـەس

**مانای وشەکان:**

**تەرح**: بیچم؛ **تەرز**: دیمەنی ڕێک؛ **تەرز**: جۆر؛ **چەلیپا**: خاچ.

**پوختەی مانا:**

کەزی یارم، جارێک لە کەمبەری دەهاڵێن و دەبنە زونار؛ جار-جارەش بەسەر یەکدا دێن و لە وێنەی خاچێک دەنوێنن. ئێمەی گیرۆدەی ئەوینی ئەو تاقانە، کە دەبینین زونار و خاچی زولفانی هەر یەکێکن، هەرکامێکیان بپەرستین، دەزانین یەکتاپەرستین و بە یەکجارە هەر بۆ یەکێک ئەویندارین.

۴ هن ژ نک دێرێ ڤە تێن قەستا کەنشتێ هن دکن
نەی ژ وانم نەی ژ وانم من دەرێ خەممار بەس

**مانای وشەکان:**

**هن**: هێندێک؛ **ژ نک**: لە کن؛ **کەنشت**: نوێژگەی جوولەکان؛ **خەممار**: بادەفرۆش.

**پوختەی مانا:**

من لام وایە، یار لە هەموو جێیەک هەیە. خوا فەرموویە: «ڕوو دەکوێ کەن، خوا لەوێیە.» ئەوانەی ڕەبەنی دێرن و هاتوچۆی کلیسا دەکەن، ئەوانەش کە دەڵێن جووین و سەر لە کەنشتەکان دەدەن، دەگەڵ ئەوانەی لە دەرکی مەیخانەدا بوونە سیپاڵ، گشت لە گشت ڕوویان دە یارە و یار لە هەموو شوێنان دیارە. جا ئێمە بۆ یارپەرستن، لە بەر دەرگای بادەفرۆش، لا ناکەوین و بەسمانە.

۵ گەرچی تێن ڕەقس و سەمایێ هەر سەحەر سەد نەیشەکەر
من د بەزما سوڕشیرینان ئەو شرینڕەفتار بەس

**پوختەی مانا:**

هەرچەندە هەموو بەرەبەیانان، سەتان جوانی بەژنزراوی شەکراوی، وەک قامیشی شلکی شەکر، لە کۆڕی سەما دەلەرن و دڵ و چاوان بە زۆر بەرەو خۆیان دەبەن، بەڵام

لـە نـاو ئاهـەنگی ڕەزاشـیرین و ڕۆحسـووکاندا، تـەنیا دڵـم گـیرۆدەی ئـەو شـۆخە بەلەنجەولارە و شیرینڕەوت و ڕەفتارەیە.

٦ وەهـ چ والاگەوهــەرن هــاتن لیباســێ جیســم و جــان
مــن ژ وان حۆریسرشــتان ئــەو پەریڕوخســار بــەس

**مانای وشەکان:**

**وەهـ**: ئای، پەکوو؛ **والا**: جێ بڵند و بەوەج؛ **جیسم**: لـەش؛ **حـۆری**: کیـژی بەهەشـتی؛ **حوور**: سپی چاوڕەش.

**پوختەی مانا:**

من زۆر گیانی جێبڵند و ڕەگەزپاکم دێنە بەرچاو، کە هاتوونەتە نـاو بـەرگی خـوێن و ڕەگی لەشی ژیانی دنیایی. کە هەموویان لە جوانیدا، سەرسوڕێنن و پەک-پەک و بەهـ-بەهیان دەوێ. من لە ناو ئەو گەلـە حـۆری و ئـەو پـەری و فریشـتانەدا، ئـەم یـارەم هەڵبژاردووە و دڵی خۆم پێ سپاردووە و جیا لەو کەسم ناگەرەکە.

٧ حەوجە سیحرێ سـامیری نیـنن کـو زولفـا ڕەش بکـت
چەشــمبەنــدا دلروبایــان کــاکولا عــەییار بــەس

**مانای وشەکان:**

**حەوجە**: نیاز؛ **سامیری**: خەڵکی سامرە؛ **سامیرە**: پاتەختی وڵاتێکـی جـوان بـووە؛ لـە شوێن شاری «نـابلوس»ی ئێسـتادا. وەختـێ مووسـا لـە کـاتی گـوم بـوونی خـۆی و پەیڕەوانی لە بیابانی سینادا، بەرەو چیای توور بەڕێ بوو کە لەگەڵ خوادا بدوێ، یربعام ناوێک کە خەڵکی ئەو سامرەیە بوو، لە زێڕی زەنبەرێ ژنان، کۆتەڵە گوێلکی ساز کـرد و جادووی لێ کرد. لە دواوە فووی پیدا دەکرد، بۆی دەبۆڕاند. گوتی: ئەمە بپەرسـتن! واز لە مووسا و خواکەی بێنن. زۆر جوولەکەی لە مووسا هەڵگەڕاندەوە. جا لە زاراوەی شاعیراندا، سامیری بە جادوگەری هەرەزانا ناسراوە. **چەشمبەند**: چاوەبەست؛ **عـەییار**:

ئەسپی ئارام نەگر و سەرهەلگر؛ **عەییار**: نازناوی ئەو ئازایانە بوو کە وەک سوارانی ئەورووپای چەرخەکانی ناوەڕاست بوون؛ **عەییار**: فێڵباز و چاوبەست و پیاوخەڵەتێن.

**پوختەی مانا:**

کەزیە ڕەشەکانی یارم، ئەگەر وازی بچێتە سەر جادوو کردن، هەزار سامیری بە پوولێک. ئەو کاکۆڵە عەییارانەی، بۆ چاوبەستی ئەو جوانانەش- کە دڵ لە عالەم دەڕفێنن- کیفایەتە.

٨ بولبولان سەد گول د چاڤن چاڤ ل سەد گول دی دکن
مـن د باغێ گولعـوزاران یـەک گـول و گولنـار بـەس

**پوختەی مانا:**

من کەیفم بە بولبول نایە و لام وایە هیچ لە دڵداریی نەزانیوە. لە کاتێکا کە دەڕوانێتە سەد گوڵان، چاو لە سەتی دیش دەگێڕێ. من لەم باغی جیهانەدا- کە لاجانگ وەک گوڵی زۆرن- تاقە گوڵێکم هەڵبژارد. تەڕ و تازە و گوڵبەدەمە و گوڵ لە زاری دەبارن.

٩ من د باغێ گولفرۆشان دی عەجەب ڕەسمەک غەریب
خارتـەبعان گولددەسـتن گولپەرسـتان خـار بـەس

**پوختەی مانا:**

دەباغی گوڵفرۆشاندا، ئەوی من دیم کەس نەیبینێ. بە ڕاستی سەمەرە و سەیرە. ئەو کەسانەی وەک دڕک وان، دەسکەگوڵیان بە دەستەوە. ئەوانەش کە گوڵپەرستن، هەر دڕکیان بە نەسیب دەبێ.

١٠ ئەو جەفا چوو دەر ژ حەد زولما تە بر حەتتا ب چەند؟[١]
ڕەحمەکی جارەک نەکی هەی زالم ئەڤ ئازار بەس

---

١. بێجگە عوسمان تونچ، باقی «حەتتا ب چین»یان نووسیوە.

**پوختەی مانا:**

تا کەی وا ئازارم دەدەی، ئەی نازدارە زۆردارەکەم؟ دەسا جارێـک بـەزەییت بـە مـنی هەژارا با بێتەوە و ئەو ئازاردان و سزایە ببڕێتەوە.

١١ غەرقێ دەریایێ گونـاهین تەشـنەیێ لوتفـا حـەقین
رەحمـەتێ ئامورزگـار و شـەفقەیێ غـەففار بـەس

**مانای وشەکان:**

**تەشـنە**: تینـوو؛ **لوتـف**: نـەرمی؛ **حـەق**: خـودا؛ **رەحمـەت**: بـەزەیی؛ **ئامورزگـار**: گوناحبەخش؛ **شەفقە**: ڕحم و دڵنەرمی؛ **غەففار**: زۆر بەخشندەی گوناه.

**پوختەی مانا:**

لە دەریـای گونـاح خنکـاوم، تینـووی لاواندنـەوەی خـودام. بـەزە و ڕوحمـی خـوای بەخشندە بۆ من بەسە.

١٢ ئەهلێ دنیایی سەراسـەر دژمنـێن مـن بـن «مـەلا»
پشتە مێری من عەلی بـێ، حەیـدەرێ کـەرار بـەس

**پوختەی مانا:**

ئەگەر خەڵکی هەموو دنیا دوژمنم بن، گوێ نادەمێ. ئیمام عەلی، حەیـدەری کـەڕارە پشتیوانمە، بۆ من بەسە و چاوم لە هیچکەس ناترسێ.



# گولا گەش

آ ئـیرۆ مـەلا سـەراپا لـەو تێـک بوومـە ئاتـەش
من دی سـەحەر خـەرامان نەیشـەکەرا شـرینمەش

**مانای وشەکان:**

**سەراپا**: لە سەر تا پێ؛ **ئاتەش**: ئاگر؛ **خەرامان**: بەلەنجەولار؛ **مەش**: ڕەوت.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ مەلا گرم گرت؛ سەرتاپام بوو بە ئاگر. دەزانی بۆ؟ بەیانی بەژنی زراوی یـارم کـە بەلەنجەولار، دەهات و هەر شیرنایی لێ دەرباری هاتە بەرچاو.

۲ یارەب چ تورفە مێوە ئەڤ ڕەنگە مەی دبەخشت
شیعرا مە تێ پەرێشان، نەزما مە تێ موشـەووەش

**مانای وشەکان:**

**یارەب**: ئەی خودا؛ **تورفە**: جوان و نایاب؛ **ڕەنگ**: جۆر؛ **نـەزم**: هـۆنراو؛ **موشـەووەش**: تێکەڵ-پێکەڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەی خودایە چۆن میوەیەکت درووس کرد! ئەوندە جوان و بە تام و بە بەرامە، کە ئـەو بادەی لێ ساز بووە و من نۆشیومە و ئەوندەی لە هۆش دەربردووم و مەستی کـردووم، کە شیعرم تێکەڵ-پێکەڵە و هۆنراوەم پەرژ و بڵاون.

۳ دلگەشتە من ژ دێـرێ، نـاچم کەنیشـتەیێ قـەت
میحـرابی وێ ب مـنڕا وەردا بچینـە «لالـەش»

**مانای وشەکان:**

**دلگەشتە**: دڵبێزراو؛ **دێر**: ماڵی ڕەبەنانی خاچپەرست؛ **کەنیشتە**: نوێژگەی جوولـەکان؛ **لالەش**: ڕووگەو شوێنی هەرەپیرۆزی یەزیدییەکان.

**پوختەی مانا:**

دڵم لە دێران بێزراوە و ڕووش ناکەمە کەنیشتەی‌جوو. من لـە کـوێ بم، دەزانم یـارم لەوێیە و پەرستنی لە هەموو شوێنان ڕەوایە. من ڕووم دەمیحرابی برۆی ئەوە. ئەگـەر بچێتە لالەشیش، من سوژدە لە لالەش دەبەم. جا ئەگەر میحرابی بـرۆی لـە لالەشـە، وەرە تا بچینە لالەش.

۴ مـەحبووب وەک سـتێرە گۆڤـەند و عیشـقبازی
تێکل بچین سەمایێ هشـیار و مەسـت و سـەرخوەش

**مانای وشەکان:**

**مەحبووب**: خۆشەویست؛ **گۆڤەند**: زەماوەند و بەزم و ئاهەنگ؛ **تێکل**: تێکەڵاو؛ **سـەما**: ئاسمان؛ **سەما**: هەڵپەڕکێ.

**پوختەی مانا:**

سەیرانە، بەزمە، ئاهەنگە، هەر کیژێک لەو گۆڤەندەدا، جوانە، دڵڕفێنە، شـەنگە. کـۆڕی داوەت وەک ئاسمان دێتە بەرچاوم؛ کە پـڕ لـە ئەسـتێرەی گەشـە. وەختـە، وەخـتی دڵدارییە. وەختی هەڵپەڕکێ و یارییە. کەس نەوەستێ؛ ئەوی خـۆی لـە لا وشـیارە و ئەوی مەست و سەرخۆشی چاوی یارانە، با تێکەڵ بین و دەس بگرین و لەو سـەمایەدا بەشدار بین.

«حافز» دەڵێ:

چۆن هەوایێکە لە بلوێرژەنەوە؟! وەسەمای خستووە مەست و ئەغیار[1]

---

۱. چه ره بود این که زد در پرده مطرب؟! که می‌رقصنـد با هـم مسـت و هوشیـار

٥ حەیوان ل کـوو دمینـت ئـەم موفتییـێ زەمـانین
بیـتن ژ دەسـتێ سـاقی جامـا زولالی بێغـەش

**مانای وشەکان:**

**حەیوان**: زیندەوەری جگە لە ئینسان؛ **حەیوان**: زیندوویـەتی؛ **ل کـوو**: لـەکوێ؛ **ئـەم**: ئێمە؛ **موفتی**: فتوادەر؛ **زولال**: ڕوون و ڕەوان.

**پوختەی مانا:**

ئەوی لەو کۆڕ و بەزمەدا بە وشیاری خۆی ڕاگرێ، مـرۆ نییـە و لـە حـەیوانیش نزمتـرە. کـێ دەڵێ مەی لە وەختی وادا حەرامە؟ وا من کە موفتی زەمانەم، فتوا دەدەم بخۆنەوە! با بادەی ڕەوانی پاک و بێ خڵتە و تڵتە، لە دەستی ناسکی مەیگێڕ وەرگرن و لێ ڕانەوەستن.

٦ وەر گۆهدە چەنگ و نایێ شیرین کو بێن سەمایێ
جامـێ بنۆشـە ڤـێڕان چ سـادە و چ زەرکـەش

**مانای وشەکان:**

**ڤێران**: پێرا، دەگەڵ؛ **زەرکەش**: زێڕکفتکراو؛ **وەر**: وەرە.

**پوختەی مانا:**

کاورای وشکە سۆفی! وەرە لەو کاتەدا ئەو جوان و شـیرینانە دێنـە کـۆڕێ، گـوێ لـە دەنگی چەنگ و شمشالان ڕاگرە و دەگەڵ جوانان، پیاڵە فڕ کە و گوێ مەدەرێ مـەی ساکارە یان ڕەنگینە؛ پیاڵە گڵین و سەنگینە یان بلوورین و ڕەنگینە.

٧ تالع کو تێت و فورسەت موهلەت ل نک حەرامـە
من عومرێ نووحی نینە وەر ساقیۆ بلـەز خـوەش

**مانای وشەکان:**

**تالع**: بەخت و تالح؛ **فرسەت**: هەل؛ **موهلەت**: ماوە، مۆڵەت؛ **نـووح**: پێغەمبەرێک بووە

تەمەنی پالی وە هەزار سالەوە داوە؛ **لەز**: پەلە؛ **خۆش**: زوو؛ **ساقیۆ**: هۆی مەیگێڕ.

**پوختەی مانا:**

هەرگا هەلێک لە تەمەنتدا هەلکەوت کە بەختەکـەت چـاکی هێنـا، گەرەکـە گـوردی خۆت بگری و دەرفەت لە دەستەخۆت نەدەی. ئێستا بۆ من ئەم دەرفەتە هەلکەوتووە، کە ڕێم دەم کۆڕە کەوتووە. نارەوایە خۆ بگرم و لە دەستی بدەم. خۆ تەمـەنی نـوحیم نییە؛ کە لام وا بێ هەلی دیکەش هەلدەکەون. هاکا مردم؛ دەمەیگێڕ! دەستم دامەنت زوو بە! وەرە و خۆش بڕۆ بادەم بۆ تێکە!

۸ نەیشەکەرا شیرینقەد مە ژ دەست تـە مـەی دڤـێتن
دا سینە پێ جەلا دین رەوشەن بکـین دلـێ رەش

**مانای وشەکان:**

**جەلادان**: ژەنگ لێ سڕینەوە؛ **رەش**: تاریک.

**پوختەی مانا:**

هەرێ هەی مەیگێڕی بەژنوبالا شیرین و جوان! بەو دەستە ناسکانەی خۆت، مەیمان دەیە! تا سینگی پڕخەم و کولی، پێ لە دەردان بسڕینەوە. تا ئەو دلەی کە لـە داخـی زەمانە ڕەش هەلگەڕاوە و ڕووناکی تێدا نەماوە، تێشکدار و پڕ لە ڕووناکی بکەینەوە.

۹ جامید چ کن ب حوسنێ کو وان نـەزەر ل خـوارە
خەرتەبعەتێن د ئەبلەه چ نێرگیز و چ کەربـەش؟

۱۰ کۆرە خوە ناسپێرت جارەک ب دەسـت دەلـیلان
ئەبلـەه چ کـت تـەوافێ نـابینتن بـەرێ رەش؟

۱۱ بێزی دکت ژ قەنجان ژ رەمـز و نـاز و غـەنجان
قەدرێ گولان چ زانت کەربەش دڤێت کـەرێ ڕەش

**مانای وشەکان:**

**جامد**: وشکهەڵاتوو، ڕەقوتەق؛ **نەزەر**: ڕوانین؛ **خوار**: ژێروو؛ **خەر**: کەر؛ **تەبعەت**: میجاز، تەبیات؛ **ئەبلەه**: دە بەنگ، ناتێگەیشتوو؛ **کەربەش**: کەرکۆڵ، گیایێکە کەر زۆری حەز لێ دەکا؛ **کۆر**: کوێر؛ **دەلیل**: شارەزا، چاوساغ؛ **بەریرەش**: بەردی ڕەشی حاجیان؛ **قەنج**: جوان و باش.

**پوختەی مانا:**

وشکەسۆفی مێشکوشکی نەگەیشتووی دەبەنگی تێنەگەیشتوو، وا ئەزانن هەر لە ڕووی جوانان بڕوانن، دنیا و قیامەتیان دەدۆڕێ و نە وەک تووشی نەزەر ببن، سەریان دەبەر خۆیان ناوە و لە نەویایەتی دەڕوانن و هەر دەیانبینی سەرشۆڕن. ئەوانە خوا لێی گۆڕیون؛ نازانن تماشای جوانی، ڕوانین لە تیشکی خودایە. بێزیان لە ناز و نیمناز و لەنجەولاری نازداران دێت. ئای کە شێتن! لە لای ئەوان- کە لە میزاجی کەراندان- نێرگز و کەرکۆڵ هەر یەکە و بۆ لەوەڕە و بگرە کەرکۆڵیان لە نێرگز پێ خۆشترە. وشکەسۆفی وەک کوێر وایە و دەشیەوێ لە ماڵی کابە بوخلێتەوە؛ بەڵام شارەزا و چاوساغی دەگەڵ نییە و پەیداش ناکا. نازانم لە ڕاموسانی بەردی ڕەش- کە وەک خاڵی لەیلای منە- چۆن سڵ نابێ. یان بێ چاوساغ چۆن دەیبینێ؟

۱۲ فەیزا مە شوبهێ نیلە ئەم دەجلە و فوراتین
گەر شەیخ وەر ئیمامە ڤێڕا یەمن کەشاکەش

**مانای وشەکان:**

**فەیز**: بەهرە؛ **فەیز**: سەرڕێژکردن؛ **دەجلە و فورات**: دوو چۆمی گەورەن؛ **شەیخ**: پیری سەر بەرماڵ؛ **ئیمام**: پێشڕەو؛ **ڤێڕا**: دەگەڵ، پێڕا؛ **کەشاکەش**: کێشەکێش.

**پوختەی مانا:**

ئەو سۆفییە سەرکزوولکانەی ڕووگرژانە، کە بوونە شێخی بەرماڵ و خۆیان بە پێشەنگ

دەزانن، هەرەش لە بڕە ناکەنەوە و تلّپاتی تەڕیش نازانن؛ دێن دەگەڵ مـن کێشـە دەکەن. وەک تنۆکەئاوێکم دێنە بەرچاوان کە شان لە شانی دەریا دەن. ئێمە وەک نیل و فورات و ڕووباری دەجلەین لە زانست و بەهرەمان لێ سەرڕێژ دەکا. نازانم بەو چۆرە-چۆرە، چییان دەگەڵ ئێمە پێ دەکرێ؟!

١٣ شۆخا کو ئەز د بەندێ دڵ گرتییە کەمەندێ
لەتیفە زوهرەسیما، ئەبروو هیلالێ مەهوەش

١٤ برهێن ژ قەوسێ قودرەت نیشانە کر «نیشانی»
لامع ژ بەر دەبارن چ یەنگییەک وە پەرووەش

**مانای وشەکان:**

**لەتیف**: نەرم و ناسک؛ **سیما**: دیمەنی ڕوخسار؛ **مەهوەش**: لە چەشنی مانگ؛ **قودرەت**: توانایی؛ **لامع**: ترووسکەدار؛ **یەنگی**: جۆرێک تیر؛ **وەش**: وەشاندن، بلاوکردنەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو یارە شۆخ و نازدارەی کە من کەوتوومە کەمەندی و لە بەندی ئەودا گیرۆدەم، زوانخۆشە؛ نەرم و نیان و ناسکە؛ وەک ئەستێرەی زوهرە گەشە؛ برۆی مانگی یەکشەوەیە؛ هەنیەی وەک مانگی چاردەیە. برۆکانی کە توانایی خودای مەزن ڕایکێشاون، بە کەوانی «نیشانی»یان تیرەباران کرد. ئای لەو تیرانەی دەبارن، چەند تیژ و برووسکەدارن و پەڕوەشێنن و ڕیشەی بریندار دەردێنن.

١٥ ئەللەهـ ل مـن حوباتە چ شەککەر و نەباتە
ژ نۆ ڤە دێ جوان بم بیهن بکم گولا گەش

**مانای وشەکان:**

**اللەهـ**: نامەخوا؛ **حوب**: خۆشەویستی؛ **بیهن**: بۆن.

**پوختەی مانا:**

ئەی نامەخوا! ئەوینی تۆ بۆ من وەک شەکر و نەباتی تێکەڵ بە ئاوی حەیاتە. تۆ گوڵێکی تازە و گەشی و زۆر بۆنخۆشی. هەر جارێک بۆنێکت بکەم، هەرچەند پیرم، سەرلەنوێ جحێڵ دەبمەوە و بۆ ئەوین، تێهەڵدەچمەوە.



# شەهیدی ئەوین

۱ شەبێ قەدرێ ل مە ڕەوشەن کـە تـو رووحـی وەرە خـوەش
مە ژ نۆ خوەش کە ل سەر چەهڤـێ شـەهیدێن خـوە بمـەش

**مانای وشەکان:**

**شەبی قەدرێ**: لەیلەتولقەدر؛ **رووح**: گیان؛ **رووح**: فرشتەی وەحیبەر؛ **رووح**: وەحـی؛ **ژ نۆ**: سەر لەنوێ؛ **بمەش**: بڕۆ؛ **ب مەش**: بە ڕۆیشتن.

دەربارەی شەوی قەدرەوە، سوورەتێکی قورئان هەیە؛ خوا فەرموویە: «لە شەوی قەدرا، قورئانمان نارده خوارێ. چی ئەزانی کە لەیلەتولقەدر چییە؟! شەوی قـەدر، لـە هـەزار مانگان باشترە. لەو شەوەدا، فریشتە و فەرمانی خودا دەربارەی هـەموو مەبەسـتان بـە ئیزنی خوا، دەنێردرێنە خوارێ. ئەو شەوە دوور لە ئازارە؛ تا سپێدە دەردەکەوێ.»

**پوختەی مانا:**

ئـەی یـار! تـۆ گیـانی، فریشـتەی ڕاسـپێراوی خـوا و گیانپـەروەری. ئەمشـەو وەک لەیلەتولقەدر موبارەکە. ئەی خۆش هاتی و بە هاتنت، دیسانەوە گەشاینەوە. وەرە پات لە سەر چاوانی کوژراوانی چاوەکانی خـۆت دابنـێ و چەنـد هـەنگاوێک بـە سـەر ئـەو چاوانەدا بڕۆ با پلەو پایەی شەهیدمان بە نەسیب بێ.

۲ مـا ل مـن کـی نـەزەرەک لوتفـێ ژ دل غـەمزە نیهـان
برشـینی جەگـەرێ ڕیـش ژ قەوسـێن خـوە ب وەش

**مانای وشەکان:**

**ما**: بەڵکوو؛ **ما**: ئازەروومە؛ **لوتف**: بەزەیی و ئیلتفات؛ **نیهان**: بە نهێنی؛ **ریـش**: بریندار؛

**وەش**: وەشاندن، چاندن، پرژاندن.

**پوختەی مانا:**

دەی بەڵکوو بێتە دڵتەوە، پەنامەکی نیوە ئاورێکم لێ وەدەی. لە کەوانی برۆیانرا، جەرگ و هەناوی زامارم، بەر تیران دەی و سەرەتیری لێ بچێنی و بە ئارەزووم بگەیێنی.

٣ سەحەرێ جوملە شەهیدێن تە ب رم ئافێهتی
ئێ ژمارینە یەکایەک مەحەمی شەششەدوشەش

**مانای وشەکان:**

**جوملە**: هەموو، تێکڕایی؛ **رم**: ڕمب؛ **ئافێهت**: هاویشت؛ **حەمی**: هەموو.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی کوژراوی تۆن و بەرەبەیان بە ڕمبی بژانگ کوشتووتن و بوونە شەهیدی ئەوینێ، لەسەر ژماردنی ئێمە بە تێکڕایی، هەموو دەبنە شەششەد و شەش. ڕستەی «ب دل د عشقی فداء» کە واتا: لە ئەویندارییدا وا سوتابوون، کە بە ئاواتی دڵی خۆ، خۆیان بە قوربان کردووە. لەسەر ژمارەی ئەبجەدی دەبێتە شەششەد و شەش.[1]

٤ لێ شەهیدێن تە ب ئەژمارێ ب خەنجەر کوشتی
هێ نەچوو خوون ژ برینان سەدوهەفتادودوو لەش

**مانای وشەکان:**

**خەنجەر**: تیخی بەرپشتێند؛ لێرەدا مەبەست لە خەنجەر برینی لۆمە کردنە؛ **هێ**: هێشتا.

١. من وای بۆ چووم. لام وایە نیازی وا بووە کە هەر یەک لەو کوژراوانە بە دڵ فیدای ئەوینێ بوون. وێشدەچێ من نەمزانیبێ و نیازی مەلا، لەو باسی شەش‌سەد و شەشە، ڕازو نهێنییەکی‌تر بێ. «هەژار»

**پوختەی مانا:**

بەڵام سەرەڕای ئەوانەی بە ڕمبی بژۆڵ پێکراون و لە ڕای تۆدا گیانیان داوە، هێندێک کوژراوی تریش بوون کە بە خەنجەری سەرکۆنە، یان بە خەنجەری عەزرەت و ئاواتی تۆ، شەهید بوون و هێشتان خوێنیان لە برینان نەتکاوەتەوە. ژمارەیان بە لەش، سەد و حەفتا و دوون![1]

**٥** جــەنگێ هینــدی دکــرن فێــرس و رمبــازێ عــەرەب
تــۆخ و عـــالا د فرەنگینـــە کەمانـــدارێ حەبـــەش

**مانای وشەکان:**

**فێرس**: سوارچاک؛ **تۆخ**: جوقـەی سـەری فەرمانـڕەوا؛ **عـالا**: ئـاڵا؛ **د فرەنگینـە**: هـی فەرەنگن.

لە زاراوەی شاعیراندا، «هیندی» بۆ خاڵی ڕەش دەڵێن. «رمبـازی عـەرەب»، مژۆڵـن. پرچیش بە «ڕەشی حەبەشی» دەشبهێنن.

**پوختەی مانا:**

بەژنی یارم، لە گەڕی زەماوەندێدا، دلەرییەوە. برۆکانی وەک کەوانداری حەبەشی، ئامادەی تـیر پێ‌هاویشـتن بـوون. چاوەکـانی وەک سـوارچاکانی ئـازا، بـە ڕمـبی مژۆڵانەوە هێرش دێنن. خاڵی ڕەشی سەر گۆنایان دابووە بەرێ و لەسـەر ئـەوەی کام ڕەشترن، ببووە شەڕیان. کاکۆڵی هەڵـگەڕاوەوە و بسـکانی کـە وەکـوو ئـاڵای جەنگ دەشەکاوە، برەوبەری ئەو ئاوریشمە نایابە بوون، کە لە وڵاتی فـەرەنگان بـە دیاری دێنن.

---

[1]. لێرەشدا من، هەر هاوارم بۆ ئەبجەدەکە بردووە؛ کە مەلایان لە قەدیمدا، زۆر جاریان دەکار هێناوە. نیوڕستەی «نَوسُلوک» بەپێی ئەبجەد، دەبێتە سەت‌وحەفتاودوو. واتا: ئەوانەی ناشی بوون، تازە هاتبوونە ناو ریزی ڕێڕەوانی خوداناسین، لە تامەزرۆیی دیدارت، گیانیان دەرچوو. لێرەشدا هیچ دوور نییە بە هەڵە چووبێتم و ڕەنگە نیازی شتێکی جیاواز بووبێت. «هەژار»

٦ تـۆ بنـێ ڕووم و عەجـەم کوشـتنە زەنگـی د کـەمین
هانە هەرتێتە پەیاپەی ژ تەرەف رووم خوەش و خـوەش
(یان: رەوم)

**مانای وشەکان:**

**بنێ**: بنۆڕە؛ **زەنگی**: ڕەشی ئەفریقایی؛ **هانە**: کۆمەگ؛ **پەیاپەی**: یەک لەدوو یەک، بـێ پسانەوە؛ **رەوم**: شلکەی گوێ، جێگەی گوارە.

**پوختەی مانا:**

لە ناو کوردەواری خۆمان، بۆ شەڕی زۆر گەورە دەڵێن: وەک شەڕی ڕۆم و عەجەمە. تۆ بڕوانە لەو سەربادانەی یارەکـەم، لـە دیلانـا، کەزیـەکانی لـە سـەر ڕوومـەت وێـک دەکەون، دەڵێی شەڕی نێوان ڕۆم و عەجەمە ڕووی داوە و لەشکریان گەیشتوونە یەک و لە هەردوو لای گوارانەوە، کۆمەگ بۆ هەردوو لایان دێ و هـیچ پسـانەوە و سـانەوە، بەرچاو نایە. خاڵی ڕەشیش -کە دەڵێی بەچکەزەنگییـەکی بەسـتەزمانە- لـە ترسـان خۆی پەنا داوە و لەبەر کەزیان داپۆشـراوە و ئـەویش وەک ئێمـەی ئەوینـدار، ئەگـەر نەش کوژرابێ چاکە.

٧ دا مە شەهزادە ب دەستێ خـوە موبـارەک قەدەحـەک
نـە غوبـارەک ژ خومـاریی و نـە تونـدی و نـە غـەش

٨ دو قەدەح مـەی ب نیشـانی د درت ڕەنـگ ب رەنـگ
نێرگـــزا نـــازک و رەعنـــا و گـــولا تازەیـــە گـــەش

**مانای وشەکان:**

**موبارەک**: پیرۆز، بەودم؛ **قەدەح**: پیاڵە؛ **غوبار**: تۆز؛ **خومـار**: سەرێشەی دوای مەستی؛ **توندی**: تیژی، تووڕەیی؛ **غەش**: خەوش؛ **ڕەعنا**: نەرم و شل و بزۆز و جوان.

**پوختەی مانا:**

یارەکەم- کە لە چاو جوانان شازادەیە- بە دەستی موبارەکی خـۆی، پیاڵـەیەکی دایـە

دەستم؛ کە بە دەستی پیرۆز ببوو. زۆریش ڕوی دەگەڵما خۆش بوو. گەردی دەردی سەرخۆشانی لێ دیار نەبوو. نەرم و نیان، دەیدواندم. نە تووڕەیی نە فریو دان بوو. دوو جار پیاڵەکەمی پڕ کرد. بەڵام لە چێ؟ لە دوو جۆر بادەی ڕەنگاوڕەنگ. لە بادەی چاوە مەستەکەی، وەک نێرگزی تازە پشکووت و لە مەی ڕوانینی کولـمەکەی، کە وەکوو گوڵی گەش دەچوو. لەو ساوە من سەرخۆشێکم نە دەترسم لە خوماری و نە لام وایە ئەو مەیەی دراوە بە من، خەوشی تێدا و چێژەی تاڵ و تیژیی دەدا.

٩ غالیبـا ئـەهلێ زەمـانی مـا «مـەلا» ئـادەمیین؟
ڤـەنەمایین ژ کـەرێ مـەی ڕەش و گایـێ تـەیی بـەش

**مانای وشەکان:**

**غالێبەن**: زۆربە و پڕایی؛ **ما**: بۆچی، مەگەر؛ **ڤەنەمایین**: نەماونەوە؛ **بەش**: حەیوانی توێڵ سپی.

**پوختەی مانا:**

زۆربەی خەڵکی ئەم زەمانە، مەگەر لات وایە ئینسانن؟ نەخێر لە بیچما وەک مرۆن؛ بەڵام لە عەقڵ و کەماڵدا، لە کەرە ڕەشەکەی ئێمە و گا هەنییە سپییەکەی ئێوە بە جێ ماون.

١٠ عارفێن ئەهلێ بەسیرەت ژ نەسەق مـەردومێ چەشـم
سورمەپۆشـن د بـەیازێ و قـەبایێ خـوەیی ڕەش

**مانای وشەکان:**

**ئەهلی بەسیرەت**: ئەوانەی دڵیان ڕووناکە و خوا دەبینن؛ **نەسەق**: هەروەک، لە چەشنی؛ **مەردومی چەشم**: گلێنەی چاو؛ **سورمە**: کل؛ **بەیاز**: سپییەتی؛ **قەبا**: کەوا.

**پوختەی مانا:**

وا دیارە پیاوانی گەورەی تەریقەت، لە ڕۆژگارانی مەلادا، کراس سپی و کەوا ڕەش

بوون. بۆ سوننەتیش، کلیان دەچاویان کێشاوە. مەلا پەسنیان دەدا و دەڵێ:
ئەو خواناسە دڵڕوونانە کە بە دڵ خودا دەبینن، لە کراسی سپی و کەوای ڕەش و سورمە لە چاوکێشاندا، وەک گلێنە و بیبیلەی چاو دێنە بەر چاو؛ ئەویش بە سورمە ڕێژراوە و کەوای ڕەشی دەبەردایە و لە ناو سپیاییدا دەژی.



# ڕەقسی مەستانە

١ سـەلوا سـەهی قـەد خـەمملی ٬هو کەمملی مەسـتانە رەقـس (رقـص)
وەر سـوحبەتێ گـەر قـابیلی دێ بێت و رەت شـاهانە رەقـس

**مانای وشەکان:**

**سەلو**: سەوڵ، سەرو؛ **سەهی**: ڕاست و بێ‌گرێ؛ **خەمملی**: ڕازایەوە؛ **کەمملی**: بێ کەمایەسی بوو؛ **سوحبەت**: هەواڵەتی؛ **قابیل**: شیاو؛ **ڕەت**: دەڕوات.

**پوختەی مانا:**

بەژنی وەک داری سەوڵی ڕاست، ڕازایەوە. ئیتر گۆوەندی مەستانە، زۆر تەواوە. ئەگەر خۆت بە شیاوی کۆڕی ئەو جێژن و بەزمە دەزانی، وەرە تێوێ. ئەو داوەتە شاهانەیە و شای ڕەقسانە.

٢ مەسـتانە مەسـتان نۆشـەنۆش قەرقەف د جامـان هاتـە جـۆش
ما دێ بمینـت کـەس ل هـۆش وەقتێ کو بـێن دوڕدانـە ڕەقـس

**مانای وشەکان:**

**نۆش**: خواردنەوە؛ **نۆشانۆش**: بە گیانت خۆش بێ؛ **قەرقەف**: بادە؛ **دوڕدانە**: گەوهەری تاقانەی بێ هاوتا؛ **ما**: مەگەر.

**پوختەی مانا:**

گوێ بگرە! مەستان- مەستانە؛ هەر دەنگی نۆشانۆشییانە. بادە دەنـاو پیاڵانـدا هاتۆتـە جۆش و دەهەژێ. لە کاتێکا کە مەیگێڕی وەک مرواری بێ هاوتا، بادە بگێڕێ، مەگـەر هیچ کەسی وا هەیە، هۆشی بە لاوە بمێنێ؟ ئەگەر مەستی بادەش نەبێ، بـەو دیمەنـە

سەرخۆش و بێهۆش دەبێ.

٣ سوحبەت ب سازان هاتە ساز    پێ مەوووجی دەریایێ ناز
دا دل ژ نوو بایێ مەجاز    وێ کەشتیێ سوککانە ڕەقس

**مانای وشەکان:**

**مەوووجی**: شەپۆلی دا؛ **کەشتی**: گەمیە؛ **سوککان**: ئامرازی دارین یان ئاسنین لە کەشتی کە شارەزایی ڕێگا بەوە؛ **مەجاز**: بەدەڵ؛ **موجاز**: دروست.

**پوختەی مانا:**

کۆڕی بەزم، بە دەنگی سازان سازدرا. دەریای ناز، کەوتە شەپۆلدان. ئەو کۆڕە وەک گەمی وایە؛ بە ناو دەریای نازدا دەڕوا. سوکانەکەش هەڵپەڕکێیە. جا هەر وەک گەمیە بای باشی دەبێ هەبێ بۆ ئاژۆتن، دڵداریی لەباتی بایە و گەمیەکە بەڕێوە دەبا.

٤ مەحبووب بیعەینێ کەوکەبن    ڕەقسا کو تێ دلبەر هەبن
سەد جان گرانی من هەبن    باڤێمە ڕێ ئەرزانە ڕەقس

**مانای وشەکان:**

**بیعەینێ**: هەر تەواو وەک؛ **تێ**: تێدا؛ **گرانی**: بەنرخ و خۆشەویست؛ **ئەرزان**: هەرزان، کەمنرخ.

**پوختەی مانا:**

ئەو جوانە خۆشەویستانە، هەر وەک ئەستێرەی بەر ئاسمان هەر لە دوور دەدرەوشێنەوە. ئەو گۆوەندەی جوانی وا دڵبەری لێ بێت. ئەگەر سەد گیانی شیرینم دەبەردابێ و بیهاوێمە سەر ڕێگەی کۆزی هەڵپەڕکێ، لام وایە هیچم نەداوە و ئەو شاباشەم زۆر بە بێنرخ دەزانم.

٥ کرشمە و ڕازا بەری    عارف ڤە نابن لێ دەری

حـــــەتتا د نێڤـــا ئــــاگری ئەو خەف نەبت پەروانە رەقـس
(یان: خۆڤ نەبت)

**مانای وشەکان:**

**کرشمە**: ناز؛ **بەری**: سادە و ئاسایی؛ **ڤە نابن**: ناکرێنەوە؛ **دەری**: دەرگـا؛ **خـەف**: ون و وەشێراو؛ **خۆڤ**: ترس.

**پوختەی مانا:**

راستە ئەوینی مەجازی، دەرگایەکە بەرەو ئەوینی ڕاستینەی خوداناسی؛ بەڵام ئـەوینی مەجازیش مەرجی هەیە. ئەگەر تەنیا بە نازێک و بە ڕازونیازێکی سـەرچڵ، لات وا بـێ وەهای گەیاندووی کە دەرگای ئەوینی خودات لێ داناخرێ، بە هەڵـە چـووی. عـارف دەبێ لە ئەوینی مەجازیدا، وەک پەپوولە خۆی بخاتە ناو گڕەوە و بسووتێ و لـە بـەین بچێ؛ ئەوسا شیاوی ئەوینی خوای مەزن دەبێ.

٤ پەروانـــەیێ شـــەمعا گەشـــین زولفـــێن وە نـــازک ڕاوەشـــین
شـەوکێن د دلـدا پـێ خوەشـین مە ژ پەنجەیێن شـێرانە رەقـس

**مانای وشەکان:**

**شەوک**: دڕک؛ **پێ خوەشین**: پێ شادین.

**پوختەی مانا:**

ئێمە بۆ سووتان، ئامادەین. وەک پەروانەین لە ئەویندا؛ لە دەورەی ڕوومەتی گەشـت. ئامادەین گڕمان تێ بەربێ. بۆ خۆش بوونی ئەو ئاگرەی کـە ئێمـەی پـێ دەسـوتێنی، کەزیە هەودا ناسکەکانت ڕاوەشێنە و باوشێنی کە! گەشتر بێ. دڵمان هەرچەنـد پڕیـە لە دڕکی ئازارت، بەڵام ئێمە پێی دڵشادین. لەو گۆوەندە کە تۆی تێدای، دەزانم مـنی پێ دەمرم و خۆم لە بەر چاوت ناگرم. دەزانم من وەک لە ناو چەمۆڵەی شـێردا سـەما بکەم وایە. بەڵام ئەگەر بشمرم، قوربانی تۆ بم، ئەوە ئەوپەڕی ئاواتمە.

٧ عـــالا و تـــاییْن قرمـــزین ئەسـلان د بـەردا بـەرڕزین
نێرگــز د باغــان تــەووزین نەیشـەککەران نیشـانە رەقـس

**مانای وشەکان:**

**عالا**: ئـالا، مەبەسـت لێـرە لفکـەی سەرودەسمالـییەتی؛ **تـا**: هـەودا؛ **ئەسـلان**: شـێر؛ **بەرڕزین**: شالاویان هێنا؛ **تەووزین**: ڕازانەوە.

**پوختەی مانا:**

لفکەی شۆڕی شەدە و دەسماڵ، هەودای گوڵینگەی سوور و ئاڵ، بوونـە نـەخش لـەو ڕوخسارە. چاوی مەستی دڵدارکوژی، وەک شێری پـەلاماردەرن. بـۆ لاسـایی بـەژنی جوانت، نێرگـز لـە بـاغ و چیمـەنان، زۆر جـوان خۆیـان ڕازانـدەوە. نـەمامی قامیشـی شەکریش، بە دەم بـاوە دێـن و دەچـن؛ لاسـای لـەرینی بـەژنی تـۆ دەکەنـەوە؛ کـە دەرەقسی.

٨ وەقتــێ خویــا بــن ئەرغــەوان گولچیچـەک و تـەرحێن جـەوان
ڤــێرا نــەبێ ســەلوا ڕەوان عـارف ل فـەرقێ جانـە رەقـس

**مانای وشەکان:**

**خویا**: ئاشکرا؛ **گولچیچەک**: گوڵی پشکووتوو؛ **تـەرح**: لـک؛ **جـەوان**: تـەڕوتازە؛ **ڤێرا**: دەگەڵ؛ **فەرق**: جودایی.

**پوختەی مانا:**

لە هەرەتی بەهاراندا، کە ئەرخەوان دێنـە بـەرچاو، گـوڵ دەپشـکوون، لکـی ناسـک و شلووڵ، بە دەم باوە دێن و دەچن. ئەگەر ئەو بەژن و بالایەی یاری نازدار- کـە وەک سەوڵ ڕاست و شەنگە- خۆی دەرنەخا، ڕێڕەوی ڕێگەی خواناسی، دەبێ سەمای گیان لە لەش جودابوون، واتا: هەر وەک پەلەقاژە و هەڵبەزینی مەلی تازە سەر لێ هەڵقرتاو، ڕەچاو بکا.

٩ ئـــیرۆ شـــەکەرخەندێ بـــرین دەســـتێ ســـپیزەندێ بـــرین
دیســـا ب گۆڤـــەندێ بـــرین دەردێ «مەلێ» دەرمانە رەقــس

**مانای وشەکان:**

**شەکەرخەند**: بزەشیرین؛ **برین**: بردینی؛ **زەند**: باسک.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ یاری لێوبەبزە و خەندەشیرین، بەو دەست و باسکە ناسکانە و سـپی و جوانـەی، دیسان بردینیە گۆوەندێ. دەردی ئێمە دەرمانەکەی هەر سەمایە و هیچیتر نا. (یان: بۆ دەردی دڵی مەلا، ڕەقس و هەڵپەڕکێ، دەرمانە.)



# وەسڵی گیان

١ مه ژ بل حوسـن و جەماڵـێ چ غـەرەز (غَـرَض)؟
بـــێ جـــەماڵێ ژ پیالـــێ چ غـــەرەز؟

**مانای وشەکان:**

**بل**: جگە؛ **غەرەز**: مەبەست و نیاز.

**پوختەی مانا:**

ئێمە جگە لە تماشای جوانی و دیمەنی لەباری یاران، هیچ ئاواتی ترمان نییـە. ئەگـەر سەیری بەژن و باڵای ڕێک و جوانی مەیگێڕ نەبێ، کارمان بە پیاڵەی مەی چییە؟!

٢ گـەر نـە تەشـبیهێ دوو بـرهێن تـە بـتن
مـــە د عیـــدان ب هلالـــێ چ غـــەرەز؟

**پوختەی مانا:**

ئەگەر بۆیە نەبێ کە هیلال وەک برۆکانی تۆ دەچێ و جێژنەمان بە دیتنیەتی، هەرگیز بۆیم نەدەڕوانی. جێژنی من هەر ئەو سایەیە کە مانگی یەکشەوە دەبینم و بـرۆی تـۆم بیر دەخاتەوە.

شاعیرێک نایناسم دەڵێ:

وەرە سەرسوانە و گۆشێکی برۆتمان شان دە! کۆمەڵی ڕۆژووگران، چاوەنواڕی جێژنن.

«مەولەوی» فەرموویە:

هـــەر مـــانگێ نـــەو بـــۆ حاڵـــم پـەشـــێوەن
هـــیلالش شـــێوەی ئـــەبرۆی تـــۆش پێـــوەن

٣ گــەر نــە قەســتا دل و جانــێ مــە دكــت
مــە ژ وێ شــۆخ و شــەپالێ چ غــەرەز؟

**مانای وشەكان:**

**شۆخ**: شەنگ؛ **شەپال**: ڕەزاشیرن و خونچیلانە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر بۆمان ڕوون نەبوایە كە ئەو شۆخ و نازەنینە، ڕەزاسووک و خوێنشیرینە، لێ بڕاوە كە گیان و دڵمان برفێنێ و ژینمان بە تیری دڵـداریی دواییبێنــێ، ئێمــە بــۆ شــوێنی دەكەوتین؟ ئێمە ئەگەر بە ئەوینی بە كوشت بچین، ئەوپەڕی بەختەوەریمانە.

٤ گــەر نــە رووحــێ مــە د پــێ دل بــرەتن
مــە ژ وێ قــەنج و دەلالــێ چ غــەرەز؟

**مانای وشەكان:**

**قەنج**: دڵپەسند؛ **دەلال**: جوانی نازدار و ڕەزاشیرین؛ **پەی**: شوێن؛ **برەتن**: بڕوات.

**پوختەی مانا:**

گوتمان دلبەر، بەڵام نابێ هەر بە دڵبردن ڕازی بێ و گیانمــان نــەبا. ئەگــەر لــە دوای دڵبردنی، گیانیشمان دەگەڵ خۆی نەبا، هیچ ئاوات و ئارەزوومان لەو شۆخ و جــوان و شیرین و نازەنینە بۆ پێک نەهات.

٥ گەر نە بیسمێ تــە موعــەمما بــن حــرووف[1]
مــە ب شــكلی خــەت و خالــێ چ غــِەرەز؟

---

١. كێشی ئەم لەتەبەیتە كپێكی زیادە؛ كەچی هەموو نوسخەكان هەر وایان هێناوە؛ عوسمان تونچ نەبێ «نە ب ئیسمێ تە موعەمما بن حەرف»ی نووسیوە و تەواوی كردووە.

**مانای وشەکان:**

**بیسمی**: بە ناوی، بە ئیسمی؛ **موعەمما**: مەتەڵـی دژوار؛ **حـرووف**: پیتگـەلی ئـەلف و بێتکە؛ **حروف**: کەناران؛ **شکل**: تەرح، وێنە.

**پوختەی مانا:**

لە قورئاندا، چەند پیتێک لەسەر سـوورەتان، دەبینـدرێ؛ وەک: ا، ل، م، ق، ک، ه ، ع، ص، ن، ط، ی، س و ... ئەو کەسانەی قورئانیان مانا کردووە، لە بارەی ئـەو پیتانـەوە، گەلێک شـتیان درکانـدووە. دەڵـێن ئەوانـە هەریـەکێک نیشـانەی نـاوێکی خـودان. هێندێکیان ڕوو دە پێغەمبەرە و هەر پێغەمبەر خۆی زانیویە. واتا: بۆ ئێمەی کەم زانـا، ئەو پیتانە، وەک مەتەڵۆکەی دژوار وان و خوا و پێغەمبەری خوا نەبێ، کەس بە تەواوی نازانێ. مەبەست چ بووە؟[1]

مەلا دەڵێ: من هەر بۆیە دەڕوانمە خەتوخاڵان و لە دیداری یار دەنۆڕم. لە کەزی بە شکڵی لام و چاوی لەسەر بیچمی صـا د و میمی دەم و ئەلفی قەد و خاڵـی نوختـە و بڕۆی وەک نوون، ورد دەبمەوە. دەزانم هەریەک نیشانەی یەکێک لە ناوەکانی تـۆن. دەمەوێ ئەو مەتەڵۆکە هەڵبێنم و بەو ناوانە تۆ بدوێنم؛ ئەگینا من هـیچ کـارێکم بـەو خەت و خاڵانە نییە.

«نالی» دەڵێ:

لـەبت مـیم و قـەدت ئـەلف و زولـف چـیم
دەزانی بـەو سێـانە تـالـبی چیـم

٦ نـەکوو شـەرمەندە ژ ڕوویـێ تـە بـوا
ئافتابـێ ب زەوالـێ چ غـەرەز؟

**مانای وشەکان:**

**شەرمەندە**: فهێتکار؛ **تە بوا**: تۆ بوایـە؛ **ئافتـاب**: خـۆر؛ **زەوال**: لاکـەوتنی ڕۆژ بـەرەو

---

[1] . بۆ ئەو باسە، بڕوانە تەفسیرەکان؛ لێرەدا بۆ درێژەدانی، مەودا نییە. «هەژار»

ئێوارە لە ناوەڕاستی ئاسمان.

**پوختەی مانا:**

خۆر ئەگەر لەڕووی تۆ- کە لەو جوانترو ڕووناکترە- بە شەرمدا نەکەوتایە، لە ناوەڕاستی ئاسمانێ لای نەدەدا و بەرەو ئێوار و ئاوا بوون نەدەڕۆیشت.

٧ قەستێ وەحدەت دکرت رووح ب رووح
وەر نە عاشق ژ ویسالێ چ غەرەز؟

**مانای وشەکان:**

**قەست**: نیاز؛ **وەحدەت**: یەکییەتی؛ **ویسال**: پێک گەیشتن.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ئێمەی دڵداری زار، ئاواتەخوازی ئەو کاتەین کە دووری لە ناو هەڵگیرێ و بە دۆست بگەین، بەو تەمایە نین کە بە لەش بە یەک بگەین. دەمانەوێ گیان لە گەڵ گیاندا تێکەڵ بێ و گیانی ئێمە دەگەڵ گیانی یاردا، ببنە یەک و هەرگیز جودا نەبینەوە.

٨ د شەبێ قەدرێ تەجەللا تو بکی
مە ل پەی مووم و شەمالێ چ غەرەز؟

**مانای وشەکان:**

**تەجەللا**: خۆ ئاشکرا کردن؛ **شەمال**: مۆمی داگیرساو.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لە شەوی قەدر (لەیلەتولقەدر)دا، تۆ تیشکی خۆت بۆ ئێمە ئاشکرا بکەی، کارمان بە مۆم و چوڵەچرا دەبێ چی بێ؟

٩ نـــە جـــەمالا تـــە تەجـــەللی بکـــرت
مـــە ژ خووبـــان ب جـــەمالێ چ غـــەرەز؟

**مانای وشەکان:**

**خووب**: جوان؛ **تەجەللی**: خۆ دەرخستن.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ئێمە، تماشای جوانچاکان دەکەین، تیشکی جوانی بێهاوتای تۆ لە ڕووی ئەواندا دەبینین. ئەگینا ئێمە و جوانی چی و تماشای ڕووپاکان لە چی؟

١٠ نـە ژ لـەعلێن تـە «مـەلا» بەحسـێ بکـت
مـە ژ ڤـێ بـەحس و سـوئالێ چ غـەرەز؟

**پوختەی مانا:**

مەلا کە پرسیاران دەکا و باسوخواس دادەمەزرێنێ، هەر دەیەوێ سەر و بنی قسەکانی بە باسی جوانی لێوی یار- کە بە ڕەنگی لالە و ئالە- دوایی بێنێ. ئەگینا هیچ بە پرس و باس کاری نییە.



# عەنبەر بار

آ
دیســـــا ل بـــــەدرێ کــــاتبی    کێشا ژ نوو ژەنگارێ خــەت (خــط)
نـــــووره رەشـــــاندی واهیـــــبی    دەر گەردشــێ پــەرگارێ خــەت

**مانای وشەکان:**

**کاتب**: نووسەر؛ **کێشا**: کێشای، ڕەسمی کرد؛ **ژەنگار**: سەوز؛ **ژەنگـار**: تیشکی مانگ و ڕۆژ؛ **ژەنگار**: بادە؛ **ژەنگار**: توند و تیژ و سووتێن؛ **واهب**: ناوی خوایە، واتا بەخشــندە؛ **دەر گەردشێ**: لە گەڕانی؛ **پەرگار**: جەغزینگ.

**پوختەی مانا:**

ئەوا دیسان دەستی توانای خودای مەزن، خــەتی ســەوزی ســەوزەی گەنـدەمووی بــە بریقەی بە پەڕگاری قودرەتی خۆی، لە کەناری مانگی چاردەی هەنیــەی یــارم، جــێ کردەوە. گەندەمووی چی؟! هەمووی ڕۆشناکی و نوورە؛ لە دەوری مــانگی هەنیــەی و خۆری ڕووی دیاری دەدەن و ناکرێ هەر ناوی بنێن خەت.

۲
حەرفێن ژ قــودرەت نوقتــە پــوڕ    مـــاداری حـــەوزا لـــەعل و دوڕ
ئەڤ ڕەنگ کــێ دیــوە بــە ســوڕ    قودرەت نموون زەنگارێ خــەت

**مانای وشەکان:**

**حەرف**: پیت؛ **حەرف**: کەنار؛ **قودرەت**: توانایی؛ **پوڕ**: زۆر؛ **مادار**: دەورە؛ **حــەوز**: جــێ ئاو؛ **دوڕ**: مرواری؛ **سوڕ**: دڵکێشی؛ **نموون**: نوێن، نیشاندەر.

**پوختەی مانا:**

ئەو خەتە سەوزەی، کە وتمان سەوزە گەندەمووی لاجانگ و کەناری ژێر چەناگەیــە و

دەوری لە مانگ و ڕۆژ داوە و ئێژی بە پەرگار کێشراوە، پڕ کراون لـە خالـی ڕەش کـە لەو سپییایەتی ئاسۆی ڕۆشنی جەغزی دەوری ڕوو، دەدرەوشێن و هێندێکی دیش لەو خالانە، بۆ تالانی دلـی دلـدار، پەڕیوونـە کـەنار و دەوری دەمـی تـەنگی کـە دەڵـێی حەوزۆکەی لاڵ (لـەعل)ە و پـڕە لـە دوڕڕی ددانـان. دە کـێ شـتی هێنـدە جـوان و دلڕفێنی دیوە؟ کێ دەتوانێ ڕەخنە لەو خەتکێشە بگرێ کە ئەو خەتە گەندەمووە پڕ لە خالانە و ئەو خالانەی دەوری لێوی یاری بە پەڕگاری قودرەتی خۆی بۆ کێشاوین.

٣ ئەوچیچـــەکێن شەتریشـــبێهت ئەفعیسیفەت قەلبێ مـە مێهـت

ســـەلوا ژ بالایـــێ وە ڕێهـــت ئـەڤ پـەردەیا گولنـارێ خـەت

**مانای وشەکان:**

**شەتری**: گولینگە؛ **شبێهت**: وەکی، لە چەشنی؛ **ئەفعی**: مـار؛ **مێهـت**: مـژی؛ **سـەلوا**: هەنگوین؛ **سەلوا**: خەمرەوێن؛ **سەلوا**: شێلاقە (مەلێکە). خوا لە بیابانی سینادا، گەزۆ و شێلاقەی بۆ جووەکانی هەواڵی حەزرەتی مووسا باراندووە. لـە قورئانـدا فەرموویـەتی: «هەورمان ناردە سەر سەرتان نسێو لێ بکـا. هـەروا گـەزۆ و شـێلاقەشمان بـۆ ناردنـە خوار»؛ **بالا**: بەژن؛ **بالا**: سەروو، ژووروو؛ **ڕێهت**: ڕژت.

**پوختەی مانا:**

چاوم بە سەلمایە کەوت. سایەی سووری گوڵهەناری ڕاڕا و خەتخەتی دەبەردا. گولینگەی سەر و شەدەکەی هاتبوونە خوار؛ کە بە دیمەن لە گوڵ دەچـوون. بـەلام بـۆ پێـوەدانی دڵ، ببوونە ماری پێوەدەر. ئەو شیرینەی وەک هەنگوێنە و ئەو خەمرەوێنە بێ وێنـە- کـە بـالای دەهات و دەچوو- هەر دەتگوت بەزەیی خودا لەو بالایە، بۆ ئێمەی لە مووساییەکانی ئـاوارەی دەشتی سینایە، بۆ دیتنی بەژنی ڕێکـی تینـووتر و بـێتێن و هێـز و تـاوتر بـووین. گـەزۆی دیداری یارمانی بۆ باراندین و بە سێبەری ئەو بالایە، تین و تاوی گەرمایی دلی تاراندین.

٤ نـــەقش و نیگـــارین دلبـــەران دەرجـێن ژ ڕەمـزێن ئەسمـەران

هەرتێنژدەســت نەیشــەککەران مە ژ گولشەنێ فەرخارێ خـەت

**مانای وشەکان:**

**نیگار**: بوت، دڵبەر، یار؛ **نیگار**: خەنەی دەست و پێی جوانان؛ **نیگار**: نەخش؛ **دەرج**: ڕۆیشتن؛ **دەرج**: تۆمار؛ **دەرج**: چوونە ناو؛ **دورج**: قوتووی جەواهیرات؛ **فەرخار**: مەڵبەندی جوانچاکان؛ **فەرخار**: بتخانە و دێر؛ **فەرخار**: ڕازاوە و جوان.

**پوختەی مانا:**

وادیارە مەلا ئەو سێ شیعرە پێشەکییانەی، دەربارەی جوانی خەتی مووی لە دەوری ڕوخساری یار و باسی پیرۆزی دیداری، هەر بۆیە بوو پێمان بڵێ: نامەیەکم ئەمڕۆ بە دەستی کیژێکی بەژن‌زراو بە دەس گەیشت کە سەلما بۆ خۆی نووسیبووی و تێیدا دڵی دابوومەوە و فەرمووبووی نامەی تریشت بۆ دەنووسم.

لە مەڵبەندی جوانانەوە، کە بۆ من وەک بوتخانەیە بۆ بت‌پەرست، لە ناو باغچە ڕازاوەکەی، نامەیەکم بۆ نووسرابوو. کیژێکی باڵانەمامی وەک قامیشی شەکر ڕاست و شیرین و پڕ لە لەنجەولار، نامەی کە پێچرابۆوە- وەکوو تۆمار- دایە دەستم. تۆماری چی؟ قوتوولکەی جەواهێرات بوو! بەو دەستە سپی و ناسکانەی نەخشاندبووی؛ کە لە پیرۆزی و قۆزیدا، نەک هەر دڵدار، دڵبەرانیش دەیانپەرست. ئەو خەتەی لەوی درابوو، گشتی دەتگوت چاوی ڕەشی جوانەکانی گەنمڕەنگە، لە پاڵ یەکتر ڕیز کراون و پڕن لە ڕازی دڵداری، مژدێکی بۆ من تێدا بوو؛ کە: نامەی منت هەر بۆ دێن. دڵت خۆش بێ... ئەی من چیم کرد؟

**۵**

| | |
|---|---|
| مە ژ دەسخەتا تەرحێن شەلال | خال و خەتێن نوورا زەلال |
| دانی د سندووقان ل بال | مالێ مە سەد قینتارێ خەت |

**مانای وشەکان:**

**تەرح**: لکی شلک و نەمام؛ **شەلال**: خەمڕەوێن؛ **شەلال**: لقی باریکی لووسی کەمگەڵا؛ **دانی**: دانا؛ **ل بال**: لە کن؛ **بال**: دڵ؛ **مالێ مە**: ماڵیمەوە؛ **قینتار**: وەزنێکە بەرانبەر بە دوسەت‌وپەنجاوشەش کیلۆ و چوارسەد گرەم.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هاتین ئەو دەسخەتە خەمڕەوێنەی کە کرابوو بە تۆمارێک، وەک لکەدار، یان نەمامێک دەبیندرا کە لە گەڵا ڕووت کرابێ و لە ناویدا، نوختە و خەتی یاری تێدا -کە وەک لە ڕووناکی و نووری خودا نەخشرابێ، وا بوو- نامانە ناو سندووقخانەی دڵمانەوە و لە گۆشەی دڵدا، هەڵمانگرت و نەمانویست لە لامان لا چێ. دوای هاتنی ئەو نامەیە، سەد قینتار کتێبی دەسخەت، کە بەر دڵم کەوتبوون و لە بەرم بوون، بە کتێبەوە و بە زانستی ناو دڵمەوە، هەمووم یەکجاری مالییەوە و جگە لەو خەتە پیرۆزە، هیچی نەما و گشتی لە بیرم چوونەوە.

٦

بەرگێن گولا ڕەیحانیێ — کاتب نموچەک دانیێ
کەس دی ب وێ شیرانیێ — دەر سەنعەتێ جەبارێ خەت

**مانای وشەکان:**

**بەرگ**: پەلک؛ **ڕەیحانی**: وەک ڕیحانە، جۆرە خەتێکە؛ **نموچەک**: نموونەیەکی پچووک؛ **شیرانی**: شیرنایەتی؛ **سەنعەت**: دەسکرد؛ **جەبار**: قەرەبوودەر؛ **جەبار**: شکستەبەند؛ **جەبار**: بەرزێ کە دەست پێی ڕاناگات؛ **جەبار**: دەسەڵاتداری سەربەخۆ. **جەبار**: ناوێکی خوایە.

**پوختەی مانا:**

ئەو قاقەزەی کە خەتی دەستی یاری لەسەر دیار بوو، پەیکی گوڵ بوو بە شێوەخەتی ڕەیحانی و بەرامەی گوڵ و ڕیحانەی بڵاو دەکرد. جوانی و خۆشی خەتی دەستی- کە دەبووە شکستەبەندی دڵشکاوان- لە ناو خەتان، هێندە تەرز و پایەبەرز بوو، دەستی هیچ بنیادەمێکی نەدەگەییە. بەڵام هونەری خۆی نەبوو، نموونەی کاری خەتخۆشی ئەزەلی بوو. خوا سیمای ڕوخساری یاری بە جوانترین خەت، خەت داوە. ئەویش لە بەر ئاوێنەدا ڕوانیوویەتە خەتی توانایی خودایی و توانیویەتی نموونەیێکی زۆر گچکەی لە سەر قاقەز نیشان بدا. ئەو شیرنایەتی و جوانییەی، لەو نامەیە دەبیندرا، دیارە کاری خوای جەبارە و لەبەری نووسراوەتەوە.

٧ ڕیحـان و سـونبول تـێ هەنـە سەد چیچەک و گـول تێهەنـە
زەربـاڤ و بولبـول تـێ هەنـە ئەو بەغچـەیا گـولزارێ خـەت
٨ گولچیچـەک و نەقشـێن غـەریب نەسـرین و ڕەیحانـێ عـەجیب
لێ ڕاستوچەپ بوویێن سـەلیب جەدوەل کەشـێنزوننارێ خـەت

**مانای وشەکان:**

**زەرباڤ**: زەردەزیرە، قەناری؛ **سەلیب**: خاچ؛ **جەدوەل**: جۆگەئاو، چەمـەک؛ **جـەدوەل**: خەتدانی خانە-خانە؛ **جەدوەل**: جەغزی بە جەغزینگ کێشراو.

**پوختەی مانا:**

هەر وەک ڕیحانە و سونبولی زولفەکانی خەتی ڕیحـانی و بۆنخۆشـی، گولـی پشـکوتووی سەرچلی گەش و ئالی بە ڕەنگی کولمە و لێـوانی، نامەکـەیان وەک گولـزاری ڕوخسـاری ڕازاندۆتەوە. تەنانەت لە خوێنەوەیـدا، خـوڕەی ئـاوی چـەم دەبیسـم. دەنگـی قـەناری و بولبولان کە وەک ئێمە دڵیان لە پەڕی گوڵانە، دێتە بـەر گـوێی گیـان و دڵان. خەتـەکان هێنـدێ وەک زولفـی، تێکپـەڕیون و وێنـەی خـاچن؛ هێنـدێکیان وەک تاڵـەکەزی کەمبەرگری لە وێنەی زوننار دەنوێنن. گشتی هانەی هەستم دەدەن، کە وەکـوو شـێخی سەنعانیی، چەلیپا و خاچ بپەرستم و لە ڕێی یار، زوننار ببەستم. دەیسا ئەگەر دەڵێم نامـە، نامەخوا لە ڕووی خەتی خوا هەڵگیراوە. بێگومانم، باش دەزانم دەسکردی بەندە وا نایە.

٩ ئـیرۆ سـەحەر توغرانیشـان ئیعـراب و حـەرفێن زەرفشـان
هـاتن دگـەل بایـێ سـەبان مـە ژ جانبـێ دلـدارێ خـەت
(یان: بایێ سیبان)
١٠ ئـیرۆ بـەراتا ئەحمـەدی توغرانیشـان زەرکـەش مـە دی
خەتتێ هومایوون کـێ وەدی شـیرین و مـەعنادارێ خـەت

**مانای وشەکان:**

**توغرا**: مۆری تایبەتی سوڵتانان؛ **ئیعراب**: بەیانی مەبەست؛ **ئیعراب**: بزاوی سەرپیتان؛ **حەرف**: کەنار و پیت؛ **زەرفشان**: زێڕ وەشێن؛ **سەبا**: ئارەزوو، تاسە؛ **سەبا**: شنەی ڕۆژهەلاتی؛ **سەبا**: دڵبەری؛ **سیبا**: منداڵی؛ **سەب**: عاشق و دڵدار؛ **بەرات**: خەلات؛ **بەرات**: خەلاتنامەی پایەبەرزان؛ **بەرات**: نازناوی شەوی نیمەی شابان کە شەوێکی زۆر پیرۆزە و خوا ڕۆزی تێدا بەش دەکا؛ **خەتی هومایوون**: دەسخەتی سوڵتان.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ لە بەرەبەیاندا، دەگەڵ هەنگووتنی سروە، بە دەستی کیژێکی جوانی تەڕوتازە، نامەیەک کە هەموو عومرم بۆی بەتاسە و ئارەزوو بووم، گەییە دەستم. نامەی خەلات و بەرات بوو، لە شەوی جێژنی بەراتا، لەلایەن پێغەمبەرەوە(د) بۆ هاوناوی- کە ئەحمەدە- ناردرابوو؛ مۆری سوڵتانی جوانانی لێ درابوو؛ بە زێرکفت نەخشێنرابوو؛ هەموو بزاو و مەبەست و پیتەکانی خوێنەریان زێڕەوشان دەکرد. کێ بێ خەتی تایبەتی هیچ سوڵتانێکی دنیایی، وا شیرین و پڕ لە مانا و جوان و ڕەوانی دیتبێ؟ خەنی لە خۆم؛ خەلات کرام!

٨

«الله» د بەر قالوو بەلێ | دا یەغمەکت قەلبێ «مەلێ»
ئاڤیهتە چەرخێ جەدوەلێ | ئەف ڕەنگە عەنبەرباریێ خەت

**مانای وشەکان:**

**د بەر**: لە پێش؛ **قالوو بەلێ (بەلا)**: گوتیان ئاری؛ (خوا کە گیانی دروست کردن، بەر لە چوونە لەش لێیپرسین: ئایا من خودای ئێوە نیم؟ ئەو گیانانەی پاک خولقابوون، گوتیان: ئاریێ تۆ خوای ئێمەی. ئەوانەش کە پیس گوورابوون و دەبوو بە کافری بمرن، گوتیان: نا تۆ خوای ئێمە نیت؛ **چەرخ**: سووڕان، خول.

**پوختەی مانا:**

گیرۆدەییم بە دوای بسکی سەلمایە، کاری خوایە و لە دەستەلاتمدا نییە. بەر لەو

ڕۆژەی کە خوا گیانان درووس بکا، بڕیاری دا من لە ناو جەغزی دڵداری ئـەو کیـژەدا، سەرگەردان و گێژ و وڕ، بسووڕێمەوە و بە دەوری خۆمـدا خـول بخـۆم. بەڵـێ بـۆن و عەنبەری کەزی دڵبەریشم، خەتێکی دەستی خودایە؛ کە فەرمانی گرتنی منی تێدایە.

«نالی» دەڵێ:

بێفایدەیـــە مـــەنعی مـــن ئێســـتاکە لـــە گریـــان

بـــۆ عاشـــقی بێچـــارە زوو ئـــەم ئـــاوە ڕژاوە



## شەپۆلی خوێن

ا	خـوون کـو ژ دل ب مـەوج بێـت	ئەشکێ ڕەوان مە تێنـە خـەت (خـط
(یان: ئەشکێ ڕەوان مە تێن ب شەت)
نیــــل ژ دیـــــدەیان دزێـــــت	کەفتمـــە ناڤـــێ شـــوبهێ بـــەت

**مانای وشەکان:**

**ئەشک**: ئەسرین؛ **رەوان**: گیان؛ **رەوان**: جاری؛ **نیل**: خم؛ **نیـل**: ڕووباری میسر؛ **بـەت**: مراوی.

**پوختەی مانا:**

دەریای دڵم کە دەکەوێتە فەرتەنە و شـەپۆل دەدا؛ فرمێسـکی ڕوون لـە سـەرچاوەی چاوی گیانمەوە سەردەکا و ڕیز دەبەستێ و پاڵەپەستۆی یەکتر دەدا و لـە چاوانمـەوە هەڵدەڕژێ و ڕووباری نیل، دروست دەبێ و من لەو ناوە، وەک مراوی بە سـەر ئـاوەوە خول دەخۆم.

٢	کاتبـــێ نەقشـــێ قودرەتـــێ	زێـــڕ ڕەشـــاندی ســـەر خـــەتێ
	ئـــەرزەن و دیم و جەبهـــەتێ	پـــێ نەقشـــاند و کـــر نوقـــەت
٣	جەبهـــەت و دیمـــێ نەققشـــاند	میسـک و زەبـادێ لـێ ڤەشـاند
	نـــووری ژ زولمـــەتێ ڕەشـــاند	تازە کشـاندی خـەت ب خـەت

**مانای وشەکان:**

**رەشاند**: پرژاند؛ **خەت**: سنوور؛ **سەرخەت**: سەرسنوور؛ **ئـەرزەن**: چەناگـە، ئـەرزینگ؛ **جەبهەت**: توێڵ؛ **تازە**: زۆر جوان و پەسند.

**پوختەی مانا:**

وێنەکێش و نووسەری قودرەتی خودا، بۆ نموونەی دەسکردی جوانی هەرە جوان، یارەکەی درووس کرد. هەروەک ڕووپەڕەکانی قورئان، بە زێڕکفت دەنەخشێنرێن، ئەویش دەوری ڕوخساری یاری دڵبەرمی، بە زەردایی لە سەر سپی، ڕازاندەوە. لە ناو تاریکایی خەستی کەزی و پۆڕی، تیشکی ڕووناکی لاجانگی پەرێشان کرد. تیشکی تاوێ لە سیلەی پڕایی کەزی، بە پرژاوی هاتە بەرچاو. چەناگە و هەنیە و کوڵمەکەی، لە گزمووڵەی زۆر بچووکی میسک و زەباد، شوێنی سنووری بۆ دانان و لەو ناوەدا، خەتوخاڵی بە جوانترین وێنە ڕشت و هەزاران دڵداری پێ کوشت.

۴ حوور و فرشتە کێ وە دین نازک و خووب و سوڕشیرین
دیمێ نموونە بەربکین سوورەتێ چین‌نوما غلەت

**مانای وشەکان:**

**خووب**: جوان‌چاک؛ **سوڕ**: دڵکێشی؛ **بەربکین**: لەبەری درووس کەین؛ **غەلەت**: هەڵە.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی حوور و فریشتەیان دیوە، با بێن بڵێن: کەی جوانی وەک سەلما هەبووە؟ کێ ئەوندە ناسک و جوان و خوێن‌شیرین و دڵگیر دەبێ؟ ئەگەر لەبەر ڕووی سەلماوە وێنەیەک هەڵگرینەوە، وێنەکانی «مانی» نەققاش[1] لەبەرانبەر وێنەی ئەودا، پڕییە لە خەڵەتوپەڵەت.

۵ شیعری «مەلێ» کو وەک ڕەوان دایەتە جانی مەرۆڤان
پور مە ل بەرگێ ئەرغەوان دینە غەزەل ل نک شەتەت

**مانای وشەکان:**

**ڕەوان**: گیان؛ **جان**: گیان؛ **مەروڤ**: مرۆ، بنیادەم؛ **شەتەت**: دوور لە ڕاستی.

---

١. پێغەمبەری چینێ کە مۆجزاتی، وێنەکێشانی بێ‌هاوتا بوو.

**پوختەی مانا:**

شیعری مەلا، وەک گیانی وانە؛ زۆری دڵمردووی بێئاگای وەگیان هێنا و فێری دڵداری کردن و خستنیە سەر ڕێی خواناسی. زۆر غەزەل و شیعری وا هەن، زۆر بەڕێز و زۆر پڕمانان. وێژەوانان، لە پەڵکی ئەرخەوان ڕەنگا دەینووسنەوە و بە دیاری دیدەن بە یەکتر؛ بەڵام گشتیان لە بەرانبەر شیعری مەلا، پڕ هەڵە و لە ڕێ لادەرن.



# کوانێ غەلەت

| | |
|---|---|
| ١ | مەی نەنۆشی شەیخێ سەنعانێ غەلەت (غَلَط)<br>ئەو نەچوو نیڤ ئەرمەنستانێ غەلەت |
| ٢ | میسلێ مووسا وی تەجەللایا تە دی<br>ئێ تو دی کانی خەتا هانێ غەلەت |

**مانای وشەکان:**

**کانێ**: کوانێ؛ **هانێ**: کێهە، کامە؛ غەلەت (غَلَط): هەڵە.

**پوختەی مانا:**

شێخی سەنعانی، چیرۆکی لە کتێبی «*مَنطِقُ الطَیر*»ی عەتاردا هاتووە. شێخێکی سەر بەرماڵ بووە و زۆر مرید و دەرویشی بوون. ڕۆژێک سەری هەڵگرتووە، ڕووی کردۆتە هەرمەنستان. چاوی بە کیژێک کەوتووە و عاشق بووە. کیژە هەرمەنی گوتوویە بەو مەرجە دەبم بە یارت، لە دینی ئیسلام واز بێنی؛ پەڕی قورئان بسووتێنی؛ زوننار لە پشتت ببەستی؛ مەستی بکەی؛ ببی بە بەرازەوانی من. شێخی دڵدار، هەموو مەرجەکانی یاری بە گیان و دڵ پێک‌هێناوە. تا ڕۆژێکیان شێخی چازان واز لە بەرازان دەهێنێ و ڕۆژی ئیمان، تیشکەی دەداتەوە دڵ و کوڵ دەیگرێ و دێتەوە سەر دەقی پێشووی. کیژی دڵبەر، کە بە دڵ گیرۆدەی شێخە، شوێن نچیری خۆی دەکەوێ و بازی دڵداریی خودایی ڕاوی دەکا و دەیکا بە قەرەواشی شێخ.

مەلا دەڵێ: شیخی سەنعان، کە گەییە ئەرمەنستان و بادەی لە دەستی چاومەستان فڕ کرد، هەڵە نەبووە. هەروەک مووسا لە چیای توورا، خودا نووری خۆی نیشان دا؛ خوا لە ڕوخساری ئەو کیژە هەرمەنییەدا دیاری داوە و شێخ بە تیری خوا پێکراوە. دەیسا خەڵەت لە کوێدایە.

٣ وێ نـــەدی بـــەژنا تـــە و دایـــێ قیـــاس
حیکمـــەتێ لـــەو چوویـــە بورهانـــێ غەلـــەت

**مانای وشەکان:**

**وێ**: ئەوی؛ **قیاس**: بەراورد؛ **حیکمەت**: زانینی شت لە ئەندازەی توانای مرۆ؛ **بورهان**: بەڵگە و دەلیل.

**پوختەی مانا:**

ئەو کەسەی چاوی بە بەژنت ڕۆشن نەبووە و تۆی نەدیوە و هەر لە ئەندازەی عەقڵی خۆی، لە تۆ دەدوێ و بە بەڵگەهێنانەوەی زۆر و بەراورد کردن دەگەڵ شت، لای وایە دەزانێ چۆنی، زۆر هەڵەیە و تا نەتبینن نازانن چیی. خوا فەرمویە: «هیچ شتێک وەک خودا نییە.»

٤ ســـەتوەتا لـــەیلێ یـــەقین مـــەجنوون تەپانـــد
وەرنـــە قـــەیس ناکـــەت بیابانـــێ غەلـــەت

**مانای وشەکان:**

**سەتوەت**: دەست بەسەراگرتنی زۆرەکی؛ **مەجنوون**: شێت؛ نازناوی قەیسی عامیری کە عاشقی لەیلێ بووە و بۆی شێت بووە و ڕووی کردۆتە بیابان و سەرگەردانی دڵی بووە؛ **تەپاند**: تووش کرد؛ **وەرنە**: ئەگینا.

**پوختەی مانا:**

دەستی زۆرداری دڵداریی لەیلایە بوو کە مەجنوونی تووشی تووشی و خەمباری کرد؛ ئەگینا قەیسی ماڵوێران نەدەکەوتە بیابان و بە شێت ناوی دەرنەدەچوو.

٥ وەک «نیشانی» نـەقش و نیشـانەک تـە دی
ئـێ کـو نیشـانەک تـە دی کانـێ غەلـەت

**مانای وشەکان:**

**نیشانی**: نازناوی مەلایە؛ **نیشانە**: درۆشم؛ **کانی**: کوانێ.

**پوختەی مانا:**

مەجنوونیش هەروەکوو مەلا، نیشانێکی لە جوانی تۆ ئەی خودایە! لە رووی لەیلایەدا دیوە. هەرکەس هەڵوەدای نیشانەی جوانی تۆ بێ، هەرگیز ڕێگەی خەڵەتی هەڵنەبژاردووە.

٦ ئەز گەهام ئاڤا حەیاتێ خەف ژ دل
خوزر ڤاژی چوویە حەیوانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**گەهام**: گەیشتم؛ **خەف**: نهێنی؛ **خوزر**: خدری زیندە؛ **ڤاژی**: بەراوەژوو؛ **حەیوان**: ئاوی حەیاتێ.

**پوختەی مانا:**

من بێئەوەی کەس بزانێ، لە ڕێگەی دڵی خۆمەوە، تووشی ئاوی حەیاتێ بووم. دیارە خدر، کە لە دنیا بۆی گەڕاوە، بەراوەژووی لێ تێگەیوە و هەڵە بووە.

٧ شانشینێن نازکان زایع مەکون
دا نەبێنی دل ب ڤێ خانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**شانشین**: باڵەخانە، تەختی پادشا؛ **زایع**: گوم؛ **مەکون**: مەکە؛ **دا**: تا؛ **نەبێنی**: نەبەستی؛ **خان**: کاروانسەرا.

**پوختەی مانا:**

چاوت لە دیداری یارت مەترووکێنە و ئاوڕ مەدە سەر دنیایە! ئەگینا وەک ئەوەت لێ

دێ کە شانشینی نازداران بەجێ دێڵێ و دڵی دەگرۆی کاروانسەرایەکی وێران و بۆگەن دەبەستێ.

٨ ئــەللەهـ ئــەللەهـ چـــەرخ و دۆلابـــێ دنـــێ
نوقتــە قــەت ناکــت د دەورانـــێ غەلـــەت

٩ ڕوزو شــەب هــەر ســەیرێ دیــدارا تــە تــێن
نـــاکرن ئـــەو دەور و ســـەیرانێ غەلـــەت

١٠ هــوون نــەبێن مەششــاتەیی خــەف دانییــە
هــەمقیران کــرد خــاڵ و نیشــانێ غەلــەت

**مانای وشەکان:**

**دۆلاب**: خەرەک؛ **سەیر**: تماشا؛ **سەیر**: گەڕان؛ **مەششاتە**: بە شانەکەر، بووکڕازێنەوە؛ **دانییە**: دایناوە؛ **هوون**: ئێوە؛ **نەبێن**: نەڵێن.

**پوختەی مانا:**

ئەی نامەخوا خەرەک و چەرخی دنیایە، چەند تــەکووز و ڕێکوپێـک دەسـووڕێتەوە و هەرگیز بە قەت نوختەیەکیش، هەڵە نابێ. ئەی خودایە! ئەو شەو و ڕۆژەی کە دادێن، دێنە سەیرانی جوانی تۆو لەو بە شوێن یەکدا هاتنەیان، هــەرگیز هەڵــەیەک ڕوو نــادا. ئەی ئەوانەی لاتان وایە شت دەزانن! نەچن بڵێن بەرانبــەر بــە یــەک کــردنی خــاڵ و ڕوخساری جوانان لە دنیا، ڕازێکە و دەستی وەستاکار نەیگەیوەتێ و بۆ خۆی، لە خۆوە ڕسکاوە. خوایەک هەیە کە هەر شتەی لە شـوێنی خۆیـدا دانـاوە و زانایەکـە هــەرگیز هەڵە ناکات.

١١ دێ ب ســەر جانــێ مــە مــوروەت دامــەئێخ
بشـــکوێن بەنـــدا گریبانـــێ غەلـــەت

**مانای وشەکان:**

**دێ**: دەسا؛ **ب سەر**: لە سەر؛ **مورووەت**: پیاوەتی؛ **دامەئیخ**: دامەخە؛ **بشـکوو**: قۆپچـە؛ **گریبان**: یاخە، پێسیر.

**پوختەی مانا:**

دەسا ئەی یار! بەزەت پێماندا بێتەوە و پیاوەتیمـان دەگـەڵ بکـە. قوپچـەی یەخـەت جارێک ـهەرچەند بە هەڵەش بێ ـ لە ڕووی چاوی دڵداران دامەخە! با سەیرت کەن و سەبووری بە دیدارت پەیدا بکەن.

١٢ سـەر نـەبی بـەر کـوفری زولفـێ عاقیبـەت
ئـەز دترسـم لـێ ژ ئیمانـێ غەلـەت

**پوختەی مانا:**

کابرای دڵدار! ئەگەر سەرت بەرانبەر بە کوفری زولفـی ڕەشـی دڵـبەر دانـەنوێنی، زۆر ترست لە ئیمانت بێ کە لەڕێگەی خواناسین بە هەڵە چووبیت.

١٣ پـەهنیا ڤـێ چـەرخ و دولابـێ دنـێ
نیسـبەتا ئـەربابێ عیرفانـێ غەلـەت

١٤ نوسـخەیێ عالـەم هـەمێ عینوانەکـە
نوقتەیـەک نابـت د عینوانـێ غەلـەت

**مانای وشەکان:**

**پەهنی**: پانایی، هەراوی؛ **دنێ**: دنیا؛ **نیسبەت**: لە گوێرەی؛ **ئەرباب**: خاوەنان؛ **عینـوان**: ناوونیشان.

**پوختەی مانا:**

پانایی و هەراوی دنیا و چەرخ و خەرەکی ئاسمانان- کە زانایان دەیکـەن بـە بەڵـگەی بوونی خوا- لە لای ئەوانەی خواناسی بەراستینە، بەڵگەیەکی زۆر هەڵەیە. هەرچی لـە

سیایی دنیادا، ئافەریدە جێ کراوە، بە تێکڕایی درۆشمێکی بچووکی خوداناسینە و لەو درۆشمەشدا هیچ هەڵە ڕووی نەداوە.

۱۵ قولــوزم و بــایێن موخــالیف تــێ پــورن
دا نەکەلشــێن دارێ ســوککانێ غەلــەت
۱۶ دا بــــزانی پەهلــــەوانی موویــــەکێ
دەســت نــەدی لیلاهــی میزانــێ غەلــەت

**مانای وشەکان:**

**قولوزم**: دەریا؛ **بای موخالیف**: بای پێچەوانە؛ **تێ**: تێدا؛ **نەکەلشێن**: نەقەڵشێن؛ **سوککان**: ئامرازی گەمیە ئاژۆتن؛ **پەهلەوان**: تەنافباز؛ **میزان**: ئامرازی ڕاستەوپاستە کردن.

**پوختەی مانا:**

ئەی ڕێڕەوی ڕێگەی خواناسینی بەڕاست! باش بزانە کە تۆ لە ناو دەریادای و بای پێچەوانەش زۆر هەیە. دەبێ زۆر ئاگات لە خۆت بێ. نەچی لە خۆت بایی ببی و خۆت بە تەنافباز بزانی و بڕوات وا بێ کە دەتوانی گەمیەی ئاوات، بە بێ وەستا، لەو دەریایەدا دەرانی و تووشی هەڵەوپەڵە نایەی. دەغیلت بم نەکەی بە ئەندازەی موویەک، دەست بۆ ئامرازی گەمیەکەی ئەم ناوی دەریایەت بەری. بترسە داری سوککانی، لەوانەیە قەڵش بەرێ و لە گێژاودا سەر دەرنەکەی.

۱۷ وێ ددەســتێ مــن گولاگــەش پــوڕ خونــاف
حــەیف بولبــول چــوو گولســتانێ غەلــەت

**مانای وشەکان:**

**پوڕ**: تژی، پڕ؛ **خوناف**: ئاونگ.

**پوختەی مانا:**

ئەوی ڕێڕەوی عیرفانە و دەیەوێ یاری ببینێ، با بێتە لام. من دەزانم یار لە کوێ و چۆن دەبیندرێ.

دڵم بە بوڵبول دەسووتێ، کە بۆ دیتنی گوڵ دەچێتە ناو باغچۆڵان. گوڵی گەشی پڕ لە ئاونگ، وا لە ناو لەپی مندایە و ئەو بە هەڵە چۆتە جێی تر.

**١٨** هێژ سەهوا خامەیێ بوو وەرنە من
ئەڤ غەلەت ناکرد دیوانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**هێژ**: هێشتا؛ **سەهو**: هەڵە؛ **خامە**: قەڵەم؛ **ناکر**: نەدەکرد؛ **دیوان**: بارەگای گەوران؛ **دیوان**: کتێبی شیعران.

**پوختەی مانا:**

من کە ئەم ڕازەم دەربری و لە دیوانەکەمدا نووسیم، گەیشتوومە گوڵی گەشی پڕ لە ئاونگ. هەڵە لە قەڵەمەکەم بوو. دەنا من کە زۆر شارەزای دامودەستووری بارەگای یارە تاقانەکەی خۆمم، قەت ئەو هەڵەم لێ ڕوو نادا کە ڕازی دڵ بدرکێنم.

**١٩** وێ ل سەر بەژنا تە ئەڤ سەیوان ڤەدا
وەرنە نادا ڕۆژ سەیوانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**سەیوان**: هەرچی سێبەر ئەدا، چەتر، کەپر؛ **ڤەدا**: هەڵی دا؛ **وەرنە**: ئەگینا.

**پوختەی مانا:**

ڕۆژ کە هەموو ڕووناکییە و ناشێ سێبەر لە هیچ لا خۆی لە بەر بگرێ، ڕێگە دەدا سێبەر هەبێ تا بەژنی تۆ لە گەرمایە بپارێزێ. واتا هەڵە لە ڕۆژەوە ڕووی نەداوە؛ پێی سپێراوە وا بکا.

**٢٠** گەه دل و گەه جان دبن تورکێن تە تێن
ناکرن یەغما و تالانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**گەه**: جار؛ **تورک**: مەبەست چاوە؛ **یەغما**: تالان.

**پوختەی مانا:**

تورکی چاوت، دێنە تالان. جارێ گیان و جارێ دڵمان لێ دەسێنن، دەیرفێنن. تاقە جارێکیش نەماندی واز بهێنن و هەڵەیەک لەکاریاندا بێ.

**٢١** مەشرەبێ تورکان فورات و نیل کر
تەشنەلەب چوو تەرفێ عوممانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**مەشرەب**: جێگەی وەخواردن؛ **تورک**: لێرەدا بە مانا زۆرکارە و لەوانەشە هەر مەبەست تورک زمان بێ کە زۆر ساڵان نیل و فورات هی ئەوان بوو.

**پوختەی مانا:**

باس لێردەدا لەسەر بەشی خوداداوە. تورکی دڵڕەق لە سەر نیل و فوراتێ ئاو دەخۆنەوە و ئەوانەش کە لێویان وشکی تینگییە؛ بە هەڵە دەچنە سەر لێوی دەریای عومانی تاڵ و سوێر بۆ ئاو خواردن.

«نالی» دەڵێ:

سەهم و نەسیب ئەسڵییە باسی گیا و گڵ نییە
تووتنە خەرجی سووتنە مۆدنە ماچی لەب دەکا!

**٢٢** پیرێ حیکمەت بین ل ویفقا مەشرەبان
کەس نەدی مەی ڕێهتە فینجانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**ویفق**: بەپێی، بە گوێرەی؛ **مەشرەب**: تەبیات و واز؛ **ڕێهت**: ڕژتی.

**پوختەی مانا:**

پیری مەیخانەکەی ئێمە- کە زۆر وردبین و زانایە- لەو ساوە مەیمان دەداتێ، بۆ هەر کەسەی بەرانبەر بە تەبیاتەکەی، بادە دەدا. کەس نەیدیوە قەت بە هەڵە، مەی دەفینجانێک بڕێژێ و مەیەکە دەگەڵ تەبیاتی خۆرەوەکەدا نەسازێت.

**٢٣** ڕاستە یەک قانوون سەراسەر نینەتێ
خوەهری و پێچێن، پەریشانێ غەلەت

**٢٤** پاک تەبع و قووەتەک مەوزوون دڤێت
دا نەدەت سەنعەت ب ئیدمانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**خوەهری**: خواری، لاری؛ **پەریشانی**: بڵاوی؛ **مەوزوون**: ڕێکوپێک؛ **ئیدمان**: خۆ پێ گرتن.

**پوختەی مانا:**

پیری مەیخانەکەی ئێمە- کە باسم کرد- دامودەستوورێکی وەهای لە مەیخانەدا داناوە کە هەرگیز خواری و بڵاوی و پێچ و لاری، لە کەسەوە هەڵنادات. ئەم قانوون و زاکوونەشی، نیشانەی هیممەتی بەرز و توانایی و هێزی زۆریەتی؛ کە هەرگیز قازانج و سوودی پیشەکەی خۆی، دەپێناو هۆگر گرتن و خۆ پێ گرتنی چەلومل، نادۆڕێنێ و هەڵە ناکا.

**٢٥** مەردومێن چەهڤێن مە لێ عەکسا خوە دی
وەک «نیشانی» مال نیشانێ غەلەت

**مانای وشەکان:**

**مەردوم**: بیبیلەی چاو؛ **مە لیٚ**: ئیٚمە لەو؛ **عەکس**: ڕەنگدانەوە؛ **نیشانی**: نازناوی مـەلا؛ **نیشان**: خاڵ.

**پوختەی مانا:**

مەلای دڵدار کە دەیڕوانییە ڕوخساری یار، لە ئاویٚنـە ڕوونـاکتر بـوو. شکڵـی بیبیلـەی چاوی خۆی، لە ڕوخساری یارا دەدیت. وای زانی خاڵی سەر گۆناس. بە غەڵەت چوو.
«حەمدی» دەڵیٚ:

بـازاڕی دەهـــرە قیمـــەتی ئەشـــیا بـــە جیٚگەیـــە

میٚشـیٚ گەییشـتە ڕووی نیٚگـاریٚ لـە خـاڵ ئـەچیٚ



## ئاگری ڕەوان

١ بێ لەبێ لەعل «مەلا» من ژ مەیا ناب چ حەز (حَظ)؟
سوحبەتا تێ نەبتن یار ب هەرحال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**ناب**: بێخەوش؛ **حەز**: بەش، بەهرە؛ **سوحبەت**: کۆڕی هەوالان.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر ئەو لێوە ئاڵە، ڕەنگ لاڵەم لێ دیار نەبێ، من چ دڵخۆشیم بە مەی بێ؟ جا با ئەو بادەش بێخەوش و زۆر نایاب بێ. ئەگەر یارم لە کۆڕی یاراندا نەبێ، با ئەو کۆڕە بەهەشتیش بێ، من هیچ خۆشی لێ نابینم.

«نالی» دەڵێ:

شەرابی لەعلی ڕوممانی لە نالی حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان

«سەعدی» دەڵێ:

هێندە گێل نیم فێر نەبووبم چی حەرامە و چی حەلاڵ
مەی لەگەڵ تۆدا حەلاڵە و بێ تۆ ئاوم لێ حەرام[1]

٢ قەدەحەک بادە ب دەستێ خوە ل قەلبێ مە برێژ
عاشقێ سووختە بێ ئاتەشێ سەییال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**سووختە**: سووتاو؛ **ئاتەش**: ئاگر؛ **سەییال**: ڕەوان، جاری.

---

١. من آن نیَم که حلال از حرام نشناسم شراب با تو حلال است و آب بی تو حرام

**پوختەی مانا:**

گڕم گرت لە ئەوینی تۆ؛ دڵم هەمووبۆتە پشکۆ. لەو مەیە زۆر مەستیهێنەی کە وەک ئاگر، بەڵام ئاگرێکی ڕەوان، هەر پریشک و ئاورینگی لێ دەبێتەوە، پیالەیەک ئەگەر نەرێژییە ناو دڵ، کوڵوکۆم دانامرکێتەوە.

٣ نەکوو وەک تەیر ژ موژینی تە ببارن پەیکان

(یان: ژ ڕەمزێن تە)

ژ برینێن د دلێ شوبهەتێ غیربال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**تەیر**: باڵدار، وێشدەچێ نیازی تەرنەبابیلە بێ، کە لەشکری ئەبرەهەی پادشای یەمەنیان سەنگباران کرد؛ **تەیرۆک**: تەرزە؛ **موژینیتە**: مژۆڵانی تۆ؛ **ڕەمز**: ئیشارەت؛ **غیربال**: بێژنگ، قەڵبیر.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لە مژۆڵەکانتەوە، بە فەرمانت، پەیکان وەک تەرزە نەبارن بۆ سەر دڵم و بە دەردی پەیڕەوەکانی ئەبرەهەی یەمەنی نەبەن و هەمووئازای وەک بێژنگی کون-کون نەکەن، ئەو دڵە بەهرەی چی هەیە؟

٤ حەزز و لەززەت مە ب عومرێ خوە د عیشقا تە نەدی

هەم ب ڤان دەرد و غەمان زێدە تو ئیسال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**حەزز**: بەخت؛ **لەززەت**: خۆشی؛ **ئیسال**: ئەمساڵ.

**پوختەی مانا:**

لە هەموو تەمەنی خۆمدا، لە ئەوینی بالاکەی تۆ، هیچ بەختم نەیهێنا و خۆشیم هەر نەدیت. ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ خەم و دەردم پتر دەبێ. دەبێ ئەمساڵ بەختی کلۆڵ چیم بۆ بکا؟

«نالی» دەڵێ:

هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمساڵ
تەمەننای مردنی پێرارە بێ تۆ

5̄ حوسن و سورِ زاتی نەبت، جەزبە ل دل دەت مەحبووب
مە ژ زولف و خەت و خال و قەدی مەییال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**زاتی**: دەخۆیەتی خۆدا؛ **جەزبە**: ڕاکێشان؛ **مەحبووب**: خۆشەویست؛ **مەییال**: بەلەرە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر یار وەک بە ڕوو جوانە، لە دەوورنیشدا جوان نەبێ و بە دڵکێشی دڵمان بەرەو خۆی نەکێشی، تەنیا زولف و خەت‌وخاڵ و بەژنی زراوی بەهرەی چییە؟

6̄ عیلمێ عیشقێ بوت و لاتان ب ریوایەت نابت
قەدەرەک حال کو نەبت شوبهەتێ هەر قال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**لات**: ناوی بتێک بووە و لێرەدا هەر مانای بت دەگەیەنێ؛ **ریوایەت**: گێڕانەوەی باس؛ **قەدەر**: ئەندازە؛ **حال**: زانستی دەروونی؛ **قال**: گفتی سەرزمانی.

**پوختەی مانا:**

دڵ دان بە بت، پەرستنی جوانانی وەک بت، بە گێڕانەوەی سەرهاتی فلان و فیسارە دڵدار بەهرە نادا. گەرەک بە ئەندازەی وتار، لە دەروون و هەناویشدا هەست بە ئەویننداری بکەیت؛ تا تێبگەی حاڵی عاشق؛ نەک هەر هێندە کە تۆ لە خەڵکت بیستووە.

7̄ بە دەوێ پاک چ کەت فەسحەتێ مەیدان کو نەبت
موستەمیع گۆ نەدرت، موتریب و قەووال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**بەدەوی**: چۆلپەرست، سەحرانشین؛ **پاک**: سوارچاکی هونەرمەندی بێ عەیب؛ **فەسحەت**: گوشادی؛ **موستەمیع**: بیسەر؛ **گۆ نەدرت**: گوێدێر نەبێ؛ **موتریب**: بەزمگێڕ؛ **قەووال**: زۆربێژ، خۆشبێژ؛ **قەووال**: بەو مەلا گچکە یەزیدییانە دەڵێن کە بە مالانەوە دەگەڕێن و گۆرانی دینی دەڵێن و کرێی زمانیان دەستێنن.

**پوختەی مانا:**

ئەسپی عەرەب زۆر کەحێل و نەجیمزادەن. سوارچاکی زۆر چالاکیشیان لە ناو هەیە. مەیدانی ئەسپ غاردانێ ئەگەر نەبێ، سوار چۆن هونەری خۆی دەرخا؟ با بەزمگێڕ، با قەووال زۆریش بزانن؛ ئەگەر کەس گوێیان لێ نەگرێ، کام بەهرە و بەشیان پێ دەگا؟

**٨** دوڕڕێ ناسوفتە دبێژم ژ لەبێ لەعل «مەلا»
گەر ڕەوانبەخش نەبت نەزمێ کەرولال چ حەز؟

**مانای وشەکان:**

**دوڕ**: مرواری درشت؛ **سوفتە**: سواو، سماو؛ **نەزم**: هۆنراو.

**پوختەی مانا:**

مەلا! شیعرت دەربارەی لێوی ئالی یار، وەک مرواری سەرمۆر و دەستلێنەدراوە. بەڵام ئەگەر هۆنراوەکەت گیانی بیسەر نەبزوێنێ و گیان وە بەر وشکەسۆفیانی دوورەدڵداری نەهێنێ، قسە بۆ کەڕولاڵ دەکەی؛ کە هیچ بەهرە ناگەیەنێ.
شاعیرێک نایناسم دەڵێ:

خەڵکیی هەموو کەڕن، منی خەودیتە بێ زوان
توانام نییە بڵێم و بڵێم؛ نایبیەن ئەوان



# موبتەلای زولف

١ سـەر ددت ئابـیٚ کەوسـەریٚ    زەمزەمـە و سـەمایێ زولف(زێلـف)
سـایەنومایێ خـاوەریٚ    سـیدرەیێ مونتـەهایێ زولـف

**مانای وشەکان:**

**سەرددت**: سەر دەگەیەنێتە؛ **کەوسـەر**: چاوەکانییەکـە لـە بەهەشـت؛ **زەمـزەم**: ئـاوێکی پیرۆزە لە مەککە؛ **زەمزەمە**: دەنگی سەبر و ویرەویر؛ **سەما**: ئاسمـان؛ **سـەما**: هەڵـپەڕکێ؛ **سایە**: سێبەر؛ **خـاوەر**: خۆرهەڵات؛ **زولـف**: نزیکـی؛ **زولـف**: پێشـکەوتن؛ **زولـف**: قـەدر و حورمەت؛ **زولـف**: بەشـێک لـە شـەوی لای بـەیان؛ **زێلـف**: باغچـە؛ **سیدر**: داری کنـار؛ **سیدرەتولمونتەها**: دار کناری ئەو بەر، دار کنارێک لە لای ڕاستی عەرشی خوداوەیە.

**پوختەی مانا:**

بەژنی یارم وەک دارە کنارەکەی دەستەڕاستی عەرشی خوایە و هەموو بەرزایی دنیایی بەزاندووە. لکوپۆپی کە بریەتین لە پۆڕ و کەزی و بسکانی، کە بە دەم بای بسـکانەوە سەما دەکەن، سێبەر لە ڕۆژهەڵات دەدەن. واتا: لەو جێ کە ڕوخساری یار دەنوێنێ و خۆیان نزیک دەکەنەوە، تا سەریان دەگاتە سەر لێوکە چاوەی، ئاوی کەوسەرە و خوڕە و زەمزمـەی کەوسـەرێ و لـە خۆشـیانا تانـە دەزەمزەمـێ دەگـرێ. پرچـی ڕەشـی، نموونەیەک لە تاریکی نیوەشەوی لای بەیانە. ڕووی وەکوو باغچـەی بەهەشـتە و ئـەو بسکەی بە سەما کردن لەو باغچەدا، دێت و دەچێ. خۆی زۆر بەقەدر دەزانێ و لە هەر شت بەختەوەرتر و لەپێشترە.

٢ سـایەنومایێ جەبهـەتێ    نـەقش و خـەتێ ژ قودرەتـێ
نوقتـە و حـەرف و جەزمـەتێ    بـال و پـەرێن هومایـێ زولـف

**مانای وشەکان:**

**جەبهەت**: هەنیە؛ **نەقش**: نەخش؛ **حەرف**: پیت؛ **جەزمە**: زەنە؛ **هوما**: مەلێکی پیرۆزە کە دەڵێن سێبەر لە هەر کەسێک بکا، دەبێتە خونکار و پاشا.

**پوختەی مانا:**

هەنیە و ڕوخساری یاری من، بە دەستی قودرەتی خودا نەخشێنراوە و خەت دراوە. پڕە لە پیتی نوورانی. نوونی بەرەوژووری برۆی، صادی چاوی، ئەلفی کەپۆی، میمی دەمی، لەم لا و لەو لاش بە نوختە و زەنەی وردەخاڵ، دەورە دراوە. بۆ ئەوەی بە تینی تاوێ، ئەو تازەخەتدراوانە، کاڵ نەبنەوە، بسکی- کە وەک شاباڵی پیرۆزە وایە- سێبەر لەو بەهەشتە دەکا.

٣ باڵ و پەرێن سیفەت هوما سایە ل جەبهەتێ نوما
خەمری و لەف دچن سەما یەک ب یەک ئەو لبایێ زولف

**مانای وشەکان:**

**خەمری**: پەرچووکە؛ **لەف**: پێچراو؛ **لبا**: لەکن، دەگەڵ.

**پوختەی مانا:**

پرچەکانی بە تێکڕایی، بڵاوی و بادراوی و بسکی، وەک شاباڵی پیرۆزی مەلی پیرۆزەن. کاتێ لە بەر با دەلەرن، سێبەر سەر توێڵی دەخەن و لە خۆشی ئەو بەهەشتەیە دێنە سەما.

٤ نەترک و بەرگ و شەتریان رەقسە ژ رەنگێ خەمریان
باز و عوقاب و قومریان سەیرە سەحەر تەبایێ زولف

**مانای وشەکان:**

**نەترک**: مانگۆڵەی بنی لەرزانە؛ **بەرگ**: پەرەنگی زێڕوێنەی گەلا؛ **شەتری**: گولینگەی سەر؛ **عوقاب**: هەڵۆ؛ **قومری**: یاکەریم؛ **تەبایی**: ئاشتی؛ **تەبا**: دەگەڵ؛ **ژرەنگ**: وەکوو، لە چەشن.

**پوختەی مانا:**

کە سروە و شنەی بای بەیان لەو پرچ و بسکانە دەدا، وەرە سەیریٚ چلۆن بەزم و گۆوەندێکە! هەروەک پەرچووکە و بسکانی- کە دەلەرێن- خشلەکانی، بە گولینگە و مانگۆلە و لەرزانەکانی و ئەو زێڕانەی کە لە وێنەی باز و هەلۆ و قومرییانن، دەلەرنەوە و لە خۆشیانا سەما ئەکەن.

**۵** هەر مە ژ بورجێ سونبولە    پەنجە د سینە و دلە
دوور و دراز و موشکیلە    قیسسەیێ ماجەرایێ زولف

**مانای وشەکان:**

**بورج**: کۆشک؛ **بورج**: مەنزلگەی ئەستێرە لە ئاسمان؛ **سونبولە**: گولی دەغل؛ **سونبولە**: شکلی بورجێکە لە ئاسمان کە شەشەمین بورجی سالە؛ بە دیمەن چەند ئەستێرەیەکن بە تێکڕایی وێنەی کیژە عازەوێک دەدەن. وەک فریشتە دوو بالیشی لێ ڕوواوە. بە دەستێکی داوێنی بە لادا دەکا. زۆر لە زانای ئەستێرەناس ناویان ناوە «عەزرا» واتا کیژی شوو نەکردوو؛ **دراز**: درێژ؛ **موشکیل**: دژوار؛ **قیسسە**: چیرۆک؛ **ماجەرا**: ڕووداو.

**پوختەی مانا:**

ئەو کیژە تازە عازەبەی لەو شانشین و کۆشکەدا- کە لە ئاسمانی جوانیدا، وێنەی بورجی سونبولەیە و پرچەکانی وەک دوو شابالی فریشتە لە سەر تا پایان گرتووە- داوێنی بە لادا دەکا؛ وا دەزانم خەریکی کوشتنی منە. زۆر دەترسم وەک بابەدەم، دلی بۆ گولە گەنمەکەی بەهەشتی خوا بە هەلەی برد، دلە هەژارەکەی منیش، بۆ سەیری پرچی بادراوی، ڕکەی سینە هەلتەکێنێ و بێتە دەرێ. ئەوسا بە بێ دل بکوژرێم. لەو ترسانە، من هەمیشە دەستم بە سینە و دلمەوە و دلەتەپێم وێ کەوتووە. چیرۆکی من و کەزەی یار، وەک درێژی کەزیەکانی و تێک هالقانی تایەکانی، پڕ لە گرێ و ئالۆزاوە و زۆر دژوارە باس کردنی.

شاعیرێک نایناسم دەڵێ:

لــە شــەوی پرچەکــەتا گــازنی دڵ دوایــی نــەهات

لـە گلـەی بـەختی ڕەشـم ڕۆژی قیامـەت چ دەکا؟!

٦ بەســـتنە زولفـــێ دەر کـــەمین حەلقە ب حەلقە چــین ب چــین

یەغمـــــە دکـــن دلان نهـــین تێنـە یەقیـــن خـەتایێ زولـف

(یان: نینە یەقین)

**مانای وشەکان:**

**کەمین**: بۆسە؛ **یەغمە**: یەغما، تالان؛ **خەتا**: هەڵە؛ **خەتا**: وڵاتی خەتایە کـە بـە ئاسـکی میسک بەناوبانگە.

**پوختەی مانا:**

ناهەق نییە هەمیشە دەستم لە سەر دڵم بێ، لە ترسانا. ئاڵقە- ئاڵقە و چین لـە سـەر چین، کەزیەکانی بوونە داو لە ڕێگەی دڵان و دەیانگرن و دەیانکەنە ماڵـی تـاڵان. لـە هەموو لا بە داوەوە، بۆسە بۆ دڵ داندراوە. ناشتوانین خەتای ئـەو کـارە بخەینـە سـەر پرچەکانی. ئەوان وەک ئاسکی خەتایە بارەمیسک هەڵدەڕێژن. دڵی هەژار چـۆن بـەو بۆنوبەرامە خۆشە گێژ نەبن و نەکەونە داوەوە.

«نالی» دەڵێ:

زولفـــت لـــە قەدتـــدا کـــە پەرێشـــان و بـــڵاوە

ئەمـــڕۆ لـــە مـــنی شـــێفتە ئاڵـــۆز و بـــەداوە

٧ ڕۆم و عەجـــەم ژ هـــەر تـــەرەف جەنگ و سەواشـەوان ب خـەف

هیندی و زەنگی سەف ب سەف هاتنـــە بـــەر لیوایـــێ زولـــف

**مانای وشەکان:**

**سەواش**: شەڕ و پێکهەڵپرژان؛ **زەنگی**: قولەڕەشە؛ **لیوا**: ئاڵا.

**پوختەی مانا:**

لە هەردووک لا، ڕیزی پەرچووکە و بسکانی- کە بە دەم باوە دەلەرن- وەک لەشکری ڕۆم و عەجەم، تێک بەربن و پێکدا بدەن، لـە سـەروو تووشـی‌یەک دەبـن. وردەخاڵـە ڕەشەکانی- کە دەڵێی ڕەشی زەنگـین و لـە فلفـی هینـدی دەچـن- لـە بـن ئـاڵای پرچەکاندا، پەناگرتە و خۆ وەشارتوون.

۸ هەردەم و هـەر سـەعەت ژ نـوو پێتـــە د ســـینە نـــار و دوو
سـەبر و قـەرارێ مـن ژ کـوو عاشـق و موبتـەلایێ زولـف

**مانای وشەکان:**

**پێت**: گڕپە و بڵێسە؛ **نار**: ئاگر؛ **دوو**: دووکەڵ؛ **موبتەلا**: گیرۆدە.

**پوختەی مانا:**

من وا گیرۆدە و دلداری پرچی یارم، وا لە تاوان، بێ‌وچان و بێ‌ئـارام و بێ‌قـەرارم؛ کـە هیچ ئاگام لە خۆ نییە. ئاگر بەربۆتە هەناوم. وا سوتاوم هەمیشە و هەموو دەم لە نـوێ، گڕ و گڕپەی دڵی ژارم، لە سینەوە دێتە دەرێ و دووکەڵی هەناسەم بەرزە.

۹ زولفـــێ ســـیاهێ بێ‌وەفـــا قــەت مــە نــەدی ژ وێ ســەفا
کوشــتمە ئــەز ب ســەد جــەفا ئــاه ژ دەســت جـەفایێ زولـف

۱۰ زوور و فــــەقیر و موبتـــــەلا زاهیـــد و ســـۆفی و مـــەلا
کوشـــتنە ئــەو ب ســـەد بـــەلا کــەس نەکەڤـت بـەلایی زولـف

**مانای وشەکان:**

**وەفا**: ئەمەگ؛ **قەت**: هەرگیز؛ **سەفا**: خۆشی و ئاشتی؛ **جەفا**: ئازار؛ **زوور**: زویر، وەڕەز و نارەحەت.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هێندە بەو کەزیە ڕەشە هەڵدەلـێین، ئەونـدە خۆشمـان گەرەکـە، کـەچی ئـەو

نامانلاوێنێ و سەد بەلامان بە سەر دێنێ. هەرگیز خۆشیمان لێ نەدی و هەر ئازاری دڵمان دەدات. ئێمەی دڵدار، زویر و هەژار، کە بە هەزار سۆفی و مەلا و تەرکەدنیامان تێدایە، بەو کەزیانەوە گیرۆدەین و کوشتەی ئەو کەزیە ڕەشانەین. ئاخ لە دەست ئازاری زولفی! داخ لە دەست بێ ئەمەگییەکەی!



# فینجانا سەدەف

١
ئێــــرۆ ژ شەهکاســـا ســــورێ مــەی هاتــە فینجانــا ســەدەف
میننــەت کــو دیســا دیمدورێ دا من مەیا حوسـنا خـوە خـەف

**مانای وشەکان:**

**شەهکاسە**: شاکاشی؛ **میننەت**: سوپاس؛ **دیمدور**: ڕوومرواری.

**پوختەی مانا:**

زۆر لە خودا منەتبارم کە یارە ڕوومروارییەکەم، دیسان لە بادەی دلگری و جوانی- کە خودای گەورە پێیداوە- بە نهێنی، بە شاکاشی کردە ناو سەدەفی دڵم. بـەو بـادەی دیداری یارە، لە مەیخورەوە مەستترم.

٢
خــەف دامــە جامــا کەوســەرێ شــیرینقـــەد و لەبشـــەککەرێ
بایـــێ ســــەبا دا چەنبـــەرێ هــاتن ســەما شــەتری و لــەف

**مانای وشەکان:**

**چەنبەر**: ئاڵقە؛ **شەتری**: گوڵینگ؛ **لەف**: پێچراو.

**پوختەی مانا:**

بادەی دیدار- کە یار منی پێ سەرخۆش کرد- بادە نەبوو، پیاڵێک لە ئاوی کەوسەری بەهەشتێ بوو کە لەو باڵاتەرز و جوان و لێو قەیتانە شەکرینانەوە پـێم گەییشـت. لـەو کاتــەدا لــە بــەختی مــن، شــنە ئــەنگووت؛ گوڵــینگەی ســەر و مێــزەری و بسکۆڵــە پیچدراوەکەی کەوتنە سەما و بەدەم باوە ئاڵقەیان دا و ڕادەهەژان.

| | | |
|---|---|---|
| ٣ | شەتری و زولف و بەلگ و پەڕ | هەمیان ل دێم دەعوا و شەڕ |
| | ئیلان ل سەلوێ بوونەگەڕ | عەقرەب خویان ئەز هەر تەرەف |
| ٤ | عەقرەب نهن ئەو سونبولن | بوو عەنبەرن داڤا دلن |
| | نیشان ژ میسک و فلفلن | وان سینەیێ من کر هەدەف |

**مانای وشەکان:**

**بەلگ**: گەڵا، خشڵی لە شکڵ گەڵادار؛ **پەر**: خشڵی لە گوێن گەڵاگوڵان؛ **ئیلان**: مار؛ **گەڕ**: گەڕان.

**پوختەی مانا:**

ئۆخەی چەند دیمەنێ جوانم هاتە بەرچاو. گولێک و کەزی و پەرەنگی خشڵەکانی، تێکڕایی دەلەرینەوە. قەف-قەف کەزیە ڕەشەکانی، وەک مار، لەو بەژن و باڵایە هالابوون و دەبزووتنەوە. سەری بسکی هەڵقرتاوی هەڵگەڕاو بەرەو بەرەوژوور، لاسای کلکە دووپشکانیان دەکردەوە و لە هەموو لاوە دەبینران.

بە هەڵەچووم؛ دووپشکی چی؟ ئەو بسکانە لە سونبولن؛ بۆن عەنبەرن؛ داوی دڵن. ناو و نیشانیان بپرسی، لە ڕەشیدا میسک و لە تیژیدا ئیسۆتن؛ کە ئەویش ڕەشە. ئەو هەمووانە: کەزی و بسک و خشڵەکانی، دڵیان کردبوومە نیشانە.

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | دا سینە جوهتێ تیر خوەشە | قەوسێ هیلالێ تۆزڕەشە |
| | یەک تیر پوڕ کوشتن لەشە | خوونێ د جەرحان دایە کەف |
| ٦ | من خوون ب جۆ تێتن ژ دل | ئەو بازیێ بێ تۆر و سل |
| | دا کەفتە نیف تۆرا قزل | قومری نەهشتن ڕەف ب ڕەف |
| ٧ | ڕەف-ڕەف نهشتن زاغ-زاغ | دانین ل دل من داغ-داغ |
| | دی کی بمینت ساغ-ساغ | وەستانە لەشکر سەف ب سەف |

**مانای وشەکان:**

**خۆش**: تیژڕۆ؛ **توززڕەش**: ڕەشی بریقەدار؛ **جەرح**: برین؛ **کەف**: خەستاوی سابوون و

ئەسپۆن و...؛ **کەف**: لەپی دەست؛ **سل**: سرک و قوشقی، سڵ؛ **قزل**: سوور؛ **ڕەف**: پۆل؛ **زاغ**: قالاو؛ **داغ**: بە ئاسنی گەرم چزاو؛ **داغ**: کێو.

**پوختەی مانا:**

لە کەوانەی مانگی یەکشەوەی برۆیان، جووتە تیرێک زۆر بە پرتاو هاتنە سینەم. ئەوا دڵ خوێن دەدەڵێنێ و بە جۆگە لە بەری دەڕوا. ئەگەر بۆ من دوو تیر هاتن، هەریەکێکیان هەزار کەسی پێ کوژراوە و لەشی لە خوێندا گەوزاندوون و کەفی خوێنی ئەو دڵدارە کوژراوانە وا بە لەپی سووری گەشی یارەوەیە. چاوی یارم وەک ئەو بازەن، کە نە تۆڕ خۆی لەبەر دەگرێ نە لە سرکی و سڵیانیشی بۆ هیچ کەس دەستەمۆ دەبێ. دڵداری یار، لە هەموو توخم و تۆوێک بوون. زۆری وەک من، هەژارۆکەی دڵ بریندار و خوێناوی؛ زۆریش لەوانەی دنیایی، دەبنە دڵدارو دڵیان لەڕاست ئەوینی پاک ڕەش و برشە. واتا هێندێکمان بەستەزمان، وەک قومری تۆق لە گەرداندا و هاوارمان دەکرد یاکەریم. هێندێکیش وەک قەلەڕەشە، دیدار شووم و دەمبەقڕە و گرانجان بوون. بازی چاوی ئەو یارە بەڵەکچاوەمان، بەر لە هەر شت ئێمەی گیرۆدەی تۆڕەکەی، کە بە خوێنی دڵمان سوور بوو، پۆل-پۆل کوشت و هەر تاقیشی لێ نەهێشتن. ئەوجار نۆرەی ڕاو کردنی قالاوان هات. قەل بە قەلی هەڵبژاردن و بە دەستی مەرگی ئەسپاردن. بۆ کلۆلیم، تەنیا هەر منی هێشتەوە؛ بەو دڵە برینداڕەوە و بەو هەڵبواردن لە کوشتنە، داخی دڵم چەند داخی تری هاتە سەر و داغ وەک کێو، بە سەر یەکدا هات. ئاخر ئەگەر کلۆڵی و بەدبەختی نەبێ، کێ لەبەر ئەو چاوە بازە و ئەو هەموو تیری کەوانەی جووتە برۆ و مژۆڵانەی، وەک من ساغیساغ دەمێنێ؟! جگە لە چاو و برۆیان، ئاخر کەزیەکانیشی هەن؛ کە هەتا با لێیان بدا، پێکدا دێن و دڵدار دەبەر پێدا دەچن. دەبڕوانە هەر ئێستا کە ڕێز-ڕێز بەرانبەر بەیەکتر ڕاوێستاون...

| | | |
|---|---|---|
| ٨ | سەف-سەف مە دین هیندی و زەنگ | چەنگیز هات تەیمووریٚ لەنگ |
| | خەف وان ڕەشاندن دل خەدەنگ | تەشبیهێ تیرێن خانشەرەف |

**مانای وشەکان:**

**چەنگیز**: لە بەشی «زێ»دا باس کرا؛ **تەیمووری لەنگ**: (٧٣٦- ٨٠٧ کۆچی) بەرانبەر بە (١٣٣٦ -١٤٠٥ زایینی) لە شاری کەش، لای سەمەرقەند هاتە دنیا. تەمەنی ٢٤ ساڵ بوو کە بە خوێنرێژ ناوی دەرکرد. لە ڕووسیا موسکۆشی گرت. شاری بەغدای وێران کرد (١٣٨٦ ز.) لە ساڵی ١٤٠٢ی زایینی سوڵتان بایەزیدی دووهەمی عوسمانیانی، لە لای ئەنکارا، بە دیل گرت. سەمەرقەند پایتەختی بوو؛ **خانشەرەف**: کوڕی خان ئەبدال، میری جزیری بۆتانێ کە شەرەفخانی بدلیسی لە ساڵی ١٠٠٥ی کۆچی، زۆر بە ئازایی و خێرخوازی و ئیمانداری، بەو خانشەرەفەدا هەڵدەڵێ و چەند ڕووپەڕی لە *شەرەفنامە*کەی بۆ تەرخان دەکات. مەلای جزیری ڕۆژگاری ئەو خانە، لە جزیر ژیاوە و لە مزگەوتی دەسکردی ئەودا، دەرسی عیلمی گوتۆتەوە و هەر لەو مزگەوتەش نێژراوە؛ **هیندی**: شیری دەسکاری هیند.

**پوختەی مانا:**

کەزیەکانی لە دوو لاوە، بەرانبەر بەیەک وێستابوون. لەو ناوەدا، برۆ دیاربوون لە شیری هیندی براتر. خاڵت دەدین زۆر لە قولەزەنگییان ڕەشتر. شنەبای بسکان هەڵیکرد. هەردووک لەشکری کەزیانی، وەک لەشکری تەیموور لەنگ و چەنگیزخانێ، بێڕوحمانە گەینە یەکتر. تیر بۆ دڵی من داباریین. بەڵام زۆر تیری نادیاری، کە لە تیژی و کاریگەریدا دەتگوت تیری خانشەرەفن کە بە دوژمنییەوە دەنێ.

| | | |
|---|---|---|
| ٩ | تیرەک ژ قەوسێ مال زراف | تێ دل قەوی تاڤێژە ناف |
| | خوون تێپوڕی تەشبیهێ ئاف | فەریاد و ئەفغان سەد ئەسەف |
| ١٠ | جان دێ نەدت ئەو مالخەراب | هەرسینەیێ جۆتەک غوڕاب |
| | تێدا بڕن پەنجە و کولاب | وێ جان د دەست وێ ڕووح د کەف |

**مانای وشەکان:**

**مال**: گوشادی ناو کەوان؛ **زراف**: باریک؛ **قەوی**: توند، بەهێز؛ **تاڤێژە**: دەهاوێژێ؛ **ئەسەف**: داخ و حەیف؛ **کولاب**: قولاپ.

**پوختەی مانا:**

تیرێکی خانشەرفییانەی مژۆلانی، لە ماڵی کەوانی ناسکی برۆکانی، بە تەوژم وە دڵم کەوت و لە ناوەڕاستەکەی چەقی. خوێن سەری کرد؛ وەک ئاوی ڕەوان، ڕەوان بوو.
ئەو دڵە ماڵوێرانەی من، چەند بێبەخت و چەند گیانسەختە؛ جگە لە تیژی مژۆڵیش، لە دوو لاوە بسکەکانی- کە وەک قالاون بە رەشی- پەنجە و قولاپیان لە سینەی سەر دڵم گیرە و گیانم بەدڵ ئامادەیە خۆی بە دەست ئەو دوانەوە دا و گیانی لە سەر داناوە؛ ئامادەیە و بە تاسەیە کە بە قوربانی تیری کەن. بەلام دڵم بەم هەموو برینەشەوە و بەو هەموو خوێن لەبەرچوونەش، هەر وا ماوە و هەر گیان بە دەستەوە نادا.

۱۱

جانێ «مەلێ» رووحا «مەلێ» نوورا ژ قودرەت نوقتە لێ
رەمزەک نهین دا من وەلێ نالی ژ بەر وەک نای و دەف

**پوختەی مانا:**

گیانە ڕاستینەکەی مەلا- کە ئەو گیانە ئامانەتییەش هەر لەوڕایە- نیشانێکی لە نووری توانایی بەرزی بە نهێنی نیشانی گیانی مەلا دا؛ کە تنۆکێک و نوختەیەک لە دەریا و پەڕاوی گەورەی خواناسی بوو. وا لەو ساوە گیانی مەلا، وەک بلوێر دەستی بە ناڵە کردووە و وەکوو دەفەی دەسی دەروێشان، کەوتۆتە دڵەتەپێوە و هەر تەپە لە دڵییەوە دێت.



# تانه له گوڵ

١ نازکا مـن د سـەمایێ ب سەرئەنگوشتێ عـەقیق
دا مـە ئـیرۆ د سـەرایێ قەدەحـەک تـازە رەحیـق

٢ مە ژ دەست و یەدێ بەیزا قەدەحەک سافی ڤەخوار
«شَعشَـعانيٍ كَـنَجْمٍ بِسَـناهُ وَ بَريـق»

**مانای وشەکان:**
**ئەنگوشت**: ئەنگووست، تلی؛ **سەرا**: کۆشک و سەرسەرا؛ **رەحیق**: مەی؛ **تازە**: لە نەوعی هەرە باش؛ **یەدی بەیزا**: دەستی سپی، یەک لە مۆجزاتی مووسا، دەستێک لـە نـاو باخەڵ نان و بە سـپییەتی دەرهێنـان بـوو؛ **شعشعانی**: ڕۆحسـووک و خۆشدیمـەن؛ **شعشعان**: شەرابێک کە ئاوی تێکـەڵ کرابـێ؛ **نـەجم**: گیـا؛ **نـەجم**: ئەسـتێرە؛ **سـەنا**: ڕۆشنایی؛ **بەریق**: ترووسکەدەر.

**پوختەی مانا:**
یارە ناسک و نازدارەکەم، ئەمڕۆ لە کۆشکەکەی خۆیدا، لە کـاتی سـەما و هەڵـپەڕکێ، پیاڵەیەک بادەی زۆر توند و بێخڵتە و تڵتەی تێکرد و بە سەرپەنجە سـوورکانی، کـە یاقیقیان بەزاندووە و بەو دەستوپەنجە ناسکانەی وەک دەستی سـپی مووسـایە و بـە موجزات دەژمێردرێ، بـە مـنی بەخشـی. خواردمـەوە؛ چـۆن بادەیـەک بـوو؟ ڕەوان، بێخڵتە، دیمەنجوان، لە ئەندازە دەگەڵ ئاوا تێکەڵ کراو. لە ڕووناکی و بریقەدا، وەکوو ئەستێرە دەدرەوشا.

٣ سیررێ لەعلێ لـەبێ جانبـەخش نـزانی تـو ب بـەحس
«أعِـدِ النَّظْـرَةَ يانـاظِرُ فالسِـرُّ دقيـقْ»

**ماناى وشەكان:**

**اَعِدْ**: دووپاتەی بکەوە؛ **نظْرە**: ڕوانین؛ **ناظر**: بەکێشە و دمەقاڵە؛ **دَقیقْ**: باریک، ورد.

**پوختەی مانا:**

کابرای بە دەم داتمەزراندۆتە قسە و باس! دەربارەی ئەو لێوە تەنکەی- کە گیان بە مردوو دەبەخشێ- لێم ڕوونە چی لێ نازانی. دیسان تماشای کەرەوە! دیسان زۆر لێی وردبەرەوە! ڕازی تەنکایی لێوانی و نهێنی پچووکیی زاری، لە وزەی باس لێوەکردنی سەرزارەکی زۆر بەدەرە.

«نالی» دەڵێ:

بەحسی سیرری دەهەنی نوقتە بە نوقتە بگەڕێی

سەری مویێ نییە بێنوکتە لە دیوانمدا

۴ ب لەبێ لەعلێ شەکەرخەندەشکێنا شەکەرەک

«إنـا بالْوعـدِ لَواثِـقْ فَلَهـا الْوَعْـدُ وَثیـق»

**ماناى وشەكان:**

**وەعد**: پەیمان؛ **لَواثِقْ**: بەباوەڕ و خاترجەم؛ **فَلَها**: بۆ ئەو هەیە؛ **وَثیق**: قایم و پتەو.

**پوختەی مانا:**

یار بەو لێوە تەنک و جوانەی- کە وەکوو دەنکی لاڵ ئاڵە و لە کاتی پێکەنینیدا، شەکری لە لێوان دەرباری- ئەمڕۆ شەکری بۆ من شکاند و بەڵێنی دیداری دامێ. دڵم خۆشە؛ چونکە دەیناسم. بەڵێنی ناشکێنێ و لە پەیمان پێکهێنانیدا، زۆر پتەوە.

۵ د ریا دورریٚ موورادیٚ مە سەریٚ دانیە ریٚ

«خُضـتُ فـی البحـرِ وَ لا زَورَقَ وَ البحـرُ عمیـق»

**مانای وشەکان:**

**خُضْتُ**: خۆم تێخست، چوومەناو؛ **فیالْبَحْرِ**: لە دەریا؛ **وَ لا**: نەیش؛ **زَوْرَق**: بەلەم؛ **عمیق**: قووڵ.

**پوختەی مانا:**

هەڵوەدا بووم کە مرواری مرادان وەدەس خۆم بخەم. سەرم لەو ڕێگەیە دانا. خۆم هاویشتە ناو دەریاوە. هیچ بەلەمیشم پێ نەبوو؛ دەریاش بە گێژ و بێپەی بوو.

٦ مە ژ غەفلەت سەحەرێ دی وە دو رەمزان کوشتم
خوەش ب حەققێ خوە گەهیشتم «آنَا بِالْقَتلِ حَقیق»

**مانای وشەکان:**

**رەمز**: ئیشارەت؛ **خوەش**: زوو؛ **اَنَا**: من؛ **قَتْل**: کوشتن؛ **حَقیق**: مستەحەق.

**پوختەی مانا:**

لە بەری بەیاندا لەپڕ دە یار هەڵەنگووتم. بە دیتنی چاوی کوژرام. زووم تۆڵەی ئەو دینە داوە؛ گۆڕی گیانمە؛ کوشتنم بۆ ئەو ڕەوایە.

٧ قەت نەگۆ قەتلە دکم بێگونەهـ و مەزلوومە
«رَشَقتنی بِنِبالٍ وَ رَمَتنی بِرَمیق»

**مانای وشەکان:**

**رشَقَتنی**: هاویشتییە من؛ **نِبال**: تیرگەل؛ **رَمَتْنی**: پێیەوە نام، بۆی فڕێدام؛ **رمیق**: سووکە تماشا.

**پوختەی مانا:**

هیچ بەزەیی پێما نەهات؛ نەیگوت بێسووچ و تاوانە؛ بۆ بیکوژم. بێ سێودوو، بەر بارانی

تیری دام و بە گۆشەی چاو، سەیری کردم. تا گیان بۆ دیتنی چاوی لـە قالـبی لـەش بێتە دەرێ.

٨ تـیر و رم هــەردو ل دلـدان ل جەگــەر چەسـپان کــر
ئــەو ژ خوونــا مــە نەرشـتی تلـیێن سـوهری عــەقیق

**مانای وشەکان:**

**چەسپان**: لکاو، پێوە نووساو؛ **تلی**: قامک؛ **سوهر**: سوور.

**پوختەی مانا:**

بژۆلی لە پێلووەکـانی سـەر و ژێـروو- کـە وەکـوو ڕمـب و تـیران وان- لـە دلـدان و جەرگیشمیان پێوە دروو. ئەو قامکە سوورە ئالانەی لە خوێنی ئێمە نەخشاوە.

نازانم کێ لە شاعران گوتوویە:

بـەرگی گولـە یـان خـوێنی دلـە نـاو لـەپی مشـتت؟
دەیـنی بـە ملـت عاشـقی بێچـارە کــە کــوشتت

٩ سۆسـنێن تــەی تــەر و نــازک ل گــولان تەعنــە ددن
«فَبِهــا العَنبَــــرُ فــــائح و بِهــا المِســـکُ عَبیـــق»

**مانای وشەکان:**

**فَبِها**: بەو؛ **فائح**: بۆندەر؛ **عبیق**: بۆن بلاوکەر.

**پوختەی مانا:**

بسکەکانت کە بە سوێسنەی تەڕ و تازە دەشبهێنرێن، تانە دەگولی تـر دەگـرن. چۆنکە عەنبەر لە سایەی پرچەکانی تۆ، بۆنی هەیە و میسکیش بەرامەی ئەوانی لە باخەلدا.

١٠ چ ب کوشـتن چ ب هشـتن تـو کـو فـەرمان بکـری
ئـەز ب حوکمـێ تـە خوەشـم «اَحْمَـدُ عَبـدُ وَ رَقیـق»

**مانای وشەکان:**

**عەبد**: بەندە؛ **رەقیق**: بەندە، بەنی.

**پوختەی مانا:**

من هەر پێم خۆشە دەربارەی من فەرمان بـدەی. نـاوی منـت بێتـە سـەر لێـو، ئیتـر فەرمان بە کوشتن یان بە هێشتن بێ، فەرقی نییە؛ هەر دڵخۆشم. ئەحمەد خولامێکی تۆیە و بەندەی ئاڵقەبەگوێتانە.

«حافز» دەڵێ:

وە دەر نـرێم و سـزای زۆر درێم، گـرژ نابـم
گوناح و کفـرە وەڕەز بـوون لـە شـەرعی دڵـداران[1]

---

١. وفا کنیم و ملامت کشیم و خوش باشیم کـه در طـریقت ما کافـریسـت رنجـیدن



# لەعلێن شەفەق

| | | |
|---|---|---|
| ۱ | من دی ژ غەفلەت جام د کەف | شاهێ نەجەف دل کر هەدەف |
| | ڕۆژ هات شەرەف ستێر بوونە خەف | هەر چارتەرەف نوورا یەقەق |
| | زولمەت نەما سوحبەت وەما | نوورا شەمالان چوو سەما |
| | لێ ئەو دەما زولف بوون جەما | هاتن سەمایێ یەک نەسەق |

**مانای وشەکان:**

**کەف**: لەپ؛ **شاهێ نەجەف**: ئیمام عەلی؛ **هەدەف**: ئامانج؛ **شەرەف**: بڵندایی؛ **ستێر**: ئەستێرە؛ **خەف**: وەشارتوو؛ **یەقەق**: زۆر سپی؛ **زولمەت**: تاریکی؛ **سوحبەت**: گفتوگۆ؛ **سوحبەت**: کۆ بوونی دۆستانە؛ **شەمال**: مۆم؛ **لێ**: لەو؛ **جەما**: کۆم بوو؛ **نەسەق**: ڕێکوپێکی و تەرتیب.

**پوختەی مانا:**

لەپڕ چاوم بە یار کەوت. نیشانەی لە دڵ گرتبوو؛ وەکوو چۆن ئیمامی عەلی، بە نیازی شەڕی کافران، ئامادەی مەیدانێ دەبوو، سەرەڕای چاوە مەستەکەی- کە هەستی عالەمیان دەبرد- پیاڵەی بادەی لە دەستا بوو. لەو کاتەدا ڕووی نیشان دا؛ نوورێکی زۆر سپی و بەهێز، هەر چوار قورنەی دنیای داگرت؛ ئەستێرە خۆیان شاردەوە. خۆر هاتە دەر تا لەو سەرە، تماشای کا. تاریکی بە جارێک ڕەوی. تەنانەت گڕی سەر مۆمان، بۆ تماشای دیداری ئەو، هەڵکشان تا چوونە ئاسمان. لەو دەمەدا کەزیەکان دەوری ڕوویان دا و لە خۆشی و جوانی دیمەنی، هەموو زۆر بە ڕێکوپێکی، دەستییان بە ڕەقس و سەما کرد.

| | | |
|---|---|---|
| ۲ | وەردان گولاف گرتن خوناف | لێ من د ناف سوهتن هەناف |
| | من دی ب چاف زولفێن بلاف | لێ بوونە داف بەندکر ب ناف |

نـوورا بەسـەر گفـت و خەبـەر     قەند و شەکەر زولفـان ل سـەر
خـالێن د قـەر باڤـێ سـەحەر     دا بێتـە دەر سـوبحا ب حـەق

**مانای وشەکان:**

**وەرد**: گوڵ؛ **خوناڤ**: ئاونگ؛ **تاڤ**: تیشک و تینی هەتاو؛ **داڤ**: داو؛ **بناڤ**: لە ناوەنـدا؛ **بەسەر**: چاو؛ **قەر**: ڕەش؛ **سوبحا ب حەق**: فەجری سادق، بەیانی ڕاست.

**پوختەی مانا:**

گوڵان بە دینی کوڵمەکانی ئاونگی گوڵاویان لێ نیشت. بەڵام من لە تـاو و تینـان، بـە جارێک جەرگ و هەناوم بە تیشکی ڕوخساری سـووتا. بـە چـاو دیـتم کەزیـە پـەرژ و بڵاوەکەی، بوونە داو لە دەوری گۆنای بۆ ڕاوی دڵی دڵداران و ئەو ڕوخسارە جوانـەیان دەنێوان خۆ گرت.

سروەی بەیان! تۆ خوا وەرە! زولفان لە سەر وردەخاڵی ڕەش لابەرە! با ئـەودەم و لێـو شیرینەی گفتخۆشە- کە ڕووناکی چاوانمانە- ڕووی بۆ ئێمە هەڵـبێتەوە و سـۆمامان بێتەوە چاوان و بەختی ڕەشی سەرگەردانمان، لـە تـاریکی شـەوی زولفانـدا، تووشـی بەربەیان بێتەوە و بەیانی لاجانگ ببینێ.

٣ مە ژ بـەهـریـیـان پوڕ نالیـان     شەڤ تاریان جەنگ بوو میان
(یان: مە ژ بوهرێیان)
وەر کوشتییان ژوان یـەنگییان     ب وان تلییان خوەش کەی گیان
کر شەفقە میر ئـانی مـە بـیر     بەردان مە تیر کرمـە ئەسـیر
نـەگها فـەقیر زولفـا حـەریر     ئاڤێهتە شـیر دا پـێ مەحـەق

**مانای وشەکان:**

**بەهر**: ڕووناکایی زۆر بەهێز؛ **بەهر**: ترووسکەی برووسکە؛ **بوهر**: پشووبڕان؛ **وەر**: وەرە، سەیرکە؛ **تلی**: قامک، تبل؛ **ئەسیر**: دیل؛ **فەقیر**: هەژار؛ **حەریر**: ئاوریشم؛ **مەحەق**: لـە ناو بردن، مراندن.

**پوختەی مانا:**

لەو شەڕەدا- کە لە نێوان ڕیزە پرچەکانی قەوما و لە سەر ڕوو پێکدا هاتن و شەوی تاریک لەمە داهات- ئێمەی دڵدار، گشمان هەناسەمان سوار بوو؛ لە تاو کەوتین. کوژراوی تیری مژۆلان لەو تاریکییەدا گەل بە گەل، گیانیان سپارد. وەرە سەیر کە! کوژراوان کە بێ تاوان، بە تیری ینگی کوژراون و کوشتەی مژۆلانی چاون. بۆ خوا شوکور، میری جوانان ئێمەشی وەبیر هاتەوەو؛ چەند تیرێکی دەئێمەش گرت و یەخسیری پرچی خۆی کردین. دەمانەویست دڵ و گیانمان بە هەودای ئاوریشمی خاوی کەزیەکانی، هەڵاوەسرێن. بەڵام کوا بۆ پیاوی هەژار، دەستی دڵ و دڵی گیانی، بە هەودای بسکی یار بگات؟ چاری ناچار، هەر بە دینی برۆ شیر ئاساییەکانی، بەر قەڵت دراین و هەر نەماین. دەسا ئێستاش نەچووە بچێ. یاری نازدار! تۆ ئەگەر قڕانمان تێ خەی، پەکی بازاڕی خۆت دەخەی. هەروەک مردنت بە دەستە، ژیانەوەش وا لە پەنجەتا. بەو قامکە باریکانەی خۆت، کەزیت لە سەر ڕوو لا بدە، تا هەموو کوژراوی دەردت، پێکەوە زیندوو ببنەوە.

۴ ئـی موشـتەری دیمـێ زەری نەبر سەری نەی جان بـەری
ئاڤـێت سـەری گاڤـا بـەری لازم هەری وی ئـەڤ پـەری
کـەلبێ دەرێ نیشـان بـەرێ تـیر ئـاورێ مـوژگین پـەرێ
(یان: ئـاوڕی)
بەحر و بەرێ عیشق و سـوڕێ ئاڤـێهتە رێ سـەرما قەلـەق

**مانای وشەکان:**

**موشتەری**: کڕیار، مەبەست دڵدارە؛ **دیم**: ڕوخسار؛ **زەری**: سپی ئاماڵ زەرد، سەوزە ڕەنگ؛ **نەبر سەری**: سەری خۆی دۆڕاند؛ **نەی جان بەری**: نە گیانی دەربرد؛ **ئاڤێت سەرێ**: سەری هاویشت؛ **گاڤا بەری**: لە هەنگاوی هەوەڵدا؛ **لازم هەری**: هەر لازمییە؛ **کەلبێ دەرێ**: سەگی دەرگا؛ **نیشان بەرێ**: دروشمێک هەڵگرێ؛ **تیر ئاورێ**:

تیری ئاگرینی؛ **تیر ئاوڕی**: تیری ئاوڕدانەوە؛ **موژگێن**: بژانگان؛ **ئاڤێهتە رێ**: هاویشتە ڕێگە؛ **قەلەق**: لە نارەحەتییان بە جوولە و بزووتن.

**پوختەی مانا:**

ئەو دلدارەی بە ئارەزووی دیتنێ ئەو دەموچاو و ڕوخسارە سەوزەڵەی سپی، ئامال بە زەردی بێگەردی دڵ تالانکەری دلبەر بێ، گەرەک ئەوندە بزانێ کە لە ڕێگای دلداریی و بەیار گەیشتن، هەوەڵ هەنگاو دۆڕاندنی سەر و گیانە و ئەشێ سەری لەم ڕێگەیەدا بڕوا؛ دەنا هەنگاوێکیش ناڕوا. با بۆ نموونەی دلداران، من ببینن؛ چۆنکە ئەو پەریزادە شۆخەی وا بە دلکێشی و دلبەریی خۆی، دەریا و بەژی خستۆتە ژێر فەرمانەوە، سەگی دەویست کە پاسی ئەو هەموو سامانە جوانەی بکا. منی هەڵبژارد پاسدار بم. سەگی پاس لە دەرکی هەرکەس، دەبێ داغی خاوەنی لە لەشی دیار بێ. ویستی بە تیری ئاوڕی- کە ئاوری لە مژۆلانی دەپریشکاند- من داغ بکا. خۆ ناشکرێ هێندە خۆی نزم کاتەوە، دەس لە من دا. تیری ئاورینی هاویشتمێ. لە جیاتی داغ، سەرم پەری و ئێستاش سەرم بە سەرسووڕمانەوە، لە بەر پێیدا و لەسەر ڕێدا هەڵدەبزووقێ و نارەحەتە کە نیشانەی داغی یاری پێوە نییە تا بیکاتە شایەتی شەهید بوونی خۆی و لە ناو کۆڕی کوژراوانی دلداریدا، بە شانازی نیشانی دات.

نازانم کێ گوتویە:

ڕێرەوی ژێر لە بیابانی ئەوین وشیار بە!
سەربەبادان و نەمان مەرجی یەکەم هەنگاوە

**٥**

| | |
|---|---|
| من دی د نەو بێ یارێ تەو<br>(یان: نەو) | سوندێ ب ئەو بێم بێ دەرەو<br>(یان: سوندم بە) |
| من بوو د قەوسێ بوویێ ئەو | شیڤان مە لەو نایێ مە خەو<br>(یان: نایێمە خەو) |
| هێستر ڕەوان تێن وەک جوان | تیر دان ئەوان رەش ئەبروان |
| دل وەک گوان بەر کاشوان | سەر لوئلوان بەرگێن وەرەق |

**مانای وشەکان:**

**د نەو بێ**: لە وەختی کێشک و شەو بێداریدا؛ **تەو**: تەواو؛ **نەو**: تازە؛ **بێم**: دەبێژم؛ **بێ دەرەو**: بێ درۆ؛ **دەقووسیێ**: دەردەباریکە، سیل و دیق؛ **شیڤان**: شەوانە؛ **شیڤان**: شێواند؛ **لەو**: بۆیە؛ **نایێ مە خەو**: خەوی ئێمە نایە؛ **نایێمە خەو**: ناکەومە خەوەوە؛ **هێستر**: هسر، فرمێسک، ئەسرین؛ **جوان**: جۆگەلان؛ **گوان**: گۆگەلی شەقێن؛ **کاشوو**: گۆچانی گەمەی گۆیێن؛ **لوئلوان**: مرواریيان؛ **بەرگ**: پەڕە؛ **وەرەق**: گەڵا.

**پوختەی مانا:**

لێم دەپرسن بۆ هێندە زەرد و لاواز و پەژار و کز و نزاری؟ خواردن و خەوت لێ حەرامە و هەمیشە دەگری و دەباری و گۆنای زەردت، فرمێسکی پێدا دێنە خوار. ڕاستوو دەوێ، ڕاستی دەڵێم و سوێند بە یار، درۆ ناکەم. شەوێک لە شەوبێداریمدا، کە گیان بەرەو بارەگای یار پاسی دەدا و دڵم سەری لە ژێردەرانەی دەماڵی، بە ئاشکرا و بە تەواوی، یاری خۆم هاتە بەرچاوی و ئەو دیدارە بۆ من نوێ بوو. وا لەو ساوە، بۆ ئارەزووی دیداری یار جارێکی‌تر، دەردەباریکەم گرتووە. جا هەرچی لە منی کردووە و ژیانی منی شێواندوە، ئەو شەوە بوو کە یارم خۆی دا نیشانم. جا چۆن من خەو ڕێگە دەدەم بێتە چاوم؟ چۆن شەو دەنووم؟ هەر چاوەنۆڕی دیداری دووبارەی ئەو یارەم دەبم. لەو سوێیانە، ئەسرین لە چاوم ڕەوانە. وەک جۆگەلان فرمێسکی ڕوون لە سەر لاڕوومەتی زەردم، وەک مرواری لە سەر گەڵای وەریوی پاییزان، دەبیندرێن.[1]

---

١. شیاوی باسە: لەو نوسخانەی کە من دیومن، ئەو شیعرە ئاوا نووسراوە:

| | |
|---|---|
| مـــن دی د نَـــو بی یـــاری تَـــو | سُندُسِـــــــه او بـــــــیم بی دَرَو |
| مـــن بُـــو د قَـــو ســـی بُـــوی او | شیڤـــان مـــەلَو نابیمـــه خَـــو |
| هیســـتر رَوان تـــین وَک جُـــوان | تـــــیردان اوان رَش ابـــــروُان |
| دلِ وَک گُـــــوان بَرکاشُـــــوان | سَـــــر لوءلُـــوان بَـــــرگین وَرَق |

من بۆ ئەوە شتێک لە شتیک حالی ببم، دەستێکی کەمم تێ وەرداوە؛ بەڵام ڕەنگە خوێندەوار باشتر بزانێ و سندس کە بە پارچێک دەلێن، لەو شیعرەدا، جێ بکاتەوە و باشتر مانای لێ بداتەوە. «هەژار»

| | |
|---|---|
| ٦٤ بــەژنا شــەپال دیمــێ ب خــال | ئیعــراب و دال قەوســێ هــیلال |
| نەقشــێ جــەلال جامــا زەلال | خەمرا حەلال سوحبەت ب حــال |
| ئــەز تەلبــەیا ئاڤــا حــەیا | تــێ بــووم تــەیا کــەژ بادەیــا |
| جامــا خویــا بــوو عیشــوەیا | یار لــەو پەیاپــەی تــێن ســەبەق |

**مانای وشەکان:**

**شەپال**: خونچیلە و دلگر و ڕەزاشیرین؛ **ئیعراب**: دەربڕینی مەبەست؛ **ئیعراب**: بـزاوی سەر پیتان؛ **دال**: شارەزاییکەر؛ **دال**: پیـتی (د)؛ **جـەلال**: شـکۆ؛ **جـەلال**: نـاوی خـودا؛ **خەمر**: بادە؛ **سوحبەت**: گفـتوگـۆ، هەواڵـەتی؛ **حـال**: ئێسـتا؛ **حـال**: چلۆنـەتی بـاری دەروون؛ **تەلبە**: داخواز؛ **حەیا**: حەیات، ژیان؛ **تیا**: تیهە سەرگەردان و ڕێ گـوم کـردوو؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **پەیاپەی**: بێبڕانەوە؛ **سەبەق**: ملەکار لە کێبەرکێدا؛ **کەژ**: کە، لە.

**پوختەی مانا:**

من هەڵوەدای ئاوی ژیان بووم؛ لەو ڕێگەدا سەرگەردان بووم. تا خوای گـەورە وێنـەی جوانی نەمری خۆی لە ڕووی سەلمادا نیشان دام. ئەم وێنـەی جـوانی خودایـە، ئـەی خودایە چۆن نەخشاوە؟! بـەژن تـا بڵـێی ڕێکوپێـک، ڕەزاشـیرین و ئێسـکسـووک، وردەخاڵ لە سەر ڕوانی و کەوانەی مانگی یەکشەوەی برۆکـانی و بسـکی وەکـوو دال شکاوی، وەک نووسراوی سەر و ژێر و بۆر کراو بێ، زۆر هاسـان لـە دڵـدارانیان حاڵـی دەکرد کە ئاشکرا نووری خوایە و لە ڕوخساری سەلمادایە.

ئەو دیدارە وەک جامێکی پڕ لە بادەی حەڵاڵی ڕۆشن و زوڵاڵ، کە بەرهەمی عیشوە و نازی تێکرابوو، سەدقات لە بادەی ئاسـایی بـەهێزتر بـوو. مـنی مەسـت کـرد و دەستم کرد بە گفتوگۆ دەگەڵ یارم. بەڵام گفتوگۆ نە بە دەم؛ بە دڵ، بەگیان، بە دەروونی پڕ لە ئاگری دڵداریی. دەمەقاڵەی تێدا نەبوو؛ دەمەحاڵ بوو. بوو بە مایەی ژیان و مان و هەڵنەوەرین. هەر بۆیەشە کە دەستە-دەستە دڵداران، ملە دەکەن و لە غاران. بە ئارەزوون وەک من بە ئارەزوو بگەن. وەک من چێژەی بادەی دیداری یار بکەن.

٧ جانێ «مەلێ» ژ قالوو بەلێ بەندم وەلێ دەر کاکولێ
بەلگێن گولێ روو هەیکەلێ ئەو میسکە لێ جارەک هەلێ
پەردە و ستوور دا بێ قوسوور بێتن زوهوور دێمێ ب نوور
نوورا غەفوور خالێن دهوور جاما تەهوور لەعلێن شەفەق

**مانای وشەکان:**

**قالوو بەلێ**: گوتیان ئارێ، لە پێشدا باسمان لێوە کرد؛ **وەلێ**: بەلام؛ **بەلگێن**: گەلایانی؛ **هەیکەل**: وشەیەکی لە ڕەگەزدا یۆنانییە، واتا بەژن‌بڵند، بە لەنجەولار، بت و کۆتەل؛ تیمسال؛ جێگەی قوربانیی موقەددەس لە کلیسا؛ **هلێ**: لا درێ، لا کەوێ؛ **ستوور**: پەردەگەل؛ **قوسوور**: دریغ، کۆتایی؛ **زوهوور**: دیاردان؛ **غەفوور**: ناوی خوایە بە مانا بەخشندەی گوناح؛ **تەهوور**: خاوێن‌کەرەوە. خوا فەرموویە: بادەی تەهوور دەرخوردی بەهەشتییان دەدرێ؛ **شەفەق**: سوورایی ئاسۆ لە ئێواران.

**پوختەی مانا:**

سەلما! گیانە شیرینەکەی مەلا! هەر لەو ساوە خوا گیانەکانی درووس کرد و هێشتا دەناو ڕکەی ڕەشی لەشی خاکی نەکردبوون، من گیرۆدەم. بەلام گیرۆدەی کاکۆڵت؛ گیرۆدەی ئەو دیمەنەتم کە وەک بت دەپەرسترێ و وەکوو بتی زۆر جێ‌گەورە، جوان کراوە. سەری کوڵمەت، وەکوو پەڕی سوورەگوڵە. وردەخاڵت، وەک هەڵوەرێنراوی میسکن. بە ئاوات لە خوا دەخوازم پەردە و لەمپەر لە نێوانماندا نەمێنێ. ڕوخساری گەش و ڕۆشنت- کە نموونەی نووری خوایە- خۆی بنوێنی. خاڵە وردەکانی سەر ڕووت، لێوەکانت- کە وەک پیاڵەی مەی و بادەی بەهەشتییە و ڕەنگی ئاڵی لاڵ‌ئاسایە و لەو بەرزە سوورایی ئاسۆی ئاسمانی جوانی و نازداریت دێتە بەرچاو- بە چاوی دڵ، تێر ببینم.

٨ یار هات و مەست، سوبحا ئەلەست من دەست ب دەست دی جام د دەست
کاکول دبەست تایەک ڤەرەست ڤێرا شکەست نیشانە قەست

ئـەو لـەبشـەكەر وا هاتـە دەر رابـوو ژ بـەر تـايێن د بـەر
خالێن دقەر زولف چوونـە سـەر ئەسلان سەحەر لێ بوون فەرەق

**مانای وشەکان:**

**سوبحا ئەلەست**: بەرەبـەیانی ئـەو ڕۆژەی خـودا گیـانی دروسـت کـردن؛ **دەست ب دەست**: ڕووبەڕوو، لە نزیکەوە؛ **ڤەرەست**: دەرچوو، دەرپەڕی؛ **نیشان**: خـاڵ؛ **قەست**: ئامانج؛ **رابوو**: هەستا؛ **بەر**: پێش؛ **د بەر**: لە بەردا؛ **قەر**: ڕەش؛ **ئەسلان**: شێر؛ **ئەسلان**: ڕەگەزان، بنەڕەتان؛ **فەرەق**: ترساو، بلاو؛ **فەرەق**: پەیدا بوونی سپیایەتی بەرەبەیان.

**پوختەی مانا:**

لە ڕۆژی هەرەبەرێوە، کـە خـوا گیـانی دروسـت کـردن، زۆر لـە نزیـک تووشـی ئـەو سـەلمایەی خـۆم بـووم. پیاڵـە بـە دەسـت هاتـە دەرێ. بەلەنجـەولار دەسـتی بـرد کاکۆڵەکانی شانە بکا و تێکپەڕێنێ، چەپکە تاڵـێک لـەو نـاوە جیـا بوونـەوە و خۆیـان گەیاندە خاڵی ڕەشی سەر ڕوومەتی. ئەو لێوشەکرینە شیرینە، کە پەیـدا بـوو، هـەموو گیان لەبەری هەستان؛ تەنانەت تاڵێ بسکانی- کە دەوری خالانیان دابوو- لەبـەر ئـەو نازارە هەستان و چوونەوە سەر بنکەی خۆیان لەو سەرەدا. بەو تاڵ لە سەر خاڵ لادانە، شەو نەما و سپێدە دەرچوو.
(یان: کە زولفەکانی هەڵاوێزنی چاوی کە لـە هەیبـەت شـێرن، بـەو بەیانـە مەسـتانە خۆیان وەدەر خست. شێران لە ترس و عەیبەتان، وا ترسان هەر زراویان چوو.)



## یەك و یەك

آ	دلبــەرا مــن ســەحەریٚ هــات ب تــۆخ و ب یــەدەک
	سەد یەدەک بوون د بەریٚ تێک ب سنجاب و وشــەک

**مانای وشەکان:**

**تۆخ**: جوقەی سەر لە تۆپەڵێک موو؛ **یەدەک**: سوخمە؛ **سنجاب**: جانەوەرێکــە خزمــی سمۆرە، کەوڵەکەی زۆر بەنرخە؛ **وشەک**: وشەگ، جانەوەرێکە خزمی شــێر و پشــیلە و لە تایەفەی گویٚڕەشانە. کەوڵەکەی زۆر بە قیمەتە.

**پوختەی مانا:**

یارەکەم بەری‌بەیان هات. کاکۆڵی وەک جوقەی شایان، لەسەر دیار بوو. سوخمەیەکی دەبەردا بوو بە سەتان سنجاب و وشەگ بە ئاوات بوون کەوڵیان لەو سوخمەیەدا بوایە.

۲	یــار بــوو چوومــە بــواریٚ ب زیــارەت کــەفیٚ پــا
	«قــالَ یــا عاشِــقُ هاتیــکَ یَــدی هــاتِ یَــدَکْ»

**مانای وشەکان:**

**بوار**: ڕێباز؛ **کەفی پا**: بەری پیٚ؛ **قال**: گوتی؛ **یاعاشِقُ**: ئەی دڵدار؛ **هاتیکَ**: ئــەوەتانیٚ؛ **یَدی**: دەستم؛ **هاتِ**: بدە؛ **یَدَکْ**: دەستت.

**پوختەی مانا:**

خۆم خستە سەر ڕێبازەکەی کە ماچی بەری پای‌بکەم. فەرمووی دڵدار دەســتت بــدە هەڵتهێنم! هانیٚ دەستم، ماچی بکە!

٣ دل و جان هەردو مە دانێ کو ئیجازەت ژ مە خواست
«قُلــتُ أَسْــتَوْدِعُکَ الْبــارِیَ اللهُ مَعَــکْ»

**مانای وشەکان:**

**قُلتُ**: گوتم؛ **اَستَوْدِعُکَ**: بە ئامانەتت ئەدەم؛ **باری**: خودا؛ **مَعَک**: دەگەڵ تۆ.

**پوختەی مانا:**

یار کە ڕابرد، فەرمووی بە ئیجازەی تۆ ئەوا دەڕۆم. گوتم بە خودات دەسپێرم؛ خوات دەگەڵ بێ.

٤ تە دقێ ساف و زەغەل ژێک قەدی تەجرەبەکە
دا عیارێ ب تەمامی بنومێتن تە محەک

**مانای وشەکان:**

**ساف**: پاک و بێخەوش؛ **زەغەل**: چرووک؛ **ژێک قەدی**: لێک بکەیەوە؛ **عیار**: هەڵسەنگان و ناسین؛ **محەک**: ئامرازی کڕاندن؛ ئەو بەردەی چۆنییەتی زێڕی پێ دەردەخەن.

**پوختەی مانا:**

دەتەوێ بێخەوش و چرووک لە یەکتری هەڵاوێری، پاک و پیسان تاقی کەوە! محەک دەزانێ زێڕ تەواوە یان چەند مسی تێ کراوە.
واتا ئەگەر لات وایە دڵداری ڕاست نیم، بمئەزموو تا بۆت دەرکەوێ چەند پاک و ساغم بۆ ئەوین.

٥ دەورێ زولفا تە موسەلسەل ب نەزەر حەل کو نەبت
نەزەرێ سافی دلی سەر ددرت نوقتەیێ شەک[1]

---

١. مەلا لەو بەیتە شیعرەدا، مەبەستە لێک جیاکانی عیلمی حیکمەت و کەلامی داونە پاڵ یەک. «هەژار»

**مانای وشەکان:**

**دەور**: دەورەدان، ساڵ، خەرمانەی مانگ؛ **دەور**: لە زاراوەی زانایـانی عیلمـی کەلامـدا دوو مەبەستی بەستە بە یەکن کە بێ یەکتریان ناکرێ و ئاکام هەر دەبێتـەوە یـەک و پێدا برۆ؛ **موسەلسەل**: بەزەنجیرە؛ **موسەلسەل (یان: تەسەلسول)**: لە زاراوەی زانایانـدا چەند کارێک یا چەند مەبەستێک کە بەیەکەوە لکاون و هیچیان بە بێ‌هیچیان نـابن و بڕانەوەشـیان بـۆ نییـە؛ **نـەزەر**: دیـتن بـە چـاو؛ **نـەزەر**: لـە زاراوەی زانسـتدا چەنـد مەبەستێکی ئاشکرا بێنییە پاڵ یـەک تـا نائاشـکرای پـێ دەرخـەی؛ **شـەک**: گومـان؛ **نوقتەی شەک**: واتا کە لە دەور و تەسەلسولدا، پیاو سـەرگەردان دەمێنێـت و ڕێگـەی حەل کردن ون دەکات. بە خەیاڵ و نەزەرییە، بەڵگەیەک دەدۆزێتەوە کە کلیلی ڕزگار بوونە. واتا بە گومانی دەراوی دەرەتان ڕەچاو دەکا؛ **سەر ددرت**: سەر هەڵدەدا.

**پوختەی مانا:**

دەورەدانی خەرمانەی مانگی ڕوخسارت، کە زەنجیرەی لێکنەپساوی کەزیـەکانت لـە کەزیە بێ‌بڕانەوەکانت دەوری داوە، سەری ئێمەی لە ناو ئـەو جـەغزە بێ‌دەرکـە گێـژ کـردووە و کەوتووینــە باسـی دژواری دەور و تەسەلسـول لــە سـەر ڕووت. کـەزیت جوانییەکەی لە ڕووتە؛ جوانی ڕووت بەو پرچانەوە هیچیان بێ یەکترییان ناکرێ و هەتا زۆر لێی بکۆڵینەوە و لـە نوختـەی خـاڵ وردبینـەوە و بـە گومـان بـە هـۆی خاڵـەوە دەرەتانێک بەدی بکەین، لە شک و گومان دەرناچین و لـەو هـەموو بـە چـاو دیارانـە، ناگەینە مەبەستی نادیار؛ کە هۆی جوانی لە بسـک و خـاڵ و ڕوودایـە. دەبـێ چـاوی دڵمان ڕوون بێ و بەو بڕوانینە جوانی تۆ. ئەوسا سەرەتای کلافەی گومان و شک، سەر هەڵدەدا و دەزانین جوانیت لە چییە و حاڵی دەبین.

«مەلا حیسامەددینی سەرا» دەڵێ:

بە سـوغرایی دەم و کوبـرایی چاوت مـەتـلەبێـکم بـوو

بە سەد دەورو تەسەلسول هاتە پێش زولفی پەرێشانت

٦ ئـاهوا مـن نـەکوو رەنجـەک تـە ب خـاتر بگـەهت
بە خودێ کی لو کو ئەو سەگ ب خودی هاتە مەسەک

**مانای وشەکان:**

**خاتر**: دڵ، بیر؛ **بە خودێ کی**: تۆ بی و خودا؛ **خـودی**: خۆبەخۆ، لە خۆیـەوە؛ **مەسـک**: گیران؛ **مەسەک**: لە ناچاریی قافیەوە هاتووە.

**پوختەی مانا:**

ئاسکە چاوجوان و ناسکەکەم! تۆ بی و خودا لە منی دڵدار- کـە سـەگی بـەر دەرکـی خۆتم- دڵ مەگۆڕە و لێم مەرەنجێ و مەڵێ سەگ هاتووە بۆ ڕاوەئاسـک. نـەخێر ئـەم سەگەی بەر دەرگات خۆی بە ئارەزوی دڵی خۆی کردۆتە نێچیری چاوت و گیرۆدەی داوی جوانیتە.

نازانم کام شاعیر دەڵێ:

سەیـری نابیـنم نێچیروانێـک بـە شـوێن نێچیـرەوە
سەیری خۆش ئەو حانەیە نێچیر وەدووی ڕاوکـەر کـەوێ[1]

٧ ب ئەڤـینێ مەلـەک و چـەرخ و فەلـەک تێنـە سـەما
رەوشـەنن تێـک ب میهـرێ ژ سـەما تـا ب سـەمەک

**مانای وشەکان:**

**میهر**: هەم ڕۆژ هەم خۆشەویستی و دڵداری؛ **سەمەک**: ماسی، نیاز ئەو ماسـییەیە کـە زەمینی لە سەر پشتە.

**پوختەی مانا:**

سەروبەر ئاسمان و زەوی و بەرزو نەوی و هەرچی لەناویانـدا هەیـە، بـە فریشـتە و بـە

١. وێدەچێ مامۆستا هەژار مەبەستی ئەم بەیتەی سەعدی بووبێ:
غَزال اگر به کَمند اوفتد عَجَب نبود     عَجَب فُتادن مَرد است در کَمندِ غزال

ئاسمان و بە عەرزەوە، تەنانەت بەو ماسییەشەوە کە دەڵێن لە ژێر عەرزایە، لە شوێن و شەبەق دانەوەی خۆری ئەوینی خودایی کەوتوونە سەما و هەڵپەڕکێ و بێ ئارامن.

٨ نەکوو پەیوەستە ب یەک بن ژ سوڕێ عیشقێ دو رووح
دێ ب ئەشباح ببن واسیل و پەیوەستە ب یەک

**مانای وشەکان:**

**سوڕ**: دلکێشی، جازیبە؛ **ئەشباح**: تارماییگەل؛ **ئەشباح**: بریەتییە لەو گیانانەی کە لە سەر زەوی کۆچ دەکەن و بە دیمەن دەچنە ناو لەشێکی ڕووناک کە لە لەشە گڵینەکەی ژیانی سەرزەمینیان دەکا؛ **واسیل**: گەیشتوو؛ **پەیوەستە**: هەمیشە؛ **پەیوەستە**: لکاو.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر دوو گیان لە سەر دنیا بەر کێشەریی دڵداریی نەکەوتبێتن و ئەوین لێکیان پیلۆز نەکا، چۆن لەو دنیا لە پاش کۆچ کردن لە زەوی، تارمایی ئەو دوو گیانانە بە یەک دەگەن و هەمیشە پێکەوە دەبن؟!

٩ ژ موسەمما عەدەد و کەسرەتێ ئەسما تو مەبین
زەید و عەمرێن مە حەتا چەند؟ دو نینە یەکویەک

**مانای وشەکان:**

**موسەمما**: ناوبراو، ناونراو؛ **کەسرەت**: زۆری؛ **زەید و عەمر**: ناوی پیاوی کەس‌نەناسن، کە لە کتێبی ڕێزماناندا بۆ نموونە باسیان دەکرێ.

**پوختەی مانا:**

لە بازاڕی دڵداریدا، من‌ـمن و تۆـتۆیەک نییە. با لە ناونرانیش جیا بن، بۆ ناسینە و ڕزگار بوون لە سەرتاسینە. زەید و عەمر هەر یەکێکن؛ مەڵێ دوانن. ئەوین دووەتی نازانێ.

دیاره مەلا باسی ناوه زۆرەکانی خودا دەکا که هەموویان ناون بۆ تاقه خودایەک.

١٠ چ فەسـاحەت ب مەلاحـەت وه ددێـری تـو «مـەلا»
ئـەڤ ئەدایاتـە د شـیعرێ وه شـیرین و ب نەمـەک

**مانای وشەکان:**

**فەساحەت**: گفتڕەوانیی؛ **مەلاحەت**: مەزەداریی؛ **نەمەک**: خوێ، لێرەدا بریەتییە لە تام و دڵرفێنیی.

**پوختەی مانا:**

مەلا! بەراستی لە شیعرا گاڵە دەکەی! ئەو گفتولفتڕەوانی و قسە بەتاموخوێیانەت چلۆن بۆ دێن؟ شیعرەکانت هەتا بڵێی ڕێک و شیرن و مەزەدارن.



# پارەی جەرگ

١ «تَعـــالیالله» زەهـــی حوســـنا موبـــارەک!
تـــەبارەک، ســـەد تـــەبارەک، ســـەد تـــەبارەک

٢ مەگـــەر شـــیرین ب ڤـــێ شـــیرانییێ بـــوو
«الا شَـــمْسُ اَلملاَحَـــۀِ قَـــدْ تُشـــارَکْ»

**مانای وشەکان:**

**تَعالَیالله**: پایەبەرزی بۆ خوا؛ **زەهی**: چ زۆر، عـەجایب؛ **موبـارەک**: پـیرۆز و بـە پیـت؛ **تەبارەک**: پیرۆزی بۆ خوا؛ **شیرانی**: شیرنایەتی؛ **ئەلا**: ئاگادار بە؛ **شـەمس**: خـۆر؛ **قـەد**: لێرەدا واتای (دەبێ؟)؛ **تُشارَک**: هاوبەشی لەگەڵ بکرێ.

**پوختەی مانا:**

چۆن جوانییەکە خودای گەورە بە تـۆی داوە؟! دەسڕەنگینـی و پایەبـەرزی هـەر بـۆ خوایە. هەی ماشەڵلا، سەد ماشەڵلا، سەد ماشەڵلا! کەی شیرینەکەی کە فەرهاد دڵی دایە، بە جوانی و شیرینی تۆ بوو؟ تۆخۆرێکی لە عاسمانی دڵکێشی و مەزەداریدا. خۆر لە عاسمان هاوتای کوانێ؟

٣ ژ غونچێن بوغچەیا وێ گولعوزارێ (گـولعیزارێ)
ژ هـــەر غونچـــە د دلـــدا مایـــە خـــارەک

**مانای وشەکان:**

**بوغچە**: باخچەی گوڵان؛ **عیزار**: لاجانگ؛ **ما**: ئێمە؛ **د دلدا مایە**؟: دە دڵدا ماوە (یـان: دە دڵی ئێمەدایە).

**پوختەی مانا:**

لەهەر خونچێکی ناو باغچەی گوڵی ئەم گوڵ لاجانگەدا، دڕکێکی داخ و عەزرەتمان لە دڵدایە.

۴ ل تــــەختێ دلبـــەرێ ڕوونـــێ ب شـــاهی
ل تــــە شـــاهی موبـــارەک بـــت موبـــارەک

۵ ژ دیــــدارێ مــــورادا مــــن ببەخشــــی
مــــورادا مــــن ژ تــــە دیــــدارە جـــارەک

۶ د دل دائـــــی و دیســــا دل دســــــۆژی
«أتَحــــرِق یــــا مَلیــــکَ الْحُســــنِ دارَک؟»

۷ عیــــزارێ گــــەر ل مــــن دی تــــو ل دل دە
«لأنَّ الْقلــبَ قَــد یَهــوی عیــزارَک (عِــزارَک)»

**مانای وشەکان:**

**شاهی**: شادی و دڵخۆشی؛ **دسۆژی**: دەسووتێنی؛ **أ**: ئایا؛ **تَحرِق**: دەسووتێنی؛ **یا**: ئەی؛ **ملیک**: خاوەن، پادشا؛ **حُسْن**: جوانی؛ **دارَک**:ماڵی خۆت؛ **عیزار**: تیری هەردوو قەراغ تیژ؛ **عیزار**: سەرکۆنە و لۆمە؛ **عِزار**: لاجانگ، کاکۆڵ، ڕوومەت؛ **لانَّ**: چونکە؛ **یَهْوی**: عاشقە بە.

**پوختەی مانا:**

تۆ سەرداری دڵبەرانی و هەموو دڵبەر تۆیان بەگەورە قبووڵە. دە بە شادی لە سەر تەختی گەورەیی و سەروەریی جوانان ڕۆنیشە! لێت پیرۆز و مبارەک بێ.
هەر شایەکی لە سەر تەختی بەختەوەریی جێگیر دەبێ، هەژاران دەلاوێنێت و خێریان بە سەردا بەش دەکا و بەخشش بە بێبەشان دەدا. منی هەژاری دڵدارت هەموو ئاوات و ئارەزووم دیتنی دیداری تۆیە. بیکە بە خێر بۆ جارێک خۆتم نیشان دە!

زۆر پێم سەیرە تۆ لە ناو دڵمدا دەژی و کەچی بەر ئاگری دەدەی. پاشای جوانی جا وا دەبێ تۆ ماڵی خۆت بسووتێنی؟! ئەگەر هەر بڕیارت داوە بە تیری تانە و سەرکۆنە یان بە پەیکانی نووکتیژی سەری بسک و مووی کاکۆڵت من بکوژی، دڵەکەم تیرەباران کە؛ چونکە ئەوی گیرۆدەی لاجانگ و کاکۆڵانتە، دڵە شێت و دێوانە و بێ ئارامەکەمە.

۸ تە جەرگێ من ژ دل کر پارە-پارە
«فَجارَكْ یا بدیعَ الْحُسنِ جارَكَ»

**مانای وشەکان:**

**ژ دل**: هەر بە ڕاستی و لە ناخی دڵەوە؛ **جارَک**: هاوسات؛ **جارەک**: پەنادانی تۆ؛ **جارک**: پەنابەر بە تۆ؛ **بَدیع**: تازە داهاتوو؛ **حُسن**: جوانی.

**پوختەی مانا:**

لە تەهی دڵدا دەتەویست جەرگەکەم پارە_پارەکەی؛ ئەوا کردت. ئەی تازە جوانی بێوێنە! چۆن تۆ دەبێ گوێ بەو فەرموودەیە نەدەی کە پێغەمبەر فەرموویەتی: هاوسایەکەت؛ دیسان هاوسایەکەت؛ ئەمجاریش هاوسایەکەت. خۆت ئەزانیت جەرگ هاوسای دڵەکەمە و تۆش لە دڵمای. کە وا بوو جەرگ هاوساتە. پەنام بدە! پەنام بە جوانیت هێناوە. خوا فەرموویە: «ئەگەر کافری خوا نەناسیش بێتە پەنات، پەنای بدە!» تۆ چۆن لە ژێر پەنای خۆتا، من و دل و جەرگ و هەناوی سووتاوم، پەنا نادەی؟!

۹ وەرە خانم بکوژ بەستە ب خەنجەر
«مەلێ» ئەمما ب دەستێ خوەی موبارەک

**مانای وشەکان:**

**بستە**: بێترس، بە ڕاشکاوی، بێ سڵ کردن.

**پوختەی مانا:**

میر و گەورەم! (یان: خانمە نازەنینەکەم!) لە کوشتنم بە خەنجەران هیچ سڵ مەکە؛ خوێنەکەمت لێ حەڵاڵ بێ. بەو مەرجەی بەو دەستە جوان و پیرۆزەی خۆت خەنجەرم لێ داوەشێنی و دوایی بە بەدبەختیم بێنی.



# چاوی بەڵەك

١ نازکەک من سەحەرێ دی ب جەمالا خوە نەوەک
حوور و ویلدان و پەری بوو نە بەشەر بوو نە مەلەک

**مانای وشەکان:**

**ویلدان**: ئەو کوڕە تازەلاوانەی لە بەهەشتان؛ **بەشەر**: مرۆ.

**پوختەی مانا:**

سەر لە بەیان جوانێکی ناسک و نازدارم هاتە بەر چاو؛ وەک چی ئەچوو؟ سەرگەردانم بڵێم وەک چی. کچۆلە چاوڕەشەکان و لاوە خوێنشیرینەکانی بەهەشت و پەری و فریشتە، لێم ڕوونە- بە جوانی- نەدەگەینە ئەو. خۆ مرۆش هەر باسی مەکە.
«خانی» دەڵێ:

پەسـنت چ بـدەم؟ ئەونـدە جـوانی
وەک هـەرچی بڵـێم جـوانی، وا نی

٢ وەر تەماشایێ شەهیدێن خوە کە جارەک تو بنێ
«اَحسَنَ اللهُ تَبارَک» ژ دو چەهڤێن د بەلەک

**مانای وشەکان:**

**بنێ**: بنۆڕە، بنواڕە، بڕوانە؛ **اَحْسَنَ**: چاکەی کرد، جوانی درووس کرد؛ **تەبارەک**: گەورەیی و پیرۆزی بۆ خوا.

**پوختەی مانا:**

گەورەیی و پیرۆزی بۆ خوا، جوانی چۆنی درووس کردووە. تۆ بۆ ئەوە کە بزانی چەندە

جوانی، هەر جارێک وەرە و بنۆڕە لە کوژراوانی چاوانت. ئەی نامەخوا و پەنا بە خوا لەو دوو چاوە بەڵەکانەت!

٣ سـونبولێن تـەر ل گـولان پـال ب مەسـتی ددرن
سوسنێن تـازە ل نەسـرین‌وەرەقان بوونـە هەلـەک

**مانای وشەکان:**

**ددرن**: دەدەن؛ **وەرەق**: پەڕە؛ **هەلەک**: ئاڵقە؛ **هەلەک**: سەرگەردان؛ **هەلەک**: بـە لادا هاتن و شکان؛ **هەلەک**: تەماحی زۆر؛ **هەلەک**: تینوەتی گیای بێ باران.

**پوختەی مانا:**

کەزی یارم، کە بە سملّی تەڕ دەشبهێنرێن، بە دیـنی کولـمە سـوورەکەی، کـە وەک پەڕی گوڵی ئاڵە، سەرخۆش بوون و بە مەستی پاڵیان وە گـوڵ دا. سوێسـنەی هـەرە پەسند و جوان- کە مەبەسـت بسـکەکانییەتی- لـە سـەر پـەڕی هـەرە سـپی گوڵـی نەسرین- کە نیازم لە لاجانگانە- بوونە ئاڵقە. (یان: لە تاوان تێکشکان و بەو لا و بەم لادا دەکەوتن.)

٤ نازکا من کـو ب مەسـتی د چەمـەن هاتـێ خـەرام
ژ حەسەد چوونە خوسووفێ مەه و میهرێ د فەلەک

**مانای وشەکان:**

**حەسەد**: ئێرەیی؛ **خوسووف**: قوپان؛ **خوسووف**: گیرانی مانگ.

**پوختەی مانا:**

یاری ناسک و نازداری من، کە لە جوانی خۆی مەست ببوو، بە لەنجەولار هاتە گوڵزار و مێرگوڵان. مانگ و خۆر کە دیتیان یارم زۆر جـوانتر و لـەبارترە لـە هـەردووکیان، لـە ئاسمان خۆیان شاردەوە و بە پەڵەی ئێرەیی گیران.

٥ ئێ ژ غەفلەت تە ببینت کو دمینێت هەیهات
تە ب چەهڤێن د بەلەک کوشتنە مەزلووم گەلەک

٦ زەررەیەک عیشقێ گەهاکی و ژ عەقلێ خوە نەبر
«کُلُّ مَنْ صادَقَهُ داهِیَةُ الْعِشقِ هَلَکْ»

**مانای وشەکان:**

**هەیهات**: دوورە، هەیهوو؛ **گەلەک**: یەکجار زۆر؛ **کُلُّ من**: هەر کەسێک؛ **صادَقَهُ**: تووشی هات؛ **داهیە**: بەڵای زل؛ **هەلەک**: بە هیلاک چوو.

**پوختەی مانا:**

هەرکەس لەپڕ تۆ ببینێ، چۆن دەمێنێ؟ دوورە مانی؛ هەیهووی دەوێ. تۆ بەو چاوە بەلەکانەت، زۆر بێسوچ و گوناحت بە کوشتن داوە. هەر تۆزقاڵێک لە ئەوینێ، وە کام پیاوی ژیر بکەوێ، ئاوەزی لەبەر نارفێنێ؟ هەرکەس تووشی بوو بە تووشی ئەو بەلایە - کە ناو نراوە دلداریی- دەبێ فاتیحای بخوێنن.

٧ خوسروێ عیشقێ کو روونیشتی ل سەر تەختێ وجوود
«فَتحَ الْقلبُ عَلَى الْفَورِ وَ لِلرَوُحِ مَلَکْ»

٨ وەهـ چ عیشق و چ سەلامەت کو د دوورن ژ یەکێ
«کُلُّ مَنْ یَسْلُکُ حُبّاً سُبُلُ النَارِ سَلَکْ»

**مانای وشەکان:**

**وجوود**: بوون و هەیەتی؛ **فَتَحَ**: کردییەوە؛ **فَتَحَ**: گرتی؛ **قلب**: دڵ؛ **علی الْفَور**: دەستەولەجێ؛ **مَلَک**: بوو بە خاوەن؛ **یَسْلُک**: دەڕوا بە؛ **حُبَ**: ئەوین؛ **سُبُل**: ڕێگایان؛ **نار**: ئاگر؛ **سَلَک**: ڕۆیشت پێدا.

**پوختەی مانا:**

پادشای ئەوین هەرکە گەییە سەر تەختی سەروەری دنیا و هەبوون، دەستەولەجێ بوو

بە خێوی مولکی گیان و هەموو شاری دڵانی گرت.
ئێوە چۆن دەگەڵ ئەویندا باسی مـان و ساغیدەکەن؟! هەرکەسێ ڕێگەی ئەوینی گرتۆتە بەر، خۆی خستۆتە ناو ئاگر و لە سەر پۆلوان هەنگاو دەنێ.

٩ ئاهـێ بێ‌گـاف ژ دل تـێن مـە ژ پێتـا د جەگـەر
بەس تو بێ فەیدە نەسیحەت کە مە دل بوویـە پەلـەک

١٠ مـا ژ عـومرێ مـە چ مابـت وەرە ئیـدی قـمەڕا
دا د ئـەقتارێ وجـودێ بکـرین سـەیرێ مەلـەک

**مانای وشەکان:**

**گاف**: وەخت؛ **پێت**: بڵێسە؛ **فەیدە**: بەهرە، فایدە؛ **پەل**: پۆلوو، سکڵ؛ **ما**: ئەشێ؛ **قمەڕا**: وێرای ئێمە، دەگەڵمان؛ **ئەقتار**: مەڵبەندگەل؛ **سەیر**: ڕۆیشتن؛ **سەیر**: تماشا.

**پوختەی مانا:**

بۆ جەرگی من وەخت و بێوەخت نەماوە. هەموو دەمان لەو بڵێسەی کە تیایە، دووکەڵی هەناسەی بەرزە. برا بەس ئامۆژگاریم کە! بەهرەی نییە. سەرەڕای جەرگی پڕ لە گڕ، دڵیشم وەک سکڵ وایە و هەر خۆی پەنگری ئاگرە. هەودای تەمەن وا هەڵدەکرێ و بۆ مردن زۆرم نەماوە. یاری جوانم! دەسا بەزەییت پێمدا بێ؛ بمخە شوێن خۆت؛ با لە هەموو مەڵبەندی ئەم دنیایەدا، گەشتێکی فریشتە ئاسام بە نەسیب بێ.

١١ دەسـتیوائێ کـو ژ حوسـنا تـە قـەدا لامیعـەکێ
«نَظَـرُ الشَـمسِ مِـنَ‌الشّـرقِ اَلـی‌الْغَـربِ دلَـکْ:»

١٢ ئافتابـێ کـو نـە تەسـویرێ ژ حوسـنا تـە بـتن
«نورُهـا فـی نَظَـری ظُلْمَـةُ داجٍ وَ حَلَـکْ»

**مانای وشەکان:**

**ئیستیواء**: ڕاست بوون؛ **خەتی ئیستیوا**: ئەو هێڵەیەکە ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمان بەر خۆی

دەدا؛ **ڤەدا**: دایەوە؛ **لامعه**: برووسکەدار؛ **نَظَر**: چاو، تماشا؛ **مِنَ‌الشَّرْق**: لـە خۆرهـەلات؛ **اِلی‌الْغَرب**: بۆ لای ڕۆژپەڕ؛ **دَلَک**: بەرەو ئاوا بوون چوو؛ **نورُها**: ڕۆشنی ئـەو خـۆرە؛ **فی نَظَری**: لە بەر چاوی من؛ **ظُلْمَه**: تاریکی؛ **داج**: شەوی تاریـک؛ **حەلـەک**: زۆر تاریـک و ڕەش.

**پوختەی مانا:**

لە جوانی تۆ، برووسکەیەک گەیشتە خەتی ئیستیوا. خۆری هێندە شەرماوی کرد کـە چاوەی چاوی لە ئالی ڕۆژهەلاتەوە وەرگێـڕا و ڕووی کـردە لای خۆرپـەڕەوە و بـەرەو ئاوابوون ڕاخوشی... ئەو خۆرەی کە وێنەی جوانیت نەداتەوە، لە بەر چاوم ڕەشە وەک شەوی تاریکی ئەنگووستەچاو.

۱۳ ژ هـەوا بەنـد تـە کـرم شـوبهەتێ بایـێ د سڤـک
چ ژ بسـکا تـە ببـێم؟ ئـاه ژ بسـکا تـە چەلـەک

۱۴ ئەز ژ زولفا تە ڤەرستم مە تەلەب کـر لـەبێ لـەعل
لـێ د چاهـا زەقـەنێ بێسـەروپا چوومـە هەلـەک

**مانای وشەکان:**

**هەوا**: ئەوین؛ **هەوا**: با؛ **هەوا**: بەرزایی، حەوا؛ **سڤـک**: سـووک؛ **ببـێم**: بێـژم؛ **چەلـەک**: چەلەنگ و شۆخ؛ **چەلەک**: خوارایی سەری دار گۆچـان؛ **ڤەرسـتم**: ڕاپسـکام؛ **زەقـەن**: چەند؛ **هەلەک**: پشووسوار، هیلاک.

**پوختەی مانا:**

لە ئەوینت وا تاسابووم، دامابووم کە بۆ کوێ بچـم و چـم بـە سـەر دێ. لەپـڕ بەنـدی بسکەکانت ئالقەیان دا لە گەردنم؛ وەک بایەکی سووک و بێسـەنگ، هەلـیانبرِیم. لـە حەوادا، ملم لە پەلەقاژە نا. ئاخ لەو بسکە ڕەشانەی تۆ! نەک هـەر مـن، باشـیان- بـەو سووکییە- لە ناو خۆیاندا گرتووە.

لەپڕیکا خۆم لە گەوی بەندی بسکانت ڕاپسکاند و بە هەلەداوان دەچوومە تماشای لێوە

ئاڵــەکەت. خوتوخــافڵ دەچاڵــی چەناگــەت کــەوتم. وەک مــەلێکی بێباڵوپــەڕ، بێدەستوپێ، لەو چاڵەدا سەرگەردانم و بێپشووم و بەرەو نەمان شۆڕ دەبمەوە.

«حافز» دەڵێ:

دڵــە نــەمگوت کــە بــە پــارێز بــە لــە پرچــی یــارم؟
بــاش تەنانــەت لــە گــەوی بســکی ئــەوا گــیراوە![1]

**۱۵** ب ئومیدا تە هومـایی نــە «مــەلێ» تــووڕ ڤــەدا
وەر تەماشایێ جیهان بویە هەمی تۆڕ و شــەبەک

**مانای وشەکان:**

**هوما**: پیرۆزەی سێبەر پیرۆز؛ **ڤەدا**: نایەوە؛ **شەبەک**: تۆڕی ڕاو.

**پوختەی مانا:**

نە هەر مەلا بە هومێدی گرتنی سێبەرەکەی تۆ، کە پیرۆزەی سێبەر پیرۆزی بەودمی، داوی ناوە. وەرە سەیرێ هەموو دنیا! تەپکە و داوە و هــەموو عالــەم وێڵــن لــە شــوێن سێبەری تۆ. بۆ هەر کوێ دەچی هەر تەپکــە و فاقــە و داووســکە دانــراوە و لــە ڕێتــا نراوەتەوە.

---

۱. صد باد صبا اینجا با سلسله می‌رقصند     این اســت حریف ای دل تـا بـاد نــپیمایی



# دڵ پەرەنگە

١ کو ئیشارەت ب بیشارەت بدرت نەغمەیێ چەنگ
ژ رووێ ئایینەیێ دل بـرتن پـەردەیێ زەنـگ

٢ فەهمێ ڕاز ئەر بکری وەر ببهی موژدەیێ ساز
چەنگێ بێپەردە دبێژت نە نەی و نایێ ب دەنگ

**مانای وشەکان:**

**بیشارەت**: مزگێنی؛ **نەغمە**: ئاواز؛ **زەنگ**: ژەنگ؛ **ببهی**: ببیسی.

**پوختەی مانا:**

هەر ئەگەر مزگێنییەکی خۆش لە ئاوازی چەنگەوە چەنگ لە دڵمان دا، ئاوێنەی دڵ مشتوماڵە و ژەنگی لە سەر ڕادەماڵێ. ئەگەر لەوانەی کە شیاوی ڕاز پێ وتن بی و لە نهێنیان حاڵی ببی، وەرە گوێ لە سازان بگرە کە چۆن ڕازان وەدەر دەخەن. چەنگ بە ئاشکرا پێت دەڵێ چ خەبەرە و بلوێر و شمشاڵیش بە دەنگ بانگت ئەکەن.

٣ وەه کو بێ شاهید و مەحبووبێ تە عومرێ خوە بوار
کارەکی ڕابە بکە وەقتە کو ئێوارە درەنگ

٤ بەرێ مەقسوودێ ژ توویی نەگرین مەعلوومە
مە ژ دەستێ خوەیی کووتاه و ژ پایێ خوەیی لەنگ

**مانای وشەکان:**

**شاهید**: دڵبەر؛ **بوار**: ڕابوارد؛ **رابە**: هەستە؛ **تووبی**: خێر و خۆشی و بەختەوەری؛ **تووبی**: دارێکە لە بەهەشت، بەهەشتییەکان دەچنە بنی؛ **کووتاه**: کورت، کن؛ **لەنگ**: شەل.

**پوختەی مانا:**

بە داخەوە تەمەنی خۆت بێ یار و دڵبەر گوزەراند. هەستە چارێکی خۆت بکە و کارێک بکە! تەمەن گەیوەتە ئێوارە و لە دنیا دەرچووی... هەتا خێوی ئەم دەستە کورت و قولانە و ئەم لاقە شەل و گێڕانەی، هەر دەبێ بە تەما نەبی بەر لە داری بەختەوەری دابوەرێ و بیچنییەوە.

«خەییام» دەڵێ:

حەیفم لە دڵێ دێ کە بە بێ سووتمانە
دڵداری تێیا نەکردووە هێلانە
هەر ڕۆژێ کە بێ دڵبەر و بێ دڵداری
بێنرخە پڕوپووچە زیانی ژیانە[1]

5̄ دلێ یارێ مە نەبوو نەرم ب سەد ئابێ گری
ئەسەرێ دێ چ بکەت ئاب ب سەد قەترە ل سەنگ؟

6̄ سینە گەهـ تێت کو بکەربت ژ دەربێ عیشقێ
مە جەگەر شوبهەتێ بارووتە و دل ماه پەرەنگ

**مانای وشەکان:**

**ئاب**: ئاو؛ **گری**: گریان؛ **ئەسەر**: شوێن؛ **دەرب**: زەبر؛ **پەرەنگ**: پۆلوو، سکڵ.

**پوختەی مانا:**

زۆر گریام و زۆرم فرمیسک داباراند؛ بەڵام دڵی ئەو یارەی من بە ئاوی چاو نەرم نابێ. بەردی ڕەقە؛ ئاو کەنگێ کاری لێ دەکا. دیومە وەستای کەڤر تاشین بەرد دەکۆڵن، باروت دەکەنە ناو کولیا و پۆلوویەکی لە سەر دادەنێن. بەرد ئەتەقێ و بە جارێک لەبەریەک دەچێ. سینگم جار-جار لەبەر زەبری خۆشویستنی ئەو یارە، بە دەردی

---

1. ای وای بر آن دل که در او سوزی نیست / سودازدەی مهر دل‌افروزی نیست
روزی کە تو بی بادە بسر خواهی بُرد / ضایع‌تر از آن روز تو را روزی نیست

بەردەکە دەچێ. جەرگم ڕەشە وەک بارووت و وەکوو بارووت ئاگرگرە. دڵەکەشم بە تەواوی بویتە پۆلوو. چۆن سینگی هەژار نەتەقێ و هەڵنەتەکێ؟!

«بابا هەژاری موکریانی!» دەڵێ:

بە گریەم پێکەنی، خەندەت بە شینە
دەڵێی پاش گریە نۆرەی پێکەنینە!
دڵت گەر سەدیەکی سینگت نەرم با
نەرم بووی ئێستە بۆ ماچێک لە سینە

۷ ب چ رەنگێ مە د دل خەف ببتن گەوهەرێ عیشق
عاشقان موحبەت و میهرا زەرییان کفشە ژ رەنگ

۸ کفشە مەجمووع و پەریشانییێ حالێ مە د دل
ژ سەرێ زولفا پەریشان و ژ بسکا تەیە شەنگ

**مانای وشەکان:**

**کفش**: دیار، کەشف؛ **زەری**: سەوزە ڕەنگ، سپی پێستی ئامال زەرد؛ **مەجمووع**: تۆپەڵ؛ **پەریشان**: بلاو.

**پوختەی مانا:**

گەوهەری بێوێنەی ئەوین، چۆن دەتوانین لە ناو دڵماندا وەشێرین؟! خۆشەویستی زەردئەسمەر و سەوزە ڕەنگان، زەردی دەدەن بە ڕەنگی دڵدارەکانیان و دڵیان دزی گەوهەری لێ دەردەکەوێ. لەو لایشەوە سەری پرچی پەرێشان و تۆپەڵە مووی بسکی شەنگت، پەرێشانی و بلاوی دڵ و دەروونمان و تێکەلاویی پڕایی دڵدارەکانت نیشان ئەدەن.

۹ نە تنێ گەزمە دبارن مە ژ قەوسێ دو هیلال
مە ژ موژگانێ سیەه تێنە جەگەر تیر و خەدەنگ

١٠ میسلێ وێ قەوسێ هیلالێ کو دو نوون ڕەیحانی
کێ نیشان دانە ژ شیراز و کێی ئانینە ژ یەنگ

**مانای وشەکان:**

**ڕەیحانی**: وەک ڕیحان؛ **ڕەیحانی**: شێوە خەتێکی زۆر جوانە؛ **شیراز و یەنگ**: دوو شارن بە کەوانی چاک ناسرابوون.

**پوختەی مانا:**

جگە لەوەی کە لە کەوانی دوو برۆی- کە وەک مانگی یەکشەوەنە- تیرمان بە سەردا دەبارن و ئەو کەوانە برۆیانەش لەوانە نین کە لە شیراز و یەنگەوە دەیانهێنن. نەخێر ئەوانە بە تیشکن وەک مانگی یەکشەوە دەچن؛ کە خەڵک دەس لە بان چاوان بە خۆشی بۆیان دەڕوانن. دەگەڵ تیشک و بەرچاویشدا، وەک دوو نوونی زۆر هونەرین کە بە دەسخەتی ڕەیحانی نووسرابن و بۆنی ڕیحانانیش دەدەن! تیری مژۆڵەکانی لە ڕەشی و تیژیش، بێبەش نەبوون. لەپەستا تیری ئەوانیش دادەرژێنە سەر جگەرمان.

١١ هەر لە دۆرا حەجەرئەسوەد حەبەشان چەرخ و تەواف
تێن وقووفا عەرەفاتێ ب سەما نووبی و زەنگ

١٢ سەف ب سەف تورک و موغول دۆگوش و هیندی د کەمین
ب عەجەب هاتنە جەنگێ حەبەش و ڕووم و فەرەنگ

١٣ میر و کرمانج ل هەولان (هۆلان) قەدەرەک وەستانە
لێ بنیڤێ ب سەف و تیپێ عەرەب هاتنە جەنگ

**مانای وشەکان:**

**حەجەر**: بەرد؛ **ئەسوەد**: ڕەش؛ **چەرخ**: خول؛ **وقووف**: وێستان؛ **عەرەفات**: جێگەیەکە لە مەککە حاجی وچانی لێ دەدەن؛ **نووبی**: خەڵکی «نووبە» کە ولاتێکە لە نێوان میسر و سووداندا؛ **زەنگ**: خەڵکی زەنگبار، قولەڕەشە؛ **موغول**: خەڵکی موغولیستان؛ **دۆگوش**: شەڕ و کێشە؛ **میر**: نەجیمزادە؛ **کرمانج**: لێرە مەبەست ئاپۆرەی کوردە؛

**هەول**: ترس؛ **هۆل**: گەمەی شەقێن؛ **تیپ**: دەستەسوار.

**پوختەی مانا:**

هەرگا یارم دێتە دەرێ، یا لە پەنجەرەی کۆشکەوە سەر دەردێنێ و تماشای دەشت و دەر دەکا و ڕێزی بسک و کەزییەکانی بە سروەی با دەهەژێن و خاڵ و میلان لە ڕوومەت و گەردن و لاجانگەکانیدا دەپۆشن و جاروبارە دیاری دەدەن، دڵم دەڕوا. دیمەنی سەیر و سەمەرەم دێنە بەر چاو. جارێک دەڵێم: خاڵی سەر ڕووی، بەردی ڕەشی حاجییەکانە. بسکەکانی- کە بە ڕەشی وەک حەبەشی و نووبی و زەنگین- لە دەوری، چەرخوخولیانە و دەڵێی حاجین لە تەوافێ و لە سەر چیای عەرەفاتی ئەو بالایە جار دەوێستن پشوو دەدەن، جار لە خۆشییان سەما دەکەن. خۆ ئەگەر شنەبای بسکان، تۆزێک بە هێز و گوڕ هەڵکا و کەزیەکانی بلەرێنێ و بیانخاتە سەر دەم و چاوی و لەسەر هەنیەی بێن و بچن، یەکجاری دڵم دەشێوێ و کۆنە شەڕی دەوڵەتانم دێتە بەر بیر و خەیاڵ و خۆم هەر لە بیر دەچێتەوە. لە لام وایە کەزیەکانی لە دوو لاوە بۆ کێشە و شەڕ و ئاژاوە، ئامادەنە. لەشکری تورک و مغولان لە لایەک و لەشکری حەبەشی و ڕۆم و فەرەنگ لەو ئالییەوە بۆ یەک دێن و دەبێتە شەڕ و پێکدادان. خاڵە ڕەشە ئیسۆتییەکەی- کە وەک ئیسۆتی هیند ئەچێ، لە ڕەشی و جەرگبڕیدا- لە بۆسەدا ماتەی داوە و دیاری نادا. لاجانگ و بەرچێڵەی سپی- کە لە پاکی و ڕووناکیدا وەک بەگزادە و ئاپۆرەی سادەی کوردانن- لەو مەیدانە بۆ سەیری گۆی چەناگەی و بسکی سەر لێ چەماوەوەی کاشۆ ئاسا، ڕاوێستاون و لایان وایە جەنگ بە سەر واندا نایە؛ بەڵام زۆر خەیاڵیان خاوە. پرچەکانی پەرێشانی- کە لە بێڕوحمی و دڵڕەشی، وەک عەرەبە ڕەشکە وانە- هێرش دێنن و ئەو مەڵبەندانەش دەستێنن کە بۆ من و چاوی دڵم، جێگەی هومێد و ئاوات بوون.

**١٤** ژ گوهەر غونچەگوشایی دگرت دورجێ عەقیق
ب شەکەرخەندە زەنی گەر بگرێت شەککەرێ تەنگ
(یان: تونگ)

**مانای وشەکان:**

**گوهەر**: گەوهەر؛ **گوشایی**: بکەیەوە؛ **دورج**: قوتووی جەواهیرات؛ **خەندە**: کەنین؛ **زەنی**: لێدەی؛ **بگریت**: دەگری؛ **تەنگ**: بار؛ **تەنگی شەکر**: بریەتییە لە لێوی دڵبەر؛ **تونگ**: کووپەڵەی دەمتەنگ.

**پوختەی مانا:**

خونچەی دەمت، بپشکوێ و ددانە وەک گەوهەرەکانت ببیندرێن، یاقیق لەبەر تەریقی خۆی، دەرگای قوتووەکەی تێیدایە گاڵەدەدا؛ تا نەیبینن. ئەگەر بە لێوی شەکرینت، زەردەخەندەی شەکربارت بێتە سەرزار، باری شەکر بە دیل دەگری و شەکر لە ناو تونگەی دەمتەنگ بەزەی بە خۆیدا دێتەوە و بۆ حاڵی زاری خۆی دەگری و لە غەیبەتان دەتوێتەوە.

**١٥** وەرە بێپەردە «مەلا» وێ غەزەلێ بینە مەقام
هەردەما بینە سەما دەف ب دەف و چەنگ ب چەنگ

**مانای وشەکان:**

**پەردە**: لەمپەر؛ **پەردە**: هەوای گۆرانی؛ **پەردە**: مەودای سەر دەستەی تار و تەنبوور؛ **پەردە**: قۆناغ لە تەریقەتدا؛ **غەزەل**: گۆرانی دڵدارانە، بەستە و هۆنراوەی دڵداری؛ **مەقام**: لاوک و گۆرانی؛ **مەقام**: کۆڕ و مەجلیس؛ **دەف**: دەفە؛ **دەف**: پەلە کردن؛ **دەف**: تەنشت.

**پوختەی مانا:**

مەلا! وەرە ئەو غەزەلەت بە ڕاشکاوی و بێ وەشارتن، بخە کۆڕی یارانەوە. با بە هەوای گۆرانییەوە بیخوێننەوە و با کۆڕەکەش دەفە و چەنگی تێدا لێدرێ. لێم ڕوونە لەو غەزەلەی تۆ، دەفە وە پەلە دەکەوێ و لەسەر تەنیشت، دەس بە سەما کردن دەکا و چەنگیش بە دەنگیش و بە چنگ، هەڵدەپەڕێ و هەڵدەبەزێ.



## دەرمانی دەردان

١ گەر بـــدیا (نـەدیا) ئـەو سـەنەما سـورجەمیل
نازلـــێ ئـــەرزان نـــەدەبوو جوبرەئیـــل

**مانای وشەکان:**

**سەنەم**: بت؛ **جەمیل**: جوان؛ **نازل**: داکەوتوو؛ **جوبرەئیل**: فریشتەی وەحی.

**پوختەی مانا:**

رووی مەلا دەپێغەمبەرە(د) و بە سیمای جوانی نوورانی پێغەمبـەری خواداهەڵدەڵـێ؛ کە پێی دەڵێ:
ئەگەر جوبرائیل ئەو سیما جوانەی لـە ئاسمانانـدا بـدیبای کـە بـۆ دڵان وەک بـت جێگەی پەرستنی و ئەو هەموو جوانی و دڵکێشییەت لە لا هەیە، دانەدەکەوتە سەر زەمین. هەر لە ئاسمان، لە جوانیت دەبوورایەوە. بەڵام چۆنکە تۆی نەدیبوو زۆر بە تەما بوو بتبینێ و دڵ و چاوی بە دیدارت ڕۆشن و شاد و گـەش بکـا، هاتـە سـەر زەوی و لێت گەڕا و دۆزیتییەوە و بە دیدارت بەختەوەر بوو.
یان: ئەگەر بە گیان نەیدیبای کە خوا چەندی دڵکێشی و جـوانی بـەش داوی، بـۆ دیتنت دانەکەوتە سەر عەرزان.

٢ مـــن نـــەزەرەک حوســـن و جـــەمالا تـــە کـــر
ئایینەیـــــەک دی م ژ نـــــوورا جـــــەلیل

٣ لـــەو ژ لـــەبێ لـــەعلێ تـــە جـــام بـــۆ خـــەجل
بادەیـــێ ئـــەنگووری کوجـــا سەلســـەبیل

**مانای وشەکان:**

**جەلیل**: خاوەن شکۆ، یەکێک لە ناوەکانی خوایە؛ **خەجل**: فهێتکار و شەرمەزار؛ **ئەنگوور**: ترێ، هەنگوور؛ **کوجا**: لە کوێ؛ **سەلسەبیل**: ناوی کانییەکی بەهەشتە.

**پوختەی مانا:**

لە دەرفەتێک ڕوانیمە ڕوخساری جوانت. ئاوێنەم دی تیشکی خودای لێوە دیار بوو. بۆیە لە تاوی لێوی ئاڵت پیاڵە بادە لە شەرمان سوور هەڵگەڕاوە. چۆنکە دەزانێ ئەم لە کوێ، ئاوی ترێی تێدایە و لێوی یاقیقی تۆ لە کوێ؟ کە لیکاوی لە سەرچاوەی سەلسەبیلە.

۴ دیل هەزارن تە د بەندێ وەلێ
«لیس لنا عَنکَ مَجالُ بَدیل»

۵ «ما انا وَحْدی بکَ مَنْ مُعرَمٍ (مُغرمٍ)»
«کَم لکَ قبلی شَغَفاً مِن قَتیلْ»

**مانای وشەکان:**

**دیل**: یەخسیر؛ **لیس**: نییە؛ **لنا**: بۆمان؛ **عنک**: لە تۆ؛ **مجال**: دەرفەت؛ **بدیل**: بارتەقا؛ **ما**: نە؛ **انا**: من؛ **وحدی**: تەنیا خۆم؛ **بک**: بە تۆ؛ **مِنْ**: لە؛ **مُعرَم**: شێتی ئەوین؛ **مُغرَم**: ئەویندار؛ **شغف**: پەردەی دڵ؛ **شَغَف**: بە هەڵپە لە دڵداریدا؛ **قَتیل**: کوشتە.

**پوختەی مانا:**

یارە جوانە تاقانەکەم! دەزانم بەجگە لە منیش هەزاران دڵداری تر هەن کە ئامادەن بە گیان و دڵ، خۆ بە قوربانی تۆ بکەن و لەسەر ژێردەرانەت بمرن. ئەوانە هەموو دیلی تۆن؛ گیرۆدەی داوی دڵدارین. منیش نەبم، تۆ بە هەزاران دڵدارت لە دەورەیە و پەکت لەسەر کەس ناکەوێ. بەڵام بۆ ئێمە دەڵێی چی؟ تۆ ئەو گەوهەرە تاقانەی کە وێنەی تۆ، لەم سەرزەویە تازە نایەتەوە بەر چاو. کێ هەیە وا بە دڵ و گیان خۆمانی دەگرێو بنێین؟ هەر تۆمان هەی.

٦ داروویٚ دەردیٚ مـــە تــــوییٖ جانـــیٚ مـــن
«هَـــلْ بِســـوی الْوَصْــــلِ شِـــفاءُ الْعَليـــلْ»

٧ ســەبر و ســکوون چوونــە مــە نیــف دەجلــەدا
لــەو ژ دو چــەشمان مــە دزیٚــت ئابــیٚ نیــل

٨ بەس نەمــە ســەد چەشمــە ژ چــەشمان دزیٚـت
«مَـــــزْجُ دَمٍ دَمـــــعُ عُيـــونی يَســــيلْ»

**مانای وشەکان:**

**داروو**: دەرمان؛ **هەل**: ئاخۆ؛ **بسوی**: بە غەیرەز؛ **وصل :** پێک گەیشتن؛ **شفاء**: خـۆش بوون؛ **غَليلْ**: نەخۆش، دەردەدار؛ **سکوون**: ئۆقرە؛ **دەجلە و نیل**: دوو ڕووباری گەورەن؛ **نیل**: خم، چویت؛ **چەشمە**: کانی، سەرچاوە؛ **مَزجْ**: تێکەڵ؛ **دَمْ**: خوێن؛ **دَمعْ**: ئەسـرین؛ **عُيون**: چاوان؛ **یسیل**: ڕەوان دەبیٚ.

**پوختەی مانا:**

بریندار و دەردەدارم؛ سەبر و قەرارم نەماوە. هەرچی ئارام و ئۆقرەم بوو، لە ناو ڕووباری فرمێسکی وەکوو دەجلەی بەتەوژمم، بە دەم شەپۆلی ئاودا چوو. فرمێسـکی ڕوون، لـە چاوانم وشکاوی هات. ڕەنگی فرمێسکی ئێستاکەم چویتین کە نیشانەی شینە بۆ دڵ. جا سووری تێکەڵ بە خوێن و وەک قوڕاوەسووری نیل دەنوێنن. هەر مـن وا نـیم؛ بـە سەتان چاو وەک سەرچاوە ئەسرینی خوێن هەڵـدەڕێژن. سا بـەزەییت پێمانـا بێـت. دیتنی تۆ دەرمانی هەموو دەردانە و خۆت دەزانی هەر گەیشتن بەو بالایـە، چـابوون و شا بوونی تیایە.

٩ پــوڕ مــە نــەزەر داتــە ژ ســەر تــا قــەدەم
«قـــد رجـــعَ الطَّـــرْفُ وَ عَقلـــی کَليـــلْ»

١٠ میسـلیٚ تــە مــا بوونــە؟ وەیــا مــا دەبــن؟
ڕۆژ کـــو تەجەللايـــە چ حاجـــەت دەلیـــل؟

**مانای وشەکان:**

**رَجعَ**: گەڕایەوە؛ **طرف**: چاو؛ **کَلیلْ**: کول و بێ سۆ؛ **ما**: بۆ؛ **دەلیل**: بەڵگە.

**پوختەی مانا:**

وا دیارە یار بەزەی بە مەلای هەژاردا هاتۆتەوە. خۆی شانداوە و مەلا تێری تێ ڕوانیوە کە فەرموویە: زۆرم ڕوانییە ئەو جوانییە. هەر لە سەر هەتا بەری پێم، بە چاو پێوا؛ بەلام هیچ تێنەگەیشتم. چاوم بە کولی و بێسۆیی، بە ڕووناکایی ئەنگووت و لە ڕوومەتی هەڵبەزییەوە و دابەزییەوە، بە شەکەتی. دەڕوانمە چی؟ چۆن پەسنت دەم؟ کە جوانی و بەڵگە بۆ جوانیت بهێنمەوە؟ خۆرەتاو کە خۆی نیشان دا، ئیتر بەڵگە بۆ بوونی خۆر، هیچ مانای تێدا نامێنێ. بۆچی جوان و نازداری وەکوو تۆ هەرگیز لە دنیادا هەبوە؟ یان تازە دێتە سەر زەوی؟

«مەولەوی ڕۆمی» دەڵێ:

بەڵگەیە بۆ بۆنی خۆشی گول، گولاو
ڕۆژی ڕۆشن شان دەدا تیشکی هەتاو[1]

**١١** «قَد سَلَبَ الرُّوحَ عَلی غَفْلَة»
«اَذْ هَجَمَ اَلْقَلْبَ بِطَرفِ کَحیلْ»

**١٢** گەرچی ل بەر زەرب و جەفان فیل بووم
بێ مەفەر ئەز مات کرم شاه و فیل

**مانای وشەکان:**

**سەلب**: داگیر کردن، زەوت؛ **غەفلەت**: نەخافڵ، لەنکاو؛ **هَجَمَ**: پەلاماری دا؛ **کَحیلْ**: بە سورمە ڕێژراو؛ **زەرب**: زەبر؛ **جەفان**: ئازاران؛ **شاه**: بێزەلەت و بەدشکڵ؛ **شاه**: داشە گەورەکەی شەترەنج؛ **فیل**: کەمزان و بیرسست؛ **فیل**: جانەوەرێکی زەلامە؛ **فیل**: داشێکی گەمەی شەترنجە؛ **مەفەر**: دەرەتان.

---

١. بوی گُل را از که جویم؟ از گُلاب    آفتاب آمد دلیلِ آفتاب

**پوختەی مانا:**

یار بە تیلەی چاوەکانی- کە هەر دەڵێی بە کلە سوبحانی ڕێژراون- لە پڕ دای بە سەر دڵمدا و لە نەکاو بێهەست و چرپە گیانی دست بە سەردا گرت و تالانی کرد. هەرچەند من خۆم لە بەرانبەر زەبر و ئازارەوە وەکوو فیل بە هێزدەزانی، لە کایە و گەمەی دڵداری، گیانم دانا و ئەو سەروەر و شای جوانانە، وەهای منی- فیلئاسایی- دامالی، کە هیچ دەرەتان نەماوە لێی دەرچم و بیر و مێشکیشم کار ناکا کە تەگبیرێک بۆ خۆم بکەم. بۆیە دژومات داماوم و لەو گەمەدا مات کراوم.

۱۳ جان ددرم گوفت (گفت) ب یەک بووسە دە
لێ ببتن لەعلێ شەکەرخا کەفیل

**مانای وشەکان:**

**گوفت**: وتی؛ **گفت**: بەڵێن؛ **بووسە**: ماچ؛ **شەکەرخا**: شەکرکرۆژ؛ **کەفیل**: دەستەبەر.

**پوختەی مانا:**

یارم فەرمووی: خەمێ مەخۆ! ئەگەر گیانت لە ڕێگەی دڵداری دەرچێ، لێوی ئاڵی شەکربارم دەستەبەرە و بەڵێن ئەدا کە لەو دنیا بە ماچێک بتخوێنێتەوە. دەی‌سا من چۆن ئەو سەودایە بە گیان ناکەم؟

«هەژار» دەڵێ:

سەر و ماڵ و گیانم دا بە ماچێک     وتی پێک نایە زۆری من کەمی تۆ

۱۴ گەرچی د نیف حەلقەیی شیرانم ئەز
«لَیسَ عَلَینا لِعِدانا سَبیلْ»

۱۵ زۆر «مەلا» فیرقەتێ ئەبتەر کرین
«اِنَّ مِنَ السّاعَةِ یَوْمَ الرَّحیلْ»

**مانای وشەکان:**

**لیسَ عَلَیْنا**: بە سەر ئێمەدا نییە؛ **عِدا**: دوژمنان؛ **سَبیل**: ڕێگە؛ **زوور**: زوڵم، زۆر؛ **زوور**: زویری و خەم؛ **زۆر**: گەلێک؛ **ئەبتەر**: دوابڕاو و بێپیت؛ **ساعە**: ڕۆژی قیامەت؛ **یَوْم**: ڕۆژی بەرانبەری شەو؛ **رَحیلْ**: بار کردن.

**پوختەی مانا:**

زۆر لەو خەڵکە کە دەبینن زەرد و کز و لانەوازم، وا دەزانن دوژمنان جزیایان داوم؛ نەخێر. من لە ناو ڕیزی دڵداران- کە هەموو لە سایەی دڵیان وەک شێری بەهەیبەت وان و کەس ناوێرێ بە دوژمنی توخنیان کەوێ- ترسم لە دوژمنان نییە و دوژمنان ڕێیان ناکەوێ بگەنە من. بەڵام دەستی زۆری دووری، لە پەڕوپۆی کردوومەوە و خۆشی لە بیر بردوومەوە و پیتوپێزم لێ براوە. ڕۆژی جیا بوونەوە لە یار، پاژێکە لە ڕۆژی قیامەت؛ کە منداڵیش لە عەیبەتانی پیر دەبن.



## بادەی ئەبەدی

١ شاهیدێ قودسی‌نیشان حوسنە ژ ڕەمزا ئەزەل
دا مە ب دەستێ سوری جامێ مەیا لەمیەزەل

٢ مەی کو بچت ساغەرێ هێژ د دەست دلبەرێ[1]
سوندێ ب خالق دخۆم ڕۆژە د بورجا حەمەل

**مانای وشەکان:**

**قودس**: پاکی و پیرۆزی؛ **قودسی نیشان**: سەر بە بارەگای بەرز و پیرۆزی خودایی؛ **لەمیەزەل**: هەرگیز لا نەچووە، هەمیشەیی و نەمر؛ **ساغەر**: پیالە؛ **سوند**: سوێند؛ **خالق**: درووسکار، داهێنەر، مەبەست خوایە؛ **حەمەل**: بەرخ؛ **بورجا حەمەل**: بورجی هەوەڵ بەهارێ، خاکەلێوە.

**پوختەی مانا:**

دڵبەری من- کە لە جوانی ئەزەلی و ئەبەدی خودا، نیشانەیەکی پیرۆزە- بە دەستی دڵڕاکێشی خۆی، پیالەیێک بادەی بارەگای دوا نەهاتووی خوای مەزنی دایە دەستم. بادە لە ناو پیاڵەدا، کە هێشتا هەر لە دەست یاردا، دەتوانم سوێند بە خوا بخۆم کە ڕۆژێکە لە سەرەتای بەهاردا دێتە بەرچاوان؛ کە ئەو سەردەمانە ڕۆژ لە هەموو دەمان گەشترە.

٣ دێم د جامێ مە دی سورێ د مەدامێ مە دی
لەو مە ژ مەیخانەیێ گرتییە بەر دەر مەزەل

---

[1] زفنگی و سەلمان: «مەی کو بچت ساغەرێ د دەستێ وێ دلبەرێ»

۴ هــەر ژ کەڤــانێ ب وەش قــەبزە زەرێ گۆشــە ڕەش
گەزمە ب جوهت، تێنە دل کەس دمرت بــێ ئەجــەل؟

**مانای وشەکان:**

**مەدام**: هەمیشە؛ **مەدام**: بادە؛ **بوەش**: وەشـێنەر؛ **قەبزە**: دەسـگرە، جێدەسـت لـە شـیر و کەواندا؛ **جوهت**: جووت؛ **ئەجەل**: وەختی دیاریکراوی مەرگ؛ **مەزەل**: مەنزڵ، جێگەی ژیان.

**پوختەی مانا:**

دە پیاڵەدا وێنەی ڕوخساری یارم دیت. لـەو مەیـەوە ڕازی دڵڕاکێشـی خـودا، خـۆی نیشان دام. بۆیە هەر وام لە بەر دەرکی مەیخانەدا، بووم بە سیپاڵ و کردوومەتە ماڵـی حاڵی یەکجاریی خۆم.
دایم و دەرهــەم لـە کـەوانی تیرپـرژێنی دەسـتوەشـێنی برۆکـانی، کـە زەردە وردە مووەکانی ناوەراستی، وەک دەستگیرەی کەوان زەرد و هەر وەک پەڕەتیری لـە زێـڕ، وانە و ئەو تیرانە گۆشە ڕەشن و بە ڕەشاوی دڵی ئێمە ئاو دراون؛ جووت-جووت تـیرم بۆ دەبارن؛ هەر جارە لـە برۆیەکـەوە و هـەرجارە لـە چاوێکـەوە. هـەموو تـیر لـە دڵ دەنیشن. کە چی بەو حاڵەش هەر دەبزووم و هێزی ناڵینم هەر مـاوە. بـۆ نـەمردووم؟ چۆنکە خودا هێشتا لە ڕۆزیی نەکردووم و هیچکەس تا وەختی خۆی نەیە، نامرێ.
«شێخ ڕەزا» دەڵێ:

دەزانی بـــۆ لـــــە دووری تـــۆ نـەمـــــردم
ئــەمن سـەگـمـەرگم و گیانسـەخت و دڵـڕەق

۵ حوســن و ســوڕا ســوورەتێ کــەس ددرت قودرەتــێ
لــەو د ئەســل دوورە ژێ تەعنــەیی «لَمّـا اَفَـلْ»[1]

---

١. خوا لە قورئاندا دەربارەی ئیبراهیمەوە فەرموویە: «کە شەوی لێ تاریک داهات، ئەستێرەی دیت؛ گوتی ئەمەیە خودای من. کاتێ ئەستێرە ئاوا بوو، گوتی: خۆشم لە ئاوابوان نایە. کاتێ کە مانگی دیت هەڵات، گوتی: ئەمەسا خودای من. هەر کە دیتی مانگ ئاوا بوو، گوتی ئەگەر خودای خۆم شارەزام نەکات، یەکێ دەبم لە گەلی ڕێلێونبوان. وەختێ دیتی وا ڕۆژ هەڵات، گوتی: ئەمە خودای منە،

**مانای وشەکان:**

**سوورەت**: شکڵ و وێنە؛ **قودرەت**: توانایی؛ **ژێ**: لێ؛ **تەعنـە**: تـەوس، تانـە؛ **لَمّـا اَفَـلْ**: وەختێ ئاوا بوو...

**پوختەی مانا:**

جوانی و دلکێشی لە یاردا، لـە دەسـکردی هـەموو داهێنـەرێکی جیـا لـە خـودا، زۆر بـەدوورە. ئـەو جوانییـە نـە وەک ئەسـتێرە یـا مانگـە. نـە وەک ڕۆژە کـە ئـاوا بـێ و تانەوتەوسی تێ بگیرێ. جوانی یارم کە وێنەیـەک لـە جـوانی خـودای مەزنـە، پەیـدا نەبووە؛ لە هەرە پێشینەوە هەبووە و هەر دەشمێنێ و هەلاتن و ئاوا بوونیشی بۆ نییە.

٦ زۆربـە وە تێـتن عـەرەب تێـک چەڤـاندن قەسـەب
قەنج ب چەهڤان مـە دی جـەنگ و جیـدالا جەمـەل[١]

**مانای وشەکان:**

**زۆربە**: بەشی هەرەزۆر؛ **زوربە**: بەتەوژم؛ **عەرەب**: لـە زاراوەی بـوێژە کوردەکانـدا، بـە مژۆلی جوانان دەڵێن؛ **چەڤاندن**: تێکیان ڕاکرد؛ **چەڤـاندن**: چەماندییانـەوە؛ **قەسـەب**: قامیش؛ **قەسەب**: ڕمبی بەقەف؛ **جەمەل**: وشتری نێر.

---

ئەمە لە گشت گەورەترە. وەختێ خۆرەکەش ئاوا بوو، گوتی خزمینە بیزانن من بە دوورم لەو شتانەی ئێوە بە شەریکی خوای دەزانن.»

١. شەڕی جەمەل بەناوبانگە. دوای کوژرانی عوسمانی خەلیفەی سێهەم، تاوان خرایە سـەر عـەلی، ئایشـەی ژنی پێغەمبەر، دەگەڵ تەلحە و زوبەیردا- کە هەردووکیان ئەسحابە بوون- بۆ خوێنەخۆیی لە عوسمان، لەشکریان هێنا سەر عەلی. لە بەیانی ڕۆژی دەی مانگی جیمادی دوهەمی ساڵی سیوشەشی کۆچی، لە نزێک بەسرا دوو لەشکر پێک هەڵپڕژان و تێکچڕژان. ئایشە لە کەژاوەدا- کە لە سەر پشتی وشتر بوو- سەرکردەیی شەڕی دەکرد. تەلحە لە مەیدانا کوژرا. زوبێر بە پەندی عەلی کرد، لە شەڕەکە خۆی کێشاوە؛ لە مەیدان دەرکەوت و کوژرا. تا بەرە-بەری ئێوارە، بلێسەی شەڕ هەر گەرم بوو. یەک لە چەکدارانی عـەلی، بـە نـاوی مـالکی ئەشـتەر، خـۆی گەیانـدە بـەر کەژاوەکەی ئایشە و پەلی وشترەکەی پەی کرد. کەژاوەکە بە لادا هات، عـەلی ئایشـەی بـە دیـل گـرت. زۆر بـە حورمەت ناردییە بەسرا و بە موحەممەدی برایدا- موحەممەد کوڕی ئەبووبەکر- بەڕێی کردەوە مەدینە. لەو شەڕە عەلی سەرکەوت و دەستی بە سەر عیراقدا گرت. شەڕ بە ناوی وشترەکەی ئایشەوە ناوی دەرچوو. «هەژار»

**پوختەی مانا:**

وەختێ دەمدی یاری نازدار، بە چاوی بەڵەک دەیڕوانی و بژانگی درێژ و کـورتی، وەک ڕمب و تیری ڕەش دەچوون کە پێلووی پێکدا دەهاتن، وام سەرشێوا و کەوتمە دەریای مەترسی و خەیاڵاتەوە، کە شەڕی جەمەل دەبیـنم و هـەروا چەکـداری عـەرەبین بـە تەوژم پەلاماری یەکتر دەدەن و بە تیر و بە ڕمب، تێک بەر بوون.

٧ شـــیر و ڕمـــان ڤـــێکڕان پەنجـــە بـــرن تێکـــران
لـــەو مـــە دکـــن ژێکـــران قیمـــە دکـــن دل دگـــەل

**مانای وشەکان:**

**ڤیکران**: تێکڕا؛ **قیمە**: گۆشتی هەنجناو.

**پوختەی مانا:**

بە چاوی خەیاڵ باش دەمدی، کە چەکدارە عەرەبەکان، بە شیر بە ڕمب، بە چنگۆڕک، یەکتر دەکوژن و دەدڕن. هەر بۆیەشە کە ئەو مژۆڵە ڕەشانە، لاسای عەرەب دەکەنەوە. ئێمە گەلی دڵدارانیان، تێکڕا وەبەر زەبر داوە و دڵمانیان پێ هەنجناوە.

٨ نـــازک و قـــەنجا شـــەپال دل ڤـــەگەرینت مـــەحال
لـێ ژ مـە دێ دل ببـەت دل ل مـە دەت موحتەمـەل

**مانای وشەکان:**

**محال**: نەشیاو؛ **موحتەمەل**: وێدەچێ، ڕێگەی تێدەچێ.

**پوختەی مانا:**

یاری جوان و خونچیلانە و نەرم و ناسک، تازە کە دڵمان دەسـتێنێ، ڕێـی تـێ ناچـێ هەرگیز بۆمان وەگەڕێنێ؛ بەڵام ڕەنگە لە جیاتی ئەو دڵبردنە، دڵمان داتـێ و تۆزێـک دڵداریمان بدات.

٩ نەیشـــەکەر و دیمدورێ دامـــە ب دەســـتێ ســـورێ
جام و قەدەح شوبهێ ئاف لەو مـە رەوان تـێن غـەزەل

١٠ گـەرچی د چەهڤـێن «أنـا» عالـەم «مـەلا» کـر فـەنا
«دونَ فَنــــا بـــابِکُمْ إنــــهُ عَبْــــدٌ آقَــــلّ»

**مانای وشەکان:**

**انا**: من؛ **عالەم**: هەموو ئافەریدەی خوا؛ **مەلا**: پڕ؛ **فەنا**: لەبەین چـوو، نـەبوو؛ **فـەنا**: بـەر دەرگای حەوش؛ **باب**: دەرگا؛ **انّهُ**: ئەو؛ **اَقَلّ**: کەمترین.

**پوختەی مانا:**

ئەو بەژنقامیشە شەکرەی لاڕوومەت وەک مرواریە، بادەیەکی پڕ لە ڕاز و دڵڕاکێشی، دە ناو پیاڵە و جامدا دامێ. پیاڵە و جام لە ڕەنگی ئاو بوون. بۆیە هەڵبەستەکانی مـن، ئەمڕۆ وەک ئاوی ڕەوانن. من بەو مەیە وا سەرخۆش بـووم، هـەموو دنیـا لـە بـەرچاوم تاوایەوە و هەستم نەدەکرد هەر بشبێت. خۆم وا تێکەڵ بە خودا دیت، بانگاوازم دەکرد «هەر خۆم». بەڵام هەرچەند کە خۆم لە تۆشـدا دەبیـنم، وەکـی دیکـە مـن لـە بـەر دەرگانەکەی تۆدا، سەری نیازم لە سەر خاکە و خۆم بە کەمترین و سـووکتر بەنـدەی بارەگات دەزانم.



# مەنسووره دڵ

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ئـــیرۆ ژ رەمـــــزا دیم دوریٚ | میننـەت کـو مـن مەسـرووره دل |
| | دلبـــەر ب فنجانـــا ســـورِیٚ | مـــەی دا مـــە و مـــەخمووره دل |
| ٢ | ڕەمـــزەک نهـــین ئاڤـــێته دل | میهـــریٚ ژ بـــاتن مێهتـــه دل |
| | شـــەهزادەییٚ ســـورِ ڕێهتــه دل | شەهکاســـــەیا فـــەرفووره دل |
| ٣ | هۆســتاییٚ عیشــقیٚ دل هەڤــۆت | سەر تـا قـەدەم هنگـی دسـۆت |
| | رەمــزا «أنــاالحَق» هــەر دگـۆت | بـــاوەر بکـــن مەنســـووره دل |

**مانای وشەکان:**

**مەسروور**: شاد؛ **مەخموور**: مەست؛ **مێهت**: مژی؛ **ڕێهت**: ڕژاندی؛ **فـەرفوور**: کاسـەی چینی، فەخفوری؛ **هەڤۆت**: فێری کرد؛ **هەڤۆتن**: فێر کردن، تـەعلیم؛ **هنگـی**: ئەوسـا؛ **اناالحَقْ**: من خوام؛ **مەنسوور**: سەرکەوتوو؛ **مەنسوور**: حوسێن کوڕی مەنسوور کـە بـە مەنسووری هەللاج بەناوبانگە. خواناسێک بـوو جەزمـە دەیگـرت و لـە وەخـتی حـاڵ لیٚهاتندا، هاواری دەکرد: «من خوام». لەسەر ئەو تاوانە ساڵی ٣٠٩ی کۆچی بەرامبەر بە ٩٢٢ی میلادی گرتیان؛ جەزرەبەیان دا و کوشتیان.

**پوختەی مانا:**

سوپاس بۆ خوا من ئەمرۆ زۆر دڵم شادە. دڵبەری مـن کـە شـا و شـازادەی جوانانـە و ڕوخساری وەک مروارییە، لە بادەی دڵڕفێنی خۆی، فینجانێکی بۆ تێکردم. بـادە هـەر گەیشــتە دڵــم، لــە ڕازی نهێــنی و گرینــگ، ئاگــادار بــووم. دڵ لــە دەروون ئـــەوینی هەمیشەیی مژت؛ وەک شاکاشی گەورەی لیٚ هات کە پڕ بیٚ لە مەی ئەوینیٚ. ئـەوجار مامۆستای ئەوین هات؛ دڵمی فێری دڵداری کرد. وا لەو ساوە دڵ سەرتاپای بۆتە ئاگر و گڕی بەرزە و «هەر خۆم خودام» دەدرکێنیٚ و بویتە هاودەنـگ دەگـەڵ مەنسـووری

هەللاجدا. باوەڕ بکەن دڵم هیچ تاوانی نییە و لە ئەویندا سەرکەوتووە و هەرچی بڵێ، پێویستە باوەڕی پێ بکەن.

| | | |
|---|---|---|
| ٤ | دل لێ بدەت نوورا مەیێ | وەقتێ سەواش و هەیهەیێ |
| | فەهم ئەر بکت وەحیا نەیێ | ژێ دت خەبەر مەئموورە دل |
| ٥ | نوورا ژ قودرەت لێ دو نوون | ژێرا دنالن ئەرغەنوون |
| | وەر ئایەتا عیشقێ بخوون | خوەش نوسخەیەک مەستوورە دل |

**مانای وشەکان:**

**سەواش**: شەڕ و هەرا؛ **هەیهەی**: گوڕە-گوڕی مەستانە؛ **وەحی**: وڵامی خوا؛ **مەئموور**: فەرمانبەر؛ **ئەرغەنوون**: ئەرگانوون، سازێکە یۆنانی پێشوو سازیان دەکرد. حەوت لوولەی کورت و درێژی هلۆڵیان لە یەکتر دەبەست؛ وەک بلوێر تێیان دەتووڕاند. مەزامیریشیان پێ دەگوت. سروودی داود پێغەمبەر کە ناو نراون مەزامیر، وا دیارە حەزرەتی داود لە لێدانی ئەو سازەدا زۆر ساز بووە. سازێ تریش بە ناوی ئەرغونوون هەیە کە وەک دەفەی جۆلا دەچێ و زۆر هەودای تێدایە. لەزاراوەی شاعیراندا، هەموو ساز و ئامرازێکی موسیقایە؛ **نوسخە**: نووسراوە؛ **مەستوور**: خەتدراو.

**پوختەی مانا:**

دڵ گەر بەر تیشکی مەی کەوێ، لە جەنگەی مەستی و هەو- هەوێ، لە وەحیی بلوێریش بگات، فەرمانبەرە خەبەر دەدات. روخساری یار، تیشکی توانایی خودایە. خوا ئەگەر سوێندی بە نوون خوارد، دوو نوون لەو روخسارەدایە کە بوونە قاشی برۆیان. هەرچی ساز و بە ئاوازن، بۆ برۆی ئاواتەخوازن و لە تەهی دڵیان دەناڵن.

وەرە سوفی ئایەتی ئەوین وەخوێنە و ڕامەمێنە! تا بزانی کە دڵ نوسخەی خەتدراوی ئایەتی تیشکی ڕووی یارە و زۆریش خۆش نووسراوەتەوە.

| | | |
|---|---|---|
| ٦ | تەفسیرێ سیررا ئایەتێ | عارف دڤێتن گۆهـ دەتێ |
| | رازا رمووزێن قودرەتێ | گەر دین بکت مەعزوورە دل |

| | | |
|---|---|---|
| ٧ | دل کەعبەیـــە مەولایـــە لـــێ | نـــاریێ کـــەلیم ئیســـایە لـــێ |
| | بـــانگی «انـــا الله» دایـــە لـــێ | هـەم کەعبـە و هـەم تـوورە دل |

**مانای وشەکان:**

**تەفسیر**: ڕاوە، ماناکردنەوە؛ **گۆهـ دەتێ**: گوێ بداتێ؛ **رمـووز**: ئیشـارەتگەل؛ **دیـن**: شـێت، لێوە؛ **مەعزوور**: عوزر قبوڵ؛ **مەولا**: بەردەست؛ **مەولا**: دۆست؛ **مەولا**: گەورە و خاوەن؛ **نـار**: ئاگر؛ **کەلیم**: دوێن؛ **کَلیمُالله**: نازناوی مووسایە کە خوا دەیدواند؛ **اناالله**: من خودام.

خوا لە قورئانی پیرۆزدا، ڕوو بە پێغەمبـەر فەرموویـە: «ئـەدی تـۆ چیرۆکـی مووسـات گەیوەتە لا؟ کە ئاورێکی چاو پێ کەوت و بە خێزانەکـەی خـۆی وت: ئـاگرێکم بـەدی کردووە ئەشێ بچم بەڵکوو سەرە بزووتێکتان بۆ بهێنم. یان لەسەر ئەو ئاگرەوە تووشی شارەزاییەک ببم. وەختێ لێی نزیک کەوتەوە، بانگی لـێ کـرا: مووسـا! مـن خـوداتم سۆڵەکانت دابکەنە، تۆ لە ناو شیوی پیرۆزدای.»

**پوختەی مانا:**

ئایەتی خوا پڕە لە ڕازی نهێنی. خواناسی بەڕاستی دەوێ گوێچکـەی بـداتێ و تێبگـا مانای چییە؟ ئیشارەت و ڕازی توانایی خودایی، ئەگـەر دڵ شـێت و دیـن بکـا، نابـێ سەرکۆنەی دڵ بکرێ. دڵ کابەیە و خودای تێدا. ئاگرەکەی مووسای بانگ دەکرد، لـە چاوگەی دڵدا داییسا و «من خوداتم»ی بە مووسا گوت. دڵ هەم کابەیە هەم توورە.

| | | |
|---|---|---|
| ٨ | سـەد جـۆ و سـەد جووبـارە تـێ | سـەد گولشـەن و گـولزارە تـێ |
| | چەندان ژ عیشقێ نارەتێ (یارەتێ) | سـافی نـەزەر دی نـوورە دل |
| ٩ | سـوحبەت کوکامیـل بـوو بـرێ | جـارەک ب جایـێ عەنبـەرێ |
| | قـەلبێ ب ئاقـێ مەجمـەرێ | خـوەش عەنبـەر و کـافوورە دل |

**مانای وشەکان:**

**گولشەن**: گوڵجار؛ **کامیل**: بێکەمایەسی؛ **بـرێ**: بریا، خۆزیا؛ **عەنبـەر**: بۆنخۆشـێکە لـە ورگی جورەماسییەکدا؛ **مەجمەر**: مقەڵی، ئاگردان؛ **کافوور**: شیرەی دارێکە لە ژاپون و

چین و ئەندونیزیا دەڕوێ؛ بۆنی خۆشە و بۆ سەریشەی بە کاردێنن و لەشی مردووی پێ دەهەنوون تا نەگەنێ. بۆ بۆنخۆشیی، بەسەر ئاگریشیدا دەکەن.

**پوختەی مانا:**

ئەو دڵەی من، لە پیرۆزی ئەوینەوە، بۆتە بەهەشت. پڕیە لە جۆگە و رووبار و تژییە لە گوڵ و گوڵجار و ئەوندەی دڵداری تێدا و ئاوری ئەوین ئەوندەی تێ هەڵگراوە، ئەگەر بە چاوی ڕوون و پاک لێی بنۆڕی، ئاگر نییە و تیشکی خوایە. خۆزی هەرگا کۆڕی یاران گەرم دەبێ، جارێک لە جیاتی عەنبەرێ، دڵم بخەیە سەر پۆلوان، لە ئاگردانی مەجلیسدا. تا بزانی چۆن لە عەنبەر و کافووریش بۆنخۆش‌ترە.

| | | |
|---|---|---|
| ١٠ | شۆخ و شەپالا لەب ژ قەند | ئەو نازکا وێ قەنج و رەند |
| | وێ دل ژ دل دلدا و خوەند | ئیرۆ یەقین فەغفوورە دل |
| ١١ | ئەر دل ژ تە مەسروور بتن | من ژی «مەلێ» دەستوور بتن |
| | دێ کت جیهان پوڕنوور بتن | لێ دائیما ڕەنجوورە دل |

**مانای وشەکان:**

**قەنج**: لەبار؛ **رەند**: جوان و پەسند؛ **خوەند**: خوێندییەوە؛ **فەغفوور**: قەراڵی مەملەکەتی چین؛ **دەستوور**: ئیجازە؛ **دێ‌کت**: کارێکی وا دەکا؛ **رەنجوور**: نەخۆش و دەردەدار.

**پوختەی مانا:**

یارە شۆخ و خونچیلانە و لێو قەندەکەم، ئەو ناسکە جوان و ڕێک و دڵ‌پەسندە، ئەمڕۆ بە ڕاستی و هەر بەدڵ، دڵی هەژارمی خوێندەوە و لاواندەوە. دڵی من ئێستا دەتوانێ بە قەراڵی چینیش بڵێ: کاورای هەتیمچە! چکارەی؟ من هەمیشە دڵم بە دووری و بێ‌مەیلیت نزار و دەردەدار بووە. بەڵام ئێستا کە دڵداریێت داوەتەوە ئەو شادییەی هەر وا بمێنێ و منی مەلاش ڕێگەی بدەم کە ڕازی دڵ بدرکێنێ، لێم روونە کارێ وا دەکا هەموو دنیا پڕ بێ لە نوور.



# زەکات بە عەبد

| | |
|---|---|
| ١ | شـــەرەبەتا لاموبێیـــان ئـــەز ب حـــەیاتێ نـــادم<br>بادەیـــا لـــەعلێ ب ئاڤـــا زولوماتـــێ نـــادم |
| ٢ | حوور و ویلـدان و پـەری جوملـە جـەما بـن ئـیرۆ<br>موویـــەکی پـــێ ژ خـــەتێ وێ بـــت و لاتـــێ نـادم |
| ٣ | گـەر بـدت دەسـت تـەوافا پـێ و دەسـتان بگـرم<br>وێ مـــەجالێ ب وقووفـــا عـــەرەفاتێ نـــادم |

**مانای وشەکان:**

**شەربەت**: شلیٔنۆشـین؛ **لاموبـێ**: لـەب، لێـو؛ **حـەیات**: ژیـان؛ **حـەیات**: ئـاوی ژیـان؛ **زولومـات**: تاریکستان؛ (سەرچاوەی ئاوی حەیاتێ لە نـاو تاریکسـتاندایە)؛ **جوملـە**: بـە کۆمەڵ، **تەواف**: لەدەورە گەڕان.

**پوختەی مانا:**

تەڕایی وشەی ئەو لێوانەت، نادەم بە ئاوی حەیاتێ. چۆن بادەی ئاڵی خودایی بە ئـاوی تاریکستانێ دەگۆڕمەوە؟!

هۆری و لاوانی بەهەشت و فریشتە و پەری کۆوە بن و بێنە سەودا، من هـەموویان بـە تێکڕایی بە تاڵێک مووی سەر و پۆری ئەو بت و لاتەی خۆم ناکرم. ئەگەر خودا بەختم بدا و دەدەوری یارم بگەڕێم و لە جیاتی بەردی ڕەش ماچ‌کەم، ڕێگـەم هـەبێ بکەومـە سەرپا و پلی و دەستەکانی ڕابمووسم، پێم لە ڕاوەستانی حاجیان لە عەرەفاتێ باشتر و بەخێرترە.

٤ ئەز و یار گەر شەڤەکێ هەردو هەماغووش ببین
لەیلەتولقەدرە مە ئەو شەڤ ب بەراتێ نادم

٥ جانێ شیرین کو ژیاررا ب خودان ئەز دکرم
نە ب یارێ خوە د وەقتێ سەکەراتێ نادەم

**مانای وشەکان:**

**ئاغووش**: هەمێز، هەمبێز، باوەش؛ **لەیلەتولقەدر**: شەوە پیرۆزەکەی ڕەمەزان؛ **بەرات**: شەوی پازدەی شابان کە ڕسق و ڕۆزی تێدا بەش دەکرێ؛ **خودان**: ساحیب، خاوەن؛ **سەکەرات**: وەقتی گیانەلاو.

**پوختەی مانا:**

گەر من و یار، شەوەکی یەکدی دەباوەش بگرین، شەوی قەدری منە؛ هەرگیز بە بەراتی نادەم. یار ئەگەر گیانی منی جارێ بە خاوەن کربا، لە سەرەمەرگ و دەمی گیان لە بەدەن دەرچوونا، جگە لەو یارە، گیانم بە کەسێ تر نادەم.

٦ شەربەتا زەهرێ هەلاهیل کو حەبیبێ مە ب دەست
ب گولاب و شەکەر و قەند و نەباتێ نادم

٧ نە ب قانوون کو ئیشارەت ب شیفایێ بکرت
ئەز هیلاکێ خوە د عیشقێ ب نەجاتێ نادم

٨ تەلبە کر وەسلێ ژ دلبەر مە ب عنوانێ زەکات
گۆ تو عەبدی و ب عەبدێ خوە زەکاتێ نادم

**مانای وشەکان:**

**قانوون**: ڕێوشوێن؛ **ئیشارەت**: دەس‌نیشان کردن؛ **شیفا**: خۆش بوونەوە؛ **نەجات**: ڕزگاری؛ هەروەها **قانوون، شیفا، ئیشارەت** و **نەجات**، ناوی چوار لە کتێبەکانی ئەبووعەلی ئیبنوسینای بەناوبانگن (٣٧٠ تا ٤٢٨ی کۆچی)؛ **عینوان**: ناوونیشان؛ **عینوان**: مەبەست.

**پوختەی مانا:**

جامی ژەهراوی هەلاهیل بێ کە یار بمداتێ، بە گولاو و شەکەر و قەند و نەباتی نادەم. گوێم لە ڕێوشوێنی حەکیمان نییە چاکم کەنەوە. لە ئەویندا بمرم، چیمە بەسەر ڕزگاری؟!

وتم: هۆ جوانێ! بەشم کوا لە زەکاتی جوانیت؟ وتی: تۆ عەبدی؛ زەکاتی من بە کۆیلان ناشێ.

٩ وێ ب پەیکێ بکرین مات رەقیبێ دیسا
ب روخ و فیل و فەرەس ئەز شەهوماتێ نادم

١٠ د سەمایا سەحەرێ دەست ب کەس دی ئیرۆ
غەیرێ شیرینقەد و مەوزوونحەرەکاتێ نادم

١١ هاتە دەستێ مە درەقسێ و دگۆ بل ژ «مەلێ»
دەست ب کەس دی د سەمایا کو «مەلا» تێ نادم

**مانای وشەکان:**

**پەیک**: پیادەی شەترنج؛ **رەقیب**: چاو نەزێر، هاوبازی؛ **روخ**: قەلا، داشێکی گەمەی شەترنجە؛ **فەرەس**: ئەسپ؛ **فیل و فەرەس**: دوو داشن لە شەترنجدا؛ **شەهومات**:شامات، واتا، شای شەترنج لە کار کەوت و مرد. (یان: ماتەی دا)؛ **مەوزوون**: ڕێکوپێک؛ **حەرەکات**: بزاو؛ **بل**: جگە؛ **کو مەلا تێ**: کە مەلای تێدا بێ؛ **شامات**: شامەگەل؛ **شامە**: خاڵی سەرڕوو.

**پوختەی مانا:**

چاوچنۆکی پیس و شۆفار و زمانشڕ، کە لە بازاڕی دڵداریی بویتە سەربار و چەڵومل، ئەوا دیسان تووشی ماتیی کردم. پیادەی پێیە و دەیەوێ بارگین و فیل و قەلاکەشم لە ناو بەرێ و پاشان شاماتم پێ بلێ. من هەرگیز نابێ بدۆڕێم و قەت ڕێگەی شاماتی نادەم. وا ناکەم لە سەیری خاڵان دەگەڵما ببێتە هاوبەش. بڕیارە ئەمڕۆ بەیانی، کۆڕی سەما دامەزرێنن. من دەستی خۆم، با هەرکێ بێ، بەجگە لەو بەژنباریکە و لارولەنجە

ڕێکوپێکە و خوێن‌شیرینە، بە کەس نادەم. ئۆخەی شوکور ئەوا لە ڕێگەی هەڵپەڕکێ، یاری شۆخم دەستی گرتم و بە دەم فەرمووی: لە هەر کۆڕی داوەتێکدا مەلای لێ بێ، من جگە لەو دەستی هیچ کەسی تر ناگرم.

هەر لەبارەی شەترەنجەوە «حەریق» دەڵێ:

هەموو عالەم دەزانێ من کە سەودای زولفی تاتاتم
لە خانەی کولمدا کۆڵم بە فەرزی شای روخت ماتم

«کوردی» دەڵێ:

تۆ بەو دوو ڕوخی خۆتەوە وەک شاهی و فەرزە
دایم کە لە پێش ئەسپەکەتا وەک نەفەرت بم

«هەژار» دەڵێ:

کش‌وماتە جیهان لە ژوانی لە نوێ
گەلاوێژ بۆ مە دەروانێ لە سەر سوێ
چریکەی بولبولێک دێ وا دەزانم
چپەی ماچی من و تۆی هاتە بەرگوێ



# فینجان و جام

١ عیــده وو دا عالــەمێ بانگــێ ســەفایێ خــاس و عــام
ماهێ نەو ئەبروو نوماندن چوو ژ بــەر عــەور و غــەمام

٢ خــوەش ب دۆر جامــێ ئیشــارەت‌کر هیلالــێ ســاقیان
ماهتـــابێن زوهرەســـیما چـــاردە ســـالێ تـــەمام

٣ نامە تەی کر رووزەیــێ عیــدێ ڤــە کــر فەسـلا مــەیێ
لێ ب زەمزەم تــێن ب ئـاوازێ نــەیێ فینجـان و جـام

**مانای وشەکان:**

**عەور**: هەور؛ **غەمام**: هەور؛ **ساقی**: مەیگێڕ؛ **ماهتاب**: مانگەشەو، ترێفە؛ **تەی**: پێچانەوە؛ **رووزە**: رۆژوو؛ **فەسل**: کڕ، هەرەت؛ **زەمزەم**: زەمزەمە، ویرەویر.

**پوختەی مانا:**

ئەوا جێژنە و هەموو عالەم، گەورە و کچکە، گش‌لەگشتیان بە دڵخۆشی مـژدە دەدەن، کەوا ئەمڕۆ مانگی لەنوێ- وەک برۆی یار- خۆی نیشان دا و پەڵەهەوری لەبەر ڕەوین. بۆ مەیگێڕانیش برۆی یار- کە لە مانگی یەکشەوە گەلێک جوانترە- هاتە بـەرچاو. بـە گۆشەیەکی نازاویی تێی گەیاندن کە دیسان بادە بگێڕن. جا ئەگـەر مـانگی ئاسمانـێ، زەرد و لاواز و باریکـە و هــیچ ڕووناکاییشــی نییــە، مـانگی مــەیخۆر و مەیگێـڕان، لـە ڕوخسارێکەوە دیارە کە لە باتی چاردە شەوی مانگێ، ئەو چاردە ساڵی تەواوە و ڕۆژ لە ڕۆژێ جوانتر دەبێ و ئاوا بوون و کەم کردنیشی بۆ نییە. دیمەنی- بە تیشک و ڕوونی- وەک زوهرەیە. بەڵام پتر لە مانگی شەوانی چاردە، ترێفەی داوەتە دنیا. نامـەی ڕۆژوو پێچرایـەوە و فـڕێ درا. هـەرەتی مـەی وەخواردنـە. لـەم ڕۆژەدا، فینجـان و پیاڵـەی مەیگێڕان، بە دەنگ و سەدای بلوێران، هەر خرینگە و زرینگە و ویرەویریانە.

«خەییام» دەڵێ:

ئۆخــەی کــە نــەما بــاوی خەیــاڵی خاڵــی
مەیگێــڕی دەبیــنمەوە بــە بــادەی ئاڵــی
گێــرەی رەمــەزان بــەر بــوو ئــەوا جێــژن هــات
دەمبێــنی لــە دەم گــا و کــەران داماڵــی![1]

۴ شـاهیدێن گولرەنگـێ سـاقی بەلکـە نەسـرینن بەشـەر
ئـی د لەبسـێ ئەرغـەوانی نێرگـزێن عەرعـەر خـەرام

۵ یارەب ئەو رووحن موجەسسەم یان میسالێ رووحن ئەو
لەو ب سیرِ جامـان دبەخشـن نـازکێن شـیرینکـەلام

۶ ئەو چ عالی گەوهـەرن هـاتن لیباسـێ جیسـم و جـان
عیشـوەییێن وان شـوبهێ ئیکسـیرێ دقـەلبانن مـەقام

۷ وەک «مـەلێ» گاڤـەک تنـێ غائـب ژ دیـدارێ نـەبم
وەر بـبم وێ سـاعەتێ لـێ بـن ژ منـدا سـەد سـەلام

**مانای وشەکان:**

**بەشەر**: بەشەرِە، پێست؛ **لەبس**: بەرگوشمەک؛ **موجەسسەم**: هاتووەتە ناو لەش، بە چاو دەبینرێ؛ **میسال**: پەیکەر، کۆتەڵ؛ **گەوهەر**: رِەگەز؛ **گەوهەر**: جەواهێر؛ **کەلام**: گفتولفت؛ **ئیکسیر**: تۆزێکە بە سەر مسیدا کەی دەیکاتە زێرِ؛ **قەلب**: دڵ؛ **قەلب**: چرووک؛ **مەقام**: جێگە؛ **گاڤەک**: تاوێک؛ **گاڤەک**: هەنگاوێک؛ **وەر**: وە ئەگەر؛ **وەک**: دەغیلە، هۆشت بێ.

**پوختەی مانا:**

ئەی خوایە! ئەو مەیگێڕانە، بەو هەموو شووش و ناسکییە، گیانن ئێمە دەیانبینین، یان

---

۱. عیـد آمد و کـارها نـکو خـواهـد کـرد     ساقی می لعل در سـبو خـواهـد کرد
افسـار نـمـاز و پـوزەبـنـد روزە     عیـد از سر این خران فرو خواهد کـرد

پەیکەرن بۆ نازکی گیان نیشان دان؟ چۆن گەوهەریکن ئەوانە؟ دەبێ لە چی دروست بووبن و چۆنە هاتوونە ناو لەشی بنیادەمەوە؟ زمانخۆشن؛ بەناز و ناسک ئەندامن؛ ئەگەر پیالەت دەدەنە دەست، وا دەزانی بە نهێنیێ ئەو پیالە هات؛ چونکە هێند روون و ناسکن نایانبینی. ناز و قەمزەیِ ئەوان دەیکەن، دڵی قەڵبیش وەکوو ئیکسیر دەکا بە زێڕ. دڵمان بویتە مزڵیان و لە ناو دڵماندا دەرناچن. مەلا هۆشت لەسەر خۆ بێ! نەچی جارێک بۆ تاوێکیش، هەنگاوێکیش لە یارت دوور بکەوییەوە. ئەگەر هەر تاوێک دوور کەوتی، سەلامان بنێرە و بڵێ: من ئیتر لە دنیا دەرچووم.

شیاوی باسە: بە عەرەبی لەباتی بڵێن فاتیحای بۆ فلانەکەس بخوێنن؛ دەڵێن: سەلامی لەسەر بێ.



# جەزبەیا عیشقێ

١ دانەیێن عەنبەر ل نەسرینان رەشـاندن خالـێ خـام
سوسنێن نازک ل سەر خـالان چەڤـاندن دالـێ دام

٢ جەبهەت و دیمێ ل قودرەت لێ نقیسی حەرف و حەرف
کاکولان تاتـا ل سـەر حـەرفان کشـاندی لام و لام
(یان: «لامُلام»)

٣ لەیلەتولقەدر و بەراتن زولف و جەبهەت سـوبحێ عیـد
دیم وەکوو فەسلا بەهارێ لێ قیامەت قـەدد و قـام

**مانای وشەکان:**

**دانە**: دەنک؛ **خام**: خاو؛ **چەڤاندن**: لار کردنەوە؛ **حەرف**: کەنار، لێـوار؛ **لام**: پیـتی (ل)؛ **قام**: بەژن؛ **قام**: هەستا؛ **لامُلام**: کەس لۆمە ناکرێ؛ **قەد**: نووشتانەوە.

**پوختەی مانا:**

ئەو لا ڕوومەت و لاجانگەی- کە وەک پەڕی گوڵی نەسرین، ناسـک و سـپین- خاڵـی ڕەش و بەبەرامەی وەک عەنبەری خاوی دانـە-دانـە لـێ پـرژاوە. بسـکەکانی کـە لـە سوێسنە زۆر تورت و زۆر بۆنخۆش‌ترن، لە سەر خاڵان لار بوونەوە، وێنـەی دال (د)ن و بوونە داو لە ڕاوگەی دڵان. دەستی هونەری بەهێزی خودای مەزن، چەند پیتێکی زۆر پیرۆزی ناو قورئانی وەکوو: صـا دەکانی چاوی و نوونیَ برۆ و ئەلفی کەپۆ و لامی بسک و میمی دەم و نوختەی خاڵان- کە دڵان دەبەن بە تاڵان- لە سەر هەنیە و ڕوخساری یار، لە ناوەوە و لە کەناران، نەخشاندووە. کاکۆڵەکان لـە سـەرووی ئـەو پیتانـەوە، بـە زوانی حاڵ پێمان دەڵێن: دڵدار کە شێت و هاریش بن، لۆمە ناکرێن. شـەوی ڕەشـی کەزیەکانی وەک شەوی لەیلەتولقەدر و بەرات وانە؛ کە هەم تیشـکی جـوانی خوایـان

دەناودایە، هەم هەموو بەرەکەت و پیتی رۆزی دڵمان لەوانڕایە. تەختی سپی ناو چەوانی، سپێدەی جەژنی پیرۆزە. ڕوخساری جوانتر بەهارە؛ نەخیر، وەک باغی بەهەشتە؛ کە هەرگیز پاییزی نییە. ئەگەر دەڵێن بەهەشت لە ڕۆژی قیامەتا دەبیندرێ، دە لەو بالایە بڕوانن! کە هەرگا یار هەڵدەوەستێ، قیامەت دەکا و هەرگا قەد دەنوشتێنێتەوە، ئێمەی دلدار، قیامەت بە چاوان دەبینین.

۴ ئەوپەری وەقتێ د سوندوسدا ژ قوندوس بت خویا
بەندەدێ شاه و گەدا بت خوسرەوێ شیرین کەلام

۵ هەرکەسێ جارەک دیبە ئەو زیندەما حەتتا ئەبەد
وێ نەدیتی ئەو پەریروو زیندەگی لێ بت حەرام

۶ هەرکەسێ جامێ ژ دەستێ وێ بنۆشت نۆش بت
ئێ ژ وێ دەستێ نەنۆشی زەهر بت ئەو لێ مەدام

**مانای وشەکان:**

**سوندوس**: پارچەی ئاوریشمی بەزیڕ چنراوی زۆر نایاب؛ **قوندوس**: تاریکایی خەستی شەوێ؛ **گەدا**: پارسەک؛ **مەدام**: هەمیشە؛ **مەدام**: بادە.

**پوختەی مانا:**

ئەو پەرییە ناسک و نازدارە، دەمکوڵ و شیرین وتارە- کە شای سەرتەختی جوانییە- بە بەرگی ئاڵ و والاوە- کە لە قوماشی سوندووسە- لە شەوی ئەنگوستلەچاوا، بێتە دەر و خۆی نیشان دا و تیشکی ڕوخساری لە دنیا پرشنگ بدا، هەموو شاهانی سەر زەوی، با خوسرەوی شیرینیش بن، لەبەر دەرکی ئەو دەکەون و لە دامێنی ئەو دەنەون و دەبنە عەبدێکی سەرکزی و بە گەدایی لە دەرگای شانازی دەکەن. چونکە هەرکەس هەر جارێک یارم ببینێ، هەرگیز مردن تووشی نابێ و هەرکەس چاوی بەو دیدارە ڕۆشن نەبێ، خۆشی و ژینی لێ حەرامە.

هەر ئەو بادەی لە دەستی ئەو ئەخورێتەوە، نۆشی گیانە و بە گیان خۆشە. بە دەستی ئەو ژەهریش هەمیشە لە بادە بەڕێزترە. هەرکەسێ لە یارم دوورە و دەیەوێ بادە

بنوشێ، یاخوا بادەی لێ ببێ بە ژەهری مار و سندان و قوززەڵقورتی بێ.[1]

٧ وان درەقسێدا کو دیم ئاور پەیاپەی دانە مـن
بەرق و تیرێژان ل دلدان جەزبەیا عیشقێ رەڤام

٨ عومرەکە دوور بووم ژ جانان کەتمە بەندا فیرقەتێ
ناگەهان پەردە هلانی گۆ: «مەلا»یم ئەسسەلام
(یان: مـولایم ئەسسەلام)

**مانای وشەکان:**

**وان**: ئەوان، بۆ ڕێزگرتن لە یەکێک دەگوترێ؛ **ئاور**: ئاگر؛ **ئاوڕ**: بۆ دواوە ڕوانین، بە تیلەی چاو ڕوانین؛ **پەیاپەی**: بە شوێن یەکا، خۆش-خۆش؛ **تیرێژ**: تیشک؛ **جەزبە**: کێش؛ **رەڤام**: ڕفێندرام؛ **هلانی**: لایبرد، لایگرت؛ **مولایم**: هێدی و لەسەرخۆ؛ **مەلایم**: مەلای من؛ **ئەسسەلام**: سلاوت لێ؛ **ئەسسەلام**: هەر نەماوی.

**پوختەی مانا:**

لە کۆڕی گۆبەند و بەزما، یار دیتمی و لەسەر یەک ئاوڕی وی دەدام و ئاوری دەهەناوم بەردەدا. برووسکە و تیرێژی جوانی، هاتنە دڵ و کێشەری ئەوین ڕای کێشام و ڕفاندمی و من هەر نەمام. دووری لە یار هەر تاوێکیش بێ، عومرێکە. من عومرێک بوو کەوتبوومە ناو زیندانی خەمی دووری یاری دڵبەند. ئەو ڕۆژە لەو گۆوەندەدا، لەپڕ یار لە پەردە دەرهات؛ لەمپەری جودایی پەڕاند؛ زۆر بە نەرمی پێمی فەرموو: مەلای منی، سلاوت لێ! هەر بەو تۆزە دواندنەی، ئیتر من یەکجاری مردم. ئەلفاتیحا.

---

[1]. دەکرێ ڕستەی دووهەمیش هەر بۆ ڕاگەیاندن بێ، نەک سکالا؛ واتا: ئەوی پیاڵە لە دەستی ئەو خاتوونە نەگرێ، هەموو کات وەکوو ژەهر بخواتەوە، وایە.



# نەترك و بازن

١ ڕەمــزێن تــە د جانــان نــە بــە ئەنــدازە درازن
هەریــەک ب هــەزار ڕەنــگ ڕەوانــێ مــە دخــوازن

٢ وان دەر بە ل جامێ مە وەکـی بـەرق و برووسـکان
تــیرێ تــە د جانــان نــەتنێ ســینە گــودازن

٣ جانــا ژ جــەفایا تــە و زولمــێ چ خەبــەر دیــن
کــوو تــیرێ ژ جــەورا تــە د دلــدا مــە ب گــازن

٤ پەروانــە و بولبــول ب دلــن شــوعلەیێ عیشــقێ
لێ کو تو نــەزەر دی ب خــوە ئــەو گولشــەنێ ڕازن

**مانای وشەکان:**

**دراز**: درێژ؛ **ڕازان**: ڕاکشـان؛ **دڕازن**: ڕادەکشـێن، خـۆ درێـژ دەکـەن؛ **ڕەوان**: گیـان؛ **ڕەوان**: خۆشڕۆ؛ **دەرب**: زەبر؛ **دەرب**: ڕێگە؛ سینە **گوداز**: سنگ‌تاوێن؛ **جـەور**: زولـم، **جەور**: لە ڕێ کلا بوون؛ **جەور**: دەنگی بەقەوی هەورەتریشـقە؛ **گـاز**: گـەزی پێـوان و گــەزی ددان؛ **گــازن**: گلــە و شــکایەت؛ **گولشــەنێ ڕاز**: باغچــەی پــڕ لــە نهێــنی؛ «*گُلشنِ راز*»: کتێبێکی فارسییە، شیخ محمودی شەبستەری ساڵـی ٧١٧ کـۆچی لـە هەزار بەیتا دایناوە و هەمووی هەر باسی عیرفانە.

**پوختەی مانا:**

ئیشارەتی نهێنی تۆ، لە گیاناندا، لەو ئەندازەیە دەرچوو کە هیچ گیانێک دەریبەرێ و گیانمان زۆر بەرتەسک‌ترە لەوەی ڕازی تۆی تێ بچێ و جێی بێتەوە. هەریــەک لەو ڕازی وا گرینگ بە هەزار ڕەنگ و تەرزەوە خــۆ دەنوێنــێ و دەیــەوێ گیانمــان بستێنێ و بە پەلە بیبا بۆ خۆی و دەرسی دڵداری ئەوینی پێ ڕەوان کا و گیان ئەو

ئەرکە وا گرانەی، زۆردژوارە بۆ هەلگیریێ. ڕازی ئەوین، وەک تیریێکن لە برووسکەی ئاسمان دەکەن. تەنیا بەوەندە بەس ناکەن سینەمان بتاوێننەوە؛ نیشانەیان لە گیانمانە.و هەر دەیپێکن. یارە گیانە شیرینەکەم! چۆن ڕێم دەکەویێ بە گلەیی لە دەست زولمت بنالێنم؟ ئەوی منیش ئازار دەدا، هەر ڕوحم و بەزەیی تۆیە و من نایزانم. من لە دەس تیران دەنالم. تیریش گلە لە بەختی خۆ دەکەن کە تۆ دوورت خستوونەوە و لە دلی مندا جێگات داون. چیرۆکی من و تیری تۆ، وەک چیرۆکی بولبول و پەپوولە دەچیێ. بە ڕوالەت گڕی ئەوینیێ بلێسەی داوەتە دلیان؛ بەلام بێینە باری ڕاستی، ئەو هەردوو دلسووتاوانە بوونەتە گولجاری ڕازان و لە ناو بەهەشتی ئەویندا، دێن و دەچن و دلیان بویتە گولشەنی ڕاز؛ پڕیە لە باسی خوا ناسی.

٥ پەیوەستە ژ وەسلیێ تە دمێنم کو سەراسەر[1]
بشکووژ و تەلیسم و وەرەق و نەترک و بازن

٦ سوببوحی و قوددووسی و حۆرێن د بەهەشتیێ
پەیوەستە شەبیێ قەدریێ لیقایا تە دخوازن

**مانای وشەکان:**

**پەیوەستە**: هەمیشە، بیێنێوان؛ **بشکووژ**: قۆپچە؛ **تەلیسم**: پارچێک خشلی زێوینە دۆعای لە سەر هەلدەکەنن تا لە جنۆکە و دێو و درنج بپارێزرێن؛ **وەرەق**: گەلا، خشلێکە وەک گەلا دەچیێ؛ **نەترک**: مانگۆلەی لەرزانە؛ **باز**: دەرزیلەی خشل بە شکلی باز؛ **بازن**: دەستەوانەی لە زێڕو زێو؛ **سوبووح**: ناوێکی خوایە؛ **سوببوحی**: بەو فریشتانە دەلێن کە هەر دەلێن سوببوح، سوببوح، واتا: خوایە پاکی هەر بۆ تۆیە؛ **قوددووس**: ناوی خوایە؛ **قوددووسی**: ئەو فریشتانەن کە هەمیشە دەلێن قوددووس، قوددووس، واتا: خوایە هەر تۆ خاوەنی پیت و پیرۆزیت؛ **لیقا**: تووش بوون.

---

١. زڤنگی و سەلمان «پەیوەستە د وەسلیێ لەو دمینم کو سەراسەر»یان نووسیوە؛ کە ماناکە دەگۆڕیێ و گرێیەکیش دەکەوێتە کێشی شیعرەکەوە. نوسخەی عوسمان تونچ بەیتەکەی تێدا نییە.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! خۆت لە دڵی من بە ئاگای. جیا لە تۆ، هەموو شتێک لە بەرچاوم بێگانەیە. دەمەوێ ئەگەر بتگەمێ هیچ شت، هیچ ئافەریدەیەک بەگیان، بێ‌گیان، بە نهێنی نێوان من و تۆ نەزانێ. نامەوێ تەنانەت قۆپچە و خشڵە زێڕ و زیوەکانیش، کە تەلیسم و پەلک و خرینگە و مەنگۆڵە و دەرزیلە و لەرزانە و بازن و خرخاڵن و لە سەرتاپای تۆ هاڵاون، پێ بزانن. بە زرینگە دەنگ دەدەن و لێم تێک دەدەن. بۆیە هەمیشە لە هاتن بۆ بارەگا و دیداری تۆ، من داماوم و بەش‌بڕاوم.

نازانم کێ گوتوویە:

مەڵێ بۆ نامە نانووسی، لە نێوانی من و تۆدا

قەڵەم بێگانەیە نابێ لە ڕازی ئێمە ئاگا بێ

٧ سونبول ب سەما تێن و گولان پەردە دراندن

بشکفتنە ئال-ئال و هشین بوونە تەڕازن

٨ جووبار دەروانن چەمەنان تەرح جوانن

مەستانە ب رەف-رەف ل کەناران سی و قازن

٩ هەریەک ب تەماشاگەهێ حوسنا تە ژ هەرجا

تەشبیهێ نیگاران ب جەمالا تە دنازن

**مانای وشەکان:**

**ئال‌ئال**: گوڵێکی کوێستانە؛ **هشین**: شین، کەوە؛ **هشین**: سەوز؛ **تەراز**: ڕێک و لەبار و بەرانبەر؛ **تەڕازن**: مێرگی بە تەڕایی، تەڕەزن؛ **تەرح**: بیچم، لق، چڵ.

**پوختەی مانا:**

ئەی دڵە! وەرە بڕوانە! بەهارە دنیا خەملیوە. سملان بە دەم شنەباوە سەمایانە؛ دەلەرنەوە. گوڵی گوڵاو- کە خونچە بوون و لە شەرمان دەرنەدەچون- لە خۆشیانا سەرخۆش بوون؛ پەردەیان دڕاند. بڕوانە چلۆن پشکوتوون. گوڵی ئال‌ئال بە هەزار ئاڵ و واڵاوە، خۆ دەنوێنن. هەرچی چیمەن و مێرگۆڵەن، لە خۆشیانا گەش بوونەوە و لە

تاسەی دیداری گولان، ئاویان دەچاوان تزاوە. ئێستە لە خۆشی دیمەنیان، هەموو دەمیان پڕ لە ئاوە و لە تریقەی خەندەی جۆگەلان، هێند پێکەنین، شین بوونەوە. بڕوانە چەند ڕێکوپێکن، تیپی گولان، بە تەکووزی هەڵوێستاون. جۆگەی ئاوان، بە ڕەوانی و بیچمی چیمەن وا بە جوانی، کارێکی وای کرد کەسی و قاز لەو دیمەنە گەشکە ببن و وەک سەرخۆشان، بێنە دەورەی گوڵ و ئاوان و پۆل-پۆل لە دەورەیان گەڕێن. یاری گیانیم! دڵی دڵم! هەم گیان، هەم دڵم، هەم گوڵم! ئەو هەموانە چ گوڵن، چ مەلن، چ قل، چ ئەو سەوزەی لە چیمەندا پێدەکەنن، گشتیان سەریان دەرێناوە و بە چاو، بە دڵ، دەڕوانن و بە تاسەوەن تۆ ببینن؛ هاتوونە سەیری جوانی تۆ. هەموو گیاندار و بێگیانێک، وەک هەموو جوان و دلبەران، بە جوانیت شانازی دەکەن.

١٠ تیران ل مە دەت دۆستێ مە تێ سێنە هەدەف کر
نازان ل مە کەت یارێ مە زاری و نیازن

١١ میحرابێ دو ئەبروو کو ژ بالاتە خویا بن
دەر سەجدەگەهێ عیشقێ نیازێ مە نەمازن

١٢ گەر حوسن و مەحەببەت ب سەراپەردەیێ جان بن
گەه شاه و گەدا، گەه ب خوە مەحموود و ئەیازن

١٣ ئەڤ حوور و پەریچیهرە بت و لاتێ جەمالێ
دەر سوورەتێ تەحقیق «مەلا» عەینێ مەجازن

**مانای وشەکان:**

**هەدەف**: ئامانج؛ **زاری**: گریان و شیوەن؛ **نیاز**: پاڕانەوە؛ **نەماز**: نوێژ؛ **نەمازە**: تایبەتی؛ **چیهرە**: ڕوخسار.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر یار تیرمان باوێتێ، ئێمە سینەی بۆ دادەکەین بە نیشانە. ئەگەر ئەو دەسکا بە نازان؛ ئێمە بە گریان و نیاز و پاڕانەوە دەیدوێنین. ئەگەر تاقی بڕۆکانی، لەو بالایە بێنە بەرچاو، سوژدە دەبەین لە جێگای سوژدەی ئەویندا. نوێژەکانمان تایبەتین و نوێژ و

نزای دڵدارانەن. ئەگەر جوانیی دەگەڵ ئەوینی ڕاستیدا، بکەونە ناو سەرسەرای گیان و تێکەڵاو بن، نە شایەتی لە ناو دەمێنێ و نە ڕووتی؛ لە بازاڕی ئەوینێ، سوڵتان و گەدا دەبنە یەک و مەحموود و هەیاسێک نییە. هەر یەک لەوان هەم مەحموودە هەم هەیاسە. چۆنکە تازە لە بۆتەیەکدا تواونەوە و جیاوازی لە ناو نەماوە. ئەو جوانانەی کە وەک حۆری و ڕوخساریان وەکوو پەریانە و ئەو بتە جوان تاشراوانەی کە خەڵکیان پێ گومڕا بووە، ئەگەر بەڕاستی بڕوانین و بە وردی لێی وردبینەوە، پێ دەزانین جوانی بەدەڵن و جوانی ڕاست لە پشت پەردەی ئەزەلییەوە تیشکی داونێ.



# دەینی بووسە

١ مەلا مە ل گەردنا دلبەر ژ نوو سەد بووسە ماین دەیـن
مەجالێ دێ بخوازم ژێ دبـێ دەینـێ تـە «فَـوْقَ اَلْعین»

٢ ب رەمزا قـابقەوسـەینێ ژ وان برهـان خەبـەردارین
«فَـــآتِ الْقَوْسَ باریهـــا اَلا یـــا رامِـــیَ الْقوسَـــیْن»

**مانای وشەکان:**
**مەجال**: وەخت؛ **دبێ**: دەبێژێ؛ **دەین**: وام، قەرز؛ **فَوْقَ الْعَیْن**: بالای چەم، لە سەر چـاو؛ **قابقەوسەین**: بە ئەندازەی ژێ کەوانێک (پێشتر باسمان کرد)؛ **فآت**: دەبێنـە؛ **باریهـا**: تاشەرەکەی؛ **الا**: هۆی؛ **یا**: ئەی؛ **رامی**: هاوێژ؛ **قەوسەین**: دوو کەوان.

**پوختەی مانا:**
یار دەیفەرموو ئەگەر لە ئەویندا مردی، ماچێکت پێ قەرزدار دەبم. تۆ لە کۆنەقـەرزان گەڕێ کە نەگەیون! وا سەرلەنوێ سەد جار لەبەر پێیدا مـردووم. دەبـێ سـەد مـاچی گەردنیم لە سەری بێ. هەتا دەڵێم کوا قەرزەکەت، دەڵێ قەرزت لە سەر چاوان. ناڵێ لە سایەی گەردنم؛ دیارە دیسان وای نیازە چیم پێ نەگا. هەر لە باسی قابەقەوسـەین لە ڕازی نهێنی برۆی- کە ئەندازەی دوو کەوانن- ئاگـادارین. کـەوان بـدەرە دەسـت وەستا، ئەی تیر بە دوو کەوان هاوێژ!
هەروەک لە کوردیدا دەڵێن: «نان بۆ نانەوا ڕەوایە و گۆشت بۆ قەساب». لە ناو عەرەب بۆتە مەسەل «کەوان بدە دەس کەوانتاش». واتـا هـەر یـارم دەزانـێ دڵان بـە تـیری مژۆڵان و لە کەوانی برۆی کەوانییەکەیەوە بهەنگێوێ. هەموو تیرهاوێژێکی‌تر با بچنەوە ماڵی خۆیان.

٣ ژ سیررا لامەکان واجب تەنەززول کر د ئیمکانێ
«فَـأَیْنَ الْعِلْـمُ، اَیْنَ الْعَیـنْ وَ اَیْنَ الاَیْـنُ اِذْ لا اَیْـنْ»

**مانای وشەکان:**

**لامەکان**: بێ جێگە؛ **واجب**: پێویست؛ **واجبُ‌الوجود**: خودا، واتا بێ‌گومان هەر هەیە؛ **ئیمکان**: شیاویی، ئیمکان لە زاراوەی فەلسەفەدا، بۆ کردارێک یان شتێکی وا دەبێژن کە لەسەر بوون و نەبوونی پەک نەکەوێ. وەک بوونی مرۆ و شینایی و جانەوەر و دوورەگیانی بێ‌بزووتن. ناوی مومکین لە بەرانبەر وشەی واجیبدا دەگوترێ؛ **ایْـن**: لە کوێ؛ **عَین**: چاو، بەرچاو؛ **اِذْ**: کە.

**پوختەی مانا:**

خودای گەورە، لە نهێنی بێ‌جێگەیی دەستی هەڵگرت و خۆی لە شیاوان (لە ئێمکانێ)دا، نیشان داین. وەک خۆی فەرمووی: «گەنجینێکی نهێنی بووم، ئافەریدەم هێنانە گۆڕ تا بمناسن». ئەگەر لەبەر ئەو ڕازە گرینگە نەبا، چۆنمان دەتوانی بیناسن؟ کوانێ زانست؟ کوا سۆمای چاو؟ کوا شتی دیار؟ تەنانەت «کوا» لە کوێ هەبوو؟ کە ئەگەر خوا دنیای درووس نەکردایە و وەخت و ڕۆژ و شەو و دەمی دانەنایە، وشەی «کوانێ» و «لە کوێش»، نەدەزانرا چییە. بۆ خوای گەورە نە دەم و کات و سات هەیە و نە جێگە و شوێن.

٤ ژ مابەینا دو ئەبروویان پەیاپەی بەرقێ لامیع تێن
ب عەینێ گەر ببی سافی چ نوورەک سیرفە ئەو مابەین

**مانای وشەکان:**

**مابەین**: نێوان؛ **مابەین**: دەرباری سوڵتان، هۆدەی چاوەنۆڕیی بۆ دیتنی سوڵتان؛ **سیرف**: خالیس و پاکی بێ خەوش.

**پوختەی مانا:**

لە نێوان هەردوو ئەبرۆیان، لەسەریەک هەر برووسکەی پڕترووسکە دیاری دەدەن بۆ من. بە

چاوی روون و بێ تانە، کە ببینی، دەزانی لەو نێوانەیدا نیشانەی کامە نووری پاکە دەنوێنێ.

٥ ب دەستوورا تـە دا، ویـژی ژ ڤـێ ناڤـێ ڤـەرێکم ئـەز
«فَصَّـفِ الْعَـیْنَ نُـورَالْعَیْن الا یـا زَیْـنَ کُـلُّ الـزین»

**مانای وشەکان:**

**دەستوور**: ئیجازە؛ **ویژی**: ئەویش؛ **ژڤێ ناڤێ**: لە نێوانە؛ **ڤەرێکم**: بەڕێ بکەم، لە نێوان لابەم؛ **فَصَّفِ**: دەسا روون بکەوە؛ **نُورَالْعَیْن**: ئـەی نـووری چـاو؛ **ئـەلا**: بریەتییـە لـە: دەگەڵ تۆمە؛ **یا**: ئەی؛ **زَیْن**: زینەت و جوانی؛ **کُلّ**: هەموو، گش.

**پوختەی مانا:**

یاری تاقانەی بێهاوتام! ئەگەر تۆ ئیجازە بدەی و ڕێگە بدرێم بۆ بارەگای نزیکانت، من گەرەکمە ئەو نێوانەش کە برۆی یاری دنیایین و لەوانەوە تیشکی خۆتت نیشانداوم، لە ناو بچێ و چاوم بە خۆت- کە سوڵتانی سوڵتانانی- بە بێ نێـوان و نـاوبژی و پـەردە و لەمپەر، ڕوون بێتەوە. دەزانم ئەو دیتنەی تۆ، چاوی دڵی ڕوونی دەوێ و ئەشێ تانەی لە سەر نەبێ. دەسا بـەزەییت پێمـدا بێـت؛ ڕووناکـایی چاوەکـانم، چـاوی دڵـم ڕوون کەرەوە؛ با جوانییەکەت بێپەردە بێتە بەر چاوان؛ ئەی جوانتر لە هەموو جوانان و ئەی مایەی جوانی گش جوانێک لە عالەمدا!

٦ بەهایێ عیشوەیەک لەعلان مە یەکسەر «مامَلَکْ» بەخشـی
دل و جان ژی ل سەر دانی و زالم هێژ دبیـژت: دەیـن

**مانای وشەکان:**

**بەها**: نرخ، بایی؛ **یەکسەر**: بە یەکجارەکی؛ **مامَلَک**: هـەرچی شـکم دەبـرد، هـەرچی هەمبوو؛ **هێژ**: هێشتا، هێمان.

**پوختەی مانا:**

لە نرخی نازی لێوانی، بە جارێک هەرچی هەمبوو دام.

دل و گیانیش کرا پارسەنگی؛ زاڵم هەر دەڵێ: کوا وام؟!
«نالی» دەڵێ:

قیمـەتی مـاچی دوسـەد کیسـەیی سـاغە و نیمـە
غـەیری یـەک کیسـەیی سـەدپارە لـە گیرفانمـدا

٧ «مەلا» هەر وی ببین هەر وی ئەگەر هەروی دناسی تو
«هُـوَ الْمَعْبـود. هُوَالْمشـهود. بَـلْ لا غَیْـرَ فیالـدّاریْن»

**مانای وشەکان:**

**هُوَ**: ئەو؛ **مَعْبود**: پەرسراو؛ **مَشْهود**: دیـار و بـەرچاو؛ **بَـلْ**: بەڵـکە؛ **لاغـیر**: نـە شـتیتر؛ **فیالدّارین**: لە هەردووک ماڵاندا، واتا دنیا و قیامەت.

**پوختەی مانا:**

مەلا لە کوێی؟ لە بارەی کێوە تۆ دەدوێـی؟ ئەگـەر یـاری تاقانـەی سـەروەری یـاران، دەناسی و تانە لەسەر چاوی دڵت نییە، هەر لەو بڕوانە هەر لە وی. هـەر ئـەو شـیاوی پەرستنە. هەر ئەو دیاری بێ پیوارە. تەنانەت ئەوەش بزانە کە لە هەردووک دنیایانـدا، جگە لە خۆی، هیچکەس نییە کە بۆ پەرستنێ بشێ.



# چیرۆکی جوانیت

آ

مـن د بـەر «قـالوا بَلـی» بـاتن ڤـەویرا بـوو ئەڤـین
هێـژ ل سـەر عەهـدا ئەلەسـتم تـا ب رۆژا ئـاخرین
مـن دڤـیٚ لـیٚ ئەشـکەرا کـەم جارەکـیٚ داغـا نهـین
«گُفْـتَمْ اورا مـا دُعـاگویِ تـوایم آیْ نـورِعین»
«اَعْرَضَـتَ عَنّـی وَ قالَـتْ مـا دُعـاءُ الْکـافِرین»

**مانای وشەکان:**

**قالوابَلی**: باسی کرا؛ **ڤەویرا**: دەگەڵ ئەو؛ **عەهد**: پەیمان؛ **عەهدا ئەلەست**: پەیمانی ئەو ڕۆژەی کـە خـوا گیـانی درووس کـردن؛ **گُفْتَم**: گـوتم؛ **مـا**: ئێمـە؛ **حـورِعین**: کیـژە چاوڕەشەکەی بەهەشت؛ **عین**: چاوگەورە؛ **عین**: گاکێوی کە زۆر بە چاوجوان ناسراوە؛ **اَعْرَضَتْ**: ڕووی وەرگێڕا، نارەزایەتی نیشان دا؛ **عنّی**: لە من؛ **قالَتْ**: گوتی ئەو مێوینـە؛ **ما**: چییە؟؛ **دُعاءُالکافرین**: نزای خوانەناسان. خوا لە قورئان وتـووێژی جەحەنـدەمیان دەگەڵ پاسەوانی توونی ئاورمان بۆ باس دەکا و دەفەرموێ: «ئەوانەی لە نـاو ئـاگران بـە پاسداری دۆزەق دەڵێن: داوامان بۆ لە خوا بکەن ڕۆژێک لە سزامان سووک‌کا. پاسدار لە وەراما دەڵێن: ڕاسپاردەتان لە ئێمەوە نەهاتە لا؛ بە بەڵگەی زۆر ئاشکراوە؟ دەڵێن بەڵیٚ: دەڵێن بۆ خۆو دۆعا بکەن! دوعای کافران، جیا لە ڕیٚ لیٚ ون کردن، چیتر ناکا.»

**پوختەی مانا:**

من بەر لەو ڕۆژەش کە خودا گیانی بۆ لەشان دروست کرد، ببوومـە دڵـداری یـارم لـە دەروونـدا. هەتا ئێستاش، هەر لەسەر پەیمانم ماوم و نەگۆڕاوم و تا دواڕۆژیـش هـەر وا دەبم. هەموو ئاواتم ئەمەیە جارێک داخی ناو دڵم ئاشکرا بکەم.

پێم گوت: ئێمە نزاگۆتین؛ هۆی چاوڕەشـە بەهەشـتییەکە! ڕووی لـە مـن وەرگێـڕا و

گوتی: دۆعای کافر بە چی دەچێ؟!

٢ ئـەی شـەهی عالیجـەناب! «پُـر عـاجز و پَرکَنـدەام»
ئاه ژ دەست جەورا ئەڤـینێ چ بکـرم؟ «مَـن بَنـدەام»
سەبر و تاقەت من نەمان لێ «بـی‌کـس و درمانـدەام»
«گـــر بخـــوانی وَر بِرانـــی بَنـــدەام تـــا زِنـــدەام»
«واجِـــبٌ لـــی اِمتثـــالُ اْلـــامرِ مـــاذا تَـــأمُرِیْن»

**مانای وشەکان:**

**عالی**: بڵند؛ **جەناب**: لایەن؛ **عالیجەناب**: وشەی ڕێزگرتنە بۆ گـەوران، واتـا: پایەبـەرز؛ **پَرکَندە**: پەراکەندە، پەرێشان و بلاو؛ **دەرمانـدە**: دامـاو؛ **بخـوانی**: بانگ‌کـەی؛ **بـرانی**: دەرکەی؛ **واجب**: پێویست؛ **لی**: بۆ من؛ **اِمتثالْ**: بەجێ هێنان؛ **ئەمر**: فەرمان؛ **ماذا**: چی؛ **تَامُرِیْن**: ئەمر ئەفەرمووی خانمەکە.

**پوختەی مانا:**

پادشای پایەبەرزی جوانان! زۆر وەڕەوز و پەرێشانم. ئاخ چی بکەم لە دەس ئازاری ئەو دلدارییە. من کۆیلەی تۆم. ئۆقرە و ئارامم پێ نەما. یـەکجار بێکـەس و دامـاوم. گـەر دەرم‌کەی یان وەمخوێنی، من هەر کۆیلەم هەتا زیندووم. پێک هێنانی فەرمانی تۆ، بە ئەرکی پێویست دەزانم؛ چۆن دەفەرمووی تا وا بکەم.

٣ سۆهتم ئەز پێتا ئەڤینێ تێـک بـوو ئـەم گـەرد و هـەبا
«أنَّ لـی آیـاتُ صِـدْقٍ کـانَ فـی هـذا النَّبـا»
حۆریـــا رۆژا لیقائـــێ، نازکـــا مەخمەرقـــەبا
«حَبَّـــذا رَوْضـــاتُ نَجْـــد زُرْتُهـــا عَهْدَالصُّـــبا»
«رَوْضَـــةٌ یَجْـــرِی عَلـــی اَرْجائِهـــا مـــاءٌمَعینْ»

**مانای وشەکان:**

**پێت**: گڕ؛ **گەرد**:تۆز؛ **هەبا**: تۆزەوردیلەی دەوری هەتاو؛ **اِنَّ لی**: تەواو بۆم هەیـە؛ **ئایات**: نیشانەگەل؛ **صِدْقْ**: ڕاست؛ **کانَ**: بوو؛ **فی**: لە ناو؛ **هذا**: ئـەم؛ **نَبا**: خەبـەر؛ **لیقا**: تووش‌هاتن؛ **مەخمەر**: پارچێکە؛ **حَبَّذا**: چەند خۆش بوو، ئای کە بـاش بـوو؛ **رَوْضاتُ**: باغچەگەل؛ **نەجد**: زوورک؛ **نەجد**: تەپۆڵکەی بێ‌گیا؛ **نەجد**: نـاوی ئـەو گردەیە کە قەیسی عـامری (مـەجنوون) لەسـەر ئـەوێ دووربـەدوور دەیڕوانییـە ڕەشماڵەکانی هۆبەی لەیلێ و گۆرانی پێدا هەڵدەگوت؛ **زُرْتُها**: دیـدارم لـێ‌کرد؛ **عَهْد**: زەمان و چاخ؛ **صُبا**: مندالی؛ **یەجری**: ڕەوان دەبێ؛ **عَلی**: لەسەر؛ **ئەرجائِها**: لایەن‌گەل؛ **ماء**: ئاو؛ **مَعینْ**: ڕەوان.

**پوختەی مانا:**

بە گڕی ئەوینێ سووتاوم؛ تـۆز و خۆڵیشـم بـا بـردی. درۆ ناکـەم؛ شـایەتم هـەن. هەرچی بـوو، دڵـداری کـردی. حۆرییەکـەی بەهەشـتی خـودا! نازکۆڵـەی کـەوا مەخمەرم! بیرێک لە هەژاریم بکە. ئاخر بێ تۆ چۆن دەربەرم؟ خۆزگەم بە دەوری مندالی و چوونە نەجدی پڕ لەوەڕی. چەند کانی و ئاویشی لێ بـوون. داخـم ئـەو خۆشییە تێپەڕی.

شیاوی باسە: ئەو بەیتە لە شیعرەکانی قەیسە بۆ لەیلای داناوە. گۆیا دەگەڵ لەیلایەدا بە مندالی لە نەجد، بەرخ و کاریان لەوەڕاندووە.

۴ من ل سەر بەدرێ مونیر مەکتووب دییە نەقشێ سەواد
سەر بەیەک ئانی دو نوونان خەتتێ رەیحـانی دو صـا د
حادری من سەجدە بر لەو غـەرقێ خوونـێ بـوو فوئـاد
«بَـــرْ دَرِ بـــاغِ وِصـــالَشْ هـــاتِفی آواز داد:»
«هـــذِهِ جَنـــاتُ عَـــدْنٍ فادخُلواهـــا خالِـــدین»

**مانای وشەکان:**

**سەواد**: ڕەشایی،؛ **حادری**: دەسبەجێ، هەر لە جێ؛ **فوئاد**: دڵ؛ **بَردرِ**: لەبەر دەرکی؛ **وصال**: پێک گەیشتن؛ **هذهِ**: ئەمانە؛ **جَنَات**: باغات؛ **عَدْن**: ئەو بەهەشتەی خوا دابووی بە بابە دەم؛ **فادخلواها**: بچنە ناوییەوە؛ **خالدین**: هەتاهەتایە.

**پوختەی مانا:**

لەسەر مانگی چاردەشەوەی تریفەدەر، من نەخشێکی ڕەشم دیوە. دوو نوونی خەتی ڕیحانی- کە وەک دوو برۆی یارم دەچوون- گۆشەیان دابووە سەر دوو صاد؛ کە بە چاوی یار، دەشبهان- دڵم بوو بە گۆمی خوێنێ لەو دیمەنە و سەرم خستە سەر سوژدەوە. لەو حانەدا، لە دەرکی باغی یارەکەم- کە جێژوان بوو- دەنگێکی بێ ڕەنگم دەبیست دەیگوت: ئێرە بەهەشتی ئادەمە بچنە ژوور و لێی دەرمەچن![1]

۵ نائیتن گۆهتن ب قال شەرح و بەیانێ حوسنێ تو
دێ ب حال و سێر بناسن دل فەسانێ حوسنێ تو
خوەش «مەلا» ئامانجێ تیران کر کەمانێ حوسنی تو
«قِصّەی عِشْقِ جَلال و داستانِ حُسنِ تو»
«تِلْکَ اَنْباءُ یَقولُ النّاسُ مِنّا بَعدَ حین»

**مانای وشەکان:**

**فەسانە**: ئەفسانە، چیرۆکی کۆن؛ **داستان**: سەرگوروشتە؛ **تِلْکَ**: ئەمانە؛ **انباء**: دەنگوباسگەل؛ **یقولُ**: دەڵێ؛ **ناس**: مەردم؛ **مِنّا**: لە ئێمە؛ **بعد**: دوای؛ **حین**: ماوەیەک لە ڕۆژگار.

---

١. لێرەش ئاماژەی بە چەند ئایەتی قورئان کردووە. وەک: سوورەتی طاها، ئایەتی ٧٦ و سوورەتی بَیّنە، ئایەتی ٨.

**پوختەی مانا:**

هەر بە گفتی سەرزارەکی باسی جوانی تۆ ناکرێ. دەبێ ئەهلی دڵ بزانن چیرۆکی جوانی تۆ چۆنە. ئەم جوانییەی چەند بە باشی مەلای وەبەر تیران داوە. چیرۆکی دڵداری «جەلال» لە گەڵ باسی جوانی تۆدا، دەبن بە باس و خەبەرێک کە مەردم لە دوارۆژێکا، بۆ یەکتری دەگێڕنەوە.[1]

---

١. شیاوی باسە: وەختە بڵێم بێگومانم ئەو شیعرانە هی بوێژێکی ناو «جەلال» بووە. مەلا تەزمینی کردووە. بەلام داخەکەم نەمزانی ئەو مەلا جەلالە کێ بوو. جەلالەددین رۆمی نەبووە. جەلالەددین دەوانییەکی شاعیر هەبوو؛ لە چەرخی نۆ تا سەرەتای چەرخی دەهەم (٨٣٠ تا ٩٠٨) ژیاوە. نازناویشی فانی بووە. سەیر ئەوەیە: لە هەموو ئەو نوسخانەدا کە من دیومن، هەوەڵ لەتی دوامین بەیتی قەسیدەکە، زیاد لە هەموان، تەواو کوردانە نووسراوە. نووسیویانە «عشقا جلال و داستانا». بۆ ئەوەی سێ لەتەی مەلاش وەک ئەو بچێ، پاشلەکانیان دەگەڵ ئەو هێناوەتەوە: بەیانا، فەسانا، کەمانا. ئەمانە هەر ویستوویانە قەسیدەکە خڕوپڕ هەر هی مەلا بێ؛ بەلام پیاو کە مرخ و چێژەی شیعری مەلای باش چێژتبێ، دەزانێ شیعری ئەو نییە. «هەژار»



# کەمان کشاندن

١ سەنەمێ ژ قەوسێ ئەبروو دو هیلالێ نـەو نومانـدن
دو کەمان ل بورجێ میزان ب غەزەب ل مـن کشـاندن

٢ نە دو نوون ب خەت موقابیل ب بەدیع خـەت نقیسـین
دو هیلالێ دەستێ قودرەت، ب قـیرانی یـەک نشـاندن

**مانای وشەکان:**

**سەنەم**: بت؛ **میزان**: بورجێکە لە ئاسمان، تەرازوو؛ **میزان**: بەرانبەر؛ **غەزەب**: توورەیی؛ **موقابیل**: بەرانبەر، رووبەیەک؛ **بەدیع**: تازەی کەس نەدیتوو؛ **نشاندن**: دیاننا؛ **نشاندن**: دانان.

**پوختەی مانا:**

ئەو یارە جوان و دلگرە- کە هەموو جوانێکی دیکە، دەیپەرستن و بۆتە بتی دلدارانی- برۆکانی هاتە بەرچاو، هەر نە برۆ، وەک دوو مانگی یەکشەوە بوون لە ئاسمانێکدا دیـار بدەن. ئەو دوو مانگە لەنوێیانە- کە زۆر لەبار و میزان بوون- لە مزلـگەی ئـەو بالایـە، وەک دوو کەوانی میرغەزەبی ئەویندارکوژ، لە من کێشران (تەرازوو کێشـانی هەیـە). دەستی قودرەتی خودایە کە ئەو دوو مانگـە یەکشـەوەی لـە ئاسمـانی سـافی توێلـی بەرانبەر بەیەک داناوە و نیشانی مەردمی داوە؛ دیارە موجزات قـەوماوە. لەبـەر چـاوی هونەرمەندانی خەتپەسند، جووتێک نوون بوون. لەسەر تەتەلـەی نوورینـدا، دەسـتی بەهێزی ئەزەلی خەتی دابوون. نوون دەچاوی ئەواندا با، لەو دوو نوونانەدا نەبوون.

٣ چ بـەراتێ حوسـنە یـارەب ب نیشـانێ پادشـاهی
ب تەرەف دو توڕڕە توغراوە بە مـاوەرێ رەشـاندن

**مانای وشەکان:**

**بەرات**: خەلاتنامەی گەورە گەوران، جەژنی ڕۆژی بەش کردنێ؛ **تەرەف**: لا؛ **تورڕە**: پەرچووکەی بڵاو لە سەر توێڵ، کەنارە، مێزەربەند، ڕیشووی بانەدراوی بلاو؛ **توغرا**: فەرمان، مۆری قیچەڵفیچی سوڵتان؛ **ماوەر**: گولاو.

**پوختەی مانا:**

ئەی خودایە! ئەو ڕوخسارەی داوتە بە یار، چۆن خەلات و بەراتێکە بۆ دڵتەڕان و دڵداران لە دنیادا، کە بۆت ناردوون. ئەگەر بەراتی پادشایان، هەر تەنیا مۆرێکی پێوە، ئەو بەراتە کە نیشانەی پاداش و بەخششی زۆرتە و لە جیاتی جێژنی بەراتە، لە هەردوو لاوە مۆری تۆی -کە دوو کەزی بە لادا کراوی بە گرێ و ئالقە و توغرائاسان- پێوە دیارە و دەوریان لە پەرچووکەی هەنیەی- کە لە قاقەزی مەرجانیش سپی‌تر و ناسک‌ترە- داوە بە جوانیی و لەباریی و بۆن و بەرامەشیان هێندە خوشن دەڵێی گولاو دەپرژێنن؛ نەک گولاویان لێ پرژابێ.

۴ ئەلیف و دو لام و هێ دین مە د ئایەتا جەمالێ
ژ جەگەر مە کر تەسەللی و ژ سینە دەست فەشاندن

**مانای وشەکان:**

**تەسەللی**: سەبووری؛ **دەست فەشاندن**: دەست هەڵتەکاندن، دەست بەردان.

**پوختەی مانا:**

ڕووی یاری من، لە قورئانی جوانی خوادا، ئایەتێکە و نیشانەی جوانیی خودایە. لێم دەڕوانی کەپۆکەی وەکوو ئەلفێکی ڕاست و شووش و کونەکەپۆی وەک «ه»یەکی دوچاویلکەی دەستی گەورەترین خەتخۆش. دوو لا بسکە سەر هەڵگەڕاوەکانیشی بە دوو پیتی «ل» دەبیندران. ناوی «الله»م خوێندەوە و لە عەیبەتان وازم لە ژیانی خۆم هێنا. سەبووریم هات؛ کە جگەرم سووتاوە، چش؛ دەستم لە سینەشم بەردا و دەستم لە دنیاش ڕاوەشاند و شێتی جوانیی خودایی بووم.

شیاوی باسە: هێندێک لە بوێژانی دی، دەمیان بە هێی وەکوو زەنە «ه» شبهاندووە.
سەید ڕەشید (شەهید) دەڵێ:

کە دوو خاڵم لە ڕاستەی بێڤلت دیت
خەمێکم گەر هەبوو لێم بوو بە سەد خەم

٥ نە تنێ ژ قشت و زولفان مە د سینە سەد کولابن
ل جەگەر سیەه کەمانان دوهەزار تیر رەشاندن

٦ ژ جەگەر «مەلا» پلینگان ب کولاب و چەنگ کەر کر
ئەسەدان ژی پەنجەڤێران دل و سینە هەڕرشاندن

**مانای وشەکان:**

**قشت:** ڕێزە بسکێک کە بەڕێکی بە قەیچی خشتیان دەکەن و لەسەر هەنیەدا دەوەستن؛ **کولاب:** قولاپ؛ **ڤێران:** دەگەڵ، پێڕا؛ **هەڕرشاندن:** هەڵدراندن، لەبەر یەک بردن.

**پوختەی مانا:**

دەردی جەرگ و هەناوی من، دووسەرەیە و دەسەرەیە. پەرچووکە قشتیلەکانی و کەزیەکانی بە بژانگی سەر بە قولاپ، تێروپڕ لە جەرگم نیشتن؛ دووهەزار تیریان تێچەقاند. ئەو جار نۆرەڕاوی چاوی دەستی پێکرد. ئەو چاوانەی بۆ ڕاوی دڵ و هەناوان پڵنگ و شێریان ناگاتێ. بە مژۆڵان پەنجەیان لە سینە و دڵم وەکار خست و قولاپیان لێ گیر دەکرد و کوت و پارچە و لەتیان دەکرد؛ بە ڕاست و چەپیاندا دەبرد؛ بە جارێک لێکیان هەڵوەشاند و لە کاریان خست.
«نیزامی گەنجەوی» دەڵێ:

مەدە شووشەی دڵم بەو چاوە مەستەت
بە سەرخۆشی، دەترسم بیشکێنێ[1]

---

١. دل شیشه و چشمان تو هر گوشه برندش    مستند مبادا که به شوخی شکنندش



## دەردی دووری

آ  خــەشمێ ل فــەقیران مەکــە زوو پادشــاهێ مــن
پورســێ بکــە جــارەک ل خــەتاء و گونــەهێ مــن

۲  تەفتیش ب موو مــوو بکــە ئــەر ئــەم ب خــەتائین
هینجــا نەکــە بێــتن تــە وەلاتی تــە جیهــێ مــن

**مانای وشەکان:**

**خەشم**: تووڕەیی؛ **هینجا**: هێنگین، ئەوسا؛ **وەلات**: مەڵبەند؛ **جیهێ**: شوێنی.

**پوختەی مانا:**

تۆ لە جوانیدا پادشای؛ من دڵدارێکی هەژارم. بەرگەی تووڕە بوونـت نـاگرم. خـۆم بـە گوناحبار نازانم. لام وا نییە بۆ هەژاران، دڵ بە جوانی دان گونـاح بـێ. جـا ئەگـەر لـە نەزانییەوە کارێکم کرد -کە خوا نەکا- گەردێکی خستە سەر دڵت، هەر گوزوگومبەت مەڕەنجێ! نێوچاوانت گرژ مەکە و خوێنم بێتاوان مەڕێژە! تۆ هیچ نەبێ، لە تاڵ-تاڵی کەزی و پرچە کافرە دڵڕەشەکانت- کە پڕن لـە میسـکی خـەتا و دڵـی منیـان بەنـد کردووە- پرسێک بکە! داخۆ دڵی بەند کراوم، هیچ گوناهی لێ روو داوە؟ با مووبـەموو دڵی هەژار بپشکنن ئەگەر جیا لە ئەوینی بالات، هیچ شتێکی دی لـە لا بـوو، ئـەو بـە داوێک بخنکێنە و منی دڵتالانکراویش لە دەورەی خۆت، لەو وڵاتەش کە تۆی تیای و بۆتە مەڵبەندی دڵداران، بتارێنە و جێی من بدە بە یەکێ تر.

«نالی» دەڵێ:

سـەری هــەر مــووی بــەدەنم تــەرزە تەمەننایێکــە
گەردشــی تــووکی ســەرم هێڵــەگی سەودایێــکە

٣ جــەورا تــە بــەهیتین و جــەفایا تــە پــەریتین
قوربانــێ تــە بم گــۆهـ بـدە جـارەک گلـەهێ مـن

٤ زانی کــو ژ بــەر جــەور و جــەفایان ئەلــەمێن دڵ
رەحمێ ب گەدائێ خوە کە سـولتان و شـەهێ مـن

٥ ســێ ســاڵە ژ دەرد و ژ بــەلایا تــە هیلاکــین
حــەتتا ب فەلــەک هــەر درِتــن ئـاه و ئـەهێ مـن

٦ ما یەک نەفەسەک مـن دبـتن سـەبر و قـەرارەک
قەد بـێ تـە و بـێ تـە دبـتن میسلێ سـەهێ مـن

**مانای وشەکان:**

**بەهیتن**: توانەوە؛ **پەریتن**: پەڕتاندن، وردوخاش کردن و لەبەین بردن؛ **گلەهـ**: شکایەت، گازندە، **ئەلەمێن**: ئەلەم، ئێش و ژان؛ **ئەلەمی**: ئێشا؛ **بەلا**: بەلاً؛ **بەلا**: گیرۆدەیـی؛ **ئـاه و ئەهـ**: ئاخ و ناڵە.

**پوختەی مانا:**

بە جزیا دان و ئازاران، تـاوان دیتـین؛ لەبـەر یـەکت هەڵـتەکاندین و بـە جارێـک هـەر وردوخاش بووین؛ لەبەین چووین. دڵی برژاوم پرژانە، ئەوە بوو بە ماوەی سێ (یان: سی) ساڵ، بە دەردی گرانی دووری گرفتارم، کە تاوێکیش لە دووریتـدا لـێم بـە هـەزار سـاڵ دەبووری و خۆت دەزانی ئۆقرە و ئارامم نەماوە و هەناسـەی ساردم لـە دووریـت، وەک بڵێسەی تەندووری سوور، گەرموگوڕە و چرەدووکەڵـی هێنـد بـەرزە، سـەری گەیوەتـە ئاسمانان. ئەو بەژنوباڵا ڕاستەی تۆ- کە تانەی لە سەولی بەژنڕێک و لـووس دەگـرێ- سێبەرێکی دەبێ هەبێ؛ من سـێبەریم. تـۆ بفـەرمووی و نەفـەرمووی، تـازە هـاتووم؛ لا ناکەوم. دەسا ئەی سوڵتان و شاهی بەڕاستی من! گوێ مەدە سووچ و گوناهی ناڕاسـتی من. لە ڕاست منی ئاوارەی بێدەرەتانی گەدای جوانیـت، لـە تاواندنـەوە واز بێنـە و بـە لاواندنەوە وەمخوێنە. دڵم خوێنە؛ جارێک گلە و گازندەکانی ببیسە و دادی بدە.

٧ گــر شــوبهەتێ پەروانــە د بــەزمێ تــە چ ســەد گــرِ[1]
سەد نالە هــەزار رەنگــی وەکــی چــەنگ و ژیهــێ مــن

٨ نــوورین قــەدەحا خــەمر و حــەیاتا مــە ب ســەر دان
گەر وێ بدەتن دەســت ب دەســت موشــتەریهێ مــن

٩ یــەک عیشــوە «مــەلا»یــێ ب بوهــا بێتــە ژ لــەعلان
سەد جان مە هەبن هێژ کــو موقەسســیر د بــەهێ مــن

**مانای وشەکان:**

**گر**: گرتی؛ **گرِ**: پێت و بلێسە؛ **ژیهـ**: ژێتار؛ **بسەر**: سەربەسەر؛ **هێ مـن**: هەی لە مـن؛ **بوها**: نرخ؛ **بەهێ**: نرخ.

**پوختەی مانا:**

لە بەزمێکدا تۆی تێدا بی، بە هەزار ئاهەنگ و هەوا، لە چەنگ بە سینگا کوتان و لەشی لاواز و باریکم- کە وەک ژێکەمان زراوە- گوێت لە دەنگی وەکــی چــەنگ و نالــینی بلوێری دەبێ.

من بە خەیاڵی خاوی خۆم وام داناوە و یار بە دەســتی ناســکی خــۆی، لــە بــادەی بــە ڕووناکایی تیشکی کوڵمی، پیاڵەیەک بداتە دەستم، ژیان و هەستم لە بەرانبەریدا بدەم و سەربەسەر سەودا سەر بگرێ. ئاخ ئەگەر یار بەو سەودایە ڕازی بوایە و دەستی دەنا و دەستم نایە و بیفەرمووایە وا سەری گرت؛ هەی لە بــەختم! لــە نــاو هــۆزی کڕیارانــدا، کەس وەکوو من سوودی نەبرد.

مەلا ئەو قسانە چین دەیانکەی؟ کەی یار سەودای وا پڕ لە زیان قبووڵ دەکــا. ئەگــەر هەر تەنیا نازێکی بە بزەی لێوە ئاڵەکەی، بە نرخی سەد گیــان بفرۆشــێ، هێشــتان تــۆ ئەگەر کڕیار بی، لە قازانجتە و هێمان لەو نرخەی دەیهێنێ زۆرت کــەمتر پــێ دراوە و نرخی تۆ کورتی هێناوە.

---

[1] . زڤنگی و سەلمان «گەر شوبهەتێ پەروانە د بەزمێ تە چ سەد گەرِ»یان نووسیوە.



# دوور ناکەوین

١ ئـــەز نـــزانم ســـەبەبێ یـــارێ چـــرا دوور کـــرین
شاهێ شیرین‌دەهەنان ئەم ژ خوە مـەهجوور کـرین

٢ میسلێ گۆی بێ‌سەروپا بوومە ل بەر زەرب و شەکان
لەو ب چـەوگانێ جـەفایا خـوە ژ دل هـوور کـرین

**مانای وشەکان:**

**چرا**: بۆچی؛ **دەهەن**: زار، دەم؛ **مەهجوور**: تەرک کراو، دوورەوە خـراو؛ **زەرب**: زەبـر؛ **شەک**: لێدان بە گۆچانی شەقێن؛ **چەوگان**: گۆچانی شەقێن.

**پوختەی مانا:**

هیچ تێناگەم، چۆن بوو دڵم تا ئەو ڕادە خۆی خوێنتاڵ کرد کە سەرداری لێوشیرینان و دەمقەندان، ویستی لای لێ لا بدەم و دوور کەومەوە؟!

من وەکوو گۆی گرۆڤەر بووم؛ دەبەر زەبری گۆچانی دووریی دیداری ڕادەفێنرام و لـێ دەدرام؛ بەڵام هەر مام. ئەوجار ناچار وردی کردم و پێی ڕێخستم؛ لای وا بوو لە نـاوی بردم. بەڵام ئەویش بەهرەی نەدا.

٣ دامە سەد جامـێ فیراقـێ ژ خـوە غائیـب نـەبووین
ژ ویســالێ قەدەحــەک دامــە و مــەخموور کــرین

٤ نوورێ چەشمێ مە کو عالەم مە ب چـەشمێن تـە ددی
ب جەمالا خوە تە وەک دیـدەیێ بـێ نـوور کـرین

٥ نەفەسەک بێ تە مە ناچی نەدژین بێ تـە دەمـەک
ژ تە هات ئەمرێ هومایوون تە وە مـەئموور کـرین

**پوختەی مانا:**

سەت پیاڵەی ژەهراوی دووری، بەگیان و دڵم چەشاند و دیتی من لە هۆش دەرناچم و لە دەرگای ئەو، نەدیار و بەرپیوار نابم. لە لایێ ترەوە بۆم هات: بە ڕووخۆشی بانگی کردم. وای بە دیداری مەست کردم، خۆم و هەموو شتم لە بیر چوو. لە سەرخۆشییان پێلووی چاوم بەسەر یەکتردا لکاون و هێندە سست و لەش‌گرانن، لێک نابنەوە کە دووبارە بیبینمەوە.

ئەی یارە مەستە چاوەکەم! تۆی سۆمای چاوی گیان و دڵ. هەموو دنیام هەر بە خۆشی و سۆمای چاوێکەوە دیوە، کە هەر خۆت بە منەت بەخشیوە؛ بە جوانی تۆ ڕووناک بووە. ئێستا کە جوانیت نەبینم، وەک چاوی کوێرم بە سەر دێ. دڵم دەستەکوتێ دەکا و گیانم سەرەنگرێ دەبێ و ڕەتان دەدا. گیان و دڵی بەڕاستم تۆی! تۆ هەناسەی! بە بێ هەناسە چۆن دەژیم؟ ئەگەر گەدای دەرکی ماڵم، ئەگەر دڵداریێ خوێنتاڵم، دەسکاری تۆم. فەرمانی پیرۆزی تۆ بوو، کە من وا بم. من و گیانم، ڕاسپاردەی بەر فەرمانی تۆین؛ گوڵچنی سەر خەرمانی تۆین. ئێمەی فەرمانبەری کز و زەبوون و ژار و خاکەسەر، هیچکارە نین؛ هەر خۆتی خۆت!

**٦** مە دزانی کو تو دێ «عاقبتُ‌اَلامر» چ کی
لەبێ لەعلێ شەکەرین ئاه کو مەغروور کرین

**٧** زەڕرەیەک بووم د هەوایا تە د ویرانەیەکی
میسلی رۆژێ ب شوعاعا خوە تە مەشهور کرین

**٨** ژ «اَناالْحَقْ» ب لەبێن لەعل خەبەردار بوین
ب گولابا سەرێ زولفا خوە تە مەنسوور کرین
(یان: ب کولابا...)

**مانای وشەکان:**

**عاقیبەت**: ئاکام؛ **ئەمر**: کار؛ **مەغروور**: بادیهەوا، بەفیز؛ **مەغروور**: فریودراو؛ **شوعاع**: تیشک و تیرێژ؛ **اَنَاالْحَقْ**: من خوام؛ (باسی کرا).

**پوختەی مانا:**

هەر کە دڵت کردینە هۆگری جوانی خۆت، دەمانزانی ئاکامی دڵداران چۆنە و چۆن تووشی دەردی دڵ دەبین و چلۆن پەندێکمان پێ دەدەی. بەڵام چی بکەم لە دەست شیرنایەتی لێوی ڕەنگ ئاڵ، کە بەدینی فریو درام و لە بەندی دڵداری خرام و کرامە پەندی عالەمێ و لە ناو ڕیزی دڵداراندا، ناوم برا و ناوم زڕا. تۆ بە ئەوینی لێوانی سەلما ناوێک، تووشی ئەوینی بەتینی ڕاستەقانی خۆتت کردم. دەگەڵ نوورتدا تێکەڵ بووم. گیانم وەک ئەو تۆزە وردەی لێ هات کە لە دەلاقەی وێرانە لە تیریژی ڕۆژ دەهاڵێ و دەبیندرێ و ناوبانگی بە ئەویندارییی ڕۆژ بڵاو دەبێ. لە خۆشی ئەو تێکەڵ بوونە، دەگەڵ تیشکت، گیانم لە خۆی بایی ببوو؛ خۆی بە تۆ دەهاتە بەربیر؛ هاواری دەکرد: «من خودام». بە تاوانی درکاندنی نهێنی دڵی، بەرەو بۆنی گوڵاوی کەزیت ڕاکێشا و بە قولاپی کەزیانتدا هەڵاوەسی و بە دەردی مەنسوور هەللاجی مەشهوورت برد.

**٩** مونسەریف ما د بوین ئەم بە دوسەد جاری «مەلێ»
لێ ب وێ کەسر و ئیزافێ ڤە خۆ مەجروور کرین

**پێش گوتنێك:**

لە ڕێزمانی عەرەبی(نەحو) دا، **مونسەریف** بە وشەیەک دەڵێن کە بزاوی سەر و بۆر و ژێر و جووتبزاوی (تەنوین) بە پێی پیت و ئامرازی تر، بچێتە سەری. **نامونسەریف** بریەتییە لەو چەند شتانە کە هەر لە بارێک دەمێنن و ئەگەر ئیزافە نەکرابن، بزاوەکانیان ناگۆڕێت. **ئیزافە**: بە ڕستێک دەڵێن لە دوو وشە پێک هێنراوە و یەک، مانای ئەویکەی تریان تەواو دەکا. بەوی هەوەڵ دەڵێن **موزاف**، دووهەمیان **موزافون‌ئیلەیە** . لە دەستووری خوێندنەوەدا، موزافون‌ئیلەیە ژێردارە و عارەبان پێی دەڵێن **مەجروور**. موزاف و چەند پیتی دیش هەن، کە ناویان ناون **جار** (**یان حەرفی جەڕ**). ئامرازی جەڕ، هەرگا دەکەونە سەر ناوێک، ناوەکە ژێر پەیدا دەکا. وشەی «ئەحمەد» لە ڕێزمانی عەرەبیدا، ئەگەر چی ئیزافە نەکرێ، لەبەر دوو شت لە مونسەریفیی بێبەشە: یەکیان وەزنی وشەکەیە، دووهەم ناوی ئاشکرایە (ئیسمی عەلەم)ە مەلا ناوی: ئەحمەد بووە.»

**مانای وشەکان:**

**مونسەریف**: واز لێ هێن، وەگەڕیاو؛ **جار**: هەل؛ **جاڕ**: ڕاکێشەر؛ **کەسر**: شکان؛ **کەسر**: بزاوی ژێر.لە دوای پیتان؛ **ئیزافە**: زیادە، سەربار؛ **ما**: بۆچی.

**پوختەی مانا:**

بە دووسەت ئەوندەش جزیای دڵ و مەینەتکێشان و ژان و برک و گیان‌کێشانیش، بۆچی وازمان لە دلداریی تۆ دەهێنا؟ نەخێر. ئێمە بۆیە نەهاتووین بگەڕێنەوە. تەنانەت من، کە ناوی ڕواڵەتم «ئەحمەد»یشە و ناوەکەشم بۆ هیچ ئامرازێکی کێشان بار ناگۆڕێ و دانانەوێ و نەوینی پێ کەسری شانە. بەڵام تۆ کە لە ئەوینێدا هەوەڵجار بە ئاڵقە و چینی تێکشکاوی بسک و کەزی یارت گرتم و ئەوینی جوانی دنیاییت کردە سەرباری ئەوینی ڕاستەقینە و بە دوو زنجیر لە دوو لاوە بەندت کردم و ڕاکێشرام، چاری ناچار منی زەبوون، ملم شۆڕ کرد و بۆڕم خوارد و تێکشکام و دانەویام بۆ تیر و تانەی نائاگا و نائاشنایان و ملی گیان بە دەم پەتەوە، وەک مەنسوور لە ژیانیش بووم و بە کافریشیان لە قەڵەم دام. بەڵام ئێستاش لە دلداریی پەژیوان نیم و بە هەموو دەردێکی شادم و هەرگیز وازی لێ ناهێنم و ناوەگەڕێم.

«مەحوی» دەڵێ:

هەتا حەق ناسیرە هەر حەقمە مەنزوور

وەکوو مەنسوور ئەگەر بکرێم بە دارا



## پێتا ئاتەشێ

| | | |
|---|---|---|
| ۱ | ئـــیرۆ ژ حوســـنا دلبـــەرێ | دیسـا هــەلاک و سەرخوەشـین |
| | رەمـــزێن د وێ شیرینسـورێ | ســـۆهتم ب پێتـــا ئاتەشـــین |
| ۲ | ســـۆهتم ب بـــەرقا لامیعـــە | ئـــەو نـــەجم و بـــەدرا تالیعـــە |
| | شەمسـا ســـەمایێ رابیعـــە | لـــەو پـــڕ د شـــەوقێ شەووەشـین |
| ۳ | پـــڕ شەووشـــاندن وێ دلـــە | زولفـــێن ســـیاه ســـەردان ملـــە |
| | تـــۆرا موخـــالیف سیلســـیله | ســـەلوا عـــەقارب لـــێ مەشـــین |

**مانای وشەکان:**

**پێت**: بلێسە؛ **ئاتەشین**: ئاگرین؛ **نەجم**: ئەستێرە؛ **نـەجم**: وردیلـەگیا؛ **تـالیع**: هـەلاتوو، دەرکەوتوو؛ **رابیع**: چوارەم؛ **شەوق**: ڕۆشناکی، ئارەزوو؛ **شـەووش**: ئالـۆز، شـێواو؛ **مـل**: شان؛ **موخالیف**: ناتەبا، پێچەوانە؛ **مەشین**: ڕۆیشتن.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ دیسان- وەک هەموو دەم- سەرخۆش و کەلـەلا و شـەکەت، لـە هێزکـەوتووم. جوانیی دلبەر، هیچ ئاهێکی بۆ نەهێشتووم. ئیشارە و نـازی ئـەو جوانـە ڕەزاشـیرین و دلکێشە، بە گڕی کولمەی ئـاگرینی، سـووتاندمی؛ برژانـدمی. سـەرەڕای ئـەو بـە گـڕ سووتانە، بە برووسکەش هەلپرووزام. ئەوی مابووم لێی سووتاندم. یاری من هەر شتێک نییە، هەموو شتی جوان هەر خۆیەتی. چاوەکانی وەک ئەستێرەی کاروانکوژە، ڕێ لـە کاروانی دلداران هەلە دەکەن. هەنیەی وەک مانگی چاردەیە؛ لەشی ئێمەی کلـۆل و بێتالح و بێبەش- کە لە کەتان بێرەنگتر و هلۆل و بێپۆ و سـووکترە- دادەڕزێنـێ و ئاوی چاومان وەک ئاوی دەریا و دەراوان دەبزوێنێ و بەرەو بـالای خـۆی دەکشـێنێ. ڕوخساری وەکوو ڕۆژ وایە. لە ئاسمانی بلندی بەژن و بالایرا- کـە سـەر لـە ئاسمـانی

هێندەم سەرەتیری چاوی، پڕ لە ناز و تیری بەهانەی نازاویم وێ کەوتووە و نووکی مژۆڵ وەک سەرەتیر لە گیانی دڵم چەقیون، هەموو گیانم وەکوو پۆڵای لێ هاتووە. شیرم لێ دەن زرینگەم دێ؛ چۆنکە لە هەر لا وێم کەوێ، هەر سەرەتیری وەبەر دێ.
گیان بە ئاواتی دیداری چاوەکانت هەر دەمێنێ و هیچ هێزێک لە بنەی ناهێنێ.

١٠ کــو دلبــەر هاتــە ڤــێ یۆلــێ　　ژ بــەر پــوڕ هــن کــەتن چۆلــێ
ژ قــەنجان کــو رەڤــاند هۆلــێ　　ژ مــــەحبووبان بـــرن نـــەردە

**مانای وشەکان:**

**یۆل**: ڕێگە، ڕەوشت؛ **هن**: هەن؛ **قەنج**: جوان و لەبار؛ **هۆل**: یاری گۆیێن؛ **تو**: هیچ.

**پوختەی مانا:**

کاتێ دلبەر لە خۆ پۆشین بەڕووبەندی وازی هێنا و ڕەوشتی خۆ نیشاندانی کردە پیشە، زۆرکەس هەبوون لە تاوان شێت و شەیدا بوون؛ کەوتنە چۆلان. دلبەرانی لەبار و جوان، لە مەیدانی ملەی جوانی و دلڕفێنیدا، دۆڕاندیان. گۆی سەرکەوتنی بۆ خۆی برد. لە باری جوانی و لەباری و لە نەردی گەردنزەردیدا، دەستی هەموو نازدارانی لە تەختە بەست و سەد دەستی لێ بردنەوە.

١١ ژ قــەدد و بــەژن و بالایــێ　　ژ رەنگــێ دیم و ســـیمایێ
تــو رەنگــی قــەت خەبــەر نایــێ　　د حوســنێ جەوهــەرەک فــەردە
١٢ ب خــەمل و رەنــگ و رەعنایــێ　　ب مـــەحبوبێ، ب زیبایـــێ
ب ئــەو حوســنا خــودێ دایــێ　　ژ گــول رەنگــان گــولازەردە

**مانای وشەکان:**

**تو رەنگی**: هیچ ڕەنگێک؛ **رەعنا**: شلک و شۆخ؛ **زیبا**: جوانی بەردڵ؛ **خودێ**: خودا؛ **خەمل**: خشڵ؛ **جەوهەرێ فەرد**: ماکی بێهاوتا؛ **جەوهەرێ فەرد**: ئەو ئەسلەیە کە خۆی بە خۆیەوە بەندە و بۆ بەش و پاژکردن ناشێ.

**پوختەی مانا:**

هیچ جوانێک و خوێنشیرینێک، بە ڕەنگ و خشڵ و زەنبەریش خۆ جوان بکەن، هەرگیز لە ڕەزاشیرینی و ڕەنگ و ڕوو، لە بەژن و بالا و سیمادا، تۆزقالێکیش وەک یار ناچن. جوانیی یارم- کە تایبەتی بەشێکە خوا بەوی داوە- لە دنیا جەوهەری تاکە و ماکی جوانیی هەر خۆیەتی و کەس ناتوانێ بەشێکی لەو جوانییە هەبێ. گوڵی زەرد، لەو ئێرەییانەی -کە نەیتوانی وەک ئەو جوان بێ- ڕەنگی زەردە.

خوا فەرموویە: «هیچ شتێک وەک خودا نییە». مەبەستی مەلا ئەوەیە، جوانی سەلما، وێنەی جوانی خوای سەلمایە و کەس لە رەنگی خودا نییە.

| | | |
|---|---|---|
| ١٣ | نەبات و شەککەرا لێڤێ | نەسیمێ وێ گول و سێڤێ |
| | هلینت پەردەیا شێڤێ | شیفایا هیندەکی (هندکی) دەردە |
| ١٤ | ژ نەقش و سونعێ جەبباری | موتەررا توررەیا تاری |
| | ل نووری میسکێ تاتاری | ب سەروان خەمریان بەردە |
| ١٥ | ل بەر رۆژێ ببت خێلی | بنێرم قامەتا عێلی |
| | قەدیف و زەرکەش و تێلی | زەباد و میسک و عەنبەر دە |

**مانای وشەکان:**

**هلینت**: لادا؛ **شیفا**: عیلاج؛ **هندک**: کەم؛ **موتەررا**: کۆوەکراو؛ **توررە**: بسکی لای لاجانگ؛ **تاری**: تاریک؛ **خێلی**: تەم و سێبەر؛ **بنێرم**: بڕوانم؛ **عێلی**: بڵند؛ **قەدیف**: مەخمەر؛ **زەرکەش**: زەری؛ **تیلی**: پارچەیەک کە هەودای زێو و زێڕی تێوەدرابێ؛ **زەباد**: بۆنخۆشی زەباد، کە جانەوەرێکە لە بەرەی شێر و پشیلە.

**پوختەی مانا:**

شەکر و نەباتی لێوانی، سێوی چەنەی، گوڵەباغی سەر کوڵمانی- کە سروەی هەناسەی ساردم دەیانگاتێ- شەوە ڕەشی کەزیەکانی- کە بوونە پەردە لە ڕوویدا- وەلا بەرێ؛ هەر کەمێک لە دیتنی وان، دەرمانی هەموو دەردانە.

ئەو بسکە لێک هاڵاوانە، کە بەم لاو بەو لادا کراون و ڕەنگی تاریکاییان هەیە و بۆنیان وەک

میسکی تاتاری، تۆمار بە تۆمار بلاوە و لەسەر وانیش پرچبەندت- کە لەسەر تویڵ دیاری ئەدا- لەسەر ڕوخسار وەلا بەرە! با ئەو نوور و تیشکی خوایە، بێتە بەرچاوی دڵداران و ئەو سێبەری بسکانەی تۆ چیدی بەری ڕۆژێ نەگرێ و مەخمەر و زەڕی و زێڕپۆیان، با لە جیرانەتی لەشت، بۆنی عەنبەر و زەباد و میسک بگرن. بێرە دەرێ با دەو بەژن و باڵا زراوە و کەڵەگەتەی تۆ- کە نموونەی دەسکاری خوای شیرینکارە- تێر ڕامێنم.

| | | |
|---|---|---|
| ۱۶ | ب سیماڤێ ب زێراڤێ | تو ڕۆژێ نەقشەکی باڤێ |
| | کودا ئەرژەنگ ژ وێ ناڤێ | ل بەر ڕۆژێ نەبت پەردە |
| ۱۷ | ئەگەر بەرقەک ژ وێ رووژێ | ژ بەر وێ عیقد و بشکۆژێ |
| | بدت قەلبێ وەکی دۆژێ | ل بەر دۆژە دبت بەردە |

**مانای وشەکان:**

**سیماڤ**: ئاوەزێو؛ **باڤێ**: بهاوێژە؛ **ئەرژەنگ**: وێنەنامەی مانی وێنەگر و پێغەمبەری موجزات وێنەکێشان؛ **وێ ناڤێ**: ئەو ناوە؛ **عیقد**: گەردانە؛ **بشکۆژ**: قۆپچە و خونچە؛ **دۆژ**: جەهەندەم؛ **دۆژەه**: دۆزەق؛ **بەرد**: سەرما، ساردی.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! هەر تۆ ڕۆژێک وەرە دەر و خۆت نیشان دە! با ئەو نەخشەی دەستی خودا ببیندرێ. با لە شەرمان، وێنەنامەی مۆجزاتی مانی، ون بێ و خۆ وەشێرێ و خۆ لەبەر ڕۆژی رووت نەگرێ و نەبێتە پەردەی بەرچاوان و چاوان بە خۆ خەریک نەکا. من لێم روونە هەر لەو شوێنی بە گەردانەی کە دنیای لێ سەرگەردانە و لەو سینە و بەرۆکەی قۆپچەت لێ کردۆتە جەزایەرچی، تۆزێک وەکوو برووسکەیەک دیاری بدات، دڵی پڕ لە ئاگری من- کە لە ناو بڵێسەی ئەوینی تۆدا قەتیس ماوە- لە سووتان ڕزگاری دەبێ و تەنانەت دۆژەهی گەورەش، لە ڕوویا سارد دەبێتەوە.

شیاوی باسە: مەلا چیرۆکی ئیبراهیم پێغەمبەر بیر دێنێتەوە: کە بتەکانی شکاند و لە سزادا خستیانە ناو ئاگرەوە. خودا فەرمووی: «ئاگر ساردی سلامەت بە!» ئاور نەیتوانی ئیبراهیم بسووتێنێ.

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ | د مەیـــدانێ شـــیرین غـــەنجان | بچـــەرخن میسـلێ شـــەترەنجان |
| | تورابـــا بـــەرپییێ قـــەنجان | زەبـــاد و عەنبـــەرین گـــەردە |
| ١٩ | دبـــت بێـــژن وی سولـــتانی | ب هـــەفت ئایاتـــێ قورئـــانی |
| | ل مـــەحبووبان تـــو خاقـــانی | وەرە دەربـــێ ل قەیســـەر دە |

**مانای وشەکان:**

**مەیدان**: گۆڕەپان؛ **توراب**: خۆڵ و خاک؛ **گەرد**: تـۆز؛ **قەیسەر**: قەراڵـی ڕۆم؛ **هـەفت ئایاتی قورئانی**: واتا، هەموو قورئـان، یـان سـوورەتی فاتیحـا، یـان حـەوت سـوورەتی هەوەڵی قورئان. کە لە قورئاندا خوا فەرمویە «وَ آتَیناکَ سَـبعاً مـنَالمَثـانی» داومانـە پێت حەوتی لێکچوو. ئەو کەسانەی تەفسیر نووسن، زۆریان لەو بارەوە گوتووە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر لە دەشتایی جێ داوەتێکدا، هەموو نازدارانی ڕەزاشیرین، کۆ ببنەوە و بە لاسایی تەختەی شەترنج، هێندێکیان لـە پلـەی جوانیـدا، بـە وەزیـر و ڕوخ و فیـل و ئەسـپ دابندرێن و هێندێک پیادە بمێننەوە و بە تێکڕاش ئەوندە جوان و نازدار بن کە تـۆزی بەر پالاکەیان وەک عەنبەر و زەبادی دابێژراو وا بێ، بە تێکڕایی و بێ لامەوجووم تۆ بـە شای خۆیان دادەنێن.

سوێندم بە حەوت ئایەتەکانی قورئانێ، تۆ لە ناو جوانانی دنیـا، وەکـوو قەراڵـی چینـێ وای. تانجی سەری قەیسەرانی. دەتوانی لە باری جوانی، زەبرێکی باش لەوانە دەی کە بە جوانی خۆ دەنازن و لایان وایە بوونە قەیسەر لە ناو جوانان.

| | | |
|---|---|---|
| ٢٠ | «مـــەلا» زانم ژ مـــەجزووبان | تنـێ نـازی تـو بـێ خووبـان |
| | دەمـــا دل دی ب مـــەحبووبان | ب شوخ و شەنگ و ئەسمـەر دە |
| ٢١ | دەمـــا جـــەللاد بـــێن بـــازی | ب شـــیر و خەنجـــەرێن تـــازی |
| | ل دەرگەهـــدا نـــەکی گـــازی | دەلال و نازپـــــــــــــەروەردە |

**٢٢** ئەمانــــەت دا ژ بێهووشـــــی دورێـــن ناســـوفتە نەفرووشـــی
«مـــەلا» زانم ژ مەدهووشــــی تـــە دل بێخـــاب و بـــێخوردە

**مانای وشەکان:**

**گازی**: گلە؛ **گازی**: بانگ، هاوار؛ **سوفتە**: سماو؛ **مەدهووش**: لەهۆشچوو.

**پوختەی مانا:**

مەلای دڵدار! دەزانم چیت. ئەگەر ڕێڕەوانی تەریق- کە هاتوونە ناو ڕیزی خواناسانەوە و ئەوینی خودا کێشاونی و دڵ و گیانیـان لـە هـۆش چـووە- گشـتیان بـە بـێ یـاری مەجازی هەڵبکەن، تۆ لەو ناوە، تەنیا کەسێکی هەڵـناکەی. جـا ئەگـەر هـەر دڵـیش دەدەی بە دڵبەرێکی دنیایی، شۆخ و شەنگی گەنمڕەنگی وەک سـەلمات قـەت دەس ناکەوێ؛ دڵەکەت دەقەبەڵ ئەو کە!

هەرگاش چـاوە دڵـدارکوژەکانی- وەک میرغـەزەب- بـە شـیری تیـژی برۆیـان، بـە خەنجەری مژۆلانیان هاتنە گەمەی دڵدارکوشتن، نەچی هاوار و داد بکەی! ئـەو یـارە، هێندە ناسکە و هێند نازدارە، لە دەنگی گلـەت دەرەنجـێ. نازکۆڵـەیە؛ مەیرەنجێنـە! تۆزێکیش ئاگات لە خۆت بێ! تۆ لـەکاتی حـاڵ لـێ هـاتن، ڕازی گرینـگ- کـە وەک مرواری نەسماون- ئەدرکێنی. دەزانم خەو و خواردنت لێ حەرامـە و دڵـت گەرمـە و هۆش‌وگۆشت، لە دەست داوە؛ بەڵام دیسان ناشێ ئەوی ناشێ بێژی، بێژی.



# عیشق و جەزبە

۱ دلبەرێ سەرداری خوبان ئەز نزام ئاگا هەیە؟
حەبسی زیندانێ و ئەسیر و گرتیێ دەرماندەیە؟

۲ گرتییم مایم د حەسبێ کی گەلۆ مەهدەر بکت؟
جارەکی ناڤێ مە بینت پورٍ سەوابەک زێدەیە

۳ میحنەت و حالێ ئەسیران کی ل میران عەرزە کت
دی بتن پورسێ ل من لەو پورٍ ب رەحم و شەفقەیە

**مانای وشەکان:**

**دەرماندە**: داماو؛ **گەلۆ**: خەلکینە؛ **مەهدەر**: تکا؛ **سەواب**: خێر؛ **میران**: میری گەورە؛ **عەرزە**: لەبەر ڕانان؛ **لەو**: چۆنکە؛ **شەفقە**: بەزەیی؛ **ئەز نزام**: من نازانم.

**پوختەی مانا:**

من نازانم ئەو دڵبەرەی سەروەری گش جوانچاکانە، خەبەرداره کە من لە زیندانی ئەوا بەند و دیل و سەرگەردانم؟ زۆر دەمێکە بەند کراوم و لەو زیندانەدا داماوم. ئاخۆ هیچ‌کەسی وا هەیە جاروبارێک، ناوی ئێمەی بێتە بیر و ئەو خێرە گەورەیە بکا. مەینەت و دڵپەریشانی یەخسیرانی ئەو جوانییە، بە عەرزی میری مەزنی مولکی جوانی بگەیەنێت؟ لیم ڕوونە لێمان دەپرسێت؛ چۆنکە دەیناسم کە بەزە و دلۆڤانی یەکجار زۆرە.

۴ گەر بپرٍست جارەکی خاتوون ل حالێ سوختەیێ
قوفل و زنجیر دێ ڤە بن بێ ئیسم و دەست و میفتەیە

٥ بەند و زنجیر دیٚ ڤەبن جەرحێن د کول دیٚ خوەش بکت
لـــەو کوناڤـــیٚ دلبـــەریٚ دەرمانـــیٚ دەردیٚ بەندەیـــە

٦ هـــەرچی بێڤـــیریٚ کـــو ناڤـــیٚ دلبـــەریٚ بێـــتن ل ســـەر
خوەش دبت حادر (هادر) د گاڤیٚ بیٚ‌گومـان و شـوبهەیە

**مانای وشەکان:**

**خاتوون**: وشەی ڕێزلێنانە بۆ ژنان؛ **سوختە**: تازەفەقێلە؛ **ئیسم**: نـاو، مەبەسـت ئیسـمی ئەعزەمە، ناوی هەرەگەورە؛ **میفتە**: کلیل؛ **کول**: بەژان، بەناسۆر؛ **بێڤیر**: نەخۆشی لەسەر مردن، لە هێز کەوتوو؛ **حادر یا هادر**: دەستەولەجیٚ؛ **د گاڤیٚ**: هەر دەمودەست.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر جارێک ئەو خاتوونە پایەبەرزە، لە منی تازەفەقێلەی دەرسی دڵداری، پرسـیار بکـا و بڵیٚ چۆنە، قوفڵ و زنجیری دەست و پێم، بـە بـیٚ دەسـت لێـدانی کـەس و بـیٚ کلیـل و بیٚ‌خوێندنی ئایەتی قفڵ کردنەوە و ناوی دایکی مووسا زانین، دەکرێتەوە! هەر ناوی خۆی لەبەر بێنیٚ، یان هەر دەردێک دڵمان بگریٚ و ناوی ئەو بێتە سەر زارمـان، کارمـان سـازە و ڕزگاریی و چا بوونەوەمان -کە کۆیلەی بەر دەرگای ئەوین و بە ئەوینی ئەو گـیراوین- بـە وی بەندە. هەر بەندەیەکی لەش بەبار- با کەوتبێشتە گیانەڵاو- ناوی یارمی لەسەر بێـنن، دەستەولەجیٚ، نوون دەلەشیدا نامێنیٚ و چابوونەوەی هیچ گومانی تێدا نییە.

٧ بیٚ‌گومـــــان خاکـــــا ڕیـــــا ویٚ تووتیـــــا و دانەیـــــە
گەر د چەهڤێن کـور ڤـەئینن خـوەش دبـن پـیٚ دیدەیـە

٨ مـــەییتی سەدســـالە ژی ویٚ ریٚ ڤـــبەر قـــەبریٚ کەڤـــت
دیٚ ڤـــەژی رووح بێتـــە ســـەر ســـاتا خـــوە بێـــتن زیندەیـــە

**مانای وشەکان:**

**تووتیا**: بەردێکە بۆ ڕووناکی چـاو دەیهـاڕن و چـاوی پـیٚ دەڕێـژن؛ **ڤـەئینن**: دانـێن، تیٚ‌بکەن؛ **مەییت**: مردوو؛ **ڤبەر**: دەسەر، دەبەر؛ **سات**: کات؛ **دانە**: دەرمانێکی چاوانە.

**پوختەی مانا:**

خاک و خۆڵی ڕێبازەکەی، وەک تووتیا و دانە وایە. ئەگەر دەچاوی کوێر کرێ، بێ‌گومانم دەستبەجێ سۆمای دێتە بەر و زۆر بە ڕۆشنی دەبینێ.

ئەگەر یارم، ڕێگەی بە سەر گۆڕی مردووی سەدساڵەدا بڕوا، یان دەبەر گۆڕی ببووڕێ، هەر ئەوساتە کۆنەمردوو گیانی دێتەوە بەر لەش و وەک گوێزی ئازا دێتە دەر.

٩ مەیتان لەورا دکت یەکسەر دلان یەغما دکت
ئیسمێ ئەعزەم ما دزانت یا مەسیح ئەو ب خوەیە

١٠ ئەز دبێم عیسایە ئەو، یا بووعەلی‌سینایە ئەو
لەو ب ڕەمز و عیشوە یان پوڕ موعجیزات و شێوەیە

١١ شێوە و ڕەمزێن د وێ تەشبیهێ بەرقێ لامیعن
کووهێ قاف بت کەر دکت ساتا خویا بت پەردەیە

**مانای وشەکان:**

**ما**: مەگەر، چما؛ **مەسیح**: هەنواو؛ **مەسیح**: دەست پێدا هێنراو؛ **مەسیح**: ممبارەک؛ **مەسیح**: بەدفەڕ؛ **مەسیح**: نازناوی عیسا پێغەمبەرە لە ممبارەکییان؛ **مەسیح**: بە جرجاڵ دەڵێن لەبەر شوومی و جووت‌قۆشەیی؛ **کوه قاف**: کێوی قاف (باسکراوە)؛ **کەر**: لەت.

**پوختەی مانا:**

جا وەختێ یارم دەتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوە، دیارە تاڵان کردنی دڵان، کارێکی زۆر هاسانترە. ئاخۆ ناوی هەرەگەورەی فێر کراوە؟ یان هەر خۆی وەکوو عیسایە، کە دەیتوانی بە ئیزنی خوا، کۆنەمردووش زیندوو وەکات؟ بەڵام لەو ناوە سەرم سوڕماوە: ئاخۆ وەک عیسا نەفەسی ممبارەکە؟ یان وەک ئەبووعەلی‌سینا، بە لێزانی نەخۆشان خۆش دەکاتەوە؟ بە ئیشارەتی چاوانی، دەڵێم مۆجزەی عیسایە؛ بە گفت و ناز و نیمنازی، دەڵێم بژیشکی چازانە. هەم شێوە و هەم مۆجزاتی، وەک برووسکەی ترووسکەدەر، یەکاویەکن. یار دیار نییە، ئەو مۆجزاتە دەنوێنێ؛ ئەگەر تاوێک خۆی نیشانی دنیا بدات و پەردە لە ناوا نەمێنێ، چیای قافیشی بێتە بەر، لەت-لەت دەبێ.

خوا فەرموویە: «ئەگەر ئێمە ئەو قورئانەن نادربایەتە سەر کێوێک، دەتدی سەری کز دەکرد و لە ترسی خوا، شەقار دەبوو؛ هەڵدەتەکا.»
مەلا لەو چەند بەیتانەدا، ئەو ئایەتە و باسی عیسا و مردوو زیندووکردنەوەی و مووسا و کێوی توور و نووری خوامان وەبیر دێنێ.

١٢ پەردەیا مەحبووب د نیڤ قەلبان کو دێ کەر-کەر بکت
قەت د پەردێ خەف دبن خورشید و ماه و زوهرەیە

**پوختەی مانا:**

ئەو پەردەی دڵبەر لە نێوان خۆی و دڵمان ڕایهەنگاوت، دڵمی خستە تاریکایی. ئەو پەردەیە لەت-لەت بکا و فڕێی بدات، دڵ وەک خۆر و مانگ و زوهرە، تیشک ئەدا و هیچ ئافەریدەیەکی خودا، وەک ناتوانێ پەردە لە بەر خۆر و مانگ و زوهرە بگرێتەوە، ناتوانێ دڵمان داپۆشێ و رووناکی لێ نەدیو بکا.

١٣ زوهرە و خورشید مەن دیتن د قەوسێ هەمقیران
سورڕێ دا دل عەقرەبان چەرخ و سەما و هەیهەیە

١٤ عەقرەب و قەوسوقەزەح، ڤێرا موقابیل موشتەری
رۆژ و شێڤ و نوور و تیرێژ، بەرق و هەم ئیسپێدەیە

١٥ ئەو حەمی ڤێکرا مە دین، تێکل د چەرخێ جارەکی
هی ژ وان بێحالم ئەز ئەحوال و عیشق و جەزبەیە

**مانای وشەکان:**

**هەمقیران**: نزیک و بەرانبەر بە یەک؛ **سورر**: دڵکێشی؛ **قەوسوقەزەح**: پەلکەزێڕینە، کەسکوسوور؛ **موشتەری و زوهرە**: دوو ئەستێرەی گەڕیدەن؛ **تیرێژ**: تیشک؛ **ئیسپێدە**: سپێدە، بەرەبەیان.

**پوختەی مانا:**

چاوم کەوت بە ڕوومەت و چاوەکانی؛ کە دوو برۆ کەوانییەکەی لە سەر دیار بوون. دەتگوت خۆر و ئەستێرەی زوهرە و موشتەری، لە مزڵگەی قەوسی ئاسمان، لێک نزیک و بەرانبەر بەیەک دیار ئەدەن. دڵکێشی ئەو لێکنزیکییە، بسکە سەر خوارەوبووەکانی- کە وەک کلکی دمارەکۆڵی ڕەش دەچن- بزواندەوە و دەتگوت لە خۆشیان دەڕەقسن. لاڕوومەت و کەزی و هەنیە و لاجانگ و تیشک و پرشنگی چاوەکانی، دەتوت خۆر و شەو و رۆژ و بریسکە و بەرەبەیانن. پارچەی هەمەڕەنگەی سەرپێچ و خشڵی سەر و گەردانەکەی، ببوونە کۆلکەزێرینەی بەر هەتاوێ. من جارێکی ئەوانەم هەموو بە چاوان دیتن. کە لە کۆڕی هەڵپەڕکێدا، تێکەڵ ببوون. وا لەو ساوە، حاڵم شڕە و دڵم سەری لێ شێواوە و جەزمەی ئەوینێ گرتوومی و بەرم نادا.

۱۶ حال ژ وێ رەمزێ گەها مەن مەستی وێ رەمزێمە هێژ
سەرخوەشم حەتتا ئەبەد بێ جام و نوقل (نەقل) و بادەیە

۱۷ سەرخوەشم بێجام و مەی، رەمزا نهین ئەبتەر کرم
ناگەهان تیر دانە دل لەو کوشتە حادر سوختەیە

۱۸ کوشتییان خوون دێن لیقائێ لەو ب وێ دێ خوەش ببن[1]
هێڤیان قەت نابرم مەقسوود مە دیدارا تەیە

**مانای وشەکان:**

**نوقل (یا) نەقل**: مەزەی بادەخۆران؛ **ئەبتەر**: دوابڕاو، بێسەروبەر؛ **حادر**: دەستبەجێ؛ **سوختە**: فەقێلە؛ **سوختە**: سووتاو؛ **لیقاء**: تووش هاتن؛ **هێڤی**: هومێد و هیوا.

**پوختەی مانا:**

لە ئیشارە و ناز و غەمزەت، حاڵەتێکم بەسەردا هات، کە هەتا دنیا دنیایە، بە بێبادە و پیاڵە و مەزە سەرخۆشم. رازی نهێنی ئەوینێ، وزە و هێزی لێ ئەستاندم. لەپڕ

---

[1] زڤنگی و دلۆڤان: «کوشتییان خەون دی لیقایێ...»

تیر دابارینە دڵ و کوژرام و سووتێندراشم. دەڵێن شەهید دەبێ بە خوێنی لەشەوە بنێژرێن؛ چۆنکە بەو خوێنە گەشەوە، دەچنە لای یار و بە دیداری یار، شاد دەبن. جا من پێم خۆشە هەزار جار، لە ئەوینی تۆدا بمرم و دڵەکەم خوێناو هەڵێنێ و گیانیشم خوێن بدەڵێنێ. بەو هومێدە کە بەو هۆیە تۆ ببینم و هەرگیز نابێ ناهومێدی بە لاما بێت.

«کوردی» دەڵێ:

شەهیدی عیشقم و مەمشۆن و کفنم بۆ مەکەن یاران
گەواهی حەشرە بۆ دەعوای شەهادەت بەرگی خوێنینم

«مەولەوی» فەرموویە:

هەر ساتێ سەد جار بەو تیر، بەو تەرکەش
زیندەگی و مەردەن ئامان، وەشەن، وەش

۱۹ هێڤیان قەت نابرم جارەک تو دینی شەفقە کی
عەقدێ ئیحرامێ دبینم حادری بم سەجدەیە

۲۰ سەجدەیا بەر ئەسوەدان نادم ب سەد حەج ئەکبەران
سوند ب وان زولفان و خالان هەچ وەکی بێژم وەیە

۲۱ سوند ب وێ زولفا سیاه ئەز عابیدێ حوسنا تەمە
خەف دنووشم وێ شەرابێ خوەش شەراب و قەهوەیە

**مانای وشەکان:**

**دین**: دیتن؛ **شەفقە**: مەرحەمەت؛ **عەقد**: بەستن؛ **ئیحرام**: نیەتی حەج کردن؛ **حەج ئەکبەر**: حەجی هەرەگەورە، ئەگەر شەوی جەژنی قوربان هەینی بێ، پێی دەڵێن حەجی گەورەتر؛ چونکە پێغەمبەر فەرموویە: «هەینی حەجیِ هەژارانە» دوو حەج پێکەوە ڕوو دەدات؛ **هەچ وەکی**: هەر وەکوو؛ **قەهوە**: بادە؛ **خۆش**: بەتام؛ **خۆش**: بەپەلە.

**پوختەی مانا:**

هەرگیز واز لەو هیوایە ناهێنم کە تۆ جارێک بە دیدارێک مەرحەمەتم دەگـەڵ بکـەی. هەر بتبینم، دەزانم دەبێ وەک حاجی، نیـەتی ئیحرامـێ بێـنم. لـە خۆشـیانا سـوژدە دەبەم. سوژدە بردن بۆ بەر خاڵت- کـە وەک حەجەرولئەسـوەدە- بـە سـەد حـەجی هەرەگەورەی ناگۆڕمەوە. سوێندەکەم بەو کەزیانەی تۆ، هەرچی دەیڵێم قسەی دڵمە. دیسان سوێندم بەو پرچ و کەزیە ڕەشـانەت مـن جـوانی تـۆ دەپەرسـتم. لـە بـادەی مەستیهێنەری ئەوینی تۆ- کە لە هەر شت بەتامترە- بێ خۆ گرتن دەخۆمەوە.

۲۲ عومرەکە دسۆژم ب خەف چەهڤنێرییەک پرسەک تەمە
دا بەیانکـەم شـەرحێ حالـێ دل ب حـەرف و نوکتەیـە
(یان: نوقتەیە)

۲۳ سـەد هـەزار بـار شـاکرم ئـەز کـو ژ بەلقیسـا پـەری
هودهـودێ شـیرینزەبان ئـیرۆ خەبـەرداریٚ مەیـە

۲۴ ئیسم و ناڤێ تەی شەریف حـەیکر ل مـن قـەلبێ مـری
لـەو د مـەدحێ تـەو سـەنائێ بوویمـە چـەنگ و نەیـە

۲۵ شـوبهەتێ چـەنگێ دنـالم هێـژ ژ دەسـت داغـا قـەدیم
هەر وەکـی مەشـعەل دسـۆژم دوسـت نـزام ئاگـەه هەیـە؟

**مانای وشەکان:**

**چەهڤنێر**: چاوەڕوان؛ **نوکتە**: وردەکاری، باریـکبینی؛ **بـار**: جـار؛ **شـاکر**: بەسـوپاس؛ **شەریف**: بەڕێز، ممبارەک؛ **سەنا**: پەسـن؛ **حـەی**: زینـدوو؛ **مـری**: مـردوو؛ **مەشـعەل**: چۆڵەچرا؛ **نزام**: نازانم.

**پوختەی مانا:**

من عومرێکە چاوەنۆڕم تۆ هەر جارێک لێم بپرسی: «حاڵت چۆنە»، تا زۆر ورد بۆتی باس بکەم: هەزار بار و هەزار جاران سوپاس بۆ خوا. کە پەپووی گفتولفتخۆش، ئەمڕۆ منی لـەو پەرییـە ناسـک و نـازدارە- کـە وەک بەڵـقیس لەسـەر تـەختی سـەروەریی جوانـان

جێ‌گیره- خەبەردار کرد. هەر ناوی پیرۆزی تۆی برد، دڵی مردووم زیندوو بۆوە. وا دەمبینی کە لە پەسن و تاریفتدا، دەنگم وەک چەنگ و نەی وایە و وەک بلوێر لەبەر ئەو داخەی کە لەمێژە دڵمی پێ کون-کون کراوە، دەناڵێنم. وەک چۆڵەچرا، هەموو ئەندامم بۆتە گڕ. دەسوتێم؛ بەڵام نازانم دۆست هیچ ئاگای لە من هەیە؟

**٢٦** من دڤێ سەر لاستانێ هەر وەکی توولان نەهم
بەلکە جارەک کەیل (لەیل) بپرست ئەڤ چ مەحرووم توو لەیە

**٢٧** گەر ب ناڤێ توولەیان جارەک ڤەخوونت بەندەیێ
ب «مەلێ» خوەشتر ژ مال و گەوهەر و گەنجینەیە

**٢٨** گەوهەر و گەنجێن مەلێ حوسن و جەمالا دلبەرە
سەد «تَعالیالله تَبارَک» ئەڤ چ حوسن و جیلوەیە

**مانای وشەکان:**

**توولان**: تولەگەل؛ **توولە**: سەگی چکۆلە؛ **نەهم**: دانیم؛ **کەیل**: هەڵبژاردە؛ **کەیل**: قەیل، فەرمانڕەوا و سوڵتان؛ **مەحرووم**: بەش‌بڕاو؛ **تَعالی**: پایەبەرزی؛ **تَبارَک**: پاکی و پیرۆزی؛ **تعالی‌الله تبارک**: بەرزی و پاکی و پیرۆزی بۆ خوا.

**پوختەی مانا:**

بە ئاواتم وەک سەگەکانی دەرماڵی، سەرم لە سەر بەر دەرگانەی بسوومەوە. شایەت جارێک ئەو سەروەرەی لە ناو جوانان هەڵبژاردە، بپرسێ ئەو توڵە بەستەزمانەیەی بە ئاوات نەگەیوە چییە؟ هەر کە جارێک منی کۆیلە، بە ناوی توڵە بانگ بکا و بەو بەزەی بمخوێنێتەوە، بۆ منی مەلا لە هەموو دارایی دنیا و گەوهەر و گەنجینەکانی باشتر و دڵخۆشکەرترە.

گەوهەر و گەنجینە لای من، جوانی و لەباری دلبەرە. ئەی خودایە! پایەبەرزی و پاکی و پیرۆزی بۆ تۆیە. کە ئەو جوانی و دیمەنە لەبار و ڕێکەت داوە بە یار. چەند زۆرە؟ هەر خۆت دەیزانی.



## ئەربابێ وەفا

١ فەلــەکا ئەتلەســێ سەرگەشــتە د جامــا مــە حوبابــە
مەوج ددەت قولزومێ عیشقێ مە ل سەر دەسـت غورابـە

٢ دل کەمەربەستەیێ عیشـقە مـە خـوە زوننـار پەرەسـتین
مــەی و مەعشــووقە دوعائــێ مــە و ســەججادە قیبابــە

٣ ژ حیجابــێ وەرە دەر نــازک و مەســتانە ب مــەش‌تو
تە جیهان زیروزەبـەر کـر ب خـودێ ئـەڤ چ حیجابـە؟

**مانای وشەکان:**

**فەلەکی ئەتلەس**: لە زاراوەی ئەستێرەناسانی پێشین لە سـەرووی هـەموو ئاسمانـان و هیچ ئەستێرەشی لێ نەبوون؛ **سەرگەشتە**: سەرگەردان؛ **حوباب**: بلقی سەر ئاو؛ **قیباب**: پەڕۆی ناو گیرفان؛ **قولزوم**: دەریا؛ **غوراب**: پیالە؛ **غوراب**: جۆرێک گەمیـەی قـەدیم؛ **زیروزەبەر**: ژێروژوور.

**پوختەی مانا:**

دەریای ئەوین، لە دڵی مەدا شەپۆل دەدا. پیالەیەکمان لە سەر دەستە کە دەمانەوێ مەستمان بکا. هەموو هەرد و ئاسمان و تەنانەت ئاسمانی ئەتلـەس، وەک بڵـقێکە بـە سەر بادەی ناو پیالەی سەر دەستی مەوە.
دڵم بۆتە کەمەربەستەی ئەوینی پاک. زوونناری یار دەپەرستین. نوێژ و نزا و پاڕانـەوەم، هـەر ڕوو بە دڵبەر و مەیە و بەرماڵەکەم، پەڕۆی مەی سـڕینەوەیە. لـەو پشـتپەردە، وەرە دەرێ! مەستانە و بە فیز و بە ناز، سەیرێ بکە و بڕوانە چۆن ئەم جیهانەت بە پیواری دیداری خـۆت، سەروژێر کرد. تۆبیوخودا، ئەم لەمپەرەت چۆن پەردێکە کە هێندە دەردی پێ داوین.

«خەییام» دەڵێ:

بــۆ ژانــی دڵان هــەر مــەیە دەرمانی بێ     زانــا ئــەوەیــە تــامــی لـە مەی زانیــبێ
ئەو کۆنە پەڕۆی لێوی لە مەی پێ دەسڕن     بـەرمـاڵی هەزار سۆفی بە قــوربانی بــێ[1]

۴ دەســـتێ جیبریـــل هلاڤــێت ژ بـــەژنا تـــە نیقابـــێ
ب یـــەقین قافـــە ل رۆژێ وەرە، دەر ســـینە نیقابـــە

**مانای وشەکان:**

**جیبریل**: فرشتەی وڵامبەر؛ **هلاڤێت**: لای گرت؛ **قاف**: «ق» ناوە بۆ قورئان، ناوی خوایە واتا تواناتر لە هەموو توانایان؛ **قاف**: ناوی کێوێکە دەوری دنیای داوە و دەیانگوت خـۆر شەوانە لە پشت قاف ماتە هەڵدەگرێ و دەحەسێتەوە؛ **ل رۆژێ**: لە خۆرەوە.

**پوختەی مانا:**

تۆ وەکوو خۆر، چۆن لـە پشـت کێـوی قـاف پـەنای دەگـرت و قـاف لێـی دەبـوو بـە پەردەیەک، نەماندەدیت، چاوی دڵمان تۆی نـەدەدیت. خـودا بـە دەسـتی فرشـتەی وڵامبەری، پەردەی لە بەر بەژنت لادا و پەردەی سینەی گیانی ئێمەش کە لەمپەرێک بوو لە نێوان، وەلا کەوت و توانیمان رووناکایی تۆ بە دڵ و گیان، هەست پـێ بکـەین. قورئان و ناوی خوای توانا، بوونە هـۆ ئـەو بناسـین و لـە سـینەدا جێگـەت بـە دڵ بـۆ بکەینەوە.[2]

۵ مــە ب ئیشــراقێ ســوئالەک ژ لــەبێ غونچەگوشــا کــر
کـــو ب ئیلهامـــێ دزانی د ســـوئالا مـــە جەوابـــە
(یـان: گـۆ ب ئیلهامـێ مـە زانی د سـوئالا تـە جەوابـە)

---

۱. یـک جُـرعەی مـی مُلک جهان میأرزَد     خشـتِ سَـرِ خُـم هـزار جـان مــیأرزد
آن کُهنه کـه لـب زِ مَی بدو پاک کُنند     حَـقـّا کـه هـِـزار طَـیلَـسـان میأرزد

۲. من وام مانا لەو بەیتە لێ داوەتەوە؛ چیترم بە بیزدا نەهات. زۆر وێدەچێ نەمزانیبێ و ماناکەی لەمە قووڵتر بێ. «هەژار»

**مانای وشەکان:**

**ئیشراق**: تیشک دان؛ **ئیشـراقییون**: ئەو کەسانەی سەر بە فەلسەفەی ئیشراقن؛ کە بـە خۆیان گوتووە ئیشراقی. فەلسەفەی ئیشراق لای وایە زانستی ڕاست و دروسـت و بـێ خەوش، تەنیا لە ڕێی دەروونی ڕوون و دڵی ڕووناک پەیـدا دەبـێ و هیچـی تـر نـا.[1] ئیشراقییەکان کاریان بە قسەکردن نەبوو؛ ڕازی دڵیان دەخوێندەوە و بە تماشای بیچم و کەسم، دەیەکتری دەگەیشتن؛ **ئیلهام**: بیر خستنە دڵەوە.

**پوختەی مانا:**

ئێمە هەر لە ڕێی دەروونەوە، پرسـیارێکمان لـەو لێـوەی- کـە هـەموو خونچـەی پـێ دەپشکووتن- کرد. دەشمانزانی هەر لە ڕێی دڵییەوە دەزانێ کە وەرام بـۆ پرسـیارەکە هەر لە ناو پرسیارەکەدا. ئەو دەزانێ من چیم دەوێ و دەشزانێ کە من دەزانم ئاواتم بۆ پێک ناهێنێ.

یان: بە خستنە دڵمەوە گوتی تۆ دەزانی وەرام هەر لە پرسیاری خۆتدایە.

«هەژار» دەڵێ:

گوڵـــی باخـــان لـــە شـــەرمی کوڵـــمە ســـوورە

لـــە ڕووی ئـــەو پـــەلکی گـــوڵ ئەســـتوورە زوورە

گـــوتم مـــردم نەگەیمـــە ماچـــێ، فـــەرمووی

هـــــەژار بمبـــــوورە دوورە ئـــــەو ســـــنوورە

٦ تـــو بنـــێ ســـازێ ب ئـــاواز چ ڕەنگـــی مـــە دخـــوازت

«الله الله» ب خـــودێ قـــەت دبـهـــی ئـــەڤ چ خیتابـــە؟

---

١. داهێنەری ئەم فەلسەفە لە ئیسلامدا، شیخ شەهابەددین سوهرەوەردی (سوورەبەردی) کوردە کە ساڵی ٥٨٧ی کۆچی، مەلاگەل بە گژیدا هاتن و لای سوڵتان سلاحەددینی ئەییووبی بە کافریان لە قەڵەم دا و ئەویش فەرمانی بە «مەلیک زاهیر»ی کوڕی خوێ دا، گرتی و کوشتی و وەک هەمیشە، کورد کوردی کوشت!

٧ گوهـــدە نایـــێ ژ لـــەبێ لـــەعلێ ب قانونـــێ حیکایـــەت
دێ چ شـــەهدە ب دەفێـــرا بـــدرت شـــەهدە رەبابـــە

**مانای وشەکان:**

**تو بنێ**: تۆ بڕوانە؛ **دبهی**: دەبیسێ؛ **خیتاب**: دواندن؛ **ساز و دەف و قانوون و رەباب یان روبابە**: ناوی چەند ئامرازی مووسیقان.

**پوختەی مانا:**

تۆ بڕوانە ئامرازەکانی مووسیقا، بە دەفە و بلوێر و روبابە و قانوونەوە، چۆن دڵ و گیانمان دەخوازن و چۆن وە زوان حاڵ دەماندوێنن؟ چۆن بە ناڵە و سۆزەی دەروون، چیرۆکی دووری دیداری لێوە ئاڵەکانی یارێ، ئەدرکێنن؟ ئەی خودایە! سەیر ماوم ئەوانە چەند بە ئاشکرا شایەتی لە جوانی یار و دڵی کلۆڵی دلدارانی ئەو لێوە جوانانە ئەدەن؟!

«جەلالەددین ڕۆمی» دەڵێ:

گـــوێ لـــە بلـــوێر بگـــرە دەکرووزێتـــەوە
زامـــی دەردی دووری پـــێ دەکولێتـــەوە[1]

«هێمن» دەڵێ:

شـــیوەنێکم پێیـــە نـــەی نـــەیکردووە
بۆیـــە ناڵـــەم تێکەڵـــی نـــەی کـــردووە

٨ خوەش پەریشان سیفەت و مەجمەعەیێ سوورەتێ حـالین
پـیرێ عیشـقین و جەوانتـەبع و ل دل عەهـدێ شـەبابە

**مانای وشەکان:**

**خوەش**: سەیر؛ **پەریشان**: بڵاو، شپرێو؛ **مەجمەعە**: جێگەی کۆبوونەوە؛ **سوورەت**:

---

١. بشنو این نی چون حکایت می‌کند    از جُدایی‌ها شکایت می‌کند

شکڵ؛ **سوورەت**: سیایی؛ **عەهد**: زەمان، چاخ؛ **شەباب**: لاوێتی.

**پوختەی مانا:**

ئێمەی دڵدار، زۆر لە بارێکی سەیردایین؛ چەند شتی دژ بە یەکترمان لە لا کۆیە: لە ئاکاردا، پەرژ و بلاو و شپرێوین. کە بێیتە دەروونمان، خڕوپڕین و گرد و کۆین و سیایی پەرێشانیمان لە لا کۆیە. پیر بووین لە دەردی ئەویندا و بووینە پیری دەستگیری ئەویندااران؛ بەڵام دڵمان هێشتا لە ئەویندا لاوە و تەبیات و ئاواتەکانمان، هەر پیر نابن و هێشتا لە تافی جوانیدان.

**٩** دوورەدەستین ژ خەیالان مە دڤێ یەک ژ خودێ را
خەف د بەحسا مە ژ دل بێت و برت عەینێ سەوابە

**١٠** مە موشەررەف کە دو چەشمێن مە بیساتا قەدەمێ کە
پوڕ ل نک من هەیە مەی، مێزەکە من سینە کەبابە

**مانای وشەکان:**

**ژ دل**: بە دڵ؛ **عەین**: کانی، بە تەواوی؛ **سەواب**: کاری خێر؛ **موشەررەف**: بە پیرۆزی گەیشتوو؛ **بیسات**: ڕایەخ؛ **مێزەکە**: بڕوانە.

**پوختەی مانا:**

بە خەیاڵ دێمە دیدارت؛ بەڵام دەستی خەیالاتیشم ناتگاتێ. خێرەومەندێکم گەرەکە لە ڕای خوادا نەهێڵێ شۆفار بزانن، بە نهێنی و بە دڵ لە نێوانمان بێت و بڕوا و داوای دیدارم بۆ بکات، زۆر خێرێکی گەورە دەکا. دەیسا وەرە و بە هاتنت گەورەمان کە و بە سەر ڕایەخی چاوماندا هەنگاو بنێ. مەفەرموو لە وزەیدا نییە میوانداریمان لێ بکا. فرمێسکی سوورم بادەیە؛ لە کووپەی دڵی هەڵدێنجم و هەرچەندەی بتەوێ هەیە. دڵ و جەرگ و هەناویشم لە ئەویندا بۆتە کەباب و برژاوە.

«مەولەوی» فەرموویە:

هەمڕاز ئاخ و داخ، ناڵە نەوای نەی
دڵ کەواو، چەم جام، خەم ساقی، هوون مەی

١١ کەسک‌وسـۆران تـو بنـێ چـەرخ ل دۆرا دو هـیلالان
دو قـیران مانـە بەرابـەر شـەفەقێ پـەردە عیسـابە

**مانای وشەکان:**

**کەسک‌وسۆر**: پەلکەزێڕینە؛ **شەفەق**: ڕووناکی ئاسۆ؛ **عیسابە**: هەنیەپێچ.

**پوختەی مانا:**

وادیارە یار تکای مەلای هەژاری دڵ بریندار‌ی، قبوڵ کردووە و هاتۆتە کۆڕی سـەماوە. مەلا بە دیمەنی یار هەڵدەڵێ و دەفەرموێ:

دە بڕوانە خشڵ و زەنبەر و پەلکەشۆڕ و گوڵینگە و سەرپێچ و شەدە، لە دەورەی ئـەو ڕوخسارەدا- کە لە ڕۆژ بە تیرێژترە- چۆن وەک کۆلکەزێڕینە دەنوێنن؛ کە دەورەیـان لە خۆر دابێ. سەیر ئەوەیە دوو مانگی یەکشەوەی بەرزیش، لەو ناوەدا دیـاری دەدەن؛ کە ناوی لێ ناون برۆ و ڕێک‌وپێک و بەرانبەرن و سپیایی تـەختی هەنیەکـەی لـە بـن بسکان، وەکوو ڕووناکایی ئاسۆی بەرەبەیان دێنە بەرچاو؛ بـەڵام پارچـەی تـوێڵ‌پێچـی وەک پەڵە هەورێک لەو سەرە بویتە لەمپەرێک لە نێوانی چـاوی مـن و دیـداری ئـەو هەنیە پاکە.

«نالی» دەڵێ:

دەسـرۆکەیی هـەوری چ حیجابێکـە کـە تێیـدا
«شمـسُ فَلَـکِ الْحُسْـنِ اَنـارَتْ فَتَـوارَتْ»

١٢ عەرعـەران تـا د شـەپالن وەرقـان جەزبەیـە ڤـێرا
نێرگـزان سـەر دگـرانن، ل بنەفشـان خـەم و تابـە

١٣ چیچەکێن قەوسـێ‌قەزەح ڕەنـگ هـەزار ڕەنـگ سـەمایە
سـونبولان گـرتی خونـاڤ و ل گـولان تـازە گولابـە

١٤ مەست و هوشیارێ هەمە کەچ‌کولەهن ڕەقس و سەما تێن
ئـەز نـزانم چ نەسـەق کەیفـە نـزانم چ شـەرابە

**مانای وشەکان:**

**تا**: لق؛ **سەرگەردان**: زۆر مەست؛ **خەم**: لارەوەبوو؛ **تاب**: پێچ؛ **تازە**: هەم نویٚ هەم زۆر باش؛ **کەجکولەه**: کلاولار؛ **نەسەق**: تەرتیب و تەکووزی؛ **کەیف**: دڵخۆشی.

**پوختەی مانا:**

پۆل بە پۆلی کیژی نازدار، بالا وەک نەمامی عەرعەر، شلک و خونچیلانە و دلگر، کە دەلەرن، پەرەنگی زێڕی خشڵەکان- کە لە بیچمی گەلای دارن- وەک من تووشی جەزمە دەبن و دەگەڵ سەریان ڕادەهەژێن. نێرگسی چاو هێندە مەستن، سەرگرانن. وەنەوشە لە شەرمی بسکان، خوار بوونەوە و پێچ دەخۆن و لات وایە ئەوانیش وێڕای سەماکەران، سەما دەکەن. هەزاران گوڵی پشکوتووی هەمەڕەنگە، لەو دەشتی جێ داوەتەدا، بە سروە کەرۆیشکە دەکەن. ئێژی ئەستێرەن لە ئاسمان دەدرۆشێن و تێکڕا وەک پەلکەزێڕینە دێنە بەرچاو؛ لە خۆشیان هاتوونە سەما. سونبول و گوڵ پڕ ئاونگن. گولاوی نویٚ و هەرە بەبۆن، بە بارانەوە، وەک شاباشی دڵدارانە لە بەر یاران. هەرچی دەیبینی نازدارە و کلاولارە و لە سەمادا بە تەمایە لە گشتیان جوانتر هەڵپەڕیٚ. ئەی خوایە! چەند دڵخۆشکەرن؟ پیاو لە دیداریان مەست ئەبیٚ. تیٚ ناگەم چۆن بادەیەکە لەو ڕوخسارە سادە و پاکانە دەباریٚ و پیاو سەرخۆشی بیٚهۆشی دەکات.

۱۵ خاکیٚ پایێن تە درێزا سەگ و توولان خوە دەناسین
مە نە سووچ و نە گوناه و نە خەتا ئەو چ عیتابە؟

۱۶ ژ ویسالا خوە زەکاتیٚ بدە میسکین و فەقیران
کو جەمالا تەیە کامیل د کەمالا خوە نیسابە

**مانای وشەکان:**

**خاکی پا**: خۆڵی ڕێباز؛ **عیتاب**: سەرکۆنە؛ **ویسال**: گەیشتن؛ **زەکات**: پیتاکی ئایینی؛ **فەقیر**: نەدار؛ **میسکین**: هەژار؛ **کامیل**: تەواو؛ **کەمال**: تەواوی؛ **نیساب**: ڕادەی زەکات لێکەوتن.

**پوختەی مانا:**

وا دیار ئەدا یار مەلای لۆمە کردووە کە بۆچی ڕووی لەو وەرگێڕاوە و پەسنی کیژی تری داوە؟ دەڵێ: تۆ نابێ سەرکۆنەم بکەی؛ بێ‌گوناهم. چاوی دڵم هەر دەتۆیە و هەرچی دەگەڵ تۆش دەیبینم و لە لام جوانە، بە تیشک و شەبەقی جوانی بەژن و بالای تۆی دەزانم. من خۆم وەک ئەو تولە و سەگانەی بەر دەرگانەکەت دێنمە حەساو کە دەکەونە ژێر خاک‌وپات و بە تۆزی پالا والاکەت بەختەوەر و سەرفیرازن. من گەدایەکم لە دەرگات. دوور لە بالات گەلێک نەدار و هەژارم. جوانیی و نازداریت نامەخوا هێندە زۆرە، زۆر پێویستە زەکاتەکەی لێ دەر بکەی. کەست لە من مستەحەق‌تر دەس ناکەوێ. دەستی من و کەرەمی تۆ!

«حافز» دەڵێ:

لە ڕادە دەرکەوت جوانی و لەباریت

هەژاری تۆم، بە ئاواتی زەکاتم[1]

| | |
|---|---|
| ١٧ | عاشقێ مەسئەلەخاهی وەرە ئەم موفتیێ عیشقین<br>دەستەکی سوننەتە تێدا و یەکی نەسسێ کیتابە |
| ١٨ | دل بشۆ تو ژ ڤێ نیقابێ کو بدەت سینە بەراقێ<br>ب سەفا هەمرەهێ ئەربابێ دل و ئەهلێ سەفا بە |
| ١٩ | نەزەرا عەینێ عینایەت ب مەدا شاهێ ویلایەت<br>ژ عینایەت نەزەرێ دل مە تژی عیلم و عوبابە |

**مانای وشەکان:**

**خاه**: داوا کار؛ **سوننەت**: ڕەوش؛ **سوننەت**: فەرموودەی پێغەمبەر؛ **نەسس**: دەق؛ **کیتاب**: کتێب؛ **نسسی‌کیتاب**: دەقی ئایەتی قورئان؛ **نیفاق**: دووڕوویی؛ **بەراق**: بریقە؛ **سەفا**: پاکی و تەبایی؛ **ئەرباب**: خاوەنان؛ **ئەهل**: خزم و ناسیاو؛ **ئەهلی سەفا**: ئاشتی خوازان؛ **ئیخوانوسسەفا**: کۆمەڵێکی نهێنی بوو، لە چەرخی چوارەمی کۆچی،

---

١. نصاب حُسن در حدّ کمال است    زکاتم ده کە مسکین و فقیرم

ناوەندەکەی لە شاری بەغدا و بەسرا بوو. لە هەموو ولاتی ئیسلام زۆر کەس ببوونە پەیڕەویان. دەیانەویست موسوڵمان دژ بە یەک نەبن و پێکەوە تەبا بن. دەیانگوت تا واش نەبن بە هیچ نابن؛ **عینایەت**: دلۆڤانی و دڵسۆزی؛ **ویلایەت**: گەورەیی، دۆستی؛ **عوباب**: جیٚشەپۆل و نێرینەی ئاو.

**پوختەی مانا:**

ڕەنگە هێندێک لە لایان خۆش نەهاتبیٚ مەلا خۆی لە ڕێزی سەگی بەر دەرگای یار حیساب بکا. لە وەرامی ئەو جۆرە کەسانە دەڵیٚ: تۆ چوزانی ئەوین و دڵداری چییە؟ هێشتا زۆرت دەویٚ فێر بی. ئەگەر دەتەویٚ لەو بارە شت بزانی، وەرە لە لای من هووین ببە! من لەم زانستە بەرزەدا- کە ئەوینە- بوومە موفتی. لە دەستێکما قورئان هەیە و فەرموودەکانی پێغەمبەر بەو دەسمەوە. هەرچی دەیلێم، هەرچی دەیکەم، بەرانبەر بەمانی دەکەم. تۆی بە ڕواڵە وا دەنوێنی کە دڵداری و لە دڵیشتدا، لە دڵداریی بێخەبەری. دووڕووی؛ پیاوی منافق و دووڕووش، لە کافران خراپترە. دەس لەو دووڕووییە هەڵگرە! تیشکێکی ڕوونی ئەوینیٚ با ئەو دڵە ڕەشەت ڕوون کا و برووسکەیەکی تیٚ بگەڕیٚ. ببە هاوڕێی خاوەن دڵان. لە کۆمەڵی پاکاندا، ببە بە هەندام و لە دژایەتی واز بێنە و دەگەڵ ئێمەدا هەواڵ بە! تا بەپایەی ئێمە بگەی.

گەورەی بەرز و خاوەن شکۆی مەملەکەتی ئەوینداریی جارێک سیلەی چاوێک بە بەزەییەوە داوەتە من. لەو ساوە دڵم و دەروونم بۆتە دەریای زانستان و لە هەموو لا شەپۆل دەدا.

**٢٠** لەبیٚ لەعلێن تە دبیٚ هەر ب یەکی نوقتەییٚ عیلمن
ب خەتیٚ حەرفیٚ ئەلیف جەزمە شوبیٚ حەلقەییٚ بابە

**مانای وشەکان:**

**دبیٚ**: دەبێژی؛ **نوقتە**: ماکی ناوەندیی کە ڕەگەز و بنچینەی هەموو شتێکە؛ **خەت**: نووسراو؛ **جەزم**: درزبردن؛ **جەزم**: بەش؛ **جەزم**: زەنەی هاوکاری سەر و ژێر و بۆر کە ئاڵقەیەکی زۆر پچووکە (ە)؛ **پیتی ئەلف**: (ا) کە لە چوار نوقتەی لەسەریەک درووس

دەبێ، دروشمی ناوانی خوا (الله، اَوّل، آخر. آمر، اَحَد) و دوو سیفەتی خوا (ئەزەلی و ئەبەدییە)؛ **حەلقەی باب**: ئالقەی دەرگا.

**پوختەی مانا:**

لێوی وەک لاڵ ئاڵەکانت، دەڵێی هەردووک بە تێکڕایی تەنیا نوختەی ناوەندی هەموو عیلمانن. ئەو نوختەیە بە نوقتەی سەرەتای پیتی ئەلفی ناوی خودا، درزی داوە و زەنەیەکی کە نیشانەی ڕاوەستانە، لێساز بووە و ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە هەموو ئافەریدەیەک بە زنجیرە سەریان بە یەکترەوەیە و لێوەکانت دەبنە پشووگەی گیانان و ئیتر لەوێ کە نوختەی بناغەی ئەلفە، ڕادەوەستن. هەروەها بۆیە لەو نوختە بوویتە ئالقە، کە بزانین ئالقەی دەرگای زانستیمان، بە زانستانی دانستەی لێوی تۆیە؛ تا لەو خەبەر وەر نەگرین، ناتوانین بچینە ژووری بارەگای زانستی خودا.

**٢١**

خەت و خالین تە ب موومـوو ژ مـەرا مەسـئەلە گـۆیین
مـە ژ وان حاشـیەیان سـینە تـژی شـەرحێ لوبابـە

**مانای وشەکان:**

**حاشیە**: پەراوێز؛ **شەرحێ لوباب**: تۆژینەوە لە کاکلان؛ **شەرح**: توێ کراو؛ **لوباب**: دلان؛ **لوباب**: چەند کتێبێک لە دەورانی مەلایەتی شێخی جەزیری، بەو ناوە هەبوون:

١- *لوباب* (کاکلان): نوسینی ئەبولحەسەن محاملی لە شەرعی شافیعیدا. ئیمامولحەرەمەین و جەلال بەکری، شەرحیان لێ کردووە.

٢-*لُبابُ‌الالباب* (کاکڵەی دلان): ژینامەی ١٦٩ شاعیرە لە ساڵی ٦١٨ی کۆچی سەدیدەددین موحەممەدی عەوفی نووسیویە.

٣-*لُبابُ‌الاحیاء*: نووسینی ئەحمەد غەززالی. پوختەی «*احیاءالعُلوم*»ی موحەممەدی غەززالییە. نووسەر لە ساڵی ٥٢٠ی کۆچی مردووە.

٤-*لُبابُ‌المعنوی*: هەڵبژاردە لە مەسنەوی. نووسینی حوسەین کەمالەددین کاشفی. کە ساڵی ٩٠٦ یان، ٩١٠ی کۆچی مردووە.

٥-*لُبابفیالنحو*: ڕێزنامەی عەرەبی، نووسینی ئەبولعەبباس ئەحمەدی ئیسفەراینی کە ساڵی ٤٠٤ یان، ٣٩٨ی کۆچی مردووە و زۆر کەس شەرحی لەو کتێبەی کردووە.

**پوختەی مانا:**

خاڵ و میلێ تۆ ڕژتووتن هەر موویەکی مووبەموو وەرامی پرسی دژواری من ئەدەنەوە. ئێمە لەو پەراوێزانەی کە لە لاجانگ ئاوێزانە و بریەتین لە کەزیەکانت، سینەمان هەمووی توێ-توێیە و کاکڵی سینەش- کە دڵمانە- توێ کراوە و پڕ کراوە لە زانست و ئێستا وەک شەرحی لوبابە.

**٣٢** ئابێ حەیوان تە دڤێ راست بنۆشی شەبێ قەدرێ
دەست بەر گەردەنێ پڕ پێچوخەمان زولفێ دوتا بە

**٣٣** مە ژ بسکێن تە گریهداریێ ژ بەختێ خوە گرێنە
مە ژ زولفێن د خەموتاب د دلدا خەموتابە

**مانای وشەکان:**

**دوتا**: دوولا؛ **دوتا**: قەدکراو، بەسەریەکا هاتوو؛ **دوتا**: دوولابار؛ **گریهدار**: بەگرێ و چین لەسەر چین؛ **خەم**: لار؛ **خەم**: غەم؛ **تاب**: پێچ؛ **تاب**: تین و تاو.

**پوختەی مانا:**

لەو شتانەی کە شەرحی خەت و خاڵی یار باسی دەکا، یەک ئەوەیە: ئەگەر بەڕاستی دەتەوێ شەوی بەڕێزی دیدارم بۆت دەس بدا و ئاوی ژیانی دیدارم بخۆیەوە و هەرگیز نەمری، دەبێ لە خەمی کەزیەکەی ئاڵۆزاو و چین لەسەر چین و لارەکەم، کزومات و دەس لە گەردن بۆی دانیشی و دەستی هومێد و ئاواتت بە شکاوی بکەیتە وەباڵی ئەستۆت؛ ئەوسا بزانین چۆن دەبێ.

یاری جوانم! ئەوا من لەو بسکە ڕەشە پڕگرێیەت، بۆ بەختی ڕەشی خۆم دەگریم. لە پێچ و لاری و قەد_قەدی، دڵم پڕە لە پێچی دەرد و خەمان و لە سەد لاوە قەد کراوە.

۲۴ تــە دڤــێ بــەرق و برووســکان برەشــینی؛ تــو نــەزەر دە
تــە دڤــێ رۆژ خویــا بــت؛ ژ شــەباکێ تــو خویــا بــە
۲۵ تــە دڤــێ زیروزەبــەر کــی مــە؛ دو زولفــان بــدە بــەر بــا
تــە دڤــێ قــەنج قیامــەت ل مــە رابــت؛ ب خــوە را بــە

**مانای وشەکان:**

**شەباک**: پەنجەرە؛ **ب خوە رابە**: بۆ خۆت هەڵسە؛ **قیام**: قیامەت؛ **قیام**: هەڵسان.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! ئەو جار نۆرەی منە بڵێم چیبکە: گەر دەتەوێ ترووسکەی ئاسمان لێمان دا، تۆ خۆت تماشامان بکە! ئەوا بە برووسـکەی چـاو دەمـرین. ئەگـەر دەتـەوێ خـۆر هەڵێ، سەر لە پەنجەرە دەربێنە و خۆت نیشان دە! گەر بە نیازی هەموو دنیا ژێروژوور کەی، کەزیەکانت بدە بەربا! ئەگەر ویستیشت دڵداران قیامەتیان لـێ ڕابـێ، بۆخـۆت هەستە! ئەوە قیامەتیش دەقەومێ.

۲۶ قەسدێ سەرچەشمەیێ حەیوانێ حەقیقەتکە «نیشـانی»!
ب جیهانێ مەبــە مــەغروور، کــو جیهــان عــەینێ ســەرابە
۲۷ سەرکەشــی شــیوەیێ ئــەربابێ وەفــا نینــە رحــێ مــن
تە ژ دل ســوهتی «مــەلا» بــەس ب «مــەلێ»را ب جەفابــە

**مانای وشەکان:**

**قەسد**: نیـاز؛ **سـەرچەشمە**: سـەرچاوە؛ **حـەیوان**: ژیـان؛ **حەقیقـەت**: ڕاسـتینە؛ **سـەراب**: تراویلکە؛ **سەرکەشی**: لاساری؛ **وەفا**: ئەمەگ؛ **رحێ من**: ڕۆحی من، گیانەکەم؛ **جەفا**: ئازار.

**پوختەی مانا:**

ئاوی ژیانی بەڕاستی، کەوتن بەسەر ڕاستیدایە و ئەگـەر دەتـەوێ نـەمر بی، لـە دووی ڕاستی هەڵوەدا بە. نابێ بە دنیا بایی بی و فریوی دنیایە بخۆی. دنیا وەک تراویلکەیە؛

چاوت بە ئاوی دەزانێ و لە ڕاستیدا، بیابانێکی بێروونە و دەم تەڕ ناکا. ئەی یار! هەرچەند ئازاریشت بە دڵ دەکرم، بەڵام تۆش بەزەت پێمدا بێ؛ لە لاساریی دەست هەڵگرە! ئەمەگداریی وا هەڵدەگرێ کە هەروەک ئازارم دەدەی، جاروبار بشمڵاوێنی. تۆ زۆر بە دڵ مەلات سووتاند؛ دە بەسیە ئازارم مەدە!



## دەردی بێدەرمان

| | | |
|---|---|---|
| ١ | موحبـــەتێ میحنـــەت د زۆرن | حـوب دبـێم بـێ شـک بەلایـە |
| | عومر و ژی خـوەش پـێ دبـۆرن | ســـۆتن و دەرد و جەفایـــە |
| ٢ | ســـۆتن و دەردێ ئـــەوینێ | عیللـــەتێ داغ و برینـــێ |
| | خــوەش دبــن مـا ئـەو بـدینێ | شــــەربەتا لێڤـــان موفایـــە |
| ٣ | هــەر دلــێ ســۆتی ب ئولفــێ | یار نـە دەرمـانکـت ب زولفـێ |
| | تــا ئەبــەد ئــەو بەنــد و قولفــێ | عیشــق دەردەک بـــێ دەوایــە |
| ٤ | عیشـــق دەردەک بـــێ تەبیبـــە | لـــێ موفـــا وەســـلا حەبیبـــە |
| | کوشـــتمە جـــەورا رەقیبـــە | پـــورێ لـــەعینێ رووســـیایە |

**مانای وشەکان:**

**ژی**: ژیان؛ **عیللەت**: هۆ؛ **موفا**: چارە؛ **ئولف**: هۆگر؛ **قولف**: ئاڵقەی جۆشدراو؛ **جەور**: ناڕەوایی؛ **رەقیب**: چاونەزێڕ؛ **رووسیا**: ڕووڕەش.

**پوختەی مانا:**

مەینەتی دڵداریی زۆرن؛ من دەڵێم دەرد و بەڵایە و بێگومانم...

گەرچی دڵداری سەرانسەر دەرد و ئازار و سووزانە، بۆ ژیان هۆی سەرگەرمییە و پیاو دڵی پێ شاد و خۆشە؛ چونکە ڕەنگە یار هەڵێک لێمان وەپێچێ و بێتە سەر پێکراوەکانی چاوەکانی. دەردی دڵداریی و برینی گیان و جێ داخ و سووتانێ هەر بە دیدارێکی یارێ دێنەوە سۆ. خۆ ئەگەر لەو لێوە ئاڵەی شەربەتێکمان بۆ بنێرێ، چاری گش دەرد و برین و سووتن و ئازار و ئێشە. هەر دڵێکی هۆگری یار، گەر بسووتێ و یار

بە پرچان باوەشێنی لێ نەکات و پێی نەچارێ، تا هەتایە هەر دەناو بەندی کەزیدا، وەک لە ناو ئاڵقەی بەیەکدا جۆش درابێ، هەر بە دەور خۆیا ئەسووڕێ و شوێنی دەربازبوونی نابێ. دەردی دڵداری بەژانە و زۆر گرانە. هیچ بژیشکێک چاری ناکا. جا مەگەر یار بێتە هاوار و بە دیداری، کە بۆ گش دەردان مەفایە، لێی ڕەها کات.
یار دەهات گەر چاونەزێران لێ گەڕابان. ئاخ لە دەس دەستەی شوفاران! چەندە شووم و ڕووسیان؛ خوا نەحلەتیان کا.

| | | |
|---|---|---|
| ۵ | داغ و کەی مـن لێ هەزارن | گول د دەست شەوکێن ب خارن |
| | سـوڕپەری دێـو وێ کـەنارن | ئەهرەمـەن خاتـەم رەڤـایە |

**مانای وشەکان:**
**کەی**: داغ؛ **شەوک**: دڕک؛ **خار**: چقڵ؛ **دێو**: عیفریت؛ **ئەهرەمەن**: شەیتان؛ **خاتەم**: ئەنگوستیلە، کلکەوانە؛ **رەڤایە**: ڕفاندوویە.

**پوختەی مانا:**
داخ لە دەس چەپگەردی گەردوون. لەو هەزار داخم لە دڵدا. گوڵ دەداتە دەستی دڕکان. دێو لە کن پەریان دەبینم. بەچکەشەیتان هەنگولیسکی ڕاڕفاند و بردی بۆ خۆی.[1]

| | | |
|---|---|---|
| ۶ | تەبعێ دێوان دەست گەهشتێ | حـوور و ویلـدانێن بهشـتێ |
| | عاشـقێ دلبەنـدێ قشـتێ | جـان بـدت یـەکجار رەوایـە |
| ۷ | میحنـەت و جـەورا حـەبیبێ | قـەهر و ئـازارا رەقیبـێ |
| | حـەق تنـێ دا مـن غـەریبێ | لـێ شـوکور بـاخوەی وەدایـە |

۱. مەلا لێرە نەقڵی تەختی سولەیمان و کلکەوانەکەی باس دەکا؛ کە چۆن دێوێک لێی ڕفاند و تەختەکەی کردە شوێنی خۆی. «هەژار»

| | | |
|---|---|---|
| ٨ | روهنیــا وێ شــەوق و تاڤــێ | شــەربەتا قەنــد و گولاڤــێ |
| | کــەس نهــن مــەحرووم ژ ناڤــێ | لــێ تنــێ بــۆ مــن غەلایــە |
| ٩ | بــێ نەسـیب مــن دی ژ جامــێ | دوور ـدوور مــەحرووم ژ رامــێ |
| | گرتیــێ وێ قەیــد و دامــێ | ئــەڤ غــەریبێ جانفیدایــە |
| ١٠ | دورەدەســـتم بێنەســـیبم | دلبــەرم خــانم حــەبیبم |
| | پــورژ دینــا تــە غــەریبم | رووح و راحــەت مــن لیقایــە |

**مانای وشەکان:**

**قەهر**: تووڕەیی، غەم؛ **غەریب**: ئاوارە؛ **غەریب**: زەبوون و بێچارە؛ **باخوە**: خودا؛ **غەلا**: قاتی و گرانی؛ **رامی**: ئۆقرە و ئاسوودەیی؛ **قەید**: بەند و زنجیر؛ **خانم**: گەورەم؛ **راحەت**: ئاسودەیی؛ **راح**: بادە.

**پوختەی مانا:**

دێومیجازی تووش و بەدفەڕ، چاوەدێری کیـژ و لاوانی بەهەشـت بـن؛ دیقـی مـەرگی عاشقانە!

مەینەت و ئازاری یارێ، تووڕەیی و ژانی شوفاران، خـوا لـە نـاو گـش دڵـداراندا، داویەتی بە منی کڵۆڵ. ناشکوری ناکـەم، بەشـی خوایـە و ئەونـدەی داوە پـێم. ڕۆشنی ئەو تیشک و تاوەی کوڵم و چاوەی، ئەو هەموو شەکر و گوڵاوەی لێـوی یارم، هەر بە تەنیا بۆ منی بێچارە قاتە و هەرکەسی تر، هیچ نەبێ تۆزێکی دیوە. دیتنی ئەو مەستە چاوە، هەر لە من ڕێی بەسـتراوە و دەرکـی ئـۆقرە و شـادیانم داخراوە و هام لە ناو زیندانی خەمدا و گیان لەسەر دەسـت و ئامـادەم خـۆم بـە قوربان کەم لە ڕێدا.

یاری دڵبەر! میر و گەورەم! خۆشەویستم! دەردی دووریت زۆر گرانە. زۆر دەترسم پێ نەوەستم دەربەرم. بۆ دیدارت زۆر زەبوونم؛ زۆر بەتاسەم. گیانی مـن بـێ دیتـنی تـۆ، چۆن دەمێنێ؟!

| | | |
|---|---|---|
| ١١ | پــورِ مــولازم تــێم لیقایــێ<br>مــن رحــێ شــیرین ددایــێ | مامــــه حـــەتتا مولتـــەقایێ<br>هودهــود ئــەر مــزگین بــدایێ |
| ١٢ | هودهـــودێ ریزوانـــێ غــەیبێ<br>دا دلــێ مــن مــوردە حــەی بــێ | ســەد خەبــەر شــیرین ژ جــەیبێ<br>گــوهـ ل رێ مــن وەک ســەبایە |
| ١٣ | چەهڤـــەنێرم گـــۆهـ ل رێمـــه<br>عـــەرزحالا موحبـــەتێ مـــه | لـــێ ســـەبا رێ دایـــه بێمـــه<br>بەندەیــەک ســادق «مــەلا»یــە |
| ١٤ | جانفیــــدایێ مـــــن د رێـــــدا<br>قالبــــەک بێرۆحــــه وێــــدا | فیرقـــەتێ دەردەک وەلـــێ دا<br>کوشــت دبــێم مــن لــێ رەوایــه |

**مانای وشەکان:**

**ملازم**: هەمیشە لێ، هەمیشە دەگەڵ؛ **مولتەقا**: تووشـی یـەک بـوون، ژوان؛ **ریـزوان**: باغچەگەل؛ **ریزوان**: ڕەزەوان؛ **جەیب**: دڵ و سـینە؛ **مـوردە**: مـردوو؛ **حـەی**: زینـدوو؛ **بێمە**: دەبێژم؛ **عەرزحال**: ڕانانی چلۆنەتی.

**پوختەی مانا:**

هەمیشە و دایم لە دەرگام؛ لاناکەوم؛ بەڵکوو چاوم بە یارم ڕوون ببێتەوە. دەمێنمـەوە؛ ناهومێد نیم. ئەگەر ئەو چاوەنۆڕییەی من، تـا ڕۆژی حەشـریش بمێنـێ، لـەوێ هـەر تووشی یەک دەبین. ئاخ ئەگەر پەپووی نامەبەر- کە باغچەوانی بەهەشـتە و دەتوانـێ یارم ببینێ- خەبەرێکی دڵخۆشکەرەی بۆ هێنابام، سەد گیانم با، لە مزگێنیدا دەمدایە بە مژدەی وا؛ دڵی مردوولەم دەژیاوە. گوێ لەسەر هەست و چاوەڕێم. دەڵێم بەڵـکوو بە سروەدا خەبەرێکی خۆشم بۆ بێت. مـن لام وایـە سروە دەرد و داخـی دڵـی مـنی گەیاندۆتە بارەگای یار و دڵداریی و ئەمەگداریمی باس کردووە. یـار فەرموویـە: مـەلا کۆیلێکی ڕاستمە و گیانی بە قوربانی منە و دووری لە من، زەبرێکـی وای لـە دڵ داوە کە ئێستا لەشی بەتاڵە و گیانێکی تێدا نەماوە. منم کوشتم؛ بەڵام ئەگەر دلبەران دڵدار بکووژن لە ئاینی ئەویندارێدا ڕەوایە؛ چی تیایە؟

| | | |
|---|---|---|
| ۱۵ | دەم ب دەم ئــەو چەهڤــەنێرە<br>دا ببــت ئــەو زینــدە ڤــێرە | بێتــە نیشــانەک مــە ژێــرە<br>یــارێ ســادق بــێ بوهایــە |
| ۱۶ | عاشــقێن ســادق دکــێمن<br>زانم ئــەو نازیتــەَ بــێ مــن | مــا دبــێ سـەد جانفـدێ مــن<br>عاشـــق و پـــڕ موبتەلایـــە |
| ۱۷ | عــالمین ئــەم ڤــێ دزانــین<br>قەت ژ هــەڤ بـاتین خویـا نـین | جیسمە ئەو، ئـەم ڕۆح و جـانین<br>گــەرچی زاهــیر ئــەو جودایــە |
| ۱۸ | هودهــودێ وێ ڕەمــز و ڕازێ<br>قیسســە بــر بەحسـا مــەجازێ | بابوو ئــەو چـوو گوفـت بسـازێ<br>قاسـیدەک خـۆش تـەبع بایـە |

**مانای وشەکان:**

**ژێرە**: بۆ ئەو؛ **ڤێرە**: دەگەڵی، پێڕا؛ **بوها**: نرخ؛ **جانفدێ**: گیانفیدا؛ **موبتەلا**: گیرۆدە؛ **ژ هەڤ**: لە یەکتر؛ **زاهیر**: ڕواڵەت؛ **باتین**: بنەڕەت و دەروون؛ **بەحسا مەجازی**: باسی دڵداری دنیایی.

**پوختەی مانا:**

هەمیشە وا چاوەنۆڕە کە نیشانیی لە لای ئێمەوە بۆ بچێت و دەگەڵ گەینی نیشانەکە، بژیتەوە. یاری وا ڕاست، هەرگیز نرخی تەواو نابێت. دڵداری بەڕاسـت زۆر کـەمن. لـە سەتان یەکی وەک مەلا هەڵدەکەوێ گیانی لە ڕای دڵدا بـدات. دەزانم ئـەو بـێ مـن ناژی.

زۆر گیرۆدەی دڵداریی منە؛ تێدەگەم. زۆر باش دەزانم ئەو لەشە و من بوومە گیـانی. لە ڕەگەز و لە دەروونـدا، من و مەلا بە هیچ کەس لێـک ناکرێینـەوە؛ هـەر یـەکێکین؛ بەڵام بە ڕواڵەت لێک جیاین.

پەپووی ئەو ڕاز و نیازانە- لە بەختانم- ئەوجار با بوو. هەرچی بە سـەر مـن هـاتووە و هەرچی ناڵە و داد و هاوارم کردووە، گشتی لە من وەرگرتووە و بە گوێی ساز و بلوێری داسرکاندووە و بلوێر و ساز، بـە گـوێی دڵـبەریاندا داوە و لـە پێشـەوە وەک چیرۆکـی

دلدارانی دنیایی باسیان کردووە. های لە منت کەویٚ سەبا! چەند پەیکێکی خاوەن مرخی.

| | | |
|---|---|---|
| ١٩ | بـا دەمـیٚ وەقتـیٚ مـەجال دا<br>قیسسـەیا حـالی ب حـال دا | چـوو کـو ئـەو یـارە ب پالـدا<br>گـوە ددیـرت یـار بایـە |
| ٢٠ | موحبـەتا مـەحبووب و لاتـان<br>دایـە قـەلب و ڕووح و زاتـان | پـوڕ ڤـەکر زیوەرسـیفاتان<br>ڕۆژ د میرئاتـیٚ خویایـە |
| ٢١ | موحبـەتا سـووری دو قیسـمە<br>هـن ژ ڕۆحـن هـن ژ جیسـمە | قوفـل و میفتـاح و تەلیسـمە<br>نـار و نـوورە هـن هەوایـە |
| ٢٢ | حوببـیٚ جیسـمانی دو ڕۆژن<br>خـەف جەگـەر پـەیکان دنـۆژن | گـەرچی دل پـڕ پـیٚ دسـۆژن<br>میسـلیٚ نەقشـیٚ بـیٚ بەقایـە |
| ٢٣ | گـول حـەتا سـوهرن بتـیٚ ڤـە<br>بولبولـیٚ سـەرخوەش د نێڤـە | بـێن تەبەسسـوم پێڤـە- پێڤـە<br>نەغمـە و نـال و نەوایـە |

**مانای وشەکان:**

**مەجال**: بوار؛ **لاتان**: بتان؛ **زات**: هـەبوو، هەرهـە؛ **میرئـات**: ئاوێنـە؛ **سـووری**: شکلـی؛ **میفتاح**: کلیل؛ **جیسم**: لەش؛ **دنـۆژن**: دەسمـن، کـون دەکـەن؛ **بـەقا**: مانـەوە؛ **پێڤـە**: بەوێوە؛ **پێڤە**: دەگەڵ؛ **نەغمە**: ئاوازی بەسۆز؛ **نەوا**: ئاوازی بەقەو؛ **تیٚ**: تا، لق.

**پوختەی مانا:**

کاتیٚ با بواری درایە و یار لەسەر تەختی نازداریی پاڵکەوتبوو، ویستی گویٚ لـە سـازان بگریٚ، دیتی هەلە و یار ئامادەی گویٚگرتنە. چیرۆکێکی بە زمان بلوێرەوە بۆ گوت؛ کە پڕی بوو لە باس و خواستی دڵداران. چۆن دڵداران یاری خۆیان دەپەرستن. باسی ئەو ناسک و نازدارە دڵبەر و دڵڕفێنانەی کرد کە لە دنیا بەناوبانگ بـوون. وردە- وردە لـە

باسی خشڵ‌لەبەران کەوتە سەر باسی ئەوانەی بە گیان دڵداری یەکتر بوون. لە ڕواڵەت خۆشویستنەوە گەیشتە چیرۆکی دڵی ئەویندارانی دەروونیی و پێی ڕاگەیاند کە سەرەتای هەموو جۆرە دڵدارییەک دەگەڕێتەوە بۆ خودا و ڕوومەتی جوان ئاوێنەیە و بەرانبەر کراوە بە خۆر و تیشکی خۆرە لە ئاوێنەدا دیارە. دڵداری ڕواڵەتبینیش دەبێتە دوو بەش؛ هەر بەشێکیان چەند قفڵ و تەلیسمی هەیە بە کلیلی خۆی دەکرێتەوە. هێندێک ئەوین لە گیانەوەن، هێندێکیان هەر سەر بە لەشن؛ هێندێکیان ئاگر و تیشکن؛ هێندێکیشیان بادی هەوان.

ئەوینی لەش، هەر دوو ڕۆژە؛ هەرچەندە زۆر دڵسووتێنە و بە نهێنی، پەیکانی جەرگان کون دەکەن؛ بەڵام وەک نەخشی سەر ئاوە و لە ناو دەچێ و زۆر نامێنێ. گوڵ هەتا لە سەر چڵانە و گەش و ئاڵە و زەردەخەنەی لە لێوانە، بەرەو ڕووی بزەیان دێتێ. بولبول لە ناو دڵبەراندا، لە خۆشیان مەست و سەرخۆشە و دەناڵێنێ و دەگاڵێنێ و جار-جار بە سۆزە و بە ورتە و جار-جار دەنگی لێ هەڵدێنێ.

**۲۴**
هەرچی جیلوا بوو ژ ناڤێ — نووگولەک دی گرت خوناڤێ
وی ژ دل چوو موحبەتا ڤێ — ئەو ب یادیرا تەبایە

**۲۵**
هەرکەسێ موحبەت ژ رۆحە — موبتەلای نوورا سوبۆحە
وی د دلدا سەد جرووحە — جەزبە و لەرزین و تایە

**۲۶**
هەردو رۆح یەک نووری تاڤن — چەرخەک و دو ستێر دناڤن
هەردو دانە و مورغێ داڤن — ئیسمێ حەی داڤ لێ ڤەدایە

**۲۷**
نوورە پڕ نادر وجوودە — گەرچی ئەووەل نار و دوودە
بەرقێ لامیع دی ل کوودە — حوب دقەلبان کیمیایە

**۲۸**
عارفێ جەوهەرشناسی — ئێ ب ڤێ وسف و لیباسی
دێ قەدر بیهتەر بناسی — مەقعەدێ سیدەقێ جەزایە

**مانای وشەکان:**

**جیلوا**: سیس؛ **نو**: تازە، نویٚ؛ **یادی**: ئەوی‌تر؛ **تەبا**: ئاشنا و ئاشت؛ **سوببووح**: سوببووح، پاک و پیرۆز؛ **سوببووح**: ناوی خوایە؛ **جرووح**: برینگەل؛ **تاڤ**: هەتاو؛ **دانە**: دەنک؛ **حەی**: زیندوو؛ **حەی**: ناوی خوایە؛ **دوود**: دووکەڵ؛ **کیمیا**: بەو زانستەیان دەگوت کە مس و زیٚو دەکاتە زیٚڕ؛ **جەوهەر**: گەوهەر، ڕەگەز؛ **مەقعەد**: جیٚگەی دانیشتن؛ **سیدق**: ڕاستی. خوا فەرموویە: «لەخواترس و خۆپاریٚزان، لە بەهەشتان و چۆماندا لە جیٚ نیشتنی ڕاستیدا، لە لای خودای توانا دەبن».

**پوختەی مانا:**

بەڵیٚ هەتا گوڵ تورت و شەق مابیٚ، خویٚن‌شیرینە و بیٚ‌دڵدار و بولبول نابیٚ. بەڵام هەر گوڵیٚک سیس ببیٚ و هەڵبوەریٚ، دڵداری لیٚ دەتەکنەوە و روو دەکەنە گوڵی تازەی دەم بە ئاونگ. بەڵام دڵداری گیان‌بەگیان، لە دڵداری گوڵانی دنیایی جیایە. دڵدار گیرۆدەی پاکییە و ڕۆشناکی گرتۆتەوە. سەد برینی دەدڵدایە و هەمیشە لە جەزمەدایە و گیانی تووشی لەرز و تایە. لە ئەوینی پاکی گیانی، گیانی دڵبەر و دڵداران، هەرتک تیریٚژی تاویٚکن؛ دوو ئەستیٚرەن لە ناو ئاسمانەساویٚکن. هەردووک دانەن؛ هەردووک مەلن؛ هەدووک داون؛ هەردووک بەجووت بە داوی خودا گیراون. دڵداری دوو گیان بە پاکی، هەرچەند لە دەسپیٚکردنا ئاگر گرتن و دووکەڵی هەناسەی تیٚدا، بەڵام ئاکام تیشکیٚکی یەکجار نایابە و تیشکی برووسکەی گیانی پاک، لە هەرچیدا، برەوی پیٚ پەیدا دەکا. دڵداریی دڵی ئاسنیش دەکاتە زیٚڕ؛ کیمیایە. دوڕناسیٚکی گەوهەری ئەوینی گیانی باش بناسیٚ، دەزانیٚ چەندە بەنرخە و دەزانیٚ دڵداری گیانی، لە ناو بەهەشتی خودادا، جیٚگەی بۆ دیاری کراوە و خۆشترین جیگا هین ئەوە.

**۲۹** دوور نەکی دا وی ژ دەریٚ خوە — وەرنەگیٚڕی ژ وی بەریٚ خوە
بووریە ئەو د سەریٚ خوە — سەر د ناڤا ریٚ نهایە

**۳۰** ما دبت ئەو دوورەدەست بت — دیٚ ژ فینجانا تە مەست بت
جام ژ شەهکاسیٚ ب دەست بت — ئەبتەران ئەو مەی دەوایە

٣١ یار پوڕ حوسنەک ل بال بوو | دلبەرەک غایەت جەمال بوو
ئەو ب حال ئاگەه ب حال‌بوو | شوبهێ وێ شەفقە و عەتایە

٣٢ مەهدەرا وێ خەیرخوازێ | نوکتەیەک ژ وێ رەمز و رازێ
وی ب دل سەح کر ژ سازێ | موغنی (مەغنی) و قانوون و نایە

**مانای وشەکان:**

**بەر**: ڕوو؛ **بەر وەرگێڕان**: ڕوو وەرگێڕان؛ **بووریە**: بووردوە، دەستی هەڵگرتووە؛ **ئەبتەر**: دوابڕاو، لێرەدا مەبەست زۆر چارەڕەش و پەشێوە؛ **مەهدەر**: تکا و شەفاعەت؛ **سەح کر**: تێگەیشت، پێی زانی؛ **موغنی**: موغەننی، گۆرانیبێژ؛ **مەغنی**: مەغنا، گۆرانی.

**پوختەی مانا:**

سروەبا، تکاکاری من، دەگەرووی بلوێرەکەدا، بە یارمی گوت: دڵداری وا پاک و گیانیت نەکەی لە دەرکی خۆت دوورکەی! نەچی ڕووی لێ وەربگێڕی! دڵدارێ وا دەستی لە سەری بەرداوە و دەمێکە لەگیان بووریوە. سەری پردەبازی ڕێیە؛ کە یار بە سەریا ببوورێ. چۆن ڕەوایە دڵداری وا، لەبەر دەستتدا نەوەستێ و لە پیاڵەی دەستت مەست نەبێ؟ پیاڵەی چی؟ بۆ دڵداری وا گەرەک مەی بە شاکاشی بێ. بۆ نازشێواو و دوابڕاوی شێتی ئەوینی گیانی پاک، بادەی دەستی تۆ دەرمانە؛ چاکترین چارەی دەردانە. یاری نازدار، ئەوندەی جوان و لەبارە، ئەوندەش دڵنەرم و باش و دڵاوایە و سەد ئەوندەش، بە دڵ و بە گیان وشیارە و لە دەردی دڵ ئاگادارە. لە دەنگی ساز و ئاوازی قانوون و بلوێر و سازان، پەی بە هەموو ڕازان برد و لە تکای شنەبای خێرەوەمەند، زوو تێگەیشت کە لەو بەزمە کێ مرازە.

٣٣ یووسوفێ دەوروزەمانی | گۆ نەسیم هان ڤی نیشانی
لێ ژ بۆ نەکهێ دەهانی | ناخوەشان ئەو لێ شیفایە

٣٤ ماوەرا بەلگێن گولێ بوو | بیهن و بوویا کاکولێ بوو

داروێ قـــەلبێ مـــەلێ بـــوو     لـەو ب چەهڤـێن مـن جەلایـە

**٣٥** بـا نەسـیم دێ چـی لـەزینی     سـاغ و سـالم مـا تـو بیـنی
ڤـێ کومێـدی لـێ گـەهینی     دا سـوار بـت لـێ پەیایـە

**مانای وشەکان:**

**هان**: بگرە، ها؛ **نەکهە**: بۆنی خۆش؛ **بیهن**: بۆن؛ **لەزینی**: پەلە دەکەی؛ **کومید**: ئەسپی کوێت؛ **کومێد**: ئەسپی مرادان؛ **پەیا**: پیادە.

**پوختەی مانا:**

ئەو نازدارە تاقانەیەی کە وەک یووسف لـە نـاو خەڵـکی میسـرا چـۆن گـرۆی جـوانی بردەوە، لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، لە چاو هەموو جوانی دنیایە، یووسفە و هەموو کەس بۆ دیداری ئەو، دەست دەشکێنن و دڵیان بە سەر تیغ دادێنن، گوتی: سروەبای تکاکـار! بەو نیشانەی کە تۆ لە نزیکی مندا ئەوندە بۆنت خۆش بووە، هەر نەخۆشێک هەڵتمژێ، دەستبەجێ چاک دەبێتەوە، دەم و زاران بۆنخۆش دەکا، ئەو بۆنە لـە گـولاوی پـەلکی گوڵی سەر ڕوومەت و لە عەنبەری کاکۆڵانمەوە بۆ تۆ دێ، دەرمانی دڵی مەلایە. (یان: دەرمانی دڵی ئێمە بوو؛ چاویشمانی وەسەر بینایی خستەوە. کۆنـەچیرۆکی یـاقووب و بۆنی کراسەکەی یووسف، ڕووی‌دایەوە). فەرمووی دە بەو نیشانەوە، بە پەلە بـۆم بگـە مەلا؛ فریای کەوە! با سواری ئەسپی مراد بێ و چی دی لە شوێن خـێڵ وێـڵ نـەبێ و نەڵێ پیادەم و ناگەمە شۆڕەسواران. لە تۆم دەوێ بە سلامەتی بۆمی بێنی.

**٣٦** غەفلـەتێ بایـێ نەسـیم هـات     خەف ژ بال یارێ کـەریم هـات
پوڕ ب ئیحسانەک عەزیم هـات     قاسـیدێ شـاه و گەدایـە

**٣٧** دل نەفەس دیسا ب بـەر هـات     لەو حەکیم لوقمان ب سەر هات
نافعـێ دەردێ جەگـەر هـات     تالیعـێ کەوکەبنومایـە

**٣٨** من کـو ئـەو نیشـان گەهەشتێ     ئەڤ دلێ سەد داغـێ رەش تـێ

زەررەیەک خەوش لێ نەهەشتێ ئیسمێ ئەعزەم پێ گەهایە

۳۹ چوومە سەرپشتا کومەیدی من ژێ پوڕ ئەو ژان و کەی دی
بەحر و بەر مە ل بەر خوە تەی دی دەشت و چۆل و کەربەلایە

۴۰ مەو نەسیم خوەشپەنجە تێکڕا وێ دچین وەک تەیر ڤیکرا
بەحسێ زولفا یار پێکرا بۆرێ عیشقێ پوڕ فرایە

۴۱ گونبەدا نوورین خویا بوو سپێدەیا سادق نوما بوو
یەک ب یەک شەوقێ ڤەدابوو قەسر و ئەیوان و سەرایە

۴۲ قومری و بولبول دخوینن لێ عەجەب ئەو خوەش دمینن
هەر سەحەر مەحبووب دبینن عەندەلیب ڤێڕا تەبایە

۴۳ بوغچەیا سۆرگول دگەش تێ چیچەک و رەیحانێ رەش تێ
دلروبایان تێنە گەشتێ سونبولان تاتا سەمایە

۴۴ سەبزەیا شەبنەم گولاڤ لێ سۆر عەقیقان دوڕ خوناڤ لێ
دلبەران سەیران و راڤ لێ عەرعەران سیتاب دایە

**مانای وشەکان:**

**غەفلەتی**: لەنکاو؛ **خەف**: نهێنی؛ **خەف**: سووک؛ **بال**: کن، نک؛ **کەریم**: بەخشندە؛ **عەزیم**: مەزن؛ **نافیع**: بەهرەدەر؛ **تالیع**: بەخت؛ **تالیع**: دەرکەوتوو، هەڵاتوو؛ **داغی رەش**: تیراوێ، برینارەش؛ **ئیسمی ئەعزەم**: ناوی هەرە مەزن، یەک لە ناوەکانی خوایە تەنیا نزیکان لە خوا دەیزانن؛ **تەی**: قەد، پێچراو؛ **کەربەلا**: ناوێکی ئارامی- ئاسوورییە، واتا: نزیکی خوا. لەو شوێنەی کە ئێستە شاری کەربەلای عیراقی لێ هەیە، بتێک هەبووە کە بە بت گوتراوە «اِله»؛ **کۆرب**: واتا نزیک؛ **کۆربئیلاه**، بۆتە کەربەلا و چونکە ئیمام حوسەینی لێ شەهید کراوە، لە زۆر دنیادا ناسراوە. لە زاراوەی کرمانجیدا، بە

بیابانی چۆڵ و واحیدەلقەهار دەڵێن کەربەلا؛ **تەیر**: مەل؛ **بور**: ئەسپ، ئەسپی مراد؛ **فرایە**: تیژباڵە، زۆر بەفڕینە؛ **عەندەلیب**: بولبول؛ **تەبا**: بەشوێنەوە؛ **تەبا**: ئاشت؛ **تەبا**: هەواڵ؛ **گەشت**: سەیران؛ **دور**: مرواری؛ **سیتاب**: سێبەری کاتی هەتاو.

**پوختەی مانا:**

منی چەمەڕای بەتاسە، لەپڕ دیتم سروەی پیرۆز- کە لە نێوان شای جوانان و منی گەدای هەناسەسارد ببووە پەیامنێری لەش سووک- بە کزەیەکی نهێنی هاتەوە لام و ئەو چاکەیەی، کە زۆر خێرەومەندانە بوو، پێ گەیاندم و تێی گەیاندم کە لای یاری بەخشندەوە مژدەی خۆشی بۆ هێناوم. دڵی مردووم کەوتەوە هەناسەدان و ئاهێکی تێ گەڕایەوە. سروە لێم بوو بە لوقمان و چارەسازی هەرە چازان، بەرگی ژیانی دەبەر جەرگ و هەناوم کرد. تۆزی پالای سۆلی یاری دەچاوم کرد. مژدەی ئەو وەک ئیسمی ئەعزەم، بەهرەدەر بوو؛ سەد برینی سەرەتیران لە دڵمدا- کە گش ببوونە تیراوێ- گۆشتەزوونیان هێنایەوە و تۆزکاڵێک خەوشی تێ نەما و هەر بوومەوە گوێزی ئازا و ئازا خۆم ئامادە کرد و پەڕیمە سەر خوانی زینی ئەسپی مراد. دەرد و ئاخی رۆژانی دووریم - کە دیبووم- فەرامۆش کرد. سروەش دەگەڵما گەڕاوە. بە جووتە فڕین لە دەشتان، لە سەر چۆڵ و کەربەلایان. من و سروە پەنجەمان تێکپەڕاندبوو؛ وەک دوو باڵداری زۆر هەواڵ، پێکەوە لە شەقەی باڵ بدەن، نەدەکرا لێک جوێ بینەوە؛ چونکە ئەسپە بۆری ئاوات، زۆر تیژباڵە و پیاو دەترسێ لەو بەرزە بەو خۆشفڕینەی چاوی ڕەشکەوپێشکە بکا و لەسەر زینەکەی بپەڕێ. من و سروە لەو ڕێگەدا، لەپەستا باسی کەزی یاری نازدارمان وتوویژ بوو. لە ئاکاما گونبەزی نوورین دەرکەوت. سپێدەی بەرەبەیانی ڕاستیمان هاتە بەر چاوان. کۆشک و سەرسەرا و دیوان و بەربێلایی و هەیوان و باڵەخانەکان، تیشکیان لەیەک دەگەڕاوە. لە گوڵجاری حەوشی یاردا، هەزاران گوڵ پشکووتبوون. ڕەشەڕیحانەش لەو ناوە، دەگەڵ گوڵان لاسای کولم و کەزیەکانی جوان و بونخۆشی ئەویان بوو. یاکەریم و کەناری و بولبول و سێرو، سەرمەستی دیمەن ببوون و بەستە و مقامیان خۆش دەگوت. من لەو ناوە سەیر مابووم کە چۆن مەل و بولبولەکان، چەند بەیانیان یاریان دیوە و توانیویانە لە خۆشیان گیانیان دەرنەچێ و چۆن هێزی خوێندنیان ماوە؟! زۆر جوانی دڵڕفێنم دین؛ لەو ناوە سەیرانیان دەکرد.

تاتای بسکیان- کە وەک لقە سمڵ وا بوون- دەلەرین و لە شاد بوون بە نزیکیی یار، کەوتبوونە سەما و هەڵپەرین. تنۆکی شەونمی بەیان، لە سەر چڵ-چڵی سەوزەڵان، ببووە گوڵاو. گوڵی ئاڵی بە ڕەنگی لاڵ، مرواری ئاونگی لە سەر، دڵڕفێنان بە دەم گەشت و گەڕانەوە، سەرگەرمی ڕاوی دڵان بوون. بەژن و باڵا نەمام عەرعەر، نسێیان لە گوڵەکان دەکرد و دڵی گوڵیان بە نێچیر بۆ خۆیان دەبرد.

**٤٥** بووم شەریف ئەز باستانێ ... شاهیدێن وێ گولستانێ
ساقیان جام-جام دادانێ ... کەوکەبان سەیوان ڤەدایە

**٤٦** چەندەکێ چیمەن حەرەم (خوڕەم) بوو ... لێ مەدام ئەو سوبحەدەم بوو
من بهیش باغێ ئیرەم بوو ... لێ سەبا گۆ من سەبایە

**٤٧** سەفبەسەف ویلدان پەری بوون ... بەندێ زولفا عەنبەری بوون
تێک ل دیمێ موشتەری بوون ... ڕەقس و گۆڤەند و سەفایە

**٤٨** پوڕ عومر من چوو ب سەختی ... لێ شوکر خوازم ژ بەختی
زوهرەیەک بوو ئەو ل تەختی ... بەلکوو بێم «شَمْسُ الضُحا»یە

**٤٩** پەردەیا خەلوێ کو هل دا ... یەنگییەک من دی د ملدا
گەزمەیا ژەهری ل دلدا ... قەت نەگۆ قەتل و خەتایە

**٥٠** حادری چووم سەجدە ژێرا ... لێ نیەت ئێحرام نەڤێرا
عاشقێ ئەڤ گەزمە تێرا ... هەرچی تاعەت کت ڕەوایە

**مانای وشەکان:**

**شەریف**: بەڕێز؛ **سەیوان**: سایەدەر؛ **حەرەم**: پاوان؛ **مەدام**: هەمیشە؛ **ئیرەم**: بەهەشت؛ **ئیرەم**: بەهەشتی شەدداد؛ **شَمسُ‌الضُحی:** ڕۆژی چێشتەنگاو؛ **بێم**: دەبێژم؛ **خەلوە**: جێی تەنیایی؛ **مل**: شان؛ **حادری**: فەوری؛ **تاعەت**: خزمەت و بە گوێ‌کردن.

**پوختەی مانا:**

بە دیتنی ئاسانەکەی، سەرفەراز و ممبارەک بووم. چی ببینم؟ هەروا جوانی ناسک و نازدار لەو ناو باغە مەی دەگێڕن و پیالە بە پیالە ڕاناگا. لە دەوری یار دێن و دەچن خزمەتکارن. ئەوندەش شووش و شەفاف و ڕێک و جوانکیلە و لەبارن، وا دەزانی ئەستێرەی لە دەوری مانگن و بوونە چەتری دەوری سەری. چیمەنی خۆشی بارەگا - کە پاوانی چاوانی ئەویندارانی گیانبەگیانە- قەت شەوی بەسەردا نایە و هەمیشە بەرەبەیانی ڕوون و ساوی بەهارانە. بە بیری خۆم دەمگوت ئێرە باغ و باغاتی بەهەشتە. بەلام سروە لەبەر خۆیەوە دەیسرتاند: گولجاری باغچەی سەبایە و نشیمەنی بەلقیسایە. لە دەوری ئەو سەرسەرایە، بە زنجیرە و ڕیزبەریز، هەروا کوڕی لاو، کیژی لەباری مەستەچاو، دەبیندران لەوێلدان سەمایان دەکرد. گش سادە و پەریزادە بوون. هەموو شتیان یەخسیری کەزی عەنبەربۆی یاری من بوون. گشتیان وەک من، ئەویندری ڕوخساری بوون و گیرۆدەی داوی ئەوینێ. تێکڕا لە خۆشی ئەو هەلەی کە دلبەرمیان لێ نزیکە، گەشکە ببوون. لە دلشادیی بە سەماوە سووڕیان دەدا. سوپاس بۆ خوا هەرچەند لە تەمەنی خۆشما زۆرم پەژارە و خەم دیوە، ئێستا بە بەختم دەنازم کە گەیشتوومە ئەو پایەی بە ڕاموسانی ئاسانەی یاری نازدار، سەرفیرازم.

یارم لە سەر تەختی نازان، شۆق و شەبەقی دەداوە. وەک ئەستێرەی کاروانکوژەی نیوەشەوان دەدرەوشاوە. نەخێر زوهرە و گەلاوێژ و ئەستێرەی چی؟ خۆری دەمەو چێشتەنگاویش لە تاوی ئەو تاوی نەبوو؛ لە شەرمان دەتاوایەوە.

پەردە لە نێوان لا درا. یار کەوانێک بە شانەوە- کە بریەتی بوو لە کەزی ڕەشی دل و گیانگەز- بە کەوانێ دەبیندران. چۆن کەوانێک؟ هەر تیرێکی کە لەوێوە بێتە ناو دل، ئێژی بە ژار ئاو دراوە. دلم پێکرا و هیچ نەشیگوت کوشتنی هەژار گوناحە و ناڕەوایە. دەسبەجێ چوومە سەر سوژدە بەرەو بالای. نیازی ئیحرامم دانەبەست و بە نیازی زیارەتی کابەی ئەو ڕوخسارە، بە دل لە دەوری دەگەڕام. مەلێن حەج بێ ئێحرام بەستن ڕەوا نابێ! دلی هەرکەس کە تیری ئەوی لێ درابێ، هەرچۆنێک تاعەتی بۆ بکا، زۆر دروستە.

۵۱ چــووم زیــارەت پــێ و دەســتی — لێ نهیشت ئــەووەل ب قەســتی
دا ب بســۆژت رووح و هەســتی — عاشـــقان ســـۆتن جەزایـــە

۵۲ شــەربەتا وەســلا خــوە نــادەت — تــا هنــەک عاشــق جــەزا دەت
دلبــەران ئــەڤ رەنگــە عــادەت — مـــەهروان کـــەمتر وەفایـــە

۵۳ پیشـــەیێ وان غـــەنج و نـــازە — ســـەنعەتێ عاشـــق نیـــازە
یـــار ل بـــەر زاران ئیجـــازە — شـــەربەتا شـــیرین موفایـــە

۵۴ چــووم تــەوافا پــێ و دەســتان — شــوبهەتێ ســەکران و مەســتان
ئــەهلێ حــال و خووبپەرســتان — وان ژ عــومر ئــەڤ موددەعایــە

۵۵ تللییـــێن نـــازک شـــەمالین — من ل سەر چەهڤێن خــوە مــالین
تالبـــێ وەردێـــن ب خـــالین — دل د ڤـــێ فکـــرێ تەیایـــە

**مانای وشەکان:**

**زیارەت**: ماچ کردن؛ **ب قەستی**: لەنقەسـت، بـە نیازێـک؛ **هەستی**: بـوون و وجـوود؛ **هەستی**: پێشە، ئێسقان؛ **هنەک**: هێندێک؛ **عادەت**: ڕەوشت و خۆ؛ **مەهروو**: ڕوومانگ؛ **غەنج**: ناز؛ **نیاز**: پاڕانەوە؛ **زار**: زارە، گریـانی بـەکوڵ؛ **سەکران**: سـەرخۆش؛ **خووب**: جوانچاک؛ **موددەعا**: داوا و ئاوات؛ **تللی**: تلهی، تبل، قامک، ئەنگوست؛ **شەمال**: مـۆم؛ **تەیا**: سەرگەردان و لێ شێواو.

**پوختەی مانا:**

هەر کە دیتم، سوژدەی سوپاسم بۆ خوا برد کە دیداری یاری شاندام. سـەرم لـە سوژدە هەڵێنا و خۆم دەدەوری سەری گێڕا؛ بالا گەردانی بالای بم. کە حەو جار تەوافیشم کرد، دەستم دە لاقی وەرێنا کە ماچی کەم و بخوازم دەستیشم داتـێ ڕایمووسم؛ بەڵام سەر لە هەوەڵەوە، ڕووی گرژ کرد. ئەو تووڕەییەش بە قەسـتی بوو؛ دەزانم لە ئانقەست وای کرد. ویستی گیـان و سـەرتاپای بـوون و نـەبوونم، تەنانەت ئێسکەکانیشم بسووتێنێ. ئەزموونی دڵداران وایـە؛ لەبـەر سـووتان خـۆ ڕابگرن. هەموو دلبەرانی ڕوومانگ، ئەو ڕێ و شوێنەیان هەیە: بەر لەوەی دڵدار

ئازار دەن، بواریٚ نادەن دڵیان بە دیداری شاد کەن. ئەوەی ئێمە ناومان ناوە وەفا و ئەمەگداریی یاران، لە لای چاومەست و نازداران، زۆر کەمتر لە دڵدارانە و ئەمەش هەر لە خۆیان جوانە. ئەوان دەبیٚ ناز بکەن و دڵدار دەبیٚ بپاڕێتەوە و خۆ کز کا و بناڵێنیٚ و ئەوسا لە پاش گریان و شیوەن و ناڵین، ئەگەر لاوێندرایەوە، ئەوپەڕی خۆشی و شادییە.

وەک خواجە حافزی خۆمان فەرموویەتی:

**لە چی و بۆچیت نەبیٚ، هەرکەس بە ئاکاریکەوە جوانە**

**کە یارت ڕووی گرژ کا و ناز بکا، تۆ هەر بپاڕێوە**[1]

بە دوای ناز و نیمنازاندا، ڕێگەی دام دەستی ڕامووسم؛ توێڵم ڕەپەنجەی پای بخەم. لە خۆشیان هۆشم نەمابوو؛ وەک سەرخۆش و مەستی دەبەنگ، تلم ئەدا و بەم لا و بەو لادا دەکەوتم. ئەوەی من لەو دیدارە دیم و پێی خەنی بووم، هەموو ئەهلی حاڵی دیکە و هەموو جوانپەرستانی دیش، لە درێژایی تەمەنیان، گەورەتر ئارەزوویانە. یار بەو قامکە ناسکانەی کە بۆ منی پەپوولە وەکوو مۆمێک بوون داگیرسابن، فرمێسکی لیٚ سڕیمەوە. من تاوێک دەستم بە سەر چاوی خۆمدا ماڵین، ویستم چاوم گەش بنەوە و بزانم ڕاستە یارم دیوە یان خەونیٚ خۆشە دەیبینم؟

بە دەردی «نالی» گوتەنی:

وەها مەستی تەماشای چاوتە «نالی» کە نازانیٚ

بە بێداری دەبینیٚ یان لە نەشئەی مەستی و خەودا

ئێمە زۆر ساڵ و زەمانە، بە دڵ لە شوێن سەیری پەڕی گوڵی ئاڵی کوڵمەی یاری، ڕوو بە وردەخاڵ هەڵوەداین؛ لە بیابانی سەرگەردانیدا، سەرگەردان، بیٚدەرەتان ڕایدەبوێرین.

**٥٦** چوو عومر مە د ڤیٚ خەیالیٚ — ما شەڤەک عیدان د سالیٚ

بێم زیارەت زولف و خالیٚ — ڕۆژ و شەو من ئەو دوعایە

---

١. میان عاشق و معشوق فرق بسیار است — چو یار ناز نماید شما نیاز کنید

| | | |
|---|---|---|
| ۵۷ | چـەرخ دترسـم کـت شـتابێ | زوو ئەجـەل پـێ دەت ریکابـێ |
| | جـان بـرەت مـە دڤـێ عـەزابێ | ئـەڤ سـیاه رەنـگ ئەژدەهایـە |
| ۵۸ | چەنـدەکی سـادق جـەما بـن | ئـەر ببێـژی جـانفیـدا بـن |
| | وەک «مـەلێ» لازِم تـو نـابن | وی ژ دل جانـێ خـوە دایـە |

**مانای وشەکان:**

**ئەجەل**: وەختی مردن؛ **ریکاب**: ئاوزەنگی، رکێف، زەنگو؛ **ئەژدەها**: حـەزیا، هـەژدیها، زەها؛ **جەما بن**: کۆ ببنەوە، کۆم ببن؛ **لازم**: سووربزانە، باوەڕ بکە؛ **تو**: هیچ.

**پوختەی مانا:**

تەمەنم بەو بیرە بووری و خەیاڵ دەکەم ئاخۆ دەست ئەدا شەوێکی لە سالاندا، تووشی ئەو جەژنە خۆشە بم؟ بێمە سەیری ئەو کەزی و خاڵە ڕەشانەت؟ زۆر دەترسـم زەمانـە وە پەلە کەوێ و مردن بەو پەلە کردنەوە، پا بنێتە نـاو رکێـف و گیـانم لـە دووی خـۆ ڕەکێش کا و منی ئاواتپێکنـەهاتوو، تـا هەتایـە بـەو پـەژارە بتلێمـەوە. مـردن وەک هەژدیهای ڕەشە و بەزەیی بە کەسدا نایە. نەوەک بمـرم و نەتگـەمێ؛ پێویسـتە مـەلا بناسی: هەرچەندی دڵداری بەڕاست کۆوە ببن و بە فەرمانێک لە لێوانت گیانیان بکەن بە قوربانت، لێت ڕوون بێ هەرگیز هیچکەسیان ناگاتە من. من هەر بە دڵ، بە ئـارەزوو گیانی خۆمت قوربان دەکەم؛ پێی ناوێ تۆ پێم بفەرمووی.



# تونگی شەکر

آ تووڕەیـــا تابـــدار عەنبـــەر کـــە
خـــەمرییێن شـــەنگ میســـکێ ئەزفـــەر کـــە

۲ ل گـــولان میســـک و عەنبـــەرێ برەشـــین
ژ گولاڤـــێ جونەســـرییان تـــەر کـــە

۳ کەســـک و ســـۆرێن ژ رەنگـــێ قەوســـێقەزەح
ژ ســـەراپا گـــولاڤ و مـــاوەر کـــە

۴ ســـورمە پووشـــێن ســـورێ ب ســـەر کـــل دە
عـــاقیلان لـــێ خـــەراب و ئەبتـــەر کـــە

۵ هـــەر ســـەحەر دەســـتەکی ژ نـــوو وەرگـــر
عەرعـــەرێ تێکـــدا سەراســـەر کـــە

۶ نێرگـــزێن ســـەرگران هلـــین جـــارک
دو قیرانـــێ ل یـــەک بەرابـــەر کـــە

۷ قـــەدوقاما شـــەریف و نـــازک و تـــەڕ
لـــێ سەراســـەر ب فەســـلین، کـــەر کـــە

**مانای وشەکان:**

**تابدار**: بەپێچ؛ **جونەسری**: هێشووی نەوعـەدار، خورمایـەکی بـە نـرخ و هەرەباشـە؛ **خەراب**: مەست؛ **خەراب**: وێران؛ **وەرگر**: وەرگێڕە، بگۆڕە؛ **فەسل**: بڕینی بەرگدروو.

**پوختەی مانا:**

کارێ بکە بسکی بەلاداکراوت، عەنبەر تووشی تـاووتوێ کـەن؛ بـا پـێچ بخـۆن و

بترووسکێن. بسکۆڵە هەڵگەڕاوەکەت، با ببێتە مایەی شۆخوشەنگی میسک. میسک و عەنبەری بسکانت، بە سەر گوڵی ڕوومەتتدا پەرژ بکە! خشڵەکانت- کە وەک هێشووی خورما لەو بالایەوە دیار دەکەن و گزوفتی چاوان دەدەن؛ با لە ناو گولاوی شەرما، شە هەڵێنن. با لە سەر تا پا شمەکی کەسکوسوورت ببن بە پەلکەزێڕینەی پاش بارانی پڕ لە گولاو لە دەوری تیشکی بالاکەت. چاوت ڕەشی دەستی خوایە و هیچ کاری بە سورمە نییە و پڕە لە کلی دڵکێشیی و ڕەزاسووکیی؛ بەلام لە ترسی چاوێنی ئەوانەی شێتی تۆ نین و خۆیان بە عاقڵ دەزانن، بە تۆزێ کل دایانپۆشە! با عاقڵان مەست و هەناو تێکڕووخاو و دوابڕاو کات. هەر بەیانییەک دەستێک جلی نوێ بگۆڕە و لە نەمامی عەرعەری بالای هاڵێنە! دڵی هەموو بەژننەمامانی شلک و ناسک و خوێنشیرین لە عەزرەتان بەر قەیچی دە و لەت-لەتی کە! ئەو چاوانەت- کە وەکوو نێرگسی مەستن- هەڵیان بێنە و هەموو جارێک دوو ئەستێرەی بەختەوەریی بەرانبەر بەیەکتر بکە!

٨ تو بمەش کۆک ب سەردەرێ قەسرێ
ب خوە کو، کێ؟ ل شاه و قەیسەر کە

٩ وەرە وەک رۆژ ب سەردەرێ کەلەهێ
عالەمێ تێکدا مونەووەر کە

١٠ وەک گولەک زەردێ بوغچەیا تە مە ئەز
تو مە تێکل خوە وەک گولا زەر کە

١١ زاهیدێ هویشک تەبع سەودایە
ب دو جامان تەبیعەتێ تەر کە

١٢ ڤەکە جارەک ب خەندە شەککەر تونگ
تێک میسرا مە قەند و شەککەر کە

١٣ پێ ل سەر دیدەیێن «مەلێ» دائین
خەلوەیا سۆفیان موکەددەر کە

۱۴ خـــــەت‌وخالان نیشـــــان «نیشـــــانی» دە
مـــە ژ ناڤـــیٚ خـــوەرا ب دەفتـــەر کـــە

**مانای وشەکان:**

**بمەش**: بڕۆ؛ **کۆک**: کەیفساز؛ **کۆک**: زۆر پۆشتە؛ **کەلەه**: قەلا، کۆشکی میر؛ **هویشک**: وشک؛ **سەودا**: نەخۆشی کەللەیی بوون؛ **سەودا**: ئەوین؛ **سەودا**: مامڵە؛ **تەبیعەت**: میجاز، تەبیات؛ **تونگ**: تونگە، کووپەڵەی دەم‌تەنگ؛ **میسر**: شار؛ **خەلوە**: کونجی تەنیایی؛ **موکەددەر**: تاریک و لێڵ؛ **دەفتەر**: پەڕاو.

**پوختەی مانا:**

زۆر بە فیز و کەیفسازیی، لە سەربانی دەرکی کۆشکیٚ وەرە و بچۆ بە هەزار پاشا و قەیسەران گەمە بکە و بەم بلیٚ: کوا؟ چت کردووە؟ و لەو پرسە: کابرا ئەتۆ کێی؟
تۆ وەکوو خۆری ناو مالی. لە کۆشکەوە سەر دەرێنە؛ هەموو دنیا ڕۆشن کەرەوە و دوایی بە تاریکی بێنە! مەلیٚ مەلیٚ مات و ڕەنگ زەردی! دزێوی! گولی سوور بە تەنیا جوان نین. من ڕیٚ دە بێمە باغچەکەت با زەردی لە ئالان هالیٚ و دیمەنەکە لەبارتر کات. وشکەسۆفی کە خۆی بە دلدار دەزانیٚ، نەخۆشێکی گەللاییە و سەوداگەرێکی خەسیسە. دەیەویٚ بە دوو دوعا و نوێژ، بەهەشت بکڕیٚ. دوو پیالە بادەی پیٚ بدە با تەبیاتی تەڕ بێتەوە.
دلم خەلوەتگەی سۆفیانە و ڕۆشناکی لە دەلاقەی چاومەوەیە. وەرە پایەک لە سەر چاوەکانم دانیٚ و لێلایی بە چاوی کزی وشکەسۆفییەکاندا بێنە! خال و میلان نیشانی نیشانی بدە! با ناوی مەلای دلداریش لە دەفتەری دلداراندا جیٚ بێتەوە.



# گول و بولبول

١ گەرچی بولبول جەوهەرا زاتێ گولە
لێ گولێ رەونەق ژ عیشقا بولبولە

٢ گوهدە زیکرێ حال و جۆشا بادەیێ
وی ب بولبولرا دخوونت بولبولە

٣ سۆسنان سەد رەنگ ئاڤێهتن کەمەند
وان نەگۆ دلبەندێ تایەک سونبولە

٤ سونبولان سەیوان ل دێمێ تازە کر
ئافتاب ئیرۆ د بورجا سونبولە

٥ عەرعەرێن رەنگین ژ تایێن سۆر و زەر
قومرییان سەد رەنگێ شوور و غولغولە

٦ زەمرییا عیشقێ ژ بالا هاتە خوار
قودسییان ئاڤێهتە چەرخێ هەلهەلە

٧ نێرگزا نازک قەد و شەهلایە مەست
دین کرم ئەز بولبولان سەودا گولە

٨ زلف و بسکان پورٍ ژ من دل بر بەلێ
رشتەیا جانێ «مەلێ» ئەو کاکولە

٩ بولبول و پەروانە ئەو فەسل و دەمن
جینسێ عیشقا من تنێ دەردێ کولە

١٠ من د دل ناسۆرەکی دا هەستیێ
لاجەرەم هێز نەشئەیا داغا کولە

١١ تـــەبعێ لامیــعوەش ز میننـــەت بولحەســـەن
مـــن د دەســـــتدا زولفـــەقار و دولدولـــــە

١٢ هشکەڕۆی بـــەدفیعل چـــی هین‌کـــر عەجـــەب
بارەکــــەللا خوەشــــبەزی ئەســـــپێ قولــــە

١٣ قـــەت ڤـــەرێکێ ڤــێ دەمـــێ حـــازر دبـــت
قیسســـــەیا فەســــلێ نـــــە کـــارێ ســــونبولە

**مانای وشەکان:**

**جەوهەری زاتی**: ژێهـاتوویی و هونـەری سـەربەخۆ؛ **رەونـەق**: بـرەو؛ **جـۆش**: قولـت؛ **بولبولە**: لوولەی لوولێنە؛ **نەگۆ**: تۆمەز، تۆ مەلێ؛ **تازە**: زۆر باش و جوان؛ **ئافتاب**: خۆر؛ **شوور و غولغولـە**: هەرا و هوریا و زەنا-زەنـا؛ **هەلهەلـە**: تلیلیلـی و هەلهولـە؛ **شـەهلا**: ڕەنگی کاڵ بۆ چاو؛ **زەمری**: بـەفوو دە سـاز تـووڕێن، وەک بلـوێرژەن و...؛ **هەسـتی**: ئێسک، وجوود؛ **لاجەرەم**: بێ‌گومان؛ **فەسـل**: کـژی سـاڵ، لێـک هەڵـپچڕان؛ **نەشـئە**: کەیف، نیشە؛ **لامیع**: بەفیز؛ **وەش**: لە چەشن؛ **حەسەن**: باش؛ **بوو**: باوک؛ **بولحەسـەن**: کونیەی ئیمام عەلی؛ **من ددەسـتدا**: دەدەست منـدا؛ **زولفـەقار**: دووخـدار؛ **زولفـەقار**: ناوی شیری ئیمام عەلی، چۆنکە دووخی هەبوو، وەک ساتوور نەبوو؛ **دولدول**: سـیخۆر، کەژووشکێکی گەورەیە؛ **دولـدول**: ناوی ئێسترێکی ڕەش‌ـبۆرەی پێغەمبـەر(د) بـووە، داویە بە ئیمام عەلی؛ **هشکەڕۆ**: وشـکەڕۆ، ڕەوتی ئەسـپی تـەعلیم نـەدراو؛ **بـەدفیعل**: تۆسن و بەدفەڕ؛ **هین‌کرن**: فێرکردن؛ **خوەشبەز**: تیـژ لـە غـاردان؛ **ڤـەرێکی**: بـەڕێوە؛ **قیسسە**: سەرگوروشتە؛ **قەسس**: بڕین، هەڵپاچین؛ **قولە**: کلک‌کورت، کوێتی قاپڕەش، ناڕەسەن؛ **کول**: غەم؛ **کول**: هەموو؛ **کول**: تەشەنەی دەرد، ژان؛ **سونبولە**: برجێـک لـە ئاسمان؛ **سونبولە**: گوڵی وشکی دەغڵ؛ **سونبول**: گوڵی سمل.

**پوختەی مانا:**

ئەگەرچی هەموو هونەر و جەوهەری بولبول لە گوڵڕایە و ئەگەر گوڵی جوان نەبوایـە و نەبووبا بە ئەوینداری، ئەو بەسـتە و گورانییـەی ئێسـتای کـوا دەزانی؛ بـەڵام گوڵـیش برەوی لە سای بولبولە. ئەگەر ئەو پێی هەڵنەگوتایە، نـاوی گـوڵ وا دەرنەدەکـەوت و

ناوبانگی بڵاو نەدەبوو. واتا: دڵبەر و دڵداریش، هەردووک دەبێ سوپاسگوزاری ئەوین بن کە کردوونی بە تای یەک و بە بێ یەکتر هیچکارە نین. تو گوێ بگرە کە بادە لە لوولێنەوە بە قوڵتە دەرژێتە پیاڵە؛ ئەویش چۆن وەکوو بولبولان، چریکەی دێ و باسی حاڵی ئەوینداریی و کوڵی دڵی هەژار دەکا؟ ماک و جەوهەری هەر شتێک لە دنیا، بە دڵدارییەوە بەسراوە و ئەگەر دڵداریی نەبوایە، دەبوو دنیا کوندەبەبووی لێ بخوێنێ. هەرچی بووە و هەرچی هەیە و هەرچی دەبێ، هەم دڵدارە هەم دڵبەرە. سوێسنەی بۆنخۆش و سوور و زەرد و هەمەڕەنگە، لە گوڵجاڕان کەمەندی ئەوین داوێژن، کە دڵی بولبول دەداو خەن. بەڵام ئەگەر زوانیان بوایە، دەمانزانی دڵی خۆیان بە تاڵێک تای سونبولێوە- کە بسکی یارەکەی منە- هەڵواسراوە. بسکی وەک سونبولی یارم، سێبەریان لە ڕوخساری کرد؛ کە لەوپەڕی جوانیدایە و تا بڵێی تەڕ و تازەیە. بەڵام نەخێر؛ سێبەری چی؟ ڕوخساری یارەکەم ئەمڕۆ- کە بە بسکان داپۆشراوە- وەکوو خۆرە لە ناو بورجی سونبولەدا.

نەمامی عەرعەری باڵای لە بەر لەرزانە و پلپلە و گوڵینگە و پەلکەشۆڕانی زەرد و سووری، ئێمەی دڵداری وەک مەلی یاکەریم خستە سەر سەد جۆر هەرا و قوولە و ناڵە و گاڵە. بلوێرژەنی هەوای ئەوین، لە ئاسمان بوو؛ خودا ناردییە سەر زەمین. فرشتەکان ئەو کاتەی بەڕێیان دەکرد، تلیلیلی و هەلهەلەیان لە ئاسمان دەنگی ئەداوە.

ئەگەر بولبول شێتی ئەوینی گوڵانن، من بێهەست و شێتی دەستی دوو نەرگسی کاڵ و مەستی بەژنزراوی بەنازم. کەزی و بسکی بەڵێ زۆر جار دڵیان بردووم و دەشیبەن؛ بەڵام گیانم بە داوی کاکۆڵی بەندە و بەو هەموو دڵڕاتەکانە، بەندی ژیانم هەر نەپساوە. پەپوولە و بولبول دڵدارن؛ بەڵام لە وەختی گوڵاندا، یان لە سەردەمی شەواندا کە مۆم و شەم داگیرساون. واتا دڵداری دەمدەمین و لە گوێن من نین. ئەو بابەتە ئەوینداریی‌ەی کە لای منە، لای کەس نییە. دەرد و ژانی بێبڕانەوە و گشتلەگشتە. ئەو ناسۆرەی دەدڵمدایە، ژانی داوەتە ئێسکانم و هەموو وجوودی داگرتووم. زۆر ژان دەکا؛ لێشم ڕوونە ئەو دڵخۆشی و نەشە و کەیفەی کە من هەمە، بەرهەمی ئەو داغ و کوڵ و خەم و ژانەی دڵی خۆمە. خەمی ئەوین، دەبێتە ئامیانی خۆشییانم. میجازی من، تەبعی شیعرم، زۆر لەخۆبایی و سەرکێش بوو. وەک بارگیری تۆسن دەچوو.

وشکەڕۆش بوو. سوپاسگوزارم بۆ خـودا، کـە بـۆم هاتـە سـەر ڕەدایـە و ئێسـتا باشـە. هەروەک چۆن ئیمامی عەلی، زولفەقاری دەخستە کـار و چـۆن دولـدولی بـۆ سـواری خۆی ڕاهێنابوو، تەبعی شیعرم ئەوێستا لە دەستی مندا ئاوا ڕامـە. تـەبعی شـیعرم کـە وشکەڕۆ و بەد ئاکار بوو، نازانم چی بوو بە سەبەب، کە وا بە جوانیی ڕایهێنـێ و ڕەوتی پێشووی پێ بگۆڕێ و ئەو ڕەوانییەی پێ ڕەوان کا. بە خوا سەیرە! ئەی ئافەریم ئەسپە قوڵە! ئۆباڵ بە ئەستۆم خۆشبەزی! لێم ڕوونە فێرکارەکەی تۆ، زۆرت دەگەڵ ماندو بووە تا فێری ئەو ڕەوتەی کردووی؛ ئەگینا چۆن هەر لە ڕێدا و بێ مامۆستا، گوزوگوممەت وا ئامـادە و حـازری هـەرکارێک دەبـووی؟! نـەخێر، چیرۆکـت چیرۆکـی گۆلەگـەنمی گەیشتووە کە دوو کژی سالی بڕی، تازە وەختی درەویەتی.



# داڤادل

١ يـــارێ مـــه پـــوڕ نیشـــان و ســـوڕ — ســـــیما ژ دوڕ دیم کەوکەبـــــه
ئـــەو لەبشـــەکەر نازکبەشـــەر — جەبهەتســـەحەر کاکولشـــەبە

٢ شـــــەب کاکوله خالفلفلـــــه — چینســـــونبله داڤـــا دلـــــه
مـــــن غەفلـــــەتێ دی قبلـــــەتێ — وەک مـــاهـ د تەیســـا غەبغەبـــه

٣ من دی ب خەف سوحبەت ب دەف — شاهێ نەجـــەف، فینجـــان د کـــەف
نوونێن ژ یەنگ بەردان خـــەدەنگ — وێ پـــوڕ ژ تـــەنگ شـــیرینلەبە

**مانای وشەکان:**

**بەشەر**: پێست؛ **جەبهـەت**: هەنیـه، تـوێڵ؛ **شـەوە**: بـەردێکی ڕەشـی بەنرخـه؛ **فلفـل**: ئیسۆتی ڕەش، ئاڵەت؛ **قیبلەتێ**: بەرانبەرم؛ **تەیسـان**: بریقـەدان؛ **غەبغـەب**: بەرچێلـه؛ **نەجـەف**: تەپۆلکە، ئاوگێڕەوە، دەفری گوشاد؛ **شـاهی نەجـەف**: ئیمـام عـەلی؛ **کـەف**: لەپ.

**پوختەی مانا:**

یاری من خـاڵ لـه ڕووی زۆرن؛ کـه هـەموویان زۆر دڵکێشـن. سەروسـیمای لـه دوڕ ئەکات. ڕوخساری وەک ئەسـتێرەیە. لێـو شـەکرینه. پێسـت ناسـکه. هەنیـەی وەک بەرەبەیانه. کاکۆڵی ڕەشی وەک شەوەن؛ وەک شەو وایە. خاڵەکانی وەک ئیسۆت دڵ دەسووتێنن. چین لە سەر چین، کەزیـەکانی- کـه وەک سـونبول بەبەرامـەن- داوی دڵن.

من لە نەکاو بەرانبەر چاوم پێ کەوت، بەرچێڵەی سپی وەکوو مانـگ لـه سـپیایەتیان دەبریقا. بە دزی دیتم؛ دەفەی پێ بوو. فینجانی مەی لە سەر دەستی، لێـوی دەوری

دەمی تەنگی، هەر شیرنایی لێ دەبارێ. برۆی وەکوو کەوانی یەنگ- کە وەک دوو نوون دەیاننواند- بەر دەسرێژی تیرانیان دام. هاوارم کرد: شاهی نەجەف، هانام بە تۆ! مەیگێڕ بە پیاڵەی زێڕەوە، وەرە و بادەکەت بگێڕە! ئەو دلکێشە جوان و شەنگە، وازی لە مەی خواردنەوەیە. با مەست ببێ و ڕوخسارە پڕ لە نوورەکەی ئاشکرا کا و وردە خاڵانمان نیشان بدا و لێوەکانی- کە مەی بەهەشتیان پێوەیە- بێتە بەرچاو.

٤ خاڵ و خەتێ شۆخ قامەتێ / مە ژ ڤێ کتێب و دەسخەتێ
هەردەم ژ نەو دل فەیزە ئەو / ئەڤ عیشق و سەودا مەوهەبە

٥ من بێ قەدار ئەڤ سیرِ ڤەشار / عیشقا غەدار سوهتی ستار
میهرا بوتان خاڵ و خەتان / سندووقەخان و مەقلەبە

٦ دیمێ ب خاڵ ئەو نوون و داڵ / ئیسمێ جەلال بەژنا شەپاڵ
یەکتا ئەلف نایێ وەسف / من عەقل تفلیمەزهەبە

٧ حەتتا نەمام ساڵەک تەمام / شیرینکەلام ما دامە جام
بی جەهدێ قەت تێن ئەمروخەت / هەرچیکو مەتلەب مەنسەبە

٨ دەرماندەییم، حەیران تەییم / پیرانەییم خوەش بەندەییم
زازا ب سیر دل ژێم ڤەکر / دەرحەق مە پڕ ئەرزان مەبە

٩ بەرگین گولێ ئەو میسکەلێ / هور-هور وەلێ دەرحەق «مەلێ»
بێپەردە و خوەش مەعدە و / یەک وەعدە و پوڕشەفقە بە

**مانای وشەکان:**

**سەودا**: ئەوین؛ **مەوهەبە**: بەخششی خودایی؛ **قەدار**: قەدەر، ئەندازە؛ **سیتار**: پەردە؛ **سندووقەخان**: سندووقخانە؛ **مەقلەب**: جێگەی دڵ؛ **داڵ**: شارەزاکەر؛ **ئیسمی جەلال**: ناوی خودا؛ **مەزهەب**: ئایین، ڕێوشوێن؛ **ئەمروخەت**: فەرمان و دەسنووس؛ **مەتلەب**: نیاز؛ **مەنسەب**: پلەوپایە؛ **زار**: ناڵە و هاوار؛ **ئەرزان**: بێموبالات، گوێنەدەر؛ **خوەش مەعدە**: ڕووخۆش، ڕەنگخۆش.

**پوختەی مانا:**

ئەوین بەخششە لە خواوە؛ چاوی دڵ ڕوون دەکاتەوە. من لە سایەی ئەوینەوە توانیم لە پەڕاوی جوانی -کە دەستنووسی خودای توانا و دەسڕەنگینە- بەژنی شەنگی ئەو نازدارە و خاڵومیلی سەر ڕوخساری بخوێنمەوە و هەڵیانبێنم. وا لەو ساوە هەموو دەمان دڵم پڕیەتی لە بەهرە و هەروا نوێشی بەسەردا دێت.

نهێنی سۆز و ئەوینم، لە سندووقخانەی دڵمدا شاردبۆوە. زیاتر لەوە کە دەتوانم دەرمنەبڕی؛ بەڵام چ دەکەی لە ئەوین؟ ئەو زۆردارە بوو بە ئاگر؛ سەرپۆشی لەسەر لاگرت و دڵیشمی دەگەڵ ئاگر دا و کردییە خۆڵەمێش و نهێنی هەموو بە با دان.

برۆکانی، ڕوخساری بە وردەخاڵی، بەژنی زراوی بەرچاوی کە لە بیچمی ئەلفە و بێهاوتایە لە دنیایە، نامەخوا ئەوندە جوانن، ناوی خوامان بیردێننەوە؛ کە چۆنی دروست کردووە. دڵم- کە خۆی وەک منداڵە و عەقڵم کاڵە و پێویستی بە فێربوون هەیە- هەتا بگات، وا وەک منداڵێکی بچووک کە تازە دەیبەنە فێرگە، خەریکی دەرسی ئەلفم؛ هێشتا تەواو ڕەوانیشم نەکردووە. ئەو یارە زمانشیرینەی کە فێرکاری دڵداریمە ساڵێک ڕەبەق گوێی پێ نەدام؛ تا هەر نەمام و لە ناو چووم. ئەوسا پیاڵەی دایە دەستم؛ بۆیە مەستم. ئەو ئازار و جزیادانەش، زۆر ڕەوا بوو. هەرکەس گەرەکیە و بەنیازە لە بارەگای ئەوینداریی پلەوپایەی وەدەس کەوێ، نابێ لای وا بێ بە بێکار، بە بێ هەڵسووڕ و تەقالا، بە هیچ دەگا و نامەی پایەی بۆ دەنێرن.

ئەی یار! بمبەخشە کە دەڵێم: جزیام کێشا و لە تۆڵەیدا پیاڵەم لە دەستی تۆ وەرگرت. مامڵە و سەودا لە بارەگای تۆدا نییە. تۆ هەمووت بەزەیی و ڕوحمی و ئێمەش تەنیا لەسەرمانە لێت وەپاڕێین. سەرگەردانتم؛ بە قوربانتم؛ هەژار و پیر و داماوم؛ کۆیلەی خۆتم. گریان وناڵەی نهێنی نیوەشەوان، دڵ و هۆشی لێ کردمەوە. لەبەرت دەپاڕێمەوە. بەسە ئیتر دەربارەی من، خۆ مەبوێرە و وردەخاڵێ- کە وەک میسک پرژاونە سەر پەلکی گوڵی لاڕوومەتت- لە منی نزار مەشێرەوە! پەردە لادە! بەزەییت بێ. تەنیا جارێک، دەگەڵ مەلای دڵداری خۆت ڕووخۆش و بەڵێنشیزین بە!

٩٥

# زولفان شه که

۱ ئــەی شــاهیدێ قودســی ڤــەکه بەنــدێ ژ نیقابــێ
تــا چەنـــد وە سەرگەشـــتە بمینـــین د حیجابـــێ

۲ بســکێن ژ حــەریرێ تــو ژ نــوو مــاوەرێ لــێ کــه
زولفــێن ژ عــەبیرێ شــه کــه باڤــێ خــەم و تابــێ

۳ قشتێن د خوە چین-چین بـده بـەر میسـک و زوبـادێ
تـــایێن د عیســـــابێ برەشـــــینن ب گولابـــــێ

۴ هەریــەک ب هــەزار رەنــگ ل بــەژنا تــە ســەما تـێن
خـــەمرێ و لـــەف و شـــەتری و تـــایێن د عیســـابێ

۵ مــن جــان یــەدێ بەیزایــە ژ ئیســان چ خەبــەر دەم؟
مـــن ئاتەشـــێ مووســـا دیيــە گولنـــارێ شـــەرابێ

**مانای وشەکان:**

**شەکه**: شانه بکه؛ **خەموتاب**: خواروپێچ؛ **عیساب، عیسابە**: پارچەی تـوێڵپـێچ؛ **لـەف**: پێچراو، لوولدراو؛ **گول**: پۆلوو؛ **نار**: ئاگر؛ **گولنار**: گوڵەهەنار؛ **ئیسان**: ئایسان.

**پوختەی مانا:**

ئەی دڵبەرە ئاسمانییەکەم! بەندی ڕووبەندەکەت وەکه با بتبینین و چیدیکه لە ژێر پــەردەی دڵـکوێریدا، مــات و ســەرگەردان نــەمێنین. گــوڵاوێکی عــارەقی ڕووت، لــەو بســکه وەک ئاوریشمانەت بپرژێنه. کەزیەکانت- کە هەموو بۆنێکی خۆشـیان لـێ بـڵاوە- بـه شـانه کـه. پەرچووکه سەرخشت بووەکانت- کە چین لەسەر چین وێستاون- بۆنی میسک و زەبادیـان با لێ بۆن بکەین. ئەو تاڵه بسکانەی کە وا کەوتوونە ژێـر هەنیـەپێچت، وە دەر خـه بـا بـۆنی گوڵاو بڵاو ببێ. بسکۆڵەی داهێڵدراوت، وردەکەزی لوولدراوت، تاڵ-تاڵه مووی بەر کـڵاوت،

تای گوڵینگەی سەر و شەدەت، لەو باڵایەی باڵاتەوە، سەما دەکەن.
چیم لە باسی مووسا داوە کە بە نیازی سەلکەبزووت، بەرەو ئاگرێک پەل بووە کە دایسا و ئاگر گوتوویە من خواتم و موجزاتی دەستی سپی، بە خەڵات لە خوا پێ گەیوە؟ من ئەو ئاگرەی کە مووسا، لە شیوی پیرۆزدا دیتی، لە بادەی ڕەنگ گوڵهەناری لێوی یارم خۆی شانداوم. گیانم- کە لە کوورەی نێڵی ئەویندارییدا قاڵ بووە- لە دەستە سپییەکانی مووسا، ڕۆشنترە و سەرتۆپی موجیزاتانە.

٦ میننەت کو ژ بەختێ خوە و تالع ب نەسیبم
حوسنا تەیە ئیرۆ ژ مەڕا چوویە نیسابێ

٧ عیشقا مە ژ بەر مەوج و عەجاجێ بوە دەریا
وێ زیروزەبەر کت مە ب دەست هیند و غورابێ

٨ نەهـ چەرخێ سپیهرێ ژ هەوایا تە و میهرێ
سەرگەشتە نە ئەو تێک ڤەمەرا شوبهێ حوبابێ

٩ وەک با دلەزینی تو کومێدێ دبەزینی
عومرێ مە عەزیزی ب خودێ بەس کە شیتابێ

١٠ یا پێ ب زیارەت بدە مە، یا سەرێ ئەنگوشت
دەستێ خوە مە ئاڤێتیە بێچارە ریکابێ

١١ من رێ ژ سەرابێ ب شەرابێ برو مونکیر
حەتتا ب ئەبەد تەشنە جەگەرما د سەرابێ

**مانای وشەکان:**

**نیساب**: ڕادەی زەکات لێ کەوتن؛ **نەسیب**: بەش؛ **عەجاج**: گێژەڵووکە و فەرتەنە؛ **غوراب**: جۆرێ گەمیەی بادەوەیی؛ **هیند**: هیندوو، هیندی؛ **هیندوو**: بریەتییە لە دڵڕەش و بێبەزەیی؛ **نەهـ**: نۆ؛ **حوباب**: بلقی سەر ئاو؛ **لەز**: پەلە؛ **لەزین**: پەلەکردن؛ **کومێد**: کوێت؛ **بەزین**: غاردان؛ **شیتاب**: پەلە؛ **ریکاب**: ئاوزەنگی؛ **سەراب**: تراویلکە؛ **مونکیر**: بێباوەڕ؛ **تەشنە**: تینگ.

**پوختەی مانا:**

جوانیت لە ڕادە بەدەرە. زەکاتی جوانیت لەسەرە. ئەی خوایە! زۆر منەتبارم کە من نەدار و هەژارم و لەوانەیە لە زەکاتی جوانییەکەت، بەشم بەرکەویَ و تێر بتبینم.

ئەوینی من بویتە دەریا؛ شەپۆل دەدا و دەکەوێتە فەرتەنەوە و گێژم دەدا. لەشم لە ناو ئەو دەریایە وەکوو گەمیەی بازۆ وایە و نەوسی چنۆک و بەدکارم، لە گەمیەوانی بێفەڕی هێندۆک، زۆر ئەحمەق و دلڕەقترە. زۆر دەترسم شەپۆلی دەریای دلداریم، لەپڕ سەروژوورم بکا و سەروماڵم تێدا بچیَ.

هەر نۆ نهۆمی ئاسمانیَ بە خۆرەوە، لە ناو دەریای ئەوینی تۆ، بە منیشەوە، وەک بلقی سەر ئاو دیار ئەدەن و سەرگەردانن.

چیتە ئەی یار! ئەی سووکەڵە سواری نازدار! بۆچ پەلەتە؟ بۆ ئەسپی کویَت ئاوا بە پڕتاو غاڕدەدەی؟ تۆ نازانی عومری منی و عومری هەرەخۆشەویستمی؟ تۆ بی و خودا، وا زوو مەڕۆ! پەلە کەم کە! کەس حەز ناکا عومری بە پەلە ببووریَ. منی هەژاری بێچارە، لە ناچاری، دەستم دە قولفی ئاوزەنگیت وەرێناوە. نەوەکا زوو بەجێم بێلی و بە سەرگەردانی و بە وێڵی بمێنمەوە. بەزەییم لیَ دریغ مەکە! یان ئەنگوستت نیشان بدە تا ڕایموسم، یان ڕێم بدە پای ناو ئاوزەنگیت ماچ بکەم.

هی وا هەیە بڕوای بە دلداریی نییە و لۆمەم دەکا. منیش ڕۆژێک وەک ئەوان بووم. لە دووی بەردەتراویلکە هەڵوەدا بووم. بەڵام وا من لە سەراب ڕزگارم بووە و لە جیاتی ئاو، بادەی ئەوین دەخۆمەوە. بیَ ئاگاش لە دەردی ئەوین، هەروا لە توونیان تل ئەدەن و لە عەزرەتی تنوکێک ئاو، جەرگیان ڕەشە.

۱۲ سیرپووش و قیبابا مەیە تەسبیح و موسەللا
وەر دابدرێنین ل خوە ئەو پەردە قەتابیَ[۱]

۱۳ لیللاە وەرە ساقی ب دو جامان مە جوان کە
موتریب ب دەفیَ ڕا بدە سێگاە و شەبابیَ

۱. باقی نوسخەکان: «وەر دابدرێنین ل خوە فیَ پەردە نیقابیَ»

۱۴ وەر گۆهـ بدە نایێ کو شیرین‌قەد د سەمایێ
پور حەل کرنە مەسئەلە ڤێ فەسلێ خیتابێ

۱۵ جاما نە شەکەرلەب ب مە دەت عەینێ حەرامە
فتوا وەنوما حاشیەیا شەرحا لوبابێ

۱۶ موفتی مە نەی و نایە و نەی قەولی قەدیمە
باوەڕ تە نەهن؟ گوهـ بدە بەر چەنگ و روبابێ

۱۷ نەردا مە چ بازی بنومێتن مە ژی رازێ
بەندین د سوئالێ و گوشادین د جەوابێ

۱۸ ئەز چوومە سەرایێ کو شیرین‌قەد د سەمایێ
گۆ ئەڤ نە «مەلایێ» مەیە؟ بێ‌پەردە بلا بێ

**مانای وشەکان:**

**قیباب**: گومەز؛ **موسەللا**: جێ‌نوێژ، بەرماڵ؛ **قەتابێ**: پسابێ، دڕابێ؛ **سیگاهـ**: سێگاهـ ئاهەنگ و هەوایەکە؛ **شەباب**: شمشاڵ، بلوێری ئاسنین؛ **فەسلی خیتاب**: قسەیەک کە هەموو قسان ببڕێت؛ **حاشیە**: پەڕاوێز؛ **شەرح**: ڕاوە؛ **لوباب**: کاکلان؛ **لوباب**: دڵان؛ **لوباب**: ناوی کتێبێکی شەرعە. ئەبولحەسەن محاملی- کە لە ٤١٣ی هەتاوی مرد - دایناوە و ئیمامولحەرەمەین، عەبدولمەلیک نەیشابووری (٤٢٠-٤٧٩ کۆچی) شەرحی کردووە. قەولی قەدیم لە شەرعی شافیعی، بە فتواکانی سەرەتایی شافیعی (موحەممەدی کوڕی ئیدریس (١٥٠-٢٠٤ کۆچی) دەڵێن. کە بەر لە چوونی بۆ عیراق (١٩٤) نووسیونی و کەمیان مان و لە برەو نەکەوتن؛ **نەرد**: تەختەی تاوڵی؛ **شەرح**: توێ، لا؛ **بەند**: شەشدەر؛ **گوشاد**: داشی تەنیا کە دەکوژرێ.

**پوختەی مانا:**

ئەم تەزبیح و دووگردەمان کردۆتە ڕازپۆشی خۆمان و لە پەنایان هەرچی ناڕەوایە دەیکەین. وەرە سوفی! با ئەو پەردەی نێوان خۆمان و خەڵکی‌تر پس-پس کەین و بدڕێنین. تۆ بی و خودا، مەیگێڕ وەرە! بە دوو پیاڵە لەو بادەیە جوانم کەوە. دەی با

کاکی بەزمگێڕیش، بە هەوای شمشاڵ و دەفە، ئاهەنگێکی سێگاه لێ بدا.

کابرای بەپرسیاری لاسار! تۆ ئەو کاتەی کە یارە بەژننەمام و شیرینەکەم دێتە سەما و دەنگی بلوێر دەویرێنێ، وەرە سەیرێ. بزانە چۆن مرقەت دەبڕێ و ناچارت دەکا کڕ ببی. مەڵێن بادە هەموو دەمان نارەوایە. بەڵێ ئەگەر یاری شەکرلێو نەفەرموێ بخۆرەوە، نابێ وەخۆین. بەلام ئەو بۆخۆی بیهێنێ و خولقم بکا، حەلاڵە وەک گەزۆی مازوو. باوەڕ ناکەن؟ دە بڕوانە شەرحی لوباب کە مەبەستم ناو تۆیی دلی دلدارانە؛ تا بزانن دلی دلدار فتوای چۆنە؟

مفتی ئێمە ئەوینداران، ڕێشاندەرمان بلوێر و شمشاڵ و سازە. نە قسەی کۆن و لەکارکەوتووی لە دلداریی بێخەبەران. باوەڕ ناکەی؟ گوێ لە دەنگی چەنگ و روبابێ بدێرە تا تێ بگەی.

نەردێنی ئەوین زۆر سەیرە. خراپیش بۆ دلداران بێ، قبوولیانە و زۆریش ڕازین. بۆ داوا کردنی مەبەست، شەشدەرمانە. ناشێ هەر دەم ببزوێنین. لە وەراما کە هەر بلێین بەڵێ قوربان، لە گش لا گوشادمان داوە و دلبەر چۆنی ئارەزووی بێ، لێمان دەدا و دەمانکوژێ و بەو دۆڕاندنەش دلخۆشین.

گۆوەند بوو لە بارەگای میر. یاری بەژنزراوی ڕەزاشیرینم سەمای دەکرد. کە منی دیت، فەرمووی: ئەوە مەلای خۆمان نییە؟ دەبا بێپەردە بێتە ناو.



## بەهیشتا ئیرەمێ

١ هێڤـی و تەوقـە دکـم ئـەز ژ خودانـا حەشـەمێ
وێ نیگـار و سـەنەم و پادشـەهـ و موحتەشـەمێ

٢ جارنـان بەنـدەیێ دلسـۆهتییێ مـەهجوور ڤـە ڤـەنێر
ب لـەبێ لـەعلێ شـەکەربار و ژ عـەینێ کـەرەمێ

٣ پرسـیارەک ل مـە جـارەک بکـە شـیرین دەهـەنا
کـو پەریهتێنـە فیراقـا تـە ل سـەر دەرد و غـەمێ

٤ ئەرنـە هودهـود ژ سـەبا بێـت وەکـی بـادێ سـەبا
دێ ژ هـیر کـو بگـەهت دەسـتی ڤـپەیکێ حـەرەمێ

٥ پرسیارا ل مـە بـت وەرنـە خـوە مـەهجووڕێ غـەریب
دێ ل کـی عـەرزە بکـم ڤـێ غـەم و دەرد و ئەلـەمێ

٦ شەرحێ حالێ غەمێ عیشـقا تـە ژ کـوو تێتـە نویسـین[1]
مـەدحێ ئەوسـافێ جـەمالا تـە کوجـا تـێ رەقـەمێ

٧ وێ مـەجالێ کـو جـەمالا خـوە تەجـەللا دکـری
لازمـە سـەجدە ببـین بـەر تـە د وێ گـاڤ و دەمـێ

٨ سەجدە بن بەر تە رەوایە د حـەمی مەزهـەب و دینـان
کـێ دبـت موشـریک و کـافر ژ وێ شـیرینفـەمێ[2]

٩ حاشەلیلەهـ کوو بکـم ئەشکەرەڤـان غوسسـە و دەردان
وەر بسـۆژم ژ غـەمێ عیشـقێ تـو سـەر تـا قـەدەمێ

---

١. کێشی ئەم لەتەبەیتە بڕگەیەک قورسە و کەسیش خۆی تێنەگەیاندوە!

٢. ئەمیان کەمە!

١٠ مـە ب سـەحرایێ ویسـالا خـوە دەرێـن تـو ژ خودێـرا
وەرنـە وەقتـە کـوو ببـین غەرقـەیێ بـەحرا عـەدەمێ

١١ ژ گولسـتانێ جـەمالا تـە گولـەک بێتـە زهـووری
ژ دنـێ دێ بچـتن نافـێ بەهیشـتا ئیرەمـێ

**مانای وشەکان:**

**تەوقە**: تەوەققوع، چاوەنۆڕی پێکهاتن؛ **خـودان**: خێـو؛ **حەشـەم**: کۆیلـە و دەسـت و پێوەند؛ **موحتەشـەم**: بـە شـەرم و حـەیا؛ **موحتەشـەم**: پایەبـەرز و گـەورە؛ **پـەریهتن**: داتولان؛ **هیر**: ئێرە؛ **پەیک**: قاسید؛ **حاشا**: بەجگە؛ **حاشەلیلەه**: نە بـەخوا، خـواگیر بم، موشکولۆزمە بم؛ **کوجا**: لە کوێ.

**پوختەی مانا:**

ئەی دڵبەرە بەنازەکەم! ئەی بـتی ڕەزاشـیرینم! ئـەی سـەرداری دڵ و گیـانم! ئـەی دەریای شەرم و حەیایە! ئەی پایەبەرزی بێوێنە، کە هەزاران دڵداری هەژار کۆیلەتن! لەبەرت دەپاڕێمەوە و هیوادارم دڵۆوان بی و بە دەنگ لالانەوەکەم بێی. جار-جـار بـە چاوی مەرحەمەت، نیوە ئاوڕێکی بەزەیی، وەسەر منی کۆیلـەی دوورەدیـداری خـۆت وەدەی. بەو لێوە ئاڵە تەنکانەی- کە لە تونگـەی شـەکر دەکـەن و شـیرنایەتیان لـێ دەبارێ- لێم بپرسی حاڵت چۆنە؟ تا بزانی کە لە دووریت، ژان و کوڵ دایانتولاندووم.
مەلا! قسان دەبزرکێنی؛ کـێ گـوێی لـە پاڕانەوەتـە؟ ئەگـەر شـنەبای بـەیانی- وەک پەپووسلێمانەکەی سولەیمانێ- لە نێوانی یار و تۆدا، نەیە و نەچێ، چۆن تۆ لێـرە لـەو کونجی خەمخانەیەدا دەستت دەگا بە قاسیدی بارەگای یار؟ کێ نامەی پڕ پاڕانـەوەت دەباتە حەرەمسەرای میر؟ ئەگەر سروە ئەو پیاوەتییەی بکردایە و بەزەی پێما بهاتایە و بیتوانیایە کارێک بکا، یار لە دەردم ئاگادار بێ و ئەوە خوایە، لێم بپرسـێ، کـارم باشـە. ئەگینا منی بێکەسی ئاوارە و سەرگەردان و وێڵ، باری دەرد و غەم و ئـازار، لـە لای چ کەسێ هەڵڕێژم و چۆن دەردی خۆم بە نامۆ و ئەغیار ببێژم؟
خوا ئەیزانێ هەزار ئەوندەش بسووتێم و لە ئاگری ئەوینێدا هەڵپرووزێم و سەرتاپام ببێتە قەقنەس، جگە لە یار، نهێنی دڵ لای هیچ کەسێ نادرکێنم.

دەسا ئەی یار! تۆ بی و خودا، بە دیدارێک لەو دەریای خەمەم دەربێنە؛ تا بە جارێک نەخنکاوم و نەفەوتاوم، بمخە سەر سارای هێمنی و رێم نیشان دە چۆن دەتوانم تۆ ببینم. لە گوڵجاری جوانی تۆوە، تەنیا چڵێک خۆ بنوێنێ، لە دنیادا ناوی بەهەشتی ئەو دنیا، لە بیر خەڵک دەچێتەوە.

جوانییەکەی تۆ، تەنانەت لە خەمَ و کوڵی منیش زۆر زۆرترە. ئەگەر باسی دەردی ئەوین، لە بەر زۆریی، زۆر دژوارە بێتە نووسین، لە توانای کام نووسەردایە پەسنی جوانی تۆ بژمێرێ؟ یان بە کتێبی بسپێرێ؟

لەو کاتەدا کە ڕوخسارت ڕوو بە دنیا خۆ دەردەخا، لەسەر هەموو کەس پێویستە دەستەولەجێ سوژدە بەرێ و کڕنۆش بکا. سوژدە بردن بەرەو ڕووی تۆ- کە تاقانەی لە جوانیدا- بە هەموو مەزەب و دینێک ڕاست و دروست و ڕەوایە. ئەو کەسەی بڕوا نەهێنێ و لای وا بێ کەس وەک تۆ دەچێ و شەریکت بۆ پەیدا بکا، هەر بە گفتی لێوە شیرینەکانی خۆت، کافرە و لە دین دەرچووە. چۆن کافر و دڵڕەشێکە و چەند خوێنتاڵە ئەو بێ تاڵەی بڕوای بە دەمی شیرینت نەهێنابێ؛ کە وێنەی نەبووە و نەدەبێت.

١٢ گەر ببم بەر تە سوجوودێ د دەما کەشف و شوهوودێ
م ل دل دێ بدرت پەرتەوێ نوورا قیدەمی

١٣ «قِبْلَتی وَجْهُکَ فی کُلِّ صَباحٍ وَمَساء»
ب دو ئەبروویێ تە جانا دخورم ئەز قەسەمێ

١٤ موویەکی ئەز ژ تە نادم ب دوسەد زین و شیرینان
چ دەبت گەر تو حەسێب کی مە ب فەرهاد و مەمێ

١٥ تە فەرەنگ و عەرەبستان و مەجەر تێک ستاندن
جەلەوێ خوەش ڤەگەرین هاتییە نۆبا عەجەمێ

١٦ ما ژ دیوانێ سەعادەت سەکری شوبهێ «مەلایێ»
تو ب نافێ م گەدایێ بکشینە قەلەمێ

**مانای وشەکان:**

**کەشف و شهود**: دیاریدان و حازر بوون؛ لە زاراوەی سۆفیاندا بەو دەمە دەڵێن کە دەگەڵ خوا تێکەڵ دەبن و لە نیزیکەوە خوا بە چاوی گیان دەبینن؛ **قیدەم**: هەرەپێشوو، ئەزەل؛ **قِبْلَتی**: ڕووگەی من؛ **وَجْهُکَ**: ڕوخساری تۆ؛ **فی کُلّ**: لە هەموو؛ **صَباح**: بەیانی؛ **مساء**: ئێوارە؛ **قەسەم**: سوێند؛ **زین**: دڵبەری مەم، کە دڵبەر و دڵدارێکی کوردی بەناوبانگن و بەیتیان بە کرمانجی و سۆرانی هەیە و شیخ ئەحمەدی خانی (١٠٦١- ١١١٩ ک.م) کتێبی بە شیعری لەو بارەوە بە ناوی «*مەموزین*» داناوە و بە زۆر زمان وەرگەڕاوە و لە دنیادا بەناوبانگە. هەژاریش ئەوەکەی خانی بە سۆرانی وەرگێڕاوە و چەند جارانیش چاپ کراوە. **شیرین**: ژنی خوسرەوی پاشای ئێران بوو؛ فەرهاد ناوێکی کوردی کەڵهوڕی بەردبڕ، شەیدای ببوو. خوسرەو پێی گوت: شیرینت ئەدەمێ، بەو مەرجە کەژی بێستوونم بۆ کون بکەی. فەرهاد بێستونی کون کرد و بە تەما بوو شا بەڵێنەکەی پێک بێنێ. بەلام درۆی دەگەڵ کرا و قاو داخرا کە شیرین مرد. فەرهاد لە تاوی شیرینێ، هەر بەو قوڵینگەی دەستی خۆی، هەستوخوستی لە خۆ بڕی و لە ڕێی گیانە شیرینەکەی، گیانی شیرینی بەخت کرد. پادشای بەدفەڕ، سەرەڕای بێناموسییەکەی، قەتڵیشی کرد.

چیرۆکی فەرهاد و شیرین، لە لایەن دوو بوێژی کوردەوە هۆنراوەتەوە: یەکیان «**ئەلیاسی نیزامی**» کە لە نێوان سالانی پلەی چوارەمی سەدەی شەشی کۆچی-مانگی، لە مەڵبەندی گەنجەی ئاران، پای ناوەتە ناو دنیاوە و لە یەکەمین دەیەی سالەکانی چەرخی حەوتەمدا مردووە. شیرین و فەرهادەکەی ئەو بە فارسییە و لەڕاستیشدا دادی داوە و هەموو بوێژ و ئەدیبی فارسی زمانی بۆڕداون. دوهەم «**خانای قوبادی**» کوردی گۆرانە. کە مێژووی ژینی نازانین. بە کوردی هۆندوویەتەوە و چاپ کراوە و نموونەیەکی بێوێنەیە. **مەجەر**: مەجارستان؛ **عەجەم**: خەڵکی ئێران، خاکی ئێران؛ **سە، سەح**: بیستن؛ **سەکری**: بیستراو.

**پوختەی مانا:**

من هەرکاتێ لەگەڵتا ڕووبەڕوو دەبم و چاوم بە دیمەنی پاکت پیرۆز دەبێ و سوژدەی سوپاس دەبەمە بەر ئەو بەژن و بالا بەرزەی تۆ، نووری هەرە پێشینە و لە دوا

نەهاتووت، تیشک ئەداتە دڵمەوە و تاریکیم لەبەر دەڕەوێ. هەموو بەیانی و ئێواران، سوژدە بەرەو میحرابی برۆی تۆ دەبەم. ڕووی تۆ تەنیا ڕووگەی منە. گیانە سوێندم بە دوو برۆت، کە من تاڵێک لە مووی کەزیت، بە سەد جوانی وەکوو زین و شیرین ناگۆڕمەوە. دەیسا خۆ قیامەت ڕا نابێ کە تۆش ئێمە بە فەرهاد یان مەم بزانی و بە تیلەی چاو، لێم بڕوانی. باسی جوانیت عەرەبستان و فەرەنگ و مەجارستانیشی داگرت. ئەمجارە نۆرەی ئێرانە کە بە جوانی خۆت، بەر خۆی بدەی. جڵەوی ئەسپت بادەوە بەرەو ئێران! با لە جوانیت بێبەش نەبن.

شیاوی باسە: عوسمانییەکان لە ڕۆژگاری ژیانی مەلا، عەرەبستانیان گرتبوو؛ مەجارستان و زۆر بەشیان لە ئورووپا لە دەستا بوو. هەمیشەش دەگەڵ ئێراندا، لە شەڕ و مشتومڕدا بوون. وەک مەجنوونەکەی عامیری، کە لێیان پرسی دەربارەی ئیمام عەلی و معاویە تۆ چی ئەڵێی؟ حوکم بە کامیان ڕەوایە؟ گوتی: ئەگەر ڕاستت دەوێ، حوکم شیاوی لەیلای منە و بۆ هەمووکەس ناڕەوایە. مەلای دڵداری سەلمایەش، دەڵێ: داگیر کردنی دنیایە هەر بۆ جوانیی ئەو دڵبەرەی من ڕەوایە و تا ئەو هەبێ، هیچ سوڵتانێک ڕێی ناکەوێ بڵێ من هەم.

لە بارەگای بەختەوەریی- کە سەراوپەردەکەی تۆیە- لە دەفتەری سیایی ناوی بەختەوەران بە دیدارت، بیستووتە لە شوێنێک ناوی کۆلکەمەلایەک نووسرابێ؟ ئەگەر هەبوو، ئەوا منی پارسەکەی بەر بارەگاشت، لە پەنا ئەودا بنووسە!

یان: زۆر ناجۆرە ناوی گەدا و کۆلکەمەلا دە دەفتەری تۆدا هەبن. ڕێیان ناکەوێ بێنە ناو. ئەگەر بیستت کە ناوی منی پارسەک و کۆلکەمەلا، لە دەفتەری دڵدارانتدا نووسراوە، بۆخۆت قەڵەمیان بکێشە! هەر ئەو قەڵەم لێ کێشانەت، کە بەو دەستە ناسکانەت دەیانکێشی، گەورەترین مایەی بەخت و تاڵحمانە.



## کوڤانا گیان

| | | |
|---|---|---|
| ١ | غەما عیشقێ پەرێهتم ئەز<br>سەراسەر تێک بەهێتم ئەز | حەبیبا غەمرەوین کانێ<br>ژ دەردێ فەرق و هیجرانێ |
| ٢ | فیراقا دلبەرا رندە<br>موسلمانەک درێ من دە | بەهێتم هەر وەکی فندە<br>خەبەر بت بالێ سولتانێ |
| ٣ | خەبەر بت بال شەکەرخایێ<br>کو میرە بەلکە بیر نایێ | شەپال و خووب و زیبایێ<br>ئەسیرەک وێ د زیندانێ |
| ٤ | ئەسیرم لەرزە و تاڤێ<br>ژ حەبسا وێ قە من ناڤێ | نە تاقەت ڤێ نە پەروا ڤێ<br>بکم فەریاد و ئەفغانێ |
| ٥ | م ناڤێت ئەز ب فریاد کم<br>سەحی دێ شوبهێ فەرهاد کم | ل زولما دلبەرێ داد کم<br>بدم ڕووحێ ژ کۆڤانێ |
| ٦ | ژ کۆڤانا تە شیرینێ<br>درێژم هێستریێن خوینێ | دنالم شوبهێ گۆیینێ<br>وەکی تاڤێ د بارانێ |

**مانای وشەکان:**

**پەریهتن**: برژانی لە ڕادە بەدەر؛ **بەهیتن**: توانەوە و چۆقان؛ **رند**: جوان و لەبار؛ **فند**: مۆم؛ **بال**: نک، کن، لا؛ **لەرزە و تاڤ**: تا و لەرز؛ **پەروا**: تابشت، ترس؛ **فەریاد و ئەفغان**: داد و هاوار؛ **سەحی**: بەڕاستی؛ **گۆیین**: باڵدارێکی شەوبێدارە و هەر دەناڵێ؛ **تاڤێ بارانێ**: تاوی باران، ریژنە؛ **هێستر**: ئەسرین، هرس؛ **کۆڤان**: عەزرەت، دەرد و کوڵ و کەسەر.

**پوختەی مانا:**

گڕەی ئەوین وای برژاندم، لە کەڵک بووم. بە تینی دەردی جودایی، هەموو لەشم تواوەتەوە و داتولاوە. لەو توانەوەی لەشی کزم- کە زەردیشە و وەک مۆم دەچێ- دەکرێ شەمم لێ درووس کەن و داگیرسێم. خۆشەویستی خەمڕەوێنی لە جوانیدا بێ تا و بێ وێنە لە کوێیە دەفریادم بێ؟ کوا موسوڵمانێ خێرەومەند تووشم ببێ و لە ڕای خودا، خۆ ماندوو کا؛ دەنگ و باسی کەساسیی من، بەو سوڵتانی گش جوانانە بگەیەنێ؟ ئەو سوڵتانی مەڵبەندی هەموو نازداران، خونچیلانە و خوێن‌شیرین و جوان و باش و بەئاکارە و لە کاتی قسە کردنا، شەکری لە زاری دەبارێ. موسوڵمانەکەی خێرەومەند، بەو نیشانانەی من دەڵێم با بیناسێ. ئەو لە سەر جوانان ئەمیرە و کاروباری دڵبەران و دڵداران گشتی لای ئەوە. سەری قاڵە؛ لەوانەیە هەر لە بیریشی نەمابێ کە یەخسیرێک لە زیندانی دلاندا، بێدەرەتانە. بەڵێ ئەو یەخسیرە منم. سەرەڕای دیلی، لە زۆر تای تاسە و ئارەزووی تابەتای ئەو کەزیە بەلەرزانەی ئەو، تووشی تووشیی و لەرز و هەڵچۆقانیان کردووم. هێز و تابشتم نەماوە. ناشمەوێ لە بەندی ئەودا هاوار بکەم. بڵێم زوڵمم لێ کراوە. ڕاستت دەوێ من دەمەوێ دەرسێک لە فەرهاد فێر ببم: گیانی خۆم لە عەزرەت دینی دیداری یاری شیرینم بە قوربان کەم. لە عەزرەت تۆی گیانی شیرین، شەو هەتا ڕۆژ، وەکوو گوێین دەناڵێنم. وەک ڕێژنەی تاوی بارانێ، فرمێسکی خوێن، لە چاوانم دادەبارن.

**٧**
وەکی بەرقا بوهاری ئەز | ژ دەست چەشمێن خوماری ئەز
دکم فەریاد و زاری ئەز | مەگەر جارەک کی ئیحسانێ

**٨**
تو پوڕ ئیحسان و خوەی نەشمی | ل دەرویشان ئا ب خەشمی[1]
چبێتن گەر بنێڤ چەشمی | نەزەرکی توولا ئاستانێ
(یان: تو ل ئاستانێ)

---

١. شیاوی گێڕانەوەیە: شەرحدەری ئەم دیوانە بە عەرەبی، نووسیویەتی: «شێخ عەلی فندەکی» گوتی: لە خەوما شێخی جزیریم چاو پێکەوت. گوتم قوربان، تۆ «ئا ب خەشمی»ت کە فەرمووە، من لام وایە «ئا» یەکە زیادە؛ تێ ناگەم. مەلا فەرمووی: تۆ نازانی! «ئا» لە مانای «ئارێ»دایە و زۆر لە کورد دەکاری دێنن. «هەژار»

| | | |
|---|---|---|
| ٩ | ل مـــن پرســـەک ب دلـــداریٚ<br>ڤـــە وەســـــتایم د فـــــەرواریٚ | دبـــت هـــــەمپایێ دیـــــداریٚ<br>ل عەبــدیٚ خــوە کــە فــەرمانیٚ |
| ١٠ | د فــــەرمانیٚ ڤـــە وەســــتایم<br>وەکـــی گـــۆی بیٚســـەروپایم | دبەنـــــــدا خدمـــــــەتیٚ دایم<br>هـــەمان لیٚــدی تـــو چـــەوگانیٚ |
| ١١ | ل بـــەر چـــەوگان و کاشـــوویان<br>دبـــازم هــــەروەکی گوویـــان | ژ دەربـــا تـــورک و هینـــدوویان<br>دەمـــا ئـــەو تینـــە مەیـــدانیٚ |
| ١٢ | دەمــا ئــەو تــیٚن ب بــازی تــیٚن<br>چ مووکـــارن؟ د تـــازی تـــیٚن | دگــەل قەوسـیٚن شـیرازی تــیٚن<br>ب دەعــــوا تیٚنـــــە لیٚکـــدانیٚ |
| ١٣ | ب دەعــوا تــیٚن مــە یــەغما کــن<br>ســـواش و فیتنــــەیان راکـــن | د عامـــیٚ شـــوور و غـــەوغا کـــن<br>ب شـــیر ئـــەو تیٚنـــە تالانـــیٚ |
| ١٤ | دو تـــالانچی دمەشـــهوور تـــیٚ<br>د تیٚکـــەل زولمـــەت و نوورتـــیٚ | ژ مەعــدەن عــەینیٚ کــافوور تــیٚ<br>مـــــە کـــوفریٚ دی د ئیمانــــیٚ |

**مانای وشەکان:**

**خۆی**: خێو؛ **خەشم**: ڕک؛ **نەشم**: ناوی بەرز و پایەی بــەرز؛ **هــەمپا**: بەرانبــەر؛ **فــەروار**: فەرمان؛ **هەمان**: ئیتر ئامادەیە؛ **کاشۆ**: دای سەرخواری گەمــەی شــەقێن؛ **دبــازم**: غــار دەدەم؛ **بازی**: گەمە؛ **تازی**: ڕووت؛ **مووکار**: زۆر تیژ کە موو هەڵدەگریٚ؛ **دەعــوا**: شەڕ؛ **یەغما**: تالان؛ **عامی**: ئاپۆرەی خەڵک؛ **شوور و غەوغا**: پشێوی و هەرا‌ـهــەرا؛ **سـواش**: شەڕ و دمەقاڵە؛ **مەعدەن**: کان؛ **عەین**: کانی.

**پوختەی مانا:**

لە دەست ئەو چاوە مەستانەت، کە لەودیوی پەچەی رووبەندەوە هەر گرشە-گرشـیانە و وەک برووسکەی هەوری پــڕی مــانگی گــوڵان، دەترووســکێن و تریشــقە و گرمــە و

بارانیان بە شوێندا دێ، ئەوا منیش وەکوو هەوری بەهاران، نالە_نالم دێ و بە تاو ئەسرین دەبارێنم؛ ئەسرینی خوێن. دەڵێم جارێک بە بارێکدا، بەزەت بە منی هەژاردا بێ. دەزانم هەر پێم بزانی، بەزەت دادێت. ئەتۆ زۆر چاک و پڕچاکە و دلۆڤانی و لە ڕاست ڕووت و گەدایان ڕک لە دڵ ناگری. هەموو ئاواتی من هێندە: کە جارێکیان، لە گۆشێکرا، بە چاوی کز، لە ئاسانەکەت بنۆڕم. تۆش بە تیلەی چاوەکانت، تولەی بەر ئاستانەی خۆت تماشا کەی. ئەگەر وا کەی، چ ناقەومێت و بەو دیدارە، دیواری کابە ناڕووخێ. ئەگەر هەر ناشتەوێ بمبینی، پرسێکی لە حالم کە؛ کە پرسیارت لە من، کەمتر لە دیدارت نییە بۆ من. ئیتر دیدارە یا پرسیار، بە دەست خۆتە. ئەمن کۆیلەم؛ لە خزمەتدام. چ فەرمانێک بدەی، سازم بەجێی بێنم. وەکوو گۆی بازی ئامادەم لەبەر شەقتا. سەری سەرکێش و پای ڕاکردنم لا نین. بە گیان و دڵ، بە ئاواتم بە گۆچانت خەلاتم کەی. چ خۆشە دڵ وەکوو گۆیەک لە مەیدانا و دوو یاریکەر، یەکێ چاوت- کە وەک تورکان، لە حاند بێ دەستەلاتان زالم و تیژن- ئەویتر، کەزیەکانی ڕەنگ شەوەت- وێنەی چەتەی هیندی بێئامانن- وەبەر کاشۆی دەن و ڕایدەن!

گەلێک جار، پرچ و بسکی تۆ، دەگەڵ چاوت، بە شیری خواری دوو بڕۆوە- کە وەک جووتێک کەوانی کاری شیرازن و تیری مژۆلان داوێژن- دێنە یاری شیر و تیر و کەوانبازی. بەلام چەند شیری مووکارن و لە کالانیش دەرکشاون. دوو شیری برۆت، بە ڕێژنەی تیر دەگەنە یەک؛ پیاو لای وایە شەڕیان لە ناو خۆیاندایە. کەچی نەخێر کێشە بۆ دڵی مەلایە؛ هاتوون تالانی دڵ بکەن؛ هەرا و ئاژاوە بەرپاکەن؛ قیامەت لە دنیایە ڕاکەن؛ ڕێزی دلان بشێوێنن؛ هەرا و هوریا لە ناو خەڵکا بنێنەوە. سەرتەریدەی ئەو دزانەش، چاوەکانن؛ هەر ئەوانن بۆ تالانی دڵی هەژار، بەناوبانگن. شیری برۆ وەکار دەخەن؛ هەڵدەکەنە سەر دلداران دڵیان دەبەن. ئەمما چەند تالانچی جوانن؟ دلدار حەز دەکا بیانبینێ و سەد جار گیانی بدورێنێ. سپی و ڕەشن؛ واتا دوو چاوی بەلەکن. سپیایەتی لە کانی کافوور سپیتر؛ ڕەشییەتییەکەش وەکوو ئەو تاریکستانەیە ئاوی حەیاتی تێدایە. سەیرە چلۆن تاریکی و نوور گەیونە یەک؟! ئێمە کە لێیان دەڕوانین، کوفرمان دێتە بەرچاوان، کە دەناو خواناسیندایە.

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ | مــه كــوفرێ دی د ئیسـلام بـێ | ژ شــەوقێ زولمـەت و شـام بـێ |
| | ژ زولفــان عەنبــەرێ خــام بــێ | كـــەنارێ خـــال و نیشـــانێ |
| ١٦ | دو زولفـــێ عەنبەرئەفشـــانن | دو لــــەعلێ شەككەرســــتانن |
| | دو چــەشمێ سـیحرێ فــەتتانن | دلــێ مــن وان خــەدەنگ دانــێ |
| ١٧ | دلــێ مــن وان خــەدەنگ لــێ دا | د بورجــا رۆژ و شـــەب تێـــدا |
| | ل ســـەلوا مـــار لڤـــین پێـــدا | ب مەســـتی هاتـــە ســـەیرانێ |
| ١٨ | ل ســەلوا مــار ب لــەف هــاتن | د بورجان تیپ ب سـەف هـاتن |
| | ژ بــاتین تــیر ب خــەف هــاتن | ژ بـــەر بەنـــدا گریبانـــێ |
| ١٩ | ژ بـــەر بەنـــدا نیقابـــا وێ | ل بـــەر فـــەتلا عیســـابا وێ |
| | جــــــەمالا ماهتابــــــا وێ | مــە بــەدرەک دی دســەیوانێ |
| ٢٠ | هــەیف بــوو ئــەو د زولماتــێ | دخـــۆم ســـوندێ ب ئایاتـــێ |
| | کـــو نـــووری دا ســـەماواتێ | ئەســەد هــات راســتێ میزانــێ |
| ٢١ | قەمــەر هــات راسـتێ پــەروینان | ژ بــۆ خــەملێ شــەمال ئینــان |
| | م نێرگـــز دیـــن د نەســـرینان | د نـــیڤ باغـــێ گولســـتانێ |
| ٢٢ | د باغــێ مــن مــەدام دل تــێ | جنەسری و سۆسـن و گـول تـێ |
| | بنـەفش و تــەرح و سـونبول تــێ | چەڤـین سـەر شـوبهێ ریحانـێ |
| ٢٣ | ل دیمــێ ســونبولان ســەردان | چەڤـین سـەر سۆسـن و وەردان |
| | ل ماهــێ عــەقرەبان گــەردان | د ســـەردا ئابـــێ حـــەیوانێ |
| ٢٤ | ژ عیشـقێ لـەو «مـەلا» خەسـتە | ژ حـــەرفا بادەیـــێ مەســـتە |
| | ژ هـــۆش و عـــاقلی رەســـتە | ل دەر گۆشـــێن د مـــەیخانێ |

**مانای وشەکان:**

**شام**: شەو؛ **ئەفشان**: بڵاوکەرەوە؛ **فەتتان**: جوانی دڵشێوێن؛ **لڤین**: جــووڵان، بــزووتن؛ **لەف**: پێچ؛ **تیپ**: کۆمەڵێکی لەشکر؛ **گریبان**: بــەرۆک، پێســیر؛ **فــەتل**: لێــک هــاڵاو، بادراو؛ **سەیوان**: سایەدەر؛ **سەیوان**: خەرمانە؛ **خەمل**: ڕازاندنەوە، ڕازانــەوە؛ **جنەسری**:

دار خورمایەکی نایابە؛ **چەڤین**: خوار بوونەوە، چەمانەوە؛ **گەردان**: لە گەردان، بەدەورەدا؛ **خەست**: تیژ و تۆخ؛ **خەستە**: نەخۆش و ماندوو؛ **حەرف**: کەنار؛ **حەرف**: تیژ لە چێژەدا؛ **حەرف**: پیت؛ **رەستە**: ڕزگاربوو؛ **دەرگووش**: جۆلانەی بە گوریس و پەڕۆ کە نەخۆشی تێدا دەحاوێننەوە.

**پوختەی مانا:**

بۆچی دەڵێم کوفرم لە ئیسلامدا دیوە؟ زولفی ڕەشی -کە عەنبەری خاو بەردەگرن- هاتبوونە دەوری خاڵانی و دەتگوت تاریکایی شەوێ، دەوری ڕوخساری وەک ڕۆژی بەتیریژی یارمی داوە. ئەو ڕوخسارە لە پاکیدا، وەک ئیمانی موسوڵمانی خوداناسی بەڕاستییە. زولف و خاڵە ڕەشەکانیش، وەکوو کافر دڵیان ڕەشە. ئاوا من ئیسلام و کوفرم پێکەوە دین.

پرچی عەنبەر دەپرژێنن، لێوەکانی هێند شیرینن، تۆ ئێژی بوونە شەکراوا. چاوی جادووی دڵشێوێن، هەر ئەوان بوون دڵی منیان بەر تیران دا.

لەو مزلگەی ئاسمانی ڕوخساری پاکڕا -کە وەک ڕۆژ لە ناو شەودایە- دڵم تیرەباران کرا. دوو ڕەشماری کەزی یارم، لە بالای ڕاستی وەک سەولی، جوولانەوە. وەک سەرخۆشان تلیان دەدا و دەیانڕوانییە ئەم تیرهاویشتنەی چاوان. جەرگ و دڵپێکانی منیان، بە خۆش و سەیر دەزانی و سەیریان دەکرد. کەزی ڕەشمار، هەر دوو نەبوون؛ زۆر بوون. ڕیز بە ڕیز و تەکووز وەک تیپی لەشکری ڕاهێندراو، هاتنە پێشێ. هێندێکیان لە گەردن هاڵان و سەریان گەیاندە سەر بەرۆک. لەبەر دوگمە و بشکۆژی سەر بەرۆکییەوە، بە دزییەوە، زۆر تیر دابارییە هەناوم.

لە بن بەندی ڕووبەندیدا، لە ژێر ئەو بسکە لوولانەی- کە بەر تووێڵپێچی کەوتبوون- جوانی هەنیەی وەکوو تریفەی مانگەشەو، دەبریقاوە. هەنیەی یارم، وەک مانگی چاردەشەوێک دی؛ کە هەنیەپێچ خۆی لێ کردبووە خەرمانە.

ڕوخساری دەناو بسکاندا، وەک مانگ لە ناو تاریکاییدا، دەینواند. بە ئایەتان سوێندێ دەخۆم کە تیشکی ڕوخساری یارم، ڕووناکایی دایە ئاسمان. بورجی ئەسەد، خۆی بەرانبەر بە میزان کرد. وەک چۆن چاوە مەستەکانی، لەڕاست برۆی وەک تەرازووی نازکێشانێ، خۆ دەنوێنن، مانگ و هێشووی ئەستێرەی کۆ، هاتنە پاڵ یەک. تا وەک ناو

چەوانی یار و لیزگەمرواری سەرتوێلی، خۆ نیشان دەن. کۆ ئەستێرەی بورجی میزان و ئەسەد و پێرو، مانگیش پێرا. هەریەک مۆمی خۆی هەلکرد و لالەبەدەست بە بەهانەی ڕازاندنەوەی ئەو ڕوخسارە، هاتنە دیدار. کە لە خۆیان جوانتریان چاو پێ بکەوێ.

ئەدی منی دلداری ژار، کە پرکولم و دلم بۆ گول دەکورکێنێ، لەو بەژن و بالا و ڕوخسارە، چیم بەدی کرد؟! نێرگسی کالی چاوانی، لە کەناریش لاجانگی سپی وەک نەسرین، لە ناو باغچەی بەهەشتی ئەو ڕوخسارەدا- کە دلم باغەوانییەتی و لێی دەرناچێ -بەژنی وەک داری جنەسری- کە خورمایەکی زۆر شۆخ و زۆر بەرشیرین و نایابە- هەلوێستابوو؛ هەر شیرنایی لێ دەباری. بسکی بۆنخۆشی وەک سوێسن، گولی ڕوومەت، وەنەوشەی خال، چلی ڕیشووی سەر و شەدەی، گولی سملی پەرچووکەکەی، گشتی لە ڕیحان بۆنخۆشتر، لە ڕەشەریحانە ڕەشتر، نووسەری قودرەتی خودا، لە شێوە خەتی ڕیحانی، نووسیبوونی و سەری خوار کردبوونەوە. کەزیە بۆن سونبولەکانی، سەریان لە ڕوخساری دەدا. بە سەر بسکی وەک سوێسنیدا چەمابوون و گشت لا دەوری پەڕەی گولی سەر ڕوومەتی ئالیان دابوو. کەزیەکانی سەرچەماوەم، وەک دووپشکی لە عەنبەر دروست کرابن و هاتبنە گیان، بەدی دەکرد؛ کە پاسی لاجانگی دەدەن. ئەو لاجانگەی ئاوی ژیانی تێدایە و لە دەوری مانگیش دەسووڕان؛ کە مانگ لە بورجی عەقرەبدا، زۆر بەتیشکە. بۆیە مەلا ئەمڕۆ لە باسی دلداریی، هێندە خەستە و قسەکانی هێندە کرژن؛ چۆنکە بادەی توند و تیژ و خەستوخۆلی ئەوینی دەرخوارد دراوە و مەست و کەلەلا کەوتووە. لەو شتانەی کە ناو نراون عەقل و هۆش، ڕزگار بووە؛ هێزی بزووتنی نەماوە. ئەوا لە ناو مەیخانەدا، خراوەتە جۆلانەوە و ڕایدەژێنن؛ بەپیری، مندال بۆتەوە!

«مەحوی» دەلێ:

لە پێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکوو مِندال

لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێ، من تازە پێ دەگرم!



# سەمەن سایان

۱ ب حوسنا «احسَنِ التّقـویم» ب زاهـیر سـوورەتێ زاتی
نـەزەر دی «عَلّـمَ الاَسّـماء» و بـاتین عـەینێ میرئـاتی

**مانای وشەکان:**

**احْسَن**: باشترین، جوانترین؛ **تَقْویم**: ڕاسـت و ڕێـک‌کردن، هەڵخسـتنەوە؛ **سـوورەت**: وێنە؛ **زات**: خۆ؛ **زات**: بریەتییە لە خودا؛ **عَلَّـمَ**: فێـری کـرد؛ **اَسْماء**: نـاوان؛ **زاهـیر و باتین**: دەر و ژوور؛ **عەین**: هەر خودی؛ **عەین**: چاو؛ **عەین**: خۆر؛ **میرئات**: ئاوێنە.

**پوختەی مانا:**

خوا فەرموویە: «ئادەم نوێنەری خودایە لە سەر زەوین؛ هەموو ناوێکیشـی فێـر کـرد.» فەرمووشیەتی: «ئێمە مرۆمان جوانترین و ڕێک‌وپێک‌تر لە هەرشتێک هەڵخسـتەوە.» پێغەمبەری خواش(د) فەرمووویە: «خوا ئینسانی لە سەر وێنەی خۆی ساز داوە.»
جا ئەگەر لە دڵبەری من ورد ببیەوە و ئاگایەکت لـەو ئایـەت و فەرموودانـەی خـودا و پێغەمبەریش هەبێت، زۆر شتت لێ حاڵی دەبێ. لە ڕواڵەتەکەی بڕوانە و ئەو جـوانی و ئەو دڵڕفێنییەی بێنە بەرچاو! تا بزانی ئەو کەسەی ئەوی لە شکڵی خۆی هەڵخستەوە، چۆن جوانێکە و چۆن هەر تەنیا ئەوە کە دەبێ بپەرسترێ و کەسی‌تر نا. خۆ ئەگەر بـە چاوی دڵت، وردتر لە ڕواڵەت بڕوانی و قووڵتر بچیتە ژوورەوە، تێدەگەی کە جـوانی و ڕێکی ئەندامی ئەو دڵبەرەی من، جگە لە ئاوێنە نییە، کە بەرەو خۆر ڕاگیراوە و جوانی سیما و بەژن و بالای، تیشکێکی جوانی خودایە داویەتەوە.

۲ د پابووسا سـەمەن سـایێ م نێـری بـەژن و بالایـێ
«لَعَلّـی اَبْلُـغُ الاَسـباب، أَسْـبابَ السَّـمواتِ»

**مانای وشەکان:**

**بووس**: ماچ؛ **سەمەن**: گوڵی یاسەمەنە؛ **سا**: وشەی پاش‌بەندە، بەمانا: وەکوو، وردکـەر، خۆڵێدەر دێت؛ **سەمەن‌سـا**: وەک یاسەمەن بەرپێ دەر، خـۆ لـە یاسـەمەن‌دەر؛ **لَعَلّـی**: شایەتا مـن؛ **اَبْلـغُ**: بگـەم؛ **اسـباب**: لایـەن و پێ‌پیلکـە و کـەنار؛ **سَـموات**: ئاسمانـان، بڵندایيان.

**پوختەی مانا:**

ئەو پاوپلە ناسکانەی- کە یاسەمەن ئەگەر بۆی بلوێ ماچیان کا و خۆیان لـێ‌دا، شـانازی بە بەختی دەکا و هەمیشە بەو ئاواتەوە لە ڕێبازی کەوتۆتەوە- پەلامارم دا ماچیان کەم و خۆم خستە سـەر پێڵاوەکـەی. لـەو خـوارەوە خێسـەم لـە بـەژن و بـاڵای کـرد و تـێم هەڵڕوانی. دڵی نەزان، ئارەزوویەکی بە دڵدا هات کە: بەڵکوو ڕۆژێـک لـە ڕۆژان، بگەمـە سەیری ئاسمانی جوانی ئەو باڵایە و بڕوانمە مانگی ڕوخساری. بەڵام دڵە نەزانەکەم وەک فیرعەون لێی شێوابوو. وەکوو قورئان باسی دەکا، کـە لـە وەرامـی مووسـادا بـە هامانـە وەزیرەکەی خۆی گوتووە: هامان بورجێکم بۆ سازکە، بەشکوو بەوێدا بگەمـە پلـە-پلـەی ئاسمانان و کەنارەکانی بگەڕێم؛ تا بزانم ئەو خوایەی مووسـا لـە کوێیـە؟! خـەیاڵ‌پـڵاوی دڵەکەم، وەک خەیاڵ‌پڵاوی فیرعەون، پڕوپووچە و دەستی بە باڵا ڕاناگات.

٣ ژ ڤێ تـەقویمێ ئینسـانی نـەزەردا سـیررێ سـوبحانی
«فَهَـــذا الْوَجـــهُ مِـــنْ اَجْلـــی بَـــراهینٍ و آیـــاتِ»

**مانای وشەکان:**

**ئینسان**: مرۆ؛ **ئینسان**: ئەم جۆرە؛ **ئینسـان**: بیبیلەی چـاو؛ **سـوبحان**: پـاک و دوور لـە هەڵە؛ **سـوبحانی**: خـودایی؛ **فَهَـذا**: ئەمـە؛ **وجـه**: ڕوخسـار؛ **اَجْلـی**: ڕۆشـنتر؛ **بَـراهین**: بورهانگەل؛ **بورهان**: بەڵگە؛ **آیاتِ**: ئایەتان، **آیَت**: نیشانە.

**پوختەی مانا:**

هەر چاوێکی کە خاوەنی بیبیلەیەکی بینا بێ و بەو بڕوانێتە یاری من- کـە نموونـەی

هەرەجوانی دروست کردنی ئینسانە و بەو جۆرە کە نهێنی خوا، بۆ نیشان دانی دەسکاری بێ هاوتای خۆی شانی داوە- کافریش بێ، ناچار دەبێ ئیمان بێنێ. چونکە ئەو ڕوخسارە پاکە، ڕۆشنتر و بەهێزترین بەڵگە و نیشانەی قودرەتی لە بنە نەهاتووی خودایە.

۴ کو نووریٚ عیشقیٚ لامیع دەت ل توریٚ قەلبیٚ جامیع دەت
دسەیرا «بَرْزَخُ الاسْماء، نِهایاتُ بِدایاتی»

**مانای وشەکان:**

**لامیع**: تروسکەدەر؛ **جامیع**: کۆ، کۆکەرەوە؛ **سەیر**: گەشت؛ **بەرزەخ**: بەرزەک، نێوان، لەمپەر، ماوەیەک دەناو دوودەمدا؛ **نهایات**: پاشینەکان؛ **بدایات**: پێشینەکان.

**پوختەی مانا:**

ئەویندارى ڕاست و دروست، گەرەک بیری بڵاو نەبێت؛ جگە لە یار، هیچ شتی بە دڵدا نەیەت. دڵی بۆ یار کۆکاتەوە و خروپڕ بیدا بە یار و ئاوڕ وە هیچ نەداتەوە، کە یاری لە بیر باتەوە. جا ئەوسایە ئەبێ هومێدیکی هەبێ کە تروسکەی نووری خودای ئەویندارانی، وەک چۆن لە کێوی تووری دا، لەویش بدا و لە ڕووناکی ئەو تیشکە بە ناو ناوەکانی خوادا- کە هەریەکێک لەو ناوانە جۆرە بار و حاڵەتێک لە ڕێڕەوی ڕێ پەیدا دەکا- پێ هەڵێنێ. ئەوە خوایە بەشکوو بگاتە هەواری بەختیاری و بە یەکجاری لەگەڵ یاری هەرەنازداری کۆوە بێت. سوپاس بۆ خوا کە من لەم گەشت و سەفەرە پڕخەتەرە، گەیشتوومە دواییەکانی تازە دەست پێکراوەکانم.
نازانم کێ گوتوویە:

دنیا لە دڵما ناحەوێنمەوە گشکی دەربەستە وە دۆس دریاوە

۵ نیشانێن توررەییٚ توغرا د وەسفیٚ زوهرەسیمایان
«لِعِنْوانِ التَّجَلّی مِنْ بَراعاتِ الْعِباراتِ»

**مانای وشەکان:**

**عینوان**: نیشان و بەڵگە؛ **تَجَلّی**: بە ڕووناکی خۆ نیشان دان؛ **بَراعات**: بارع‌گەل؛ **بارِع**: سەرکەوتوو لە ئاکاری پەسندا؛ **بارِع**: زۆر دەمپاراوی قسەڕەوان؛ **عِبارەت**: تەرزی قسە، قسەدەربڕین.

**پوختەی مانا:**

بۆ شایەتی و بەڵگەی هەرە زۆپ و دیاری، کە نووری خودا داویەتە ڕوخساری پاک و جوان‌چاک و بیچم و سیمای زوهرەئاسایان، ئەو مۆرە بە قیچەڵفیچەی قودرەتییە، کە پادشای پادشایان بۆی ناردوون و بۆی کردوون بە بسک و کەزی. تۆ بڕوانییە ئەو بسکانەی لە دەوری ڕوون، فەسیح‌ترین عیبارەتن بۆ ناوونیشانی دەسکاری خودای مەزن و زوو تێدەگەی کە نووری خوا بە مۆرەوە، بە مۆری لە ڕوخساری جواندا دێتە بەرچاو. پێغەمبەری خوا فەرموویە: «چاکەتان لە ڕووی جوان بوێ».

٦ دلۆ وەر سەیرێ بالایان د گولزارا سەمەن‌سایان
«بِها تَهْتَزُّ باناتٌ لَنا مِنْ مَیْسِ قاماتِ»

**مانای وشەکان:**

**سەمەن‌سا**: وەک گوڵە، یان: چڵە یاسەمەنە؛ **بِها**: لەویدا؛ **تَهْتَزُّ**: ڕادەژێ؛ **لَنا**: بۆمان؛ **مَیْس**: لەرینەوەی بەناز؛ **قامات**: قامەت‌گەل؛ **قامەت**: بەژن.

٧ سەمایا جوملە دێم دوڕ تێ ب ئیعجاز ئەهلێ سوڕپوڕ تێ
«بِها تَصْطَفُّ قاماتٌ بِعیدانٍ وَ نایاتِ»

**مانای وشەکان:**

**جوملە**: بە تۆپەڵ و کۆمەڵ؛ **ئیعجاز**: مۆجزات شاندان؛ **تَصْطَفُّ**: ڕیزە دەبەستێ؛ **عیدان**: عوودگەل؛ **عوود**: ئامرازێکی موزیکە؛ **نایات**: نەی‌گەل.

**پوختەی مانا:**

ئـەی دڵ! وەرە لـەو کـۆڕەدا کـە بویتـە باغچـەی نـەمامی بـەژن و بـاڵا لـە گـوێن قلەیاسەمەنان، تاوێک چاوێک بەو بـەژن و باڵاشـەنگانەی چەلەنگانـەدا بگێـڕە. چەنـد جوان بە دەم هەڵپەڕکێوە دەلەرنەوە؛ تۆ ئێژی نەمامی بانن، ڕادەهەژێن بە دەم باوە. چۆن ڕەقسێکە؟ سەرلەبەر ڕوخسار مروارین، لەوێدا کـۆن و هـەموویان لـە دلکێشـیدا گەیونە پلەی مـوجزات نیشـان دان. بـۆ ئـەهلی دڵ و دەروێشـان، پـڕن لـە بەڵـگەی ڕێشاندەر بۆ ئەوینێ. چەند جوان و لەبار بە هەوای عـوود و تـار و بلـوێرەوە، ڕیزبـەڕیز دەستیان گرتووە و باڵایان پێکەوە داوە و کۆڕی داوەتیان جۆش داوە.

**٨** سەمایێ ڕاست و چەپ تینن شەمالێن خاسسە هلتیـنن
«فَیَـــا للهِ فـــی مَیْلاتِهـــا مِـــنْ عَطْـــفِ بانـــاتِ»

**مانای وشەکان:**

**ڕاست**: جۆریکە لە ڕەقس؛ **چەپ**: نەوعێکی تریەتی. لە وڵاتی بۆتان بیستوپێنج جـۆر هەڵپەڕکێ هەیە، کە دوو جۆریان ناویـان ڕاسـت و چەپـە؛ **شـەمالێن خاسسـە**: مـۆمی تایبەتی، مۆمی سافی زەردی بەژن بڵندی مالـەمیران کـە بخـووری تێکـەڵ دەکـرا و دەگەڵ ڕووناکاییدانیش بۆنی خۆشی بلاو دەکرد؛ **هلتینن**: بڵند دەکـەن، ڕایـدەدێرن، هەڵیدەکەن؛ **فَیاللهِ**: ئەی نامەخوا؛ **مـەیل**: لارەوە بوون؛ **عَطْـف**: گەڕانـەوە و خـوارەوە بوون؛ **عَطْفْ**: بەزەیی و خۆشەویستی؛ **بانات**: بان‌گـەل؛ **بـان**: دارێکـی بەلەنجـەولار و شۆخوشەنگە.

**پوختەی مانا:**

لە سەمادا، بە لای ڕاست و چۆپەدا دێن؛ جۆری ڕاست و چەپ دەڕەقسن. هەموو وەک شەمی تایبەتی هەڵکرابن، تیشـک دەدەن. شـەمی تایبـەت لـەو نـاوەدا، بـە دەسـت خزمەتکارانەوە هەڵێنراون تا کۆڕی داوەت ببینرێ. ئەی نامەخوا! لەو نەمامە شـلک و بەناز و ڕێکانە، چـۆن بـە هەناسـەی دڵـداران، دەلەرنـەوە و خـوار دەبنـەوە و ڕاسـت دەبنەوە! دەڵێی خەڵفی شلکی بانن بە دەم سروەی بەیانەوە دێن و دەچـن. ئێمـەی

دڵدار، لەو دیدار و تماشایە، چیمان کەمە؟ هەر تەنیا مەیگێڕ و بادە. دەسا زووکەن!

٩ بێژن غـەمزە ئەلماسـیٚ ب زەمـزەم بینـە شەهکاسـیٚ
کـو حـەلکت مـەعنیێن ئاسـیٚ «فَیـا هَیّـا لَنـا هـاتِ»

**مانای وشەکان:**

**ئاسیٚ**: دژوار؛ **فَیا**: دە ئەی فلان؛ **هیّا**: پەلە بکە؛ **لَنا**: بۆمان؛ **هاتِ**: بهێنە.

**پوختەی مانا:**

بڵێن بەو جوانە مەیگێڕە کە هـەر چـاوداگرتنێکی، وەک نـووکی تیخـی لـە ئەڵـماس، جەرگبڕە. بە زەمزەمەی گۆرانییەوە، خوڕ-خوڕ بادە بکاتە ناو شاکاشییەوە و بمانـداتیٚ تا ئەو بادەی کە هـەموو گیروگـرفتی سـەخت و دژواریـش هەڵـدێنیٚ، لـە نـەزانیمان دەربێنیٚ. دەسا مەیگێڕە شۆخەکە! پەلە بکە و ڕامەمێنە و بۆمان بێنە!

١٠ دبیـنی نەغمـەیا چـەنگیٚ دەمـا ئاڤـێهتە ئاهـەنگیٚ
ب قـانوون ویٚ د خوونـت مـە «لِمیعـادٍ وَ میقـاتِ»

**مانای وشەکان:**

**قانوون**: ڕیٚوشوێنی دیاریکراو؛ **قانوون**: ئامرازێکی مووزیک؛ **میعاد**: ژوانگـە؛ **میقات**: وەختی دیاریکراو.

**پوختەی مانا:**

مەیگێـڕ گیانـە! دە بلـەرزە و بـادە بێنـە! وا دەبیـنی ئـاوازەی چـەنگ، بـە ئاهەنگـە تایبەتییەکەی- کە تۆش وەکوو من تێی دەگەی- بەرانبەر بە ڕیٚوشوێنی ناو دڵداران، بانگمان دەکاتە جیٚ ژوانیٚ و کاتی بە یەک گەیشتنمان بە گوێی دڵدا دەسرکێنیٚ.

۱۱ ژ ڕەمزێن غـەمزە چالاکـێ ب دل دێ بێنـە ئیـدراکێ
«مَعــانٍ لَــمْ یَســَعْها الْلَّفْــظُ مِــنْ ضَــیْقِ الْعِبــاراتِ»

**مانای وشەکان:**

**چالاک**: چوست؛ **ئیدراک**: تێگەیشتن؛ **مَعانٍ**: مەعنایان؛ **لَمْ یَسَعْها**: لە وزەیـدا نـەبووە؛ **لفظ**: وتەی دەم؛ **ضَیْق**: تەنگی.

**پوختەی مانا:**

هەر بە چاوداگرتنێکی زۆر چاپوکانە لە دلبەر- کە شوفار و نابابان هەستی پێ نەکەن- دڵ دە زۆر مانای وا دەگا کە لە وزەی دەم و گوتن بـەدەر بـووە و هـەرگیز وتـاری وا نەبووە کە بتوانێ ئەو مانایانە دەربڕێ. زمان لەوە بەرتەنگ‌ترە کە ئـەو مانـا نهێنییانـە ئاشکرا کا.

ئەحمەد شەوقی دەڵێ:

زوانی زوان لـە سـەیری لێـوی ئاڵــی لاڵ و پــاڵ دامــا
بـە سـرتەی دڵ وتـوویژی دەکـرد چـاوم دەگـەڵ چـاوی[1]

۱۲ ژ نازک دلبـەرا نـازک د سـەهمێ دی مـە ئیعجـازک
«وَ کَــمْ مِــنْ خَشْــفِ غِــزِلانٍ آهابَــتْ لَیْــثَ غابــاتِ»

**مانای وشەکان:**

**نازک**: نازێک؛ **سـەهم**: بـەش؛ **سـەهم**: تـیر؛ **کَـمْ**: چەنـد؛ **خَشْـف**: کارمـامز؛ **غِـزلان**: ئاسکان؛ **آهابت**: ترساندی؛ **لَیْثَ**: شێر؛ **غابات**: لێڕەوار و جەنگەڵ.

**پوختەی مانا:**

لەکاتێکا کە ئەو یارە نازدارەی من، نازی بەسەر دلدارانیدا بەش دەکرد، لەو بەشەی کە بە من بڕا، نازێکی وەک تیر هات بۆ من. ترسێکی وا ڕووی تێ کردم، کـە بـە مـۆجزاتم

---

۱. وَ تَعَطَّلَت لُغَةُ الکلامِ و خاطَبَت عینَیَّ فی لُغَـةُ الـهوای عیـناکِ

زانی. دەشزانم زۆر جار کارمامز، شێری جەنگەڵ دەترسێنن و زۆر ڕووی داوە شێر لە کارمامز ترساوە.

ئیبنولفارز (٥٧٦-٦٣٢) دەڵێ:

وەک لەو دڵە هەژارەی من قەوماوە لە کێ قەوماوە؟

خۆی بە شیرەدڵ دەزانی و چاومامزێک ڕاوی ناوە

«نالی» دەڵێ:

ئەلا ئەی نازەنین ئاهوو بە باهۆ    دڵی سەییادی خۆت هێنایە لەرزە

«هێمن» دەڵێ:

ئەمن دەمگوت لە دنیا تا بمێنم    لەبەرکەس ئەستەمە سەر دانەوێنم

کەچی ئێستا لە داوی بسکی تۆدا    گرفتارم گوڵم، موو ناپسێنم

١٣ نە تەنها پێشبەرێ یارین، ژ ئەمرێ کون خەبەردارین
«وَ مَنْ اَهْواهُ سارٍ فی مَساری کُلِّ ذَرّاتی»

**مانای وشەکان:**

**پێشبەر**: ڕووبەڕوو؛ **کُن**: ببە؛ **وَ مَنْ**: ئەو کەسەیش؛ **اَهْواهُ**: دڵم لەسەریەتی؛ **سارٍ**: لە گەڕانایە؛ **مَساری**: شوێنانی گەڕیان؛ **کُلّ**: گش؛ **ذَرّاتی**: وردیلەکانم.

**پوختەی مانا:**

ئەم ئەوینە گیانبرژێنەی، کە من لە ژیانا تووشی بووم، کاری ئەمڕۆ و دوێنێ نییە. لەو ڕۆژەوە کە چاوم بەو یارە کەوت و ڕووبەڕووی بووم، پەیدا نەبووە. هەر لەو ساوە خوا فەرمانی بە ئافەریدەکان داوە: «ببە!» و ئەوانیش «بوون»، من گیرۆدەی ئەم ئەوینەم. ئاگادارم کە خوا ئەوینی ئەم جوانەی چۆن تێکەڵاوی گیانم کرد و هەموو تۆسقاڵە وردیلەی لەش و گیانم، ئەوینی ئەوی تێکەڵە و تازە لێک هەڵناوێردرێن.

۱۴ «هُـــوَالاوَّل، هُوَالْـــاخِرْ، هُوَالظّـــاهِرْ، هُوَالبـــاطِنْ»
«هُوَالْمَعْبـــود وَالْمَشْـــهودُ فـــی کُـــلِّ الْهُویّـــاتِ»

**مانای وشەکان:**

**هُوَالاوَّلْ**: ئەو یەکەمە؛ **هُوَالْـاخِرُ**: ئەو دوایینە؛ **هُوَالظّـاهِرْ**: ئـەو دیـارە؛ **هُوَالْبـاطِنْ**: ئـەو ناوەڕۆکی نادیارە؛ **هُوَالْمَعْبود**: هەر ئەوە دەپەرستریٚ؛ **وَالْمَشْهودُ**: حـازر و بـەرچاویش؛ **فی کُلِّ**: لە گش؛ **هُویـات**: هۆوییەتگەل؛ **هَوُیـە**: بەڵـگەی ڕاسـتینی بـوونی شـتێک، پێناس.

**پوختەی مانا:**

ئەو کەسانەی لایان واسە هەوساری کار و ژیانمان لە ناو لەپی خۆماندایە و گوناهی دەردی ئەوینمان، دەکەوێتە سەرشانی دڵ و چاوانمان، زۆر زۆر هەڵەن. ئەوانەیش کە لایان وایە دڵداریی یەکیٚ وەکوو من، بۆ کیژێکی سەلما ناوە و دنیاییە، لـەوی پێشووش هەڵەترن. نەخێر بابـە، تیٚنەگـەیون. خـوا کـە هەرگیانـەی بـە کارێـک سەرگەرم کرد، ئێمەی کردە ئەوینداری جەمالی خۆی. هەر لـە ڕۆژی بناوانـدا تـا دوامین کات- کە ئەو دوامینەش هەر نایە- ئێمە ئەوینداری جوانیی خوداین. جـا لە کوێدا، یان لە کێدا خۆی نیشاندابن، خۆی دەزانـیٚ و ئێمـە سـووتان و بـرژان و گریانی دلدارانەمان لە سەر شانە و ئەرکێکە دەبیٚ بەجیٚ بێـت. یـاری سـەرەتایی خوایە. ڕواڵەت و بەرپیوار خوایە. جێگەی پەرەستنمان خوایە. ئەوی دێتە بـەرچاو خوایە و ئێمە خۆمان نە خۆمانین، نە دەزانین چین؛ یـاخۆ کێـین. هـەرخوا نـاو و نیشانمانە و هەر خۆی بەڵگەی پێناسمانە. ئەوین ئەوینی خودایە و مەلا و سەلما و هەموو دلبەر و دڵداری ئەم جیهانە، بە دەوری جوانی خـودادا وەک ئـەو تۆزکاڵـە تۆزانەن، کە لە دەوری تیرێژی ڕۆژیٚ خول دەخۆن.

۱۵ ژ «لا شَیْئی» ژ مەعدوومی، مە ناسی سیرری قـەیی‌ومی
«سُـجُودی فـی تُـرابِ المَحـوِ مِـنْ اَعْلـی المَقامـاتِ»

**مانای وشەکان:**

**لا شیئی**: نە تشتی؛ **مەعدووم**: لەبەین بـراو؛ **قـەییوم**: ڕاگـر و پـارێزەر؛ **قـەییوم**: نـاوی خوایە؛ **سُجُودی**: سوژدەکانم؛ **تُراب**: خۆڵ؛ **مەحو**: نەمان؛ **اَعْلـی**: بـەرزترین؛ **مقامـات**: شوێنان، جێگەیان، پلە و پایەگەل.

**پوختەی مانا:**

ڕێڕەوی ڕێگەی خوا ناسین، تا وشەی منی لە لا بێ و بلێ من دەبم بە دڵـدار، مـن وا دەکەم، من وا دەچم، من ئیمانم بە خوا هەیە، هەرگیز بە هـیچ ئـاواتێکی دڵـی ناگـا. دەبێ من ـمن و خۆ ـخۆیی و ئێمە و نامۆیی و تۆ ـتۆیی، هەر لە ئارادا نەمێنێ. بـڕوای وا بێ کە یاری نازداری گیانان، هەر خـۆی بـە کـاری ڕادەگـا و دەیپـارێزێ. نابـێ لـە بەرانبەر ئەودا، نقەی هەبێ. بڕوبیانووی بەهەشت چوون و جەحەندەم نەچوونی نـەبێ. ئەویندارى بەڕاستی بێ و هیچی‌تر نا. هەرچی یـار بەسـەری دێنـێ، دڵـی شـادکا. بـا سووتان و قورپێوان بێ؛ نابێ بلێ ئاخ! من سووتام. وشەی من لە شەریعەتی دڵـداریدا شەریک بۆ یار پەیدا بوونە و بە دەردی کافران چوونە.

سا لە سایەی یاری نازدار، ڕازی نهێنی نازناوی قەییومی خوام بۆ دەرکەوت. من ـمنی و خۆیەتیم نەما. ئەگەر خۆم بە شت دەزانی، لە ناوم برد. لـە سـەر خـاکی هەرنـەمانم سوژدەی سوپاسم بۆ یار برد. ئەو سوژدانەم گەیاندیانمە بەرز و بەرێزترین پایە لـە نـاو کۆڕی ئەویندارا‌ن، لە بارەگای بەرزی یاردا.

**١٦** ب حەق ڕەندێ خـەراباتم ژ دێـرێ ڤـێ دەمـێ هـاتم
چ هێڤـی هـوون دکـن ئـیرۆ ژ ڤـێ ڕەنـدێ خـەراباتی

**مانای وشەکان:**

**ڕەند**: گوێنەدەر و گەللایی؛ **خەرابات**: مەیخانە؛ **هوون**: ئێوە.

**پوختەی مانا:**

ڕەنگە هێندێک لەو کەسانەی کە بە عاقڵ ناسراون و لە ڕاستیشدا هیچ لـە دەردی دڵ نازانن، تەوس‌وتوانجم تێ بگرن کە من چۆن قسـەی وا دەکـەم، کـە دەگـەڵ ئـاوەزی

ئەوان یەکتر ناگرن؟ چەندم پێ خۆشە تێم بگەن، کە من لە دەستەی ئەوان نیم. ڕاستی دەڵێم من سیپالی مەیخانەم و تازە لە دێرێوە هاتووم. گوێ نادەمە لۆمە و لەقەم. دەسا ئێوە لە گەللایی ناو مەیخانە چیتان دەوێ و چۆن بەهیوان بار بگۆڕێ؟!

**١٧** د عیشقێ شێخێ سانیمە ب دل بەحرێ مەعانیمە
«لِذی حِجرِ وَذی قَلْبٍ شِفاءٌ فی اِشاراتی»

**مانای وشەکان:**

**سانی**: دووهەم؛ **مەعانی**: مەعناگەل؛ **ل**: بۆ؛ **ذي** : خاوەن؛ **حِجر**: عەقڵ و ئاوەز؛ **قَلْب**: دڵ؛ **شِفاء**: چارە؛ **اشارەت**: دەستنیشانگەل؛ **شِفاءو اشارات**: ناوی دوو کتێبی ئیبنوسینایە.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر شێخی سەنعانێ یەکەمین کەس بوو لە ڕێگەی دڵداریدا، دەستی لە دنیا و دین بەردا، من دووهەمم. داومەتە سەر ڕێوشوێنی ئەو. جا ئەگەر لە ڕواڵەتییدا مەستم و زوننار دەبەستم و یارم بتە و دەیپەرستم، لە دەروونم ئاگادار بن! دەریای تژی لە زانستم. بۆ ئەوانەی دڵیان هەیە و ئاوەزیان دڵدارنەیە، ئیشارەی من چارەی هەموو ژان و دەرد و نەخۆشییانە و هیچ کارێکیان بە بژیشکی وەکوو ئیبنوسینا نییە.

**١٨** د ئیقلیمێ سوخەن میرم د شیعرێ دە جەهانگیرم
«وَیعلو مَوکِبَ الْعُشّاقِ اَعْلامی وَ رایاتی»

**مانای وشەکان:**

**سوخەن**: وتار؛ **یَعْلو**: بەرز ئەبێت؛ **مَوْکب**: دەستەی سوار و پیادە پێکەوە؛ **عُشّاق**: دڵداران؛ **اعلام**: عَلَمگەل؛ **عَلَمْ**: ئالا؛ **رایَتْ**: بەیداغ.

**پوختەی مانا:**

گوتم دلم دەریایەکی پڕزانستە و ئیشارەتم دەرمانی دەردی عاقلانە. واتا: هەم زانام، هەم حەکیم؛ هەر هێندەش نیم. لە مەلبەندی دەمپاڕاو و قسەڕەواناندا، میرم. لە شیعر هۆنینەوەدا، دنیام خستۆتە ژێر دەستم. هەرگاش دەستەی دڵبەستەی داوی دلداریی، سوار و پیادە و بۆرەپیاگ و نەجیمزادە، بەیەکەوە بەرەو دیداری یار بچن، من ڕەمکێش و هەر لە پێشم و بەیداغ و ئالاکانی من، لە ئالای گشت بەرزتر و بلندتر خۆ نیشان دەدەن. واتا: هەم زانام، هەم بژیشک، هەم میرم، هەم جیهانگیرم. هەم سەرداری دلدارانم.

**١٩** چ خوەش نوورەک زەلالی تو د قەلبێ من شەمالی تو
«وَ قَلْبی حَیْثُ فیهِ الحُبُّ مِصْباحُ بِمِشْکاتِ»

**مانای وشەکان:**

**زەلال**: ساف و ڕۆشن؛ **وَ قَلْبی**: دلیشم؛ **حَیْثُ**: هەرگا، لە هەرکوێ؛ **فِیه**: تیا؛ **مِصْباح**: چرا؛ **مِشکات**: تاقە، دەلاقەی بە تاق سەرگیراو.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! ئەو هەموو پایەوپلانەی تۆ بە منت دا، لە سایەی ئەو نەمانە بوو کە لە دلداریی تووشم بوو. دلم کە دنیا و هیچکەسی تێدا نەما، تۆی هاتییە ناو. تۆ چەند نوورێکی ڕووناکی! تۆ مۆمێکی داگیرساوی لە تاریکایی دلمدا و دلمت ڕووناک کردۆتەوە. دلم هەرگا دلداری تێدا بایسێ، وەک چرایەک لە ناو دەلاقە دابندرێ دەلاقەکەش هەر ڕۆشنە.

خوا فەرموویە: «وێنەی نووری خودایی من، وەک چرایەکە لە دەلاقە دانرابێ.»

**٢٠** تەقازا وەه دکر حیکمەت کو چەرخ و لەولەب و با بن
«هُوَ الْفَعّالُ لا تَغْتَرْ بِاَسْبابٍ وَ آلاتِ»

**manای وشەکان:**

**تەقازا**: حوکم، داوا، ڕەوا دیتن؛ **حیکمەت**: لێزانی؛ **لەولـەب**: لۆلەپ، هەر لووسێکی خڕ هەڵدراو کە لە ناو شتێکی دیکەدا چەرخ بخوا؛ **هُوَ**: ئەو؛ **فَعّالْ**:زۆرکـارا؛ **لاتَغْتَـرْ**: فریـو مەخۆ؛ **اَسْباب**: هۆگەل؛ **آلات**: ئامرازگەل.

**پوختەی مانا:**

کابرای خۆ بە عاقڵزانی دنیاپەرست! کە لات وایە خۆت دەتـوانی هـۆی ئاسـوودەییت پێکبێنی و هـەل و دەرفـەت بـە ژێـری خـۆت بـۆ بـەهرەی خـۆت برەخسـێنی، زۆر پێچەوانەی تێگەیوی. خودای گەورە بۆیەی ئەم ئاسمان و عەردە خستۆتە خول و هەر بە بایەک دەیچەرخێنێ، تا هی وەک تۆ تێبگەیەنێ کە هەرچی جگە لە خوایە، وەکوو خولخولەی بەربایە و بادی هەوایە و بەربادە. بە ئەسباب و ئامراز و هزر و بیری خـۆت، بەس بنازە! فریو مەخوە! تەنیا خودایە کارایە و هەرچی ئەو نەیکا، ڕوونادا و هەرکـەس دەس دەکاری خوا دا، لەقە لە بەختی خۆی دەدا و چارەڕەشە تاهەتایە.

**٣١** ئەزەل عەینی ئەبەد یـەک ئان د دەییـومی د قـەییومی
تەنـــەززول دێتـــە تەفســـیلێ «بآنـــاتٍ و اوقـــاتِ»

**مانای وشەکان:**

**ئان**: دەم، تاو؛ **دەییـوم**: زۆر خـۆڕاگر؛ **قـەییوم**: ڕاگـرو پـارێزەر؛ **تەنـەززول**: دابـەزین، هاتنەخوار؛ **تَفْسیل**: درێژەدان و ڕۆشن کردنەوە؛ **اَوْقات**: دەمان، کاتان.

**پوختەی مانا:**

کاورای خۆت زۆر بەزانا زان! ڕەنگە بێژی ئەی ئەم هەموو بارگۆڕانەی دەور و زەمانە بۆ چییـە؟ ژیـان و مـەرگ و شـادی و خـەم و زۆر و کـەم و ڕووتی و بـەرگ و دووری و سەبووری بۆ هەیە؟ خوا بۆچی ئەم هەموو دژەی لە یەکتری کۆ کردەوە و ئەو نێوانـەی ئەزەلییەت و ئەبەدییەتی بۆ بەوانە پڕ کردەوە؟ دیسان دەڵێم بە هەڵە چووی. بـۆ خـوا وەخت و کات و زەمان و دەم نییە. نێوانێکیش لە نێوانی ئەزەلی و ئەبەدییـەتی ئـەودا

نییە. خوا کە هەر بووە و هەر دەبێ، خۆی ڕاگر و پارێزەری ئەم دنیایە و هەتا هـەتایی خۆیـەتی؛ نـە گـۆڕانی بـە سـەردا دێـت، نـە گـۆڕاوە. بـەلام بـۆ تێگەیانـدنی ئێمـە ئافەریدەکانییەتی کە وای بە ڕەوا زانیوە و ڕەوای دیوە لامان وا بێ نێوانێک دە ئارادایە و گۆڕان بەسەر دنیا و ژیانی زەویندا دێ. خوا هەر شتەی لە کاتی خۆی، بەرانبـەر بـە لێبڕانی خۆی لە دنیا، دادەبەزێنێ و لە کارایی بێچوونی خـۆی، ئێمـەی نـەزان، وردە وردە حالی دەکا و کردوونییە محەکی ئەزموون بۆ بڕوا و هزر و ژیریمان.

**٣٢** «تَعـــالیاللە» ژ ئیحســـانی ب دلـــداری ب دلدانی
«مەلا» ئیرۆ تە کر پاشا ل سەر چەهڤێن «مەلێ» هـاتی

**پوختەی مانا:**

هەی نامەخوا لەو چاکەیەی دەگەلمت کرد؛ کە هاتی و بە دیداری خۆت شادت کردم. لاوانتمەوە و زۆرت دلداریی دامەوە. ئەمڕۆ بە خەلاتی شایان خەلات کرام. یار بە خێر بێی سەر هەردوو چاوی من هاتی.



# خەیالی خال

| | |
|---|---|
| ١ | ئـــەی نەســیمێ ســەحەرێ مــا د مــەجالا ســبەهێ<br>ســـەد ســـەلامان بگـــەهینی ژ مـــە وێ پادشـــەهێ |
| ٢ | عەرعــەرا قامەتئـەلیف نەیشــەکەرا شـوخ و شـەپال<br>نازکـــا ســـیمتەن و خوســـرەوی زەررین کولـــەهێ |
| ٣ | دبەرێـــدا تـــو ببووســـی ب دوســـەد زاری و لوتـــف<br>ئاســـتان و دەر و دیـــوار و شـــەباکێن کەلـــەهێ |
| ٤ | نامـــەیا جـــەور و جـــەفا و ئەلـــەم و دەرد و غـــەمان<br>دی ب دەستێ زەریـێ موحتەشـەمێ سـەرویسـەهێ |
| ٥ | بـــەلکوو دلبـــەر ژ روێ عـــادلی و مەرحەمـــەتێ<br>رەحمـــەکێ کـــەت ب فـــەقیران و بپرســـت گلـــەهێ |
| ٦ | حـــەق دزانـــت د شەڤـــان شـــوبهەتێ ئاڤـــێن د ڕەوان<br>مـــە ب دل زاری و کالینـــە حـــەتا ســـوبحگەهێ |

**مانای وشەکان:**

**کولەهێ**: کلاوێ؛ **لوتف**: نەرمی؛ **شەباک**: پەنجەرە؛ **کەلەه**: قەلا، کۆشـکی میرنشـین؛ **ئەلەم**: ئێش و ژان؛ **گلە**: گلی، شکایەت و داد؛ **کالین**: زۆڕە و دەنگی گریان.

**پوختەی مانا:**

شنەبا! دەستم دامانت، لە کاتی بەربەیانێکدا وەرە و سلاوی من بەرە و بۆ ئەو سەرداری جوانانە، کە لە مەڵبەندی جوانیدا پادشـایە. نیشانەشـت بـا پـێ بڵـێم: بـاڵای وەکـوو تازەنـەمامی عەرعــەرە. ڕاســتە وەک پیــتی ئەلفێکــە، کــە خەتخۆشــی زۆر لــەزەبر

نووسیبێتی. هەر شیرنایی لێ دەبارێ. وەک قامیشەشەکری تەڕە. شۆخ و شەنگ و شلک و ناسک و خونچیلە و ڕەزاسووکو لەبەردڵە. ئەوندە سپی و ناسکە، زێو شەرم لە لەشی دەکا. تانجێکی زێڕی نیشانەی پادشایەتی هۆزی جوانان لەسەر ناوە. شنەبا گیان! بەر لەوە بچییە خزمەتی، خۆت کز بکە و تا دەتوانی کزەبایەکی نەرم بە! سەر لە ئاسانەکەی بسوو! دەرک و دیوار و پەنجەرەی کۆشکی شاهانە ڕامووسە.

ئەوسا کە ئەو نامەیەی من- کە پڕە لە باس‌وخواسی دەرد و کوڵ و ئێش و ژان و سزا و ئازار و کۆڤان و کەسەر و عەزرەت و ئاوات- بدە دەست ئەو ڕەنگ سەوزەڵەی پایەبەرز و شەرمێونە، کە لە ناو جوانانی دیدا وەک سەوڵێکی هەرە نایاب لە ناو داراندا دەنوێنێ. ئەوە خوایە بەشکوو دڵبەر بکەوێتە سەر دادپرسیی و باری بەزەیی بجوولێ و دڵی بە هەژار بسووتێ و بڕیار بدا کە بە دادی من ڕابگا.

خوا دەیزانێ بە درێژی هەموو شەوگاران، بارانی هسرم ڕەوانە و لە تینی خەم، خۆشم تەواو تاواومەوە و هەر بوومە ئاو. وەکوو خوڕ-خوڕی ئاوی چەم، دەنگی گریانم دەبیسرێ و تا ڕۆژ هەر ناڵە و زاڵەمە.

٧ ما ژ بەر دەرب و فیراقا تە سکوونەک مە هەیە؟
جەرگ و دل هەردو ب نالینە وەکی چەنگ و ژیهێ

٨ پەردەیا خێلی و چارێ تو ژ سەر دیمێ هلین
دا ژ شەوقا تە ب خەف بت شەفەقا میهر و مەهێ

٩ دین ئەگەر بێتە بەها جان ددرم لێ ئەمما
مە هەزار جانێ عەزیزی دهلێتن د بەهێ

١٠ قەت دبت وەک تە شەپالێ نە د شام و نە د شەرق؟
کێ نیشان دا د جەهان میسلێ تە خوندکار و شەهێ

١١ عالەمەک شەهدەییا حوسن و جەمالا تە ددت
تو زولەیخایێ زەمانیی و چ حاجەت مەدەهێ

۱۲ حـەق نیگەهـداریٚ تـە بـت پادشـەها سـەروقەدان
ب کـەناریٚ مـە فـەقیران بکـە جـارەک نیگـەهیٚ

۱۳ خـووبی و دلبـەری و نـاز و تەلـەتتوف ب تـە شـێن
خوسـرەوا پادشـەهانیی و خودانـا جەبـەهیٚ

**مانای وشەکان:**

**سکوون**: ئۆقرە؛ **خێلی**: ڕووبەنـد؛ **چـاری**: چارۆکـەی سـەر؛ **دهلیـتن**: تـیٚ هەڵـدێنیٚ، بارتەقای دەکا؛ **خوندکار**: خونکار، پادشای گەورە؛ **شەهدەیی**: شایەتی؛ **زولەیخا**: ناوی کویٚخاژنێکی میسری بووە، کە یووسف پێغەمبەری بۆ کۆیلەی خۆی کڕیوە و تـەماحی تیٚ کردووە و گەلێگ فێڵی لیٚ کردووە کە سواری بیٚ. یووسف خۆی تیٚ نەگەیاندووە و تووشی دامێن‌تەڕی نەبووە. قورئان لە سوورەی یووسفدا باسی دەکـا. بـەڵام نـاوی بـە زولەیخا نەهێناوە. ناوەکە «زولەیخا» نییە؛ «زەلیخا»یە و عەرەب بەو دەردەی بردووە و مانای لووسی جیٚ خلیسکی بچووک دەدا؛ **مەدەه**: پەسن، تاریف؛ **نیگەهیٚ**: تماشایەک؛ **ب تە شێن**: شیاوی تۆن؛ **خودان**: خاوەن؛ **جەبـەه**: جبەخانـە و قۆرخانـە؛ **نیگەهـدار**: ئاگادار.

**پوختەی مانا:**

مەفەرموو با ئارام بگریٚ و هەدا بدا. بۆچی لەبەر زەبری دووریت ئۆقرەم ماوە؟ جەرگ و دڵم لەبەر ناڵینیٚ ڕۆژ و شەو، ئێژی چەنگ و ئامرازی ژێدار ئەژەنن؛ بێدەنگ نـابن. دە بەزەییەکت پێما بێت. ڕووبەند و سەرپۆشت لادە با ئـەو ڕوخسـارەت دەرکـەویٚ و بـۆ تەماشات ڕووناکی و تیشکی مانگ و خۆر، وەکوو من لـە سـووچێکەوە بێنـە سـەیرانی جوانی تۆ (یان: تا مانگ و ڕۆژ، لە ڕووناکی دان بکەون و هەموو کـەس هـەر بڕوانێتـە تۆ). ئەگەر دیتنی دیدارت بە کڕین با، من هـەر گیـانم هەیـە و دەمـدا؛ بـەڵام دیـارە بیٚبەهرە و ناهومێـد دەمـام. چونکـە نرخـی دیـدارێکت هـەزار گیـانی زۆر بـەڕێزیش بارتەقانەی نایەتەوە.

خونچیلە و ڕەزاشیرینی وەک تۆ لە دنیادا نییە. نە بە شەو ئەستێرە و مانگ و نە بە ڕۆژ خۆری خۆرهەڵات، دەگەنە تۆ. وەک تۆ پادشا و خونکاری جوان و نـازداران لـە دنیـادا

نەدیتراوە و ناشبیندرێ. نە هەر من، دنیا سەرانسەر شایەتی جوانیی و نازداریی و لەباریی تۆن. تۆ زەلیخای ئەم زەمانەی. لە پێهەڵگوتن زیاتری و ئاتاجیت بە تاریف نییە.
ئەی سەرداری بەژن‌شۆڕ و پەلکەشۆڕان! خوای مەزن ئاگادارت بێ و هێندەت بەزە بخاتە دڵ، سیلەی چاوێک بدەی بە ئێمەی هەژاری دڵداری خۆت. بەڕاستی پایەی سەروەریی پاتشایانی مولکی جوانی هەر لە خۆت دێ. جوانیی و ناز و دڵڕفێنی و ناسک‌ئەندامی و شەفافی، کالایەکن پڕ بە بالات و تەنیا لە تۆ دەشێنەوە. بەزە و ڕەحم و دلۆڤانیش شیاوی خۆتە و هەر لە خۆت دەوەشێنەوە.

۱۴ حەجەرئەسوەد بدرت دەست زیارەت بکرم
نەزرێ من بت بگرم خواس تەریقا مەکەهێ

۱۵ ژ ئەزەل حەق ب «مەلێ» دایە ژ عیشقێ قەدەحەک
تا ئەبەد مەست و خەرابین ژ مەیا وێ قەدەهێ

**مانای ئەو دوو بەیتە:**

خاڵی گۆنات- کە هەر وەکوو حەجەرولئەسوەد پیرۆزە- ئەگەر جارێ دەستی بدایە ڕایمووسم (یان: ئەگەر بە دەست ئیشارەم بۆ بکردایە و دەستی خۆم ماچ بکردایە)، مەرجە و نەزری سەرشانم بێ، بە پێخواسی و بەسەرقۆتی ڕێگەی مەکەم بگرتایە و لە مەکەدا لە سەر حاجیان ناز و شانازیم بە بەختم بکردایە.
خوا هەر ڕۆژەکەی بناوان، پیاڵەیەک بادەی ئەوینی دا بە مەلا. هەتا هەتایە بە بادەی ئەو پیاڵەیە مەست و سەرخۆش و بێهۆشین.



## خەدەنگا ئاوڕان

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ئێـــرۆ ژ نـــوو پورئاتەشـــم<br>مـەجرووحێ قەوسـێ پەروەشـم | دیســـا ژ رەمـــزا دلبـــەرێ<br>تـــیر دانـــە نێڤـــا جەگـــەرێ |
| ٢ | تـــیردان ژ قەوســێ ئەســوەدە<br>کوشتینە وەک من چەنـد سـەدە | شـــــەهزادەیا شـــــیرین‌قەدە<br>وێ پادشـــــاه و بەکلــــەرێ |
| ٣ | وێ بەکلــەرێ پــوڕ کوشـــتنە<br>ما ئـەهلێ دل قـەت هشـتنە؟ | ئەنگوشــت ب خوونـێ رشـتنە<br>سـوهتینە میسـلی مەجمـەرێ |
| ٤ | لێ ئـەز تنـێ سـەر تـا قـەدەم<br>وەسـفێن دعیشـقێ ئـەز چ دەم؟ | یەکسەر دسـووژم دەم ب دەم<br>نـــایێن حیســـاب و دەفتـــەرێ |
| ٥ | وەســفێن ئەڤــین و عیشــقەهێ<br>نایێنـــە شـــەرح و مـــەددەهێ | حوســـن و جـــەمالا وێ شـــەهێ<br>ئەحســـەن ژ نەقشـــێ بەشـــەرێ |
| ٦ | ئەحســەن ژ حوســنا دیمـدوڕێ<br>ســـەد زاهیـــد ئێخســـتن ژ رێ | شـــیرینی و گفـــت و ســـوڕێ<br>وێ نـــازک و لەبشـــەککەرێ |
| ٧ | شـــەککەر د نـــێڤ لێڤـــانە وێ<br>مەشـــعەل دنـــیڤ شیڤـــانە وێ | ریحـــان ل دۆر سێڤـــانە وێ<br>تەیســـێ ژ رەنگـــی فەنـــەرێ |
| ٨ | فەنـــەر نییـــە نـــوورا حەقـــە<br>بەرقـــە ســـپێدە و شـــەفەقە | حوســـن و جـــەمالا موتلەقـــە<br>زوهـــرە و شەمســـا خـــاوەرێ |

| | | |
|---|---|---|
| ٩ | زوهـــره و مـــاه و موشـــتەری | مـــن دیـــن ل دیمـــێ ئـــەنوەری |
| | زولفـــا موسەلســـەل عەنبـــەری | ســـەردایە حـــەوزا کەوســـەرێ |
| ١٠ | حـــەوزا ژ کەوســـەر چەشمـــەتێ | یـــا جـــیە د رەوزا قودرەتـــێ |
| | هـــەردەم ژ نـــوو وێ ســـەردەتێ | خـــەمری و تـــایێن عەرعـــەرێ |

**مانای وشەکان:**

**پەرووەش**: پەرە پرژێن؛ **بەکلەر**: گەلەبەگ؛ **بەکلەر، بێگلەر**: نازناوی میریمیران بوو کە بەسەر گەلەبەگێک ڕادەگەیشت؛ **رشتن**: ڕەنگاندن؛ **ئێخستن ژ رێ**: لـە ڕێ لای دان؛ **فەنەر**: چرای ناو شووشە؛ **ئەنوەر**: هەرە ڕووناک.

**پوختەی مانا:**

ئەمرۆش لە سۆنگەی ئیشارەی چاوی دلڕفێن، سەرلەنوێ پڕ بووم لە ئاگر. بـە کـەوانی برۆکانی، تیری مژۆڵ- کە وەکوو تیری پەڕدارن- دامبارینێ و دەناو جەرگم هەڵچەقین و جەرگ و گیانم بریندارن. ئەو شازادە چەلەنگ و ڕەزاشیرینە، هەر بەو کەوانە ڕەشانەی برۆکانی، چەندین جار سەد لە پاشا و میری میرانی، بە دەردی ئێمە بردووە و لە گیان و ژیانی تەکاندوون. دەستی بە خوێنی دڵدارانی پایەبەرز ڕەنگاندووە.

ـ هەر میر و پاشای کوشتووە؟

ـ نەخێر...

ـ ئەی بۆچی قرانی دەکۆمەڵی دڵدارانی نەخستووە؟

ـ گش لە گشتمان وا سووتاوین، هەر خۆمان بووینە ئاگردان. بەڵام من لـە چـاو هەموانیان زۆرتر سووتاوم و برژاوم. بە بێ وچان، هـەموو دەمـان، گـڕم بـەرزە و سەرتاپام لە سووتاندایە. نازانم دەربارەی ئەوین چی ببێژم؟ لە دەفتەرا جێگـەی نابێ و بۆشم نایەتە حیسابێ. پەسن و تـاریفی ئـەو جوانـە- کـە پادشـای گـش جوانانە- و باسی ئەوین و دڵداریم، بە زمان رۆشن نابێتـەوە. هـەر ئەونـدەم لـە توانایە، بڵێم خوایە چەند سنعاتکارێکی چاکی! چۆن نەخشـێکت لـەو بنیادەمـە کـردووە. شـیرینکاریی هـەر بـۆ تۆیـە. شـیرنایەتی و گفـت و لفـتی دلـڕفێن و

دڵگێشیی و سیمای وەک دوڕت داوە بە یار؛ کە بە بزەی لێوی شەکریی و تەنک و ناسک، سەد سۆفی سەرگەردان کرد و لە ڕێ دەربرد.
شەکر لە لێوی دەبارێ. کولمی سووری دەناو بسکاندا دیار ئەدا، وەک ڕێحانەی دەوری سێوی لاسوور دەچێ. ڕوخساری لە ناو بسکاندا تیشک دەدا؛ وەک چرای دەناو شووشەدا. شووشە و چرای چی؟ زۆر هەڵەی! نووری خوایە. جوانیی بێگەردی خۆیەتی، برووسکەی داوەتە سەر ڕووی. بەرەبەیانی لاجانگ و سوورایی ئاسۆی ئاسمانی، لە کولمانییەوە دیاری دا و گرشەی چاوی و تیشکهاوێژی ڕوخساری- کە لە زوهرە و خۆر ڕوونترن- هاتوونە ڕوو. مانگی هەنیە، زەردی گەردن، تیشکی سپییەتی بەرچەنەی، لەو ڕوخسارە هەرەڕوون و تیشکدارە، وەکوو زوهرە و مانگی چاردە و مشتەری، دەترووسکێنەوە. کەزی زنجیرەکراوی عەنبەراوی، سەریان داوە لە قولکەی گەردنی زەردی، کە لە جێی حەوزی کەوسەرە؛ بەڵێ سەرچاوەی کەوسەرێ لەوێوەیە. جێگەی کەزیان، لە ناو باغچەی دەسکاری خودای تواناداو هەر لەپەستا بسکۆڵەی بەلادا کراوی لەسەر نەمامی عەرعەری بەژن و باڵای سەر دەبزێوێ و دەڕوانێتە ئەو ڕوخسارە.

| | | |
|---|---|---|
| ١١ | خەمری و ڕەشبسکا حەریر | وەر بوون ل دۆر بەدرا مونیر |
| | بورجا کو حاکم لێ دو میر | من دین ل تەختێ کیشوەرێ |
| ١٢ | تەختێ د میر و بەکلەران | مەیدانێ جووقا گۆیگەران |
| | ئەسلان و جووتێ مەیخوران | مەی دان شەرابا ساغەرێ |
| ١٣ | ساغر ب دەست سەرخۆش و مەست | وەقتی سەحەرگەهـ دەست ب دەست |
| | غەفلەت دو بەکلەر مەیپەرەست | کوشتم ب دەر با خەنجەرێ |
| ١٤ | کوشتم ب دەر با کەیبەران | گەزمە و خەدەنگا ئاوران |
| | ڕەمز و ئیشارات و سوڕان | دان دل ژ نیڤا پەنجەرێ |

١٥ دل دان ژ بەر حوسنا ب نوور بەرقا تەجەللایا سوودوور
لەو سوهتییەم وەک کووهێ توور حووبب و ئەڤینا وێ زەرێ

١٦ حوببا تە ما خوەش هشتمە هەر رۆ ژ نوو ئەز کوشتمە
یەکسەر ژ خوونێ رشتمە تیر و خەدەنگێن مەجەرێ

١٧ گەزمێن د شیرین نازکێ دەربێن د وێ رمبازکێ
چووبینە نێڤ دل گازکێ مەن داد ژ زولما دلبەرێ

١٨ دلبەر چ بێحەد زالمە جارەک نەکر پرسێ ل مە
لازم ب حالێ عالمە لێ پورِ ددێرت غەدەرێ

١٩ لازم ب قەتلا مەن دڤی هێژ ئەڤ د دل مارێ شەڤی
پەیکان د جەرگێدا چەڤی بەند کر ب شەوکا عەنبەرێ

٢٠ بەند کر کولاب و پەنجەیان دل ما د نێڤ ئەشکەنجەیان
من ئاه ژ دەست وان غەنجەیان کۆک و کوبارێن دینبەرێ

**مانای وشەکان:**

**وەر بوون**: کۆ بوونەوە؛ **کیشوەر**: مەملەکەت؛ **جووق**: دەستە، تاقم؛ **گۆیگەر**: گۆباز؛ **کەیبەر**: تیخ و تیری دەمپان؛ **گاز**: گەزی پێوان؛ **غەدەر**: پەیمانشکێنی؛ **شەوک**: درِک؛ **شەوک**: قولاپەی سەرلەزەنبەری ژنان؛ **ئەشکەنجە**: شکەنج، چین؛ **کوبار**: زۆر بەرِێز و بەدەمار؛ **کووک**: ساز و تەیار؛ **سودوور**: سینەگەل، لایانی سەروو؛ **چووبینە**: چووبوونە.

**پوختەی مانا:**

بسکۆلە و کەزی رِەشی وەکی ئاوریشمی خاو، دەورەیان دا لە مانگی چاردەی بەتریفەی ناو چەوانی. کەزی لەم لا و لەو لای توێلی، وەک دوو حاکم لە مەملەکەتی مانگێدا حوکم بکەن، وام دەدیتن. یان ئەو هەنیە پاک و ساوە و دانەی خالّی رِەش لەو

ناوە، وەک مەیدانێک لە ئاسمانی ساودا دەچوو، گۆیەکی ڕەشی لێ دیـار بـێ و مـیر و بەگلەری کەزیانی، دەگەڵ بسک و پەرچۆکانی، بووبنە دوو دەستەی گۆیەنێ و بە کاشۆ بەرەو ئەو خاڵە هێرش بەرن و کایە بکەن.

چاوەکانی- کە وەک دوو شێری مەست وانە- بە پێوانە بادەیان لـە کـۆڕ دەگێـڕا. لـە بەیاندا کە بای بسکان کەزیەکانی دەلەراندن و دەگەینە لای پیالەی پڕ بادەی چاوانی و سەرخۆش ببوون، لە هەردوو لا بەجووتە، یەکتریان گرت و دەست لە دەستا ئەو دوو مەستە هەڵیانکردە مـنی هـەژار. بەرخەنجـەری تاڵـی سـەری زولفانیـان دام. تـیر و پەیکانی ئاوڕان، کە هەروا ئاورینگیان دێنان، چاوداگرتن و ئیشارە و نازی دڵکێش -کە لە پەنجەران دەدیتران- گشتی وەکوو تیری دەمپان، دەناو دڵ و جەرگم چەقین.

لەو جوانییەوە -کە تیشکی جوانیی خودایە و دەروون ڕۆشن دەکاتەوە- برووسکەیەکم بەدی کرد. ئەوینی ئەو سەوزەڕەنگەی دایە سینەم؛ بۆیـە وەک تـووری سـینایە- کـە کەوتە بەر تەجەللایە- بەو تەجەللایە گڕی گرت.

یاری نازدار! لێم مەپرسە ماوی یان نا؟ خۆت دەزانی، خۆتی هەموو دەم کوشـتووتم. بۆ هێشتووتم کە زیندوو بم؟ بڕوانە تیرەکانی خـۆت- کـە لـەتیری کـاریی خەڵـکی مەجارستان بڕاترن- هەموو بە خوێنم شەلاڵن و بەڕەنگی ئاڵ ڕەنگ کـراون. تـیری نازی ناسکئەندامی خوێنشـیرین، زەبـری ڕمـبی بژۆڵـی ئـەو ڕمهـاوێژە، هەریـەک گەزێک بە دڵمدا چووبوونە ژوور. هەی داد لە دەس ئەو ناهەقییەی یـار لـێم دەکـا! بەڕاستی دەردم دەداتێ. دەزانـێ حاڵـم چلۆنـە و جارێـک بـە دەردم ڕاناگـا و لـێم ناپرسێ. بەڕاستی پەیمانشکێنە. فەرمووبووی بـرینی تـیرم بـە پرسـیاران دەرمـان دەکەم. کە چی نایکا. دیارە گەرەکییە بمکوژێ و تازە نەیەمە بەرچاوی؛ بۆیە هێشتا سەرەتیری ماری ڕەشی بە ڕەنگ شەوەی، لە هەناوما چەماونەوە و بە ئاڵـقەی داوی عەنبـەرین، بەسـتوونییەوە؛ کـە نەلـەقێن و دەرنـەچن. قولاپـەی سـەری بسـکانی، پەنجەیان لە دڵدا گیرە و دڵ گیرۆدەی چین-چینی یەک لەسەر یەکی پرچانییەتی. هاوار لە دەست ئەو نازانە، هاوار لەو چاوە بازانە، کە هێندە ساز و تەیار و بەخورمەتن و کاریشیان ئیمانبردنە.

٢١ رەمـز و سـورێن شـیرینلـەبان تـیرۆژێ بـەرقێن کەوکـەبان
ڕێـزا موسەلسـەل عـەقرەبان گـەر دان لـە دۆرا قەمـەرێ

٢٢ مـن دیـن ل دۆر بـەدرا تـەمام حـەرفێن د مـەکتووب دال و لام
وێ پێشـرەوێ بـاتن رەڤـام یـەغما کـرم سـیمینبـەرێ

٢٣ سـیمینبـەرا نەیشـەککەری ئـەو حۆریـا نیسـبەت پـەری
بـەژنا شـیرین دێمـی زەری بـوو ژ گـولاب و مـاوەرێ

٢٤ بـوو مـاوەر و شـیرینلـەبێ وێ خـووب و نـوورین غەبغـەبێ
بـەدرا د بورجـا عـەقرەبێ کـەنگی ژ بـەر پـەردێ دەرێ

٢٥ بـەدرا ژ قـودرەت لـێ دو نـوون ئـەو قـاتلا ئەسـود عیـوون
پورِ راکـرن وێ قـەتل و خـوون عالـەم پـەرێهت یـەغما کـرێ

٢٦ هەر دەم ب زولمـێ وەد سـوژی قـەلبێ ژ حوببـا تـەی تـژی
لازم دبـێم مـن دێ کـوژی کـەس نینـە چیـتن مەهـدەرێ

٢٧ کەس نینه رەت مەهـدەر بکـت بـەس گرتییـان ئەبتـەر بکـت
خـەملێ ژ زێـرێ زەر بکـت شـەفقەت ل یـەکتا بـدەرێ

٢٨ شـەفقێ ب دیـدارێ خـوه کـت قەسـتا برینـدارێ خـوه کـت
شەهیدێ رەشمـارێ خـوه کـت ئـێ سـەر ل فـەتلا پیشـتەرێ

٢٩ فـەتلێ سـیاه مـارێ شەڤـین ریحانێ ب دور سـەروان چەڤـین
ئـاخر ب سـەلوێدا رەڤـین خـەف بـوون د تایـێ چەنبـەرێ

٣٠ خەف بوون د نـیڤ تـوورا قـزل ئـیلان میسـالێ سـەر ل مـل
کوشـتین و ژەهـر ئاڤـێته دل هێـژ کوشـتیێن رەمـزا بـەرێ

| | | |
|---|---|---|
| ٣١ | کوشـــتینە ئـــەم شـــیرین‌لەبێ<br>گەر ئەز ببینم ئـەو ب خـوە بـێ | تــەحلی کەشــین رووز و شــەبێ<br>نـــاکم ژ دل هێـــژ بـــاوەڕێ |
| ٣٢ | ئـــەو نازکـــا نیســـبەت گولـــێ<br>مەســـتم ژ بـــەر قـــالوو بـــەلێ | جامەک ژ کەوسـەر دا «مـەلێ»<br>حـــەتتا ب رۆژا مەحشـــەرێ |

**مانای وشەکان:**

**گەردان**: خولدەر؛ **گەڕدان**: گەڕیان؛ **نیسبەت**: بە ڕەگـەز؛ **عیـوون**: چـاوان؛ **مەهـدەر**: تکا؛ **ئەبتەر**: دوابڕاو؛ **پیشتەر**: لەپێشەوەتر؛ **قزل**: سوور؛ **ئیلان**: مار؛ **مل**: شان؛ **تـەحلی**: تاڵی؛ **کەشین**: خۆرەوەین.

**پوختەی مانا:**

غەمزە و نازی دڵکێشە؛ لێو شیرینە؛ تیشک و برووسکەی ئەستێرەی سەر ڕوخساری، کە بریەتین لە خشڵی سەر تـوێڵ و گـوارەی، ڕێـزی بـەزنجیرەهاتووی بسـکی، وەک دووپشکی ڕەشی لـە عەنبـەری خـاوکراوی، کـە لـە دەوری ڕوخسـاری وەک مـانگی چاردەی دەگەڕان و دەوریان دابوو، بسکی وەک «د» و لابسکی وەک «ل»م دین کـە واتا دڵ لێرە بەندن. ئیتر لە پێش دڵداراندا من بـووم لـە تـەهی دەروونم ڕفێنـدرام و سینگی لە زێو چەرمووگـتر و نـەرم و بـە شـۆق، دڵ و دیـنی تـالان کـردم. سـینە و بەرۆکی وەک زێوە. باڵای وەکوو چڵەقامیشێکی لووسە، شەکری پێـوە. حۆرییـە و بـە ڕەگەز پەرییە. بەژن‌شۆخ و ڕەنگ‌زەڕییە. بۆنی گوڵاو بڵاو دەکا. لێوی شـەکرە و بـۆی گوڵ دەدا. تیشکی بەرچەنە و لاجانگی، لە دڵ دەدا. هەنیەی لە ژێر پەرچۆکانی، وەک مانگی چاردە لە بورجی عەقرەبی ئاسمانی ساودا، پەناگیرە.

خوایە کەی ئەو مانگە جوانە، لـە پشـتی پـەردە دێتـە دەر؟ لەسـەر مـانگی چـاردەی هەنیەی دوو نوونی سەرەوبەرەژێر لە خەتی خودا دەبینم؛ کە لێم بوونەتە کەوان و بـە هانەدانی چاوانی کە لـە دڵـی کـافران ڕەشـترن و لـە کوشـتنی ئێمـەدا بێ‌بـەزەترن، دەستیان بە کوشت و کوشتار کرد. دنیا پڕ بوو لە ئاژاوە. هـەموو ناوچـە و مەڵـبەندی دڵانیان سووتاند. هەرچی وەبەرگیریان کەوت، تالانیان کرد.

ئاخر یارە دڵڕەقەکەم! خۆت دەزانی دڵم پڕە لە ئەوینت. چۆن ڕەوایە هەمیشە ئاوا بە ناحەق ئەنوای ئەوین بسووتێنی؟ من دەڵێم بڕیارت داوە نەمهێڵی لە سەر دنیاوە و خۆشت لە چاری من نایە. کەسی واشم پێ شک نایە، ڕۆژێک بینێرمە تکایە و تکات لە خزمەتدا بکا و چی دی دیلی ئەوینت دوابڕاو نەکەی. بۆ چاری دڵی دیلانیش، هێندە بەسە خۆت بە زەنبەری زێڕی زەرد، وەڕازێنی. بیستنی خرمەی خشڵان و دیتنیان لەو بەژنە جوانەت، دەرمانی دەردی دڵانە. منی تەنیا و بێ‌کەس و بێ‌دەر و دیلیش، کە دەردم یەکجار گرانە و لە دیلی تر هیلاکترم، بە دیداری ڕوخساری خۆت، چا دەبمەوە. دەسا وەرە منی مەلای ئەویندار و کۆیلە و دیل و بریندارت، بە دیدارت دڵخۆش بکە! من نامەوێ ساغ بمەوە. من ئاواتمە تۆ خۆت بیتە سەر سەرینم و بە هۆی سەری بە قولاپەی کەزیەکانت- کە وەک سەری ڕەشماری بەژەهر دەچن- تەواوم کەی، ببمە شەهیدی ئەوینت.

ئەو کەزیانە کە من دەڵێم ماری ڕەشی سەر بە ئاڵقەن، بۆنیان هێند خۆشە دەشتوانم بێژم چاکترین ڕەشەڕێحانەی بۆنخۆشن لە دەوری باڵای وەک سەولا لار بوونەوە. لەولاشەوە وەکوو ماری پاپۆکەدەر لە سەر شان پاپۆکەیانە و بە پرچبەندی سوور و ئاڵ شیراونەوە. ڕەشماری ئەو جووتە کەزیە درێشووکەیان هاتە دڵ؛ ژەهریان پژاند. لایان وایە من مارانگەستەی ئەوانم. بەڵام نەخێر من هەر زۆر لە مێژینەوە، هەر ئەو ساتەی کەوتوومە ناو گێژی ئەوین، دەستم لە گیانم بەر بووە. ئێستاش لە پاش گیان دەرچوونیش، شەو و ڕۆژ لە تاو ئەو لێوە شیرینانە، تاڵی‌کێش و لە ئازارم و ئاخهەڵکێشم. نازانم تکاکارەکەم بە کام باردا چارەم دەکا؟ ئەو یارەی کە من دەیناسم، ئەگەر ئێستا هەر بە چاوی خۆم بیبینم، لە بان سەرینم وێستاوە، لە خۆشیانا باوەڕ ناکەم. هەرجارێکیش چاوم بە چاوی بکەوێ، حەو ڕۆحم بێ، تازە ناژیم؛ گەشکە دەگرم و بۆی دەمرم. ئەو ناسکۆڵەی ڕەگەزگوڵە، بەر لەوە خوا گیانی ئێمە درووس بکا، پیاڵەیێکی لە ئاوی کەوسەری دامێ. منی مەلای دڵدار و هەژار و بێ‌کەس و زەبوون، هەتا ڕۆژی عەشرێ مەستم؛ ئەغیار بوونەوەم بۆ نییە.



## سوڵتانی بوتان

| | |
|---|---|
| ١ | لاتــــێ حوســــنی و شـــەهێ خووبـــانی<br>ب خـــوە هـــەم خـــانی و هـــەم خاقـــانی |
| ٢ | یووســــفێ ســـانی تـــو ئـــیرۆ خـــانم<br>کـــو ب حوســـنا خـــوە نـــەدێری ســـانی |
| ٣ | ب سوڕ و هەیبەت و سەهمێ خوە پوڕی (پەری)<br>ب تـــــە شـــینت ل بوتـــان ســـولتانی |
| ٤ | ب تەبلخانـــــەیێ شـــاهی وەرە تـــــەخت<br>کـــو تـــو ئـــیرۆ شـــەهێ کوردســـتانی |
| ٥ | کاکولـــێ بـــەردە ب ســـەر خـــاڵ و خـــەتان<br>کـــو موسەلســـەل بنومێـــت رێحـــانی |
| ٦ | ئیسـمێ ئـەعزەم تـە دڤـێ چ ل (چـل) ئیسـمێ<br>ژ دو حـــــــەرفان ب موعـــــــەمما زانی |

**مانای وشەکان:**

**لات**: بت؛ **نەدیری**: نیێتــە؛ **ب تــە شین**: بــەتۆ دەشـێت، بـۆ تـۆ رەوایـە؛ **تەبلخانـە**: نەقارەخانە، دەستەی مووزیکی شایانە.

**پوختەی مانا:**

تۆ نموونەی خودای جوانیت و جوانان دەبـێ بتپەرستن. خونکـاری گـش نـازدارانی. چاوجوانان ناوی خان بێنن، بە تۆ دەڵێن. ئەگـەر باسـی قـەراڵ و قاقانانیـان کـرد، تـۆ

مەبەستی. خانمە ناسک و نازدارەکە! تۆ ئەمڕۆ یەکەمین جوانی لە دنیـادا. ئەگـەر لـە مێژووش بنۆڕین، تۆ لە پاش یووسف دووهەمی و بۆ خۆت هـیچ دووهـەمت نییـە. بـە دڵکێشی و هەیبەت و سـامێک کـە هەتـە و لـەو بابەتـەدا زۆر زۆری، سوڵـتانیی هەموو نازداران شیاوی خۆتە و بۆت هەیە پەڕی سوڵتانیی لە سەرت دەی.

دەسا با نەقارەخانە تەپڵی شادی و خۆشی لێ دا و لە سەر تەختی سـەروەریی هـەموو جوانان جێگیر ببە! ئاشکرایە کە کیژەکورد، لە جوانیدا لە هەموو دنیا بێوێنەن. تـۆش لەچاو گش کچەکوردێک، وەک پادشای لـەچاو گـەدایان. واتـا: ئەمـڕۆ تـۆ خونکـاری کوردستانی. کاکۆڵەکەت با بێتە سەر خاڵ و میلت؛ تـا ڕەشـەڕێحانەی بۆنخـۆش، بـە زنجیرە خۆ بنوێنێ و ببنە نموونـەی دوو شـێوە خـەتی ڕەیحـانی و موسەلسـەل، بـە ڕێکوپێکی و بە جوانی.

تۆ بۆ دنیا هێنانە بەر فەرمانی خۆت، بۆ ئیسمی ئەعزەم مەگەڕێ و گوێ مـەدەرێ کـە دەڵێن دەبێ چل ناوان لە ناوی خودا لەبەرکەی. شایەت لە نـاو ئـەو چلـەدا، تووشـی ئیسمی ئەعزەم ببی و بە جامی چل‌کلیل، ئاوێ بخۆیتەوە و بە خۆیدا کەی. تۆ لـە دوو پیتی ڕوخسارت، ئەو مەتەڵـۆکە هەڵـدێنی. «ص»ی چـاوت- کـە صـاد خـۆی نـاوی قورئانە- ئەلفی بەژنت- کە بەڵگەی زۆر لە ناوانی خوای گەورەیە و دوو جاران لە ناوی گەورە (ئیسمی ئەعزەم)دا هاتووە- بەڵگەت بەسە کە تۆ تووری و نووری خودا لە تۆی داوە و ئەو هەموو جوانییەی پێت داوە و دەتوانی لە سـەر دنیایـە شـانازی لـە زەمـین بکەی کە بەو جوانییە خودادادەت، هەنگاوی لە سەر هەڵدێنی.

٧ چ بـەرات بـوو وە ب سـەردا کـاکول
چـین ب چـین میسـک ب تـوغرا رانی

٨ تـە چ حاجـەت ب سـولەیمانیێ حوسـن
خاتەمـەک لەعلـە ب گەوهـەر سـانی

٩ چ خـەت ئەشکسـتە موسەلسـەل یـارەب
کـو تـە پـێ نەسـخ کـری دیـوانی

**مانای وشەکان:**
**خاتەمەک**: ئەنگوستیلەیەک؛ **خاتَمکْ**: ئەنگوستیلەی تۆ؛ **خەتی شکستە و موسەلسەل و نەسخ و دیوانی**: چوار شێوە خەتی هونەری و جوانن؛ **نەسخ**: سڕینەوە، لە ناو بردن؛ **نەسخ**: نووسینەوە؛ **شکستە**: شکاو؛ **موسەلسەل**: بەزنجیرە؛ **دیوان**: بارەگای مەزنایەتی؛ **دیوان**: کتێبی شیعر.

**پوختەی مانا:**
ئەو کاکۆڵە چین لە سەر چینەی تۆ هەتە، مۆری پادشای شاهانە بۆت بە خەڵاتەوە نراوە. خەتی بەرات و مۆرەکە، نە ڕەنگە نە مەرکەفە؛ میسکی چینە، چین لە سەر چین داندراوە و لە سەر سەری تۆ نراوە و لە بەر چاوان ڕانراوە. تۆ هیچ کارت بە ئەنگوستیلەی سولەیمان- کە بە هۆی ئەو، حوکمی لە سەر دنیا دەکرد- نابێ و نییە؛ تا بە جوانی، لە سەر جوانان داوای سولەیمانیی بکەی. ئەنگوستیلەی سەرداریی و فەرمانڕەواییت لەسەر عالەم، لێوی ئاڵی ڕەنگ لاڵەتە و لە بنیاد و ڕێزەگەوهەر، ڕیز کراوە. هەرچی بە لێو بیدرکێنی، هەموو خاوەن ژیان و گیانێک، بەگیان‌ودڵ پێکی دێنێ و دێویش ناتوانێ بیرفێنێ و ئەو کەتنەی بە سلێمان‌کرا، بە تۆش بکرێ.
ئەی خودایە! چ نەخشێکت لە ڕووی یاری من شان داوە؟ بسک و پەرچووکە و کاکۆڵ و کەزیەکانیت، بە هەموو شێوەخەتێکی دەستی قودرەتت کێشاوە. هێندێک شکاون بۆ جوانی، هێندێک هۆنراو بەزنجیرە، هێندێک ڕێک‌وپێک، وەک نەسخ، هێندێ وەک خەتی دیوانی، لەبەر چاو ئاڵۆز و تێکەڵ. لە ڕاستیشدا موو لە موو تێ‌نەپەڕیوە؛ هەموو نەخشی هونەراویی خەڵکی زەوینت پێ سڕییەوە و لە دیوانی شاعیراندا وات کرد هەر ئەو بنووسنەوە. (یان: لەبەری بنووسنەوە.)

۱۰ گـەرچی پوڕخـال و نیشـانی ئـەمما
ب نیشـانی کـو تـو بـێ نیشـانی

۱۱ ئـەی پـەری جوورسرشـتێ هەرچەنـد
ب بەسـەر ئـادەمی و ئینسـانی

١٢ سوڕێ (سیررێ) سوبحان تە ژ حوسنێ دنومێت
«اَحْسَنَ‌اللە» ژ سوڕا (سیرا) سوبحانی

١٣ چ حەدێ عەقلە قیاسێ تە کرت؟
ئەڤە بورهان کو تو بێ بورهانی

**مانای وشەکان:**

**سوڕ**: دڵکێشی؛ **سیرر**: حیکمەت؛ **سوبحان**: پاک؛ **سوبحان**: ناوی خودا؛ **احسن‌الله**: بنازم بە کاری خوا، خوا چەند جوانی کرد؛ **حەد**: کەوشەن، سنوور؛ **بورهان**: بەڵگەی زۆر ڕوون.

**پوختەی مانا:**

ئەگەرچی چاو لە ڕواڵەتدا خاڵ و خەتی تۆ دەبینێ و لای وایە بوونە نیشانەت، لە خەڵکی دیت جیا کاتەوە، بەلام چاو لە هەڵە چووە. نیشانەی تۆ لە بێ‌نیشانی تۆدایە و ڕەنگت نییە و دەهەموو ڕەنگانیشدا هەی. هەرکەسێ دەڵێ من دیومە، دیارە نەیدیوی و ناتناسێ. هەرکەسێ کە تۆ بناسێ، هەر هێندەی لێ حاڵی دەبێ، کە تۆ هیچ نیشانت نییە و نازانێ تۆ وەک چی دەچی.

پەرییەکەی ئامیان حۆرییە کە هەرچەند لە ڕواڵەتا مرۆی، پێستی مرۆت دەبەردایە، بەلام ئەو دڵکێشییە پاکەی دەتۆدایە، نوێنەری ڕازی نهێنی سوڕی هونەری خودایە.
ئەی نامەخوا لەو حیکمەتەی خوا نواندوویە! سەد ماشەڵڵا لەو دەسکارە جوانەی خودا.
لە ڕادەی عەقل بەدەرە، بەراوەردت دەگەڵ ئافەریدەکان بکرێ.
بەڵگە لەسەر جوانی بێ وێنەت لە دنیا، بێ بەڵگەیی و سەرگەردانیی دڵدارانتە.

١٤ مە تەمەننا ژ نەسیم خاکێ رەهە
پێ بکین دیدەیی دل نوورانی

١٥ نەفەسەک بێ تە مە نایێ بیَللاه
تە تنێ رۆحی تۆ رۆح و جانی

١٦ سەد هەزاران ژ تە پەیکان د دلن
لێ ل سەر وێ مە تنێ دەرمانی

۱۷ تـــە بـــرینێن مـــە کەوانـــدن دیســـا
ژ نـــوو ئـــاگر تـــە ل داغـــان دانی

۱۸ تە «مەلا» پور د جەگەر گەزمە نـەلۆ (نـە لـەو)
وە پەریشـــــــانی و پورئێشـــــــانی

**مانای وشەکان:**
**رۆح**: گیانی ماک، کە خوا فەرمووی: هەر خۆم دەیزانم چلۆنە؛ **جان**: گیانێکە دەزگای لەشی زیندەوەری لە ماوەی دیاریکراوی ژیانی ئەم سەرزەمینەدا پێ سپێراوە و دەبـەر فەرمانی گیانەکەی سەرەکیدا. کە فـارس بـە ڕەوان و جـان ناویـان نـاون؛ **کەوانـدن**: داغکردن؛ **لۆ**: بۆچی؛ **لۆ**: کابرا، لاقۆ؛ **لەو**: بۆیە.

**پوختەی مانا:**
دەستەوداوێنی شنەباین؛ تۆزێک لە تۆزی ڕێبازت بۆ مە بێنـێ؛ تـا دە چـاوی دڵـمانی کەین؛ دڵمان ڕۆشن ببێتەوە. سوێند بە خودا، هەناسێکیش بێ تۆ ناژیم. تۆ هەر ڕۆحی بەتەنیام نی؛ تۆ ڕۆحیشم و ڕەوانیشمی. زۆرم سەرەتیری دووریت لە دڵدایە. دەرمـانی برینی دڵم، لە دەست دیداری تۆدایە و بـە کەسـیتر چـارم نایـە. فـەرمووت نـاتوانی بمبینی؛ ئەی خوا هاوار! برینە جێ داخەکانی جەرگ و دڵـم، هێشـتا هـەر خوێنیـان دەدەلاند؛ سەرلەنوێ داغت پێوە نان و ئاگرت تێ بەردانەوە.
کاورای مەلای دڵداری ژار! چیتە هێندە پەرێشان و دەم بە هاوار و پڕ ژانی؟ دڵـبەرت تۆی خوێندۆتەوە کە جەرگی بە تیر هەنجنیت. کێیتر وەک تـۆ بەختـەوەرە، یـار بـە تیرانی وەخوێنێ؟ چۆنە بە چاکە نازانی و گلە دەکەی؟!



# چین و ماچین

| | |
|---|---|
| ١ | مــــزگین ژ مـــــەرا بێــــت ژ سورشـــــیرینێ<br>جانـــێ خــــوەیی شـــیرین ددرم مزگینـــێ |
| ٢ | سـەد چـین د خـوەدا گرتییـە زولفـا تـە ب چـین<br>شـیعرا مــە وە حــەق لــەو چــوو حــەتا ماچینــێ |
| ٣ | نەقشــێن فەلــەکان گــوە دەدرن ڤــێ نــەزمێ<br>تــەنها نــە بەشــەر هــەر دکــرن تەحســینێ |
| ٤ | عیشـــقێ ژ خودێــــدا تـــو بخــــوازی ژێ را<br>گــەر دێ ل نــەیارەک خــوە بکــی نــەفرینێ |
| ٥ | یــەک سـەجدە تنــێ فــەرزە د دینــێ عیشــقێ<br>بـــن بەرقـــەدێ یـــارێ د مــەجالێ دینـــێ |
| ٦ | عاشــق کــو ب دل فاتیحــەیا عیشــقێ خوەنــد<br>ئایــــات یەکایـــــەک دکـــــرن ئامینــــێ |
| ٧ | مـە ژ لـەعلێ لـەبێ یـارێ ڤـەخار ئاڤـێ حـەیات<br>ئـــەغیار بــــلا تێکــــی بچــــن دارینــــێ |

**مانای وشەکان:**

**چین**: قەدیم بریەتی بوو لــە مەڵـبەندی کاشـغەر و خوتـەن، کـە بـە ئاسـکی میسـک ناسرابوون؛ **ماچین**: کورتەی «مەهاچین»، واتا: چینی گەورە. کە ئێستا «مەها»کە فڕێ دراوە و هەر چین ماوە؛ **تەحسین**: ئافەریم؛ **نەیار**: دوژمن؛ **نەفرین**: تووک.

**پوختەی مانا:**

هەرگا مژدەی دیدارێکم لە یاری خوێن‌شیرین بۆ بێت، گیانی شیرین بە مزگێنی دەدەم بەو مزگێنی‌هێنە. پرچە چین لەسەر چینەکەت- کە سەد چینیش پتر دەبێ- ناوی هاتە ناو شیعری من؛ بۆیە شیعرم وەک میسکی خەتا و خۆتەنێ بە بۆنخۆشی بەناوبانگە. تەنانەت خەلکی ماچین و چینی گەورەش- کە میسک مالی خۆیانە- بە ئاواتن ئەو شیعرانەی منیان هەبێ.

«نالی» دەلێ:

خەتات فەرموو کە خۆشە چین و ماچین

کە ناچین لێرە خۆشە چینی ماچین

نەک تەنیا خەلکی ڕەمەکی بە شیعرم دەلێن ئافەریم؛ ئەو ئەستێرەی دەدرەوشێن و بوونە نەخش لە ئاسمانان، پەسنی هۆنراوەی من دەدەن. ئەوەش هەمووی لە سایەی پرچی هۆنراوی بە ئالقە و داوی چین-چینە. ئەوینی کەزی تۆ وای کرد، کە من هێندە دەمپاراو بم. ئەگەر دوژمنێکت هەیە و دەتەوێ تووکی لێ بکەی، بلێ خوایە ئەوینی بخە دلەوە. لایەک دەسووتێ و دەپرووکێ و لە لایەکیش کینەی لە دلدا نامێنێ و دەبێتە دۆست. لە ئاینی دلداراندا، لە کاتی دیتنی یاردا، سوژدەیەک بۆ بەژنی فەرزە. سوژدەی تریش ئەگەر بەرین، سوننەتە و خێری تێدایە.

ئەو دلدارەی خۆی دەقەبەل ئەوین دەکا و بۆ پێک‌هاتنی سەوداکە، سوورەی فاتیحا دەخوێنرێ، هەموو ئایەتی قورئانێ دەلێن خێری لێ ببینی؛ پیرۆزت بێ.

من لە لێوی یارەکەی خۆم، ئاوی ژیانم خواردۆتەوە. با نامۆیان بە تێکڕایی بە شوێن خدر و ئاوی ژیاندا بەرەو دارین هەلوەدا بن.[1]

٨ لازم ب خوە ئایینەیێ «روحُ القُدُسي» تو

لەو کەس نەدیەن حۆری ب فێ ئایینێ

١. دەلێن خدر دەگەل مووسا، لە نێوانی دوو دەریایان لە شوێنێکا بە ناو «دارین» تووشی یەک بوون. کە چیرۆکی ئەم تووش‌بوونە، لە قورئانێدا هاتووە. بەلام ناوی خدر نابا و «دارین»یشی تێدا نییە. «هەژار»

٩ جائز ب تە «مِنْ حَیْثُ بَشَرْ» نسبەت دان
بیهن و شەفەق و نازکییا نەسرینێ

١٠ ئەڤ رەنگێ فەساحەت ژ بەشەر سیحرێ حەلال
ئیعجازێ بەیان ئانییە بەر تەدوینێ

١١ دا نالە و ئاهێن مە ژ دل سەح بکری
وەر گوهـ بدە هنداڤی سەرێ بالینێ

**مانای وشەکان:**

**ئایین**: ڕەوش؛ **ئایین**: خشڵ؛ **ئایین**: شکۆ؛ **ئایین**: جوانی؛ **مِنْ حَیْثُ**: بەو ئیحتوبارەی؛ **بەیان**: وتار؛ **بەیان**: ڕوونکردنەوە؛ **تەدوین**: کۆکردنەوە؛ **سەح بکری**: ببیسی؛ **هنداڤ**: لەدیار، نێزیک؛ **بالین**: سەرین، باڵگە.

**پوختەی مانا:**

یاری نازدار! بە بیری من، تۆ دەبێ ئاوێنەیەک بی جوبرایلت تێدا دیار بێ. ئەگینا قەت حۆری و پەری وا جوان و شەنگ نەڕەخساون؛ چونکە لە بیچمی ئادەمیت، دروستە پێت بڵێن مرۆ. ئەگینا بۆنی وا خۆش و ڕوخساری وا تیشکدەر و ناسکیی پێست- کە وەک پەلکی گوڵی نەسرین دەچێ- کام بنیادەمی وا هەیە؟

گفت و لفتت هێندە ڕەوان و شیرینە، وتارت هێندە ڕەنگینە، بوویتە جادووگەر لە دڵان و جادووەکەشت بە شەرعی خودا ڕەوایە و دەکرێ بڵێین مۆجزاتە.

بۆ ئەوەی دەنگی ناڵین و ئاخهەڵکێشانم ببیسی، دەبێ بیتە نزیک سەرینی جێگاکەم؛ کە نەخۆشم و تێدا کەوتووم. ئەوسا بەحاڵ نووزەی منت گوێ لێ دەبێ و خۆم نابینی.

«مُتَنَبّی» (٣٠٣- ٣٥٤ کوچی مانگی) تاکبەیتێکی هەیە دەڵێ:

ئەوەند زار و زەبوونی تۆم کە لێم بڕوانی نامبینی
مەگین دەنگم ببیسی و باوەڕی بێنی کە هەر ماوم[1]

---

١. کفی بجسمی نُحولاً أننی رَجُلٌ لَو لا مخاطبة أیّاکَ لَم تَرَنی

«حاجی قادر» دەربارەی دەم و بەژنی یار فەرموویەتی:

تا دەستی نەدا خەنجەر و نەیفەرموو دەسا دەی
حاجی بکوژن خێرە مەدەن ئیتر ئەمانی
ئیمکانی لە لای ئەو عولەمای موو دەقەلێشن
عەنقا و وەفا بوو چ میانی، چ دەهانی

۱۲ فەرهاد دزانت تو ژ پەرویز مەپرس
ئەتواری غەمێ عیشق و سوڕا شیرینێ

۱۳ بێ نوقتە نهن دائیرە ئیحسان کە «مەلا»
دەووار چ کت دائیرەیا تەکوینێ

**مانای وشەکان:**

**نهن**: نین؛ **ئیحسان**: چاکە؛ **دەووار**: زۆر خولدەر؛ **تەکوین**: پێکهاتن؛ **ئەتوار**: گۆڕان‌گەل، بارگەل.

**پوختەی مانا:**

پەروێزی مێردی شیرینێ چوزانێ ئەوین یانی چی؛ دەبێ لە فەرهاد بپرسین. ئەو دەزانێ دلکێشی شیرین تا کوێ بوو. ئەوین چەند جۆرە دەردی هەن. هەموو جەغزێک نوقتەی ناوەندی هەر هەیە. ئەوین ئەو نوختەی ناوەندەس لە جەغزی ئەم جیهانەدا. هەتا پیاو بەو نوختە نەگا، سەرگەردانە و بەدەوری جەغزا خول دەخوا. دەسا ئەی یار! بەزەییت بە مەلادا بێت. شارەزای کە لە بارەگات؛ کە چیتر بە سەرگەردانی بە دەوری جەغزا نەسووڕی. با بگاتە تۆ؛ کە نوختەی ئەو جەغزە گەورەی هەموو ئافەریدەی تێدا، هەر تۆی؛ هەر تۆی.



## بەقا نینن ل بۆ تشتێ[1]

١ ژ مابــەینا دو ئــەبروویان دبیــنم قابەقەوســەینێ
«تَـعـالــيالله» بنێ رەمزێ چ رەنگ ئاڤێتە مابــەینێ

٢ بنێ نوونێن ل سەر سادان کو کاتب گۆشە لێ بـادان
سەراســەر قـاف تـا قافـە رمـووزا حیکمەتولعـەینێ

٣ بەقا نینن ل بۆ تشتێ، حـەتا کـەنگێ بکـین پشـتێ
د عیشـقا وان پـەریرۆویان وەرن دنیایــە دادەینــێ

٤ ب بەرقا شیر و ئەلماسان ب تیرێژێن د شەهکاسان
سەراسەر ئەهلێ دنیایـێ دسـووژی تورفەتولعـەینێ

٥ «مەلا» بیللاه دڤێ دەورێ ب ڤێ رەنگێ ب ڤـێ تـەورێ
نیشان دا وەک «نیشانی» کەس دەرانین دوڕ ژ بەحرەینێ

**مانای وشەکان:**

**تَعالَیالله**: پایەبەرزیی بۆ خوا، نامەخوا؛ **حیکمەت**: سوڕ؛ **عەین**: چـاو؛ **حێکمەتولعـەین**: ڕاستی تەواو؛ ***حێکمەتولعەین***: کتێبێکە لە عیلمی حیکمەتـدا نووسـینی نەجمـەددین قــەزوێنی؛ **پشـتی**: کۆڵەپشــت، تێلەکــە؛ **پشــتی**: پاڵەوپشــت؛ **دەینــێ**: بـدەینێ؛ **تورفەتولعەین**: چاوترووکانێک؛ **تەور**: ڕەوانی ئاو؛ **بـەحرەین**: دوو دەریـا؛ **بـەحرەین**: ناوی مەڵبەندێکی میرنشینە لە سەر خەلیج کە دەریاکەی جێگەی ڕاوی مرواریيە.

**پوختەی مانا:**

لە نێوان دوو برۆیاندا، بە مەودای ژێکەوانێک دێتە بـەر چـاوی دڵ و گیـانم. خودایـا

[1] ١. ئەم غەزەلە لکابووە ئەوی پێشەوە. لێکم کردنەوە و ئەم ناوەشم بۆ دانا.

گەورەیی بۆ تۆ. بە چەند ڕەمز و ئیشارە، ئەم نێوان دوو برۆیە نەخشاوە. دە بڕوانە کە ئەو جووتە برۆیانەی لە شکڵی نـوون، لـە سـەر چـاوانی وەک «ص»ن دەسـی توانـای هونەرمەندی خودای گەورە، بەرەو تیلە چەماندوونی. وەکـوو نەسسـێک گەیاندوویـە. ئیشارەی ڕاستی ئەو چاوە، هەموو دنیای لە قاف تا قاف، وەبـەر داوە و لـە دەسـکاری خودای جوانی، نیشانێکن. کتێـبی حیکمەتولعـەینی وەلا نـاوە و کەسـێ ئـەو چـاو و ئەبرۆیە بە چاوی دڵ تماشا کا، چ حەددی هەس لە وەستای کارسازی بێنیازی جوانی وا بێوێنە حاشا کا؟

دنیایە کە بێبەقایە و هەرچی لە ناویشیدایە، بۆ کەس هەتا سەر نەمایە. تا کەنگێ پاڵی پێوە دەین؟ تا کەنگێ لە کۆڵمانی دەین؟ وەرن وەک من بکەن یاران! شـتی دنیـا بـە دڵداریی وەگۆڕین و لەسەودادا بزانن ئێمە سەرکەوتووین.

«نالی» فەرموویە:

بێـزارە لــە تــۆ، ئێســتە هەماغووشــی عەدووتــە

دنیــا کــە دوێنــێ حــەرەمی موحتــەرەمت بــوو

برۆی وەک شیری ئەڵماسن لە تیژیدا، تررووسکەی چاوەکانیشی، لـە شاکاشـی گـرۆی مەیخۆری دڵداران، بەدی بکرێ. لە چاو لێکنانی یارمدا، لـە مـاوەی چاوترووکانێـک، هەموو دنیا بە گڕپەی ئاگر و تینی ئەوینی خۆی دەسووتێنێ. مەلا سوێندت دەدەم بە خـوا! لـەوان ڕۆژان وەکـوو شـیعرت ڕەوان و جـوان و ڕەنگینـە و بـە مانـا و خـۆش و سەنگینە، لە توانای کام غەواسدایە لـە نـاو دەریـاش دوڕ و مـرواری وا بێنـێ کـە نیـو هێندەی بنرخێنن؟

## پەسنی میری بۆتان

۱ ئەی شەهەنشاهێ موعـەززەم! حـەق نیگەهـداریٚ تـە بی
سـوورەیی «اِنّـا فَتَحْنـا» دۆرومـاداریٚ تـە بی

۲ هـەر کـەناریٚ پێڤـە وەرگێـری عینانـیٚ هیمـەتیٚ
زوهـرە بـیٚ پـەیکیٚ تـە و کـەیوان رەکێبـداریٚ تـەبی

۳ دائیمـا مەنزلگـەها سـوورا تـە بـت بورجـا شـەرەف
تالیعـیٚ فەرخونـدە و بـەختیٚ سـەعید یـاریٚ تـە بی

۴ سـەبعەیێ سـەییارە و نـوە چـەرخێ سـەرگەردان بڤـیٚ
گەردش و دەوریٚ عەجەب دەر خدمەت و کـاریٚ تـە بی

۵ ماهتابـا دەولـەتیٚ یـەک پەرتـەوەک شـەمعا تـە بـت
ئافتابـا رەفعـەتیٚ بەرقـەک ژ ئـەنواریٚ تـە بی

۶ لامیعـیٚ فـەتحا ئـەزەل بـەرقیٚ ژ بـەر تاجـیٚ تـە دت
کەوکـەبا سـەعدا ئەبـەد نەجمـەک ژ سـەییاریٚ تـە بی

**مانای وشەکان:**

**نیگەهدار**: ئاگادار؛ **دۆرومادار**: لە دەوراندەور؛ **پێڤـە**: بۆ لای؛ **عینـان**: جڵـەو؛ **رەکێـب**: ڕکێف، ئاوزەنگی؛ **رەکێبدار**: مەیتەر؛ جڵەودار، پیادەی لەگەڵ سواران؛ **سوور**: وارش؛ **شەرەف**: بڵندی و گەورەیی؛ **فەرخوندە**: ممبارەک؛ **سەعید**: پیرۆز؛ **سـەبعە**: حـەوت؛ **سەییارە**: گەڕۆک؛ **سەبعەی سەییارە**: حەوت ئەستێرەی گەڕیدە لە ئاسماندا؛ **دەر**: لە؛ **پەرتەو**: شەبەق؛ **دەولەت**: بەختەوەری.

**پوختەی مانا:**
ئەی پادشای زۆر بەقەدر! خودای مەزن ئاگای لێت بێ. سورەتی «اِنّا فَتَحْنا»- کە خەلاتی سەرکەوتنی پێغەمبەرە لەسەر کافران- هەمیشە لە دەوری تۆ بێ. بۆ هەر کوێ جڵەو وەرگێڕی، زوهرە قاسیدی ڕێگەت بێ و زوحەل ببێتە مەیتەرت؛ ڕکێفەکەت بۆ دابگرێ، تا سوار دەبیت. ئەو بورجەی کە مزڵی تۆیە و کەوتۆتە ناو وارشی شار و ناویان ناوە بورجی شەرەف، بەڕاستی بورجی شەرەفە و بە وجوودی نازەنینت، شەرەفی پەیدا کردووە. یاخوا هەمیشە ئاوا بێ. هەمیشە هەر بەختەوەر بی و گش ڕۆژت جەژنی پیرۆز بێ. حەوت ئەستێرە گەڕیدەکانی ئاسمانێ، بە ئاسمانی خولدەرەوە- کە سەرگەردان چەرخ دەخۆن- بەو گەڕانە سەمەرەوە لە کار و خزمەتی تۆ بن. تیشکی مانگی دنیاداریی و سەرکەوتن و بەختیاریی وەک گڕی مۆمی تۆ وا بێ؛ کە گڕی مۆمی پێشە تۆ، لە مانگەشەو ڕۆشنترە. خۆرەتاوی پایەبەرزیی برووسکەی ڕۆشنیی تۆ بێ. ترووسکەی خودای ئەزەلی، بۆ سەرکەوتن بەسەر نەیارانی دەوڵەت لە تانجەکەتدا بترووسکێ. ئەستێرەی بەودمی ئاسمان، تا هەتایە، یەک لە کێشکگرانت بێ.

٧ بەرقێ سوببووحی کو ئیشراقێ ل سەد جانان ددەت
ئەو کو کەشفا دل دکت ڕەمزەک ژ ئەسرارێ تە بی

٨ رایەتا فەتحێ ژ نەسرا تە کو هەر مەنشوور بوو
شەهسەوارێ فەررێ سوبحانی عەلەمدارێ تە بی

٩ نەی تنێ تەبریز و کوردستان ل بەر حوکمێ تە بن
سەد وەکی شاهێ خوراسانێ د فەروارێ تە بی

١٠ گەرچی دەر ئیقلیمێ رابیع هاتی تەختێ سەڵتەنەت
پادشاهێ هەفت ئیقلیمان سەلامکارێ تە بی

١١ چیمەنا سولتانیێ یەک لا لە یەک باغێ تە بت
گولشەنا خاقانیێ خارەک ژ گولزارێ تە بی

١٢ ئێ ژ ئەمرا تەی موکەررەم سەرکەشی کت میسلی شـەمع
بـەر سـەری تیخـێ تـە و مـەفتوولێ مووکـارێ تـە بی

**مانای وشەکان:**

**سوببووح**: خودا؛ **ئیشراق**: تیشک‌هاوێژی؛ **نەسر**: سەرکەوتن، یاریـدە دان؛ **مەنشـوور**: بڵاوکراو، شەکاو و هەڵکراو؛ **عەلەمـدار**: ئاڵاهەڵگر؛ **ئیقلـیم**: مەڵـبەند؛ **رابیـع**: چـوارەم؛ **سەلتەنەت**: دەستەڵات و فەرمانڕەوایی، سوڵتانی؛ **چیمەنا سولـتانی**: بنکەی تەیمووری لەنگ بوو لە ئێران؛ **مووکار**: تیژی مووهەڵگر.

**پوختەی مانا:**

ترووسکەی نووری خودا، هەرگا لە سەد جۆرە گیانان بدات، دەزانێ چییان دەدڵـدایە.
ڕازان بۆ تۆ ئاشکرا کا و ڕازداری نهێنی تۆ بێت.
ئاڵای مەملەکەت گرتنت، هەر بشەکێ و سەرکەوتوو بی. شاسواری شـەوکەتی خـودا، ئەو ئاڵایەت بپارێزێ. نـەک هـەر تـەورێز و کوردسـتان بەتـەنێ هـی تـۆ بـێ؛ یـاخوا فەرمانڕەوای خوراسانیش سەر بۆ فەرمانت نەوی کات. هەرچەند لە مەڵبەندی چوارەم چویە سەر تەختی گەورەیی، بە ئاواتم پادشای حەوقوڕنەی دنیایـە بێنـە سـڵاوت. لـە تەیمووری لەنگ زلتر بی. لە خانی مەغول گەورەتر. چیمەنی سوڵتانیی تەیموور، تاکە گوڵە مێلاقەیەکی باغت بێ. باغچەی خاقان، دڕکێک لە گوڵزاری تۆ نەهێنێ.
هەر کەسێکی لە فەرمانی بەڕێزی تۆ سەرکێشی کات، یاخوا وەک مۆم سەری بە تـیخ بە بڕین بچێ و بەر تیخی مووکارت کەوێ.

١٣ شـــاهباز ئەرچەنـــد پـــەروازێ ب بـــالا بێـــت و رەت
دێ د نـێڤ تـۆرا تـە بێـت و سـەیدێ شـونقارێ تـە بی

١٤ شـاهێ پوڕهەیبـەت د دێـرت لـێ ب سـەهمێ زێـدەیی
سـاعەتا غەفلـەت خویـا بـێ کـووز دبـن بـارێ تـە بی

١٥ هەرسەرێ دەولەت هەبت دێ هەر دنێڤ بەنـدا تـە بـت
هەرکەسـێ عاقـل بـتن دێ هـەر د چۆکـارێ تـە بی

۱۶ ئـێ دڤـێت ئـازادە بـت دێ چەهڤـنێر لوتفـا تـە بـت
هــەرچی ئیسـتغنا د دل بــەر میننــەت و پــارێ تــە بی

۱۷ هەرکەسێ قەستەک د دل دێ قەستێ دەرگاهێ تـە کـت
ئـێ د خــاتر ئــەرجوو کــت دێ هــەر ڕجاکـارێ تـە بی

۱۸ ئـێ نـە دەولـەتخواهێ حــەزرەت بـت ژ نێڤا جـان و دل
شــوبهەتێ ئــەهلێ شــەقا بــەر قــەهر و ئــازارێ تـە بی

**مانای وشەکان:**

**شاهباز**: بازی سپی؛ **پەرواز**: فـڕین؛ **کـووز**: پشـتچەماو، کـووڕ؛ **چوکـاری**: چـاکری، خزمەتکاری؛ **ئازادە**: سەربەست؛ **ئیستیغنا**: بێنیازی؛ **پار**: بەش؛ **ئەرجوو**: ئاوات، ڕەجا؛ **حەزرەت**: حوزوور؛ **حەزرەت**: وشەی ڕێزلێنانـە؛ **شـەقا**: بەدبـەختی؛ **شـەقی**: یـاغی؛ **ئەهلی شەقا**: جەحەندەمی؛ **قەهر**: تووڕەیی.

**پوختەی مانا:**

ئەوانەی شاباز ئاسایی بەرزەفڕن، هەرچەندی کە بێن و بچن، هەر دەکەونە تۆڕی تـۆوە و دەبنە ڕاوی شمقاڕی تۆ. شای ئێرانێ، هەیبەت و مەترسیی زۆرە؛ بەڵام ئەو بەشـەی لێ زیادە. دەمەوێ لەخوتوخافڵ پەیدا ببێ و پشتی لە ژێر باری تۆدا، دابنەوێ. هـەر سەرێکی خوا بەخت و ئیقباڵی دابێ، خۆی دەخاتە بەر دڵدارییی تۆ. هەرکەس ئـاوەزی لە لا بێت، هەر خزمەتکاریی تۆ دەکا. کێ بخوازێ ئازاد بـژی، چـاوەنۆڕی تۆیـە. کـێ دەیەوی بێنیاز بێ، بەرمنەتی ئەو بەشەیە تۆ دەیدەیەی. هەرکەس نیازی لـە دڵـدایە، بێتە دەرگات نیاز ڕەوایە. کێ ئارەزووی هەرچی دەکا، با بێ و لە تۆ داوا بکا.
هەرکەسـێکیش بـە دڵ و گیـان تـۆی خـۆش نـاوێ، یـاخوا وەکـوو جەحەنـدەمیانی بەدبەخت، قەهر و ئازاری لێ باری.

**١٩** ما ب عەیش و نووش و شاهی ئەوقەدەر عومرێ تـە بـت
چەنـدەکێ سـالیک موجـەددەد بێـت و بـێ، زارێ تـە بی[١]
(یان: سـالیکی موجـەدەد)

**مانای وشەکان:**

**ما**: ماو، باقی؛ **عەیش**: ژیان؛ **عەیشونووش**: خۆش ڕابواردن؛ **شاهی**: شادی؛ **شاهی**: خونکاری؛ **قەدەر**: ئەندازە؛ **سالیک**: سالێک؛ **سالی**: بە ژمارەی ئەبجەدی سەتویەکە. قەڕن سەت ساڵە. بەو ساڵەوە کە قەڕنی تازە دەستپێدەکا، دەبێتە سەتویەک؛ **موجەددەد**: تازەوەکراو؛ **موجدەد**: بە بەهرە؛ **بێت و بێ**: هەر بێن و بێن؛ **زار**: سازگار و موافق؛ **زار**: منداڵ؛ **زار**: زەبوون؛ **زارێ**: لاوێنی.

**پوختەی مانا:**

هەر باقی بی و خۆش ڕابوێری. تەمەنت هێندە درێژ بێت، کە هەتا قەڕن کۆن دەبن و سەرلەنوێ تازە دەبنەوە، هەموو قەڕنێک تـۆ هـەر لاو بی و زەمـان دایم لەگـەڵ تـۆدا سازگار بێ و تۆ هەمیشە هەر خونکار بیت.

**٢٠** هەرکەسێ نـە ژ جـان دوعـاگووی و سـەناخوانێ تـە بـت
گرتیـێ قەیـدا تـە و ئامانجـێ نووبـارێ تـە بی

**٢١** مەدرەکێ عیلمێ زەمیرێ شەممەیەک وەسفا تە هـات
وەر نە کەی عالەم ب شەئنێ قەدر و میقـدارێ تـە بی

**٢٢** قەست و داخـوازا «مـەلێ» دائـیم ژ جـان و دل ئەڤـە
هـەر دبەنـدا خزمـەتێ پێشدەسـتێ دیـدارێ تـە بی

**مانای وشەکان:**

---

١. نیمەی دووهەمی ئەم بەیتە، وا نووسرابوو: «چندکی سالِک مجدد بیت و بیزاری تە بی». منەتبارم خوێندەواران لە من باشتری بزانن. «هەژار»

**نووبار**: تازەکەوان؛ **زەمیر**: بریەتییە لە دڵ و هەناو؛ **شەممە**: کەمێک؛ **شەئن**: ڕەوا، دەربارە؛ **میقدار**: ئەندازە؛ **مەدرەک**: هۆی تێگەیشتن.

**پوختەی مانا:**

هەرکەس نزا بۆ تۆ نەکا و لە دڵەوە پەسنی تۆ نەدات، یاخوا لە زنجیرەی تۆدا شەتەک درێ و بە تیری تۆ سەکەت بێ.

بە ئەندازەی زانست و هەستی دڵی خۆم، ئەو کەمووسکە پەسنەم داوی. دەشزانم لە هەموو دنیا کەس بە ئەندازەی جەنابت پایەبەرز و بەڕێز نییە. لە دەست کێ دێ وەکوو تۆ هەی، پەسنت بدات؟ لە گیان و دڵمەوە دەڵێم: هەر بۆ ئەوەی بە دیداری تۆ شاد ببم، خزمەتکاریی و بەردەستیی تۆ بویتە ئەوپەڕی ئاواتم.



# دیسان پەسنی میرشەرەف

| | |
|---|---|
| ۱ | خانێ‌خانــان لامیعــێ نــەجما تــە هــەر پــوڕ نــوور بی<br>کەشــتییا بــەختێ تــە ئــەز بایــێ موخــالیف دوور بی |
| ۲ | کەوکەبا ســەعدا شــەرەف تــالیع دنــێڤ بورجــا تــە بــت<br>دا تنــێ تــۆ ژ چــەرخێ بــالا شــوبهێ مــەه مــەنزوور بی |
| ۳ | ئەنجومێ چەرخێ موحەددەب هەر ژ زاتێ تــەی شــەریف<br>کەســبێ ئــەنواری بکــن حــەتتاکوو نــەفخا ســوور بی |

**مانای وشەکان:**

**خانی خانان**: سەروەری سەوەران؛ **تالیع**: دەرکەوتوو، هەڵاتوو؛ **تالیع**: بەخت؛ **مەنزوور**: بەچاو؛ **ئەنجوم**: نەجم‌گەل؛ **نـەجم**: ئەسـتێرە؛ **موحـەددەب**: پشـت‌کووڕ؛ **نـەفخ**: پـف؛ **سوور**: کەڵەشاخ کە قەدیم تێیان دەتووڕاند وەک شەیپووری ئێستا. بۆ ئاگادار کـردنی دنیا لە هاتنی کاتی قیامەت، فریشتە ئیسرافیل دە کەڵەشاخ دەتووڕێنــێ؛ خـوا فەرموویـە: «هەرگا دە سوور توڕێندرا، باسی شانازی بە ڕەگەز لە ناو دەچـێ»؛ **سـەحەرگاهان**: دەمـەو بەیانان.

**پوختەی مانا:**

ئەی مەزنی سەروەران! ئەستێرەی بەتیشـکی بـەختت، هەمیشـە هـەروا پـڕنوور بـێ. گەمیەی بەختت لە بای پێچەوانەی ژیان، خوا بیپارێزێ و بەدوور بێ. هەر وەکوو ناوت شەرەفە، ئەستێرەی شەرەف و ئیقباڵ، هەر لە نـاو بورجەکەتـدا بـێ؛ تـا لـەو ئاسمانـە بەرزەوە- کە بریەتییە لە ماڵەکەت و سەری لە ئاسمانێ دەسوێ- وەکوو مانگ تریفـە بدا و لەبەر هەموو چاوان دیار بێت.

ئەستێرەکانی ئاسمانیی، پشت چەماوە هەتا ڕۆژی قیامەتێ دێ، لە ئەستێرەی ئیقباڵی

تۆ تیشکو ڕووناکی وەرگرن. خۆر بەیانان بەر لە جێی تر، گزینگ لە کۆشکی تۆ دەدا. دیارە بەنیازە هەموو ڕۆژ، ڕۆشنیی لە زیارەتی تۆ بە نەسیب بێ و ئەوسا بەسەر دنیایەیدا، پەخشان بکات. (دیارە کۆشکی میر لە جزیرێ، لە جێی‌تر بەرزتر بووە و هەوەڵ گزینگ لەوی داوە.)

۴ ئەختەرا تە ژ پەردەیا غەیبێ ئەگەر بێتن زوهوور
دێ بتن نێسفوننەهارێ وەر شەبێ دەیجوور بی

۵ (ئایەتەلکورسی) و (ئەنعام) هەیکەلا تۆخێ تە بن
بێ‌نیهایەت پوڕمراد و بێ‌عەدەد مەنسوور بی

۶ هەر کەنارێ وەرگەڕینی پێڤە عەزم و هیممەتێ
رایەتا فەتحێ ب نەسرا «لَمْ یَزَلْ» مەنشوور بی

۷ خەیمەتا نووری عینایەت «ظِل»ێ مەمدوودێ تە بت
سورەیێ «اُمُّالْکِتاب» ماداری حەزرەت سوور بی

۸ پاشێ نەوشیروان دبێم دێ حاکمێ عادل توی
میسلێ حاتەم دێ بدانێ دەر جیهان مەشهوور بی

۹ ما جزیرێ شوبهێ دارێ تەختێ هەفت‌ئیقلیم بت
هەم ب حوکم و سەلتەنەت ئەسکەندەر و فەغفوور بی

**مانای وشەکان:**

**ئەختەر**: ئەستێرە؛ **نێسفولنەهار**: نیوەڕۆ؛ **دەیجوور**: تاریکی تۆخ؛ **هەیکەل**: حەمایەڵ و نوشتە؛ **پێڤە**: بۆی، بۆ لای؛ **ظِل**: سێبەر؛ **مەمدوود**: درێژکراو؛ **اُمُالْکِتاب**: سوورەتی فاتیحا؛ **نەوشیروان**: پادشایەکی ئێران بوو بە خاوەن‌داد ناوی دەرکردووە؛ **حاتەم**: عەرەبێکی هۆزی تەی کە بە دەهندە ناوی دەرچووە؛ **دان**: بەخشین، **توخ**: جوقەی پاتشایەتی.

**پوختەی مانا:**

وەک لە پێشەکی باس کرا، لە زەمانی میرشەرەفدا، شاری «جزیرابۆتانیٚ» وارشێکی لە بەردی تاشراو لیٚ کراوە؛ هەموو قورئان لە بەردەکان هەڵکەنراوە. مەلا دەڵیٚ: ئەستێرەی تۆ، ئەگەر لە پەردەی بەپیوار لە شەوی تاریکەشەودا بێتە دەریٚ، دنیا دەبێتە نیمەڕۆ. لەبەر خوا دەپاڕێمەوە ئەو قورئانە بە سوورەتی فاتیحا و ئەنعام و ئایەتەلکورسی و تێکراوە، هەر وەک لە وارشی شارەکەی پاتەخت پارێزگارن، نوشتەی جوققەی سەریشت بن. هەمیشە سەرسەلامەت بی و بە هەموو ئاواتان بگەی و سەرکەوتنت بە سەر دوژمن، لە بنە نەیەت. بەرەو هەرکویٚ بڕیار بدەی هێرش بەری، ئالای پیرۆزی و سەرکەوتنت شەکاوە بیٚ و قەت نەنەویٚ. تیشکی بەزەیی خودایی، وەکوو سێبەر دەگەڵت بیٚ و سێبەرت کورتی نەهێنیٚ و هەر خاوەن پایە و سایە بی. سوورەی پیرۆزی فاتیحا وارشی دەوروبەرت بیٚ و لە بەلایان بتپارێزیٚ. بە بیری من، فەرمانڕەوای هەرەبەداد، پاش ئەنوشیروان هەر تۆ بووی. بە بەخشینیش وەک حاتم، ناوبانگت دەڕوا. بە هومێدم شاری جزیرابۆتانیٚ پاتەختی هەر حەوت ئیقلیم بیٚ و بە شەوکەت و حوکمرانی، وەک ئەسکەندەر و فەغفوور بی.

**١٠** میسلیٚ جەم جاما زەرین خالی نەبی تە ژ بادەییٚ
دا ژ خەمرا شادمانی دائیما مەخموور بی

**١١** ما د باغیٚ عەیش و نووشیٚ هەر ب ساز و ئەرغنوون
کامران و کامبەخش و دلخوش و مەسروور بی

**١٢** چەندەکی شیرین ب سوڕ دەربەندیٚ دیوانا تە بن
بەندیٚ شاپووریٚ تە بن تا خوسرەو و شاپوور بی

**مانای وشەکان:**

**جەم**: کورتەی ناوی جەمشید کە پادشایەکی ئێران بووە؛ **مەخموور**: سەرخۆش؛ **دەربەند**: خزمەتکاری دەستەونەزەر؛ **دەربەند**: ئەو شوێنەی شیرینی فەرهاد لیٚ بوو؛ **شاپوور**: کوڕی شا؛ **شاپوور**: ناوی پادشایەکی ئێران بوو کە هێرشی کردە سەر

عەرەبان و پەنجاهەزار دیلی لێ گرتن و شانی سمین و بە پەتێکەوە بەستنەوە و عەرەب بە ناوی شاپورەکەی شانان (زولئەکتاف) ناوی دەبەن؛ **شاپوور**: وێنەکێشێکبوو؛ ببووە دەلالی خوسرەو، شیرینی بۆ تاو دەکرد **خوسرەو**: پاشا؛ **خوسرەو**: مێردی شیرینی فەرهاد. مەلا لەو شیعرەدا زۆری تەڵە ناوەتەوە!

**پوختەی مانا:**

وەک جەمشید خاوەن شکۆ بی. جامت دنیای تێڕا دیار بێ. هەمیشە لە بادەی شادی مڕ و پڕ بی و هەرگیز پیاڵەت خاڵی نەبێ. لە باغی خۆشگوزەرانی هەمیشە دڵشاد و ساز بی و ئاهەنگ و بەزمت بگەڕێ. بە مراد بگەی؛ خەڵکیش بە مراد بگەیەنی و هیچ کەمایەسی نەهێنی. هەرچی جوان و خوێنشیرین و دڵ دەکێشن بەرەو خۆیان، نۆکەری دەستەونەزەر بن لە دیوانت. هەرچەند شاو شازادە هەیە لە دنیادا، ببنە نۆکەری کوڕی تۆ. هەموو فەرمانڕەوای نامۆ، وەک عەرەبیان لێ بقەومێ بە دەستی شاپووری ئێران، خوسرەو و دەلالەکەشی و شیرینەکەی دەربەندیشی، خزمەتکار و کارەکەری ماڵی تۆ بن.

۱۳ هیندەکی ڕۆژ و شەڤن تێک عید و لەیلێ قەدر بن
جام مەدام پڕ بادە بت، لێ نە ژ مەیا ئەنگوور بی

۱۴ شوبهەتێ ڕووحولقودوس عەردێ تو پێ لێ داینی
سەبزە و ڕەیحان و نەسرین و گولێ مەنقوور بی

۱۵ هەر دەرێ نەعلێ فەرەس شوبهەت بوراقێ ڤێ کەڤت
چەشمەیێ حەیوان ژ ئەو عەردێ موبارەک فوور بی

۱۶ ما تە عومرێ خزر و نووح و مولکێ زولقەرنەین بتن
گونبەدا چەرخێ مولەممەع هەر ب تە مەعموور بی

۱۷ خاسسێ تەشریفا تە بن دەریا و دەربەندێ عەجەم
دا خەلاتێن هەر سەحەر سەد زەرکەش و مەخموور بی

**مانای وشەکان:**

**ئەنگوور**: تریێ؛ **لێدایني**: لێ دادەنێی؛ **مەنقوور**: دندووکلێدراو؛ **نەعل**: نال؛ **بوراق**: ئەو فرشتەی بوو بە ئەسپی پێغەمبەر و بۆ میعراج سواری بوو؛ **فور بوون**: فیچقەکردن؛ **نووح**: پیرەپێغەمبەرێک بووە تا تەمەنی نۆسەدوپەنجا سالی دەگەل ئۆمەتەکەیا ژیاوە. باوەڕیان پێ نەهێناوە. نەفرین و تووکی لێ کردوون. خۆی گەمیەی لە دار تاشیوە و هەوال و کەس‌وکاری خۆی و لە هەموو زیندەوەرێکیش نێرومێوێکی تێ ناوە. ئەوسا باران دایکردووە و لافاو دنیای داگرتووە. هەرچی جانەوەر لە دنیان جگە لەوانەی ناو گەمیە، لەو لافاوەدا خنکاون. گەمیەش لە پاش لەهی نەمان، لەسەر دوندی کێوی «جودی» لە کوردستان نیشتۆتەوە. نێر و مێ تێک بەر بوونەوە و ژیانیان بە سەر گرتۆتەوە؛ **مولەممەع**: بریقەدارکراو؛ **مەعموور**: ئاوەدان؛ **تەشریف**: خەلات؛ **دەربەند**: بەندەر؛ **مەخموور**: مەخمەر، قەدیفە.

**پوختەی مانا:**

هەرچەندەی ڕۆژ و شەوی تۆن، جێژنە و لەیلەتولقەدر بن. پیالەت هەمیشە پڕ مەی بێ. بەلام بادەی تریێ نەبێ؛ بادەی خۆشەویستی خوا بێ. وەک نازانم کێ گوتویە:

لە ئەسپابی فەرەح سالۆنی عەیشت پرتەدارەک بێ

شەوت هەر ڕۆژ و ڕۆژت جەژن و جەژنت لێ مبارەک بێ

یاخوا لە کوێ پێ دادەنێی، ودمی وەکوو شوێن پای فرشتە جوبرەئیل وا بێ. لە ودمی ئەو، ئەو زەمینە پڕ بێ لە سەوزە و ڕیحانە و غونچەی خەریک پشکووتن و لقەنەسرین. یاخوا نالی ئەسپەکەی تۆ، وە هەر زەمینێک دەکەوێ، ودمی ئەسپە بالدارەکەی پێغەمبەری کە بە سواری ئەو چووە میعراج، بۆ ویش هەبێ. ئاوی ژیانێ لە جێ نالی فیچقە بکات. تەمەنت وەکوو تەمەنی نووح و خدران، هەر لەدوو بێ و پاتشایەتی زولقەرنەینت بە نەسیب بێ کە باجی لە ڕۆژێ ئەستاند وَ پێشی بە عاجووج‌باجووج گرت. تایبەتی خەلات دانێت بن بەندەرگە و دەریای ئێرانێ و لە بەهرەی وان، هەموو ڕۆژێ لە بەیاندا- کە تەشریف دێنییە دیوانێ- سەتان پارچە و بالاپۆشی زەڕی و مەخمەر، بەسەر نزیکانی خۆتدا، دابەش بکەی.

۱۸ گەرچی دەر دیوانێ حەزرەت پور حەقیرین شوبهێ موور
چەشمێ تە چەشمێ سولەیمانی ب حالێ موور بی

۱۹ ئێ نە وەک گۆی بێ سەروپا بێت د بەندا خدمەتێ
ما د چەوگانا تە هەر پەرکەندە و مەقهوور بی

۲۰ ما لیسانێ من دوعاگوییێ ل دەرحەق وەسفێ خان
مەزهەرێ سیرڕا کەلامێ وەک درەختا توور بی

۲۱ هەر د مەدحێ تە و سەنایێ سینە و قەلبێ «مەلێ»
بێ تەفاوت قولزوما پور لوئلوئێ مەنسوور بی

۲۲ ژاستانێ دەولەتێ غایب نەبێ جارەک «مەلا»
دا ژ فەرمانێ موکەررەم دەمبەدەم مەسموور (مەئموور) بی

**مانای وشەکان:**

**حەقیر**: بێنرخ و سووک؛ **مەقهوور**: غەزەب لێ گیراو، تێشکاو، خەمگین؛ **لیسان**: زمان؛ **مەزهەر**: دیاریدەر؛ **درەخت**: دار؛ **مەنسوور (منثور)**: پەرژ و بڵاو؛ **موکەررەم**: بەڕێزوحورمەت؛ **مەسموور(مثمور)**: بەهرەمەند؛ **مەئموور**: فەرمانبەر؛ **بێ تەفاوت**: بێ فەرق.

**پوختەی مانا:**

خانی سلێمانئاسایی! من خۆم لە بارەگای تۆدا- کە پڕییە لە پیاوی گەورە- وەک مێروولە دێتە بەرچاو. بەڵام تۆش هەروەک سلێمان، لە مێروولەی دەپێچاوە، بە چاوی خۆشی و بەزەیی وەملاوێنە. هەرکەس وەک گۆی گرۆڤەر و بێپا و سەر، بۆ بەهرەی تۆ هەڵنەسووڕێ، گۆڕیەتی لەبەر کاشۆی تۆ، سەرگەردان و پەرژ و بڵاو و تێکشکاو بێت. زمانم لە پەسنی تۆدا، وەک چیرۆکی ئەو دارەیە کە لە تووری مووسای دەدواند. دار نەیدەدواند؛ خودا دواندی. خودایە کە تۆی خۆش دەوێ؛ پەسنی تۆ فێری زمانی بەستەزمانی مەلا دەکا. لەوساوە کە پەسنت ئەدەم، دڵ و سینەم وەکوو دەریا پڕن لە مرواری پرژاو.

هەرگیز مەلا لە دەرگای خۆت دوور مەخەوە! با هەمیشە گوێ بە فەرمانی بەڕێزی جەنابت بێ و شانازی بە بەختی بکات.



# بەیانی باش

به شێوەی سەربەندی (تەرجیع‌بەند)

١

«صَباحُ‌الخَیر» خانێ من    شەهێ شیرین‌زەبانێ من
توی رووح و رەوانێ من    ببت قوربان تە جانێ من
«تَعالی‌الله» چ زاتی تو    چ وێ شیرین‌سیفاتی تو
نەوەک قەند و نەباتی تو    یەقین رووح و حەیاتی تو
حەیات و راحەتا جانم    «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!
وەرە بیناهیا چەهڤان    ببینم بەژن‌وبالایێ

٢

«صَباحُ‌الخَیر» مەستا من    لەتیفا جام ب دەستا من
خومار و مەی‌پەرستا من    توی مەقسوود و قەستا من
ژ مەقسوودان توی بەس من    ببن بەر چەرخێ ئەتلەس من
ژ غەیرێ تە نەڤێت کەس من    ب رەشتوزین موقەووەس من
د بەندا زولفێ چەوگانم    «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!
وەرە بیناهیا چەهڤان    ببینم بەژن‌وبالایێ

٣

ژ وێ زولفێ، ژ وێ بەندێ    رەها بم لێ ژ پەیوەندێ
سیەه چەشمێ سپی زەندێ    تە سوهتم شوبهەتێ فەندێ
شوبێ شەمع و شەمالم ئەز    ژ بەر حوببا تە لالم ئەز
زەعیفم وەک هیلالم ئەز    سیفەت گۆیین دکالم ئەز
ڤە بولبولرا ب ئەفغانم    «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!
وەرە بیناهیا چەهڤان    ببینم بەژن‌وبالایێ

٤

ڤـــە بولبـــولرا شـــەڤ و رۆژێ     ل ســـەر وێ تـــەرح و بشـــکۆژێ

ئـــەنی ماهـــێ، شـــەفەق رۆژێ     تـــە ســـوهتم شـــوبهەتێ دۆژێ

کـــو دوورم ئـــەز ژ وێ حـــۆرێ     تنـــێ جـــارەک ل ســـەر ســـوورێ

ژ وادێ ئەیمـــــــەنا تـــــــووری     تەجـــەللا کـــر د نـــیف نـــووری

ژ وێ سوهتی دل و جانم     «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!

وەرە بیناهیا چـەهڤـان     ببـــینم بـــەژن‌وبالایێ

٥

ژ حوســـــنا وێ تەجـــــەللایێ     یـــــەدێ بـــــەیزا و بالایـــــێ

چ وەســـفان بـــێم خەبـــەر نایـــێ     وەلـــێ دل جەزبـــەیێ دایـــێ

نـــە هشـــیارم ژ وێ بـــەرقێ     ژ زەر تاجـــێ ل ســـەر فـــەرقێ

ســـپێدە دا هـــەتا شـــەرقێ     وەلـــێ نائێخمـــێ فـــەرقێ

ژ زەربێ عیشق نالانـم     «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!

وەرە بیناهیا چـەهڤـان     ببـــینم بـــەژن‌وبالایێ

٦

زەریفـــی نـــازکی شـــەنگی     ســـیفەت‌حـــۆری پـــەری‌رەنگی

ب رۆژێـــرا تـــو هەڤـــدەنگی     دو رەشـــتوزین ســـیە رەنگـــی

کشـاندن لـێ نـە وەک جـاران     خـــەدەنگێن قەوســـێ نووبـــاران

ژ رەنگـــێ شـــیر و مووکـــاران     رەشـــاندن ســـینە وەک بـــاران

ژ وێ زەربێ پڕ ئیشانـم     «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!

وەرە بیناهیا چـەهـڤـان     ببـــینم بـــەژن‌وبالایێ

٧ ڤـە کـە جـارەک خـەت‌وخالان | ل سـەر وان مەسـنەد و پـالان
ب خوونـە لـێ مـە عەبـدالان | ببینـین عیـد و سەرسـالان
ئیجـازەت دی مـە دەسـتووریٚ | پـەری‌رەنگیٚ سـیفەت حـووریٚ
ژ نیڤـا زولمـەت و نـووریٚ | بنووشـین مـەی د فـەرفووریٚ
ژ دل تـالانیٚ خـالانم | «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!
وەرە بیناهیا چـەهڤـان | ببـینم بـەژن‌وبالاییٚ

٨ ژ شەهکاسـا کـو قەرقـەف تـیٚ | مـەیا نـوورین موشـەررەف تـیٚ
نیشـانەک دلبـەریٚ کـەفتیٚ | ژ بۆ من هەر سەحەر خـەف تـیٚ
ژ ویٚ جامـیٚ دنۆشـم ئـەز | سەحەر لەو نـەی ل هۆشـم ئـەز
ژ عامـیٚ لـیٚ دپۆشـم ئـەز | ب جان هـەر لـیٚ دکۆشـم ئـەز
کوغالیب‌مەست‌وسەکرانم | «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!
وەرە بیناهیا چـەهڤـان | ببـینم بـەژن‌وبالاییٚ

٩ وەرە پیٚشـبەر «مـەلا»یـیٚ خـوە | شـەهید و موبتـەلاییٚ خـوە
ب شـەفقەت کـە لیقایـیٚ خـوە | «مـەلا» نـەمرت ب دایـیٚ خـوە
مەسـیحایی ل بیمـاران | کەسـیٚن گـەزتی دو رەشمـاران
شـەهیدیٚن شـیر و مووکـاران | کـری ئامانجـیٚ نووبـاران
ل دیدارا تە حـەیرانم | «صَباحُ‌الخَیر» یا خانم!
وەرە بیناهیا چـەهڤـان | ببـینم بـەژن‌وبالاییٚ

**مانای وشەکان:**

**صباحُ‌الخیر :** بەیانی باش؛ **شەهیٚ**: پادشای؛ **شەهیٚ**: جیٚـی ئـارەزوو؛ **یـا**: ئـەی؛ **خـانم**:

گەورەی من؛ **خانم**: خاتوونەکە؛ **پەیوەندی**: گرفتاری، گیرۆدەیی؛ **ئەنی**: هەنیە، توێڵ؛ **وە لێ**: وەها لێی؛ **بەلێ**: ئاریّ؛ **بەلێ**: بەڵام؛ **نائێخمێ**: ناخەمێ، نایخەم؛ **زەرب**: لێدان؛ **زەرب**: ژەنینی مووزیک؛ **مەسنەدوپال**: پاڵەوپشت؛ **عەبدال**: دەروێش و هەڵوەدا؛ **سەرسال**: نەورۆز؛ **قەرقەف**: بادە؛ **پێشبەر**: رووبەروو.

**پوختەی مانا:**

هەموو وشە دژوارەکانم مانا کردەوە؛ خوێندەوار دەیانزانێ. ئەگەر گوێ نەدەینە یەکبەیەکی وشەکان، ماناکە وای لێ دێ:

**١**

بەیانت خۆش‌وگەش خانم — کزە و هیوای دڵ و گیانم
لە بسکتدایە تای ژیانم — ئەوینت بۆتە ئامیانم
بڵێم تۆ چەندە شیرینی؟ — نە وەک قەندی نە هەنگوینی
ئەتۆ گیانی ئەتۆ ژینی — ئەتۆم هێزی ئەتۆم تینی
بە قوربانت دەکەم گیانم — بەیانت خۆش‌وگەش خانم
وەرە ڕووناکی چاوانم — ببینم بەژن‌وبالاکەت

**٢**

لە مەستی چاوەکەت مەستم — نەما هۆشم بڕا هەستم
بە ناز و غەمزە ناوەستم — بە خێری خۆت وەرە دەستم
لە جوانیت بوویە پیری من — ئەوینتە دەستگیری من
تەنێ هەر تۆی لە بیری من — ئەتۆی سەردار و میری من
پەنای بۆ من کەسی بۆ من — ئەتۆ فریاڕەسی بۆ من
خەنیم تا تۆ هەسی بۆ من — لە عالەم تۆ بەسی بۆ من
گراوی داوی کەزیانم — بەیانت خۆش‌وگەش خانم
وەرە ڕووناکی چاوانم — ببینم بەژن‌وبالاکەت

٣ دڵـم بـەر بـێ لـە کـەزیانت — ڕەهـــا تـــابم لـــە چاوانـــت
لـە پەنجـەی ناسـک و جوانـت — گـڕم گـرت بوومـە شـەمدانت
ئەوینـــــداری ژیانتاڵـــــم — پەپوولـــەی ڕوومـــەتی ئاڵـــم
گـڕی تـێچـوو پـەڕ و باڵـم — دەســـووتێم ناشـــێ بشناڵـــم
لـە تـاوان بـێسەروزمانـم — بەیانت خۆش‌وگەش خانم
وەرە ڕوونـاکی چـاوانـم — ببینـم بـەژن‌وبـاڵاکـەت

٤ خـــودا لـــەو بەژن‌وباڵایـــە — لـــە نـــاو ئـــەو ئاڵ‌ووالایـــە
پشـــێویی خســـتە دنیایـــە — دڵـــم پۆلـــووی لەبـــەر بایـــە
گـرێکی خـوا لـە تـوور جـارێ — کـە مووسـا دی لـە سـەر دارێ
ئـــەمن دیـــتم لـــە تـــالارێ — دەســـا چـــۆن ئـــۆقرە ناتـــارێ
لـــە تینـــی دیـنی بریـانم — بەیانت خۆش‌وگەش خانم
وەرە ڕوونـاکی چـاوانـم — ببینـم بـەژن‌وبـاڵاکـەت

٥ شـــەوەی بســـکۆڵ و کاکۆڵـــی — ســـپێدەی لامـــل و قۆڵـــی
بەروســـــینگی سپی‌وسۆڵـــــی — پـــــەل‌وپووزی خڕوخۆڵـــــی
لـە هـەر لا ڕێـزی بشـکۆژێ — کـڵاوی زێـڕ لـە سـەر ڕۆژێ
دەدەن پرشـــنگ و تـــیرۆژێ — دڵـم هـەر دەسـتی دەکـرۆژێ
وەکـوو دڵ خـانـەوێـرانم — بەیانت خۆش‌وگەش خانم
وەرە ڕوونـاکی چـاوانـم — ببینـم بـەژن‌وبـاڵاکـەت

٦ لـە شـۆخی و ناسـکی و شـەنگی — لـە چـاوی مەسـت و سـێوەنگی
پـــەری‌زادەش پـــەری ڕەنگـــی — ڕوحـــم کەوتـــە نەفەســـتەنگی

کەزیت وەک جووتە ڕەشمارن — بڕۆت وەک شیری مووکارن
مژۆڵت تیری پەڕدارن — بەرەو جەرگم سەرەوخوارن
بە برژانگانە برژانم — بەیانت خۆش وگەش خانم
وەرە ڕووناکی چاوانم — ببینم بەژن وبالاکەت

٧
لە ڕۆژی جێژن و سەرسالان — کە داروودەستە لێت هالان
بپرسە حاڵی بێحالان — بفەرموو بێنە دیار خالان
چ ناقەومێ ئەگەر وا بێ — یەقینم کابە کەچ نابێ
ئەوندەت با لە ڕای خوا بێ — دەگەڵ دڵدار دڵت چا بێ
نەماوی وردەخالانم — بەیانت خۆش وگەش خانم
وەرە ڕووناکی چاوانم — ببینم بەژن وبالاکەت

٨
لە بادەی بەردەمیم ڕوانی — لە وێنەی ڕوومەتی جوانی
دڵم بووراوە ئەو عانی — لە هۆش خۆم چووم لە ڕامانی
لەوێ ڕۆژێوە بێهۆشم — پەرۆش و مات و خامۆشم
وتم ڕازێکە دەیپۆشم — بەلام هەیهاتە تێکۆشم
بە سەرخۆشی چ دەتوانم؟ — بەیانت خۆش وگەش خانم
وەرە ڕووناکی چاوانم — ببینم بەژن وبالاکەت

٩
بزەی ئەو تەنکە لێوانە — شیفان بۆ شێت و دێوانە
لەرەی ئەو شەکرەسێوانە — لە گش ئازاری هەتوانە
نەخۆشی چاوی بەخومارم — بە نازانت برینەدارم
«مەلا»ی زاری بەئازارم — دەبا نەمرم بکە چارم
لە دەستتدایە دەرمانم — بەیانت خۆش وگەش خانم
وەرە ڕووناکی چاوانم — ببینم بەژن وبالاکەت



## بتی جوانان

آ

سـەنەما سـوڕ ژ سـەمەد شـەوقێ ژ حـەق دایـە وجـوودێ
گـــەر عـــەزازیل بـــدیتا نـــەدبر غـــەیرێ ســـجوودێ

غەرق بوم ئەز د غەما عیشقێ د وەقتـێ سـەحەرێ بـوو
کـو تەجـەللایێ جـەمالێ ل میسـالێ بەشـەرێ بـوو
نە ژ لـەونێ بەشـەران مـن دیـە لـێ دیمـێ زەرێ بـوو
ئەز دبێم ڕووحێ قودوس بوو ب خوەیا حوور و پەرێ بوو
لەو ب حوسن و نەزەرێ ڕەمـز ژ سـیررا قـەدەرێ بـوو
خەمرییێن سەیرێ ل دێم حەلقـە ل دۆرا قەمـەرێ بـوو
سەد خەدەنگ دانە جەگەر سینە ژ زەربێ بەکەرێ بـوو
ل مــە ئـێش و ئەلــەمان زێـدە ژ تـیرا قەجـەرێ بـوو
دل ژ مە بوویە پەلەک جان و جەسەد تێک سەقەرێ بوو
لەو مە شەب تا ب سەحەر نالەیە وەک مەغنیێ عوودێ

سەنەما سوڕ ژ سەمەد شەوقێ ژ حـەق دایـە وجـوودێ
گــەر عــەزازیل بــدیتا نــەدبر غــەیرێ ســجوودێ

**مانای وشەکان:**

**عـەزازیل**: شـەیتان، مەلـەک تـاوس؛ **زەرب**: زەبـر؛ **بەکـەری**: لەتوپـەت؛ **قەجـەر**: خۆشبەز، بەپێ؛ **قەجەر**: ناوی عەشرەتێکی مەغولی بوو کە تەیمووری لەنگ ساڵی ٨٠٣ هێنانیە ئێران و شەڕکەری سەفەوییانیش بوون. لە ساڵی ١٢١٠ڕا تا ١٣٤٤ی کـۆچی- مانگی پادشـایەتی ئێرانیـان لـە دەسـتا بـوو؛ **پەلـەک**: پۆلوێـک، پـەنگرێک؛ **سـەقەر**: جەحەندەم؛ **مەغنی**: مەغنە، ئاواز؛ **عوود**: سازێکە وەک تار دەچێ.

**پوختەی مانا:**

شــــەپالێکی کـــە وەک بــت دەیپەرســتم مـــن،
ترووسکە و شۆقی نووری خوایە؛ دیتوومە لە دنیایە.
ئەگـەر شـەیتان لـەباتی بابـەدەم، یـارمی بدیتایـە،
هـــــەزار سَـــــوژدەی دەبـــــرد یـــــەکجێ
بەرەو ئەو بەژنوبالآیە

بەیانێک بوو کە پرشنگی خـودای جـوانی، وەکـوو عینسـانێ خـۆی شـان دام؛ بـەرەو دەریای ئەویندارییی و خەمی هان دام. لە گێژاویا نوقوم بووم؛ بێسەروشوێن چووم.
بە دیمەن ئادەمیزاد بوو لەبەر چاوم؛ بەڵام جوانی وەها سەوزە و بەناز و غەمزە، قەت نابـێ لـە دنیا بێ. بڵێم حۆری و پەری بوو؟ نا. دەڵێم هەر عەزرەتی جوبرایلە هاتبووە بەرچاوم.
لەرەی پەرچەم بـە دەم سـروەی بـەیان لـەو مـانگی ڕوخسـارە و لـە دەوری سـێوی کوڵمانی، نموونێک بوو لە کردەی جوانی بێ وێنەی دەسی ڕەنگینی خوای جوانی. وە بەر تیری تماشای دام؛ بە پەیکانی بژانگ پێکرام و جەرگم ئەنجن-ئەنجن بـوو. خـودا هاوار! بە چی ئاو داون ئەو تیری بژۆلانە؟! لە جێ تیری قەجەر فیشتەر بەدەرد و ئێش و پرژانن. لـە دیـداری بـرۆی لاری، لـەش و گیـانم بـە یـەکجاری، وەکـوو کوانـووی قەلاشکاری، لە گوێن تەندووری گڕ سوورە. لە دوور هالاو و تیـنی تـێ. دڵـی چـۆل و بیابانم پەرەنگێکە کە لەو چۆڵە لە بەر با بێ. لـە تـاوی دیتـنی چـاوی، دەناڵـێنم بـە سووتاوی، شەو و ڕۆژ دەنگی ناڵینم، وەکوو بلوێر و شمشاڵە لە گالیندا.

شــــەپالێکی کـــە وەک بــت دەیپەرســتم مـــن،
ترووسکە و شۆقی نووری خوایە؛ دیتوومە لە دنیایە.
ئەگـەر شـەیتان لـەباتی بابـەدەم، یـارمی بدیتایـە،
هـــــەزار ســـــوژدەی دەبـــــرد یـــــەکجێ
بەرەو ئەو بەژنوبالآیە

٢ نەزەرەک وێ بەشـەرێ لەبشـەکەرێ حۆریسرشـتێ
نادرم ئـەز ب مـەی و کەوسـەر و حـوورێن د بهشـتێ

ئێ دیبە ئەو ب خوە جارەک د عەجیبم کو بهش تێ
تە ژوان قەوس و کەڤانان چ خەدەنگن د بەوەش تێ
ئەوە من شافیێ دەردان مە چ حاجەت ب نقشتێ
گەر بکت حوسن و جەمالا خوە تەجەللا د کەنشتێ
دبتن بەیتێ‌قودوس ئەهلێ زیارت ژ حەبەش تێ
سینە پوتخانەیە ئێرۆ مە ژ دێم و قەد و قشتێ
ب دلێ سادە چ کم ئەز؟ کو تەجەللا نەگەهیشتێ
ئەوە من قیبلەیێ جەبهەت د قیام و د قعوودێ

سەنەما سوڕ ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە وجوودێ
گەر عەزازیل بدیتا نەدبر غەیرێ سجوودێ

**مانای وشەکان:**

**سرشت**: ماک و ئامیان؛ **نادرم**: نادەم؛ **ئێ دیە**: ئەوی دیتوویە؛ **شافی**: شفادەر؛ **نقشت**: نوشتە؛ **کەنشت**: هەم کلیسا، هەم نوێژگەی جوو؛ **پوت**: بت؛ **جەبهەت**: تووێڵ، رووبەروو؛ **قیام**: هەڵسان؛ **قعوود**: رۆنیشتن.

**پوختەی مانا:**

نیگای چاوێکی ئەو جوانە- کە چاوی هۆریەکانیشی لەبەر پرشنگی هەڵنایە- و لە تاسەی لێوی شیرینی، تکەی لیکاوی دەمیانە، بە بادەی پاک و ئاوی کەوسەر و حۆری بەهەشتی گەر وەگۆڕم، شێت و ناحاڵیم. ئەوی جارێک ئەوی دیبێ؛ ئەگەر جارێک وەسەر هۆش بێتەوە، سەیرە.

ئەتۆ بڕوانە لەو جووتە کەوانانەی برۆیانی و سەری نووکی بژۆلانی -کە پەیکانان دەبارێنن- چ ڕاست هاوێژ و توند و تیژ و لەش‌دابێژ و دڵ‌پێکن. ئەمن جەرگم بە سەر ئەو نووکی پەیکانانەوە ماوە و بەخوڕ زووخاوێ هەڵدینێ. بژیشکی وا لە کوێ بێنم بە دەرمان و بە هەتوانان برینی گیان وەبرژێنێ؟ عیلاجی دەردی دڵداران نە لوقمان پێی دەچارێن و نە کاری نوشتەنووسانە. بە تەنیا یارە چارە؛ هەر وەکوو ئازار لەوێڕایە،

ئەویش دەرمانە بۆ دەردم.

ئەگەر پرشنگی ڕوخساری، لە گۆشێکی کلیسا، ورشەـورشی بێ، حەبەشیانیش بـەرەو خۆی ڕادەکێشێ بێنە کڕنووشتی.[1]

لە نوێژاندا، لە سوژدەمدا، ئەمن کڕنۆش بەرەو یارم دەکەم. لە دانیشـتن، لـە هەسـتانا، هەمیشە ڕوو بە دڵبەرم و ئەوێستا کە دڵ و گیانم وەکوو بتخانەیێک وایـە و بـتی مـن کوڵم و پەرچووکەی گەش و ئاڵ و ڕەشی بۆنخۆشی نازدارە.

دڵی ساکار چ لێ بکەم من، بە بێ پرشنگی دڵداری؟!

شـــەپالێکی کـــە وەک بـــت دەیپەرســـتم مـــن،
تروسکە و شۆقی نووری خوایە؛ دیتوومە لە دنیایە.
ئەگــەر شــەیتان لــەباتی بابــەدەم، یـارمی بدیتایـە،
هـــــەزار ســـــوژدەی دەبـــــرد یـــــەکجێ
بەرەو ئەو بەژنوبالایە

«مەحوی» دەڵێ:

سـەر کـە شـۆرێکی نـەبێ، مـن زرکەتالـم بۆچییـە؟
دڵ کە عیشـقێکی نـەبێ، شووشـەی بەتالـم بۆچییـە؟

٣ قیبلــەیا ئــەهلێ دلان گــەر بکــتن کەشــفێ جــەمالێ
یا تەجــەللا کــە ژ بــەر تــاج و پــەران قەوســێ هیلالــێ
کی ب دل کافرە ئێ سەجدە نــەبت جەبهــەت و خالــێ
یــا نــەدت شــەهدە ب ئایاتــێ د وێ وەقــت و مــەجالێ
لەیلەتولقــەدر ب مــن ئــەو ســەعەت و عیــدە د ســالێ

---

١. مەلا باسی لە دایک بوونی عیسامان وەبیر دێنێ؛ کە ئەستێرێک لە هەنداو غارەکەی زێدی قەتیس مابوو. مەجووسی و پیاوی جێگەورەی حەبەشیانیش -کە بەو ئەستێرەوە هاتبوون- بە هۆی ئەستێرەکە زانیان مەسیح هاتۆتە دنیاوە. «هەژار»

شەفقە کر پەردە هلانی سەحەرێ شۆخ و شەپالێ
ئەییساندیم ژ ئەنوار و سورێ شوبهێ شەمالێ
مەشها مەست و شەکەرلەب ب مە دا مەی ژ پەیالێ
نەگهام سەجدە ببم پورٟ خەجلیم ئەز ژ ویسالێ
حادری بەرقێ ل دلدا، ژ تەجەللا و شهوودێ

سەنەما سورٟ ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە وجوودێ
گەر عەزازیل بدیتا نەدبر غەیرێ سجوودێ

**مانای وشەکان:**

**پەر**: پەرەتاوس کە شازادەخانمان لە دەوری تانجە زێرەکەی سەریان دەدان؛ **شەهدە**: شادوئیمان، شایەتی؛ **مەشها**: رۆیشت، رابرد؛ **خەجلیم**: شەرمەزار بووم؛ **حادری**: فەوری.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر جارێک بەرەو ئەهلی دڵان- یارم- پەچە و رووپوش لە روو لا دا، کەوانەی مانگی دوو برۆکەی، لە خوار تانج و پەرانداا بێتە بەرچاوان، دەبێ کێ هێندە کافر بێ و دڵی رەش بێ، نەچێنە سوژدە بۆ ئەو توێڵ و خاڵانە و نەکا باوەڕ بەوندە ئایەتانەی وا لە روخساری ئەوا دیارن؟ شەوێک، شەو نا، لە نێوانی شەو و رۆژا- کە تازە بەربەیان دەنگووت- بەزەی بە منی هەژاردا هات و رووبەندی لە روو لا دا. بە دینی، چاوی دڵ پشکووت. لە سەیری بەژنوبالای شۆخوشەنگی، واق و ور دامام. لە دڵکێشی و لە مەستی چاوەکانی، هەر گرم گرت و لە چەشنی مۆمێ داییسام. بە مەستی هات بە لاما؛ ئەو شەکرلێوە و بە مەی جوانیی، مەسی کردم. لە شەرمانا لە بیرم چوو کە سوژدەی بۆ بەرم ئەوسا. برووسکەی رۆژی روخساریء دڵی گرتم. لەجێوە کاری خۆی کرد و دڵی بردم. چلۆن سوژدەم لە بیر چوو؟! خوایە تۆبە.

شەپالێکی کە وەک بت دەیپەرستم من،
تروسکە و شۆقی نووری خوایە؛ دیتوومە لە دنیایە.

ئەگەر شەیتان لەباتی بابەدەم، یارمی بدیتایە،
هەزار سوژدەی دەبرد یەکجێ
بەرەو ئەو بەژنوبالایە

۴ روهنیا چەشم و چرایامە نزام هێژی دبیرم
کو د زیندان و حەبسخانەیێ وێ بەند و ئەسیرم
ژ خەدەنگێن قەجەری سینە تەژی گەزمە و تیرم
دل د نێڤ حەلقەیێ زولفا سیەها بوو ژ عەبیرم
تێک پەریشان ژ لەف و شەتری و تایێن ژ حەریرم
تو هەیی من د دنێ لەو د دنێ بەگلەر و میرم
زێر و مال ئەرچی نەدیرم تە ددیرم نە فەقیرم
ژ ئەڤینا تە شەپالێ د شەڤان شوبهێ نەدیرم
ژ لەبێ لەعلێ شەکەرباریێ تە وەک شەککەر و شیرم
مە ژسەر تا ب قەدەم سوهتنە وەک ئاتەش و عوودێ

سەنەما سور ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە وجوودێ
گەر عەزازیل بدیتا نەدبر غەیرێ سجوودێ

**مانای وشەکان:**

**روهنی**: ڕووناکی؛ **تو هەیی من**: تۆ بۆ من هەی؛ **تە ددیرم**: تۆم هەیە؛ **نەدیر**: ئاگری سەر چیا؛ **عوود**: نەوعە دارێکە بۆ بخوور و بۆنخۆشی دەیسووتێنن.

**پوختەی مانا:**

تۆی بۆ شەوی بەختم چرای. تۆ سۆمایی چاوەکانمی. من هەر بەو بیرەوە دەژیم کە گیرۆدەی ئەوینی تۆم؛ لە بەندی تۆ ڕەها نابم. (یان: ئاخۆ هیچ لە بیری ماوە کە من یەخسیر و دیلی ویم؟) هەناوم پڕ لە تیری تیلە چاوی تۆن- کە لە تیری قەجەر، حەستەمترن- دڵم دەناو گەوی ڕەشی هەرە بۆنخۆشی کەزیتدا سەرگەردانە. وەکوو

بسکی لوول‌دراوت، وەک گولینگەی سەر و شەدە و هەوری لاری بان کلاوت- کە لە سەر ئاوریشمی پرچان پەرێشانن- پەرێشانم. کێ لە من بەختەوەرترە؟ هەتا تۆم هەی، خۆم بە بەگلەر، بە میری‌میران دەزانم. جا با زێڕ و ماڵ شک نەبەم؛ تا تۆم هەی، ناڵێم هەژارم. لە سایەی ئەوینی تۆوە، هەموو شەوگار، بە هۆی گڕی دەروونمەوە- وەکوو ئاگری سەر چیا- لە هەموو ئاقاران دیارم. لە سای باسی لێوە ئاڵە شیرینەکەت، هێندە خوێنم شیرین بووە، قسەکانم چێژەی شیر و شەکر دەدەن.

هەم ئاگرم لە ئەوینت هەم بخوورم، بۆ خۆ دە خۆمدا دەسووتێم و دووکەڵەکەم- کە یادێکی تۆی تێکەڵە- بۆنی لە عوود و بخووران، زۆر خۆشترە. تۆ مەخلووقێکی تایبەتیت.

شەپالێکی کە وەک بت دەیپەرستم من،
ترووسکە و شۆقی نووری خوایە؛ دیتوومە لە دنیایە.
ئەگەر شەیتان لەباتی بابەدەم، یارمی بدیتایە،
هەزار سوژدەی دەبرد یەکجێ
بەرەو ئەو بەژن‌وبالایە

**۵**

بێ‌حیساب شۆخ و شەپالێ ل «مەلێ» قەهر و غەدەر کر
نە ئەم ئانینە خەیالێ نە ل حالێ مە نەزەر کر
قەت نەکر شەفقە، لیباسێ غەزەبێ زیدە د بەر کر
عیللەتا جەور و جەفا و ئەلەمێ جە ب جەگەر کر
عەلیلاندین د فیراقێ ستەمێ سینە ب کەر کر
ئاها! حەتتا مرنێ ئەڤ ژ مەرا داغ و کەسەر کر
سەفەرا شام و عیراقێ ل مە خوەش لازم و فەر کر
ب مەدا ژەهر و رەقیبان د دەڤێ شەهد و شەکەر کر
ئەم بویین پێت و پەرەنگ لەو ژ ویسالێ مە حەزەر کر
نازک و نەیشەکەر و خووب و شرین‌قەدد و خدوودێ

سەنەما سور ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە وجوودێ
گەر عەزازیل بدیتا نەدبر غەیرێ سجوودێ

**مانای وشەکان:**

**قەهر**: غەزەب؛ **غەدەر**: بێشەرتی؛ **عیللەت**: سەبەب؛ **عیللەت**: نەخۆشی؛ **عەلیلاندین**: تەفرەی داین، خافلاندینی؛ **ستەم**: زوڵم؛ **ستەم**: حەستەم و دژوار؛ **کەسەر**: خەموکوڵ؛ **فەر**: کورتەی وشەی فەرز؛ **پێت**: بڵێسە؛ **پەرەنگ**: سکڵ؛ **دەڤ**: دەم، زار؛ **خدوود**: کوڵمان.

**پوختەی مانا:**

یاری چەلەنگ و شۆخوشەنگ، ڕەنگە لە «مەلا» دڵتەنگ بێ؛ لە بەڵێنی دیداری پاشگەز بێتەوە. بەختڕەشم؛ هەر بە یادیشیدا نایەم. لە ئاوڕ وێدانەوەشی، دوورەبەشم. سەرەڕای بێئیلتفاتیی، بەرگی غەزەبی پۆشیوە و تێکۆشیوە دەردەکەم لێ گرانتر کا. دەرد و کوانی زۆر بەژانی داخی دڵن و لە ناو قووڵایی جەرگمدا جێ خۆش دەکەن. بۆ دیداری دەمخافڵێنێ و هەر ئەمڕۆ بە سبەم پێ دەکا. ئەو دەستاودەست پێ‌کردنە، داخی دڵمن هەتا مردن. لە عەیبەت دەردی دەروونم، ئاوارە بووم؛ هەتا شام و عیراقیش چووم. بەلام بە چی سەبووریم دێت؟ بەڕاستی ناهەقیی یارم لە منی دەکا، لە ئەندازە دەرکەوتووە. ژەهری دووری دەدا بە من؛ کەچی شۆفار و بەدکارم، لە دەوری ئەو، هەموو ڕۆژێک ڕووی دەبینن و لە ڕەواقی هەنگوینی دەمی شیرینی، دەمشیرینن. ڕاستوو دەوێ، من مافی گلەییم نییە. ئەو بەژنشۆخ و شیرینەی، وەک قامیشە شەکر دەچێ. ئەو کوڵمە ئاڵ و ناسکانەی، لە پەڕەی گوڵی گولاوێ ناسکترن. چۆن بەرگەی ئاگر دەگرن؟ منێک کە لە تینی ئەوین، گڕم بەرزە و هەموو گیانم بۆتە پۆلوو، دەبێ لە خۆی بپارێزم. وا گریمان فەرمووی: «مەلا» با بێتە لام و بمبینێ. چۆن دەوێرم بچمە دیاری و لەو ناسکە نزیک ببمەوە؟ یاری من لەو بتانەیە کە ناشێ پەرسیارەکەی تخوون کەوێ.

شەپالێکی کە وەک بت دەیپەرستم من،<br>
ترووسکە و شۆقی نووری خوایە؛ دیتوومە لە دنیایە.<br>
ئەگەر شەیتان لەباتی بابەدەم، یارمی بدیتایە،<br>
هەزار سوژدەی دەبرد یەکجێ<br>
بەرەو ئەو بەژنوبالایە



## تیری نیگا

به شێوەی کلکەدار (موستەزاد)

١ یـــا رامـــیَ قَلْـــبی بِســـهامِ اللَّحَظـــاتِ!  هَیْهـــاتْ نَجـــاتی
مـــازالَ فِـــداءً لَـــکَ روُحـــی وَ حَیـــاتی  مِـــنْ قَبْـــلِ مَمـــاتی

**مانای وشەکان:**

**یا رامی**: ئەی هاوێژەر؛ **قَلْبی**: دڵم؛ **بِسِهام**: بە تیرانی؛ **لَحَظات**: نیگایـان؛ **هَیْهات**: زۆر دژوارە، چەتوونە؛ **نجاتی**: ڕزگاریم؛ **مازال**: هەر هەیە؛ **فِداء**: قوربان؛ **لَکَ**: بۆ تۆ؛ **روحی**: گیانم؛ **وَ حَیاتی**: ژیانیشم؛ **مِنْ قَبْل**: لەپێش؛ **مَماتی**: دەمی مەرگم.

**پوختەی مانا:**

ئەی ئەوکەسەی دڵت کردم بە ئامانجی تیری نیگات! زۆر دژوارە ڕزگاریم بێت. گیان و ژینم قوربانی تۆن. هەر بە قوربانیشتی دەکەم؛ هەتا ماوم و نەفەوتاوم.

٢ نَمَّقْـــتُ اِلـــی بابِـــکَ یـــا قُـــرَّةَ عَیْنـــی!  بِالـــدَّمعِ کِتابـــاً
اشْـــهَدْتُ علیالْوَجِـــدِ مِـــدادی وَدَواتـــی  سَـلْ مِـنْ عَبَراتـــی

**مانای وشەکان:**

**نَمَّقْتُ**: نووسیم؛ **الی بابک**: بەرەو دەرگات؛ **قُرَه**: فێنکایی؛ **عَیْـنی**: چـاوم؛ **بالـدَمعِ**: بـە فرمێسک؛ **کتابا**: نامەیەک؛ **اَشْهَدت**: ئاگادارم کرد؛ **علَی**: لەسەر؛ **وَجْـد**: ئـەوین، تاسـە، مەیل؛ **مِدادی**: مەرەکەفم؛ **و دواتی**: مەرکەفدانەکەشم؛ **سَلْ**: بپرسە؛ **من**: لە؛ **عَبَراتی**: فرمێسکانم.

**پوختەی مانا:**

فێنکی و سۆمای چاوەکانم! نامەیەکم بە فرمێسکی خوێنین نووسی و بۆ ئاسانەتم بەڕێ کرد. مەرەکەف و دەواتەکەش بە ئەوینی منیان زانی؛ دەتوانی لە ئەشکم پرسی.

٣ مُذْ زَیَّنَکَ الدَّهْرُ بِأَزْهارِ جَمالٍ یا رَوْضَةَ حُسْنٍ!
اَخْجَلْتَ طَلَّ الْوَرْدِ بِحَبِّ الْوَجَناتِ بینَ الْعَرَماتی

**مانای وشەکان:**

**مُذْ**: لەوەتا؛ **زَیَّنَکَ**: ڕازاندوویتەوە؛ **دَهْر**: زەمانە؛ **ازهار**: گوڵان؛ **جَمال**: جوانی؛ **رَوْضَه:** باغچەو گوڵجار؛ **حُسْن**: جوانی؛ **اَخْجَلْتَ**: شەرمەزارت کرد؛ **طَلْ**: ئاونگ، شەونم؛ **حەب**: دانە؛ **وَجَنات:** وجنەگەل؛ **وجنه**: کوڵمە، **بَیْن**: نێوان؛ **عَرَمات**: نوختەگەلی ڕەش لەسەر سپی.

**پوختەی مانا:**

لەو ساوە دەستی زەمانە بە جوانی تۆوە خەریکە و بە گوڵانت وەدەڕازێنێ و تۆی کردۆتە باغچەی گوڵان، ئاونگ لە شەرمی ئارەقی دانە-دانەی، دەوری خاڵانی سەر گۆنات، سەر دادەخا و زۆر تەریقە.

٤ جِلْبابُ دُجَی صُدْغِکَ الْهابُ فُؤادی یَحْکیکَ عِیاناً
نیرانُ جحیمی حُجِبَت بالشَّهَواتِ مِنْ کُلِّ جِهاتی

**مانای وشەکان:**

**جِلباب**: سەرپۆش؛ **دُجَی**: تاریکی؛ **صُدْغ:** لاجانگ؛ **اِلْهاب**: گڕپەگرتن؛ **فُواد**: دڵ؛ **یَحکیک**: بۆت دەگێڕێتەوە؛ **عِیانا**: بە ئاشکرا؛ **نیران**: ئاگر؛ **جَحیم**: جەحەندەم؛ **حُجِبَتْ**: بەرپیوار بووە؛ **شَهَوات**: ئارەزووگەل؛ **مِنْ کُلِ**: لە گش؛ **جهات**: لایەنان.

**پوختەی مانا:**

بسکی ڕەشت- کە لاجانگیان داپۆشیوی و هاتوونە سەر کوڵمەی سوورت- ئاشکرا تێت دەگەیەنێ کە دڵم چۆن گڕپەی بەرزە و ئاگری ئەوین لە دڵما- کە وەک ئاگری دۆزەقە- لە هەموو لاوە ئارەزووی دیداری تۆ و ڕەشایی بەختی نەگبەتم، داپۆشیوە و لە بەر چاوی تۆ نەدیوە.

٥ فـی ظُلْمَـةِ اَصْـداغِکَ مُـذْ اَصْبحَ مِسکٌ یـا ظَبـیَ حَـریمٍ
قَـدْ اَحْـرَقَ فی‌الصِّـینِ قُلُـوبَ الظَّبیـات نارُالحَسَـرات

**مانای وشەکان:**

**فی‌ظُلْمَه**: لە تاریکاییی؛ **اَصْداغ:** لاجانگان؛ **اَصْبحَ:** گەڕیاوە، بوەتە؛ **اَصْبحَ:** کەوتۆتە بەرەبەیانەوە؛ **ظبی**: ئاسک؛ **حَریم**: ئەندەروونی ماڵ؛ **قد**: لێرەدا بە مانا بێ‌گومان؛ **اَحْرَقَ**: سووتاندی؛ **فی الصّین:** لە چین؛ **قلوب**: دڵان؛ **ظَبیات:** ئاسکان؛ **حَسَرات**: عەزرەت و ئاواتان.

**پوختەی مانا:**

هەر لەوساوە، لە شەوی کەزیەکانتەوە بۆنی میسک، لە سپیایی بەربەیانی لاجانگت پەرژ و بلاوە، بە کۆمەڵ کەژالانی چین- کە میسکی چاک وا لە لای وانە- و تێگەیشتوون میسکیان ڕەواجی نەماوە و ناگاتە ئەو بۆنە میسکەی لە تیسکی بسکی تۆوە دێت، بە عەزرەت و ئاواتەوەن، بگەنە تۆ. زۆریش ئێرەییت پێ دەبەن؛ کە تۆی کارمامزێکی ماڵیی، گرۆت لەوان بردۆتەوە. بە ئاگری ئێرەیی و تاسە، سووتاون و دڵیان لە سوێت پرووکاوە.

٦ کَـمْ تُحـرِقُ اَحْشـایَ وَ فـی فیـکَ زُلالٌ والشـارِبُ مِنـهُ
یَحْکـی خَضِـراً مَـورِدُهُ مـاءُ حیـاتِ لا فی‌الظُّلُمـاتِ

**مانای وشەکان:**

**کَمْ**: چەند؛ **تُحرِقُ**: دەسووتێنی؛ **احشای**: هەناوم؛ **فیکَ**: دەمی تۆ؛ **زُلال**: ئاوی شیرین و ڕەوان؛ **شارب**: خۆرەوە؛ **مِنهُ**: لەو؛ **خَضِر**: سەوزەگیا؛ **خَضِر**: خدری زیندە؛ **مَورِدُه**: شوێنی خواردنەوەی، کانیەکەی؛ **ماءحیات**: ئاوی ژیان؛ **فی‌الظُّلُمات**: لە تاریکستاندا.

**پوختەی مانا:**

ئەو لێوە شیرینانەی تۆ، لە بان دەمی بیچەلانەت- کە سەرچاوەی ئاوی ژیانی شیرین و فێنک و ڕەوانن- هەرکەسێ خوا بەختی بدا و لەو لێوانەی تۆ هەڵمژێ، وەک سەوزەیەک لە ئاوی ژیان پاراو بووبێ، قەت سیس نابێ. (یان: وەک خدری زیندەی نەمر، گەیشتۆتە سەرچاوەی ژین؛ نەشگەیوەتە تاریکستان.)

هەتا کەی دڵ دەسووتێنی و هەروا تینووم دەهێڵییەوە؟ دە بەزەییەکت پێما بێت.

٧ مِنْ «اَحْمَدَ» فی‌لَیْلَةِ اَصْداغَ مِلاحٍ لاحَتْ کَلِماتٌ

مَنْ یَسْمَعُها فاحَ بِمِسْکِ‌الدَّعَواتِ جَیْبَ‌الْغَدَواتِ

**مانای وشەکان:**

**مِلاح**: خوێن‌شیرینان، جوانان؛ **لاحَتْ**: دیاری دا؛ **کَلِمات**: وشەگەل؛ **یَسْمَعُها**: دەیبیسێ؛ **فاح**: بۆنی بلاوکردەوە؛ **دعَوات**: نزایان؛ **جیبْ**: دڵ، ناوەرۆک؛ **غَدَوات**: بەیانان.

**پوختەی مانا:**

چەند وتارێک لە پەسنی شەوی کەزیانی و بەرەبەیانی لاجانگی سپی و جوانی یاری نازدار، لە جەنگەی بەرەبەیاندا، ئەحمەدی دڵدار درکاندی. کێ بیانبیسێ بۆنی میسکیان لێ هەڵدەمژێ؛ کە لە ناوهێنانی بسکی، بۆنخۆش و بە بەرامە بوون.



# چرای کوردستان

| | | |
|---|---|---|
| آ | پــور ژ دینــا تــه غــه‌ریبم خــانم | ژ ته سه‌ر تا ب قــه‌ده‌م حــه‌یرانم |
| | هه‌ر ب جان ته‌شنه‌له‌بێ لــه‌علانم | دل د به‌نــــدا گرێهـــا زولفـــانم |
| | یووسوفێ جورعه‌که‌شێ هیجــرانم | نوقتــــه‌یا دائره‌یـــێ زینــــدانم |
| | لــه‌و شــوبێ دایــره ســه‌رگه‌ردانم | باده‌نوشــێ قــه‌ده‌حێ حیرمـــانم |
| | ب دل ئاتــه‌ش ژ جه‌گــه‌ر بریــانم | لـــه‌و په‌رێشـــانم و پورئێشـــانم |
| | عاشـــقێ نـــازک و مـــه‌حبووبانم | تــو مــه‌بین بێ‌ســه‌ر و بێ‌سـامانم |
| | گولـــێ باغـــێ ئیره‌مـــێ بوهتـــانم | شــه‌بچراغێ شــه‌بێ کوردســتانم |
| | چ ته‌بیعه‌ت‌به‌شـــه‌ر و ئینســـانم | «للهِ‌الْحَمْـــــد» چ عالی‌شـــانم |
| | د ریبا یارێ ل رێزا سـانم (صـانم) | لــه‌و د ئیقلیمــێ ســوخه‌ن خاقـانم |
| | ســبه‌هێ عیــده و ئــه‌ز پــێ زانم | کو ب کێ‌را تــه ســه‌حه‌ر قوربـانم |
| | خــوه‌ش برینــداره‌کی بێ‌ده‌رمــانم | جاره‌کێ شه‌فقه که‌، ڕووحم! جانم! |

ژ خودێرا ڤه‌که به‌ندا به‌رییێ　　دینبه‌رێ حۆری‌میسالێ زه‌رییــێ

نازکێ نه‌یشه‌که‌رێ سورپه‌رییێ

**مانای وشه‌کان:**

**موسیف**: دڵ به‌داخ و خه‌مبار؛ **جورعه**: قوم، فڕ؛ **حیرمـان**: بێبه‌شــی؛ **سـامان**: دارایــی؛ **بێ‌سه‌روسامان**: بێ‌سه‌روبه‌ر؛ **بوهتان**: مه‌ڵبه‌ندی بۆتان له کوردستان؛ **شه‌بچراغ**: چرای شه‌و، گه‌وهه‌ری هه‌ره‌نایاب که به شه‌و ده‌ترووسکێ؛ **عالی‌شان**: پایه‌به‌رز؛ **سان**: سه‌گان؛ **سان**: ڕانان، ڕانراو.

**پوختەی مانا:**

سەروەرەکەم! بۆ دیدارت زۆر بەتاسەم. حەیرانی لە سەر هەتا پێتم؛ چەند جوانی؟! گیانم تینووی دینی لێوی تەنک و ئاڵتە. دڵم گراوی کەزیانتە. پڕ لە داخم، ژەهری دووریتم چێژتووە. لە زیندانی ئەویندا، بوومەتە نوختەی ناوەندیی؛ بۆیە جەغزی سەرگەردانم و لە گش لا بێدەرەتانم. لە جیات بادە، بێبەشیم لە دیداری تۆ، دەرخوارد درا. دڵم وەک ئاگردانێکە، جەرگمی لە سەر دەبرژێ. پڕ لە ژان و پەرێشانم. دلداری خوێنشیرینانم! دۆستی ناسک و نازدارانم! لێم مەڕوانە کە وا بێسەروسامانم. تاقەگوڵەی بەهەشتەکەی مەڵبەندی چیای بۆتانم؛ بوومە شەوچرای کوردستان. با بمناسن کە من چتۆ مرۆڤێکم؛ چۆن کەسێکم. سوپاس بۆ خوا، لە سایەی ئەوینی تۆوە، جێبڵند و پایەبەرزم. خۆم لە ڕیزی دلداراندا جێکردەوە و خۆ بەسەگی دەرگای یار دەزانم. بۆیە وا گفتڕەوانم و لە چاو شاعیران قاقانم. دەزانم سبەینێ جێژنە و منت دەوێ بۆ قوربانت؛ چۆنکە هەرچەند برینداری ئەوینی تۆم، بە لەش ساغم و نامگەرەکە دەرمان بکرێم؛ لە ئەوینت ڕزگارم بێ. دەسا گیانە شیرینەکەم! بەزەت بە گیانی مندا بێ. بیکە لە ڕاهی خودادا، دوگمەی سینە بترازێنە، با بەر لە قوربانی کردن، بڕوانمە ئەو سینە جوانەت. تۆ وەک حۆریت؛ تۆ دینبەری؛ تۆ جوانترین سەوزەڕەنگی؛ تۆ ناسکی؛ تۆ وەکوو قامیشەشەکری لەبالادا؛ تۆ وەکوو پەری دلکێشی.

٢

| | |
|---|---|
| سووسەنێن تازە و مشکین والان | بەس پەرێشان کە ل سەر سەرمالان |
| ڤەکە جارەک تو ژ دۆرا خالان | ژ دل ئەم داینە بەر چەنگالان |
| خەنجەر و شیر و رمێن قەتتالان | نەزەرێ وەربدە ساحیبحالان |
| کو ئەسیرین د دەست حەییالان | لەو ئەلف تێن مە د حەرفێن فالان |
| کو ل شکلێ رەقەمێ سەرسالان | تۆی موورادا مە ژ عەرعەربالان |
| زەمزەم و دەنگ و زمیهنا لالان | جەزبەدا مە ب هەزار ئەحوالان |
| لەو دنالین ژ نەسەق عەبدالان | کو ب مەستی ددرن یەک پالان |
| عەنبەرین خەمری و سۆسن ئالان | سوهر و زەر شەتری و چیچەک ئالان |

میسرییان دل مە ژ خوە کر کالان   تە ژ قەوس‌وقەزەحێن خەلخالان
کو بوین دایرەشوبهەت هالان   خەمرینن خەمزەدە نیسبەت دالان
کو چەڤاندینە ژ رەنگ کۆپالان   میسرییان وەربدە بەر سیقالان

زوهرەرەنگێ و شەفەق موشتەرییێ   دینبەرێ حۆری‌میسالێ زەرییێ
نازکێ نەیشەکەرێ سوڕپەرییێ

**مانای وشەکان:**

**والا**: بەرز و بەقیمەت؛ **مالان**: ملان؛ **سەرمال**: دەسمالی سەر، سەرپۆش؛ **قەتتال**: کوژەر؛ **حەییال**: خاپینۆک؛ **بالان**: بالایان؛ **لال**: بێزمان؛ **ئالان**: رەنگ‌ئالان؛ **ئالان**: هالان، لێک هالان؛ **خەلخال**: قۆلبەند، پاوانە؛ **هالان**: خەرمانانی مانگ؛ **خەمزەدە**: لارەوەبوو؛ **کۆپال**: گۆچان؛ **سیقال**: مشت‌ومال.

**پوختەی مانا:**

کەزیەکانت- کە وەک میسکی بەقیمەت و وک سوێسنی تەڕوتازەن- بەس بەسەر دەسماڵەکەتا و لەسەر ملان، بلاو بکە! جارێک لە دەوری خالانیان وەلا بدە! ئەو بسکە سەر بەقولاپانەت، چنگیان لە ناو دلمان گیرن. هەم خەنجەرن، هەم شمشیرن، هەم ڕمبی دلدار مرێنن. فێلەبازن، بەرەو خۆیانمان دەکێشن. دەتۆ وەرە سەیرێکی دلدارانت بکە! چۆن ئەسیرن لە ناو زیندانی پرچاندا. لە ناچاری فالمان بۆ خۆمان گرتەوە؛ ئەلفی هێنا. واتا: سالەکەی خۆش دەبێ و بە دلداریی بەژن ئەلفێک- کە وەکوو عەرعەر بەرچاوە- دەمێننەوە و وەشوێن بەختی خۆمان کەوتین. ڕێمان کەوتە نزیکی تۆ. خرمە و زرمە و گرمە و قرمەی، زێڕ و زەنبەری بێ زمان- کە لە جوانیت سەرخۆش ببوون و دەهەژان، جەزبە و حالی لێمان هێنا. گشمان وەکوو دەمانبینن، وەک عەودالانی شوێن خالان، نالەمانە و لە ئەوینت وا سەرخۆشین، پالمان بە یەکەوە داوە، تا نەکەوین و بۆ نزیکیت گشتمان پالەپەستۆمانە؛ هەی لەوەی زووتر بتگاتێ! لابسک و کەزی عەنبەری، لە گوێن لقەسوێسنەی تازە، لێک هالاون. گولی ئالی سەر کولمانت، دەگەل گولینگەی سەرپێچت، وێک دەکەون. بازنە و خرخال و

لاسەرە و گوڵ و گوارە، لە دەوری مانگی ڕوخسارت، بە خەرمانـە دێنـە بـەرچاو. بسـکەکانت وەکوو دالێک چەماونەوە. سەریان وەکوو گۆچان لارە. برۆکانت- کە وەک شـیری میسـری دەچن- دڵی مەیان کردە کالان؛ دەریانکێشـە و لـە خـوێن مشتومالـیان بکـە! بـە ڕەنـگ زوهرەی؛ بە تیشک چەشنی موشتەری. وەکوو حۆرییەکی دینبەری و سەوزەڕەنگی. نـازکی و نەیشەکر ئاسای؛ بۆ دڵکێشان وەک پەری وای.

٣

سونبولێن تـازە موسـەننا نـەکری | توڕڕەیا شـەنگ موتـەڕڕا نـەکری
---|---
خەمرییان شـیفتە، تـوغرا نـەکری | عەرعـەرێ خـارە و دیبـا نـەکری
دل و دین غاەرت و یەغما نەکری | سەری سەودازەدە سەودا نـەکری
گوهرێ نەرگسێ شـەهلا نـەکری | کوشتیێ خەنجەرێ بوڕڕا نـەکری
ساعەتێ ڤـێ سـەعەتێ ڕا نـەکری | مە ژ قەیدا خوە تەسـەللا نـەکری
لێ خەرامێ ژ مـە مەسـتانە کـری | ژ مە دل کەعبە و بوتخانـە کـری
دەعویـێ دلبـەرییێ دا نـەکری | جیلوەیەک میری و شاهانە کـری
پێشێ شەمعا خوە، مە پەروانە کـری | دلی غەمدیدەیێ مـا شـا نـەکری
ل مە بێپـەردە تەجـەللا نـەکری | وەهە جارەک مە تەوەللا نـەکری
غەنجەکێ قەنج ل «مەللا» نەکری | جەگـەری ریـش مـوداوا نـەکری
بکـوژی عاشـق و پـەروا نـەکری | ل شەهیدێ خـوە تماشـا نـەکری

ما وە دلبەر دکرن دلبـەرییێ | دینبەرێ حۆریمیسالێ زەرییێ

نازکێ نەیشەکەرێ سوڕپەرییێ

**مانای وشەکان:**

**موسەننا**: نوشتاو، قەدکراو؛ **موسەننا**: دولایەنە؛ **موتەررا**: لوولدراو؛ **شیفتە**: شێواو؛ **سەودا**: شێت؛ **سەودا**: مامڵە؛ **سەودا**: ئەوین؛ **سەودا**: ڕەش؛ **گوهری**: گـۆڕی، قوربـان؛ **ساعەت**: قیامـەت؛ **تەسەللا**: سەبووری، تەرک؛ **تەوەللا**: بەسەرکردنەوە، دۆستی؛ **تەوەللا**: هەڵوەدا، دوورخراو.

**پوختەی مانا:**

سونبولی تازەی کەزیانت بـە دوو لا نەنووشـتێنییەوە، لابسـکان پـیچ و لـوور نـەدەی، بسکی ئالۆز- وەک مۆری سولتان- ڕێک نەخەی، تافتە و خـارا دەبـەر بـەژنی وەکـوو عەرعەری خـۆت نەکـەی، تـا دڵ و دینمـان تـالان کـەی و بـە خەنجـەری مژۆلانـت بمانکوژی و بمانکەیـە قوربـانیی نێرگسـی چـاوی مەسـت و کـاڵـت و سـەری شـێتی ئەویندارمان بۆ خۆت نەبەی، هەر ئێستە قیامەت ڕانەکـەی، لـە زنجـیری کەزیـەکانت ڕەها نەبین. ئێمە دڵمان بوتخانەیەکە تۆی تێدای و لە سایەی تـۆ بۆتـە کابـە. تـۆ بـە مەستیی و بە لەنجەولار ڕووی تێ نەکەی، داوای دڵبەری بێوێنەی تێدا نەکەی، خۆت دەرنەخەی کە بزانن تۆ میر و شای دڵبەرانی، ئێمـە نەکـەی بـە پەپوولـەی بـەرمۆمی ڕووت، دڵی خەمبارمان شاد نەکەی، هەمیشە هەر دەرمـان بکـەی، جارێـک خۆتمـان نیشـان نـەدەی، نـازێکی زۆر نازەنینانـە بەرامبـەر بـە مـەلا نەکـەی- کـە جەرگـە برینداره‌کەی دەرمان بکرێ- هـەر دڵـداری خـۆت بکـوژی و گـوێ نەدەیـەی، هـەر تەماشای کوژراوەکانیشت نەکەی، چۆن پێت بڵێم تۆ لە دڵـبەریی دەزانی؟ تـۆ دڵـبەر نیت و دینبەری، ئەی یاری سەوزەڵەڕەنگی حۆریئاسا!

۴

| | |
|---|---|
| هەردو قەوسێن تە ژ قودرەت نە ژ یـەنگ | ژێ ب میزان برەشێنن مە خـەدەنگ |
| بدرن سینە ب سەرپەنجە پلـەنگ | ڕووم پشت دت عەجەمێ بێتە فرەنگ |
| لێ نە وەک واقیعەیا گیـو و پەشـەنگ | هلبتن قەنج ژ نێڤ ئاتەشێ جەنگ |
| تێن سواشێ حەبەشی و نۆبی و زەنگ | تو دزانی چ نەهەنگن چ نەهـەنگ |
| ڤەکە لەعلان تو ژ سەر شەککەرێ تەنگ | کو ژ موورادا تە بوین پێـت و پـەرەنگ |
| مەستێ جەورا تە مە، بێ بادە و بەنگ | بێ تە جانا ل مە عالەم بویە تەنگ |
| ژ جەفایا تە نەما قەت ل مە ڕەنگ | تو دڕانی چ دەبێژت نەی و چـەنگ؟ |
| ژ چ پەیوەستە دنالن سـەرەدەنگ | مە دخوونن قەد و بەژنا تەیی شەنگ[1] |
| چ بکم فەیدە کـو ئێڤـارە درەنـگ | موتریبان دانەکەون چەنگ ژ چـەنگ |

۱. ئەم بەیتە لێرە کەوتووە: «نێرگزین مەست ب ناز و نەیرەنگ لێ تو تووبیی و ئەزم خەستە و لەنگ»

دانەدت پەردەیێ ئایینەیێ زەنـگ     کو ژ چەنگا مە بنالت خەرچـەنگ
وەک «مەلا»یێ ب هزار رەنگ ئاهەنگ     ب فغان بێت ژ بەر سەد فەرسـەنگ

نەکری تەرکێ تو ڤێ کافرییێ     دینبەرێ حۆری‌میسالێ زەرییـێ
نازکێ نەیشەکەرێ سورپەرییێ

**مانای وشەکان:**

**واقیعـە**: ڕووداو، جـەنگ؛ **پەشـەنگ و گیـو**: دوو پاڵـەوانی چـیرۆکن؛ **نـۆبی**: خەڵـکی ژووررووی میسر کە ڕەش‌پێستن؛ **سەرەدەنگ**: بەستەی گۆرانی؛ **خەرچـەنگ**: قـرژاڵ، برجی سەرەتان لە ئاسمان؛ **ئاهەنگ**: هەوای گۆرانی؛ **فغان**: هاوار؛ **فرسەنگ**: فرسەق، پێوانەی ڕێگەیە بریەتییە لە ٤٤٨٢ میتر.

**پوختەی مانا:**

بەو کەوانەی برۆیانەت- کە کرگاری تایبەتی دەسـتی قـودرەتێن- ڕێک‌وپێـک تـیران بگرە دڵ! با لە هەردوو لاوە کەزیت، لە سەر گۆنات بەیەک بگەن. وەک لەشکری ڕۆم و عەجەم، پێکا بدەن. با چاوە مەستەکانیشـت- کـە وەک فـەرەنگی ئیسـلام‌کوژ، لـە هەژارکوشتن زۆر خێـران- بێنـە ویـزەی گیـانی سیسـم. وردەخاڵـت- کـە لـەگوێن حەبەشی و زەنگین و لە ناو دەریای جـوانی تـۆدا، وەک نەهـەنگی تینـوو بـە خـوێنی دڵداران دێنە بەرچاو- بێنە بەرچاو. با جـەنگ، جـەنگی مەغلۆبـە بـێ و لەشـەڕەکەی پەشەنگ و گیوو- کە شانامە باسی دەکا- حەسـتەمتر بێـت. ئـاگری جـەنگ پێـت و بڵێسەی بلند بێ و ببێتە کڵ بۆ سووتانی دڵ و گیانم؛ لە دواهەناسەی ژیانمدا، چاوێکم بە گڕ بکەوێ. واتا: سەر کوڵمەت ببینم؛ کە لە لابەلای بسکاندا، وەک گـڕی ئـاگر لـە شەودا، ترووسکەی دێ. لەم ئاواتەم نیازم وایە، لێـوە لـەعل‌ڕەنگـەکانت- کـە تـونگی تەنگی پڕشەکریان داپۆشیوە- بکرێنەوە و بە بزە و بە بەزەییـەوە، وەدرۆم خەیتـەوە و بفەرمووی: دڵداری ژار! تۆ لەمێژە لە تاسەی ئێمە سووتاوی. گڕت تێچوو، بوویە پۆلوو، بوویە سووت و سووتاو چۆن دەسـووتێتەوە؟! ئەوسا بـزە و زەردەخەندەشـت ببیـنم. ئەوندەی مەستی ئەوینم، سەدئەوندەی تر مەست ببم.

یاری نازدار! گیانی شیرینی گش گیانان! خۆت ئەیزانی کە ناتدینم. دنیای هەراو لەبەر چاوە، وەکوو دڵ و بینم تەنگە. هەرچی دەیبینم- دوور لە تۆ- وەک ڕوخساری خـۆم بێڕەنگە. دە گوێ بگرە! سەروبنی لۆرینەوە و دەنگدانەوەی بلوێر و چەنگ، دنەی من و دڵ و گیانە نزارەکەم دەدەن، کە هەڵوەدای دیداری بەژنی شەنگت بین و بـە تیـنی ئەوینت بژین و بیر لە چیتر نەکەینەوە.

بەختەوەرم کە لەوەتا لە سەر دنیام، گراوی داوی بسکانم. تیا پـیر بـووم؛ گەیشـتوومە زەردەپەڕی ژیانی ئامانەتی دنیا. بەرەو ئاسۆگی جیهانی هەرمانی دڵداران دەچـم. زۆر زامی کاریم لە نازی چاوی مەستی تۆ، لە دڵدان؛ کە دەبنە مایەی شانازیم لە ناو یاران. بەئاواتم، هەتا کاتی ئاوابوونم، بۆ ئەوەی دڵم ژەنگ نـەگرێ و دڵـڕوون و دڵـنیا بـڕۆم، بەزمگێڕان، بە بلوێر و چەنگ و بە دەنگ، لەگەڵ منا هاودەنگ بن و ئاوازەمان هـەرد و ئاسمانان دابگرێ و لەبەر تۆ بپاڕێینەوە کە دەغیلە لەو کافرییە و دڵـدار کوژییـەت واز نەهێنی! ئـەی دینبـەری چەشـنی پـەری، بـۆ دڵکێشـی! ئـەی بـاڵا قامیشەشـەکری سەوزەڕەنگی شۆخوشەنگی حۆریئاسا!

**٥**

| | |
|---|---|
| نیرگـزا مەسـتێ چیـای بوهتـانی | نـازکو شـەنگ شـوبێ رەیحـانی |
| چ خەت ئێشکەستە و پوڕعینوانی | کـو تـە پـێ نەسـخ کـری دیـوانی |
| «الله الله» ژ چ رەنـگ ئینسـانی | یووسـفێ لەبشـەکەرێ عیـبرانی |
| بەسە گەر وەکتە بدێرت سـانی | «اَحْسَـنَالله» ژ سـوڕا سـوبحانی |
| کو جەمالەک وە مونـەززە ئـانی | وەکتە سەر تا ب قـەدەم نـوورانی |
| د میسـالەک بەشـەریدا دانی | مـە ب ئیلهامـێ ئیلاهـی زانی |
| ب نیشان قودرەتـێ بـێ نیشـانی | چ نیشان؟ زولمـەتێ نوورئەفشـانی |
| ل جـەمالا سـەمەدی بورهـانی | تو ل دەرحـەق مـە چـرا ئـەرزانی |
| کو سەحەرگەهـ ب مەشێ سەیرانی | تە «مەلا»یێ خـوە ڤـەجارەک نـانی |
| ب سـەرئەفرازی و عالیشـانی | سەجدە بت بـەر قـەدەما سـولتانی |
| زینەتا حوسـن و سـوڕا خووبـانی | تاجێ فـەرقێ سـەرێ مـەحبووبانی |

تو ب شیرانی و لەبشەککەرییێ          دینبەرێ حۆریمیسالێ زەرییێ
نازکێ نەیشەکەرێ سوڕپەرییێ[1]

**مانای وشەکان:**
**نەسخ**: بێبرەو کردن و لەناو بردنێ؛ **عیبرانی**: جوولەکە؛ **مونەززە**: پاک و بێخەوش؛ **ئەرزان**: گوێپێ نەدەر، بێموبالات.

**پوختەی مانا:**
وەکوو ڕێحانەی شلک وای. بەڵام بە چاوی کاڵترا، لەو نەرگسە کالانەی تۆ، کە لە چیای بۆتانێ دەڕوێن، خەتوخاڵی بەعینوان و پڕ لە نازت، دیوانی ناوی جوانانیان لەبەین برد. ئەی نامەخوا! تۆ چ جۆرە ئینسانێکی؟ ئەگەر یووسفی جوولەکە تۆ ببینێ، دەزانێ دووهەمی هەیە. تۆ حۆرییەکی لە گیان ڕسکای، سەرتاپات لە تیشکی خوایە. گەورەیی هەر بۆ خودایە. جوانییەکی وا پاکی هێنا، خستییە قاپێلکی بنیادەم. ئێمە لە خواوە زانیمان کە تۆ نیشانی کری خوای بێنیشانی. تۆ لە ناو تاریکی لەشدایت و پرشنگ بڵاو دەکەیتەوە. تۆ بەڵگەی بۆ جوانی خودا. چۆنە جارێک مەلات ڕێ نەدا بێتە لات، تا سوژدە بەرێتە بەرپێت و شانازی بە بەختی بکات؟!
تۆ نەک تەنیا گیانی شیرنی، گیانی گیانیشمان هەر خۆتی. جوانیی و دڵکێشیی هەموو کەس لە تۆڕایە. تۆ تانجی سەری جوانانی و بە خوێنشیرنی و ڕەزاسووکی، کەس تات ناکات. وەکوو حۆریت و دین دەبەیت و سەوزەڕەنگی و نازکی. وەک نەیشەکەری و پەریئاسای دڵکێشی.

---

[1]. ئەم شیعرەم لە نوسخەکانی «سەلمان دلۆڤان» و «عوسمان تۆنچ»دا نەدۆزییەوە. سەرەتای ئەم بەندی ئاخرەشی لە هەردوو نوسخەی «زڤنگی» و «شێخ مونەووەر»دا، شپرزە. دیارە مامۆستا هەژار وا ڕاستی کردۆتەوە. هەروەها لەتەبەیتی بەرامبەری «نەتنێ ڕۆحی، تو ڕۆح و جانی» لەو دوو نوسخەدا داکەوتووە و لێرەش بەیتەکە نییە.

## سەرنجێک:

قەسیدەی «یەلمومیٚ عیشقیٚ» پاشڵ ئەلفە. لە زوربەی زۆری دیوانە دەسخەت و چاپکراوەکاندا، ڕەمکیشە و لە پێشەوەیە. لە شەرحە عەرەبییەکەدا، دوا خراوە و نووسراوە: «دەڵێن هی شێخی جزیرییە».
لە بەر زۆری شیعرەکانی، کە ٢٨٤ لەتەبەیتی دووپارچەیە و لەبەر دژواری وشەکان و ماناکانیان، منیش ڕامگوێزایە دواوە. مانای وشەکانم کرد و بە سەرچڵیش -بە پێی توانا- لە پوختەی ماناکانیش دوام. بە بیری من، تەنیا شەرحی ئەم قەسیدە، وەک پێویستە، کتێبێکی ئەستوور و سەربەخۆی دەویٚ. کە بیروبڕوای لێک جیای فەیلەسووفانی لاهووتزان و خاوەن مەنتیق، شی کاتەوە. ئەوسا فەرموودەی جەزیری ڕۆشن دەبن. بەداخەوە لەبەر بەرتەنگی جێگاکە و نەفەستەنگیم لە زانستا، ئەم ئەرکەم بۆ پێک نەهێنرا. هێندەم توانی، ڕچە بۆ خوێنەر بشکێنم خۆ ماندوو کا و سەر لە سەرچاوەکان بدا و باشتر لە خۆمی تیٚ بگا. خودا یار بیٚ.

«هەژار»



# یەلموومێ عیشقێ

| | | |
|---|---|---|
| ۱ | «الله» سەحەرگاها ئەزەل | یەلموومێ عیشقێ شوعلە دا |
| | نوورا جەمالا لەمیەزەل | زاتێ تەجەللایە خوە دا |
| ۲ | زاتێ تەجەللا بوو ل زات | بێ ئیسم و ئاسار و سیفات |
| | سیررا حرووفێن عالیات | خەف بوو د سەتر و پەردەدا |
| ۳ | زاتێ موقەددەس بوو وجوود | جۆشش نەدابوو بەحرێ جوود |
| | وەسف و ئیزافات و قیوود | یەک ژێ تەجەللایێ نەدا |

**مانای وشەکان:**

**یەلموم**: چۆلەچرا، خەتیرە؛ **حرووف**: پیتان؛ **عالیات**: بلندان.

**پوختەی مانا:**

ئەی نامەخوا! لە بەرەبەیانی هەرە پێشیندا، چۆلەچرای هەلکراو تیشکی دا؛ نووری جوانی خودای نەمر، هەر لە خوداوە دیاری بوو. هێشتا هیچ ناو و نیشانێکی بۆ خۆی بڕیار نەدابوو کە ئێمە بەو هۆیەوە بیناسین. ڕازی پیتە بەرزەکانی ناوی خودا، هێشتان لە ژێر پەردەدا بوو. خودای گەورە، خۆی هەر هەبوو؛ بەڵام هێشتان دەریای بەخشش بە ڕووی ئێمە، داپۆشرابوو؛ هەڵنەقولیبوو. پەسنی چلۆنەتی خودا، فەرمانەکانی بۆ بەندە، چارەنووسی قەرەبەخت و بەختەوەران، دیار نەکرابوون.

| | | |
|---|---|---|
| ۴ | حوسن و جەمالێ خواست ئەڤین | ڤێکرا د یەک زاتێ جڤین |
| | نوورا قەدیم بوو عیشق و ڤین | وان لێک ناز و عیشوەدا |

۵ عیشقا ژ نوورا لایەزال — حوسن و جەمالا بی‌میسال
ئەیساند یەلمووم و شەمال — دیسا خوە لێ پەروانە دا

۶ حوسن و محەببەت هەر هەبوو — حەق عاشقێ زاتێ خوە بوو
موحتاجێ حوسنەک دی نەبوو — نەقل و ریوایەت پێ وەدا

۷ بورهانێ عەقل ئەو کر قیاس — ئیسم و کەمالاتێن د خاس
ئەووەل ئەلیفێ پێ بناس — ڤێ نوورێ ئەو پەرتەو ڤەدا

۸ ئەو نوورە دایێ شەوق و تاف — عالەم خویا بوو، ما د ناڤ
بەرقێن خوە ئاڤێتن بلاڤ — رەنگ-رەنگ بەرق و لەمعە دا

**پوختەی مانا:**

جوانیی خودا ئەڤینی ویست؛ ئەڤین لە زاتی خودادا هاتە بەرهەم. نوور و ئەڤین لێکتر هاڵان و نازیان لە سەر یەکدی دەکرد.

ئەوین لە نووری نەمر بوو. جوانی بێوێنەش هەر خوا بوو. نوور و جوانیی گەیاندە یەک؛ هەردووکیان هەم ببوونە مۆم، هەم پەپوولە بۆ یەکتری.

جوانیی و ئەوین- وەک زاتی خودا- قەدیمن. خودا بۆخۆی ئەوینداری جوانیی خۆی بوو. ئاتاجی هیچ جوانییەک نەبوو کە جوانیی خۆی پێ تەواو کا. ئەم باوەرە لە ڕیوایەتدا هاتووە. عەقڵ بە بەڵگەدینەوە، خوای ناسیوە و بەراوردی دەگەڵ شتی تر کردووە و بۆی ڕوون بووە کە خوا هەیە و ناوی تایبەتی لێ ناوە و بێکەمایەسیی زانیوە. خوا بەرانبەر بە هەر شتێک- وەک پیتی ئەلفی ئەلفوبا- سەرەتایە و پیتەکانی تر لەوڕایە و لەوەوە هاتوونە بەرهەم؛ ئەو یەکەمە. نووری خۆی دەدنیا گێڕا و پرشنگی بڵاو کردەوە و تروسکەی بە چەندین جۆر دا و عالەمی دەناو خۆ پێچا.

۹ سوبحان ژ رەمزا خالیقی — نووری سپێدە سادقی
تاڤێتە قەلبێ عاشقی — لەرزێن و تا و جەزبە دا

۱۰ مەعنایێ عیشقێ بێم چییە — لەو من ب چەشمێ دل دیە
عەکسا جەمالەک سافییە — لامیع د میرئاتا مە دا

١١ حوسن و محەببەت زاتەکن — مەعشووق و عاشق لاتەکن
لێ سوورەت و میرئاتەکن — هەریەک د مەعنایێ خوەدا

١٢ گەر دلبەر و وەر عاشقن — عارف دڤێدا سادقن
ئاینەیێ نوورا حەقن — جێ-جێ دواندا جیلوە دا

١٣ عاشق ئەوە، دلبەر ئەوە — زاهیر ئەوە، مەزهەر ئەوە
ڕووح و بەدەن گەوهەر ئەوە — هەر شاهدەک دوڕدانە دا

١٤ هەر شاهدەک دا دێم ژ دوڕ — رووحەک دبەخش با ڕەمز و سوڕ
خەتێ غوباری نوقتە پوڕ — کاتب ژ بالا نوسخە دا

١٥ حەرفێن کشاندی کاتبی — نوورا د ڕۆح و قالبی
یەک-یەک ب ئیسمێ واهیبی — ئێعراب و جەزم و نوقتە دا

١٦ نوورن ژ سەر حەتتا قەدەم — نەققاشێ سەرمەشقێ قیدەم
پێ زەیینان لەوحێ عەدەم — هەریەک ب یەکدی چەشنەدا

١٧ ئەڤ شکل و سوورەت چەشنەئین — ئەسلن ل بالاتەر هەئین
نیسبەت ب وان ئەم سایەئین — تەرتیبێ خەللاقی وە دا

١٨ عالەم ب عالەم ئەو نەسەق — بوو ئاینە ئەسمائێ حەق
نوورا تەجەللایا تەتەق — عەکس و خەیالەک سادە دا

١٩ هەر هەیئەتا لێ ڕووح و جیسم — کلکێ کو لێ دانی تەلیسم
هەریەک ژ یەکرا بوونە ئیسم — لەو حەرف-حەرف ئەندازە دا

٢٠ ئەم تێک هەوییاتین یەقین — ئیسمین ژ مەسدەر موشتەقین
مەوهووم و لاشەی موتلەقین — عەکسێن د نێڤ ئایینەدا

٢١ پەرتەو ژ عەینێ نوورەکی — تێن-تێن تەجەللا توورەکی
ئەو سەر ددت یەک فوورەکی — لەو چەند لب-لب قەترەدا

٢٢ ئەو شاهدێن بێری ژ عەیب — هەر جیلوە لێ دائی د غەیب
ڤێ عالەمێ ئەو تێنە جەیب — دیسا لیها ئەو جیلوەدا

٢٣ ڕەنگ-ڕەنگ حوسنێ سوورەتان نەقش و نیگارێن دەستخەتان
بالا و بەژن و قامەتان شیرین لەبان پور خەندە دا

٢٤ شیرین لەبێن قەد نەیشەکەر سیمین بەرێن نازک بەشەر
زولفان ستار بوو رووژ د بەر بسکان ل مسکێ تەعنە دا

٢٥ گولدەستەیێ نوورێن قیدەم دەستان ژ ئەنگوشتان قەلەم
ئەو لالەیێ باغێ ئیرەم ماوەر ل بەلگان ژالە دا

٢٦ هن ئەسمەرن، هن دیم زەری مەهپەیکەرن، سوڕموشتەری
ویلدان و حوور و ئەو پەری هاتن لیباس و جامەدا

٢٧ چەندی ب خەمل و ڕەونەقن تەزیین ژ حوسنا موتلەقن
تیک جیلوەیێ نوورا حەقن عیشقا ئەزەل پێ شیوە دا

٢٨ حوسنا مونەززەهـ بێنیشان وێ لێ نقیسی زەرکەشان
خال و خەتێن عەنبەرفشان هەرکەس ب وان دل یەغمە دا

٢٩ دارووێ حوسنا دلبەران ب خەمل و لیباس و زیوەران
بێتە شوهوودا بەسەران بیناهییا هەر دیدە دا

٣٠ بنمێتە حوسنێ ڕەنگ-ڕەنگ نای و دەف و قانوون و چەنگ
ئەو عیشقەڤان تینت ب دەنگ لەو وان ب حوسنێ نەغمە دا

٣١ سیررا کەلامێ ئەقدەسی دەم-دەم د لەبسێ ئەنفەسی
تێتن تەنەززول بێ حسی نە ب گوفت وگوییێ قیسسەدا

٣٢ وە دڤێن کو عوششاقن هەبن دلدار و موشتاقن هەبن
وێ شەمسێ ئافاقن هەبن دا کفش ببت دسپێدەدا

٣٣ دا کفش ببن کەوکەب د چەرخ ڕابن هەزار مەعرووف ژ کەرخ
شبلییو سەعدی ئالێ فەرخ عیشقێ د وان کەشفا خوەدا

٣٤ دا حوسن و حوب دن مەزهەران کفش کن ل هەر عەرد و دەران
عاشق بخوونن دەفتەران دلبەر مەحەبەت نامە دا

| | | |
|---|---|---|
| ۳۵ | حوسن و جەمال و عیشقەیە | ئارام د پەردێدا نەیە |
| | مەحبووب لەو حەتتا هەیە | نابت دپەردە و خەلوەدا |
| ۳۶ | مەحبووب و خووب و دلبەران | بگری ل وان هەفتێ دەران |
| | دێ خوە ژ شباک و پەنجەران | زاهیر بکن د هەر عەردەدا |
| ۳۷ | ئەو لالەیێن ژ گوڵ تازەتەر | فەسلا بوهارێ بیتە سەر |
| | جیهـ-جیهـ ب هەڤرا تێنە دەر | خوەش-خوەش د عەردێ خارەدا |
| ۳۸ | رەمزەک غەریب و فاتری | پێدا ببت نێڤ خاتری |
| | قووەت تە نینن راگری | خەف کی د نێڤ قەلبێ خوەدا |
| ۳۹ | مەفهووم کو بوو مەعلووم د دل | زیوەر بدێ تێ سەد عەمل |
| | بینت لیباسک پور خەمل | هیندی کو سەعی و جەهدەدا |
| ۴۰ | لەفز و عیبارەت جامەیە | مەحبووبێ مەعنا ب خوەیە |
| | لێ خەمل حوسنەک زێدەیە | لەورا ب حوسنێ زیبەدا |

**مانای وشەکان:**

**ئیعراب**: بزاوی پیت، دەربڕینی مەبەست؛ **جەزم**: زەنە، سووربوون و پێ دا گرتن؛ **چەشنە**: چێژە و تام؛ **چەشنە**: نموونە؛ **توتوق**: خێوەت و پەردەی زل؛ **تەتەق** (**توتوق**): ئاسمان؛ **هویە**: بەڵگەی بوون؛ **مەسدەر**: چاوگ؛ **موشتەق**: وەرگیراو، لەت بوو لە شت؛ **مەوهووم**: خەیاڵی؛ **لا شەی**: نە تشت، نە شت؛ **لب-لب**: دانە-دانە؛ **بێری**: بەری، پاک و دوور؛ **جەیب**: دڵ، ناوەند؛ **لیها**: لەوێ؛ **دی سالها**: هەروا سالان؛ **ژالە**: شەونم؛ **ئەنقەس**: هەرە هێژا؛ **ئافاقن**: ئاسۆگەل؛ **فاتر**: وەدیهێن، داهێنەر؛ **مەفهووم**: زانراو، مەبەست؛ **عەمل**: کەرەت، جۆر.

**پوختەی مانا:**

پاکی و پیرۆزی بۆ خودا. رۆشناکییەکی- وەکوو بەیانی بەڕاستی- هاویشتە دڵی دڵداران، کە تووشی جەزمە و لەرزین بوون. با من مانای ئەوین بێژم چۆنە و چییە؟ خۆم بەچاوی دڵ دیتوومە؛ تیشکدانەوەی جوانییە و دڵی دڵدار ئاوێنەیە و دەینوێنێ.

جوانی و ئەوین لە ڕەگەزدا هەر یەکێکن؛ دڵدار و دڵبەر بوتێکن. هەرتک ئاوێنەی یەکترن. بەڵام هەریەک بە بارێکدا. ئەوانەی بەڕاست خواناسن، چ ببنە دڵبەر یان دڵدار، ئاوێنەن لە بەرانبەری نووری خودا و بە دوو جێ، خۆی نیشان داون. دڵدار خوایە؛ دڵبەر خوایە؛ ڕەگەز خوایە؛ هەموو جوانێکی بێ وێنە، وێنەی خوامان نیشان دەدا؛ خوای تێدایە. خودا لە جوانی جواناندا، بۆتە دڵکێشیی و نازداریی. خاڵ و میلی دڵ تالانکەر، خەتی وردی دەستی نووسەری قودرەتە، لەو بالاوە خەت دراوە. بەرچاو خوایە؛ جوانی دیاریدەر هەر خوایە. خودا تیشکە لە لەشی بنیادەماندا.

ئەو پیتانە کە درۆشم و نیشانگەی جوانیی بێوێنەن و بوونە سەر و بۆر و نوختە و زەنە و ئیشارەتن بۆ دلکێشیی و لە ڕوخسار و بەژن و بالای نازداران دەخوێندرێنەوە، بە نووری خودا ڕەنگاون و چەند سەرمەشقن دادراون و لەسەر تەتەلە نووسراون و لە نەبووڕا هێندراون و هەریەک مانای تایبەتی بە خۆیان هەیە؛ تا ئێمە لەبەر سەرمەشق خوا بناسین.

ئەو شکلانەی تۆ لە سەر زەوی دەیبینی، هەر لە ئاسمان خەت دراون و عەسلەکەیان وا لەوێیە و سێبەریان داویەتە چاومان. ئێمە و هەموو ئافەریدە سێبەرێکین کە سایەدەرمان خودایە. دنیا ئەمدیوە و ئەودیوی، بەو هەموو ڕێکوپێکییەوە، ئاوێنەی ناوی خودایە. نووری خودا، لەو خێوەتە کەوەڕەنگەی- کە ئاسمانە- خۆی نیشانی زەوین داوە و زەمین وەکوو ئاوێنەیەک ئەیداتەوە. هەر هەندامێک و هەر گیانێک، پیتێکی بۆتە درۆشم و سەر بە ناوێکی خودایە و هەر پیتەی نیشاندەرێکی ئەندازەدار و پێوراوە، بۆ ناسینی داهێنەر و سازدەری ئەم دوو جیهانە. ئێمە بووینە بەڵگە بۆ بوونی وەستاکار. ئێمە ناوین؛ لە چاوگەیەک ساز دراوین. ڕاستت بوێ، خۆمان هەر نین، وێنە شاندەرین؛ ئاوێنەین. خوا لە ئاوێنەدا دیارە. نوورێکە لە تووری داوە. لەو نووره چیا سووتاوە و کلی چیا سۆمایی دەدا بە چاوان.

کردەوەی نهێنی خودا، جۆشێک دەدا؛ بە شوێن یەکدا تکە-تکە تنۆک دەڕژێ. خودا بە جوانیی بێ خەوشە. هەرجار لە بەرپیوارەوە خۆی دەردەخا. دنیایەک دەناو خۆ دەگرێ و هەزاران ڕەنگ، هەزاران جۆر جوانی دلکێش نەخش دەکا و خەتی ئەدا، بەژنوبالای ڕاست و ڕێک و لێوی شیرین و پڕخەندە، پێستی نازک و زێوین ڕەنگ،

کەزی ڕەشی بە ڕەنگی شەو، ڕوخساری وەکوو ڕۆژی ڕوون، بسکی لە میسک بۆنخۆشتر، پەنجە و ئەنگوستی دەناسک، خڕوخۆلی قۆڵوباسک، شەونمی گوڵان لە کوڵمە-کە وەک مێلاقەی بەهەشتن- بەتێکڕایی، دەسکەگوڵە و لە نووری ئەزەلی خواوە بە دیاری هات. ئەو نوورە ڕەنگان دەگۆڕێ و دەچێتە ناو لەشانەوە. تۆ دەبینی هەر لە جوانان، هێندێکیان شیرینئەسمەرن، هێندێک سەوزەن، کوڕن، کچن، پەریزادە و حۆری و لاوی ناو بەهەشتن، ڕوخسار هەیڤن، دڵکێشن وەکوو مشتەری. هاتوونە ناو شمەکەوە؛ ڕازاونەوە؛ زۆر بەبرەون. ئەوانە گشتی تروسکەی نووری خودان؛ ئەوینی ڕۆژی بناوان سازیداون. بۆ نیشانەی دەسکاری خۆی، خاڵ و خەتی عەنبەرینی لێ کێشاون. دڵانیان پێ تاڵان دەکات. خوا ویستوویە ئەو جوانییەی داویە بە جوانان، فێرکارێک بێ، بۆ چاوی دڵ، ڕووناکی خودا بدینێ. هەر ئەو ئەوینەی پێشینە، بلوێر و دفە و سازی تر وەدەنگ دێنێ؛ تا هەریەکەی ڕازێک لە دڵکێشیی و ڕندیی جوانیی خودا بدرکێنێ. ڕازی فەرمانی خوای گەورە، بە بێ زوان، هەر هەڵە بە جۆرێکی نوێ و هەر دەمە بەڕەنگێکی جوێ، دێتە بەرگوێی دڵ و گیانان؛ بێ ئەوە گوێمان پێ بزانێ، باسی جوانی هەرە پیرۆزی خوا دەکا.

ڕازی ئیرادەی خودایی، دەیەوێ دڵداری هەبن. وەک بەرەبەیان لە دنیا بڵاو دەبێ، تا چەند ڕۆژێکی لە دوا بێ، کە ئاسۆیان ڕووناک بکەن؛ تا ئەستێرەی جوان بدرەوشێن. هەزارانی وەکوو شبلی و سەعدی و شێخ فەرخ، بە ئەوینیەوە بسووتێن و باسی جوانییەکەی دەربڕن. تا دڵداران کتێبی ئەوین وەخوێنن و جوانی ئەزەلی بناسن. ناشێ جوانی و ئەوینی جوانی ئەزەلی، دەناو پەردەدا بمێنێ. هەموو جوانێک حەفتا دەرکیشی لێ داخەن، لە پەنجەرە و ڕۆچنانەوە دێتە دەرێ. بەڵام بە سات و وەختی خۆی. گوڵ بە بەهار لە زەوی غار دێتە دەرێ و خۆ نیشانی دنیا دەدا. هەرگا ئیشارەتی خودا بداتە دڵ، قەت بۆت ناکرێ هەمیشە لە ناو دڵتدا بیشێرییەوە. هەر ناچاری ڕاستی بڵێی؛ جا بەکام زمانی دەڵێی؟ چۆنت بۆ دێ؟ ئەوە بەستە بە دەمڕاستی خۆتە. قسە، لیباس و زەنبەرە؛ دڵبەر، مانایە و کاکڵە. زەنبەری باش، جوانی پتر وەدەر دەخا. ئەگینا نرخی جوانییەکە، بێ کەمایەسی و نوقسانە.

٤١ من ئەڤ میسال لەو بۆ تە بەست — زۆران ب زولفان دل ڤەبەست
هەرچی تە دی سوورەتپەرەست — دوررێ یەتیم بێ فەیدە دا

٤٢ پیس و خەراب و زشت و عار — ما ئەو ب خەملێ تێنەکار؟
ئێ د قەیدێ لەبسێ نەدیە یار — حوببێ ب خوە داڤێ نەدا

٤٣ چارێ هلین یارێ ببین — نە د پەردەیا تارێ ببین
سەد جاری ئەر کارێ ببین — گول وێ د نێڤا بوغچەدا

٤٤ ئەو بوو موورادا کردگار — لەو کر ئیرادە و ئیختیار
ڤی بوغچەیێ هەر لێ بوهار — گول گەش د باغێ غونچە دا

٤٥ بایێ ئەڤینێ کو لڤی — ئەو قشت و زولفێ سەرچەڤی
هەردەم هەزار دل داکەڤی — خال لەو دداممێ دانەدا

٤٦ بەحرا وجوودێ جۆش هات — نوورەک تەنەززول بوو ژ زات
هاتن تەعەیيون تێک سیفات — ئەشیا زوهوور عیلمییە دا

٤٧ ئەشیا د عیلمێ بوون زوهوور — ئیسمان ژ فەیزا ئیسمێ نوور
تەقویم بەستن بێقوسوور — حوکمێ سیفاتێ سەبعەدا

٤٨ ڤێ عالەمێ تەقویم بەست — هەر ئیسمەکی فیعلا خوە بەست
حوکمێ تەسەرروف دا ب دەست — هەر وی د مولک و قەبزەدا

٤٩ ئەعراز و عەین و جەوهەران — واحید ژ ئەسل و مەسدەران
تەئسیر بەخشێ مەزهەران — سەد رەنگ حەرف و سیغە دا

٥٠ فەیزا حرووفێن عالیات — بەحسا ستوورێن سافیلات
ئایات و وەسفێن موحکەمات — تەرتیب عوشر و سوورە دا

٥١ کاتب نڤیسین ئەو حرووف — هەر تالبێ پێ بوو وقووف
هاتن ژ دل سەد ئاه و ئووف — سەرخەت ل لەوحێ سادەدا

٥٢ ئەو دەستخەتێن کاتب سەمەد — واحید ل سەر لەوحا ئەحەد
نەقشەک رەشاندی بێ عەدەد — جەعدا جەمالێ شانە دا

۵۳ ئـەسما تـەکامول راسـت کـرن / بـالا فـەواعیل راسـت کـرن
جیهـ-جیهـ قـەوابیل راسـت کـرن / ژێ عیللەتـەک سـوورییە دا

۵۴ ئـەسما موقابیـل بوونـە زەوج / لێ جوملە ژێ بون فەوج-فـەوج
بـەحرا وجـودێ هاتـە مـەوج / مـەوجان د بـەحرێ لوججـەدا

۵۵ جۆشش کـو دا دەریایـێ جـوود / داینـە یـا ئیسـمێ وەدوود
جـارەک تەجـەللا بـوو وجـوود / فـوورەک ژ نـووری ژێ وەدا

۵۶ فـوورەک ژ نـووری وێ ڤـەکر / گـەنجا توهـووری پـێ ڤـەکر
کـەنزا خـوە قوفـل و مفتـە کـر / هێـز وێ د قوفـل و مفتـەدا

۵۷ حوسـنەک مونـەززەهـ سـەووراند / نـوورا حـەبیب ژێ ئافرانـد
عالـەم د کونهـێ حەیرانـد / رووحولقـودوس جـان نەفخـە دا

۵۸ عەرش و جیهات لێ بوو حـەیات / ئـەو شـاهیدێ قودسـی سیفات
ژ بوونـا یـەقینا نـووری زات / سـەیوان و شـەوق و هالـە دا

۵۹ حوسـنا ژ عیشـقێ سـەووری / غـارەت کـرن حـوور و پـەری
هـەرچی د کونهـێ فـەککری / ئـەو مـا د عیجـز و حـیرەدا

۶۰ ئەو سـوورەتێ میرئاتـێ حوسـن / ژێ بـوو زهـوور ئایاتـێ حوسـن
لـێ بـوو تەجـەللا زاتـێ حوسـن / ڤێ حوسـنێ ئـەو سـەرچەشمەدا

۶۱ سـەرچەشمەیا حوسـنێ ئـەوە / خورشـیدە، عالـەم پەرتـەوە
گـەر بـەدرە وەر ماهـێ نـەوە / وەر موشـتەری یـان زوهـرە دا

۶۲ ویلـدان و حـوور و گـەر پـەری / شـیرین و مـەحبووبێن بـەری
هـەمیان ژ حوسـنا خـاوەری / نـوورێ دەوان یـەک زەررە دا

۶۳ نـوورێ ژ نـوورا ئەحمـەدی / سـیررا سـیفاتێن سـەرمەدی
داینـەیا زاتـێن خـوە دی / کەشـفا کـەمالاتێ خـوە دا

۶۴ ئەو بوو قەلـەم، ئـەو بـوو عـەقل / لـەو پـێ حەدیسـێدا نـەقل
دەریایێ عـیلم ئـەو بـوو شـەقل / تەفسـیلێ عیلمـێ جوملـە دا

٦٥ ئـــەو بـــوو د جوملـــە رابیتـــە / میـــزان و ئیســـم و باســـیتە
فـەیزا حـەق ئـەو بـوو واسـیتە / چـــەشمیٚ وجـــودیٚ ســـورمە دا

٦٦ یەک بوو ئەلیف، یەک نوقتە کر / چەند شـکلیٚ دی لـیٚ زیٚـدە کـر
هــەردەم پەیاپــەی سـیفرە کـر / بـــالا ب بـــالا روتبـــە دا

٦٧ واحیـــد ژ نـــوورا وی دورِیٚ / پەیمانـــە و جامـــا ســـورِیٚ
مــەی ریٚهــتی ئـانی بــەرفریٚ / هــەم جـام و هــەم پەیمانــە دا

٦٨ غەیب و میسالن هەر دو سیلک / پەیوەسـتە ئـانین میمـیٚ میلـک
ئــەو کاتبــیٚ ئەلماســیٚ کیلـک / ژ ویٚ خامــەییٚ ئــەو رەشـحە دا

٦٩ نــوورا تەجــەللا هاتــە عــەرش / ئەسما هەمی لـیٚ بوونـە نـەقش
شەوقا دەوان چوو تـا ب فـەرش / ئیســـمان ب زاتـــیٚ ســـەجدە دا

**مانای وشەکان:**

**زشت**: ناحەز؛ **عار**: شوورەیی؛ **لەبس**: پۆشاک؛ **ئـەرکاری**: ئەگەر دەتوانی؛ **تەعـەییون**: دیاری کردن؛ **تـەقویم**: ڕاست کـردن؛ **سیفاتی سـەبعە**: حـەوت سـیفەتان، مەبەسـت حەوت سیفەتی ئەزەلی خودایە کـە بریـەتین لـە: «هـەبوون»، «زانـین»، «توانـایی»، «ویستن»، «گوتن»، «دیتن»، «بیستن»؛ **ئەعراز**: عەرەزان؛ **عەرەز**: شـتێکە بنـەڕەتی نەبێ و بەسەر بنەڕەتێکدا هاتبێ؛ بێت و لەبەینیش بچێت. ئەگەر تایبەتی بە ڕەگەزێک بێ، وەک پێکەنین، یا نووسین، کە تایبەتی مرۆیە، عەرەزی تایبەتی (خاس)ە. ئەگـەر وەک جوولانە -کە هەموو زیندووی تێدا هاوبەشن- عـەرەزی گشـتی (عـام)ی نـاوە؛ **قەبزە**: لە ناو دەست گرتن؛ **باست**: بلاوکەرەوە، ڕاخەر؛ **سافیل**: نزم؛ **عوشـر**: دەیـەک؛ **عەشەرە**: دە ئایەتی قورئان؛ **وقووف**: ئاگا؛ **جەعد**: مووی لـوول؛ **فـەواعیل**: کارکـەران؛ **ئافراندن**:دروست کردن؛ **کونه**: بوونی شت وەک هەیە؛ **سـەرمەد**: بێ بڕانەوە؛ **شـەقل**: درۆشم؛ **سیلک**: هەودا؛ **میلک**: خاوەنیی؛ **عەرش**: تەختی لەسـەر دانیشـتن؛ **فـەرش**: ڕایەخ، مەبەست زەمینە؛ **نەفخە**: فوو.

**پوختەی مانا:**

بۆیەم نموونە هێناوە، چۆنکە زۆر کەس دڵیان دەکەزییان هاڵقاوە. هەر کەسـت دیـت ڕواڵەتیی دەپەرستێ، گەوهەری بە خەسار داوە. شت جوان نەبێ، کەی بە خەملانـدن جوان دەبێ؟ پیاو نابێ بڕوانێتە ڕوو، تا دڵ بدا. دەبێ لە گیان ببییە دڵـدار؛ چـاوت لـە ڕواڵەتیی نەبێ؛ گیانە بۆ دڵداریی دەبێ. لەش تاریکییە لە دەوری گیـان. لـەش وەک وارشی باغچەیە. گیان گوڵە لـەو دیـو وارشـدا. خـودا گیـانی پـاکی ئێمـەی، وەکـوو باغچەیەک ساز داوە؛ پڕە لە غونچە و گوڵی جوان و هـەرگیز پـاییزی بـۆ نایـە. خـودا جوانیی ڕواڵەتیی سازدا؛ پەرچووکە و کەزی سەرخواری بە دەم باوە، وە جووڵە خست؛ خاڵی لە ڕوو جێ کردەوە؛ تا ببنە دانە و بۆ گیان و دڵدار لە ئەوینی ئەوان گیرۆدە بێ و لەوێوە بە ئەوینی گیان گرفتار بێ.

خودا ویستی عالەم سازدا. تیشکەی نووری خۆی بەڕێ کرد؛ تا کـار هـەمووی بـە تەکووزی و ڕێکی، پێک بێن. کرداری خۆی لەسەر ئافەریدان بـەش کـرد. هـەموو شتێک هاتـە زانـین و دیـاری دا. نـاوانی خـوا و حـەوت ڕەوشـتە نوورانییەکـەی، بێ کەمایەسی هاتنە ڕوو. هەر ناوێکی چی هەڵدەگرت، ئەوەی دایە و جۆرێک کاری شیاوی واتای ناوەکەی لێ کردە ئەرک. ماک و ڕەگـەز و داهێنـراو، لـە بنچینـەدا دەبنە یەک. بەڵام بۆ ئێمە- بـە ڕواڵـەت- لێکتـر جیـان. پیـتی ناوەکـانی خـودا، هەریەکەی بۆ دەستەوجوونێک وەکار کەوتن. بلندیان بەرزەوە کرد و ئەوی شیاوی نەویایەتین، نزمیان کردن. هەر ئاگادار و دڵڕوونێک کە لەو پیتانە بزانـێ، دەزانـێ هەرچی ڕوو دەدا بوون و نەبوون، لە دەستەڵات کەسدا نییە؛ جگە لە خـوا. ئەوسـا دڵـی هـاوار دەکـا و دەناڵـێنێ؛ کـە دەزانـێ خـۆی بـۆی نـاکرێ خۆشـبەختی و قەرەبەختی خۆی بخاتە ڕوو. خوای بێنیاز و بێشەریک، لەسەر تەتەڵەی ئەزەلی، زۆری نەقش و نیگار چێ کرد.

کاکۆڵی لوولی شانە کرد؛ هەموو مایەی تەواو بوون و کاری بوونی بـۆ ڕێـک هێنـا. بـە ڕواڵەکردنی بە هۆ، بۆ دیاری دانی دەسکاری، نیشاندەری ناوەکانی بە کۆمەڵ بەرانبـەر کردن. فەرمانی بە دەریای بوون دا، شەپۆل بدات و سەرڕێژکات. لە ئاوێنە ئەو نـاوەی خوا -کە «وەدوود»ە و واتای زۆر پـڕ لـە ئەوینـە- تروسـکەیەک تیشـکی وەدا. ئـەو

تیشکە بوو بە کلیلی قفڵی گەنجینەی نهێنی و بوو بە مایەی ناساندنی نووری خودا، لە سەر زەوین و ئاسمانان. لەوتیشکە پێغەمبەری خوا: «موحەممەد»(د) هاتە بەرهەم. جبرایل گیانی وێ هێنا و خستییە ئەو قاپێلکە پاکە. ئەو نوورە تاک و تاقانە، کرایە ئامیانی ژیانی گش ئافەریدەکانی دیکە. جوانییەکەی ئەو- کە لە ئەوین ساز درابوو- دڵی حۆری و پەریزادانی تالان کرد. ئەگەر ڕۆژە، ئەگەر مانگە، ئەگەر زوهرە و موشتەرییە، ئەگەر جوانیی لاوەکان و کیژی وەک حۆری و پەرییە، گشتی تۆزقاڵێک لە جوانیی، نووری ماکی پێغەمبەری خودای تاکە. هەوەڵین قەڵەم هەر ئەو بوو. هەوەڵین عەقڵ درا بەو. بۆ دەریای زانست درۆشمە. ئەو نێوانە بۆ ئافەریدەکان و خوا و لە قیامەت تکاکاریانە. چاوی هەبوون بەو دەڕێژرێ و بەهۆی ئەو لە ئاکاری خوا شارەزا بوین؛ کە پێشوو کۆی دروست کردووین. خودا خۆی نوختەی ناوەندە. نوختە دەکرێتن بە ئەلیف. ئەلیف سیفری لێ زیاد کران. ژمارە هەر بەرەژوور چوو. ئەلیف بە زۆر شکڵ و بیچمان چەرخ درا؛ ناو و پیتی لێ چێ کران. ئەلیف نیشانەی یەکیەتی خوای نیشان دا و بوو بە نیشانەی یەکەمین نووری پرشنگدەری خودا؛ کە موحەممەدی نازدارە. سەبارەت بەو، پیاڵەی بادەی خواناسینی پێ فڕ کردین. میمی ناوی موحەممەدی نیشانەی پادشایەتییەتی لە سەر عالەم. لە پاش ناوی موحەممەدێ ناوی تریش سەریان هەڵدا و لە دەورەی ناوی نەخش بوون. ناو و خاوەن ناوەکانی زەوی و ئاسمان سوژدەیان برد.

| | | |
|---|---|---|
| ٧٠ | کاتب قەلەم دیسا گەراند | ئیسمەک ژ ئیسمان سەووراند |
| | کورسی ژ نووریٚ ئافراند | جەنناتیٚ خولد و سیدرەدا |
| ٧١ | سەرچەشمەیا نوورا سەخیٚ | بەحرا جەمەد دابوو رەخیٚ |
| | فەیزی ژ بەردا بەرزەخیٚ | داگرت و گەهگەهـ فوورە دا |
| ٧٢ | ئەو بەرزەخا رەنگ ئایینە | هەنگی کو ئەشیا داینە |
| | وان تیٚ شەمال ئیسایینە | ژیٚ سوورەتەک عەکسییە دا |
| ٧٣ | وەسف و کەمالا تیٚن سبووح | حەرفیٚن کیتابا عەقل و ڕووح |
| | ئیسمەک دقیٚ لیٚ بن وزووح | لەو لەوح و کلک و خامەدا |

**٧٤** ئەو نوسخەیا عالی ئیسم — لەو حەک دقێ ژێرا جیسم
دا حەرف لێ بن مورتەسیم — حەرفان شکل نوورییە دا

**٧٥** نوقتێ کو مەعنایەک دقێ — تەرکیبێ ئیملایەک دقێ
سوورەت هەیوولایەک دقێ — رووحان د نەفسێ جوسسەدا

**٧٦** ما تێنە دیتن حوسن و سوڕ — بێ بەژن و بالایێن ژ دوڕ
کاتب ژ ڤان حەرفێن د پوڕ — نوونەک خەیالێ بەسمە دا

**٧٧** دوردانەیێن خاوەر میسال — ئایینەیێن تێدا شەمال
نوورەک مونەززە ئەو جەمال — مەی‌کر د نێڤا شیشەدا

**٧٨** رووحانیێن قودسی میسال — دێ بێن لیباسێ خەت‌وخال
ساقی مەیا گولگوون و ئال — تینت د فینجانا مە دا

**٧٩** مەی کو د جامێ بێتە نووش — بێ‌دەنگ و سەوت هەر تێتە گووش
ژێ تێتە دل هەردەم سورووش — لەو ئەڤ شەراب ئالوودە دا

**٨٠** ئەڤ رەنگ تەجەللا کر سوبووح — ساقی ژ شەهکاسا فوتووح
مەی رێهتە جاما عەقل و ڕووح — رۆژ بوو د قەوسێ قوببەدا

**٨١** رۆژ بوو د نێڤا نەینکێ — کاتب ژ حەرفێ عەینکێ
نێڤ گوشەیا قەوسەینکێ — توغرا ب ئیسمەک تازە دا

**٨٢** تەی‌کر د نێڤ توغرایە ئیسم — تەکسیر کر حەرفێن تەلیسم
حوسنا موقەددەس بوو دو قیسم — حوکمێ تەجەللایێ وە دا

**٨٣** یەک عەقل و ڕووحێ ئەعزەمە — میسباح و نوورا عالەمە
حەوواء و نەقشێ ئادەمە — بێ موددە و بێ ماددە دا

**٨٤** ئێ دی کو نەفسا کوللییە — حوسنەک موقەددەس عالییە
ئەو ژی ب ڕووحرا ئەسلییە — وان هەردو هەڤرا سایە دا

**٨٥** ئایینەیێ زاتێ یەکن — لەو دلبەر و لاتێ یەکن
ڤیکرا د میرئاتێ یەکن — هەم تازە- تازە عیشوە دا

| | | |
|---|---|---|
| ٨٦ | ئەو تێن ب جەمعێ فـەرع و ئەسـل | مائیـل دبـن ڤـێکرا ب وەسـل |
| | نالن ژ یەک ئەو فەرق و فەسـل | حوکمـێ ویسـالێ پـێ وەدا |
| ٨٧ | ڤێکرا کو بوونـە وەسـل و جـەمع | بـارین ژ مابـەینێ دو لـەمع |
| | ئیسـا ژ ئـەرواحان دو شـەمع | شـەمعا نوفووسـان شـوعله دا |
| ٨٨ | ئیسـا ژ ئـەرواحان قەبـەس | پوڕ شوعله تێن نوورین قەفـەس |
| | نەفسـان ب عیشـێ دا نەفـەس | قـەلبان ب حوببـێ لەهجـە دا |
| ٨٩ | ئەو لاتێ حوسـن و عـەینێ نـوور | سوورەت ب سوورەت تێن زوهـوور |
| | ئینس و پـەری ویلـدان و حـوور | جـی-جـی دوانـدا جیلـوە دا |
| ٩٠ | هەریـەک ژ فـەیزا ئیسـمەکی | تـێن سـوورەتا تەلیسـمەکی |
| | لـەو مـەعنییا هـەر جیسـمەکی | پەڕتـەو ژ نـوورێ لـێ ڤـەدا |

**مانای وشەکان:**

**خولد**: تاهەتایی، بەهەشت؛ **جەمەد**: سـەهۆڵ؛ **بـەرزەخ**: لەمپـەر، بـەرزەک؛ **وزووح**: ئاشکرا؛ **مورتەسیم**: کێشراو بە قەڵـەم؛ **هـەیوولا**: وشـەیەکی یۆنانییـە، واتـا: ئامیـانی هەموو گیاندران کە هێشتا نەهاتوونەتە سـەر شـکڵ و فەرحانیگـەل؛ **نـەینک**: ئاوێنـە؛ **تەی**: پێچانەوە؛ **تەکسیر**: شـکاندنەوە؛ **ئـەعزەم**: گـەورەترین؛ **نـەفس**: ئـەو گیانـەی سەروکاری دەگەڵ لەشی زیندوو هەیە و بەردەستی گیانی گەورە و بنەڕەتییە؛ **نەفسی کـول**: لە زاراوەی سوفیاندا گیانی هەموو عالەمە و نوێنەری عەقلی یەکەمە کە هـەموو وەدی هاتوو لەو پێکهاتوون؛ پێشی دەڵێن «نەفسی ڕەحمانی»؛ **لەهجـە**: قسـەکردن و زمان گرتن.

**پوختەی مانا:**

نووسەر قەڵەمەکەی گەڕاند؛ ناوێکی تری وەبەر هات. کورسی لە نوور وەدی هێنا. بەهەشت و داری نەبگی کرد؛ دەریای سەهۆڵ لە نێوان بوو. سەرچاوەی نوور، لـەو لەمپەرە سەرڕێژی کرد. بە فیچقە هات. بوو بـە مۆمێـک پرشـنگی لـە ئاوێنـە دا. دەبوایە تەتەڵێک هەبێ، ڕەوشت و ناوی بـەرزی خـوای لـێ بنووسـرێ؛ تەتەڵـە و

قەڵەم دروست بوون. بڕیار درا هەر گیانێک دەچێتە هەر لەشێک، سیایی لەو شوێنە بنووسرێ.

جوانیی و دڵکێشی خودایی، خرایە ناو لەشی جوانان. تیشکی خۆرئاسایی جوانی، لە گیانەوە دایە لەشان. جوانیی دیار و ڕواڵەتی- وەکوو بادە- دڵدارانی گیانی پاکی پێ سەرخۆش بوون. عەقڵ و ڕۆح گەلەلا کەوتن. هەر ئەو جوانییەی خودایی، خۆی بەشکرد بە دوو بەشەوە: بە ناوی ئادەم و حەووا هاتە دنیا. حەووا و ئادەمیش- بە ڕەگەز- هەر یەکێکن؛ هەردووک سێبەری نووری خوان. هەردووک ئاوێنەن بۆ یەکدی. لک و قەوارەی یەکترین؛ بۆیە بەرەو یەکتر دەچن و تێکەڵ دەبن. دوو گیان وەک دوو شەم ئایسان. گڕیان گەیاندە دەوروبەر. بەر و بەهرەیان زیادی کرد. هەموو زیندووی بەرەی ئادەم، بە ئەوین هەناسە دەدەن. هەموو دڵێک، بە ئەوینێ گەشە دەکا. هەر زیندووێک، بەرانبەر بە ناوێکی خوا، لە سەر ئەم دنیایە دەژی و خوا بڕیاری خۆی بۆ داوە کە چۆن بژی.

**٩١**
دێ سیررێ تەولیدێ ببێم — نە ب وەهم و تەقلیدێ ببێم
مەعنی ژ تەوحیدێ ببێم — دل ڤێ ئەدایێ شەهدە دا

**٩٢**
مەعشووق و عاشق هەردو لات — مەجزووبێ دێ یەک بن سیفات
حینا کوو بوو یەک ئیلتفات — بەعزەک سیفاتان حیسسە دا

**٩٣**
های و هویا سوببووحییان — رەقس و سەمایا قودسییان
تەشبیهێ جەوقا سووفییان — فەریاد و زیکر و لەرزە دا

**٩٤**
وەستانە شاخیس سەف-سەفن — باتین د عەینێدا خەفن
تەشبیهێ بەرقا خاتیفن — لامیع دچەرخێ تیسعەدا

**٩٥**
ب ساز و جاما بادەیێ — یار تێتە نیڤا حەلقەیێ
مەدهووش و مەستێ وێ مەیێ — شاش و کولاه ئاشوفتەدا

**٩٦**
رەمزا د جاما شەربەتێ — خەف تێتە نیڤا سوحبەتێ
هەرچی کوو فینجانێ دەتێ — وێ جان ب نەزر و سەدقە دا

| | | |
|---|---|---|
| ٩٧ | شـەمعا ویسـالێ هـەر گەشـە | شـەوقا شـەمالێ ئاتەشـە |
| | خـەمرا پـەیالێ بێغەشـە | ساقی عەجەبڕەنگ بادە دا |
| ٩٨ | ساقی عەجەبڕەنگ بادە ڕێت | عاشق ژ مەعشووق ئەو دڤێت |
| | فینجـان ب فینجـان داومێت | کامـا دلـێ بیچـارە دا |
| ٩٩ | ئەشیا ل پەی هەڤ وەللدین | یەک-یەک ژ وەسلێ بەددین |
| | هەم مەسدەرین هەم مەوردین | ڤێ قولزومێ ئەڤ رەشحە دا |
| ١٠٠ | ئەو رەشحە دا وێ قولزومێ | مەی هاتە تاسا عالەمێ |
| | جاما جیهانبین دا جەمێ | بە سکەندەری ئایینە دا |
| ١٠١ | عەکسا ژ حوسنا مەیفرۆش | ئاڤێتە فینجانێن ب پۆش |
| | ناگەهـ د جامان هاتە جۆش | فووری د نیڤا کووزەدا |
| ١٠٢ | ساقی ژ دەنگێ بولبولە | ئاڤێتە چەرخێ غولغولە |
| | ڕووحان ل دۆرێ سیلسیلە | گۆڤەند و ڕەقس و حەلقە دا |
| ١٠٣ | مەحبووب خوە نیشاندا سەفێ | جارەک د جاما قەرقەفێ |
| | هاتی ب ئاوازێ دەفێ | تەنبوور و چەنگێ نەغمە دا |
| ١٠٤ | عەینی تەبیعەت جیسمێکول | بشکفت د وێ باغی دو گول |
| | عیشقێ گەراندی جامێ مول | حوسنێ دواندا پەنجەدا |
| ١٠٥ | بەرزەخ ب بەرزەخ بوونە ڕاست | نینن دنێڤدا کێم و کاست |
| | مەنزل ب مەنزل هلگوهاست | حەتتاکوو دوڕ چوو حوققەدا |
| ١٠٦ | ئاڤێتە دوڕدانا خوە دوڕ | ئیساند ژ میسباحا خوە سوڕ |
| | دوولابێ نەجمێ نەحس و کوڕ | میهرا ستێرا سەعدە دا |
| ١٠٧ | چەوگانێ بایێ لامەکان | فولکا فەلەک قائیم سوکان |
| | تەشبیهێ گۆی دا بەر شەکان | هەر بێ سکوون و سوکنە دا |
| ١٠٨ | ئەو کامیلێ بێعەیب و نەقس | چەرخێن ب هەریەک نەوع و شەخس |
| | وی یەک ب یەک ئانینە رەقس | تێ سەبعەیێ سەیارەدا |

**١٠٩** هەر نەھ ب ڤێ جەهد و لەزێ ... چەرخن ل دۆرا مەرکەزێ
بەحرا دو عالم لێ کەزێ ... تێ ئەڤ حوباب سەرگەشتەدا

**١١٠** بەحرا دو عالەم لێ زەبەد ... مەوج و حوبابن هن جەمەد
پەیوەستە تێتن جەزر و مەد ... سەیوان ل سەحرایێ ڤەدا

**١١١** ئەو خێڤەتا کەوکەب میسال ... گەھ بەدرە تێتن گەھ هیلال
سێ دە دوازدە ماھ و سال ... چەرخن د سەیرا تیسعەدا

**١١٢** من دل ژ فەهمێ قاسیرە ... ژ وێ سوورەتێ چار باگرە
پێ کر تەمام ئەو دائیرە ... نەقشەک ژ وێ تەروەندەدا

**١١٣** یەک ژێ ژ تەقویما قەدیم ... لێ بوو نەسەق حوکمێ حەکیم
ئاڤێتە وێ لەوحێ رەقیم ... تێک عالەمێ پێ شوعلە دا

**١١٤** هنگی کو خەت و نوقتەنە ... ئەوزاع و ئەشکال تێ هەنە
هەریەک ب میقدارێ خوەنە ... ئەسلا تەسەوور رێ نەدا

**١١٥** میقدار و شکلێ هەندەسی ... کێم زێدەیەک پێ ناحەسی
تەسویر دکر ئوقلیدوسی ... حەتتا ب سەتحێ سوفلەدا

**١١٦** مەر سەف د ناڤ ڤان مەشعەلان ... قەتعا مەسافا مەرحەلان
سیررا بورووج و مەنزلان ... رەسما سولووکێ جادەدا

**١١٧** ئەو یەکب یەک خالی نهن ... بێ حیکمەتەک عالی نهن
گەر ڤان سوڕەک حالی نهن ... ئەو ڕەقس چرا مەستانە دا

**١١٨** مەستانە گۆڤەندێ دکن ... ڕەقسێ ل دۆر فەندێ دکن
قەستا شەکەرخەندێ دکن ... لەعلان ژ گەوهەر خەندە دا

**مانای وشەکان:**

**تەولید**: بەرهەم هێنان؛ **تەقلید**: لاسا؛ **شەهدە**: شایەتی؛ **تیلتفات**: ئاوڕوێدان؛ **دی‌یەک**: یەکتری؛ **حیسسە**: بەش؛ **شاخیس**: دیار؛ **خاتیف**: رفێن؛ **تیسعە**: نۆ؛ **زار**: ساز؛ **شاش**: شاشک، مێزەر؛ **ئاشوفتە**: شێواو؛ **ریت**: ڕژاندی؛ **میت**: مژتی؛ **کام**: کاو، مراد؛ **وەللدین**:

زان؛ **بەددین**: لەبەین چوون؛ **مەسدەر**: شوێنبردە؛ **مەورد**: جێهاوردە؛ **رەشحە**: شـە، تەڕایی؛ **پیـووش**: بەسـەرپۆش؛ **بولبولـە**: لوولـەی لوولێنـە؛ **مـول**: بـادە؛ **هەلگواسـت**: ڕایگوێزا، هەڵیبوارد؛ **دوولاب**: چەرخ؛ **کـر**: مـات و خوسـت؛ **فولـک**: گەمیـە؛ **شـەک**: شـەقی گـوێین؛ **سـەبعە**: حـەوت؛ **سـەییارە**: گـەڕۆک؛ **سـەبعەی سـەییارە**: حـەوت ئەستێرەی بەگەڕی نەچەق؛ **کەزی**: قـەوزە؛ **زەبـەد**: کـەف؛ **تەروەنـد**: تـازە داهـاتوو؛ **رەقیم**: نووسـراو؛ **مەرسـەف**: شـەقام؛ **ئوقلیـدوس**: فەیلەسـووفی ریـازیزانی یۆنـانی (دەوری ٣٠٠ ساڵ بەر لە میلاد) لە ئەندازیاری ڕووکار و نوورپێواندا بەناوبانگە.

**پوختەی مانا:**

ڕازی بەرهەم ئەدرکێنم. من بە ئاشکرا دەیزانم؛ نەک بڵێم خەڵک وا دەڵێن.
یار و دڵدار بتی یەکن؛ لە ئاکاری خودا پێـی داوان، هاوبەشـن. بـەو هۆیـەوە دەگەنـە یەک. بەو پێکگەینە، فرشتەکانی ئاسمانی، پیرۆزبایی و شاباش و هەر بـژی دەڵـێن. وەک کۆڕی بەزمی سۆفیانە، دێن و دەچن و جێژنەیانە. ساز و بادەش- کە وەرگێـڕی زمانی گیانی پاکانن- دێنە گۆڕی. کۆڕی بەزم گەرم دادێ. سۆفی مێزەر و کڵاوی بڵاو دەبێ. هەرکەس لەو بادە بنۆشێ، گیانیشی لە ڕێ دەبەخشێ. مـەی پێـک گەیشـتن بێخەوشە؛ شۆقەکەی هەمیشە گەشە. دڵبەر بادەی دڵ تاڵانکردن دەگێڕێ. دڵدار لەو مەیە هەڵدەمژێ و بە کاو دەگا. گش ئافەریدە بەو جۆرە لە پێگگەین ڕوو لە زیادین و تۆرەمە بڵاو دەبنەوە. عالەم لەم چۆرە-چۆرەوە، وەکوو دەریـای لـێ هـاتووە و هـەزار جەمی بە جامەوە و سەتانیش وەک ئەسکەندەرێ ئاوێنە لە دەستی دیوە.
تیشکی ڕوخساری مەیفرۆش، بە نهێنی دایە پیالە؛ پیالە دڵی وەجۆش کـەوت. مـەی ناو کووپەشی گرتەوە؛ ئـەویش بـە فیچقـە دەرکـەوت. گیانـان کەوتنـە هەڵـپەڕکێ و گۆوەند و سەما. یار- کە خوایە- جارێک لە جامی بادەدا، خۆی نیشانی خەڵکی دەدا و جارێک لە ناو دەنگی بلوێر خۆی دەردەخا. بە دیار کەوتنی نووری ئەو، سرشـت- کـە گشتایی لەشە- گەشەوە بوو. دوو گوڵ لە باغیدا پشـکووت. ئـەوین مـەی لـە کـۆڕێ گەڕاند. جوانیی خستە ژێر دەستی خۆی. لەمپەر لە نێوانـدا نـەمان. هـەموو کـارێکی ڕاست هێنا. پلە-پلە هەر پێدا هـات. هـەتا دوڕ کەوتـە نـاو دوڕدان. چـرای دڵکێشـی خودایی تیشکی دایە. ئەستێرەی ودمی بۆ هەڵات؛ شوومی خـۆی نـەگرت و هـەڵات.

بای ڕەحمەتی خودای مەزن، گەمیەی زەمانە دەگێڕێ و ناهێڵێ لە کار بکەوێ و ئەو گەمیە توند و پتەوەی، وە بەر کاشۆی قودرەت داوە و لە چەشنی گۆ لە مەیداندا، ئەیسووڕێنێ. هەموو کەس و هەموو شت و حەوت ئەستێرە گەڕیدەی ئاسمانیش پێرا، لەو مەیدانەدا خول دەدەن.

هەر نۆ ئاسمان وا بە کۆشش و بە پەلە، لە دەوری ناوەند خولیانە. نوختەی ناوەند دەریایەکە، هەردووک دنیا وەکوو قەوزەی قەراخی وان. (یان: هەر دوو دنیا وەکوو کەف لە سەر ئەو دەریایە دیارن.) لەو قەوزەدا (یان: لەو کەفە) شەپۆل هەیە، بڵقی سەر ئاو دێتە بەرچاو. هەیە دەریای سەهۆڵ بەستە، دەریای بە هەڵکش‌وداکش، چەتر لە سەر سارا دەگرن. ئەو خێوەتە پان و بەرینە ببینە! جارێک مانگی یەکشەوەمان نیشان دەدا، جارێک مانگی چاردە شەوە. سی‌ڕۆژەی مانگ، دوازدە مانگەی هەموو سالان، ئەو نۆ ئاسمانە لە گەڕ دان؛ دڵم بۆی ناکرێ تێبگا هەر چوار لای گرێ پووچکەیە. هەموو دەمان، ئەو جەغزە، بەو سووڕانەیان تەواو دەبێ و هەر دەمێکیش نۆبەرێکی تازە دەدەن.

یەکیش لە کاری سەرسوڕێن- کە قودرەت بەرهەمی هێنا- ئەو ڕاست‌وپاستە کردنەی پێشینەیە- کە لە سەر تەتەڵەی نووسی و دنیای پێ ڕۆشن کردەوە- ئەو هەموو خەت و نوختانەی لە زەوین و ئاسمانێ بە هەموو جۆر شکڵ و بیچم دێنە بەرچاو، هەمووی دە ئەندازەیەکدان کە هەندەسەی ئەندازیاری هەرە ماهیر بۆی داناون؛ زیادو کەمی تێدا نییە. تۆ بڕوانە لەو نەخشە ئوقلیدوسییانە، لەمەڕ ئاسمان و عەرزەوە و تەنانەت لە خوارووتریش دێنە بەرچاو، پیاو چۆن سەری سووڕ نامێنێ؟ نێوان ئەستێرە و ئەستێرە، وەکوو جادەی خۆشکراون. ڕازی بورجان -کە مەنزڵ بە مەنزڵ دیارن و بوونە شەقامی هەمیشە بۆ گەشتی خۆر- ئەو هەموو شتە سەیرانە بەتاڵ و بێ کاکڵ نابن؛ سووڕێکی بەرزی خودایان تێدا هەیە. ئەگەر ئەو عەرز و ئاسمانە، شتێکیان لێ حاڵی نەبووە، ئەدی بۆچی مەستانە کەوتوونە سەما؟! ئەوانە چەند پەپوولێکن بە دەوری نووری خوداوە و دەیانەوێ بە یار بگەن؛ بزەیەکی بەزەیی ئەویان پێ بگات.

| | | |
|---|---|---|
| ۱۱۹ | تێن بایێ چەرخ و لەولەبان | تەدویر و سەیرا کەوکەبان |
| | شەعشەعنییا ڕۆژ و شەبان | دوولابێ هەر تێ ژێ سەدا |

۱۲۰ سوورەت ب سوورەت لێ کشاند — لەوحێ هەیوولا نەقشاند
زێراف ژ نووری لێ ڕەشاند — تەقویم و شکل و خانەدا

۱۲۱ کاتب د چەرخێ جەدوەلێ — خوەش نەقشەک ئاڤێتێ وەلێ
کرحاشییا هەفت هەیکەلێ — نیف کوللیاتێ خەمسەدا

۱۲۲ دانین د پەرگاران ئەسل — بەستن موقابیلدا فەسل
ڤێکرا دەوائیر بوون وەسل — بەرزەخ ب بەرزەخ خەسفە دا

۱۲۳ چار عونسورن چار تەبعەتن — ڤێکرا ب میزان ڤێک کەتن
هەڤرا موخالیف سیرەتن — دەر سوورەتێ شەخسییەدا

۱۲۴ حەتتا ب میزان چار ئەسل — بهەڤرا نەبن جەمع و وەسل
جیسمان ژ هەڤ نابن فەسل — بازوو ژ بازوو شەق نەدا

۱۲۵ چار ئوممەهاتن سێ بەنات — هەر بێقەرارن بێتەبات
پوڕ عیشق و مەیلن ئیلتفات — ڤێ تازە دەیرێ کوهنەدا

۱۲۶ هن سوفلەوی بازی دکن — هن مەیلێ ئەڤرازی دکن
خوەش ڕەقسێ شەهبازی دکن — سەرگەشتەنە د حالێ خوەدا

۱۲۷ هەر هەیئەت و هەر جیسمەکی — هەر فەرد و نەوع و قیسمەکی
ڕووح وێ د دەستێ ئیسمەکی — مایی د قەبزە و پەنجەدا

۱۲۸ کوللاب ب دەستێ واهیبە — یان راکیدە یان جازیبە
یان خافیزە یان ناسیبە — یان ڕەفعەیە یان جەزمەدا

۱۲۹ ئەو جەزمە دایی مەرکەزان — ئی دل ژ بەر شەوق و لەزان
حیکمەت ب قانونێ بزان — ئەهلێ دل ئەو ژێ گوفتەدا

۱۳۰ ڕەمزێن نجوم و هەیئەتێ — عەقلێ موجەررەد نارەتێ
بێ نووری عیلمێ وەحدەتێ — ئەو ما دشەکک و شوبهەدا

۱۳۱ فەیبازێ عیلمێ من لەدون — پەی-پەی ژ بەحرا کان و کون
گەهگەهـ ب ئوستادێ سوخون — وی گەوهەرەک ناسوفتە دا

| | | |
|---|---|---|
| ١٣٢ | فـــەیزا عولوومـــێ فەلســـەفە | پـور کفشـه لـێ سـتر و خەفـە |
| | مـن دی د جامـەک قەرقەفـە | فینجان ب جـان مـن جورعـە دا |
| ١٣٣ | هەر نـەهـ فەلـەک لـێ کاخـەکن | دوور و دراز وەک ئاخـــــەکن |
| | تـــێدارن ئـــەو ژی شـــاخەکن | ڤـێ تـەرحێ ئینسـان مێـوە دا |
| ١٣٤ | ئینسـان بـەرە عالـەم درەخـت | سولتان ژ خەلوەت هاتە تـەخت |
| | پـێ زەیینـین ئیقبـال و بـەخت | دەولـــەت ژ بـــالا تالـــە دا |
| ١٣٥ | ســولتان ژ بـــالا هاتـــە خـــوار | لاهـــووت ب ناســـووتێ ڤەشـــار |
| | پەیوەســـتە بـــوو نوقتـــا مـــەدار | دەورا عرووجـــــێ گـــــەڕ وەدا |
| ١٣٦ | دەوران گەهانـــدن هەرتـــەرەف | عاشق گەڕاندن سەف ب سـەف |
| | مەحبووب ب فینجانا سـەدەف | دوڕدانـــــەیا ســـــەییالە دا |
| ١٣٧ | سـاقی کـو دامـن ئـەو سـولاف | فـەیزا مـەیا گولگـوون و سـاف |
| | زائیـل کـرن شـوبهە و خـیلاف | عیلمـــەک ژ بـــەژنێ ڕوقعـــەدا |
| ١٣٨ | عیلمەک نومـا دل پـێ نومـووج | قەلبێ ب عیشقێ کـت عـورووج |
| | دێ تەی بکت چەرخ و بـورووج | شـــەهپەر ل دارا ســـیدرەدا |
| ١٣٩ | دۆلاب و چـەرخێ نـەهـ فەلـەک | پیش‌دەستێ کورسی بوون هەلـەک |
| | سەرگەشتە هـاتن ئـەو گەلـەک | دوێ نوقتـــەیا مەوهوومـــەدا |
| ١٤٠ | ئەحسەن ژ ڤـێ نـەزمێ لـەتیف | چەندی سەبوک هـاتی خـەفیف |
| | مەحبووب ب دەستێ خۆی شەریف | نەقـدێ مـە مـوهر و سـککە دا |
| ١٤١ | ئەحســەن ژ ڤـێ وەسـفێ رەفیـع | ئەشـــکال و ئـــەوزاعێن بـــەدیع |
| | تێــتن ژ نـــووری وەک رەقیـــع | بێعـەیب و نـەقس و ڕەخنـە دا |
| ١٤٢ | ئەحسەن ژ ڤـێ وەزعـێ «مـەلا» | ئەشکال و ئەوسافێن حەلا (جەلا) |
| | لـــەو دل ب وان بـــوو موبتـــەلا | جەزبـــە و جەلالـــە د ســـینەدا |

**مانای وشەکان:**

**تەدویر**: گرۆڤەری؛ **شەعشەعنی، شەعشەعان**: تیشکە و تریفە و ڕۆشـنی؛ **هـەفت**

**هەیکەل**: حەوت ئاسمان؛ **کوللیاتی خەمسە**: پێنج گشتییەکان کە بریەتین لە: جسن و جۆر و بەند و عەرەزی تایبەتی و گشتی «جنس و نَوع و فَصل و عَرَض خاس، عرض عام»؛ **خەسف**: ڕۆچوون؛ **خەسف**: گیران، کە بۆ مانگی دەڵێن؛ **ئوممەهات**: دایکان؛ **چارئوممەهات**: بریەتییە لە: چوار ماکی ئاو و ئاگر و خاک و با؛ **بەنات**: کیژان؛ **سێبەنات**: بریەتییە لە: گیاندار و ڕووەک و کرەک «حَیوان، نَبات، جِماد»؛ **خافیز**: نەوێن؛ **ناسیب**: وەسەرخەر؛ **رفعە**: بڵندی؛ **جەزم، جەزمە**: وەستاندن؛ **عیلمی لەدوننی**: زانستی تایبەتی خوایی؛ **کان**: بوو؛ **کُن**: ببە؛ **سوخون**: وتان، وتە؛ **کاخ**: کۆشک؛ **ئاخ**: خاک؛ **شاخ**: لک؛ **سولاف**: بادە؛ **روقعە، رەقیع**: تابلۆی بە خەتی ڕوقعی نووسراو؛ **نمووج**: نموونە؛ **حەلا**: شیرین؛ **جەلا**: ئاشکرا، ساف.

**پوختەی مانا:**

چەرخ و لۆلەپ باو دەخۆن؛ چەرخو خولیانە. ئەستێرەکان لە ناو جەغزی دیاریکراو، بە سوورڕدانەوە دەگەڕێن. هێندێک بە شەو هێندێک بە ڕۆژ، دنیا ڕووناک دەکەنەوە و دۆلاب و چەرخی دنیایە هەر هاڕەی دێ. سەر ڕووپەڕی مەڵبەندی بوون، بە هەزاران شکڵ و ڕەنگ نەخشێندراوە؛ پەراوێزی بە ئاوەزێڕ لێ کراوە؛ وەکوو سالپێو خانە-خانە و چاوە-چاوە خەت دراوە. پەراوێزی حەوت ئاسمان، بە پێنج ناودێرە گشتییەکان واتا: جسن و جۆر و بەند و عەرەزی تایبەتی و گشتی، ڕەنگێنراوە. ماک و ڕەگەز- کە نوختە ناوەندییەکەیە و هەبوون لە دەوری خول دەدا و بویتە جەغز بەرانبەر بەو ئافەریدانەی لە خۆیان جوێ دەکاتەوە- نیشان درا. هەموو لەمپەر لە نێوانی بوون و نەبووندا هەڵگیرا.

خاک و ئاو و ئاگر و با- کە هەر چواریان دژی یەکن- بە ئەندازەی پێویستی بوون، تێکەڵ کران. بە بێ ئەو لێک کۆبوونەوە، بوونی مرۆ زۆر دژوار بوو. ئەو چوارانە ماک و داکن. سێ کچیان هەن: گیاندار و ڕوەک و کرەک (حەیوان و نەبات و جیماد). هیچی تاوێک هەدا نادا و ئەویندارن؛ وێڵی یارن؛ بە ئاواتن لەو دێری تازەی زۆر کۆنە، بەرەو ماکە بادەنەوە. هەروا ئاوڕ ئەدەنەوە بە هومێدی ئەو ڕۆژەی بگەڕێنەوە دەقی پێشوو. هێندێک سەربەرەژێر دەچن؛ هێندەک رووەو هەوراز دەبن؛ سەرگەردانن؛ دەخولێنەوە.

هەر بیچمێکی دێتە بەرچاو، لە هەر جۆر و هەر توخمێک بێ، بەر فەرمانی ناوێکی خودای گەورەیە. قولاب لە دەست بەخشندەدا، جا ڕایدەگرێ یان دەیکێشێ، بەرەو ژێری دەکاتەوە یان بەرەو هەورازی دەبا، لە پەنجەی ئیرادەی ئەودان. ئەوانەی دەڵێین ناوەندن و چرکە ناکەن، وەکوو زەنەی کە لەسەر پیتان دادەنرێ، خودا زەنەی لەسەر داناون و نابێ ببزوون.

قسەم، قسەی ئەهلی دڵە و قانوونی ڕازی خودایيم پێ گوتراوە. ئەو نهێنییەی لە گەڕی ئەستێراندایە، زانستی مرۆ نایگاتێ. گەرەکە زانستی خوایی فریا کەوێ و لە دوودڵی ڕزگارمان کات. زانستی تایبەتی خودا، لە دەریای ببە و بووی خۆیڕا جاروبارە، دوڕێکی هەرگیز نەسماوی بە مامۆستای قسەزانان- کە پێغەمبەرە و فەرموویە: «لە گشت عەرەب فەسیحترم»- بەخشش داوە و لە هێندێک ڕازی نهێنی، حاڵی کراوە. بەهرەی زانستی فەلسەفەی زۆر دژوار و وەشێراوەی تێدا دیارە. بەڵام گەلێک شتم لەو بادەیە وە دەست کەوت، کە فینجانێکم لێ فڕ کرد و گیانم بەو مەیە سەرخۆش بوو؛ زۆر شتی بۆ ئاشکرا بوون.

بە ژمارە ئێژین نۆ ئاسمان، بەڵام گشتیان نۆ نهۆمی ئاواییەکن. ئەگەر دوورتری بۆ بچێن، ئەویش هەر وەک زەوی ئێمەن. وارش و دیواری ماڵێکن. هەر نۆ عاسمانان، وەکوو قەوارەی دارێکە؛ زەمین لکێکە لەو دارە. مرۆ میوەی ئەو لکەیە. مرۆی میوەی ئەو درەختە، زۆر بەرز بوو. لە نەبووڕا هاتە بوون و ناوی نرا بەرزتر و سەروەری هەموو عالەمێ؛ بەخت شانازی پێ دەکرد. زۆر لە ڕێز و برەودا بوو. لەو باڵایەوە دابەزی. لە پلە و پایەی نزیک خوایی، خۆی هاویشتە ناو نزمایی و بەرگە نوورانییەکەی گۆڕی و بەرگی مرۆڤی کردە بەر و لەو بەرگەدا خۆی شاردەوە. لە سەر زەویش، هەمیشە نوختەی ناوەند بوو. ئارەزووی بەرزبوونەوەی تێدا ژیاوە؛ کەوتە کۆشش و سووڕخواردن. یاری مەزن بە فینجانی سەدەفەوە، بە ئەویندارااندا گەڕا. دوڕی تاواوەی- وەکوو مەی- بۆ تێکردن؛ مەستی کردن. مەیگێڕ چۆڕێکی دا بە من؛ هەموو ڕازم بۆ دەرکەوتن. لە بەژن و باڵای یارەوە، زانستی ڕاستی پێویستم، وەکوو تابلۆیێک خوێندەوە. زانستێ کە نموونەی دامێ چلۆن دڵم بە هۆی ئەوینی باڵای ئەو دەتوانێ بۆ باڵا بچێ و ئاسمان و بورجان وەپێچێ و شاباڵی لە سیدرە بسوێ. گیانم فڕی؛ گەییشتە بارەگای خودا.

سەیری هەر نۆ ئاسمانم کرد؛ کە بە ئاڵقە لە دەوری کۆڕی خودا بوون. سەرگەردان لە دەوری نوختەی خەیاڵیدا، خولیان دەخوارد و دەرەتانیان شک نەدەبرد.
مەلا ئافەرین بۆ شیعرت! خۆش و سووک و ڕێک و ناسک هۆندۆتەوە. یار بەدەستی ممبارەکی مۆری ئافەریمی دامێ؛ کە سکەی بە ناوی ئەو بوو.
ئافەریم بۆ ئەو باس کرن و نیشاندانی شکلی زۆر جوانی بێوێنەی کری خودا؛ کە هەمووی لە نوورێکی پاک و چاک و بێخەوش و بێکەمایەسی هاتە بەرهەم. پەسنەکانت زۆر شیرینن؛ هەر بۆیە دڵ دادەگرن و جەزمەیەکی زۆر پەسند و بەشکۆ دەخەنە ناو هەناو.



## چارین

۱
قەوســـــێ د هـــــیلالی ب دەلالی کەشـــــها
بـــەژنا تـــە ژ شـــەنگی ب درەنگـــی مەشـــها
مـــارێ ژ حـــەریرێ د عـــەبیرێ خوشـــها
مـــاوەر بـــوو ژوان زولفـــی د زەنگـــی وەشـــها

۲
ئاخـــا قـــەدەما موحتـــەرەما پایـــێ پەریمـــە
وەک تـــووتی پەیایـــەی ل زەبانـــێ شـــەکەریمە
هـەر لـەحزە دبـێ بێـت کـو دچـم رەهگوزەریمـە
ئیـدی چ ببێـژم کـو کـەریم ئیبـنی کەریمـە

۳
شمشـاد و خەرامـەک کـو مـە دیبـوو سـەحەرێ
جامـــەک ژ شـــەرابێ ب مـــە دا وی قەمـــەرێ
تـــیرەک کـــو ژ قەوســـەین دوێ دا جەگـــەرێ
قوربانـــێ خـــوە کـر جانـێ شـیرین روخ فەنـەرێ

**مانای وشەکان:**

**ب دەلالی**: بە ناز و جوانی؛ **کەشها**: کێشرا؛ **درەنگی**: بـە گـرانی و تەمەڵـی؛ **خوشـها**: ڕاخوشی؛ **وەشها**: پرژێندرا؛ **ئاخ**: خـاک؛ **کـەریم**: سـەخی و بەخشـندە، نـەجیمزادە؛ **فەنەر**: چرای ناو شووشە.

**پوختەی مانا:**

کەوانەی مانگی یەکشەوەی برۆکانت، یەکجار بە جوانی کێشراون و زۆر بە نازەوە بۆم کێشران و تیریان دەگیان و دلم گرت. بەژنی شەنگت، لەبەر نازی زۆر گرانت، بە گرانی ڕێوە دەچێ. کەزی ڕەشت، وەکوو مارێکی زەنگی ئاوریشمین، خوشیبێتە ناو چەندین بۆنخۆشی تێکەلاو، خۆی ڕاوەشاند؛ بۆنی گولاوی بلاو کرد.

من کە - وەک تووتی گفتخۆش- دەم و ڕاوێژم شیرینە، هۆی ئەوەیە لە جیات شەکر، خۆلی بەرپێی یار دەچێژم. هەر دەمێکی یار دەیەوێ دەرچێتە دەر، دەلێ: بلێن با بێتە لام. دەچم دەبم بە ڕێبازی. چۆن شوکری ئەو چاکەی بکەم؟ نەجیمە و نەجیمزادەیە و زۆر دلاوا و بەخشندەیە.

بەژنی وەکوو دار شمشالیم، لە بەرەبەیانێک بەرچاو هات؛ بە لارولەنجەوە دەڕۆیشت. ڕووی وەک مانگ بوو. پیالێکی پڕ بادەی دامێ و تیرێکیشی لە کەوانی برۆیانڕا دە جەرگم گرت. دەی هەزار جار گیانی شیرین قوربانی ئەو کولمانەی بێ؛ کە وەکوو فەنەر بەتیشکن.



# شیعردز[1]

۱ قەوی مەشهوورە کو ناڤێ تە مەلا خەمسەعەشەر
تو ب شیعرا نەتەگۆتی خوەدکی قەند و شەکەر

۲ دورێ ناسوفتە دهوونی! مە نەدی میسلێ تە قەت
نە د سەمتێ عەجەمێدا نە د ئیقلیمێ تەتەر

۳ ئەڤ چ شیعر و غەزەلن مەدح و سەنایا خوە دکی؟!
د جڤاتان وە دبێژی مە ب تەعن و ب خەبەر

۴ ئەڤ چ تەقلید و شەتاتن چ بەتاتن تو دکی؟
سەرێ ڤێرا دهەژینی، ب دوسەد ئاه و کەسەر

۵ تو دزانی فەنەکا تە نە مەکانێ غەزلانە
چ بوها تێنە مەتاعێ تە، ئەیا بێ سەروبەر!

۶ دەست و پایان ژ بەرێ زیدە بکی دێ تە بکم
میسلی حەممادی عەرەب، هەر وەکی شەیخ ثانی ب سەر

۷ ئەحمەدم سینە سپەر پێشبەرێ تیرا فەلەکێ
دەعوەدارێ تەمە ئیرۆ تو ژ دەحلێ وەرە دەر

---

۱. وا دیارە مەلایەکی خەڵکی «فەنیک»، شیعری لە مەلا دزیوە و بە ناوی خۆی لە لای خەڵکی خوێندۆتەوە و ڕەخنەی لە مەلا گرتووە، کە لە شیعرا ناگاتە من.
مەلا بەم چەند بەیتە شیعرە، گاڵتە بە شیعردز دەکا. ناویشی نەزرینگاندووە و بە «پازدە» ئاوی بردووە.
بە بیری من، دەبێ مەلاکەی شیعردز، «زوبێر» بووبێ کە لە شێوەی کرمانجیدا، زۆر ناوان هەڵدقرچێنن: بە «ڕەشید»ان دەڵێن: «ڕەشۆ»؛ بە «موستەفا» دەڵێن: «مستۆ» بە «زوبێر»ان دەڵێن: «زبۆ». زبۆ، بە ئەبجەد پازدەیە. لەوانەشە شتی تربێ و نەمزانیبێ. «هەژار»

**مانای وشەکان:**

**قەوی**: زۆر؛ **سەمت**: لا، ئالی؛ **خەبەر**: جوێن، قسە؛ **شەتات و شەتەت**: دەلەسە و لافی پووچ؛ **بەتات و بەتەت**: درۆ و فشە؛ **فنیک**: ناوی مەلبەندێکە؛ **فەنەک**: دەلەک؛ **غەزل**: ڕستن؛ **غەزەل**: شیعری دلداریی؛ **غێزلان**: ئاسکان؛ **بێسەروبەر**: هەژارۆکە؛ **دەحل**: بێشەی دەس‌نێژ.

**پوختەی مانا:**

زۆر مەشهووره کە ناوت مەلا پازدەیە. بە شیعرێک کە هی خۆت نییە، خۆت لای خەلک شیرن دەکەی! وا دەردەخەی کە مرواری کون‌نەکراوت هۆندۆتەوە! پیاوی وەک تۆم نە لە ئێران، نە لە ولاتی تاتار نەدیوە. خۆت بە شیعر بە جەنابی خۆت هەلدەلێی و تانە دە شیعری من دەگری و بەخراپە باسم دەکەی! ئەم درۆ و دەلەسە چییە تۆ ناوت لێ ناون شیعر و بە ئاخ و خەمبارییەوە دەیانبێژی و سەرتی دەگەل ڕادەژێنی؟! خۆت دەزانی دەلەکاوا بەرەگەی کارمامزان نییە و بە تەلەکە و کەلەک، دەلەک ناکرێن بە ئاسکی چاو بەلەک. بە چاوەڕاو و گالەگال، گال لە تالایی ناکەوێ. هەلبەستەت کە دەلەک‌نامەن، ئەو پڕوپووچە بێتامەن، کە هیچ‌کەس بە هیچی ناوێن. هەرێ کابرای شیعردزی گزیکەری بێسەروبەر! ئەگەر لە تەشکەبەرەی خۆت ئیتر پتر پێ ڕاکێشی، لێت ڕوون بێ، بەو دەردەت دەبەم کە شێخەکە، بەسەر کاورای عارەوی حەممادی ناوی هێنابوو.

من ئەحمەدم؛ نەترسێکم کە بەرانبەر بە تیری بەلای زەمانە، سینگم مەتال و قەلغانە. ئەمەوێ بەگژتا پچم. دەسا مەلا پازدەی دەلەک! لە کەلەک و مێشەدا، خۆت مەلاس مەدە! بۆم وەرەدەر!



## وتوویژی مەلا و میرعمادەدینی جزیری

**مەلا:**

| | |
|---|---|
| ســـەلاما مـــن ســـەنا خـــوانی | ســەحەرگەهـ گەوهەرئەفشــان بــت |
| ب ســوورەت ئــەمرێ ســوبحانی | سەر ئــەلقاب و زەرئەفشــان بــت |
| ب خدمــەت عــەرزێ ســولتانی | عـــەبیر و عەنبەرئەفشـــان بـــت |

**مانا:**

سلاوی منی پەسندەر، لە بەرەبەیانا، بە خزمەتی جەنابت سەرفراز و بۆنخۆش بێت و بە ناوی تۆ، ببێتە گەوهەرپڕێن و خوا بۆ قبووڵ بوونی نزام دەربارەی تۆ فەرمان دەرکا.

**میر:**

| | |
|---|---|
| ســـــەلاما ســـــانعێ قـــــادر | مـــەلا دا پـــێ موعەتتـــەر بـــێ |
| موفـــەررەح بـــێ مـــەلێ خـــاتر | پەیاپـــەی لـــێ موکـــەررەر بـــێ |
| ژ جامـــــا خــــاترێ عـــــاتر | مـــە ژێ ئایینـــە ئـــەنوەر بـــێ |

**مانا:**

سلاوی خوای داهێنەر و توانا لە مەلا بێ. هەمیشەش بۆی دووپاتە ببێتەوە و لە سایەی مەلاوە، دلی ئێمەش وەک ئاوێنەی مشتوماڵکراو بێ.

**مەلا:**

| | |
|---|---|
| ژ رەنـــگ ئایینـــەیا جامـــێ | مـــە بـــاتن رەوشـــەن و ســـافە |
| دەرەمـــزا کـــوفر و ئیســـلامێ | یـــەقین فـــەهمێ تـــە کەششـــافە |
| ژبـــەرقا نـــووری ئیلهامـــێ | درەخشـــان قـــاف تـــا قافـــە |

**مانا:**

ئێمە هەناومان وەک ئاوێنەیەکە بەرانبەرت. لەسایەتەوە ڕووناکە و چونکە تۆ لەزاناییـدا

وەک تەفسیری کەششاف وای و زۆر باش لە کفر و ئیسلام حاڵیت و تیشکی زانستت دنیای تەنیوە؛ منیش بە تیشکدانەوەت ڕۆشنم.

**میر:** درەخشـــانێ درەخشـــان بـــوو　　ســـەنا بـــەرقا تەجـــەللایێ
د جامـێ مـەی بەلەخشـان بـوو　　ب فـــەیرووزی جـــەلا دایـــێ
وەکـی لـەعلێ بەدەخشـان بـوو　　د دەســـــــتێ ماهســـــــیمایێ

**مانای وشەکان:**

**درەخشان**: بریقەدەر؛ **سەنا**: ڕوونـاکی؛ **بەلـەخش**: لـەعل؛ **بەدەخشـان**: شـوێنێکە بـە لەعلی باش ناسراوە؛ **فیرووزی**: سەرکەوتن.

**مانا:**

لەوەتا تۆ پەیدای و درەوشـاوی، نـووری خوامـان بـە چـاو دیـوە. شـەرابێکمان دەس کەوتووە وەک لەعلی بەدەخشان وایە، کە لە سەر دەستی جوانێکی ڕوو وەک زێو بێ و زۆر سەرکەوتە و بەختەوەرین.

**مەلا:** ژ دەســـــتێ شـــــەککەرئامیزان　　سەراســـەر غـــەرقێ مەســـتیمە
ســــــەمەنبووی و دلاویــــــزان　　ب رەیحانـــێ خـــوە بەســـتیمە
ژ تـــــــۆرا فیتنەئـــــــەنگیزان　　دو ئـــەژدەر مەســـت گەســـتیمە

**مانا:**

من لە مەستیدا خنکاوم. مەی ئەوینم بە شـەکری دوو لێوانـەوە فـڕ کـردووە. دڵ بـە بسک هەڵاواسرا و بە بۆنی لاجانگی سپی- کەوەک گوڵی یاسەمەنە- گیرۆدە بووم. بە ڕەشەڕێحانەی کەزی، شەتەک درام. چاوی مەست- کە فیتنەگـەرن- بـە هـەژدیهای کەزیانی، بە گەستن داوم.

میر: دو ڕەشمارێ سەمەنسوربوو مە دل مابوو خەیالێدا
کو سونبول هات و کەر-کەر بوو د بەر گۆشێ هیلالێدا
ژ عەکسا ساقی ئەنوەر بوو شەرابا مە پەیالێدا

مانا:

دوو کەزی وەک دوو ماری ڕەش، لە سەر یاسەمەنی لاجانگ هاتە بەرچاوم. دڵم خەیاڵی لێ کردن. بسکی- کە وەکوو سونبول بوون- هاتنە سووچی مانگی لە نوێی برۆیان و لەسەر ڕوخساری دابەش بوون. مەیگێڕ تیشکی دا پیاڵەکەم؛ بادەی پیاڵە تیشکی داوە.

مەلا: شەرابا نابێ روممانی شەفەق دا عیقدی پەروینێ
موسەلسەل مابوو ڕەیحانی خەتێ نازک ل نەسرینێ
غەرەز شکلێ تە بوو مانی ژ نەقشێن چین و ماچینێ

مانا:

بادەی وەکوو دەنکی هەنار، تیشکی لە گەردانەکەی دا. گەندەمووی ناسک لە لامل، بەزنجیرە وەکوو خەتی موسەلسەل و ڕیحانی جوان، هاتە بەرچاو. ئەگەر مانی لە چین خەریکی شکڵان بوو، نیازی وا بوو وێنەی جوانی تۆ نەخش کا.

میر: میسالێ سوورەتێ چینێ غەلەت مانی خەتا کێشا
کو من دیبوو ل ئایینێ ژبەر زولفا دوتا کێشا
مە دیبوو شکلێ شیرینێ تو ئوستادان وەنا کێشا

مانا:

مانی لە چین -کە لای وا بووە جوانترین شکڵی کێشاوە- بە هەڵە چووە. دەبوایە وەک من یارم دیت- کە لە ئاوێنەی دەڕوانی و لە دوو لا پەخشان بوو- ئەویش دیبای؛ ئەوسا بە جوانیی دەیزانی، جوان یانی چی. ئەو شکڵە شیرینەی من دیم، هیچ

وەستایەک ناتوانێ وەک ئەوی دەرخا.

**مەلا:** کــو کێشــا کاتبــێ غــەیبێ خەتــەک زیبــا ژ کــافووری
چ ئایــەت بــوو ژ لارەیبــێ رەشــاندی عــاریزان نــووری
د یاقووتــا مــە دێ مــەی بــێ ژ دەســتێ وێ سـیفەت حــووری

**مانای وشەکان:**

**کو**: چلۆن؛ **لارەیب**: بێ‌گومان.

**پوختەی مانا:**

ئەی نامەخوا! دەستی هونەرمەندی خودا، چۆن لەو لەشەی وەکوو کافوورە چەرمووگە و لەو لاجانگانــەی وەک نــوورن، چتــۆ حــۆری بــەدی هێنــا؟! جــوانی یــارم ئایەتێکــە بێ‌گومانیی توانایی خوا ئیســپات دەکــا. دیــتم بــە پەنجــەی یــاقووتی، مــەی ئــەوینی دەرخواردی دڵداران دەدا.

**میر:** ژ نەشــــئا بادەیــــا کاســــێ ب زات ئــەز غــەرقێ عیرفــانم
ب وێ جامــــێ ب وێ تاســــێ ســــیفەت کیســــرا و خاقــــانم
ژ بــــەرقا غــــەمزە ئەڵماســــێ ل تــــەختێ دل ســــولەیمانم

**مانا:**

هەر لەو مەیەی کە یار ب جام و تاس دایمێ، لــە هەســتی خوداناســیندا، هــەر نوقــوم بووم. وا سەرخۆشم، خۆم بە قاقان و بە کیسرا و سولەیمانیش ناگۆڕمەوە.

**مەلا:** ســولەیمانی مــە ئــەز دیســا سەحەر هودهــود بیشــارەت کــر
جــــەواب ئــــانی ژ بەلقیســــا ب حــال و ســوڕ عیبــارەت کــر
ب جان ئــەز خــوەش کــرم عیسا دەمــا وی ئــەو ئیشــارەت کــر

**مانا:**

من سولەیمانی دووهەمینم و پتریش. سروەی بەیان، وەک پەپووسلێمانەکە بوو کە مژدەی بەلقیسی پێبوو. بە مزگێنی و بە ئیشارەتی چاوی یار، وەکوو لازار، بە فووی مەسیح دیسان ژیاوە؛ گیانی نەماوم ژیایەوە.

**میر:** دەمـا عیسـا ئیشـارەت کـر — ل من عەزمێ رەمیم حـەی بـوون
دل و جانـێ مـە غـارەت کـر — درێ مەعـدووم و لاشـەی بـوون
ئـەدا لـەو خـوەش عیبـارەت کـر — مە هەمسـەر مـوغنی و نـەی بـوون

**مانای وشەکان:**

**عەزم**: ئێسک؛ **رەمیم**: ڕزیو، پواو؛ **هەمسێر**: هاوڕاز.

**پوختەی مانا:**

لە ڕێی یاردا دڵو گیانم بە تالان چوو. نەمام و بوومە بابردە. لە بلوێر و لە گۆرانی- کە هاوڕاز بوون- وەهام زانی، کە یار گۆشێکی چاوی دایە من. فەورەن وەکوو عیسا- کە مردووی ڕادەکردن- هەموو پێشەی ڕزیوم ژیانەوە و دووبارە گیانم هاتەوە بەر لەش.

**مەلا:** نـەی و مـوغنی مـە هـەمرازن — د رەمزا ئایینـا (ئاییـنـەی) جامـێ
ل مـن مـەحرەم دەف و سـازن — ددن بـێ پـەردە پـەیغامێ
دنـالن کەوکـەب و بـازن — هـەزار رەنگـێ د ئیلهامـێ

**مانا:**

لە تێگەیشتنی ڕازی نهێنی- کە لە بادەی ناو پیاڵەدایە- هاوڕازم زۆرن و دڵم لە زۆر شتان ئاگادار دەکەن: بلوێر، گۆرانی، دەف، ساز، گوارەی ئەستێرەئاسایی، بازنەی دەستی لە خرینگەدا.

**میر:** دنـالن غونچـە و دەنـگ هـات — ژ بـەلگێ نێرگـزا نـازک

ژ تایــێ عەرعــەرا شــەنگ هــات ب پــــەروازا خـــوە شــــەهبازک
مەشا سەلوا ســەهیڕەنگ هــات گهـــا ڕۆحـــێ مـــە ئـــاوازک

**مانا:**

دەنگێک هاتە بەرگوێی گیانم. لە چەند دەنگێک تێکەڵاو بوو. قرچەی دڵی غونچەی بە تاسەی نەپشکووت، خشەی لەرەی چلەنێرگز، هاشەی گەڵای عەرعەری شەنگ، فڕەی باڵی بازی سپی، مژدە و ئارەزووی دیتنی بەژنی یار بوو؛ کە سەوڵـێکی بێوێنەیـە لـە دنیادا.

**مەلا:** زەهـــی شـــاهین و شــــەهبازێ ب نـــاز و قـــەنجی و غـــەنجان
چ تـــەیغوون بـــوو دپـــەروازێ وەشـــیرین دامـــە بـــەر پـــەنجان
درەمـــزا ســـیحر و ئیعجـــازێ بـــرم ڕێـــزا گوهەرســـەنجان

**پوختەی مانا:**

جوانی و نازی ئەو نازدارە، زۆر بازی سپی و شـاهێنی وەکـوو سوێسـکە خسـتۆتە ژێـر چەنگی خۆ. منیش وەبەر پەنجەری هاتم، بۆیە هێندە قسەزانم.

**میر:** گوهەرســـــەنجن د حوســــنێدا دوئـــەبروو میســـلێ میزانـــێ
دو شـــەهلا بـــوون د قەوســـێدا گـــران بـــوو ســـەر ل کێشـــانێ
هـــیلالن گووشـــە لـــێ پەیـــدا ژ سونبول ڕاست و چـەپ دانـێ

**مانا:**

دوو برۆی، تەرازووی نازکێشانێ، کە هاتـە سـەر کێشـانی نـازی کاڵـەکانی، مەسـت و سەرگران ببوو؛ سەری دەکرد. بۆ پارسەنگدان و بۆ یاریدەدانی تای تەرازووەکە، بسکی وەک سونبولی لە گۆشەی برۆیان جێ کردەوە.

**مەلا:** دو ســونبول هاتــە ســەر بــەدرێ موسەلســـەل تـــوورە توغرانـــە

بـــــەرات و لەیلەتولقــــەدرێ    مـــەلائیک ســـەف گرێ‌دانـــە
ژ بــــالا حەلقـــەیێ چـــەترێ    ل بــــەدرێ تـــازە ســـەیوانە

**مانا:**

بسک هاتۆتە سەر هەنیە، لە شکڵی مۆری سوڵتانە. کەزی و کـاکۆل وەکـوو چـەترێک لەسەر ئەو هەنیەوە دیارە. دەڵێم مۆری دەسی غەیبە، کـە ئەمشـەو لەیلەتولقـەدرە و فرشتەی خواش هەموو هاتوونە سەیرانێ.

**میر:** ل بـــەدرێ کاتبـــێ حوســـنێ    نقیســـــی عەنبـــەرێ ســـــارا
شـــیرینە غالبـــێ حوســـنێ    ب نیشـــــانا جـــەمال ئـــارا
نـــەزەردە تالبـــێ حوســـنێ    کـــو دلبـــەر دل بـــەرێ خـــارا

**مانای وشەکان:**

**سارا**: خالیس، بێ‌خەوش؛ **خارا**: ڕەق، مەڕمەڕ؛ **ئارا**: وەڕازێن.

**مانا:**

نووسەری جوانیی، بـە عەنبـەری بێ‌خـەوش، ڕوخسـاری یـاری ڕەنگانـد و بـە خـاڵان ڕازاندییەوە. تۆ کە بـە تاسـەی بـۆ جـوانیی، ئەوندەشـت ئاگـا لـێ بـێ کـە ئـەو یـارە ناسک‌هەندامە، دڵی وەک بەردی ڕەق سەختە.

**مەلا:** د تـــۆڕا عەنبـــەرێ چینـــان    ژ قـــودرەت ڕۆح پـــەروەردن
دلـــێ بـــت ســـەیدێ شـــاهینان    یـــەقین دێ دەســـت ژێ بـــەردن
دنـــــازێن عیشوەشـــــیرینان    مـــە دل هـــەر پورغـــەم و دەردن

**مانا:**

نازان دەکا، ناهێڵێ گیانم بچێتە ناو تۆڕی کەزیی چین-چینی؛ کە برەوبەری عەنبەرە. چونکە گیان لەو تۆڕەدا وەکەیف دێ و گیانپەروەرە. هەر دەرد و داخم دەداتـێ. دڵـم بۆتە نێچیری شاهێنی چاوی؛ بەو گیرانەش زۆر دڵخۆشم. دڵێک کە چـاو ڕاوی بکـەن

تازە دەبێ یەکجاری دەستی لێ بەردەی. ئەو چاوانە نێچیرێ خۆ نادەنەوە.

**میر:** ژ قــودرەت نوقتــەیا نــووری ب ســووورەت بــوو ل نیشــانێ
ژ بـــەرقا ئاتەشـــێ تـــووری چ شــەوقەک دایــە پــەروانێ
ژ عەکســا جامــێ فــەرفووری کــو ئاتــەش هاتــە فینجانــێ

**مانا:**

بریقەی ڕەشایی خالان، شکڵێکن لە نووری خودا. بادەکە وەکوو ئاگرێـک لـە پیاڵـەی چینی دەدرەوشا؛ لەو جۆرە ئاورە نوورە بوو کە مووسا لە تووری دیتی. دڵ بـەو گـڕە، وەکوو پەپوولە گڕی گرت.

**مەلا:** ژ وێ نـــووری ژ وێ نـــاری مــە مووســایی قەبــەس ئیســا
چ ئاتـــەش بـــوو دورێ داری ل تــەیرێ دل قەفــەس تیســا
ژ عیشـــقا نەقشـــێ جـــەبباری ژ ئـــاگر مـــن نەفــەس دیســا

**مانا:**

لەو تیشکە ئاگرەی مووسا، من هەر بۆ خـۆم بوومـە بـزووت و ئاییسـام. خوایـە چلـۆن ئاگرێک بوو لەو دارەدا؟! کە بۆتە قەفەس بۆ دڵـم و هێشـتا هـەر ترووسـکە دەدا. لـە ئەوینی خودای گەورە، هەناسەشم گڕی بەتینی ئاگرە.

**میر:** ژ ئــاگر مــن نەفــەس هیــل بــوو ژ روخســارێ شــەبئــەفرووزێ
ژ بۆ مــن حــەللێ موشــکیل بــوو ب رەمـــزا موعجیزئـــامووزێ
د نــار و نــووری کامیــل بـــوو ژبــــەرقا وێ جەهانســــــووزێ

**مانا:**

لە ئاگری ئەو ڕوخسارەی وەک مانگ، شەو پڕتیشک دەکـا. هەناسـەی ساردم گـڕی گرت. بە ئیشارەتی چاوانی- کە وەک برووسکەی دنیاسۆز، گرشەی دەهـات- هـەموو

مەسەلەی دژوارم لێ حاڵی بوون.

**مەلا:**

| | |
|---|---|
| بنــــێ بـــەرقا تەجـــەللایێ | مـــەلائیک دیـــن د ئادەمـــدا |
| ژ رمـــــزا بـــــەژنوبالایێ | چ غـــەوغا بـــوو دعالەمـــدا |
| ژ بــــالا تالیعـــەک دایـــێ | ســـولەیمان دی دخاتەمـــدا |

**مانا:**

بنۆڕە برووسکەی دیاردەی خـوا، فرشـتەکان لـە ئادەمـدا دیتیـان و سـوژدەیان بـرد. سولەیمان لە ئەنگوستیلەدا دیتی، حوکمی لە دنیا کرد. هەر ئەو نوورە، لە بـەژنوبالای یارمدا چۆنی هەرا لە دنیادا ناوەتەوە؟

**میر:**

| | |
|---|---|
| کەسـێ بێپـەردە مـەحرەم بـت | دڤـێ بێپـەردە وەک نـەی بـێ |
| روبـاب و چـەنگ هەمـدەم بـت | د تاعەت مەسـتێ بـێ مـەی بـێ |
| د دەستدا جامێ وەک جەم بـت | ژ رەنـــگ ئایینـــەیا غـــەیبێ |

**مانا:**

کەسێک لە بارەگای یاردا، بە نامۆیی لێی نەڕوانن، دەبێ خۆی ئاشکرا بکـا و بێپـەردە بلوێر ئاسایی، دەنگ هەڵێنێ. دەگەڵ سازاندا هاوڕاز بێ و جامی دەستی لە جامەکەی جەمشێر پتر نهێنی بۆ ئاشکرا کات. ئەشێ بێ بادە هەر مەست بێ.

**مەلا:**

| | |
|---|---|
| دڤـــــێ ئایینـــــەیێ زانی | چ حیکمـــەت تێتـــە تـــەعلیمێ؟ |
| کـــو حـــەرفێن تـــازە نـــوورانی | د لـــەوحێ ســـینە تـــەقویمێ |
| ژ بـــالا تـــووریٚ ئینســـانی | نـــەزەردا ســـاعیدێ ســـێمێ |

**مانا:**

دەزانی لەو ئاوێنەدا چۆن ڕازێک فێری پیاو دەکرێ؟ پیتی تازە و ڕووناکیدەر، لەسـەر تەتەڵەی دڵی دڵداران وا نووسراوە کە خوا ئەمجار لەباتی کێو، خۆی نیشـانی بـەژن و

بالای یارم داوە. بڕوانە باسکی زیوینی، تا ئەم ڕازەت لێ حالی بێ.

| | | |
|---|---|---|
| میر: | شـــەفەق دا ســـیمێ ئەنـــدامێ | ژ بـــالا پەرتـــەوەک نـــووری |
| | بگـــــر ئایینـــــەیا جامـــــێ | ژ دەستێ مەست و مـەخمووری |
| | تـو جـارەک گوهـدە پـەیغامێ | ژ دەنگـێ عـــوود و تـــەنبووری |

**مانا:**

بە بالاوە، تیریژی نوور لەو هەندامە زیوەی داوە. بڕوانە پیالەی سەر دەستی! کە لە جوانی یارم مەستە. یان گوێ بدە دەنگی سازان! تا تێ بگەی کە ڕاست وایە.

| | | |
|---|---|---|
| مەلا: | ب قـــانوون گوهـــدە ئایینـــێ | بـــزانی دا ســـوڕا ســـازان |
| | ژ حیکمـــەت تینـــە تـــەدوینێ | ب عـــــەینی مـــــەعنییا رازان |
| | د دامـــا عیشـــوە شـــیرینێ | ددت تـــەیرێ مـــە پـــەروازان |

**مانا:**

تۆ لـە ڕێوشـوێنت دەرمـەچۆ! ئەوسـا گـوێ هەڵـخە! دلکێشـییەکی دەنـاو دەنگـی سازاندایە، هەمووی باسی نهێنی هێژا و بەنرخە و مانای زۆر دژوار تێدەگەی. مـن کـە ئەو ڕازە گرینگە لە سازانەوە دەبیسم، مەلی دڵم لە ناو داوی نازشیریندا، بۆ دەرکەوتن دەکەوێتە پەلەقاژە.

| | | |
|---|---|---|
| میر: | دپـــــەروازێ هومـــــادەنگین | مـــە ســـەردا تاجـــێ ئیقبالـــێ |
| | شـــەهێ کەیخوســـرەو و زەنگـــین | ســـەر ئـــەفرازین د ڤـــێ حالـــێ |
| | وەریـــن ســـاقی مـــەیا رەنگـــین | مـــەدل مایـــە دڤـــێ قالـــێ |

**مانای وشەکان:**

**زەنگی**: فەرمانڕەوای مووسل؛ **ڕەنگین**: دەوڵەمەند.

**پوختەی مانا:**

ئێمەی دڵداری بەڕاستی، فڕینمان وەک پیرۆزەیە. تاجی سەری کەیخوسرەو و فەرمانڕەوایانی زەنگی، لە سایەی سەری ئێمەیە. زۆر لە ژیانی خۆمان ڕازین و سەرفەرازین. مەیگێڕ بادەی ڕەنگین تێکە! من چی و ئەو دەمەقاڵە چی؟ دیارە هێشتان زۆرم ماوە، لە خۆهەڵکێشان واز بێنم.

**مەلا:**

| | |
|---|---|
| د رێدا خاکێ دەرگاهم | بەلێ ئەووەل ژ ڤێ خاکێ |
| بلا بێپایە و جاهم | مە پێ چوو فەرقێ ئەفلاکێ |
| شکارەک دەرخورێ شاهم | د وێ بەندێ د فیتراکێ |

**مانا:**

من دە ڕێگەی دڵداریدا دەبمە خاکی بەردەرگانە؛ ئەمما دەبێ خاکی دەرگانەکەی یارم قبووڵم کات؛ ئەو بەختەوەرییەم بداتێ. ئەوساکە پام لە سەر سەری هەموو ئاسمانان دادەنێم. ئەگەر بە خاکی بەر دەرگام قبووڵ بکا؛ پادشایان بە شانازی دەیانەوێ ڕاوم بکەن و لە بەن‌سامورتەیاندا بم.

**میر:**

| | |
|---|---|
| گرانبەندم د بەندێدا | د قەیدا شاهێ شەهبازان |
| دو سەرپەنجە د زەندێدا | گەهیشتن یەک شوبێ بازان |
| د دەستێ شەهلەوەندێدا | ب شاهینی و رمبازان |

**مانای وشە:**

**شەهلەوەند**: سواری شۆخ، شۆڕەسوار.

**مانا:**

لە زیندانی دڵداریدا، یەخسیرێکی بەندگرانم. بە زنجیری شای شابازان، بەستراوم. دوو سەرپەنجەی تێک‌پەڕاندن. ئەو باسکە سپی و ناسکانەی هاتنە سەر یەک. من نێچیری شۆڕەسوارێکم لە ڕمبازی بێ‌هاوتایە و بە چاوانیشی شاهێنە.

**مەلا:** ب شـــیرانرا کـــو رمبـــازم د رەمـــــزا قابەقەوســـــەینێ
ب یعـــەینێ *گولشـــەنێ رازم* د بابـــێ حیکمەتولعـــەینێ
مـــولازم حـــەزرەتێ لازم حیجـــاب را کـــت ژ مابـــەینێ

**پوختەی مانا:**

ئازایەتیم هێندە هەیە، خۆم لە بەر شیری کـەوانی برۆیـانی ڕاگرتـووە. کـە بـە ڕمـبی مژۆلانیش لانەکەوتووم. وەک کتێبی *گولشـەنی راز*، پـڕم لـە ڕازی نهێـنی سـۆفیانە. سوڕی چاوانی دەزانم و دەتوانم وەکوو کتێبی حیکمە*تولعە*ین، شـەرحی بکـەم. خـۆم لام وایە شیاوی ئەوەم بۆ خزمەت لە بارەگای یار، جێگە بدرێم.
بە هومێدم پەردە لە نێوان هەڵگرێ و بۆ هەمیشە بە خزمەتکارم حیساب کا.

**میر:** ژ مابـــەینێ ب زاتـــێ چـــت کوو واسـیل بـت ب مـەحبووبی
نـــە تـــەنها دێ ســـیفاتێ چـــت ئەگـــەر دل مەســتێ مـــەتلووبی
ب توغرایـــەک بـــەراتێ چـــت ب مـــوهرا ئـــەمرێ مەنســـووبی

**مانا:**

بە باسی هونەر کردنێ، کەس ناتوانێ بگاتە یار. ئەو دڵدارەی کە مەستی بادەی ئەوینە و یاری دەوێ، گەرەک خۆی لە بیر نەمێنێ؛ ئەوسا مۆری پلە و پایەی خەلات دەکرێ و دادەمەزرێ.

**مەلا:** د مەنســـــووبا ویســـــالێدا بـــلا ساحیب مـــەقام ئـــەو بـــت
د بـــــەر قەوســـــێ هیلالێـــــدا ژ فـــەیرووزی ب جـام ئـــەو بـــت
د ئەســــــرارێ پەیالێـــــدا دڤێ میســکین خیتـام ئـــەو بـــت

**مانا:**

بەڵێ لەو خۆهەڵکێشانە پەشیمانم. یار خۆی چی دەوێ بڕیاردا، سـوپاس دەکـەم. بـا جێگە ئەو دیاری بکا؛ پلە و دامەزران هەر بەوە. لە پیاڵەی مەستیهێنی چاوەکانی، لە

ژێر کەوانی برۆیان، هەرخۆی دەبێ ڕێگە بدا سەیر بکەم و پیاڵەی سەرکەوتن بنۆشم. لە ڕازی ناو پیاڵەشدا، بڕانەوەی وەک میسک هەر بەدەست ئەوە.

میر: د خەتما ڤێ خیتامێدا غەرەز میهرا شەهەنشاهە
خەت‌وخالێ دجامێدا ژ نەشئا ئیسمی ئەڵلاهە
د بەحسا زولف و دامێدا مەلایا قەنج کووتاهە

**مانا:**

لە بڕانەوەی ئەم دواییەدا، دەڵێم: لە باسی زولف و داوی دڵداریی و وێنەی خەت‌وخاڵ لە پیاڵەی بادەدا، مرازمان ئەوینی پادشای پادشایانی جوانییە کە خودایە و ناوی خوا، لە جوانیی یاردا دەبینین و نەشئە دەمانگرێ و گەشکە دەکەین. بەڵام مەلاگیان! هەرچەندی باس بکەین هەر کورتی دێنین.

مەلا: د ئیقلیمێ سوخەن خاقان ڕەوانبەخش و شەکەرریزی
نەهن وەک تە د ئافاقان ب جانڕا عەنبەرئامیزی
ژ سیمین ساعید و ساقان ب سەحاری گوهەرریزی

**مانا:**

لە مەڵبەندی قساندا، بوویە خاقان؛ شەکر لە دەمت دەبارێ؛ گیان دەبەخشی. لە هەموو دنیا تات نییە. گیانمت بۆنخۆش کردووە. قسەت ئێژی عەنبەری تێکەڵ کراوە. دەربارەی بەلەکی سپی و باسکی زێوین، جادووگەری لە شێعردا و هەروا گەوهەر هەڵدەڕێژی.

میر: ب غەوواسێ ب سەحاری تە دور ئانین ژ بەحرەینێ
ژ نەزما تە شەکەرباری ژ میسرێ تا ب غەزنەینێ
ب دیققەت‌بین سەد ئەشعاری دبێژی تورفەتولعەینێ

**مانا:**

لە شێعرا جادووگەر هەر تۆی! ئەتۆ مرواری ناو بەحران دەهۆنییەوە. لە شیعری تۆ شەکرباریی هەتا میسر و هەتا غەزنەینیشی داگرت. لە تاوکێدا، لە تررووکانی چاوێکدا، سەتان شێعری بەمانا و ورد و باریکت بە دەمدا دێت.

**مەلا:**

ژ بەحرا قولزوما میران ب غەوواسی گوهەرچینم
د بەحسا عیلم و تەفسیران تو دەریایان وەنابینم
ژ میر و بەگلەر و چیران غولامێ میر ئەمادینم

**مانای وشە:**

**چیر**: دەسەڵاتدار.

**مانا:**

من لە دەریای گەوهەرەکانی مرخی تۆ، هەڵدەهێنجم. تۆ جگە لە شاعیری، لە زانست و شەرح و تەفسیردا، دەریایەکی. وەک تۆ دەریام هەر نەدیوە. لە ناو میر و خونکار و دەسەڵاتدارانی وڵات، بچووکی میر ئەمادین (عیمادەدین)م.

**میر:**

د باغێ لەفز و مەعنایێ سوخەن من سەروێ ئازادە
ژ ئیملاء و ژ ئینشایێ مە لەوحێ دل نوما سادە
ژ حوسنێ ڕەونەقەک دایێ کو شیخ ئەحمەد مە ئوستادە

**مانا:**

لە ناو باغی قسەی باشدا، قسەی من وەک سەوڵ وایە؛ بەرێک نادا. لە نووسینەوە و داناندا، تەتەڵەی دلم ساکارە. ئەگەر قسەم پەرە و بڕەوێکی هەیە. هەر بۆیەیە کە شاگردی شێخ ئەحمەدم و مامۆستام تۆی.



# وەڵام و وەرامی فەقێ تەیران و جزیری

**فەقێ:** سوئالا من حەقیرێ — سەدەفەک تقێ کو تێکن[1]
ئیرۆکە ل جزیرێ — حەقە کو ل مەلێ کن
هیلاک ژ دەربا تیرێ — ژ دەرمان هەیە لێ کن

**مەلا:** سەلامێن ملیاکەتان — بێ حەدد و بێ حەسێبن
شوبهەتێن ئاڤێن شەتان — ژ مەلا ل میم و حێ بن
هیلاکێن ژ زەحمەتان — دەرمان ژ لام و بێ بن

**فەقێ:** شەربەتا لام و بێیان — نادم ئەز وێ ب حەیاتێ
مەعدەنا دال و رێیان — دبارینن نەباتێ
ئیزهار دکن مەعنییان — ژ حوسنا بوت و لاتێ

**مەلا:** ژ نەقشێ بوت و لاتان — مە سینە بوتخانەیە
تەعوییونا سیفاتان — تەجەللا د قەلبێ مەیە
عید و شەڤێ بەراتان — ژ وانرا مە سەجدەیە

**فەقێ:** سەجدەیا شوکرێ جارەک — مە فەرزە د ویسالێ
نە پەردەبێ نە ستارەک — ل بەر وەجهێ هیلالێ

---

١. هەموو نوسخەکان «سەلاما من حەقیرێ»یان نووسیووە؛ کە دەبینین مەلای جزیری، لە وەرامدا، سەرەتا سەلام لە فەقێ تەیران دەکا، وا دیارە فەقێ، بە نیشانەی ئەدەب و وەک دابە، پێشەکی سەلامی کردبێ و مەلا جوابی سەلامەکەی دابێتەوە.
شیاوی باسە: لەم وەلام و وەرامەدا، بەپێی ئەو چوار سەرچاوە دەستم کەوتوون، تێکچوونی کێشی لەتەبەیت و تەنانەت سێبەیتمان گەلێک زۆرە؛ کە مامۆستا هەژار هێندێکی ڕاست کردوونەوە.

«اَحْسَـــنَاللە تَبـــارَکْ» ژ ســـیرڕا وێ جـــەمالێ

**مەلا:** جـــەمالا نـــوورین ســـافە د وەجهـــێ تەجـــەللایێ
ب حـــەرفێن خـــوە کەششـــافە زەمـــیر ددن مـــەعنایێ
حـا، مـیم، عـەین، سـین، قافـە رەمـــزا وێ موعـــەممایێ

**فەقێ:** حـێ یـێن د هـەفت حـا میمـان نوقتـەیان لـێ پەیـدا کـن
باڤـــێنە جـــەم دو جیمـــان عیشـــقێ ژ وێ هوەیـــدا کـــن
ئیســـمێن د دو طاســـیمان دو میمـــان ژێ جـــودا کـــن

**مەلا:** هـەفت خـوم تـژی بـادە دی د مەیکـــەدا قیـــدەمێ
خومـــا کـــو مـــەی ئـــیرادە عیشـــق رێهـــت جاما جـــەمێ
لـــەوحێ دو نـــوون لـــێ صـــادە لـــەو فـــەیزێ دا قەلـــەمێ

**تێبینی:**

هێندێک سوورەتی قورئانێ، بە یەک یا بە چەند پیتێک دەس پێدەکرێن؛ وەک: **الـم، ق، ص، ن، طه، یس، حم، المر، المص، طسم، کهیعص، حمعسق**. زانایان بەخەیاڵ خۆیان، مانایان بۆ دۆزیونەوە. گوتوویانە: نیشانەن بۆ ناوی خودا، بۆ جوبرایل، بـۆ پێغەمبـەر(د). هێندێکیان بۆ ناوی قورئان. بۆ هەر پیتەش مانایەکیان نیشانداوە.

هێندێکی دیش وتوویانە: تەنیا مەبەست لەم پیتانە، وسکوتکرنی کافرانە. دەیـانکردە چەقە و هەرا و گوێیان بۆ ئایەت نەدەگرت. کاتێ خوێندنی ئایەتان بـەو پیتانـە دەس پێدەکرا، سەرنجی رادەکێشان و کڕ دادەمان، بزانن چییان بە شوێندا دێت.

جا ئەگەر زانای ڕواڵەتبین، وایان بۆ چوون، عارفانیش بە باری دڵداریی خۆیان مانایـان لێ هەڵکڕاندوون.

لە بیرمان بێ، حەوت سوورەت بە وشەی «حم» دەسپێکراوە و یەکێ لەوان «عسق»ی بە دوادا دێت.

**مانای وشەکان:**

**حەقیر**: سووک و بێنرخ؛ **ملیاکەتە**: فرشتە، مەلایکەت؛ **میم و حێ**: نیاز فـەقێ تەیرانـە

کە ناوی موحەممەد بووە؛ **سیتار**: سەتتار، پۆشەر؛ **کەششاف**: دۆزەرەوە؛ **زەمیر**: پۆشراو؛ **زەمیر**: دڵ؛ **موعەمما**: مەتەڵ؛ **طاسم**: میمی لێ جیا کرێتەوە طاس دەمێنێ، بەمانا: زەرکە؛ **خوم**: کووپە؛ **جەم**: نک، کن؛ **جەم**: ناوی پادشاکەی ئێرانە کە دەڵێن لە پیاڵەکەیدا هەموو شتێکی دنیای دەدیت؛ **هوەیدا**: ئاشکرا.

**پوختەی مانا:**

**فەقێ**: پرسی [سەلامی] منی بێنرخ، بخەنە ناو سەدەف و بیبەنە خزمەت مەلا؛ کە لە شاری جزیرە. ئاخۆ برینی تیران چار و دەرمانی چییە؟

**مەلا**: سلاوی مەلائیکەتان بە قەد ئاوی شەتان و لە ئەندازە و هەژمار بەدەر، لە مەلاوە لە سەر مەلا موحەممەد بێت. نەخۆشیی ئەرک و ئازاران، دەرمانەکەی لە لێوانە.

**فەقێ**: شەربەتی لێو، بە ئاوی ژین ناگۆڕمەوە. لێو لە سەر دوڕی ددانان نەباتان دادەبارێنن، واتای جوانی بوتانمان بۆ لێوە دەدەن.

**مەلا**: لەبەر نەخشی جوانچاکانی بتئاسایی، سینەمان بۆتە بوتخانە. ئاکار و سیفاتی خودا، خۆی نیشانی دڵمان داوە. جێژنان و شەوی بەراتێ سوژدەی سوپاسی ئەو خۆشییە بۆخوا دەبەین.

**فەقێ**: هەرگا پەردە لا بدرێن و لەمپەر لەبەر چاو نەمێنێ و ئەو جوانە ڕوخسار بنوێنێ، سوژدەی سوپاس زۆر پێویستە. هەی نامەخوا، لە دلکێشی ئەو جوانییە!

**مەلا**: جوانیی نوورێکی پاکە لە ڕوخسار خۆ دەردەخا. پیتی وا زۆر لە ڕوخساران، کە زۆر خەبەران دەدەن و دڵ واتاکانیان دەزانێ: «ح» کە وەک بسکی چەمیو دەچێ. میمی دەموچاو و ددان. عەین و سین و مانایان لە ناو دڵدایە؛ واتا: «قەلب» بوونە ڕەمزی مەتەڵۆکێک بۆ هەڵێنان. عەین، سین، قاف، واتا: عسق، سێ نوختە دەیکا بە «عشق».

**فەقێ**: نوختە بۆ حەو حامیمەکان دانێ. «حم» دوانیان لە ژێر با ببنە جم بە جامەوە. میم لە تاسم جیاکەرەوە، با بێتە تاس. ئەوا تاس و جَمْ پەیا بوون. سێنوختەش بدە بە عسق، ببتە عشق و مەتەڵۆکە ئاشکرا بێ.

**مەلا**: حەوت «خُم» دارماڵن لە بادە، لە مەیخانەی ئەزەلیدا. لەو کووپەی ئێمە نیازمان بوو، ئەوین ڕژا ناو جامی جەم. تەتەڵەی ڕووی یاری نازدار، دو برۆی بە شکڵی نوونی، لەسەر صادی چاو دیاردەدا. واتا: دەقی ئایەتی جوانی خوایی «نصّ» و هەر ئەوەشە کە

«ن. والْقَلَم» نووسراوەو ئەو دیمەنە بەهرەی داوە بە قەلەم، کە وا ڕەوانە.

فەقێ: ساقی ژ خەمرا ئەزەلێ / نوون و قەلەم ژێ ئافراند
دارێهتە لەوحا ئەوەوەلێ / رزق و نەسیب پێ قەدراند
ئەو بوو موراد موستەهەلێ / نەقشێ مەجاز پێ سەوراند

مەلا: نەقشێ مەجاز تەلسمە / مەزهەر ژ رەنگ میرئاتێ
سوورەت ل بال مە ئیسمە / مەعنا ب تەجەللا تێ
حەرفێن د نوورێن جیسمە / کاف هایە د ئایاتێ

فەقێ: کاف ها ئیسمێ کوورە / توغرایە د تەنزیلێ
جیسمێ وێ کووهێ توورە / ئیجمالە د تەفسیلێ
جەمالە عەینێ نوورە / کەوکەب مە د قیندیلێ

مەلا: کەوکەب دبێم بەشەرە / نوورە کە مونەززەهـ تێ
چ حوسنەک موسەووەرە / رەسمەک ژ «مِنَ‌الله» تێ
یەقین ب خوە مەزهەرە / چەرخەکە سەد خەرگە تێ

فەقێ: خەرگە ب من حیجابە / ستار دکت جەمالێ
عەورێ رەش و نیقابە / ل بەر وەجهێ هیلالێ
پەروانە لەو د عەزابە / مەحجووبە ژ شەمالێ

مەلا: شەمال ژێ عەینێ نوورە / شەوقە ل بەر ستار تێ
پەروانە بێ دەستوورە / د چەرخێ سەما دار تێ
حەیران سیررا غەفوورە / لەو جانفیدایی یار تێ

فەقێ: یارێ حەقیقەت خالیقە / چوون جانفیدا ڤێ کەڤین
راست و دروست و سادقە / چ رەنگ شوونا رێ کەڤین
قەنج و لەتیف و لایقە / ئەر تڤێ ئێ باغێ کەڤین

**مەلا:** باغــــێ ژ نـــوور وەرەق لـــێ ‌ ‌ یـــار د وێ د زوهـــوور بـــت
سـپێدەیێ شـــەفەق لـــێ ‌ ‌ مەزهـــەر ژ عـــەینێ نـــوور بـــت
پەرتـــەو ژ حوسـنێ حـــەق لـێ ‌ ‌ دا عـــەکس بێقســـوور بـــت

**فەقێ:** عەکســـێ ژ حـــەق دبینـــین ‌ ‌ ل دۆر وەجهـــێ مـــەحبووبان
ل حـــــالکی نـــــامینین ‌ ‌ ژ ســـــورا وان مـــــەتلووبان
گـــەه نـــالین گـــەه دخـــوونین ‌ ‌ دووریـــن ژ وەسـلێ خووبـــان

**مەلا:** فـــەریاد ژ دەســـت فیراقـــێ ‌ ‌ د دووریـــــن ژ ســـــولتانان
تـــیرێن ژ لـــەونێ بـــەراقێ ‌ ‌ هەیبـــەت و ســـوڕا خانـــان
روژ ئانییـــــــە ئیشـــــراقێ ‌ ‌ لـــەو دمـــرین ژ کۆڤـــانان

**مانای وشەکان:**

**موستەهەل**: تازە دەرچوو، تـازە هـەڵاتوو؛ **ئیجمـال**: پوختـە و کورتـە؛ **تەفسیل**: شـی کردنەوە و درێژەدان؛ **قیندیل**: جێچرا؛ **خەرگە**: خێوەتی گەورە، بریەتییە لە ئاسمانان؛ **عەور**: هەور؛ **مەحجووب**: پۆشراو، نەدیو؛ **سـەمادار**: سـەماکەر؛ **ڤـێ کـەوین**: کۆشـش کەین؛ **بەراق**: برووسکە؛ **ئیشراق**: دەرکەوتنی خۆر؛ **نوون**: ماسـی؛ **دەسـتوور**: یاسـا و رێوشوێن؛ **کۆڤان**: عەزرەت و ئاوات.

**پوختەی مانا:**

**فـەقێ**: مەیگێڕی ئەزەلی هەر وەک بـادەی ئـەوینی سـاز کـرد، ماسـی و قەڵەمیشـی دروست کرد و بە قەڵەم لەسەر تەتەڵەی قودرەت، بەش و بژیوی بۆ ئافەریـدە دیـاری کرد. کە لە سەر دنیای سەرپشتی ماسی دەژین. بۆیە دەستی پـێ کـرد، تـا نەخشـی وێنە دەرەوەی خوا نیشان بدا؛ کە بەشەرە و بەشەریش بژێوی دەوێ.

**مەلا**: نەقشی بەدەڵ -کـە مرۆیـە- وەک تەلیسـمە و کـراوە بـە ئاوێنەیـەک وێنـەی بەرامبەر دەنوێنێ. ئەو بیچم و شکڵەی لامانە، وەک ناوێک هـەر وشـەیەکە؛ ماناکـەی شەوقی خودایە. تیشکی خودا، وەکوو چەند پیتی لە نـوورە و وەکـوو کـاف هـای نـاو قورئانە. واتا هەر خودا بەسمانە و ئەویش رێنیشاندەرمانە.

(هێندێک لایان وایە: کاف و هێ لە «کهیعص»دا واتا خودا کافی و هادییە).

**فەقێ**: کافها ناوێکی زۆر قووڵ و بەکاکڵە. مۆری پادشای شاهانە لە قورئاندا. لەشی مرۆش کێوی توورە؛ بەڵام ناوێکی کورت و پوختەیەتی، نووری خوا خۆی نیشان دەدا. جوانیی تەواو نووری خوایە لە ڕوخساری یار دیار ئەدا. نووری خودا، ئەستێرەیە دەنێو جێچرا نراوە.

**مەلا**: دەڵێم مرۆ ئەستێرەیە و نوورێکی پاکی خودایی لێوە دیارە. خوا جوانیی خۆی هێناوەتە ناو شکڵەوە و نیشانەی نەخشی کاری خۆی، پێوە ناوە. مرۆ نوێنەری خودایە. دنیایە کە سەتان ئاسمانی تێدایە.

**فەقێ**: من ئاسمانیش وەکوو پەردەیەک دەبینم؛ جوانیی خوامان لێ دەپۆشێ. لەبەر مانگی جوانیی یارم، بووە بە هەورێکی ڕووپۆش. پەپوولەش دەردی منیەتی؛ لە دیتنی مۆم بێبەشە.

**مەلا**: مۆمیش هەر نووری خودایە و تیشکی لە نەدیوڕا بۆ دێت. پووپەلە ئەویندارێکە گوێ بە یاسای لە دڵداریی بێخەبەران ڕانادێرێ، ئیجازەی پێ لازم نییە؛ هەر دەخولێتەوە و دەڕەقسێ؛ سەرگەردانی ڕازی نهێنی خودایە و گیانی خۆی بە قوربان دەکا.

**فەقێ**: بەڵێ یاری ڕاست خودایە. گەرەکە بە گیان و بە دڵ تێبکۆشین، تا دەیگەینێ. ئەو ڕێگەی بۆشی داناوین، ڕاستەڕێیە و تێی گەیاندوین کە بە کام ڕێگەدا بڕۆین و شوێن هەڵگرین. ئای چەند خۆشە و چەند ڕەوایە، بگەینە ناو ئەو باغەوە، کە یاری تێدا بەدی کەین.

**مەلا**: ئەو باغەی پەلکی لە نوورە و یار لەوێدا خۆ دەنوێنێ. تیشکی بەرەبەیان لەوێ لە سەرچاوەی نوورەوە دێت. تیشکی جوانی خوای لێ دەدا؛ وێنەدانەوەی تەواوە.

**فەقێ**: وێنەی جوانی خودای گەورە، لە ڕوخساری جوانانڕا دێتە بەرچاومان. ئەو دیتنەش هەمیشە بۆمان دەس نادا و لەبەرچاو بەرپیوار دەبێ. ئێمەش لە کاتی دیتنا، ئاهەنگ و گۆرانیمانەو لە دووریدا دەناڵێنین. واتا: لە حاڵێک نامێنین.

**مەلا**: ئەی هاوار لە دەستی دووری لە دیداری سەردار و خونکاری جوانان. دووری تیژ دێ وەک برووسکە و پێی دەپڕووکین. دلکێشی و هەیبەتی جوانیی خودای مەزن، ڕۆژ دەهێنێتە خۆرهەڵات. خۆر دێتە سەیری جوانیی خوا. ئەو جوانییەیە کە ئێمە دڵمان پێ داوە و بە ئاواتی دینی دەمرین.

**فەقێ:**
کۆڤـــانێن میهـــرداران — بێ حـــەدد و بـێ ئـــەژمارن
تـــیرن تـــێن ژ هەســـاران — ســەد جــار و ســەد هــەزارن
خـــەدەنگێن د نووبـــاران — نهـــین ل دل دبـــارن

**مەلا:**
نهـــین ل دل درشِـــینن — تـــیران ژ سیاگۆشـــان
دو میرغـــەزەب دکشـــینن — ل قـــەتلا مـــە مەدهۆشـــان
ژ عـــەین و قـــاف و شـــینن — خـــەدەنگێن ئەســـوەد دۆشـــان

**فەقێ:**
دو نـــوونن ســـیاه ڕەنگـــن — ب ســـەر ل مـــە کـــو کێشـــان
دەربـــێن ئـــەوان خـــەدەنگن — ل قـــەلبێ مـــە دەروێشـــان
عاشـــق ژ دەســـت بهـــنگن — ژ داغ و زەجـــر و ئێشـــان

**مەلا:**
داغـــێن مـــە پـــڕ دکـــوولن — خەبـــەر ژێ نایـــە گـــۆتن
یـــەنگیان زەرب ل دلـــن — هـــەناو مـــە ژێ پرســـۆتن
کەمانـــدار ڕەش قـــاتلن — گەزمـــە ل دل بجـــۆتن

**فەقێ:**
گەزمـــەیێن عـــەین و ســـادان — ئیشـــارەت ڕەمـــز و ســـۆرن
کشـــاندن گوشـــە بـــادان — مەحبووبـــە تیـــژ ئـــاورن
تـــیرێن دوان جـــەللادان — بـــاتین ل دل دفـــرن

**مەلا:**
ئـــاورێن جووتـــێ بەلـــەک — بـــەرقێ ژ ســـەماواتێ
شەمســـە د چـــەرخا فەلـــەک — هاتـــێ ب نـــیف میرئاتـــێ
ئینســـانە ســـوورەت مەلـــەک — یـــان حـــوورە د جـــەنناتێ

**فەقێ:**
حـــۆری کـــو تێـــک جـــەما بـــن — پـــەری هـــەم دڤـــێ گاڤـــێ
هـــەموو ژ ڕەنـــگ چـــرا بـــن — نێزیکـــێ شـــەمس و تاڤـــێ
ژ شـــەرما خویـــا نـــابن — ژ حوســـنا وێ گولباڤـــێ

**مەلا:** شەرمن ژ دیمێ زەری — عەقرەبان دەرب ل دلدان
شەمس و مەهو موشتەری — پێرو د موقابلدان
ئینسە بە شکلێ پەری — یا حۆری‌سفەت ویلدان

**فەقێ:** پێرۆ یەقین کو خالن — د عیقدا سورەییایێ
دو رۆژ و دو هیلالن — ل دیمێ وێ لەیلایێ
بێ وەسف و بێ میسالن — د رەمزا شەکەرخایێ

**مەلا:** ب رەمز و گفت و سوڕان — نەباتێ ئەف درێژن
عیشوەیێن لەعل و دوڕان — لوئلوء شەکەر دبێژن
خەدەنگێن د ئاوڕان — عاشقان دێ برێژن

**فەقێ:** عاشقێن لەب و لێڤان — شاباشە ژ خودێرا
سەلوا ب بیهو سێڤان — بەلگن ژ زیف و زێرا
حەرامن خەوێد شێڤان — ل کەسێ موحبەت ڤێرا

**مەلا:** کەسێ کو ئێک دڤێتن — سوهتییە ب ئولفەتێ
شەڤان کو ئەف خەڤێتن — ژ بەر دەربا موحبەتێ
عاشق ل پەی وی تێتن — ژ جەزب و ژ فیرقەتێ

**فەقێ:** فیراقێ تێک حیرقەتە — بەعیدە ژ خەیالێ
تووتاکە ب زەحمەتە — بولبول ژ بەر جەمالێ
گۆیین قەت خەو ناکەتە — کو دوورە ژ ویسالێ

**مەلا:** زەحمەت ب من ویسالە — عاشق ژ بەر جەزبەیێ
لەو تێت ب دەرد و حالە — ژ بەرقا شەعشەعەیێ
دەما هل بت شەمالە — نەزەر دە پەروانەیێ

| | | |
|---|---|---|
| **فەقێ:** | پەروانــــە لــــەو دمـــــرت | خـــوەش نینــە ئــەو ب ژینـــێ |
| | زەعیفـــــە خـــــۆ نـــــاگرت | تیــــژە بـــــەرقا ئەڤـــــینێ |
| | د پـــــەردێ نـــــا ســـــەبرت | دا رەت کـــــەمالا دینــــــێ |
| **مەلا:** | پەروانـــــە لـــــەو دسـوووژی | ژ لەمعـــــــەیا جـــــــەزباتێ |
| | فیـــــدا کــــرن عــــومر و ژی | د کەشـــــــفا ســــــوببوحاتێ |
| | کـــو دا ژ نـــو ڤـــە ڤـــەژی | بـــــاقی بــــت د حـــــەیاتێ |

**مانای وشەکان:**

**هەسار**: قەڵا، کەلهە؛ **سیاگووشان**: گۆشەڕەشان؛ **دووش**: شان، مل؛ **هنگ**: نرکە و نالینی بەقەو؛ **بەرهەنگ**: خوێناوهەڵێنان؛ **گولباڤ**: خونچەگوڵ؛ **دبێژن**: دا دەبێژن؛ **برێژن**: دەبرژێنن؛ **حیرقەت**: سووتان، سووتمان؛ **تووتاک**: تووتەک، مەلێکە شەو بێدار؛ **گۆیین**: مەلێکی شەو بێدارە؛ **شەعشەعە**: رووناکایی و تیشک دان؛ **ڤەژی**: بژیتەوە؛ **ژی**: ژیان.

**پوختەی مانا:**

**فەقێ**: عەزرەتی تاسەی دڵداران، بەدەر لە ڕادە و هەژماردن، لە کۆشک و شانشینانڕا، لە کەوانی تازەکاری برۆیانڕا، بە نهێنی هەزاران تیر دەگرنە دڵ.

**مەلا**: دوو میرغەزەب -کە دوو چاوی عاشق کوژن- ئەو کەوانانە دەکێشن. تیری گۆشەڕەش لە گۆشەی ڕەشی برۆیان، داوێژن؛ ئێمەی لە تاوان هۆشنەماو، دەدەنە بەر.

**فەقێ**: وەک دوو نوونی ڕەش دەنوێنن. تیریان بە دڵی هەژاری دڵداری بێچارە فێرە. لەو زەبرانە، ئێش و ژانمان هێندە زۆرە، دایم نرکە و ناڵەمانە و خوێناویان پێ هەڵێناوین.

**مەلا**: برین و داخمان دژوارن؛ دە باس نایەن چەند بەژانن. جووتە تیری ئەو کەواندارە کافرانەی، بەزەییان پێماندا نایە؛ جەرگ و هەناویان سووتاندوین.

**فەقێ**: ئەو دوو چاوە بادامییانەی، کە وەک دوو سەرەصاد دەچن و هەتا بڵێی بە نازان دڵان دەکێشن، گۆشەی برۆ وەکار دەخەن و لە گۆشەوە کە دەڕوانن، وەک میرغەزەب

بە ڕکەوە تیر باوێژێ، لە ناوەندی دڵ دەچەقن. ئەی نامەخوا! هەر ئاوڕدانەوەی یاران، چەند کاریگەرن و چەند خۆشن.

**مەلا**: ئاوڕی دوو چاوی بەڵەک، برووسکەن لە ئاسمانەوە. ڕوخساری ئەو ئاوێنەیە، وێنەی خۆری دەداتەوە. بەڵێ لە شکڵا مرۆیە؛ بەڵام ئاخۆ فرشتەیە یا خۆ لە حۆری بەهەشتە؟!

**فەقێ**: حۆری و پەری لێک وەکۆ بن، جوانی ئەو تازەخونچەیە دیاری بدا، لە شەرمان خۆ دەشێرنەوە. وەک چرایەک بەرانبەر بە خۆرەتاوێ، بێ ڕەنگ دەبن.

**مەلا**: ئەو ئینسانەی جوانیی پەری و حۆری و لاوی بەهەشتی هەموو لە لایە و سەوزە ڕەنگە، کەزیشی لە شەرمی ڕووی ئەو، هەموو سەریان هەڵگەڕاوە و بوونە دووپشک لە دڵمان. نەک هەر خۆرێکە بە تەنیا، مانگی هەیە؛ گرشەی موشتەری پێڕایە؛ کۆ ئەستێرەی پێرووشی لە ڕوودا دیارە.

**فەقێ**: بەڵێ خاڵەکانی پێروون، لە ناو لیزگەی هێشووی کۆدا. هەر لا ڕوومەتەی خۆرێکە. برۆکانی دوو مانگی نوێن؛ دەم و لێوی شیرینی شەکرشکێنی، لە پەسن و پێ هەڵدان نایە.

**مەلا**: گفت و بزەی، هێند دڵکێشن لە بەرچاوم. لەعلی لێوی و دوڕی دانی، لەپەستا شەکر دابێژن. ئەو لە لایەک شەکر ڕێژن، لە لایەکیش ئاوری چاوی، دڵی دڵداران دەبرێژن.

**فەقێ**: دڵ دان بەو دەم و لێوانە، خەڵاتێکە لە خوداڕا، کە تووشی بووین. سەوڵی بەژنی بەهێ و سێوی بەرگرتووە. گەڵاکانی زێڕ و زێوی خشڵانییەتی. کەسێ بەڕاستی دڵدار بێ، چاوی لە یار ناترووکێنێ؛ خەوی لە چاوان حەرامە.

**مەلا**: کێ دڵی بدا بە کەسێک، لەو هۆگرییەدا سووتاوە. زەبری دڵداریی بەژانە و پێوە دەچێ. دڵدار نەک هەر شەو ناخەوێ لە تاوی دڵ، بگرە لەبەر کێشی ئەوین، لە ترسی ڕۆژی جودایی، ناپەرژێتە خواردن و خەو؛ نە بە ڕۆژگار و نە بە شەو.

**فەقێ**: جودایی لە یار، سووتانە؛ هێند بەژانە، نایەتە خەیاڵیشەوە. بە خەیاڵ لێ کردنەوەشی، دڵ دەسووتێ. لەو دەمەدا دڵدار بەرانبەر بە یارە و بولبولێکە بەرانبەر بە گوڵی دڵە، لە ترسی جودابوونەوە، وەکوو تووتاک، وەکی گۆیین، شەو هەتا ڕۆژ دەناڵێنێ و بیری لە شوێن پێک نەبڕانە.

**مەلا**: بە بیری من، دیتنی یار لە دوورییەکەی چەتوونترە. تیشک و تیرێژی

جوانییەکەی، دلدار بەرەو خۆ دەکێشێ و حالی لێ دێ و بە یەکجارەکی دەشێوێ. تۆ لە پەپوولە بڕوانە! کە مۆم هەلبوو، چی بەسەر دێت؟

**فەقێ**: برووسکەی ئەوینێ تیژ دێ. پەپوولە بێداروبار و خۆنەگرە. ژیانی لە بەرچاو دەکەوێ و بەرەو مەرگ پەلە دەکا. ڕاناوەستێ تا لە کوورەی دلداریدا بتوێتەوە و پاکژ ببێ و ئەوسا بگاتە ئەوپەڕی ئاواتێ دیتنی دلبەر.

**مەلا**: پەپوولەی ژار، بۆیە بە تیشکەوە دەچێ تا بسووتێ، دەیەوێ بگاتە ئەوجێ کە سەرچاوەی ئەو تیشکەیە. ژیانی دنیا تەبا دەدا، تا بە دیداری پاکی خوا چاو ڕوون وەکا و ئەوسا لە نوێ بژیتەوە و تازە هەرگیز نەمرێتەوە.

**فەقێ**:
حەیات ل بال من وەسلە — دو لات گەر ببن لاتەک
موراد ب خۆ هەر ئەسلە — تێکدا ببن سیفاتەک
ژ هەڤ ئێک نەبن فەسلە — واحید بمینت زاتەک

**مەلا**:
واحید زاتە کە فەردە — تەجەللا دا سیفاتان
ل عەینێ دل نەزەر دە — ل جوملە تەعیناتان
تەوەهوم بوویە پەردە — ب ئیسمێ بت و لاتان

**فەقێ**:
لا ت ژی سوورەتەک حەقە — ژ ئەسمائێن حەقانی
ل بال من موحەققەقە — د نیڤ کەشفا سوبحانی
لاهووتە هەر موتلەقە — د ناسووتا ئینسانی

**مەلا**:
ئینسان ب من ناسووتە — گەوهەر دنێڤ سەدەفێ
ژ عیلما جەبەرووتە — شەمس هاتییە شەرەفێ
«تَنَزُّل» ژ لاهووتە — مەحبووبە جام د کەفێ

**فەقێ**:
کەفا کووزە و تاس تێ — نازک و سپی زەندن
قەدەحا مەیا خاس تێ — بنێرن تالب چەندن
ڤەخون ژ دەستێ راستێ — ب مەدحان مەحبووب خوەندن

**مەلا:**
وەسف و مەدحێن مەحبووبان — ل داغێت کول حەیاتن
قووتن ژ بۆ قلووبان — گولاف قەند و نەباتن
ژ نەغما مەدحێن خووبان — عاشق ب جەزبە هاتن

**فەقێ:**
عاشق ب وەسفو مەدحان — د فیراقێ د سەبرن
نەسیم بێت ژ وان تەرحان — بلبل نەشێ خوە بگرن
خوون دێ دەربت ژ جەرحان — دێ ب داغێن کول بمرن

**مەلا:**
بولبولێن وێ گولشەنێ — ژ ئەزەل ئەو دبێژن
تا ئەبەد ژ مەعدەنێ — گەوهەران دابرێژن
حەرفەک ژ وەسفان تنێ — عالەم تێک نابرێژن

**فەقێ:**
جەما کن تێک عالەمێ — حەمی‌یان ب ئوستاد کن
حەرف ژ لەوحێ قیدەمێ — ب شەرح و ب سەواد کن
نائیتە بەر قەلەمێ — بەحران ئەر ب میداد کن

**مەلا:**
نەسرین و گول تەبەقەک — سەحەر ژ باغێ گولان
ژ نەستەرەن وەرەقەک — بەسە مە ساحیبدلان
عورفە خواهی سەبەقەک — چێتر ژ سەد سجلان

**فەقێ:**
ئەحسەن ژ نوو سەبەقان — قەلەم ژ قەند و نەباتێ
ل سەر سەفحا وەرەقان — درێژن ئاوا حەیاتێ
دەس ب دەس ژێ تەبەقان — مەلەک دبن جەنناتێ

**مەلا:**
نقیسا تە عەنبەرن — زوباد و میسک پێژن
چ شاخێ نەیشەکەرن — قەند و نەبات درێژن
نوتقا تە خوە گەوهەرن — سەد بار گوهەر هاڤێژن

**فەقێ:**
گولم د دەستێ خاران — بیسمێ «موحەممەد» ناڤم
بولبولم دگولزاران — ژ عیشقێ لەو زەرباڤم
د زومرەیا میهرداران — تو رۆژی ئەز هەتاڤم

**مەلا:**
دوورم ژ گولێ ب خوناڤە — لەو زەر شوبهەتێ بیهم
سووسنا عەرەق تلاڤە — د فیرقەتێ دبرژهم
ل بال خودان دلاڤە — تو هەتاڤی ئەز سێهم

**فەقێ:**
بریندارێ عیشقێ مە — دوورم ژ سیها بێهان
زانن مەدداحێ کێمە — د هەزار و یەک و سێهان
سەناخوانێ «مەلێ» مە — لە هەموو عەرد و جێهان

**مەلا:**
هیندی کو د گازەهم — دکێشم سەبر و خێرێ
شوبهەتێ چەنگ و زەهم — هێلاک ژ دەربا تیرێ
سەناخوانێ فەقەهم — ئیرۆکە د جزیرێ

**مانای وشەکان:**

**کەف**: لەپی دەست؛ **جەبەرووت**: خاوەن دەستەلاتیی؛ **قووت**: بژیو؛ **نابرێژن**: نابژێرن؛ **میداد**: مەرەکەف، جەوهەر؛ **عورفە**: ناسیاوی؛ **سجل**: کتێب و سیایی؛ **سەبەق**: ملەکار و پێشکەوتوو؛ **زەرباڤ**: زەردەزێڕە؛ **تلا**: ئاونگ، شەونم؛ **د گازەهم**: گلە و داد دەکەم.

**پوختەی مانا:**

**فەقێ**: بە بیری من، چوونە لای یار، ژیانی ڕاستە. لەمپەر لە نێوان نامێنێ. دلبەری نوێنەری خوداش، هەر تێکەڵ بە ڕەگەز دەبێ. دلەتەپێ لە وەبەرهاتنی سیفەتانی خوایی- کە قەهر و گومڕا کردنە- لە ناو دەچێ و خاوەنی هەموو سیفاتان دەبێتە دۆست. ئەوسایە یەکتاپەرستی بەڕاستی بۆ مە دەست ئەدا.
**مەلا**: هەر زاتی تاقانەی خوایە لە سیفەتاندا دیار ئەدا. تۆ بە چاوی دڵ بڕوانە کە هەرچی خوا هێناویەتە ڕووکاری بوون، گشتی هەر خۆیەتی تێیدا- ئێمە چاومان تانە

بەسەر، تارمایی خەیاڵ دەبینێ. ئەگینا بتی سەردنیا -کە بتپەرست دەیپەرستن- تیشکی ناوێک لە ناوانی خودای تێدا و تیریژی ناوێک لێی داوە.
**فەقێ**: بەڵێ لای من ئاشکرایە و لە خواوە بۆم ڕوون بۆتەوە کە بتیش هەر کاری خوایە و دڵکێشیی خوا لە قاپێلکی بتاندایە. دەڕوانمە لەشی عیسانان، هەر خوا دەبینم و هیچی تر.
**مەلا**: عینسان وەکوو سەدەفێکە بۆ مرواری. هەر خودایە ئەو گەهەرەی دەو لەشە سەدەفە دایە. لە زانستی دەسەلاتداریی خواوەیە، خۆر تیشک ئەداتە دنیا و خوایە لە ناو پیاڵەی سەر دەستی یاری نازداردا، وەکوو بادە خۆ دەنوێنێ.
**فەقێ**: ئەو لەپە دەستە ناسکانەی لەو باسکە سپی و ناسکانە ڕاکشاوە و قومقومۆک و پیاڵەی مەی لەسەر دەبینرێ؛ بادەی تایبەتی دەگێڕی بۆ دڵدارانی تایبەتی؛ کە خوا باسی لە قورئانێدا هێناون و بە هەوالانی دەستەڕاست ناو براون. سا بڕوانە چەند لەوانە داواکاری خواردنەوەی ئەو مەیە پاکەن. چۆن سەرخۆش و گەشکە دەبن و بە یاری گەورە هەڵدەڵێن؟!
**مەلا**: پەسن و پێ هەڵگوتنی یاران، داغ و برین ساریژ دەکەن؛ دڵیان پێ دەبووژێتەوە؛ وەک شەربەتی حەکیمانن. لە ئاوازە و سۆزەی پەسنی جوانان، دڵدار جەزمە دەیانگرێ.
**فەقێ**: دڵدار بە باسکردنی یار، سەبوورییان لە دووری دێت؛ بەلام لە دیداردا نازانم چۆناوچۆن خۆ رادەگرن؟ سروە بە چڵی نازکی باڵای ئەودا ڕاببوورێ و لە بولبول دات، خوێن لە برینانی سەردەکا و لە کەسەران خۆی پێ ڕاناگیرێ و دەمرێ.
**مەلا**: بولبولانێ کە دڵداری باغچەی پڕ لە گوڵی خوایین، لە ڕۆژی بناوانەوە تا هەتایە لە پەسنی جوانیی بنچێنە و هەرەپێشوو، بە باران گەوهەر هەڵڕێژن. نەک هەر ئەوان هەموو دنیاش وێڕای ئەوان، پەسنی بدەن، یەک لە هەزاری ئاکاری وەدەر ناخەن.
**فەقێ**: هەموو دنیایە خڕ وەکەن، دەرسیان بدەن، ببنە فێر کار و کارامە و خۆ خەریک کەن، تاقە پیتێک لە تەتەڵەی پەسنی خودا شەرح کەن و بنووسنەوە، ئەگەر هەموو دەریاکانیش مەرەکەف بن، هێشتان لە وزەیان بەدەرە.
خوا بە پێغەمبەری فەرمووە: «بڵێ ئەگەر دەریا مەرەکەف بێ، بۆ نووسینی وتەی

خودام، ئاوی دەریا وشکاوی دێ، بەر لەوە فەرموودەی خودا ببڕێنەوە، تەنانەت ئەگەر دەریای دیش بێنە یاریی.»

**مەلا**: یا تەبەقێک لە پەڕی گوڵ و نەسرینان لە باغی گوڵان بچنرێن، بۆ خاوەن دڵی وەک ئێمە، تەنیا پەلکە نەستەرەنێک بەسە و هیچی ترمان ناگەرەکە. پێشڕۆییەک بەرەو ناسینی خوای مەزن، لە سەد کتێبان چاکترە.

**فەقێ**: ئافەریم بۆ تۆی پێشکەوتوو! قەڵەمت قەند و نەباتە و ئاوی حەیات دەڕژێنێتە سەر رووپەڕان. فرشتەکان هەر بە تەبەق بۆ دیاری دەیبەنە بەهەشت.

**مەلا**: نووسراوەکانت عەنبەرن؛ میسک و زەباد دادەبێژن. وەکی لقەنەی شەکەرن، هەر شیرنایەتیان لێ دەڕژێ. گفتت سەرتاپا گەوهەرن و سەد بار گەوهەر هەڵدەڕێژن.

**فەقێ**: من گوڵم لە ناو دڕکاندا، ناویش نراوم «موحەممەد». بولبولێکم لە گوڵجاڕان. گڕەی ئەوینێ لێی داوم؛ بۆیە وا زەرد هەڵگەڕاوم و هەر بوومەتە زەردەزیڕە. لە ناو کۆمەڵی دڵداران، تۆ خۆری و من وەک هەتاوم.

**مەلا**: دوورم لە گوڵی بەئاونگ؛ بۆیە وەک بەهێ ڕەنگزەردم. ڕووسوێسنەی ئارەق شەونم، لە من دوورە و لە دەردی دووری برژاوم. لە لای خاوەندڵانەوە، تۆ خۆرەتاوی من سێبەر.

**فەقێ**: برینی ئەوینم لێن و لە سای بەیان دوورەبەشم. لە هەزار و سیویەکدا، دەزانی پەبسنی کێ دەدەم؟ ئەمن پەسنبێژی «مەلا»م. لە هەموو هەرد و هەر جێیەک.

**مەلا**: هەمیشە داد و هاوارمە. سەبر دەکەم؛ سەرگەدانم. وەکوو چەنگ خوار بوومەتەوە. وەک ژێ بارێک و بەپێچم. بە زەبری تیران هیلاکم. وا ئەمڕۆ لە جزیرێدا منم پەسنبێژی فەقێ.

**سەرنجێکی هەژارانە**

زۆر جار دیوانی شاعیرێک، یان پەخشانێک لە نووسەرێک، هەرچەند ئەمدیو-ئەودیو دەکەین، کەم وایە کەمایەسیمان بێتە بەرچاو. جا نەخوازە ئەو دیوانە یان پەخشانە، بە ناوی پیاوێ بەناوبانگ، بەناوبانگ بێ.

بەلام وەرگێڕ- کە هەموو وشە و دێڕێکی بەوردی ورد دەکاتەوە و دەیئاژنێ- هەر پووشێکیشی تێدا بێ، دیمەنی لە چاو گوم نابێ و زۆر بە زۆپی خۆ دەنوێنێ و زوو دەتوانێ ساغ و ئەیاغ لێک هاوێر کا.

زۆر شێعرم لەم دیوانە دین ئەگەرچی زۆریش ناسراون، بە هی جزیریم نەزانین. جزیری لە وردەکاریی شاعیرانە، هیچ‌کەس تۆزی نەشکاندووە؛ قافیەی زەدەداری نەبووە. لە کێش و ڕەوتی شێعردا، کەمتر شاعیری گەیونێ. هۆی ئەمەشە کە چوار سەدە لە سەر دەموزاران ماون و نەفەوتاون.

جا هەروەک چیرۆکی «جامی» کە دابەزی و کەرەکەی خۆی بەرهەلدا کرد؛ گوتی ئەمەش بۆ خواجە بێت؛ جەزیریش لە شاعیریدا گەیوەتە پلە و پایەیەک، هەر مەلایەک لە دوای جزیری هاتبێ و شیعری وتبێ، کز یان قەلەو، شل یان پتەو، چاری ناچار ڕەگەل سامانی ڕەوانی مەلای جزیری کەوتووە. هێندێکیش هەر سیرمەخۆر بوون؛ لاسای ئەویان کردۆتەوە؛ ویستوویانە لەنجەولاری کەو فێر ببن، ڕەوتی خۆشیان لێ تێکچووە. ئیتر پیاوی کۆلکەخوێندەواری وەک خۆم، هەمووی بە ناوی جزیری وەرگرتوون و بە ممبارەکی زانیون و دەناو دیوانی ئاخنیون. چوارسەد سال لەم دەست بۆ ئەو دەست، ئال‌وگۆڕیان پێ کراوە. وەها تێک هەلشێلدراون و لێکدراون، فیلم دەوێ وەیانناسێ. بە بڕوای هەژارانەی خۆم، لەوانەشا، کە لە پێشوودا نووسیومن، هی وا هەیە ئاوەکی بن. بە پێی توانای هەژارانەم، وا هێندێکم هەلبژاردوون و بە دوای دیوانم ئەسپاردوون. ڕەنگە زۆر کەس دەگەل منا هاودەنگ نەبن و هەر بە شیعری مەلای جزیری بزانن. لاشم وایە کەسانێکی چێژەی شیعری مەلایان باش بۆ دەرکەوێ، تێدەگەن بژارەکەی من بێ‌جێ نەبووە.

هەرچۆنێک بێت ئەمانەش هەر شیعری کوردین و کورمانجین و سامانی نەتەوایەتین. ئەگەر شیعری مەلاش نەبن، حەیفە ون بن.

سا وا ئێوە و ئەو شیعرانە کە بە هی مەلا زانراون و لە ناوەرۆکی دیواندا دەرخراون:

# غەزالی شەپال

۱ دل ژ من بر دلبەرەک زیبا قەبا
چەهف غەزال و پورشەپال و مەهلیقا

۲ نازدارە ئەو ل تەختێ دلبەری
دلروبایە، جانفزایە، رووحشیفا

۳ حۆرێ عەینە ئەز نزانم یا پەری
یا گولەک رەعنا ژ گولزارێ وەفا

۴ یارەب ئەو گولدەستەیێ باغێ ئیرەم
دوور نەبت ژێ هەرسەحەر بادێ سەبا

۵ سوڕگولەک من دی دگولزارێ ب مەش
لالە و رەیحان ل سەر تینە سەما

۶ سونبولێن رەعنا ل بەر تاقێ هیلال
وێ دکن سەعیێ ل سەر مەروە و سەفا

۷ نازکا من هەر دەما بێتن خەرام
سەد هەزار دل وێ ل پەی وێ دەر قەفا

۸ ئەز چ بێژم کو ل من لەعلێ دتە
پوڕ کرن بێ حەد ل من جەور و جەفا

۹ ئەی «مەلا» باوەر ب مەحبووبان مەکە
کارێ وان هەر ئەخزێ جانە بێ خەتا (بێ عەتا)

**پوختەی مانا:**

ئەو نازدارە -کە وا جوانە- دلی بردم. چاوکەژالە؛ خوێن شیرین و ڕەزا سووکە؛ چویتە سەر تەختی دلبەری. وەک دلبەرە؛ گیانپەروەرە و دەرمانە بۆ دەردی گیانم. نازانم حۆرییە یان پەری؟ یان چلەگولی ناسکە و لە گولزاری ئەمەگدارییەوە هێنراوە؟ خوایە ئەو یارەم -کە هەر وەک دەسکەگولێکی بەهەشتە- سەلامەت بێ و هەموو ڕۆژێ، سەرلەبەیانی بێتە دەر و لە بەر سروە، بسکەکانی بێنە لەرین.

چاوم لێ بوو کە یارم هات. دەتگوت گەشتر سوورەگولە و لە ناو گولزارا دەگەڕێ. بسکی وەکوو ڕیحانە بوو کە لە سەر گولەمێلاقە بێت و بچێت. زولفی جوانی لە ژێر کەوانەی برۆیان، وا دەزانی حاجین لە سەفا و مەروایە. یاری نازدار، بە لەنجەولار ئەگەر بڕوا، سەدهەزاران دل لە دواوە شوێنی دەکەون. لێوی ئالی زۆری دەرد و ئازار دامێ؛ بەلام ناتوانم هیچ بلێم. کاکە مەلا! باوەڕیت بە جوانان نەبێ؛ بە بێسووچ دلدار دەکوژن و دل دەستێنن و هیچ نادەن!

# جووتێك ڕووگه

آ شیوەیێ دلبەری بـزان سـوننەتە شـیوە عیشـوە فـەرز
هەردو نەزەر کو بن قیران واجیبە یەک کرشمە فـەرز

**مانای وشەکان:**

**شیوە**: ڕێوشوێن، داب ودەستوور؛ **شیوە**: خدە و خوو؛ **شـیوە**: نـاز و قـەمزە؛ **شـیوە**: فـێڵ و گزی؛ **شیوەگەر**: دلبەرێ کە زۆر باش لە بیچمی دڵدزین و دڵـداریی دەزانـێ؛ **عیشـوە**: بـە جۆرێک خۆ نیشان‌دان و بزووتنەوەی دلبەرانە کە دلدار وە تەماح بخا؛ **فەرز**: پێویستێکی بێ برانەوە لە کاتێکی دیاری کراو؛ **فـەرز**: مووچـە و بەشـی دیـاری؛ **فـەرزی**: جێگـەی ژێ لـە کەواندا؛ **سوننەت**: ڕوخسار و دەوری ڕوخسار؛ **سوننەت**: پەیڕەویی لـە ئاکـاری کەسـێک یـا کەسانێک؛ **سوننەت**: ڕەفتار، شەریعەت؛ **قیران**: لێک نزیـک بـوون، بەرانبـەر بـوون؛ **نـەزەر**: ڕوانین؛ **واجب**: لازم و پێویست؛ **واجب**: لەرزین کە زۆرتر بۆ دڵ دەگوترێ.

**پوختەی مانا:**

کاکی ڕێبوار! تۆ کە تازە گەیشتوویە کاروانی دلدارانەوە و دەتەوێ لە ڕێـی دڵـداریی شارەزا بی، با پێت بڵێم ڕێوشوێنی دڵـبەران چۆنـە؛ لـە بارەگـای دلداریشـدا چەنـد سوننەت و فەرز هەیە: ناز کردن و خۆ بواردن و تەوس‌وتوانج تێ‌گرتنی دلدارانە، شێوە و ڕەوشتی یارانە. بەڵام هەموو دەمان نییە. جار هەیە دەرت دەکەن و جـار-جـارەش دەتلاوێننەوە و ئەمە بە سوننەت حیسابە. بەلام وەک فەرزە لە سـەریان کـە بـە لار و لەنجەیان و چاوداگرتن و بزەیان، دلداران شێت و هار بکـەن و دیـن و دنیایـان تـالان کەن. جا هەرگا تووشی یار هاتی و نیگات بەرانبەر نیگـای بـوو، دەبـێ زۆر ئاگـات لـە خۆت بێ؛ لەوانەیە دڵت دالەرزێ، بکەوی. یار ناهێڵێ لەبەین چی. ناز و چاوداگرتنێکی

پرپەزەیی -کە بە مووچە دەیدا بە دڵداری ترساو لە چاو- گورجــێ دەتبووژێنێتــەوە و مردووش بی، دەتژێنێتەوە.

٢ هەردو قیران (قەران) کو قیبلە بن هەرچی دەما خویا بن ئــەو
وێ سەعەتێ د دینێ عیشق لازمە یەک دو سەجدە فــەرز

**مانای وشەکان:**

**قیبلە**: ڕووگە؛ **خویا**: ئاشکرا؛ **لازم**: پێویست؛ **قەر**: ڕەش.

**پوختەی مانا:**

ئایینی دڵداران دەڵێ: کە چاوت بە یار دەکەوێ و چاوتان دەیەکتر هەڵدەنگوێ، وەک بەرانبەر بوونی ئەستێرەی بەودم و پیرۆز دەگــەڵ سیسەئەســتێرەیەکی بێرونــاکیی و پیت وەهایە. تۆ بە ڕوانین چی دەبینی؟ دوو ڕووگەی لە بیچمی میحراب کە تاقی دوو برۆیەتی و خاڵێکی ڕەشیش دەبینی کە وەک بەردی ماڵی کابــە، دەبــێ کرنۆشــی بــۆ بەری و ئەگەر دەستیشت نەیگاتێ، لە دوورەوە ماچی بکەی. کە وا بوو دەبێ سوژدە بۆ ئەو تاک و جووتە بەری. یاخۆ سوژدەی سوپاس بەری کــە بــەو دیــدارە گەیشــتووی و ڕکاتێک نوێژ بەرەو میحرابی ئەبرۆکەی دابەستی؛ کە دوو سوژدەی تێدا هەیە.

٣ خەرقەیێ زەرق و ژەنگێ زوهد من ب مەیێ موغانە شوست
شوستوشووێک د مەیکەدێ ئەووەلێ کار فەرزە، فەرز

**مانای وشەکان:**

**خەرقە**: باڵاپۆشی پڕپینەی سۆفیان؛ **زەرق**: حیلە و مەکر؛ **مەی موغانە**: شەرابی کۆنی تایبەتی مەلاکانی زەردەشتی؛ **شوست وشوو**: شیو و کوڵ؛ **مەیکەدە**: مەیخانە.

**پوختەی مانا:**

لەو مەیخانەی- کە تایبەتی دڵدارانە- پیس و پۆخڵ ڕێگە نادرێن. گەرەک زۆر پاک و خاوێن بین. تــا بتــوانین دەســتەوداوێنی مەیگێــڕ بــین. هــەلێک بەســەرمان‌کاتەوە و

ئاورێکمان لێ بداتەوە. جا من چونکە زۆر باشم سەر لێ دەردەچوو، کە یەکەم کار شیو و کوڵە، سەرجلە پینەدارەکەی گزیکاریی و وشکەسۆفییەتی ژەنگاویم، بە بادەی موغانە شوشت و ئەو فەرزە یەکجار پێویستەم بەجێهێنا. تا ڕێم دەن بچمە ژوورەوە.

۴ نەیشەکەرێن شیرین زەبان مەست ب جـام و بـادەیێن
فەرزە دبت ژ تەوبە بێ سـالیکێ عیشـقێ تەوبـە فـەرز

**مانای وشەکان:**

**سالک**: ڕێڕەو.

**پوختەی مانا:**

هەرگا باڵای بەلەنجەولار وەک قامیشەشەکری شلک و بێگرێ و شـیرینبار، پیاڵـەی بادە لە سەر دەستان و خۆشیان مەست و بە دوو چاوی مەستیشیان هانـەمان بـدەن، بادەیان لە دەست وەرگرین و بخۆینەوە، ڕێڕەوی ڕێگای دڵـداریی -کـە هاتۆتـە تۆبـە کردن- تۆبەی هەرە پێویست و فەرزی ئەو حانەی، تۆبە لە تۆبە کردنە و بادەی دڵبەر وەخواردنە.

«پیرەمێرد» دەڵێ:

شکەنجی زولفی تۆبەی پـێ شـکاندم تۆبـە بـۆ تۆبـە
دڵی شیخ و ملی مول تێکشـکا هـەر بشکەنە ئەمشـەو

۵ ساقیێ سـیمسـاقێ مـا زەهـرێ هـەلاهیلی ب دەسـت
جانێ مـە شـوکر و میننەتـە تیزرەوانـە رەقـس فـەرز

**مانای وشەکان:**

**سیم**: زیو؛ ساق: پووز و بەلەک؛ **هەلاهیل**: ژەهری گیایەکە؛ **تیـز**: تیـژ لـەتام یـان لـە ڕۆیشتندا؛ **رەوان**: گیان؛ **رەوان**: بەڕەوت؛ **رەوان**: ڕووناک؛ **تیزرەوانە**: ڕۆیشتنی بەتاو.

**پوختەی مانا:**

ئەو مەیگێڕە دیدەمەستە، بە پووز و بەلەکی زێوین، بە پیاڵەی پڕ لە بادەوە بگەڕێ و خولقمان بکات، چۆن دەتوانین تۆبە ڕاگرین و پێ داگرین، کە مەی ناڕەوایە و ناخۆین؟ لێی وەردەگرین؛ ئەگەر ژەهری هەلاهیلیشی تێدا بێ دەیخۆینەوە و بەغار دەڕۆینە ناو کۆڕی هەڵپەڕکێوە و پێویستی سەرشانی دلدار، بە جێ دێنین. با سەماکەش وەک هەڵبزۆقین و ڕەقسی گیانەلاوی سەربڕاو بێ. زۆریش سوپاس لە مەیگێڕەکەمان دەکەین، کە لە جیاتی عیزرائیل خۆی گیان‌کێشمان بێت.

٦ خال ئەگەر ب وەجهەکی بێتە قیرانێ ئەبروان
شوبهەتێ بەیتێ مەقدیس و کەعبە دبن دو قیبلە فەرز
(یان: دو قوبلە فەرز)

**مانای وشەکان:**

**وەجە**: ڕوو؛ **وەجە**: لا؛ **وەجە**: تەرح، جۆر؛ **بەیتی مەقدیس**: ماڵی پیرۆز، بەیتولموقەددەس، قودس، کە شارێکە و ڕووگەی کۆنی موسوڵمانان و ڕووگەی ئێستای خاچپەرست و جولەکانە؛ **قیبلە**: ڕووگە؛ **قوبلە**: ماچ.

**پوختەی مانا:**

ئەگەر جارێک بۆ دلدارێک وا هەلکەوێ، خاڵی ڕەشی لای گۆشەی باڵای چاوی یار، کە کەوتۆتە نزیک برۆکەی، ببینێ و دیارە وەک دوو ئەستێرەی پیرۆز و زۆر بەودمی چاو پێ کەوتبێ، وەهایە. نەک هەر ئەستێرەی بەودم، بگرە وەک دوو قیبلەی ئێستا و کۆنی موسوڵمانانی دیتبێ، لەسەریەتی کە کڕنووش بۆ هەرکان بەرێ و دووراودوور ماچیان بۆ بنێرێ.

٧ ئەز کو د دەعوی عاشقی کفشە دکت زەبان دەرەو
کەتمێ شەهادەتێ دبت وێ سەعەتێ ب شەهدە فەرز

**مانای وشەکان:**

**دەعوی**: داوا؛ **کفشە**: کەشفە، مەعلوومە؛ **دەرەو**: درۆ؛ **کەتم**: وەشارتن؛ **شەهادەت**: شایەتی، گەواهی؛ **سەعەت**: دەم و کات.

**پوختەی مانا:**

ئەمن کە دەڵێم دڵدارم، بۆ خۆم دەڵێم. ئەگینا هێشتا کاڵم و نەگەیشتوومەتە ئەو پلەی کە ئەو نازناوە لە خۆم نێم. ئەگەر بە زمانی خۆم گوتم من دڵدارم، دیارە زمان درۆ دەکا. ئەگەر شایەتی لێ نەدەم کە زمانێکی درۆزنە، لە فەرزێک وازم هێناوە. چۆن لەسەر هەرکەس پێویستە کە دیتی درۆیەک دەکرێ و خەڵک باوەڕی پێ دەکا، دەبێ درۆزن ڕسوا کا و درۆکانی ئاشکرا کات.

٨ جەبهەت و دێم و گەردەنێ پەردە دەما ژ بەر بەرت
فەرزە «مەلا» ل حاجیان سەعی و تەواف و عومرە فەرز

**مانای وشەکان:**

**سەعی**: ڕۆیینی بە پەلە، نیوەغار؛ **تەواف**: دەدەورە گەڕان؛ **عومرە**: ئاوەدانی، گورگەلۆقەی نێوان گردی سەفا و مەروا کە لە مەککەن و گەڕان بە دەوری کابەدا و زیارەت کردنی ماڵی خوا کە پێی دەڵێن «عومرە» لە کاتی حەج لەسەر حاجییان فەرزە بیکەن. بەڵام عومرە لە وەختی تریشدا دەبێ و فەرز نییە؛ **سەفا**: بەردی لووسی سپی؛ **مەروە**: گیایەکی بۆنخۆشە.

**پوختەی مانا:**

هەرگا یارم پەردە لادا و هەنیە و گەردن و ڕوومەتی بێنە بەرچاو، حاجی حەجیان لێ دەکەوێ. توێڵی وا پاک، کەزی و بسکی بەبەرامە، کولمی وەکوو کابە ڕووگە. خاڵی ڕەشی ئەو بەردەیە حاجیان لە دووراودوورەوە ماچی دەکەن، هەر دیداری لە عومردا عومرەیەکی زۆر پێویستە.

## دین‌بەر

١ وەللەھ ژ هەردو عالەمان من حوسنێ جانانە غەرەز (غَرَض)
لەو من ژ حوسنا دلبەران هەر سونعێ رەحمانە غــەرەز

٢ ئەو کافرێن جامە سیا هاتن ب هەڤرا ســەف ب ســەف
زانم کو هەر تێن ئەو مەدام وان ئەخزی ئیمانە غــەرەز

٣ ئیرۆ دلێ مــن دلبــەران ئاڤــێتنە ســەر ســەد پــەنگران
ئانین مەیا گولگون و ساف دان من کــو بریانــە غــەرەز

٤ بشاهێ بهەڤرا هەمنشین رەنگ و روێ هەڤ مە نەدین
هەریەک تەماعەک بوو ئەڤین لەورا کو پرخوانە غەرەز

٥ عەقل و دلێ من بر ئەوان شاهان ب رەمز و عیشوەیان
وان عەقل و دل ڤێکرا دڤێن لەو ئەخز و ئیعتانە غــەرەز

٦ من گۆ گەلۆ ئەی دلروبــا فیتنــا رەقیــب فەیــدە هەیــە
گۆ سوند ب حوسنا من کو نە لێ فیعلێ شەیتانە غەرەز

٧ ئەو سونبولێن بوو عەنبەرێ رەیحان بنەفش و عەرعــەرێ
لەو تێن ب دیمێدا ب لەز وان سەیر ل نیشانە غــەرەز

٨ خــالێن مــدەووەر فلفلــین مــاوەر ژبســکان لــێ وەریــن
زولفێن پەریشان تێنە مەست بێهنــا بێهــا وانــە غــەرەز

٩ دل‌گرت ب داما سونبولان بەردا و دیســا حــەبس کــر
میرە کــو ئــەو هــەر دائیمــا گــرتن و بەردانــە غــەرەز

١٠ زان عیشوەیان دل هەررشاند سەرتیر ژ خوونێ نەقشـاند
لەو ئەز دبێم جانێ مەلێ ئـیرۆ تـە قوربانـە غـەرەز

**مانای وشەکان:**

**دو عالەم**: دنیا و قیامەت؛ **رەحمان**: ڕۆزیدەر، ناوی خوایە؛ **ئەخز**: ساندن، گرتن؛ **غەرەز**: مەبەست؛ **پەنگر**: پۆلوو؛ **ئیعتا**: دان؛ **گەلۆ**: هەیاران، ئاخۆ؛ **فیعل**: کردە؛ **بێهنابێها**: بۆنی بێیان، بۆی بەیگەل.

**پوختەی مانا:**

خوا ئەیزانێ لە سەر دنیا و قیامەتیش، جوانپەرستم. لە جوانییەوە دەسکاری خوام دێتە بەرچاو. کەزیەی یارم- کە وەک کافری جلڕەشن- ڕیز بە ڕیز، دەوری ڕوویان‌دا. ئەو ڕوخسارەی وەک نووری ئیمان ڕووناکە؛ بەڵێ کافر ئیمان‌گرە و ئاین‌بەرە.
دڵم بۆ ئەوینی کولمەی بەگرشە و ئاڵ، چز و هۆڕییە و لە سەر سەد پەنگر هەڵدەکزێ. مەی ئەوینیشم پێ درا؛ دیارە مەبەست کەباب کردنی بوو کە دڵ بۆ دوو چاوی مەستی ببتە مەزە.
لە ناو یاراندا دانیشم بە بێئەوە هیچمان یەکتری ببینین، سفرەی ئەوین بۆ دڵبەران و دڵداران زۆر بەپیتە و هەریەک جۆرێک ڕازی دەکات. ئەوان ناز دەدەن بە ئێمە و دڵمان دەبەن. هەر خەریکی ئەو مامڵەن؛ ناز دەدەن و دڵ دەستێنن. پرسیم ئاخۆ ئاژاوەنانەوەی شوفار، زیانێکی بۆ ئێمە هەیە؟ گوتی: نا. تەنیا کارێکی شەیتانییە کە چاونەزێران فێری بوون.
بسک و کەزی -کە وەک سونبول و وەنەوشەن- لەو باڵا وەکوو عەرعەرە، هەمیشە بۆ دینی خاڵان، بە تاسەن و بە پەلە دێنە سەر ڕوخسار، تا تێر لە خاڵان بڕوانن.
ئەو بسکانەی، خاڵە وەک ئیسۆتەکانیان، بە گوڵاو تەڕ کردۆتەوە. پرچەکانیش- کە سەریان گەیاندۆتە سینگ- بۆ هەڵمژینی بەرامەی مەمکی وەک زەردەبەی هاتوون.
دڵم بە بسکانی دەگرێ و بەری دەدا و دیسانیش دەیگرێتەوە. میرایەتی خۆی دەنوێنێ، کە خاوەن بگرە و بەردەیە. بە ناز دڵی هەنجنیوم. تیری بە خوێنم شەلاڵن.
بۆیە دەڵێم گیانی مەلا! تۆ ئەتەوێ گیانی مەلا قوربانت بێ و دڵشادم بە قوربانت بم.

# جنّةُالمأوی[1]

۱ یــارَبْ ایــن گُلدَســتەای یــا نَــرگِسِ رَعْناســت ایــن؟
سَــروِ گُلْشَــنْ یــا اَلِــفْ یــا قامــتِ رَعْناســت ایــن؟

۲ ایــن مَلَــک یاشــاهدِ قُدســی اســت یــا مــاهِ فَلَــک؟
حــور یــا روحُالْقُــدُس یــا نــورِ چَشْــمِ ماسـت ایــن؟

۳ کَوْکَــبِ صُــبحَ اســت یــا خورشــید یــا دُرِّ یَتــیم؟
یــا تَــنِ ســیمینبَرَی یــا گَــوْهَرِ والاســت ایــن؟

۴ عــارزَ اســت ایــن یــا شُــعاعِ شَــمْس یــا بَــدرِ مُنیــر؟
لالــه یــا نَســرین و گُــل یــا بــادەی حَمْراســت ایــن؟

**مانای وشەکان:**

**این**: ئەمــە؛ **گُلْدَسْته**: چەپکــەگوڵ؛ **قامَت**: بــەژن؛ **ماهِ فَلَک**: هــەیڤ؛ **روحُالْقُـدُسْ**: جوبرائیل؛ **کَوْکَبِ صُبح**: ئەستێرەی کاروان کوژە؛ **دُرِّ یَتیم**: مرواری تاقانە؛ **تَـنْ**: لــەش؛ **سیمین**: زێوین؛ **بَرْ**: میوە؛ **بَرْ**: سینگ و بــەرۆک؛ **والا**: جێگــەورە؛ **عـارِز**: لاڕوومــەت؛

---

۱. شیاوی باسە: شیخ عەبدورەحمانی جامی (۸۱۷– ۸۹۸ کوچی) قەسیدەیەکی وای هەیە کە شاعیر تەواو داویەتە سەر شۆپی و دەمەلاسکەی کردۆتەوە.
سەرەتای قەسیدەکەی «جامی» بەم بەیتە دەس پێ دەکا:

عارِضْ استْ این یا قَمَرْ یا لالەی حَمْراست این؟ — یا شُعاعِ شَـمْسْ یا آییـنەی دِلْهـاست این؟

بەم بەیتەش دوایی پێ دێنێ:

قُـمـریِ بـاغِ جـنـان یـا بُلْبُـلِ بیخـانـمـان — طوطیِ شکَرشِکَنْ یا «جامی» شیداست این؟

«هەژار»

**شُعاع**: پرشنگ؛ **مُنیر**: ڕووناکی‌دەر؛ **لاله**: گوڵەمێلاقە؛ **حمرا**: سوور؛ **است**: پاشبەندی خەبەردانە، وەک «س» یان «یە»ی کوردی وایە؛ **این است**: ئەمەس، ئەمەیە.

**پوختەی مانا:**

ئەی خوایە! سەرم سوڕماوە نازانم ئەوەی دەیبینم، یارەکەمە یان چەپکەگوڵ؟ یان نێرگزی شلکو بەلارولەنجەیە؟ ئەو بالایە، سەوڵە لە ناو باغ ڕواوە؛ یان پیتی ئەلفە وا ڕاستە؟ یان بەڕاستی هەر بەژنی یارەکەی منە کە لە دنیادا تای نییە؟ ئاخۆ ئەمە فرشتەیە؟ یان دڵبەرێکی پیرۆزی خوداییە؟ یان هەیڤە لە ئاسمان دیارە؟ نازانم حۆری بەهەشتە؟ یان فرشتەی ولامبەرە؟ یان هەر سۆمای چاوی خۆمە؟ ئەستێرەی کاروان کوژەیە؟ یان خۆری بە تیشک و تاوە؟ یان مرواری تاقانەیە؟ یاخۆ لەشی میوە زێوە و بە ڕووی وەکوو زێو، دەتروسکێ؟ یان هەر پرشنگێکە لە خۆر؟ یان مانگی چاردەی بە تریفە؟ لێوەکان و سەری کولمە ئاڵەکانی و سپیی لاجانگ؛ گوڵی گوڵاو و نەسرین و مێلاقەنە؟ یان بادەی ئاڵ؟

| | |
|---|---|
| ۵ | سُنبُلِ تَر یا بَنَفْش، یا سوسن و گُل‌چیچَکە؟<br>زُلف یا مُشک خُتَنْ، یا صورتِ تُغراست این؟ |
| ۶ | غمزه این یا گَزمە این یا تیر یا سحرِ حلال؟<br>ساحِر این یا چشمِ شوخِ تُرکِ بی‌پَرواست این؟ |
| ۷ | میم یا یاقوت یا سَرچشمەی آب حیات؟<br>حُقّەی دُردانە این یا لعل شکّرخاست این؟ |

**مانای وشەکان:**

**سونبول**: سمڵ؛ **بَنَفش**: وەنەوشە؛ **سوُسَن**: سوێسنە؛ **گولچیچَک**: گوڵی پشکۆتوو؛ **خُتَن**: ولاتێکە بە ئاسکی میسک ناسراوە؛ **صورت**: شکڵ؛ **توغرا**: مۆری سوڵتانان؛ **بی‌پروا**: بێ‌ترس و گوێ‌نەدەر؛ **حوققە**: قوتوولکە؛ **دوردانە**: مرواری بێ‌وێنە؛ **دوردان**: مرواری‌دان؛ **شکّرخا**: شەکرکرۆژ.

**پوختەی مانا:**

سملّی‌تەرە؟ یان وەنەوشە و گولّی پشکووتە و سویسنەیە؟ مۆری پرپێچ و جوانی سولّتانانە بە میسکی خوتەن نووسراوە. یان کەزیەیە؟ شتێک وەک تیر، بەر هەناوی دلّ دەکەوێ. تیری سیلەی چاوی تۆیە، یان جادووی ئەو چاوانەتە؟ کە جادوو لە دلان دەکەن. وەک تورک بێ‌ڕەحم و بەزەن و گوێ نادەنە هەناسەی دلّی برژاوم. دەم و لێوتە من دەیبینم؟ یان قوتوولکەی لە یاقووتە و مرواری دەناو کراوە؟ یان لالێکە بە شەکراو ئاخندراوە؟ یان سەرچاوەی ئاوی ژینە؟

۸ خط، یا قوسُ دو نوُن مَکتوبِ مُشک آذفَرند؟
یا هلال عید یا آبروی بی‌همتاست این؟

۹ کوی او یا کَعْبە یا بَیتُ‌المُقَدَّسْ یا بِهِشْتْ؟
خُلد یا فردوس این یا جَنَّةُ‌المأواست این؟

۱۰ هاتفِ غَیبْ است این یا تُرجُمانِ روحِ قُدْس؟
بُلبل شیداست در گلزار یا «مُلاّ»ست این؟

**مانای وشەکان:**

**مکتوب**: نووسراو؛ **آذفر**: زۆر بۆنخۆش؛ **کوُ**: کۆلان؛ **او**: ئەو؛ **خُلْد**: بەهەشت؛ **فِردَوْس**: بەهەشت؛ **جَنَّةالمَاوی**: بەهەشت؛ **هاتِفْ**: دەنگی بێ‌ڕەنگ؛ **تَرْجُمان**: وەرگێڕ، دەمراست؛ **شەیدا**: شێت و گەللایی.

**پوختەی مانا:**

شکلّی دوو نوونی سەرەوژێر، وەکوو کەوان دێنە بەرچاو. خەتەکەیان ئاخۆ بە میسکی زۆر بۆنخۆش نووسراونەوە؟ یان نوون نین و مانگی لەنوێن، کە مزگێنی جێژنی پێوە؟ یان خۆ برۆ بێ‌وێنەکەی تۆنە. شوێنێکی زۆر پیرۆز دیارە. لێم گۆڕاوە: مالّی «بەیتولموقەددەس»ە؟ یان کابەیە؟ یان بەهەشتە؟ یاخۆ هەر کۆلانەکەیە کە مالّی ئێوەی تێدایە؟ گوێم لە دەنگێکە زۆر خۆشە و خاوەنی دەنگ ڕەنگی نییە؛ فرشتەیە لە نەدیارەوە بانگ دەکا؟ یان وەرگێڕی فەرمایشتی جوبرائیلە؟ یان بولبولی لێ‌شێواوە لە گوڵجاڕا شیوەنیەتی؛ یان هەر مەلاکەی خۆمانە و شیعری خۆی دەخوێنێتەوە؟

# هەر تۆم بەسە

١ کەس نەدیە سەحەرگەه کو چ نـازک وەرەسـی تـو
مە ژ بەلگێ گول و نێرگزێ سەرمەست بەسی تـو

٢ زانم نـەتنێ کـو یـەدێ بـەیزا تـو د دێـری
وەر خوەش کە شەهیدێن خوە کو عیسانەفەسـی تـو

٣ ڕۆحی تو نـە جیسـمی ژ جـەمالێ ب چ ئیسـمی
ڕەنگ، ڕەنگ ت بی کەشف و شهوودێ چ کەسی تو

٤ ڕۆژێ تو ل شـەرقێ ب جـەمالا خـوە د بـەرقێ
بیللەه کو ژسەرچەشمەیێ ئەقدەس قەبەسی تـو

٥ بیللـەه ژ چ نـووری و تەجـەللا ل چ تـووری
گەهگەه ل سەراپەردەیێ جـان مولتەمەسـی تـو

**مانای وشەکان:**

**وەرەس**: گوڵێکی سوورە، بۆ ڕەنگ دەکار دەکرێ؛ **یـەدی** بـەیزا: دەسـتی سـپی کـە مۆجزاتی موسا پێغەمبەر بوو؛ **تبی**: دەبێ؛ **شهوود**: حـازری، دیـاری؛ **چەشمـە**: چـاوە، چاوەی ئاگر یان ئاو؛ **قەبەس**: بزووت؛ **ئەقدەس**: هەرەپیرۆز؛ **مولتەمەس**: داواکراو.

**پوختەی مانا:**

وەک من تۆم دی لە بەیاندا، کەس نەیدیتووی. کێ دەزانێ تۆ گوڵێکی چەند ناسکی؟ لە پەڕەی گوڵ و نێرگسی کاڵ و مەستەچەم، وازم هێنا و هەر تۆم بەسی. مـن دەزانم دەستەکانت وەک دەستە سپییەکەی مووسا، مۆجزاتن بۆ ئەوانەی پێت کافرن. بـەڵام دەشزانم هەناسەت وەک هەناسەی عیسا وایە؛ مردوو زینـدوو دەکاتـەوە. دەسـا وەرە

کوشتەی چاوە مەستەکانت بە هەناسەیەک زیندوو کەوە.
تۆ چیت؟! تۆ وەک ئێمە لەش نیت. تۆ گیانێکی لە جوانی درووس‌کراوی و نازانم ناوت بنێم چی؟ ناو بۆ لەشان دیاری دەکرێ؛ گیان هەر گیانە و ناوێکی تایبەتی نییە. مەگەر پێت بڵێم: گیانی جوان. تۆ هەردەمەی بە رەنگێک خۆت نیشان دەدەی. کێ دەتوانێ بێژێ من ئەو گیانەم دیوە؟ چوزانێ خۆت نەگۆڕیوە. هەر تۆی ڕۆژێ لە خۆرهەلات سەر دەردێنی و تیرێژ و بریقەت هەیە. سوێندێ دەخۆم، تۆ لە چاوگەی هەرە پیرۆزی بارەگای خودای مەزن، گڕەبزووتی و هاتوویە سەر دنیایە؛ تا دڵ و گیانێ دڵداران بسووتێنی. تۆ بی و خودا با بزانین تۆ چۆن ڕۆشنی و نووریکی؛ لە کام چیای توور خۆت دەرخست؟ گەلێک جاران لە بارەگای گیانی گەورە تۆیان دەوێ. ئاخۆ تۆ خۆری ئاسمانی، یان فرشتەی؟ هەر نەمزانی. حۆری لە ڕەگەزی پەری یان فرشتەی وەلامبەری خودا، خۆتی؟

٦ جانا جەرەس و رەهبەرێ عیشقا تە ئەزم قەت
ئاگەهـ ب فەغان و حەرەکاتێ جەرەسی تو

٧ ما یەک نەفسەک من دبتن بێ تو وجوودەک؟
دێ بێ تە چ بم؟ هەم تو رحی هەم نەفەسی تو

٨ عیشقا تە مە گۆ زێرسیفەت زەر دکرین گۆ:
ئیکسیرە ئەڤینا مە ب عەینێ وە مسی تو

٩ من‌گۆ ژ نیگاران تو گولی بەس ب شکوهـ بە
زانم نە موحیب هەر نەکەس و خاروخەسی تو

١٠ ئەی حوورسرشتێ ل مە خۆش مەی وەتە بەرکر
جەنناتە ویسالا مە و ئاتەشپەرسی تو

١١ من گۆ د شەڤان شوبهێ نوجوومان ب تەوافین
گۆ عیشوە دزانن ب چ قەست و هەوەسی تو

۱۲ من گۆ مە ب تیغان ڤەدی ناکن ژ دەرێ تە
گۆ ئەم ژ نەباتین و ل تەبعێ مەگەسی تو

۱۳ من گۆ ژ کەمەندا سەرێ زولفا تە ڤەرەستم
پەروازێ لەبێ لەعلێ مِە گۆ گەر ڤەرەسی تو

۱۴ یەکدەم ڤە نەهیشتین تە دهاموونێ فیراقێ
بێ هەمدەمێ دەردان گۆ: چ فەریادرەسی تو؟

**مانای وشەکان:**

**رەهبەر**: بەڵەد؛ **شکوه**: گەورەیی و جەلال و شەوکەت؛ **وەتەبەرکر**: وا لەپێشت داناوە؛ **جەننات**: باغات؛ **جەننات**: بەهەشتان؛ **نوجووم**: ستارەگەل؛ **ڤەدی ناکن**: دەر ناکەن؛ **ڤەرستم**: ڕەها بووم؛ **پەرواز**: کەنارە؛ **هاموون**: بیابان.

**پوختەی مانا:**

گیانە جوان و ئازیزەکە! من بوومە زەنگۆڵەی کاروان؛ بوومە شارەزای سەر ڕێگە. تۆ هیچ ئاگات لە هاوار و بزووتنی منی ژاری دڵدار هەیە؟ کە باسی جوانی تۆ دەکەم و ڕێڕەوان بە هۆی منەوە شارەزای دڵداریی دەبن؟ تۆ دەزانی من بە بێ تۆ تاوێک ناژیم و تۆ شک نەبەم، منیش هەر نیم؟ تۆ هەم گیانی هەم هۆی هەناسەدانمی.

گوتم: ئەوینی بالاکەت، ڕەنگی وەکوو زێڕ زەرد کردم. گوتی: ئەوینی بالای من وەک ئیکسیرە و دیارە تۆی مس دەکاتە زێڕ.

گوتم: لە ناو دڵبەراندا، هەر تۆی گوڵی هەڵبژاردەم. یاخوا هەر گەش و بەشکۆ بی.

گوتم: دەزانم ناتەوێ ئەوینداری ناکەس و دڕک و پووشان بی. من گوڵم و گش دڵبەری تر لەچاو من پووش و پەلاشن.

گوتم: هۆی بەچکە حۆرییەکە! بادەی خۆشت لە پێش دانام. چۆن ڕەوایە بیخۆمەوە؟

گوتی: لە ڕێگەی دیدارم، ئەگەر ئاگر بپەرستی، وەبزانە چوویتە بەهەشتێ.

گوتم: شەوانە تا بەیان، وەک ئەستێران چاو لێک نانێم؛ لە دەورەی بارەگاکەی تۆ هەر خول دەخۆم.

گوتی: نازی من دەزانێ تۆ لەم گەڕ و شەوبێدارییە چیت گەرەکە؟

گوتم: بە تیخ و بە چەقۆش، کەس ناتوانێ لە دەرگای تۆم دوور کاتەوە.

گوتی: بەڵێ من شەکرم و تۆش خۆت لێ کردوون بە مێش و دەورم دەدەی.

گوتم: ئۆخەی لە کەمەندی کەزیەکانت ڕزگاریم هات.

گوتی: ئەگەر لە کەناری لێوی ئاڵم ڕزگاریت بێ، سەر دەردەکەی.

گوتم: من لە بیابانی دووریتدا مابوومەوە و بە هاوارمەوە نەهاتی.

گوتی: یەکدەم نەمهێشتووە بێ هاودەم بی. دەرد و داخم بۆ کردبووی بە خەمڕەوێن لەو چۆڵگەیە. چۆن دەڵێی فریاڕەسم نیت؟

**١٥** من گۆ: ژ دلێ شوبهێ بخوور خوەش تە ب کەر کر
کەرکر ب دو لەعلێن خوە شەکەر گۆ: عەدەسی تو

**١٦** من گۆ: ل رەخانین نەکو کەجرەو وەکوو فەرزین
شاه گۆتە مە: کش، مات، ل بازی فەرەسی تـو

**١٧** من گۆ: ژ قەدیم ئـەز مـەیێ عیشـقا تـە دنۆشـم
گـۆ: مـن ژ عوشـاقان نـەتنێ مەیتەلەسـی تـو

**١٨** من گۆ: د شەڤان شـوبهێ شـەمالان وە دسـوژین
پەروانە سیفەت جا هەرە، بێسەوت و حسـی تـو

**١٩** من گۆ: بەسەر و قووەتێ سەمعا مـە تـویی، گـۆ:
زانین تە ئەمین رووح و موجەررەد قەفەسـی تـو

**مانای وشەکان:**

**بخوور**: ئەوەی بۆ بۆنخۆشی دەسووتێ؛ **عەدەس**: نیسک، بۆ پیاوی بێئەمەگ دەڵـێن وەک نیسکی بـێ بـەر و پشـتە و بـەقای نییـە؛ **روخ**: قـەڵای شـەترنج؛ **رەخ**: کـەنار؛ **فەرزین**: وەزیر لە شەترنجدا؛ **شا**: داشە زلـەی شـەترنج؛ **فـەرەس**: ئەسـپی شـەترنج؛ **کش**: برۆ؛ **مات**: بێبزووتن؛ **تەلەس**: مرد؛ **مات**: سەرخۆشی کەلەلا و بێحاڵ؛ **جاهەرە**: دەسا بچۆ بەولاوە، دەبڕۆ؛ **قووەت**: هێز؛ **سەمع**: بیستن.

**پوختەی مانا:**

گوتم دڵمت بۆ لەت_لەت کرد؟ بۆ بخووری کۆڕی بەزمت بەکار دەهات؟

بە لێوی ئاڵ، شەکری شکاند و پێی فەرمووم: تۆ وەک نیسک هیچ بەر و پشتت بۆ نییە. من چاکەم دەربارە کردووی کە دڵتم هەڵبژاردووە لەت_لەتی کەم. تۆ بەو چاکەیە نازانی و هاتووی گلەییم لێ دەکەی؟!

گوتم: من لە دڵداریی تۆدا وەک قەڵای شەترنج ڕاست دەڕۆم و جێگەم لە کەنار گرتووە؛ نەک وەک وەزیر ڕاستیش بچم خواریش بڕۆم.

ئەو شای کۆمەڵی جوانانە دەری کردم؛ پێی گوتم: کش! تۆ هەر بۆ مات و کز بوون و مردن و لەناوچوون دەبی. چۆنکە وەک ئەسپی شەترنجی، لە سەر خەتی خۆت باز دەدەی. دڵدار ناشێ گلەی هەبێ و خراپەی دڵداران بڵێ.

گوتم: زۆر لەمێژینەوە من فێری بادەی ئەوینتم؛ هەر بادەی تۆ دەخۆمەوە.

گوتی: دڵداری من زۆرن؛ لە مەستی بادەی ئەوینم بوونە سیپاڵی مەیخانە. هەر تۆ نی، تا خۆت هەڵکێشی.

گوتم: شەوان وەکوو مۆم سەرم بەگڕە و بۆت دەسووتێم.

گوتی: دەبڕۆ! تۆش هەر وەکوو پەپوولە وای؛ هیچ دەنگو هاوارت نییە. پێم خۆشە دڵداری سووتاو لە ئەوینم، هاوار بکا و ناڵە و گاڵەی شایەتی ئەوینداریی بن.

گوتم: تۆ سۆمای چاوانمی. هێزی بیستنم لە تۆیە.

گوتی: دەزانم من گیانم لە لەشتدا و تۆ قەفەسێکی گڵینی.[1]

---

١. هەرکەس تۆزێک شیعرناس بێ و ئەو دوو قەسیدەی خوێندبێتەوە کە بە «جانا ژ جەمالا تە موقەددەس قەبەسم ئەز» و «وەرە جانم کو چ نازک وەرەسین» دەست پێ دەکەن، دەزانێ ئەم شیعرانەی لێرەدان هی مەلا نییە و هی کابرایەکە دەمەلاسکەی مەلای کردۆتەوە و نەشیپێکاوە. «هەژار»

# چاوی دەڕەش

١ دلبەرێ سەردارێ خووبان ... ئەز نزام ئاگەهـ هەیە
عارفە ب حالێ قلووبان ... عالمە ب حالێ مەیە

٢ عالمە ب داغێ فوئادان ... گەرمەیین وان نوون و «صادان»
چوونە دل حەتتا ب رادان ... یەنگییێ رەش گۆشەیە

٣ گەزمەیێن وان «صاد» و نوونان ... ئاوڕێن ئەسوەد عیونان
را دکن ئەو قەتل و خوونان ... من دیە و دل شەهدەیە

٤ لازمە ل سولتان و میران ... پورس کرن حالێ ئەسیران
ئەم کرین ئامانجێ تیران ... سوختەیێن دەرماندەیە

٥ هێژ نزانم میر دبیرین ... زانت ئەم سی‌سال ئەسیرین
چەهڤنێر پرسەک ئەمیرین ... لەو ب روحم و شەفقەیە

٦ پور دبێم شەفقە ل بالە ... عارفە و ساحیب کەمالە
جارنان بینە خەیالە ... پرس بکت چی لێ هەیە

٧ شەفقە کت جار_جار نهێنی ... توولەیێ ئاستان ڤەخوونی
داڤەکەم داغان ببینی ... نار و پێت و شوعلەیە

٨ دا بزانت پێت و نارم ... کوشتییێ جوهتێ خومارم
موحبەتێ سوهتم بوارم ... لازم ئەو زانت وەیە

٩ عالمە ب دەرد و برینێ ... مادەما دیدار و دینێ
خەف دبت رەمزا ئەوینێ ... ڤێ بزان بێ شوبهەیە

١٠ هەردەما دلبەر دیار بت ... جان و دل تێک تارومار بت
دی چ رەنگ موحبەت ستار بت ... خەف کرن بێ فەیدەیە

**مانای وشەکان:**

**فوئاد**: دڵ؛ **بوار**: پشوو لەسەرخۆ، ڕازی؛ **بوارم**: بواردمی.

**پوختەی مانا:**

ئەو دڵبەرەی سەرداری هەموو جوانانە، ئاخۆ بە حاڵی دڵی مە ئاگادارە؟ دەزانێ داخمان لە دڵە و تیری برۆ و چاوەکانی هەتا پەڕان، لە ناو دڵماندا جێگیرە و لە گۆشەی کەوانی یەنگی هاوێژراون؟ تیری چاو و برۆیان و ئاوری چاوی ڕەشی ئەو، پیاوکوژن و خۆم بەڵگەی ئەو قسەی خۆمم، کە کوژراوی ئەو چاوانەم. منی کردە نیشانەی تیر؛ منی سوختەی ژار و فەقیر. ئەو ئەمیرە دەبوو لە حاڵم بپرسێت؛ چاوەنۆڕی ئەو پرسینەم. دەزانم بەزەیی هەیە. زانایە؛ لە دەردی من شارەزایە. هەر جارێک بێمە خەیالی، بپرسێ چیم لێ قەوماوە، وەک سەگی ئاسانەکەی خۆی، بانگم بکا، تا جێ داغی لەشم ببینێ و بزانێ بە گرپە و پۆلووی ئەوینی ئەو بوومە قەقنەس. کوژراوی چاوی خومارم. سووتاوم و پشوو لەسەرخۆم؛ بەلام هەرکەسێ بمبینێ، دەزانی من ئەویندارم. چۆنکە هەرگا یار دەبینم، گیان و دڵم بەرباد دەبێت.

| | | |
|---|---|---|
| ١١ | هەردەما مەحبووب زوهوور بت | زێدە مەزهەر بێ قوسوور بت |
| | دێ تەجەللایەک ل توور بت | بەرقێ لامیع جەزبەیە |
| ١٢ | جەزبەیێ دل ژ وجوود بر | خەف ژبەر عەینی حەسوود بر |
| | من د میحرابێ سجوود بر | لێ حەجەر نیشانەیە |
| ١٣ | سەجدەیا بەر نوون و دالان | من تەوافا زولف و خالان |
| | ئەڤ بەسە ساحیب جەمالان | دا بچین لێ عومرەیە |
| ١٤ | ئێ یەکی سادق حەبینی | بێحیجاب گەر ئەو ببینی |
| | ما ل هشیاری دمینی | سەرخوەشێ بێبادەیە |
| ١٥ | عیشقە توغرایا نهینی | هەردەما مەحبووب دبینی |
| | دێ ب دل لازم بخوونی | ئەڤ چ ئیسم و نوسخەیە؟ |
| ١٦ | لامیعا وێ حوسن و نووری | گەرچی دل تێ، شوبهێ تووری |

| | | |
|---|---|---|
| | باتینـــا نایـــێ زوهـــووریَ | لـــێ حیجـــاب و پەردەیـــە |
| ١٧ | عـــارفن مەعناشوناســـــن | لێ ب سەد سوورەت لیباسن |
| | غەیری مـەحبووب وان نەناسن | خـــەف ژ وان زانی مەیـــە |
| ١٨ | ئـێ ل مـن یـەنگی کشـاندی | سەد خـەدەنگ ڤـێرا رەشـاندی |
| | دل ژ دەربـــێ هەررشـــاندی | ئـەز کـری ئەختـەر مەیـە |
| ١٩ | لازم ئـــەو زانـــت ب حـــالی | دلبـــەر و یـــارێ مـــوالی |
| | گەزمـــەیێن قەوسـێن هـیلالی | دەرب ل نێڤـــا ســـینەیە |
| ٢٠ | هێـژ دبـێم مـەحبووب نـزانی | مـــن ئـــەوە ڕۆحـــا گیـــانی |
| | پـورس نـەکر بـیرا خـوە نـانی | ئـــەڤ چـــرا پەرکەندەیـــە؟ |

**مانای وشەکان:**

**ئەخترمە**: یەخسیر؛ **ئەخترمە**: چۆلەچرا، یەلمۆم؛ **موالی**: دۆست.

**پوختەی مانا:**

هەرکاتێ یار خۆ دیار بکا؛ دیداری بێکەمایەسی، کێوی تووری پـێ دەسووتێ و پیاو دەچێتـە حالـی جەزمـە. جـارێ یـارم خـۆی نیشـان دام، تـەواو دلـی لـە نـاو بـردم نەشیهێشت شوفار بزانن. خالێکم لەبەر برۆی دیت؛ سوژدەم بـۆ بـرد. لـە دەورەی خالانی گەڕان، دەوری بسک و کەزیەکانی، پیاوی پێ دەبێتە حاجی و عومرەی خـۆی بەجێ هێناوە.

دلداری راست، ئەگەر ئەو یارە ببینێ، لێت ڕوون بێ هۆشـی نامێنـێ و بـادەی نـاوێ، سەرخۆش دەبێت. ئەوین مۆری لای خودایە و هەرگا یارت لێ دیار بێ، دەزانی کـاری خودایی چەند جوانە و خوا چەند جوانە. ترووسکەی جوانی خودایی، هەرچەنـد خـۆی نیشان دڵ دەدا، بەلام بە چاو نابیندرێ و پەردەی بەسەردا کشاوە. دلدارانی زۆر ورد و وشیار، ئەو تیشکەی خوایە دەناسن؛ با لە سەد لیباسیشدا بێت. ئەوانە گوێ نـادەن بـە جل، هەر تەنیا دلبەر دەناسـن. مـنیش لـەوانم زانیـوە کـە یـاری بەڕاسـت کامەیـە. یارەکەی من ئەو کەسە بوو کەوانی لە من کشاند و سەد تیری هاویشتە دلـم و مـنی

کردە یەخسیری خۆی. دڵبەرم- کە دۆستی خۆمە- دەزانێ چیم لێ قەوماوە. کەوانی مانگی برۆکەی تیریان لە نێوان سینگمدا، هێشتان دەڵێم دڵبەرم خەبەردار نییە! ئەو دڵبەرەی گیانمە، چۆنە نەهاتۆتە بیری بڵێ فلان بۆ ئەوندە پەرێشانە؟

| | | |
|---|---|---|
| ٢١ | چەندەکی تاقەت ددێرم | بم غوبار بەدرێ ڤەشێرم |
| | گەر ژ چەهڤان ئەز بوێرم | من زەنەخدان تەلبەیە |
| ٢٢ | دا بنۆشم مێ ژ لێڤێ | ماوەرا رەیحان و سێڤێ |
| | لوئلوئێن شەککەر دنێڤێ | ئابێ حەیوان چەشمەیە |
| ٢٣ | چەشمەیا ئاڤا حەیاتێ | شەربەتا قەند و نەباتێ |
| | من ل داغان ئەو موفاتێ | جان ژ بۆ شوکرانەیە |
| ٢۴ | لەو وەکوو سەودا و دینم | هەردەما دێمێ دبینم |
| | دین دبم، حەیران دمینم | موشتەرێ یا زوهرەیە |
| ٢۵ | شەمس دنێڤ بورجا شەرەفدا | سەد کەواکیب چار تەرەفدا |
| | موشتەرێ هاتی ب رەفدا | ئیستیوا چو قیبلەیە |
| ٢۶ | ئافتابێ دەستیوایێ | ئەز ژ بەر زەرب و جەفایێ |
| | جانفیدا تێمە لیقایێ | شوبهەتێ پەروانەیە |
| ٢٧ | من تووی مەقسوود ژ ژینێ | من ژبەر مەوجا ئەڤینێ |
| | سەد دکم دیدار و دینێ | مەزهەرە بەس زێدەیە |
| ٢٨ | روهنییا چەهڤێ نەبینان | مورشیدێ مەجزووب و دینان |
| | داروێ دەرد و برینان | من تەلەب دینا تەیە |
| ٢٩ | بینە پێ نازک موبارەک | دەینە سەر چەهڤێن مە بارەک |
| | من جرووح خوەش بن ب جارەک | روهن ببن پێ دیدەیە |
| ٣٠ | بێن کەفا نازک ژ نووری | تللییێن جاما تەهووری |
| | بیهن ژ ماوەرد و بوخووری | من زیارەت تەوقەیە |
| ٣١ | دا ل سەر چەهڤان بمالم | بولبولێ وەردێن ب خالم |

جارەکـــێ رەحمـــێ کـــە زالم شـــەفقەخووی حـــەقێ وەیـــە

۳۲ ئـەر نـەکی رەحمـێ تـە مـیرۆ دێ چ بـێـت حالـێ مـە ئـیرۆ

قـەت نـەبی جـارەک ئەسـیرۆ گرتییـــــێ سێســـــالەیە

**مانای وشەکان:**

**زەنەخدان**: چەنە؛ **موفا**: چارە؛ **رەف**: پۆل؛ **دەینە**: دایبنێ؛ **کەف**: لەپ؛ **تللی**: قامک؛ **تەوقە**: ئاوات؛ **تەوقە**: چاوەڕوانی؛ **میرۆ**: ئەیمیر.

**پوختەی مانا:**

بە هەموو توانا دەکۆشم ببمە تۆزی سـەر ڕێگـەت و مـانگی ڕووت لـە ڕووی شـوفاران داپۆشم. ئەگەر لە ترسی چاوانت بموێرایە، دەمگوت چەنەشت ببینم. خـۆش بـوو لـە ڕێحانەی بسکت، کە وە کوڵمی وەک سـێوی سـوورت دەکـەوێ و لـەو لێـوە وەکـوو شەکرانەت، کە مرواری ددانیان وە بن خۆ داوە، فرێکم هەڵـبمژیایە- کـە وەک ئـاوی ژیان وایە و بۆ هەموو داخان دەرمانە- بە گیان سوپاسـم دەکـردی. هـەتا ڕوخسـارت دەبینم، هـەر شـێت دەبم. سـەرگەردانم، نـازانم کـام ئەسـتێرەیە؟ موشـتەرییە یـان زوهرەیە، یان ڕۆژە لە بورجی شەرەف، دەست و پێوەند وەک ئەستێرە لە چوار تەرەف، دەوری داوە و موشتەریش دەگەڵ ئەو پۆلە هاتۆتە سەیر و تماشـا و ڕۆژ ڕاسـتەڕێگەی ون بووە و لە لای قوبلەوە دیار ئەدا. من گوێ نادەمە ئازاران. گیان دەکەمـە قوربـانی دەمێ دیدارت. وەک پەپوولە لە دەوری گڕت دەسووتێم. هەر تـۆی ئـاواتم لـە ژینـا. دەریای ئەوین شەپۆل دەدا؛ بە ئاواتم سەدجار چاوم پێت بکـەوێ و دیـارە زۆر زیـادم ئاواتە. تۆ سۆمای چاوانی کوێری؛ ڕێشاندەری شـێت و جەزمـە لێهـاتوانی؛ دەرمـانی هەموو دەردانی. بۆیە دەمەوێ بتبینم. عەرزەت بکەم لاقت لە سەر چاوم دانێ تا برینم چاک ببنەوەو؛ چاوم ڕۆشنتر بێتەوە. لەپی دەستت ڕابکێشە با ئـەو قامکـە ناسـکانەی بادەی بەهەشتی دەگێڕن و بۆنی بخوور و گولاویان لێبلاوە، زیارەت بکـەم؛ بـە سـەر چاومیدا بماڵم. من بولبولی پەڕی کوڵمی نەخشێنراو بە وردەخاڵم. بێئینساف! دەسا بەزەت بێ! بەزەیی ئاکاری خۆتە. ئەگەر بەزەت پێمـا نەیـە، مـن چـۆن بـژیم؟ قـەت نەتفەرموو ئەو ئەسیرەی سێساڵە لە بەندی مندا، حاڵی چۆنە؟

۳۳ شون‌جیهێ پەیکان و نەسلێ — ژتلیێن یاقووت و فەسلێ
ئەر نەکی دەرمان ب وەسلێ — زەربێ تیر و گەزمەیە

۳۴ گەزمەیێن یارێ کو باقێ — نە ژ مەی و قەند و گولاڤێ
بێت دەوا کت وان دگاڤێ — ما حەیاتەک لێ هەیە؟

۳۵ نە تنێ قەند و نەباتی — مەزهەرێ ڕۆح و حەیاتی
هەم بت و عوززا و لاتی — لەو مە دل بتخانەیە

۳۶ خۆندێ لاتێ ئازەری تو — بێ چ شیرین دلبەری تو
هەرجیهێ لێ بێوەری تو — بێ خیلاف ئەو کەعبەیە

۳۷ ما دبت بێخن خیلافێ — سەر ددت باقێ نیسافی
ئەر بکی بێ مە تەوافێ — من ب ئەسوەد سەجدەیە

۳۸ دا زیارەت‌کم نیشانێ — بەر زوحەل بێتن قیرانێ
توولەیم سەر لاستانێ — چەهڤنێرێ مووچەیە

۳۹ ما ب زەهرێ شەککەرینی — مووچەدا دێ خەف بخوینی
دا رەقیب مەلعوون نەبینی — پوڕ «عَلَيْهِ اللَّعنَة»یە

۴۰ گەر ببەخشی دل موورادێ — زەو حەیات و خەمر و بادێ
دا نەکم گللەه و دادێ — دادمە دیسا بەر تەیە

۴۱ گوە بدە بەر گلە و دادان — حاکمێ شەهر و بیلادان
دێ تو داخواز و مرادان — دی کەسێ بێ‌چارەیە

۴۲ دێ‌تو دیسا شەفقەتێ کی — بەو نیشانا جەبهەتێ کی
مەژ حەریمێن خزمەتێ کی — مەحرەمێن بێ پەردەیە

۴۳ بێ‌نیشانین مە نیشان کی — ماه و خورشیدێ قیران‌کی
بەندە کەلبێ ئاستان‌کی — دوور نەکی خوەش توولەیە

۴۴ دا دەما سوحبەت ب جۆش بێ — جام ب خوەش‌لەعلان ب نۆش بێ
مەژ حەبیب‌سەد دەنگ سرۆش بێ — دینبەر و پوڕ عیشوەیە

| | | |
|---|---|---|
| ٤٥ | شــــەربەتا وێ جــــام و تاســـێ | یــار کــو تــێ بێــت ئینعکاســێ |
| | بێت مــە ژی فــەیزەک ژ کاسێ | ئابــێ حــەیوان ئــەو ب خوەیــە |
| ٤٦ | ئـــێ ژ وێ زەرفـــێ ڤـــەخاری | خۆنـــدی ئـــەو خـــەتێ غوبـــاری |
| | مەســـتییا چەهڤـــێن خومـــاری | قـــەنج دبـــێ ئـــەو زێدەیـــە |
| ٤٧ | مــن ل دل تــیرەک موغـول دی | تێـــک ژ بـــەر خوونـــێ قـــزل دی |
| | لــێ دبــێم دەردێ کــو دل دی | هێـــز ژ چەهڤـــێن شــــەهلەیە |
| ٤٨ | روهنییــا چەهڤـــێن «مـــەلا»یـــێ | خالقـــێ حوســـنا تـــە دایـــێ |
| | حــوب تنـــێ دا مـــن گـــەدایێ | حوسن و حوب یــەک چەشــنەیە |
| ٤٩ | دیتییـــە نـــوورا یەقـــەق مـــە | سەد نەسەق لەو تێن سەبەق مە |
| | پــوڕ نــەبی ئــەرزان ل حەقمــە | لــێ «مــەلا» خــوەش بەندەیــە |

**مانای وشەکان:**

**نەسل**: سەرەڕم؛ **فەسل**: بەند، بەندی ئەنگوست؛ **خۆند**: خاوەن؛ **بێـوەری**: جـێ گیربی؛ **نیساف**: ئینساف؛ **مووچە**: جیرە؛ **زەهر**: دەم، زار؛ **گللە**: گلە، شکایەت؛ **بلادان**: ولاتان؛ **حەریم**: مەحرەم؛ **ئینعیکاس**: تیشکدانەوە؛ **خەتی غوباری**: شێوە خەتێکی زۆر وردە.

**پوختەی مانا:**

جێ سەرەتیر و ڕمبم لێن. ئەگەر بەو بەندی قامکانەی یاقوتییانەت هـەتوانی لـە سـەر دانەنێی و لە بادە و قەنـد و گـولاوی لێوەکـانتم دەرخـوارد نـەدەی- کـە چـا بـوونم یەکاوەیەکە- تازە ناژیمەوە و دەمرم. تۆ نە هەر قەند و نەباتی، تۆ گیان و ژیانت لایـە. تۆ بوتی؛ تۆی گەورەی بتی ئازەری مامی برایمی. تۆ لە دڵمای دڵم بویتە بتخانەیەک. تۆ هێند جوانی بچییە هەر کوێ ئەو جیگایـە کابەیـە. هـەر کەسـێکی ئینسـافی بـێ، دەزانێ ئەم قسەم ڕاستە. ئەگەرچی وەک زوحەل شوومم، ڕێگەم بدە خاڵت ماچ کەم؛ با بڵێن زوحەل لەگەڵ ڕۆژ بەرانبەر بوون. تولەی تۆم سەر لـە بـەر دەرگـا، چـاوەنۆڕم جیرەم دەیتێ. بە زارە شیرینەکەی خۆت، بانگم بکـە بـە دزییـەوە. بـا شـوفار بـە ڕاز نەزانێ؛ خودا وە بەر نەحلەتی خا. ئەگەر لەو ئاوی حەیاتە و لەو بادەیەی لێوەکانتم، پێ

بەخشی و دڵم بە ئارەزوو بگات، شکات ناکەم. شکاتیشم هەر لای خۆتە. خۆت فەرمانڕەوای وڵاتی، هەر تۆی مراد پێکهێنەری. منیش بێکەس و بێچارەم. بەزەت هەبێ! سوێندت دەدەم بەو خاڵانەی لە هەنیەتن، وا بکە لە ماڵدا مەحرەم بم؛ خۆتم لەبەر چاو ون مەکە. هەنیە و ڕوخسارت بە جووتە بێنە بەرچاو؛ واتا خۆر و مانگی تەواو، بەرانبەرن. من بکە سەگی دەرگای خۆت؛ سەگی چاکم. تا ئەگەر بەزمت گەرم بوو، بەو لێوانەت بادەت فڕ کرد، گوێم لە دەنگە خۆشەکەت بێ- کە وەک دەنگی جوبرایلە- نازی زۆرت دینم دەبات. ئەگەر وێنەت لە کاسەی مەیدا ببینم، بەهرەی بۆ من یەکجار زۆرە؛ وەکوو ئاوی ژیانێ وایە. هەر کەس لەو دەفری خواردەوە و خاڵ و میلی وردی توێ بە چاوانی دیت- کە وەک خەتی زۆر وردی هونەراوی وان- لە دیتنی چاوت مەست بوو، باوەڕ دەکا کە بادەی تۆ، لە ئاوی حەیات زیاترە.
تیرێکی دستکاری مەغول، لە دڵی دام. خوێنی گەشم لە بەر هەڵنیشت. بەلام دەڵێم: ئەو خوێناوە، لەو چاوە کاڵەی تۆڕایە، دڵی من هەڵیهێناوە.
ڕووناکایی چاوی مەلا! خودا ئەو جوانییەی بە تۆ دا، بە منی گەداش دڵداریی دا. جوانی و دڵداریی چون یەکن؟ من نووری زۆر سپیم دیوە. زۆر ڕێکوپێک بەرەو من بە پەلە دەهات. هێندە بە هیچم مەزانە! مەلا کۆیلەیەکی باشە.

# گوڵی بێدڕك

آ

| | |
|---|---|
| ئـیرۆ مـه دی وەقتـێ سـەحەر | ئـەو دلبـەرا سـوندوس د بـەر |
| دیســا د لەبســێ ســۆر و زەر | نوورەک مونـەززەه بـوو بەشـەر |
| بسـکێن سـیاه خـالێن د قـەر | ڕەش کاکولێ زولف چوونه سەر |
| ئەسـوەد بـوو دایم سـەجدەبەر | مـن بەسـتی عەقـدا نییـەتێ |
| غەفلەت ب سیرر مـن دا نـەزەر | مـیران ب قـەتلێ کـر غـەدەر |
| تـیر دانـه دل شـاهێ مەجـەر | بـێمرووەت ئامـانج کـر جەگـەر |
| فەریاد و ئـەفغان سـەد کەسـەر | وەسفان نەشێم لێ ئـەو قـەدەر |
| زانم کـو ڕۆژ بـوو هاتـه دەر | سـوبحان ژ شـاهێ قودرەتـێ |

**مانای وشەکان:**

**سوندوس**: حەریری تەنک؛ **عەقد**: بەسـتن؛ **نەشێم**: نـاتوانم؛ **میران**: مـیری گـەورە؛ **مەجەر**: کاکێشانی ئاسمان؛ **شاهێ مەجەر**: خۆر.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ لە دەمی بەیاندا، دە یاری دڵبەرم ڕوانی. بە بیچم بنیادەمێک بوو؛ بەڵام ئەگـەر ڕاستت دەوێ، پرشنگی جوانی خـودا بـوو، دەنـاو سـوور و زەردی حـەریری تـەنک و ناسکدا دەدرەوشاوە.

بسـکو کـەزی و کاکۆڵـی ڕەش، بـەرەو خاڵـی ڕەش چـەمابوون؛ کـە وەک «حەجەرولئەسوەد»ێ ڕووگەی بەودم و پیرۆزە، لام وا بوو سوژدەی بۆ دەبەن. منـیش نیەتی خۆم دابەست، کە سوژدە بەرمە بەر خاڵی و ببمە حاجی. ئەو سەروەر و مـیری

میرانی جوانانە، لە نەکاوێک گۆشە و تیلەچاوی دا من؛ زۆر بە ناحەق فەرمانی کوشتنم دەرچوو. تیری ئەو ڕوخسار وەک خۆرە، بێبەزەیی دامبارینێ و جەرگمیان کردە نیشانە. هاوار و داد و هەزار داخ. چیم بەسەرهات، ناتوانم هەر باسی بکەم. هەر ئەوەندەی لێ دەزانم، کە چاوم لێ بوو خۆر هەڵات. هەی نامەخوا! لە توانایی خودای مەزن، کە جوانی وای خولقاندوە.

٢

| | |
|---|---|
| سوبحان ژ تە شاهێ جەلال | هۆستایێ پر قودرەت ل بال |
| خاسا تە دایی ئەڤ جەمال | دیمێ ژ قودرەت خەت و خال |
| کفش بوو د قەوسێدا هیلال | ڤێرا مە دی بەدرا کەمال |
| لێ بوون نیقاب چەوگان و دال | وان یەک ب مەستی دایە پال |
| لێ سەییری بایێ شیمال | پێچانە سەر نوورا زولال |
| قەت کەس دیێن ئەڤ ڕەنگ میسال | موتریب وەرە وەقتە مەجال |
| زازا ب نائیرا بنال | ساقی وەرن خەمرا حەلال |
| جارەک ژ سەر دێمێ ڤەمال | زولفێن ل دۆرا جەبهەتێ |

**مانای وشەکان:**

**هۆستا**: وەستا؛ **ل بال**: لە کن؛ **سەییری**: هەڵیکرد، ڕابرد؛ **زازا**: ئەیساز.

**پوختەی مانا:**

خودای گەورە و خاوەن شکۆ! پاکی و پیرۆزی هەر بۆ تۆ. چەند وەستایەکی بەکار و دەسڕەنگینی. ئەو خوێنشیرینی و لەبارییەت بەتایبەتی دا بە یارم. خاڵ و میلت بە دانستە لە ڕوخساری نەخشاندووە. مانگی یەکشەوەی برۆکەی، لە بورجی کەواندا هەڵات؛ مانگی چاردەی هەنیەکەشی تیشک ئەدات. بسکی سەر وەکوو کاشۆیان، پەرچووکەی وەکوو دال شکاو، بوونەتە پەردە لەسەر ڕووی و لە خۆشیان مەست و کەلەلا پالیان بە یەکەوە دابوو. سروەی شەماڵێ هەڵیکرد؛ بسکی بەرەو سەرێ ڕادان. نووری پاکی خوا دەرکەوت. قەت کەس نموونەی وای دیوە؟ لێم ڕوونە: نا. بەزمگێڕ! وەختەکەی وەختە با ساز و بلوێر بناڵن. مەیگێڕ دەستت مەگێڕەوە! بادەی حەلالی بۆ تێکە و هەر بەو دەستە ناسکانەت، تاقەجارێک بسکان لەسەر هەنیت لادە.

٣ زولفـــێن موعەنبـــەر کـــاکولین بســکێن سـیاه رەنـگ سـونبولین
تـــا-تـــا ب داف- داف فـــەتتلین چین-چین ب مەستی سیلسیلین
دایـــێ نەسـیم تێـک مـــەییلین وێ قەســـــتە خـــــالا فلفلـــــین
ئەبلـــەق ژقـــودرەت خـــەمملین وێ بوغچـــەیێ گـــول کـــەمملین
تـــێ عەنـــدەلیب و بولبـــولین رۆژ هاتـــە بورجـــا ســـونبولین
غەفلەت مـــە دی لـــەو خـــەجلین مەحرووم و مەهجوور دل‌کـولین
مـــەجرووحێ تـــیرێن قـــزلین رەحمێ کـە پـوڕ سـوهتی دلـین
ڤـــێ پـــەردەیێ جـــارەک هلـــین باڤـــێ نیقابـــا زولمـــەتێ

**مانای وشەکان:**

**فـەتتلین**: لوولیـان خـوارد؛ **سیلسـیلین**: بوونـە زنجـیرە؛ **مـەییلین**: خـوار بوونـەوە؛ **عەندەلیب**: بولبول.

**پوختەی مانا:**

بسکی ڕەشی وەکوو سونبول، کەزی و کاکۆڵی وەک عەنبەر، تاڵ‌بەتاڵ لە یەکتر هاڵان و مەستانە و چین لەسەر چین و بەزنجیرە دەبیندران. سروە لێی‌دان، خـوار بوونـەوە. بەرەو خاڵان -کە لە فلفل ڕەشتر و تیژ و توندترن- ڕەش و سـپی ڕازایـەوە. باغچـەی گوڵان بەوپەڕی جوانی خۆی نواند.
بولبول دەستیان کرد بە خوێندن. خۆر کەوتە بـورجی سـونبولە و لەپڕ دیـتم، شـەرمەزار بووم؛ ڕەنگم پەڕی. یاری ڕوخسـار وەکـوو ڕۆژم! لـە دووری تـۆ دەردەدارم؛ دڵ برینـدار و هەژارم. تیری دووریت لە خوێنی دڵم شەلاڵە؛ ڕەنگی سوورە؛ دڵ بەگڕە؛ وەک تەنـدوورە. دەسا بەزەییەکت هەبێ، ئەو ڕووبەندە لە ڕوو لادە! با تاریکی لەسەر ڕووناکی بڕەوێ.

٤ برسێ ب میهدارێ (میهردارێ) خوە کە ل مەجزووب و حال‌دارێ خوە کـە
بەس قـەهر و ئـازارێ خـوە کـە قەســـتا برینـــدارێ خـــوە کـــە

| | |
|---|---|
| شـەفقێ ب دیـداریٚ خـوه کـه | تێک غەرقێ ئـەنواریٚ خـوه کـه |
| لێ ئـەمر و فـەرواریٚ خـوه کـه | شـەهیدیٚ نۆبـاریٚ خـوه کـه |
| گەسـتییێ ڕەشمـاریٚ خـوه کـه | لـەعلێ شـەکەرباریٚ خـوه کـه |
| ب لـەفز و گوفتـاریٚ خـوه کـه | دەرمانـێ کولـداریٚ خـوه کـه |
| لێ کەشفێ ئەسـراریٚ خـوه کـه | مەخمووریٚ خەمماریٚ خـوه کـه |
| حـەیرانێ ڕەفتـاریٚ خـوه کـه | کوشـتینه تـیرا موحبـەتێ |

**مانای وشەکان:**

**میهدار**: کۆترێک که دەخوێنـێ؛ **میهـردار**: خۆشەویسـت؛ **فـەروار**: فـەرمان؛ **کولـدار**: خەمبار، بەژان.

**پوختەی مانا:**

پرسیارێک له شێت و حاڵ‌لێ‌هاتووت که! لەو کەسەی زۆر خۆشیدەوێی وەک کـۆتر بۆت دەناڵێنێ. بەسم غەزەبێ لێ‌بگره و چیدیکه ئازارم مەده! وەره سـەر برینـداری خۆت! ئیجازەی بده شەهید بێ و فەرمانی پێ بده بمرێ. ڕەشماری کەزیت پێوەی دات. به لێوی شیرین و ئاڵت بیدوێنه. خەمباری تۆم. چارم بکه! له نهێنیم ئاگـادار که! بمکه به مەستی بادەی خۆت، با له خۆتـدا سـەرگەردان بم. بـه تـیری ئـەوین کوژراوم.

٥

| | |
|---|---|
| وەر سەرده جارەک کوشـتییان | ئەختەرمـەیێن وان بـەنگییان |
| بـەرده ب ملـدا خـەمرییان | بـا دەت سـەحەر ڕەیحانییـان |
| داغـێن شـەهید و سـۆهتییان | دانینـه لـێ وان تللییـان |
| کـوژ مـوعجیزا خـەمارییان | رووح بێتـه دیسـا سـەرگیان |
| هێـژ نابـڕم قـەت هێڤـیان | وان شـەفقه و دلـدارییان |
| بیللـەهـ ژ نـال و زارییـان | زەربـا فـیراق و بیهرییـان |
| تەشـبیهێ تووتـاکێن چیـان | خـەو نـاکرین شەڤـتارییان |

| | |
|---|---|
| لـێ هێـژ دخـوازین شـوکرییان | چەنـدی کـو روو دیـن قیبلـەتێ |

**مانای وشەکان:**

**ئەختەرمە**: یەخسیر، چۆلەچرا؛ **با دەت**: با لێی بدا؛ **بیهری**: بەتاسە؛ **تووتـاک**: مەلێکی شەوبێدارەو تا بەیان دەنگی دێ.

**پوختەی مانا:**

جارێک سەری کوشتەت بدە! ئەسیری تازە کەوانتم. بسکت لە شان پەخش بکە! با با لە ڕێحانان بدات. قامکت لە سەر داغ و برینی کوشتەی خۆت بکە هـەتوان! بـا گیـانم بێتەوە بەرم. هێشتا هومێدم نەبڕیوە، چاوم لە بەزەیی تۆیە. بە خوا لـە دەردی دووری تۆ، لە تاسەی دیداری جوانت، وەکوو تووتاک شەو هەتا ڕۆژێ دەناڵم. قـەت خـەو لـە چاوم ناکەوێ، بەو حاڵەشڕا سوپاس دەکەم هەتا ڕوو دەکەمە ڕووگە.

۶

| | |
|---|---|
| دەردێ غـــەدار بـێم فیرقەتــە | فیرقەت ژ جـان پـور زەحمەتـە |
| عاشــق مــرن هــەر ســاعەتە | یــا ســەهل عاشــق ڕۆح دتــە |
| لێ دلبـەر ئـەڤ ڕەنـگ عادەتـە | هـــەرچی دبەندێـــدا کەتـــە |
| ئـــەووەل ددت پـــێ ئولفەتـــە | زەوق و ســـەفاء و ســـوحبەتە |
| گاڤــەک کـــو ئــەو ڤــێرارەتە | ئانجـــا ژ ناگـــە غەفلەتـــە |
| شـــیرێ جـــەفایێ لـــێ دەتـــە | ئەللـــەهـ چ وێ بـــێ مروەتـــە |
| ڕەحمـــێ ب عاشـــق نایەتـــە | وێ قەســتە جـان یـەغما کەتـە |
| حـــەتتا کـــو دل قـــەنج ژێ بتـــە | ئینســـاف ژ مـــەهروویان نـــەتێ |

**پوختەی مانا:**

دەردی دووری زۆر گرانە؛ لێک جیایی لەش و گیانە. عاشق گیـان بـدا هاسـانە؛ دەنـا هەموو دەم مردووە. کرداری دلبەران وایە: پیاو بە ڕووخۆشی دەکێشن، قسەی خۆشی دەگەڵ دەکەن، لەپڕ بە ئازار دەیکوژن. بەزەییان بە پیاودا نایـە، نیازیـان گیـان تـالان کردنە. جوانان قەت ئینسافیان نییە.

۷
یـار قەسـتەجان یـەغما کـرت — دا مـــوعجیزێ پەیـــدا کـــرت
رەمزەک ژ رەنـگ عیسا کرت — یـــا سـیحرێ بووســـینا کـــرت
ژەو لـەعلێ شـەککەرخا کـرت — دیســـا شـــەهیدان راکـــرت
ڤـان کۆلـــەیان ئـــازا کـــرت — جــارەک غـــەریبان شـا کـرت
راسـتی یـــەدێ بـــەیزا کـــرت — میســـکی د جـــەرحان داکـــرت
دا خـــوەش بکـت ئیحیـا کـرت — شـــەفقێ کـــە یـــارەب داکـــرت
رەش کـاکولان تـا-تـا کـرت — سەد حەلقە چین-چین بـا کـرت
هـــەمیان ل دێم تـــوغرا کـــرت — ئەمرێ هومایوون سـەر مـە تێ

**پوختەی مانا:**

یار بۆیە گیان تـالان دەکـا، ویسـتی مـۆجزات بنوێنـێ، لاسـای عیسا بکاتـەوە، یـان ئیبنووسینا ئاسایی خۆمان لێ پکا بە جادووگەر. بەو لێوانەی مردوو زیندوو بکاتەوە. بە دەستە سپی و ناسکەکەی، میسک بە برینـاندا بکات. کۆیلان هەموو ئـازاد بکـا و دڵـی غەریبان شاد بکا.

دەخوایە وا بکەی وا بکات. کاکۆڵی ڕەش تا-تا بکات؛ چین-چین هـەموویان بـا بـدا و بەر با بدات. بیانکاتە مۆری سوڵتانی و فەرمانی پێ ئیمزا بکات.

۸
ئی گۆیـــێ مەیـــدانێ تـــە بـــت — وەک مــن د زنـــدانێ تـــە بـــت
ســـەربەندێ چـــەوگانێ تـــە بـــت — مـــەجرووحێ پـــەیکانێ تـــە بـــت
یـــەغما و تالانـــێ تـــە بـــت — هـــەر رۆژێ قوربانـــێ تـــە بـــت
بیمـــارێ موژگانـــێ تـــە بـــت — موشـــتاق و حـــەیرانێ تـــە بـــت
ســـوهتێ ژ هیجرانـــێ تـــە بـــت — دێ مەست و فینجانـێ تـە بـت
وێ بـــەهر د نیشـــانێ تـــە بـــت — مووچـــە ژ بـــەر خوانـــێ تـــە بـــت
لـێ لوتـف و ئیحسـانێ تـە بـت — هـــەردەم ب خوونـــێ حـــەزرەتێ

**پوختەی مانا:**

کەسێ وەک من سەری گۆ بێ لە مەیدانت، لە زیندانی تۆ دەرنەچێ، بە گۆچانی تۆ هەڵسووڕێ، بریندار تیری تۆ بێ، هەموو ڕۆژ بە قوربانت بێ، بە دڵ و بە گیان تالانت بێ، دایم لە ژێر فەرمانت بێ، کوژراوی مژۆلانت بێ، حەیران و سەرگەدانت بێ، مەستی چاوی فینجانت بێ، بۆ خۆت نیشانت کردبێ، لەبەرماوی خوانت بخوا و جار-جارە بیلاوێنیەوە و بانگی کەی و خۆت ببینێ؛ چی تێدایە؟

**٩**

| | |
|---|---|
| جانـــان ب ئــەغیاران نـــەدی | خەمرێ ب خوونخـواران نـەدی |
| وەردان بـــە مـــرداران نـــەدی | وان رێ د گـــولزاران نـــەدی |
| ڕەیحـــان و گولنـــاران نـــەدی | بـــۆ وان ژ زەیـن خـاران نـەدی |
| تـــو ڕەمـــز و ئەســـراران نـــەدی | کـــوران تـــو ئـــەنواران نـــەدی |
| ب نوونـــەکی یـــاران نـــەدی | نێڤ مە و خوە ئەسـتاران نـەدی |
| تـــیران ژ نووبـــاران نـــەدی | دەردان ب بیمـــاران نـــەدی |
| ژ غـــەیری ســێ جـاران نـەدی | ریشـــن نـــەدیرن تاقـــەتێ |

**پوختەی مانا:**

بادەی نەدەی بە نامۆیان و خوێنمژان! مەهێڵـە مـردار بێنـە بـاغ! گـوڵ و ڕەیحانیـان نەدەیەی! جگە لە دڕوو مەیاندەرێ! مەهێلە بـە ڕاز بـزانن! مەهێڵـە کـوێران ببیـنن! عاشقانت ئازار نەدەی! لە بەدکاریان بپارێزە! یاری خۆت هەرزان مەفرۆشە! خۆتیشمان لێ دامەپۆشە! بە کەوان تیرمان تێمـەگرە! دەردمـان لەسـەر گـران مەکـە! لـە سـێ پیاڵەش زیاتر بادەمان مەدەیە! بریندارین، تاقەتی مەستبوونمان نییە.

**١٠**

| | |
|---|---|
| بـەس عاشـقان مـەهجوور بکـی | شوبهەت «مەلێ» ڕەنجوور بکـی |
| قـــەلبێ شکەســتی هـــوور بکـــی | شـــوونا برینـــان کـــوور بکـــی |
| شـــەمعا مـــە ژێ پـــڕنوور بکـــی | ب زەهرێ خـوە مـەئموور بکـی |
| تـــەنها مـــە بـــێ دەســتوور بکـــی | مـــەحرەم ســەرایێ حـــوور بکـــی |

وەسلا خوە دا فەغفوور بکی ژ وێ بادەیێ مەخموور بکی
نیف کاسەیا فەرفوور بکی فەیزێ ل دلدا فوور بکی
دیمێ ژ رەنگ کافوور بکی دالان ژ خالان دوور بکی
پێ عالەمێ مەقهوور بکی وەقتێ سەحەر کو بادە تێ

**مانای وشەکان:**

**ژەین**: غەیر، جگە؛ **کور**: قوڵ.

**پوختەی مانا:**

بەس عاشقان دوور خەرەوە! بە دەردی مەلایان مەبە! دڵی شکاو بەس ورد بکە! شوێنی برین قووڵتر مەکە! مومێ مە چاکتر هەڵبکە! بۆ خۆت فەرمانمان بدەرێ، با هەر تەنیا ئێمە بێینە ناو حەرەمسەراوە. بە دیدارت بمانکە شا! لە بادەی خۆت مەستمان بکە! بادە دەپیاڵەی چینی کە! بەهرە لە دڵ بە فیچقە بێ. ڕووت وەک کافووری سپی کە! بسکان لە خالان دوورخەوە! دنیایە بێنە بەر حوکمت! دەمی بەیان کە سروە دێ.[1]

---

١. ئەم شیعرە لە نوسخەکەی سەلمان دلۆڤاندا، ١٢ بەندە.

# ئاخ جودایی

| | | |
|---|---|---|
| ١ | ڤێ فیرقەتێ ئەبتەر کرین | فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ |
| | ژار و زەعیف و زەرکرین | فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ |
| ٢ | پور زەرکرین وەک زێرمام | چەهڤێن د لوتفێ پیرمام |
| | دایم ل رێ چاونێر مام | فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ |
| ٣ | چاڤنێرێ رەفتارا تە بووم | موشتاقێ گولزارا تە بووم |
| | لەو دور ژ دیدارا تە بووم | فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ |
| ٤ | دوور بووم ژ وێ رەفت و چنێ | وان عیشوەیا گفت و کەنێ |
| | نایێ ب چەهڤان من دنێ | فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ |
| ٥ | دنیا ب من مژ بوو غەمام | خەو ژی ل چەهڤان من حەرام |
| | عومرەک ب ڤێ حالێ هەمام | فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ |
| ٦ | ساعەت ل من تێک سال بوون | دائم ل سەر دەست فال بوون |
| | حەرفێن دهاتن دال بوون | فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ |

**مانای وشەکان:**

**زەر**: زەرد؛ **ژار**: کز و زەبوون و بێچارە؛ **زیر**: داوەتێلی ساز کە دەنگی زۆر باریک و نزمە؛ **چاڤنێر**: چاوەڕوان، چەمەڕا؛ **رەفتار**: ڕەوت؛ **رەفت‌وچن**: هات‌وچۆ، ڕۆیشتن و چوون؛ **گفت**: قسەکردن؛ **کەن**: خەنین؛ **غەمام**: هەور؛ **فاڵ**: بۆ بەخت ڕوانین، فاڵنامە.

**پوختەی مانا:**

دوابڕاوی دەس جودابیم؛ زەرد و دەردەداری ئەوم. وەکوو سیمە باریکەکەی کەمانچە و تار، کز و لاواز، هەمیشە چاولەڕێی یارم. هانام بە پیری مەیخانە دەفریام بێ. هاوار لە

دەس ئەم دورییە. دەمەوێ ڕەوتت ببینم؛ لە باغچەی جوانیت بڕوانم. هەر چونکە ئەو نیازەم بوو، لە دەرکی خۆت دوورت کردم! هاتوچوونەکانت نابینم. قسە و دەنگی پێکەنینت نایەنە گوێم. وەک لە دنیا نەبم وایە؛ دەردی جودایی بەلایە. هاوار لە دەستی جودایی. دنیا بە من هەورە و مژە؛ چاوم لەگەڵ خەودا دژە. عومرێکە بەو ژانەی دەژیم. دەوەرە لام و بمکوژە!

هەر ساتێکم لێ بە ساڵە. چاوم لە فاڵنامە و فاڵە. هەوری دەوری تاڵەم تاڵە. هەر پیتێ بۆم دێ هەر داڵە. لار و خوار، چەوت و چەواڵە. واتا دووری، واتا دڵەدەردی دووسەر، دەرچوون لە دەرمان و دەوا. بەڵام وا دیارە داڵێکیان واتای دیداری دەگەیاند.

| | | |
|---|---|---|
| ٧ | ئـیرۆ تنـێ دەرهـات ئـەلیف | مـەعنی دچـوو بـەژنا شـەریف |
| | یا خـارە لـێ کیمخـە و قـەدیف | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ٨ | ڤـێ فریقـەتێ پـڕ دڵ شـەواند | جـەرحێن قـەدیم دیسا کەواند |
| | شیشـێن د سـۆڕ تێـدا تەوانـد | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ٩ | داغـێن مـە دیسـا رەش کـرن | یەک-یەک ژ نوو ئاتـەش کـرن |
| | لـێ زێـدە پەنجوشـەش کـرن | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ١٠ | سـەودا و سـەوس و گێـژ کـرم | پـوڕ هـەر د دل خـوونرێژ کـرم |
| | چەنـدان وەبـوو لـێ هێـژ کـرم | فـەریاد ژدەسـتێ فیرقـەتێ |
| ١١ | بـیللاه ژ نالـە و زارییـان | گـەزمێن دەوان خـەمماریيان |
| | خـەو نـاکرین شـەو تارییـان | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ١٢ | شەڤ بوو دنـێ چـەشمێ مـە دا | حـەتتا بەشـیر مـزگێنی دا |
| | دێ بـێ سـەحەر شـاهێ گـەدا | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ١٣ | مزگین کو دا مـن ئـەڤ قـەدەر | ڕۆحـێ شـرین مـن هاتـە سـەر |
| | خەیلەک ل من روون بوون بەسەر | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ١٤ | روون بـوو ب دیـدارێ تـە دل | بـوو غـەرقێ ئـەنوارێ تـە دل |
| | نـارەت ژ فـەروارێ تـە دل | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ | میننەت مە دلداریٔ خوە دی<br>سولتان و خوندکاریٔ خوە دی | دیسا ژ نوو یاریٔ خوە دی<br>فەریاد ژ دەستیٔ فیرقەتیٔ |
| ١٦ | رەش کاکولێن سونبول چەڤین<br>نوو بوون ل دل حوبب و ئەڤین | میننەت مە دیسا غەم رەڤین<br>فەریاد ژ دەستیٔ فیرقەتیٔ |

**مانای وشەکان:**

**ئەلیف**: هۆگر؛ **ئەلیف**: پیتی یەکەمی ئەلفوبێتکە؛ **خارا و کیمخە** (یان: **کیمخوا**): دوو پارچەی بەقیمەتن؛ **شەواند**: برژانـد؛ **کەوانـد**: داغ کـرد؛ **تەوانـد**: خـوار کـردەوە؛ **بەشیر**: مـژدەدەر؛ **سەوس**: دەمـدەمی و گـەللایی، وازوازی؛ **خەممار**: بـادەفرۆش؛ **خەیلەک**: زۆرێک، ئەندازەیەکی زۆر.

**پوختەی مانا:**

ئەمڕۆ لە کتێبی فاڵنامە، ئەلف دەرهات. واتا: ئەو بەژن وەک ئەلفەی خارا و کیمخوا و حـەریر و مەخمـەر دە بـەرە، تەشـریف دێنـیٔ. دەیسـا بـا بـیٔ و دادم لـە دەسـت دوورەدەستیی، لای ئەو بکەم. دڵ برژاوە، کۆنە بـرینم کـولاوە، دیسـانەوە داغ کـراوە، شیشی سوورەوەکراوم دەناو دڵێدا چەماون. جیٔ داخیش ڕەش هەڵگەڕاون؛ ئاگریشـی تیٔ بەرداون. نەهەر جارێک پێنج جار، شەش جار. هاوار لە دەستی جودایی.

سەوداسەر و هێر و گێژم؛ هەر خوێنی دڵ هەڵدەڕێژم. خۆم هـەر هـیچ بـووم، دەردی جوداییش تووشم هات، لەو تۆزە هیچەشی کردم. تیری ئەو چاوە مەستانە، ئەو مەستە لەسەر هەستانە و پیاڵەی شەراب لە دەستانە، خەوی شەویان لیٔ تاراندم. هەر دەگریم و دەبارێنم، نازانم لە دەستی دووری هەتا کەنگیٔ وا دەمێنم؟ هاوار لە دەردی جودایی.

دنیام شەو بوو لەبەر چاوان؛ گوتیان هات نازداری باوان. هەر بەو مژدە دڵڕفێنە، گیـانم هاتە سەر گلێنە، چاویشم پیٔ ڕوون بوونەوە. تیشکی ڕوون دە دڵم گەڕا، لە ڕووناکیـدا نوقم بوو؛ ئامادەی هەر فەرمانێکە. چۆن دەفەرمووی تا وا بکات.

سوپاس کە یارمان دیتەوە؛ جوانی خونکارمان دیتەوە. کاکۆڵ لە سروەبا نەوین. سوپای کوڵ و کەسەر ڕەوین. دڵ پڕ بوو لە خۆشی و ئەوین، هاوار لە دەستی جودایی.

| | | |
|---|---|---|
| ١٧ | دەردێ غـەدار بـێم فیرقەتـە | فیرقـەت ژ جـان پوڕزەحمەتـە |
| | یا سـەهل کـو عاشـق رح دەتـە | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ١٨ | نـارێ فـیراق و سـوهتنێ | ئێشـا خـەدەنگێ نوهتنـێ |
| | پـرس کـن ژ عوششـاقان تنـێ | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ١٩ | عاشـق ئـەون هـەر دمـرن | چەنـدەک د رەمـزێن دلبـەرن |
| | کەیبـەر ل دل مـن بهتـرن | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ٢٠ | یـارەب ب دیـدارێ خـوە کـی | مـن واسـلێ یـارێ خـوە کـی |
| | بەس سوهتییێ نـارێ خـوە کـی | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ٢١ | مە ژ دوستێ ساتەک دوور نەکی | پەرکەنـدە و مـەهجوور نـەکی |
| | دیسـا ژ نـوو دل هـوور نـەکی | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |
| ٢٢ | خاکـا ریـا دلبـەر «مـەلا» | بکشـین دچـاوان وەک جـەلا |
| | دیـدارێ قیسـمەت بـوو هـەلا | فـەریاد ژ دەسـتێ فیرقـەتێ |

**مانای وشەکان:**
**غەدار**: گران، زۆردار؛ **زەحمەت**: دژوار؛ **نوهتن**: سمین؛ **بێتر**: زۆرتر؛ **پەرکەندە**: بڵاو؛ **پەرکەندە**: بێپەڕوپۆ؛ **جەلا**: سورمە؛ **هەلا**: هۆشت بێ.

**پوختەی مانا:**
دەردی دووری زۆر گرانە. لە لەش جیابوونەوەی گیانە. هێشـتا گیانـدانیش هاسـانە؛ بەڵام ئەو زۆر بەسووتانە. تیری جەرگان کون-کون دەکا؛ کۆنـانیش خـەمئاژن دەکـا. کەسێک خۆی دڵدار نەبووبێ و ژانی بە دڵا نەچووبێ، چوزانێ دووری چ تامە؟ هاوار لە دەستی جودایی.
زۆر دڵدار هاتن و ڕابردن؛ بە نازی دڵبەران مردن. بەڵام من لە ناو هەمواندا، پتر جـەفا و دەردم دیوە و تیری دووریم تێچەقیوە. هاوار لە دەستی جودایی. خوایـە بـەزەییت پێما بێ؛ یارم لەگەڵما تەبا بێ؛ جەرگم لە سووتان ڕەها بێ؛ تازە لەمەش وردتـر نابـێ. هیچ کاتێ لێم هەڵماوێرە؛ چۆنکە ئەو بە تۆران فێرە. هاوار لە دەستی جودایی.
مەلا ئەگەر بۆت هەڵکەوت، دیسان چاوت بە یار کەوت، خاکی ڕێبازی دابێـژە! چـاوی خۆتی پێ بڕێژە! هۆشت بێ لە بیرت نەچێ! هاوار لە دەستی جودایی.

# فرشتەی بەشەری

آ

سەنەما سوڕ ژ سەمەد نەیشەکەرا لەب ژ نەبات
«اَحْسَنَ‌اَللهُ تَبارَکْ» ژ سوڕا وێ سەنەمێ
ئەنوەرا رەنگ فرشتە بەشەرا حوور سرشت
یا ژ میسکێ خوتەنێ خال و خەت و کاکول و قشت
گەر خوە نیشان سەقەرێ دەت دگرت حۆری بهشت
کەعبەیا تێ نەبت ئەو پوتکەدەیە و دێر و کەنشت
کو نەسیب دا ژ ئەزەل حەق ژ مەرا عیشق نویشت
فەیدە ناکن ل مە ئیسم و نە تەلسم و نە نویشت
زاهیرێ دا مە عەزابەک وەکوو باتین ڤە بەهشت
سوهتنێ دا بە عەناڤان و جەگەر تێک بریشت
قەسدێ وەسلێ مە ب جان کر کو ڤە دایین و نەهیشت
دەست نەهلین ژ تەلەب گەر مە درێ چت سەر و تشت
پشت نادین دوهەزار خەنجەر و تیر و رم و خشت
مە سەری داینە رێ و ب خودێ بەستییە پشت
ئەوە من ڕووح و حەیات و ئەوە من قیبلەیی زات

سەنەما سوڕ ژ سەمەد نەیشەکەرا لەب ژ نەبات
«اَحْسَنَ‌اَللهُ تَبارَکْ» ژ سوڕا وێ سەنەمێ

**مانای وشەکان:**

**اَحْسَنَ‌اَللهُ تَبارَکْ**: ماشەڵڵا لە شیرینکاریی خوا؛ **نویشت**: نووسی؛ **بریشت**: برژاندی، براژتی؛ **ڤەدایین**: دەری کردین، ڕای داین؛ **سەروشت**: سەروماڵ؛ **خشت**: نێزە؛ **پشت نادین**: ڕا ناکەین.

**پوختەی مانا:**
بوتە بەلارولەنجەکەم بەژنی وەک نەیشەکەر ڕێکە و لێوی وەک نەبات شیرینە. هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشییەی لە خواوەیە. تیشکدەرە؛ ڕەنگی لە فرشتە دەکا؛ ئاکاری وەک حۆری دەچێ و بنیادەمە. خاڵومیل و کاکۆڵ و پەرچووکەی هەنیەی، لە میسکی خوتەن ڕەشتر و بۆنخۆشترن. ئەگەر خۆی شان جەحەندەم دات، حۆری جەحەندەم دادەگرن؛ کە لە بەهەشت خۆشتر دەبێ.
خودای گەورە، ڕۆژی بەرێ، ئەوینی لە چارەم نووسی. بە دۆعا و نوشتە و هەیتوهووت، لە دڵی من ناچیتە دەر و هەرچی بکەن بێبەهرەیە. ئەوین ئەگەر بەرواڵەت دەرد و ئازار و سزایە، لە ڕاستیدا بەهەشتێکە خودا دەیدا بە دەروونمان. کەیفم سازە کە بە ئاگری ئەوینێ جەرگ و هەناوم برژاوە و هەڵقرچاوە و پرووکاوە. ویستم بمرم لەرێی ئەوین؛ بە گیان بگەم بە دیداری. لە خۆی دوور کردم و نەیهێشت. بەڵام هەرگیز دەست هەڵگیر نیم. سەر و سامانیشم بڕوات، گوێ نادەمە تیر و رم و نێزە و خەنجەر. با هەزارانیشم بۆ بێن، سەرم لە سەر ڕێ داناوە و پشتم بە خودا بەستووە. یارە گیان و ژیانی من؛ ڕووگەم ئەوە. بتە بەلارولەنجەکەم، بەژنی وەک نەیشەکەر ڕێکە؛ لێوی وەک نەبات شیرینە.
هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشییەی لە خواوەیە.

۲ زەرییا دێمدوڕ و لەبشەکەرا عیشوەپەری
یا ژ سەر تا ب قەدەم تێک ژ عەیبانە بەری
ژ سەراپەردەیێ لاهووت ب سەد شیوەگەری
بێتە بەر عەینێ شهوودێ د لیباسێ بەشەری
«حاشَ للّه» تو کسان دیبتن ئەڤ رەنگی زەری
دایە بەر قەند و نەباتێ ژ دو لەعلێن شەکەری
بێ، تو یا لەبشەکەری یا تو نەباتا بەتەری (تەبەری)
«اللّه اللّه» چ تەجەللایە ژ سیرڕا قەدەری
حاجیان سیلسیلە بەستینە ل دۆرا قەمەری
دۆرێ بەیتێ ژ سەفا تێنە سەمایا سەحەری

بێمورووەت کو دو مێران ژ سورێ مـەی د سـەری
نهـێلن چینـه تـەوافێ و زیـارەت حەجـەری
زەمـزەم و غولغولـه و عـومره و عیـد و عـەرەفات

سەنەما سورٖ ژ سـەمەد نەیشـەکەرا لـەب ژ نـەبات
«اَحْسَـنَ اللّٰهُ تَبـارَکْ» ژ سـورٖا وێ سـەنەمێ

**مانای وشەکان:**

**لاهووت**: خوایی؛ **کسان**: چلۆن؛ **بێ**: ببێژە، بلێ؛ **بەتـەر**: کورتـەی بێتـر، کـه بـه مانـا زۆرترە؛ **تەبەری**: نەباتی تەبەرزە، تەشوێ تاش؛ **حاجب**: برۆ.

**پوختەی مانا:**

سەوزەڵەی ڕوخسار مرواری، بە نازو غەمزەی لێوشەکر. سەرتاپا بێبـەش لـە عـەیبان، پەری خوایە و ناردراوە لە بیچمی بنیادەماندا دێتە بەرچاو؛ ئەگینا چۆن هیچ ئەو ڕەنگە سەوزەیەی و هەردوو لێوە ئاڵـەکانی -کـە نـەبات و شـەکر و قەنـدیان بـەر گرتـووە- دەکرێ لە ڕیزەی خەڵک بێت؟!

تو بلێ: شەکرە لە لێوت یان لە نەباتی تەبەرزەس؟ ئەی خودایە چ نهێنیـت لـە توانـایی خودا لایە! دوو برۆی لە یەک پەیوەندت دەوری لە مـانگی ڕووت داوە. هـەر بەیانییـەک کە بسکانت بە دەم سروەوە دەلەرن و لەسەر هەنیەت -کە وەک ئاسمانی ساو دەچـێ- حەجێ دەکەن و دلان پڕ دەکەن لە خۆشی، ئێمەی دڵدار زۆر بەتاسەین کە لـە دەوری سەرت گەرێین؛ خاڵی ڕەشت وەکوو بەردەڕەشـی ماڵـی کابـە، ڕابمووسـین. بـەلام دوو چاوە مەستەکەت -کە سەرمەستن- ناهێڵن ئەو حەجە بکەین. هەروا هوریای دڵـدارانە.
دیداری تۆ بۆ ئەوان جێژنی قوربانە و زیارەتی تۆ وەکوو عومرە و عەرەفاتە.
بتە بەلارولەنجەکەم بەژنی وەک نەیشەکەر ڕێکە؛ لێوی وەک نەبات شیرینە.
هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە.

٣ من ب دل سوورەتێ جان دی ژ بتان ئـەو ب تـەنێ
ئـەو تنـێ سـەروا رەوان دی ژ زەریفـێن چەمـەنێ

سۆسن و سونبول و گـول چەرخـە ل دۆرا سـەمەنێ
خەمرییان حەلقـە و چـین دانـە ژ میسـکا خوتـەنێ
سەر ددن چەشمەیی حەیوان و ب زەمـزەم درەنـێ
لـێ چ شـیرانییە «اللّٰه» تـە ژ وێ کـەفت و چـەنێ
ئەز دبێم بەدرە ب دێم لێ دکـتن گوفـت و کـەنێ
یـا یـەقین رۆژە ل شـەرقێ و شـەفەق دانـە دنـێ
غەلەتم رووحی قـودوس هاتییـە نـێڤ وێ بـەدەنێ
دکت ئیحیایێ مـەواتان ل سـوڕ و رەفـت و چونـێ
تــە نهــن بــاوەر و ئیمــان نــەزەرێ دێ و بنــێ
چ تەجەللایــە ب وێ قیبلــە مەلــەک روو ددەنــێ
ئـازەری گـەر بـدیا هـور دکـرن لات و مـەنات
سەنەما سوڕ ژ سـەمەد نەیشـەکەرا لـەب ژ نـەبات
«اَحْسَــنَ اَللّٰهُ تَبــارَکْ» ژ ســوڕا وێ ســەنەمێ

**مانای وشەکان:**

**دەرنێ**: دەچێ؛ **کەفت**: لامل؛ **مەواتان**: مردوان؛ **بنێ**: بڕوانە؛ **ئازەر**: باوک یـان مـامی برایم پێغەمبەر کە بتی دەتاشین.

**پوختەی مانا:**

لە چاو جوانان، ئەو بە تەنیا شکڵی گیانە. لە باغاندا، هەر ئەوە سـەروی ڕەوانـە. گوڵـی سوێسنە و سمڵی کە پەرچۆکەن، لە میسکی خوتەن ڕەشتر و بۆنخۆشترن. لە لاجانگی گوڵی یاسەمەنئاسایی دێن و دەچن؛ سەر دەگەیەننە سەر لێوان، کە سەرچاوەی ئاوی ژیان و وەک چاوەی زەمزەم پیرۆزە. ئەی خوایە! لامل و چەنەی چەنـد جـوانن. مـن دەڵێم ڕووی مانگی چاردەس. بەڵام گفت و پێکەنینی لـە مانـگ زیـادە. یـان وەکـوو خـۆرە لـە خۆرهـەڵات و جیهـان ڕۆشـن ئەکاتـەوە. لەمـەش هەڵـەم؛ دەڵـێم ڕەنگـە جوبراییلی هاتبێتە ناو لەشەوە. ڕەوت و چوونی وەکوو عیسا، مردوو وە گیان دێنێتەوە. گەر لە گفتم بەگومانی، تۆش وەرە و لە یار بڕوانە! تیشکی خوایە و لە فرشتان بۆتە ڕووگـەی

پیرۆز و جوان. باوک یان مامی برایم کە ئەتۆی دیبا بە چاوان، بتەکانی هەموو دەشکاند.
بتە بەلارولەنجەکەم، بەژنی وەک نەیشەکەر ڕێکە. لێوی وەک نەبات شیرینە.
هەی نامەخوا! لە دلکێشی بتی جوانم. ئەو دلکێشیەی لە خواوەیە.

۴ نیرگزا مەست و شیرین و گول و نەسرینە ژ ڕەنگ
شەکەر و لوئلوئێ مەنشوور و ب دل ئاهەن و سەنگ
مە ژبەر زەربێ ئەڤینێ بووە دل پێت و پەرەنگ
لەو مە شەب تا ب سەحەر نالەیە وەک مەغنی و چەنگ
دامە سەد ڕەنگ عەزابێ و نەهات دەر ژ مە دەنگ
هەستیان گرتییە ناسۆر و مە ژیدا هەیە ژەنگ
لەو نە هشیار و خوماری مە نە خواری مەی و بەنگ
ل مە ئیرۆ دو کەمانداریێ حەبەش هاتنە جەنگ
تێنە قەتلا مە د دەستان دو سیەهقەوسێ ژ یەنگ
درەشێنن مە و تێن مە دوهەزار تیر و خەدەنگ
جەگەرێ کون دکن و تێ دبەین میسلێ تفەنگ
میسلێ وێ کافر و زالم قە دیین کەس د فەرەنگ
نازک و خووب و شەکەرخەندە و شیرینحەرەکات
سەنەما سوڕ ژ سەمەد نەیشەکەرا لەب ژ نەبات
«اَحْسَنَاللهُ تَبارَکْ» ژ سوڕا وێ سەنەمێ

**مانای وشەکان:**

**ئاهەن**: ئاسن؛ **مەژی**: مێشک؛ **تێ دبەین**: بە نێواندا دێت.

**پوختەی مانا:**

چاوی وەک نێرگزی مەستە؛ خوێنشیرینە؛ بە ڕەنگی گول و نەسرینە. ڕوو مرواری، لێو شەکرینە. دلی وەک ئاسن و بەردە. من لە ئەوین دلم بۆتە گڕ و پەنگر. شەو هەتا ڕۆژ، وەک دەنگی چەنگە نالینم. سەد جۆرە جەزرەبەی داوم؛ دەنگم نەهات. ئێسکم

تووشی برین بوون و مێشکم ژەنگی هەڵێناوە. نە بادەم خواردووە نە بەنگ. دوو برۆش ڕەش- وەک دوو کەوانداری حەبەش- هاتنە جەنگم.
دوو کەوانی یەنگیان لە ناو دەستان هەیە و دوو هەزار تیریان پێوە نام. جەرگم کون بوو؛ وەکوو گوللە بە ناویدا دەرباز دەبن. کافری وا کێ لە فەرەنگستانیش دیویە؟!
ناسکە، جوانە، بزەی وەکوو شەکر وایە و ڕەوتی لەبەر دڵ شیرینە.
بتە بەلارولەنجەکەم، بەژنی وەک نەیشەکەر ڕێکە. لێوی وەک نەبات شیرینە.
هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە.

**۵** دریبا دوستێ «مەلا» یەکجیهەت و سادەدلین
مە حەتا جان هەیە حاشا ژ تەلەب دەست بهلین
یا درێ سەر بدرین یا ب موورادێ وەسلین
مە چ پەرواری ڕمێن بەر وەشێ شیرێن قزلین
تا ئەبەد مەست و هیلاکین ژ شەرابا ئەزەلین
ژ جەفا و ستەما وێ ژ جەگەر پوڕ دکولین
پەردەیا گووشەقەسەب لێ تو ژ سەر دێمێ هلین
کو د شەرقێ مەه و خورشید ژ شەوقێ بتلین
لەو ژ سوڕ سورمە د دێرین و نە موحتاجی کلین
مەست دنێڤ تۆڕ و لەفان مار ل سەلوێ فتلین
سورمەدارین ژ سورێ مەستێ ژ قودرەت کەملین
مە ژ غەفلەت دوژها دین و ژ سەهمێ خەجلین
عیشوەکەر شێوەنومایا مە ژ وێ ڕۆح و حەیات
سەنەما سوڕ ژ سەمەد نەیشەکەرا لەب ژ نەبات
«اَحْسَنَ‌اللهُ تَبارَکْ» ژ سوڕا وێ سەنەمێ

**مانای وشەکان:**

**بهلین**: هەڵگرین؛ **وەسل**: گەیشتن؛ **بە ڕووەش**: لەپێشەوە وەشێن؛ **قەسەب**: پارچەی

ئاوریشمچن؛ **بتلین**: دەست هەلگرتن؛ **فەتلین**: پێچیان خوارد؛ **ژها**: هەژدیها.

**پوختەی مانا:**

مەلا! ئێمە لە ڕێی یاردا ڕاست و لە ڕووین و دڵساکار. هەتا دەمرین دەست لە دڵداریی بەر نادەین. یان بە ئاواتی دڵ دەگەین، یان سەریشمان دەدۆڕێنین. گوێ نادەینە ڕمبی نووکتێژی خوێناوی. هەتا هەتا لە بادەی ئەزەلی مەستین. لە دەست ئازاری دەستی یار، دڵ پڕغەمین.

ڕووبەندی ئاوریشمچنت لە ڕوو لادە! با ڕۆژ و مانگ، لە تیشکدان ڕابوەستن. چاومان پڕە لە جوانی تۆ؛ ئیتر کارمان بە کل چییە؟ ماری کەزیت لە بەژنی سەوڵت پێچیان خوارد. چاوی مەستت کلی خودای تێکراوە؛ بۆیە مەستن. دوو هەژدیهای پرچتم دین، لە ترسان ڕەنگ لە ڕووم نەما. زۆر بە نازی؛ نازان دەکەی. گیان و ژیانمان لە تۆڕایە.

بتە بەلارولەنجەکەم، بەژنی وەک نەیشەکەر وایە. لێوی وەک نەبات شیرینە.

هەی نامەخوا! لە دڵکێشی بتی جوانم. ئەو دڵکێشیەی لە خواوەیە.

# سوێند بە بالا

١ ئـەی نەسـیمێ سـبەهێ مـا د مـەجالا سـەحەرێ
سەد سـەلامان بگـەهینی ژ مـە وێ لەبشـەکەرێ

٢ نیرگزا نـازکو تـەر نەیشـەکەرا مەسـت و خومـار
دێمدوڕ و لەعلـەب و موحتەشـەم و موعتەبـەرێ

٣ بسک و گیسۆ ژ حەریرن قەسـەبن تـۆررە و زولـف
نـە ژ کـافوورە بـەدەن خالـێ ژ میسـکێ تەتـەرێ

٤ دێم بەدر و ئەنییێ، زولف ل سـەر بوونـە هەلـەک
ئەرقـەمان حەلقـە و گەردانـە ل دەورا قەمـەرێ

٥ ئاسـتانی و شـوباک و کولـەک و پەنجـەرەیان
دا ب مسـکینی و زاری تـو ببۆسـی د بـەرێ

٦ توزەکی بین ب خـوەڕا تـا بکـرین کوحلـێ بەسـەر
ل تـەریقا قـەدەما دلبـەرێ وێ رەهگـوزەرێ

٧ دا ببینی سـەنەما مـن تـە بگـین خـوە بـدە خـەت
بکـە تەلخیسـێ جـەوابێ مـە ژ ڤـێ موختەسـەرێ

٨ لەو کو پورشەفقە ددیرت کەرەم و لوتـف و کـەمال
ئاه ژ دەست رەمز و سوڕێن وی دوڕ و گەوهەر خەبەرێ

٩ ما ب زەهرێ شەکەری دۆست بخوونـت جـارەک
عـەرزحالا کـو نفیسـی مـە بخوونـا جەگـەرێ

١٠ قـەدەرەک شـەفقە ژ لوتفـا تـە تەمـەننا دکـرین
دا مە مـەحرووم نـەدیری تـو ژ لوتـف و نـەزەرێ

١١ ب خودێ قەت تە د دلـدا ژ خـودێ تـرس نـەهن
دکـری زولم و جـەفایێ تـو ل مـن ڤـێ قـەدەرێ

١٢ ئەز ب وێ قامەت و بەژنێ ل تـە سـوندێ دخـورم
بەس کە ئەی پادشـەها مـن ل ئەسـیران غـەدەرێ

١٣ ژ بەر ئاهێن مە دنێ ئاگر و دوود بت نـە عەجـەب
مە د دلـدا هەیـە نـارەک کـو دسـوژت سـەقەرێ

١٤ نـە بووینـە نـە دبـن وەک تـە شـەپالێ د جـەهان
کی دییە میسلێ تە سـیمین‌تەن و زەررین‌کەمـەرێ

١٥ پاشی وان گەزمەیێ چەهڤێن تە «مەلا» پێ کوشـتی
ما خەدەنگن دکرن قەت ل مـە ئێـدی ئەسـەرێ؟

**مانای وشەکان:**

**قەسەب**: زەڕی، پارچەی زێڕتێوەدراو؛ **ئەرقەم**: مـاری جنجـیر؛ **کولـەک**: کولانچکـە، ڕۆچنە؛ **کوحل**: سورمە؛ **بگین خوە**: خۆ بگەیێنە؛ **تـەلخیس**: پوختـەکراو؛ **موختەسـەر**: کورت‌کراو؛ **تەلخیس**: کتێبێکە لە کتێبێکی بە ناوی موختەسەر وەرگیراوە و پوختـەی موختەسەرە؛ **خەبەر**: گفت و دوان.

**پوختەی مانا:**

سروە! لە بەرەبەیاندا سەد سلاوم لەو لێوشـەکرباره بکـە! بـەژنی وەکـوو نەیشـەکەرە. شلک و تورتە وەکـوو نێـرگس. مەسـتەچاوە؛ ڕوومرواریـیـە؛ لێولالـە؛ پایەبـەرزە و زۆر بەڕێزە. کەزی و بسک و لابسک و پەرچووکەکانی، وەک ئاوریشم دەگەڵ زێڕان تێکەڵ دەبن. لەشی لە کافوور سپی‌تر، خاڵی وەک میسکە بۆنخۆش و شـەوەڕەنگە. ڕوخسـار مانگە. هەنیەی بەو ئاڵقە بسکانەی لە سەریەتی، هەر دەڵێی ماری جنجیرن لە دەوری مانگێ هاڵاون. سروە! زۆر بە کزی ببوورە! لە پێشانا دەرک و پەنجەرە و کولانچکـە و لێوی دەلاقەکان ماچ‌کە! تۆزێکی سەرڕێی یار بێنە! تا بیکەینە سورمەی چـاوان. هـەر خۆت بچۆ خزمەت یارم، نامەکەمی بدە دەستی؛ وەرامەکەم بە پوختەیی بۆ بێنەوە. زۆر

بە بەزەو ئیتلفاتە. ئاخ نازانی چەند دڵکێش و پڕ لە نازە و گفتی وەکوو گەهەر دەچن. ئەگەر جارێک بە زاری ممبارەکی خۆی بانگم بکا و ئەو عەریزەم- کە بـە خـوێنی دڵ نووسراوە- قبووڵ ببێ، چەند خۆش دەبێ! نووسیومە تۆزێک بەزەت بـێ! لـە بـەزەت بێبەشم مەکە! جارێک ئاورێکم وێ بدە! بە خوا تۆ لە خوا ناترسی؛ دەنا هێندەت ئـەو دەردە بە من نەدەدا. سوێندت ئەدەم بەو بەژنە شۆخ و شەنگەی خـۆت، تـۆ پادشـای چاوجوانانی؛ هێندە لە منی یەخسیری خۆت زوڵمێ مەکە! لە بەر ئاهم ئەگەر دنیا پـڕ لە دووکەڵ و ئاگر بێ، سەیر نییە. ئاوری دڵم جەحەندەمیش دەسووتێنێ. کێ لە دنیا لەش‌زێوین و کەمبەرزێڕینێکی وەک تۆی بە چاو دیوە؟ ڕەزا سووک و جوانی وەک تۆ، نە هەرگیز بووە، نە دەبێ. دوای وەی مەلات بە تیری چاوەکانت کوشت، ئیتـر تـیری دیم بۆ چییە؟! تیر هاویشتن بەهرەی نییە.

**به یاری خوا شەرحی دیوانی جزیری دوایی هات**

خوایە! ئەی بینایی چاوان! سوپاس بۆ تۆ کە بەزەییت بە منی هەژاردا هاتەوە؛ ئەو هێز و توانایەت دامێ، لە پاش «*مەم و زین*»ی خانی، «*دیوانی شێخی جزیری*»ش، بە سۆرانی، شی کەمەوە؛ کە زۆری بۆ بەئاوات بووم. ئۆخەی ئیتر خەمم نەما؛ ئاواتم نەبردە ژێر گڵ. بشمرم ئارخەیان دەمرم. لە قیامەتیش دەس بە داوێنی خاوێنی ئەو دوو خۆشەویستەت دەگرم؛ لێم روونە خۆم لێ نابوێرن.

لە چاپ و بەرهەمهێنانی ئەم کتێبە، چەند کەسێکی هەژارپەروەری خێرەومەند یارمەتییان دام؛ ئەگەر چاکەیان لەبیر کەم، خۆم بە بێئەمەگ دەزانم:

سوپاسی زۆر بۆ کاک «ماجدی رۆحانی»؛ کە وەختە بێژم بەقەد خۆم، خۆی ماندوو کرد. پاکنووسی ئەو خەتەپیسەم، هەڵەوپەڵە هەڵگرتنەوەی، بە سەر چاپ ڕاگەیشتنی وە ئەستۆ گرت. هەر ئەویش بۆی دامەزراندم، کرێی چاپیان لێ نەستاندم.

سوپاس بۆ کارگێری سرووش، ئاغای «زەورەق»، بۆ بەرپرسی چاپخانەی ئیدارەی سرووش، «میهرپەروەر»ی خوێنشیرین، بۆ کیژی یەکجار هونەرمەند «ئابگینە»؛ کە بەڕاستی لە پیتچنینی کوردیدا مۆجزاتە.

پێشەکیش سوپاسی زۆرم بۆ ئەو کوردە لاوانەیە کە بە چاوی ڕەخنەگری لە نووسراوەکەم دەڕوانن و هەڵەکانم دەدۆزنەوە.

پازدەی پووشپەڕی ساڵی ١٣٦٠ی هەتاوی

عەبدورڕەحمان شەرەفکەندی «**هەژار**»

«صباحُ الخیر» خانێ من　　شەهێ شیرین زبانێ من

توی رووح و رەوانێ من　　ببت قوربان تە جانێ من

«تعالی‌اللّٰه» چ زاتی تو　　چ وێ شیرین سیفاتی تو

نە وەک قەند و نەباتی تو　　یەقین رووح و حەیاتی تو

حەیات و راحەتا جانم　　«صباحُ الخیر» یا خانم

وە رە بیناهیا چەهڤان　　ببینم بەژن و بالایێ

بەیانت خۆش وگەش خانم　　کزە و هیوای دڵ و گیانم

لە بسکتدایە تای ژیانم　　ئەوینت بۆتە ئامیانم

بڵێم تۆ چەندە شیرینی؟　　نە وەک قەندی، نە هەنگوینی

ئەتۆ گیانی، ئەتۆ ژینی　　ئەتۆم هێزی، ئەتۆم تینی

بە قوربانت دەکەم گیانم　　بەیانت خۆش‌وگەش‌خانم

وەرە ڕووناکی چاوانم　　ببینم بەژن و باڵاکەت





پەخشانگای پانیز

٣٥٠٠٠ تمەن